


# گومڕاكەی سەردەمی سەلەف
# و
# پێشەواكەی سەردەمی خەلەف

نوسینی :

داستان محمد








# گومڕاكەی سەردەمی سـەلەف

# و

# پێشەواكەی سەردەمی خەلەف

نوسینی

داستان محمد

## ابن حزم دەڵێ:

گەر ووتەیەکت بۆ هات بە زمان یان هێرشت کردە سەر ووتەیەك لە کتێبێکدا، ئاگاداربە نەکەی بەرامبەری بوەستی وەستانێکی توڕەیانە کە هۆکارەکەی ویستی سەرکەوتنی خۆت بێ بەسەریدا پێش ئەوەی لە ناحەقی ئەم ووتەیە دڵنیا بیتەوە بە بەڵگەی بنبڕکەر.

[مداواة النفوس : 194-195]

# ئەم كتێبە بە (خطبة الحاجة) دەست پێناكات

خطبة الحاجة بریتیە لەو پێشەكیەی كە ووتار بێژ لە ووتاری هەینی و جەژنەكان یان لەكاتی مارە بڕیندا دەیڵێت: (إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ... هتد) ئینجا دەست بە ووتارەكەی دەكات، ئەمڕۆ بە دەگمەن دەبینیت كتێبێك یان نامیلكەیەك بنوسرێت ئەم خطبة الحاجة-یە لە پێشەكیەكەیدا نەبێت وەك سوننەتێكی تەئكید لەسەر كراوی لێهاتووە تەنانەت گەر نوسراوەكە خاڵی بێت لێی ئەوا بۆی هەیە بە هەڵەیەكی زەقی بزانن، ئەم خطبة الحاجة-یە لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە سوننەتە لە ووتاری هەینی و جەژنەكان و مارە بڕیندا بووترێ، وە دروستیشە لەكاتی تریش بووترێ كە مرۆڤ دەست بە ئامۆژگاری كردنی خەڵك دەكات یان مەجلیسەكەی پێ دەكاتەوە، ناڵێین دروست نیە یان بیدعەیە بەڵام بەم جۆرەی ئەمڕۆ كە لە پێشەكی هەموو كتێبێكدا هەبێت بوونی نەبووە، جا هەر شتێك كە لە سوننەتدا نەبێت یان شتەكە سوننەت بێت بەڵام لەشوێنی خۆیدا بەكار نەهێنرێت ئەوا زۆر جار واز لێهێنانی باشترە لە ئەنجامدانی تا خەڵكی بزانن سوننەت نیە، بگرە جاری واهەیە شتێك سوننەتە هەندێكجار واباشە وازی لێ بهێنیت تا خەڵك بزانن سوننەتە بە بەردەوام بوون لەسەری وانەزانن فەرزە، بەڵێ پێغەمبەر ﷺ ئەمەی فەرمووە بەڵام لەهیچ كام لە نامەكانیدا لە پێشەكیەكەی ئەمەی نەنوسیوە بەڵكو تەنها بە بسم الله دەستی پێكردووە، وە زانایانی سەلەفیش زۆر بە دەگمەن دەبینیت لە هەندێك كتێبدا لە پێشەكیەكە ئەمەیان نوسی بێت تەنها بە بسم الله دەستیان پێكردووە، بەڵام دواتر لە سەردەمی خەلەف ئەمە وەكو عادەتێكی لێهاتووە گەیشتووە بەم حاڵەی كە بە دەگمەن كتێبێك دەدۆزیتەوە تێیدا نەبێت لە پێشەكی.

**الملا علي القاري** دەڵێ: **كاتێك زۆربەی زانایانی كتێب نوس وازیان هێناوە لە كاركردن بە ڕواڵەتی فەرموودەی (كل خطبة ليس فيها تشهد فهي كاليد الجذماء) -هەر ووتارێك شایەتمانی تێدا نەبێت وەك دەستێكی بڕاو وایە- ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ڕواڵەتی فەرموودەكە مەبەستێكی تری هەیە، جا بە یەكێك لە تەئویلەكان تەئویل دەكرێت، وە ئەوەی لەلای من**

**صەوابترە ئەوەیە کە ئەم ووتارەی لەم فەرموودەیەدا هاتووە مەبەست پێی ووتارەکانی سەردەمی پێغەمبەرە ﷺ لە هەینیەکان و جەژنەکان و جگە لەمانەش، چونکە کتێب نوسین دوای ئەم سەردەمە سەری هەڵدا.** [جمع الوسائل في شرح الشمائل : 10/1]

**ابن حجر** دەربارەی هەمان فەرموودە دەڵێ: **دەست پێکردن بە الحمد لله و مەرجدارکردنی شایەتمان ئەمە تایبەتە بە ووتار، بە پێچەوانەی باقی کارە گرنگەکانی تر هەندێکیان بە بسم الله الرحمن الرحيم دەست پێدەکات وەک نامەکان، وە هەندێکیان تەنها بە بسم الله وەک سەرەتای سەرجێ کردن و سەربڕینی ئاژەڵ، وە هەندێکیان بە زیکرێکی تایبەت دەست پێدەکات وەک الله أكبر، وە من نوسراوەکانی پێغەمبەرﷺ کۆکردەوە کە بۆ پاشاکان و جگە لەوانیشی ناردبوو هیچ یەکێک لەوانە بە حەمد دەستی پێنەکردبوو بەڵکو بە بسم الله دەستی پێکردبوو.**

[فتح الباري : 730/9]

ووتم: کە دەڵێ بە حەمد دەستی پێنەکردبوو مەبەستی خطبة الحاجة-یە چونکە ئەو بە حەمد دەست پێدەکات.

**ابن حجر** دەربارەی ئەوەی کە بۆ البخاري صەحیحەکەی بە خطبة الحاجة دەست پێنەکردووە ووتەی هەندێک لە زانایان نەقل دەکات کە هۆکارەکەیان باسکردووە، ئینجا دەڵێ: **سەیرتر لە هەموو ئەمانە ووتەی ئەو کەسەیە کە دەڵێ: البخاري کتێبەکەی بە حەمد و شایەتمان دەست پێکردووە بەڵام هەندێک لەوانەی کە کتێبەکەیان لێوەی ڕیوایەت کردووە سڕیویانەتەوە ! وەک بڵێی خاوەنی ئەم ووتەیە کتێبەکانی پێشەوایانی نەدیبێ لە شێخەکانی البخاري و شێخی شێخەکانی و ئەوانەی سەردەمی خۆی وەک مالك لە الموطأ و عبدالرزاق لە المصنف و أحمد لە المسند و أبو داود لە السنن هەر ناژمێردرێت کە چەندە زۆرن ئەوانەی خطبة الحاجة-یان نەنوسیوە لە سەرەتای کتێبەکانیان، لە بسم الله زیاتریان نەنوسیوە، ئەم زانایانە زۆرینەن کەمێکیان کتێبەکانیان بە خطبة الحاجة دەست پێکردووە، ئایا دەربارەی هەموو ئەمانە دەووترێ ئەوانەی کتێبەکانیان ڕیوایەت کردووە خطبة الحاجة-یان سڕیوەتەوە ؟ نەخێر.** [فتح الباري : 1/28-29]

ئەو زانایەنەش کە لە کۆندا لە سەرەتای کتێبەکەیان خطبة الحاجة-یان نوسیوە بەم شێوەیە نەبووە کە لە هەموو کتێبێکدا بینوسن بۆ نموونە الطحاوي تەنها لە یەک کتێبدا نوسیویەتی، وە دەووترێ ئیمام أحمد پێش نوسینی فەرموودە بە دەم الحمد لله-ی دەکرد بەبێ نوسین وەک الخطیب ڕیوایەتی کردووە، جا دەکرێ زانایانی تریش کردبێتیان، والله أعلم.

جا لێرەدا مەبەستمان ئەوە نیە کە بڵێین خطبة الحاجة لە سەرەتای کتێبدا بیدعەیە و نابێ بنوسرێ، بەڵکو مەبەستمان دوو شتە، یەکەمیان: ئەوەیە کە بزانرێ بەم شێوەیە نیە کە مەرجدار بکرێ و لە سەرەتای هەموو کتێبێکدا بنوسرێ، بەڵکو زۆرجار واز لێهێنانی لە پێشترە تا خەڵک بزانن ڕاستی بابەتەکە چۆنە، دووەمیان: تا ڕوون ببێتە بۆچی لەم کتێبەدا نەمان نوسیوە.

# پێرست

# پێشەکی

الله تعالی دەفەرمووێ: ﴿وَلَقَدۡ أُوحِيَ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ واتا: وەحیمان بۆ تۆ و پێغەمبەرانی پێش تۆش ناردووە ئەگەر بێتو شیرك ئەنجام بدەی ئەوا کردەوەکانت هەڵدەوەشێتەوە، لە ڕۆژی دواییش لە خەسارەتمەندان دەبیت.

بەڵێ الله تعالی بەم شێوەیە پەیام دەنێرێت بۆ خۆشەویسترین و نزیکترین و باشترین بەندەکانی کە پێغەمبەرانن علیهم الصلاة والسلام کە ئەگەر بێتو هەر کامێکیان توشی کوفر ببن الله کردەوەکانیان هەڵدەوەشێنێتەوە، ئەمەش لەبەر گەورەیی شیرك و کوفرە هەر بۆیە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ﴾ واتا: بەڕاستی الله لەوە خۆش نابێت کە شەریکی بۆ بڕیار بدرێت، وە لە هەموو تاوانێکی تری جگە لە شیرک خۆش دەبێت لە هەر کەسێک کە بیەوێت.

سێ سەدە چاکەکەی ئوممەتیش باش لەم مانایە تێگەیشتبوون بۆیە نابینین لە سەردەمی ئەواندا هیچ بیدعەچیەک گەورە بکرێت و بەرگری لێ بکرێت چ جای ئەوەی کافر گەورە بکرێت و نازناوی بریقەداری بۆ بەکار بهێنرێ، بەڵام دوای سەردەمی ئەوان دەبینین هەرچی کافر و بیدعەچی هەیە کراوە بە ئیمامی ئەهلی سوننە و چاوپۆشی لە کوفرەکانی کراوە بە بیانووی ئەوەی خاوەن زانست بووە و کتێبی بە سودی نوسیوە، دەڵێن خراپەکانی لە دەریای چاکەکانی نقوم دەبێت ! ئەمە لەکاتێکدا الله فەرمووی لە شیرک خۆش نابم هەرگیز بەڵام لای ئەوان گەر کتێبی بە سودت هەبێ و خاوەن زانست بیت ئەوا کێشە نیە گەر کوفریشت هەبێ، خۆزگە دەمزانی کێ ؟ وە چۆن؟ ئەم عەقیدەیەی خستە ناو ئوممەتەوە کە گەر زانایەک کتێبی بە سودی هەبێت کوفریش بکات تەکفیر ناکرێت بەڵکو هەر بەڕێز و گەورە دەمێنێتەوە و کەس بۆی نیە تەکفیری بکات بگرە گەیشت بەوەی هەر کەس تەکفیری بکات جۆرەها تۆمەتی بدرێتە پاڵ، دوای سەردەمی سەلەف ئەم عەقیدەیە بەجۆرێک تەشەنەی کرد و بەر بڵاو بوو تەنانەت موسڵمان وا هەست دەکات ئەمە

ئیسلامی ڕاستەقینەیە کە زانا نابێت تەکفیر بکرێت ئەگەرچی کوفریشی هەبێت بگرە تەکفیر کردنی زاناکان کارێکی زۆر گەورە و ترسناکە هەرکەسێک دەستی دایە ئەم کارە بەرەو هەڵدێر دەڕوات و چارەنوسی خێر نابێت و سەرەنجام دەبێتە خەواریج ! سبحان الله ڕاستیەکان چۆن پێچەوانە بوونەتەوە ئەوەی بە خاوەنی کوفر بڵێ کافر مەترسی لەسەرە ببێتە خەواریج، بەڵام ئەوەی بەرگری لە خاوەنی کوفر دەکات و بە ئیمام ناوی دەبات و ڕەحمەتی بۆ دەنێرێ ئەهلی سوننەیە و شوێنکەوتەی قوڕئان و سوننەتە !

هەر بۆیەش کتێبەکەم لەسەر أبو حنیفة نوسی چونکە أبو حنیفة کەسێکە لە سەردەمی سەلەف ژیاوە ووتەی سەلەف زۆرە دەربارەی بە پێچەوانەی زانا موتەئەخیرەکان کە سەلەف پێیان نەگەیشتوون و ووتەیان نیە دەربارەیان، جا أبو حنیفة نموونەیەکی زۆر ڕوونە بۆ دەرخستنی جیاوازی نێوان مەزهەبی سەلەف و خەلەف، لەم کتێبەدا دەبینین کە سەلەف چۆن مامەڵەیان لەگەڵ أبو حنیفة کردووە هەر لە تەکفیر بگرە تا بچووکترین ووتە لەدژی ووتراوە کەچی لەلای خەلەف کراوە بە ئیمامی ئەهلی سوننە شان بە شانی سێ ئیمامەکەی تر، جا تۆی موسڵمان کاتێک لەوە تێگەیشتی سەلەف و خەلەف زۆر جیاوازن لە مامەڵە کردن لەگەڵ زاناکاندا ئەوا دەبێت لەوە تێبگەی هەر زانایەک لە موتەئەخیرین کە کەوتۆتە ناو کوفرەوە ئەوا گەر لە سەردەمی سەلەف ژیابوایە بە هەمان شێوەی أبو حنیفة مامەڵەی لەگەڵ دەکرا، کە نموونەیەکت دەست کەوت لە أبو حنیفة ئیتر ئەوانی تریش بەهەمان شێوەیە چونکە ناکرێ سەلەف هێرش بکەنە سەر أبو حنیفة و تەکفیر و تەبدیعی بکەن بەڵام بەرامبەر کەسێکی وەک النووي یان ابن حجر العسقلاني بێدەنگ بن حەتمەن ئەوانیش لەو سەردەمە ژیابوان حاڵیان خراپتر دەبوو چونکە کوفرەکانیان زۆر لە أبو حنیفة ڕوونتر و زیاترە، جا بۆیە ناکرێ ئێمە کتێب لەسەر دانە بەدانەی زاناکان بنوسین و حاڵیان باس بکەین، تۆ خۆت دەبێ لەوە تێبگەی کەسێکی وەک أبو حنیفة کە خاوەن مەزهەبێکی فیقهیە کە دەکەوێتە کوفر و بیدعەوە لێی قبوڵ ناکەن، کەواتە زاناکانی تریش بەهەمان شێوە لێیان قبوڵ ناکرێ، وە من لەم کتێبەدا أبو حنیفة-م تەنها وەک نموونە وەرگرتووە چونکە ئامانجی من زۆر لەوە

گەورەترە خۆم بەوە خەریک بکەم أبو فلان یان ابن فلان حاڵی چۆن بووە، ئامانجی من ئەوەیە ئەم عەقیدەیە لەناو موسڵمانان بوونی نەمێنێ کە دەڵێن فلان زانا کوفری هەیە بەڵام لەبەر خاتری کتێب و زانستەکەی تەکفیری ناکەین، من ئامانجم لە أبو حنیفة و أبو فلان و ابن فلان کورت ناکەمەوە، أبو حنیفة تەنها وەک نموونەیەک نیشانتان دەدەم لەم کتێبەدا تا بزانن سەلەف چۆن مامەڵەیان کردووە بەرامبەر کوفر و بیدعەی زاناکان، پێت وایە من شەش مانگ لەکاتی خۆم بگرم بۆ نوسینی ئەم کتێبە تەنها لەپێناوی ئەوەی بۆ تۆی ڕوون بکەمەوە کە أبو حنیفة چۆن بووە ؟ نەخێر ئامادە نیم شەش ڕۆژیش کاتم بە أبو حنیفة و هیچ زانایەکی تر بکوژم بەڵکو دەمەوێ ئەم عەقیدە بۆگەنە لە ڕەگەوە بقرتێنم چیتر نەووترێ فلان کەس بەڵێ کوفری هەیە بەڵام زانایەکی بەڕێز و گەورەیە تەکفیری ناکەین چونکە کتێبی بە سودی نوسیوە ! نامەوێ تۆی خوێنەر دوای خوێندنەوەی ئەم کتێبە بڵێی أبو حنیفة بە کافر دەزانم بەڵام ئەشعەرییەکان تەکفیر ناکەم، بەڵکو دەمەوێ دوای خوێندنەوەی ئەم کتێبە بڵێی هەروەک چۆن سەلەف کوفر و بیدعەکانی أبو حنیفة-یان قبوڵ نەکرد منیش بەهەمان شێوە کوفر و بیدعە لەهیچ زانایەک قبوڵ ناکەم هەر ناوێکی هەبێ هەر مەزهەبێکی هەبێ هەر کتێبێکی هەبێ و هەر کەسێک بێ مادام کەوتەوە کوفرەوە بەلامەوە کافرە و هیچ کەرامەتی نیە، چونکە وەک ووتم ئامانجی من نەهێشتنی ئەم عەقیدە بۆگەنەیە نەک ئامانجم خۆ خەریک کردن بێ بە فلان زانا بە دیاریکراوی.

جا أبو حنیفة نموونەیەکی زۆر گونجاوە بۆ ئەم بابەتە چونکە کاتێک خوێنەر بینی خاوەن مەزهەبێکی فیقهی کە بە الإمام الأعظم ناسراوە و هەمیشە لەپاڵ مالك والشافعي وأحمد ناوی دەهێنرێ لەلای خەلەف و معاصرین، ئەمە حاڵی بووە لەلای سەلەف ئەی دەبێت زاناکانی تر حاڵیان چۆن بوایە گەر لە سەردەمی سەلەف ژیابوان ؟ بێگومان خراپتر دەبوون، گەر زانست و کتێب نوسین و ناوداری ڕێگر بوایە لە بەردەم تەکفیر و تەبدیع و قسە ووتن بە زانایەک ئەوا أبو حنیفة زۆر لە النووي وابن حجر وابن حزم والقاضي عیاض وابن الجوزي والهیتمي والرملي والشیرازي والسبکي والقرطبي و الذهبي والسیوطي و الشوکاني و زۆرێکی تر لەپێشتر بوو کە زانایان

لێی بێدەنگ بن و قسەی پێ نەڵێن لەبەر خاتری زانستەكەی و مەزهەبەكەی، بۆیە هەمیشە أبو حنیفة بكە بە ئامرازێک بۆ بەراووردكردنی نێوان مەزهەبی سەلەف و خەلەف، گەر ووتیان فلان زانای موتەئەخیر كوفری هەیە بەڵام كتێبی بە سودی نوسیوە چاوپۆشی لێدەكەین و رەحمەتی بۆ دەنێرین و بەرزی دەكەینەوە، تۆش بڵێ خۆ أبو حنیفة لەو زانایە گەورەتر و لەپێشترە ئەی بۆ سەلەف ئاوایان نەكرد بۆی ؟ ئینجا جیاوازییەكەت بۆ دەردەكەوێ.

بەداخەوە لەدوای سەردەمی سەلەف قسەكردن لەسەر أبو حنیفة وەک ئەوەی لێهاتووە قسە لەسەر ڕوكنێک لە ڕوكنەكانی ئیسلام بكەیت، وەک بڵێی دینی ئیسلام لەسەر أبو حنیفة وەستاوە گەر قسەت لەسەر أبو حنیفة كرد ئەوا هێرش كردۆتە سەر دینی ئیسلام، بۆیە دەبینین كەسێكی وەک الخطیب لە تاریخ بغداد لە ژیاننامەی أبو حنیفة ڕیوایەتەكانی مەدحكردنی نەقل دەكات پاشان ڕیوایەتەكانی زەمكردنی، پێش ئەوەی بچێتە سەر ڕیوایەتەكانی زەمكردنی دەڵێ ئەوەی ڕاستە و لە زانایانەوە چەسپاوە قسە ووتن بووە بە أبو حنیفة واتا ڕیوایەتەكانی زەمكردنی بە ڕاستر دەزانێت لە ڕیوایەتەكانی مەدحكردنی كەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێ: ئێمە هەموو ڕیوایەتەكان نەقل دەكەین گەر ڕیوایەتێكتان بینی بە دڵتان نەبوو داوای لێبوردن دەكەین چونكە أبو حنیفة لەلای ئێمە ئیمامە ! یان كەسێكی وەک المعلمي الیماني كتێبی (التنكیل) دەنوسێ بۆ ڕەتدانەوەی درۆ و تۆمەتەكانی الكوثري، زۆرێک لە ڕیوایەتەكانی تاریخ بغداد تەصحیح دەكات كەچی لەگەڵ ئەوەدا بیانوو بۆ أبو حنیفة دەهێنێتەوە و بە ئیمام ناوی دەبات گوایە سەلەف بۆیە قسەیان پێ ووتوە تا خەڵكی شوێنی هەڵەكانی نەكەون ئەگینا قەدری أبو حنیفة-یان زانیوە ! ئایا تەكفیر و تەبدیعی كەسێک دەكەن بە درۆ وەک تەمسیل كردن تەنها لەبەر ئەوەی خەڵک شوێنی نەكەوێ ؟! نازانم عەقڵت لەم ساتەدا چی بەسەرهاتووە المعلمي كاتێک ئەم ووشانەت نوسیوە ؟! ئاخر كێ وەک تۆ بەرگری لە ڕیوایەتەكانی تاریخ بغداد كردووە كەچی هەر نەتتوانی لە كاریگەری سەردەم و دەوروبەر دەربچیت و هێشتا أبو حنیفة بە ئیمام ناو دەبەیت ! بۆیە دوای المعلمي پێم سەیر نیە هیچ زانایەک أبو حنیفة بە ئیمام ناو ببات چونكە المعلمي موناقەشەی دانە بە دانەی ڕیوایەتەكانی تاریخ بغداد

دەكات لەگەڵ الكوثري و ڕەددی تەزعیف كردنی الكوثري دەداتەوە و پشتیوانی لە ڕیوایەتەكان دەكات لەگەڵ ئەوەشدا بەم بیانووە خۆی هەڵدەخەڵەتێنێ ! دەڵێ سەلەف بۆیە قسەیان بە أبو حنيفة ووتوە تا خەڵكی شوێنی نەكەون ئێ باشە خۆ تۆ لە هیند ژیای ماوەیەك دەتزانی خەڵكی هیند چەندە دەمارگیرن بۆ أبو حنيفة بۆ تۆش وەك سەلەف دانەبەزیتە سەر أبو حنيفة تا خەڵكی شوێنی نەكەون و نەیكەن بە ئیمام ؟ ابن عبدالبر-یش لە كتێبی (الانتقاء) هەمان شتی كردووە ڕیوایەتەكانی مەدحكردنی نەقل كردووە پاشان چەند ڕیوایەتێكی زەمكردنی نەقل كردووە ئینجا دەڵێ ئەهلی سوننە زیادەڕەوییان كردووە لە قسە ووتن بە أبو حنيفة ! بەڵام كاتێك دەچینە سەر كتێبەكانی سەلەف هەمووی یەك پارچەیە لە زەمكردنی أبو حنيفة بەبێ هێنانی هیچ ڕیوایەتێك دەربارەی مەدحكردنی، وە نابینی یەك زانای سەلەف بیانوو بۆ أبو حنيفة بهێنێتەوە یان بەرگری لێ بكات، بۆ نموونە دوو تاریخەكەی البخاري، تاريخی الفسوي، تاريخی أبو زرعة الدمشقي، سؤالات البرذعي، المجروحين لابن حبان، الضعفاء للعقيلي، چەندەها كتێبی تر هەمووی یەك پارچەیە لە ڕیوایەتی زەمكردنی أبو حنيفة نابینیت وەك موتەئەخیرین ڕیوایەتی مەدحكردنی نەقل بكەن ئینجا دواتر تەئویل بۆ ڕیوایەتەكانی زەمكردنی بكەن و بیانووی بۆ بهێننەوە.

**مقبل بن هادي الوادعي دەڵێ: جاهیلە دەمارگیرەكان بۆ أبو حنيفة ژمارەیان زۆرە، بینیم ژمارەیەك مامۆستا لە (الجامعة الإسلامية) توڕە دەبوون ئەوپەڕی توڕەیی وایان دەبینی ئەم بابەتە ڕوخاندنی ئیسلامە (واتا: باسكردنی أبو حنيفة) ئەم داماوانە نازانن ئەو كەسەی كە قسە بە أبو حنيفة دەڵێ تانەی نەداوە لە ڕوكنێك لە ڕوكنەكانی ئیسلام، وە ئێمە بەو جاهیلانە دەڵێین: ئێوە بە غیرەت ترن لەسەر دینی الله لە أحمد بن حنبل و محمد بن إسماعيل البخاري ومسلم والدارقطني والخطيب ؟ وە پێیان دەڵێین: ئێوە شارەزاترن بە أبو حنيفة لە مالك بن أنس وشريك بن عبدالله النخعي ويحيى بن سعيد القطان وعبدالله بن يزيد المقرئ وسفيان الثوري وسفيان بن عيينة وعبدالله بن المبارك و ئەوانەی كە لەسەر ڕێبازی ئەمانە ڕۆیشتوون ؟** [نشر الصحيفة : 5]

ووتم: ئەگەرچی مقبل بن هادي الوادعي لە كۆمەڵەی ئەو زانایانە دابوو كە هەندێك لە طاغوتی

وولاَتانى عەرەبيان بە وەلى ئەمر دەزانى و جەختيان لەسەر گوێڕايەڵى كردن بۆيان دەكردەوە، بەلاَم خۆزگە موسڵمانان دەربارەى أبو حنيفة و هاوشێوەكانى بەم شێوەيەى مقبل لە باسەكە بڕوانن و تێى بگەن، كە غيرەتيان بۆ دين بجوڵێ و دەمارگيرييان بۆ حەق هەبێ، نەك غيرەتيان بۆ كەسەكان بجوڵێ و دەمارگيرييان بۆ كەسەكان هەبێت، كەسێكى وەكو مقبل كە طاغوت بە وەلى ئەمر دەزانێ چ شتێك واى لێكرد ئاوا دابەزێتە سەر أبو حنيفة و كتێبى لەسەر بنوسێ ووتەى 77 زانا كۆ بكاتەوە دەربارەى أبو حنيفة ؟! جێگاى تێڕامان نيە ؟ بێگومان هۆكارەكەى زۆرى ووتەكانى سەلەفە دەربارەى أبو حنيفة، كە ئەم هەموو ووتەيە بەهيچ پاساوێك ڕەت ناكرێنەوە تەنها بە دەروێشايەتى و تەقليدى كوێرانە و دەمارگيرى و جەهل نەبێت.

مقبل بن هادي الوادعي دەڵێ: **ئەو ووتانەى لە پێشەوايانى فەرموودەوە دەرچوونە دەربارەى أبو حنيفة بەڵگەيە لەسەر غيرەتى پێشەواكانمان رحمهم الله لەسەر سوننەت كە لەپێناوى الله لۆمەى لۆمەكاران كاريان تێناكات، بەپێچەوانەى ئەم سەردەمە كە سەردەمى چاوپۆشى و موجامەلە كردنە، دەبينى نازناوى گەورە بۆ بيدعەچى بەكاردەهێنن وەكو: (بانگخوازى گەورە ، موجاهيد) بگرە لەوانەيە نازناوى (مجدد)ى بۆ بەكار بهێنن، سەردەمەكەمان چەندە پێويستى بە كەسانێكى وەكو شعبة بن الحجاج ويحيى بن سعيد القطان ويحيى بن معين و أحمد بن حنبل والبخاري وأبو حاتم الرازي وأبو زرعة الرازي وابن حبان والدارقطني هەيە كە حاڵى بيدعەچيەكان ڕوون بكەنەوە كە دينيان لە موسڵمانان تێكداوە و يەكڕيزى موسڵمانانيان پەرتەوازە كردووە بەو بيرە نوێيانەى كە هێناويانەتە ناو ئيسلام، وە بەو كەسە حزبيانەى كە پلانى دوژمنانى ئيسلام جێبەجێ دەكەن، سكاڵامان بۆلاى الله يە، وە لە هەموو ئەمانە سەيرتر ئەوەيە كاتێك كەسێكى خاوەن غيرەت لە ئەهلى سوننە هەڵدەستێ بە ڕوونكردنەوەى حاڵى زانايانى فاسق يان بانگخوازان بەرەو حزبايەتى كە خزمەتى ئامانجەكانى ئەمريكا دەكات، بێزار دەبن لەم كارەى ئەو، وە دەڵێن: الله الله يەك دەنگى بپارێزن ! الله المستعان بانگم دەكەى بۆ يەكدەنگى لەگەڵ كەسێكى ديموكراسى يان خاوەن ڕق بەرامبەر سوننەت دوژمنێكى سەرسەخت كە پلان دەگێڕێت**

**لەگەڵ سۆفی و شیعە بۆ لێدانی ئەهلی سوننە ! پاشان پێم دەڵێ: الله الله لە یەکدەنگی ! نا نا نا، خۆم یەکدەنگ ناکەم تەنها لەگەڵ کەسانی سوننی نەبێ، گەر بڵێ: واز بهێنە لە ووشەی بریندارکەر! دەڵێم: بگەڕێوە بۆ ژیاننامەی أبو حنیفة کە پێشتر باسمان کرد دەبینی ووشەی بەریندارکەری لەوە گەورەتر هەیە.** [نشر الصحیفة : 397-398]

ووتم: خۆزگە ئەمە ووتەی موسڵمانان بوایە هەموویان بڵێن ووتەی زانایانی سەلەف نیشانەی غیرەت جوڵانیانە بۆ دین کە حاڵی أبو حنیفة وهەموو کافر و بیدعەچی و گومڕاییەکیان ڕوونکردۆتەوە بۆمان و لە لۆمەی لۆمەکاران نەترساون، وە ئێمەش ئامادە نین یەکدەنگی بپارێزین لەگەڵ کەسانێک کە دەیانەوێ هەرچی کافر و بیدعەچی و گومڕا هەیە لێمانیان بکەن بە ئیمام، بەڵێ ئەوەی حەقە دەیگەیەنین و بڵاوی دەکەینەوە ڕازی نابین یەکدەنگی بپارێزین لەسەر حیسابی شاردنەوەی ڕاستیەکان.

سەلەف پیشەیان وابوو کە کتێب بنوسن دەربارەی تەوحید و عەقیدە ناویانن لە کتێبەکە دەنا (السنة) سوننەت لەلای ئەوان بەمانای بابەتە عەقیدەییەکان دەهات بۆیە هەمیشە ووشەی سوننە و بیدعە بەرامبەر یەکتر بەکاردەهێنن، نموونەش وەک (السنة)ی عبدالله و (السنة)ی حرب الكرماني و (السنة)ی الخلال و (السنة)ی ابن أبي عاصم و (صريح السنة)ی الطبري و (شرح السنة)ی البربهاري و (شرح السنة)ی ابن أبي زمنين ...هتد، جا بیربکەرەوە چ شتێک وای لە عبدالله-ی کوڕی ئیمام أحمد کرد لە کتێبی (السنة) کە تایبەتە بە تەوحید و عەقیدە بەذێک تایبەت بکات بە أبو حنیفة ووتەی زانایان لەدژی نەقل بکات کە دەگاتە 179 ڕیوایەت، گەر هەڵەکانی أبو حنیفة بچووک بن یان خیلافی فیقهی و مەزهەبی بن یان ڕەتدانەوە و ئاگادارکردنەوە لە أبو حنیفة شتێکی گرنگ نەبێ بۆچی عبدالله لە کتێبێکی ئاوادا بەشێک تایبەت دەکات بە أبو حنیفة، بڕوانە لەم کتێبەدا بەشێکی تایبەت کردووە بە مورجیئە، بەشێکی تایبەت کردووە بە جەهمیەکان، بەشێکی تایبەت کردووە بە قەدەرییەکان، بەشێکی تایبەت کردووە بە خەواریج، لە بەرامبەر ئەم چوار گروپەش بەشێکی تایبەت کردووە بە أبو حنیفة، واتا أبو حنیفة-ی شان بە شانی ئەم چوار گروپە

هێناوە و بە پێویستی زانیوە ئاگادار كردنەوەی لێ بدات و كوفر و بیدعەكانی باس بكات ؟ ئایا تێدەگەن لەوە ؟ هەست بە گەورەیی بابەتەكە دەكەن ؟

جا كاتێک باسی ئەوە دەكەین كە زانایانی سەلەف توند بوونە بەرامبەر زانا كافر وگومڕا و بیدعەچیەكان و پلەیان بەرز نەكردوونەتەوە و ڕەچاوی پلە و زانست و كتێبەكانیان نەكردوون كە كوفری كردووە وتوویانە كافرە كە بیدعەی كردووە وتوویانە بیدعەچیە، بەپێچەوانەی مەنهەجی خەلەف كە كۆمەڵێک زانای كافر و بیدعەچیان كردووە بە ئیمام و ئەهلی سوننە بە بیانووی ئەوەی كتێبی بە سودی نوسیوە و خاوەن زانستێكی زۆر بووە، زۆرێک لە خەڵكی دەڵێن ئایا ئێوە زاناترن لە خەلەف بە مەنهەجی سەلەف ؟ خەلەف نەیانزانی مەنهەجی سەلەف بەم شێوەیە ئێوە زانیتان؟ بەم ووتانە دەیانەوێ وای نیشان بدەن كە مەنهەجی سەلەف و خەلەف هیچ جیاوازی نیە سەرەڕای بەدی كردنی ئەم جیاوازییە زۆرە لە مامەڵە كردن لەگەڵ كافر و بیدعەچیەكاندا، دەیانەوێ تەنها ئەوكاتە سەنگ دابنێن بۆ ڕێبازی سەلەف كاتێک خەلەف پێی ڕازی دەبن !

ابن رجب دەڵێ: **موبتەلا بووینە بە كەسانێكی جاهیل بڕوایان وایە هەندێک لەو زانایانەی المتأخرین كە زۆر قسەی كردووە دەربارەی بابەتەكان زاناترە لە هەموو زاناكانی المتقدمین، هەندێكیان بڕوای وایە كە تاكە زانایەكی المتأخرین زاناترە لە هەموو هاوەڵان و ئەوانی دوای هاوەڵان هاتوون بەهۆی زۆری ڕوونكردنەوە و قسەكردنی زاناكە، وە هەیانە دەڵێ زاناترە لە هەموو فەقیهە ناودارەكان كە خەڵكی شوێنیان كەوتوون ...** (پاشان دەڵێ) **ئەمە پلە كەمكردنەوەیەكی گەورەیە بۆ سەلەفی صالح، وە گومان خراپ بردنە پێیان و دانە پاڵی جەهل وكەمی عیلمە بۆیان، ولا حول ولا قوة إلا بالله.** [بيان فضل علم السلف على علم الخلف : 61-62]

ابن رجب دەڵێ: **خاوەنانی زانستی بە سود گومانی خراپ بە خۆیان دەبەن و گومانی چاك بە زانایانی سەلەف دەبەن و لە دڵەوە دان بە فەزڵی زانایانی پێش خۆیان دەنێن، وە دان بەوە دەنێن كە بێ توانان لە گەیشتن بە پلەی ئەوان یان نزیک بوونەوە لە پلەی ئەوان.**

[بيان فضل علم السلف على علم الخلف : 86-87] بە دەستکارییەکی کەمەوە

**ابن تيمية** دەڵێ: **هەرکەسێک الله عیلم و ئیمانی پێ بەخشی بێت ئەوا دەزانێت کە لەلای زانایانی المتأخرين هەر تەحقیقێک هەبێت ئەوا ناگات بە پلەی تەحقیقی سەلەف نە لە عیلمدا و نە لە عەمەلدا.** [مجموع الفتاوى : 436/7]

**ابن القيم** دەڵێ: **جیاوازی لەنێوان زانستەکانی المتقدمين و المتأخرين وەک ئەو جیاوازییە وایە کە لەنێوانیاندا هەیە لە فەزل و دیندا.** [أعلام الموقعين : 544/5]

**الشاطبي** دەڵێ: **المتأخر لە ڕۆچوون لە عیلمدا ناگات بەو پلەیەی کە المتقدم پێی گەیشتووە.** [الموافقات : 59/1]

ووتم: ئەگەرچی ووتەکانیان بە شێوەیەکی گشتیە دەربارەی فەزڵی زانستی سەلەف بەسەر زانستی خەلەف بەڵام ئەم جیاوازی زانستە لە مامەڵە کردن لەگەڵ کافر و بیدعەچیەکانیش دەردەکەوێ، بێگومان بەهۆی زانستەکەیان بووە کە کەسانی خاوەن کوفر و بیدعەیان گەورە نەکردووە و پلەیان بەرز نەکردۆتەوە و زۆر توند بوونە بەرامبەری، کەچی دەبینین خەلەف پێچەوانەی سەلەفن لەمەدا کوفرەکانی زاناکان دەژمێرن کەچی دەڵێن ئیمامە ڕەحمەتی لێبێ قبوڵ ناکەین تەکفیر بکرێ داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەین و پاساوی بۆ دەهێنینەوە ! بێگومان جیاوازی زانستی سەلەف و خەلەف یەکێکە لە هۆکارەکانی ئەم مامەڵە جیاوازەیان لەگەڵ کەسەکان و گروپەکان.

# چەند زانیارییەک دەربارەی کتێبەکە

**یەکەم:** کتێبەکە لە سێ بەش پێکهاتووە، بەشی یەکەم هێنانی ووتە و ڕیوایەتەکانە دەربارەی زەمکردنی أبو حنيفة کە دابەشم کردووە بۆ سەر دە بڕگە بەپێی ئەو بابەتانەی کە بەهۆیەوە قسەی پێ ووتراوە، بەشی دووەم هێنانی ڕیوایەتەکانە دەربارەی مەدحکردنی أبو حنيفة، بەشی سێیەمیش وەڵامدانەوەی گومانەکانە دەربارەی أبو حنيفة بەتایبەتی و زاناکانی تر بە گشتی.

**دووەم:** کردوومەتە مەرج تەنها ڕیوایەتە صەحیحەکان بهێنم دەربارەی زەمکردنی أبو حنيفة، ڕیوایەتە درۆ و زەعیفەکانم نەهێناوە تەنها کەم نەبێت نەبێت ئەویش بۆ مەبەستی تایبەت هێناومە، وە لە شوێنی خۆیدا ئاماژەم بە مەبەستەکە داوە و ڕوونم کردۆتە کە زەعیفە، بەڵام دەربارەی مەدحکردنی أبو حنيفة هەرچی ڕیوایەتی صەحیح و زەعیف و درۆ هەیە هێناومە، چونکە گەر تەنها صەحیحەکان بهێنم بەردەوام خۆشەویستانی أبو حنيفة دەست بەو ڕیوایەتانە دەگرن و دووبارەیان دەکەنەوە بەبێ ئەوەی بزانن درۆیە یان زەعیفە بۆیە ئەوانیشم هێناوە تا نەڵێن ژمارەیەک ڕیوایەت هەیە دەربارەی مەدحکردنی أبو حنيفة لەم کتێبەدا نەهاتووە.

**سێیەم:** ئەو ڕیوایەتانەی دەربارەی مەدحکردنی هاتوون کە درۆن یان زەعیفن ئاماژەم پێداوە کە هۆکارەکەی چیە، وە ئەو ڕیوایەتانەی کە صەحیحن دەربارەی زەمکردنی هاتوون لە کتێبی السنة-ی عبدالله و تاريخ بغداد-ی الخطيب گەرکەسانی دەمارگیر بۆ أبو حنيفة بشار و مصطفى دوو محققەکەی تاريخ بغداد یان القحطاني محقق-ی السنة بە زەعیفیان دانا بێت بە بیانووی پڕو پوچ ئەوا وەڵامی بیانووەکەم داوەنەتەوە یان لە کتێبی التنكيل نەقلم کردووە، وە ئەو ڕیوایەتانەی کە لەدژی أبو حنيفة هاتوون لەم دوو کتێبەدا گەر بشار عواد یان القحطاني بە صەحیح یان حەسەنیان دانابێت ئەوا قبوڵم کردووە چونکە بەهۆی دەمارگیری ڕوونی ئەوان بۆ أبو حنيفة ئەستەمە ڕیوایەتێک زەعیف بێت بە صەحیحی دابنێن لەکاتێکدا بەدوای بچووکترین بیانوو دەگەڕێن بۆ زەعیف کردنی ڕیوایەتەکان کە هەندێک بیانوویان دەتوانم بە کارەساتی زانستی

ناو ببەم وەک دواتر دەیبینن بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بشار عواد لە تەصحیح کردنی هەندێک ڕیوایەتی کەم هەڵەی کردووە زەعیف بووە بە صەحیحی داناوە، وە ئەو ڕیوایەتانەی عادل آل حمدان محقق-ی السنة-ی عبدالله بە صەحیحی داناوە پشتم پێی نەبەستووە بە تەنها بەڵکو گەڕاوم بەدوای ئەوەی ئایا القحطاني یان الوادعي بە صەحیحیان داناوە گەرووتەی ئەوانیشم دەست نەکەوت ئەوا خۆم بەدوای حاڵی ڕاوییەکانی سەنەدەکە گەڕاوم ئەمەش لەبەر ئەوە نیە کە عادل آل حمدان بە شایستە نەزانم یان سیقەم بە حوکمەکانی نەبێت، بەڵکو لەبەر ئەوەیە ژمارەیەک جاهیلی دەمارگیر بۆ أبو حنیفة هەستیارییان هەیە بەرامبەر عادل آل حمدان بەجۆرێک سەیری دەکەن وەک بڵێی ئەم ڕیوایەتانە ئەو دروستی کرد بێت لەکاتێکدا ئەو تەنها محقق-ە تەحقیقی کتێبەکەی کردووە بەپێی زانستەکەی خۆی حوکمی لەسەر هەندێک لە ڕیوایەتەکان داوە، بۆیە تا ئەم هەستیارییەی خوێنەران کەم بکەمەوە دڵنیایان دەکەمەوە کە لە هیچ ڕیواتێکی کتێبی السنة-ی عبدالله پشتم بە حوکمەکانی عادل آل حمدان نەبەستووە لەگەڵ ئەوەشدا تۆزێک شلە لە تەصحیح کردن، جا هەمان شتیش دەربارەی کوفری ئەشعەرییەکان ڕوویداوە بەرامبەر خالد بن علي المرضي الغامدي هەندێک جاهیلی دەمارگیر بۆ زانا ئەشعەرییەکان دەیانەوێ وای نیشان بدەن کە تەکفیر کردنی ئەشعەرییەکان بوونی نەبووە خالد المرضي دایهێناوە ! باقی کتێبەکانی تریش خۆم حوکمم داوە لەسەر ڕیوایەتەکان بەپێی توانا چونکە کەس حوکمی نەداوە لەسەر ئەم کتێبانە، هەر ئەمەش وایکردووە کتێبەکە بەم شێوەیە دوا بکەوێ چونکە ڕیوایەت هەبووە ڕۆژێکی تەواو پێی خەریک بوومە تا حاڵی ڕاوییەکانم بۆ دەرکەوتووە بەتایبەتی ئەو کتێبانەی دوای سەدەی سێیەم نوسراون لێکۆڵینەوە لە حاڵی ڕاوییەکان زۆر زەحمەتترە، ئەمەش شتێک نیە وەک منەت پێتانی بفرۆشمەوە بێگومان کاتێک حوکم لەسەر کەسێکی وەک أبو حنیفة دەدەین بەپێی ئەم ڕیوایەتانە دەبێت ماندوو بین و لە حاڵی سەنەدەکانیش بکۆڵینەوە ئەمە واجبی سەر شانمە بەڵام ویستم ئەوە بزانن کە ئەم حوکمانەی کە تۆ لەماوەی چەند چرکەیەک دەیخوێنیتەوە هەر یەکێکیان کاتێکی زۆری خایاندووە تا ئەم حوکمەی لەسەر دراوە، وە بێگومان هیچ کارێک بەدەر نابێت لە هەڵە گەر هەڵەتان لەهەر حوکمێک یان هەر شتێکی تر بەدیکرد سوپاستان دەکەم بەشێوەیەکی زانستی بۆمی ڕوون بکەنەوە

منیش بە خۆشحاڵیەوە قبوڵی دەكەم.

**چوارەم:** ئەو كتێبانەی كە بونیان نەماوە زاناكانی تر هاتوون لێیان نەقل كردووە بە سەنەدی خاوەن كتێبەوە ئەوا وەک ئەوە مامەڵەم كردووە كە كتێبەكە بەر دەست بێ، واتا نەم كردۆتە مەرج كە سەنەدی نێوان خاوەنی كتێبەكە و ئەو زانایە بزانم كە كتێبەكەی نەقل كردووە، بەڵام سەنەدی خاوەن كتێبەكە وەک باقی سەنەدەكانی تر چۆتە بەر جەرح و تەعدیل، نموونە: علي بن محمد بن كأس النخعي كتێبەكەی نەماوە كە دەربارەی مەدحی أبو حنيفة نوسیویەتی، بەڵام الخطیب كتێبەكەی النخعي بەر دەست بووە دەڵێ: قال النخعي ئینجا سەنەدەكەی النخعي نەقل دەكات، لێرەدا ناڵێین الخطیب بە النخعي نەگەیشتووە دەبێ سەنەدی نێوان الخطیب و النخعي بزانین مادام زانیمان كتێبەكەی بەردەستە ئیتر كارمان بە سەنەدی نێوانیان نیە، بەڵام سەنەدەكەی النخعي وەک هەموو سەنەدێكی تر لە حاڵی ڕاوییەكانی دەكۆڵینەوە، كتێبەكەی الساجي بەهەمان شێوە كە بوونی نەماوە بەڵام الخطیب و ابن عبدالبر بەردەستیان بووە، جا ڕیوایەتەكان لە بەرژەوەندی أبو حنيفة بێ یان لە دژی بێ جیاوازیم نەكردووە هەردووكیانم قبوڵ كردووە مادام سەنەدی خاوەن كتێبەكە بەردەستە، بەڵام گەر زانایەک لەكتێبێک ڕیوایەتێک نەقل بكات بەبێ ئاماژەدان بە سەنەدی خاوەن كتێب ئەوا حیسابم بۆی نەكردووە چونكە سەنەدەكەی نەهێناوە، نموونە: الذهبي لە كتێبی (مناقب أبي حنيفة وصاحبيه) زۆر جار لە كتێبەكانی پێش خۆی ڕیوایەت نەقل دەكات بەبێ هێنانی سەنەدەكە لێرەدا ڕیوایەتەكە ڕەت دەكەینەوە چونكە نازانین حاڵی سەنەدەكە چۆنە، وە لە سەرچاوەكەدا ئاماژەم پێداوە كە ئەم ڕیوایەتانە فلان زانا لە فلان كتێبدا نەقلی كردووە، وە ئەو خاڵەی باسم كرد شتێک نیە تایبەت بێ بە من بەڵكو زانایان لەسەری ڕۆیشتوون.

**پێنجەم:** هەموو ئەو كتێبانەی كە سودم لێیان بینیوە وەک سەرچاوە ئاماژەم داوە لە كۆتایی كتێبەكە بەناوی دەزگای چاپەكە و ناوی ئەو كەسەی كە تەحقیقی كتێبەكەی كردووە و ژمارەی چاپەكەش گەر ئاماژە بە هەر سێكیان درابێت لە كتێبەكاندا، بەڵام گەر لە كتێبێكدا تەنها دەزگای

چاپەكە نوسرا بێ یان تەنها ناوی محقق ئەوا منیش تەنها ئەوەم نوسیوە یان گەر ژمارەی چاپەكە نەنوسرا بێ منیش نەم نوسیوە، ئەمەش بۆ ئەوەی خوێنەر بە ئاسانی بگەڕێتەوە سەر كتێبەكە چونكە زۆربەی كتێبەكان زیاتر لە جارێک تەحقیق كراون و لە چەند دەزگایەک چاپكراون گەر نەزانرێ كامە چاپە یان كامە تەحقیقە یان چاپی ژمارە چەندە ئەوا زەحمەتە ژمارەی بەرگ و لاپەڕەكە بدۆزرێتەوە، تەنها لە كتێبی (سؤالات أبي داود للإمام أحمد) پشتم بە دوو تەحقیقی جیاواز بەستووە، سەرەتا لەسەر تەحقیقی طارق عوض الله ڕۆیشتم بەڵام لەبەر ئەوەی ووتەیەكی تێدا نەبوو ناچار پشتم بە تەحقیقی زیاد محمد منصور بەست كە لە تەحقیقی ئەودا ووتەكە هەبوو، بۆیە تەنها لەكاتی نەقل كردنی ووتەكانی ئەم كتێبەدا لەژێریەوە نوسیومە كامە تەحقیقە چونكە تەنها لەم كتێبە دوو تەحقیقی جیاوازم بەكار هێناوە.

**شەشەم:** بەهۆی ئەوەی هەردوو كتێبی السنة-ی عبدالله و تاريخ بغداد-ی الخطيب زۆرترین ڕیوایەتی تێدا هاتووە دەربارەی زەم كردنی أبو حنيفة محققەكان تەعلیقیان داوە لەسەر ڕیوایەتەكان لە حاشیەدا، دوو تەحقیقەكەی كتێبی السنة كە بەردەستمە تەحقیقی محمد بن سعيد القحطاني و تەحقیقی عادل آل حمدان، بە حوكمی ئەوەی عادل آل حمدان بەرگری لە أبو حنيفة نەكردووە بۆیە تەنها تەعلیقەكانی القحطاني نەقل دەكەین كە وەک بەرگری كردن لە أبو حنيفة نوسیویەتی حاشیە، جا كاتێک ووترا محقق وادەڵێ واتا القحطاني، بەڵام بۆ كتێبی تاريخ بغداد هەردوو محقق بشار عواد معروف و مصطفى عبدالقادر عطا لە حاشیەدا بەرگریان لە أبو حنيفة كردووە بۆیە بە محقق- تاريخ بغداد (١) و (٢) ئاماژەم پێداون، من لەسەر تەحقیقی بشار ڕۆیشتووم ژمارە (١) بۆ ئەوە، وە ژمارە (٢) بۆ مصطفى-یە.

**حەوتەم:** بەپێی توانا هەڵەی چاپەكانم ئاماژە پێداوە.

# الكوثري (شێتەکەی أبو حنیفة)

محمد زاهد الكوثري ناسراو بە (مجنون أبي حنيفة) شێتەکەی أبو حنیفة، لەبەر دوو هۆکار بە پێویستم زانی کورتەیەک دەربارەی الكوثري باس بکەم.

یەکەم: ناوی الكوثري زیاتر لە 100 دووبارە دەبێتەوە لەم کتێبەدا، بۆ خوێنەر خۆش نیە ناوی کەسێک ئەوەندە جارە بخوێنێتەوە کەچی نەزانێ ئەم کەسە کێیە بۆیە ناسینی بە پێویست دەزانم.

دووەم: بەهۆی زۆری ئەم هەموو فێڵ و درۆ و تەدلیس و تەلبیسەی الكوثري ئەنجامی داوە بە مەبەستی بەرگری کردن لە أبو حنیفة و قسە کردن لەسەر ڕیوایەتەکانی تاریخ بغداد.

خاڵی یەکەم:

محمد زاهد الكوثري ساڵی 1878 لە تورکیا لە دایکبووە، لە ساڵی 1952 لە مصر مردووە، حەنەفی مەزهەبێکی زۆر دەمارگیرە بۆ أبو حنیفة و مەزهەبەکەی هەر بۆیە ناونراوە بە (شێتی أبو حنیفة) لە عەقیدەشدا جەهمیەکی گۆڕ پەرستی پیسە گاڵتە بە عەقیدەی ئەهلی سوننە دەکات، خاوەنی کۆمەڵێک کتێب و تەحقیقە.

خاڵی دووەم:

الكوثري کتێبی (تأنيب الخطيب على ما ساقه في ترجمة أبي حنيفة من الأكاذيب)ی نوسی بۆ ڕەددانەوەی ئەو ڕیوایەتانەی کە الخطيب البغدادي لە کتێبی (تاريخ بغداد) هێناویەتی کە تێیدا زەمی أبو حنیفة کراوە، الخطيب نزیکەی 260 ڕیوایەتی هێناوە دەربارەی زەم کردنی أبو حنیفة، الكوثري تانەی لە 273 ڕاوی داوە لەسەر هیچ ڕیوایەتێک نەوەستاوە ئیللا تانەی لە ڕاوییەک داوە ئەگەرچی ڕاوییەکی ئیمامێکی زۆر گەورەی ئەهلی سوننەش بێت گرنگی بەوە نەداوە گرنگ ئەوەیە ڕیوایەتەکە بە درۆ یان زەعیف ناو ببات و بەرگری لە أبو حنیفة بکات، لە چوار چێوەی ئەم کتێبەدا بەشێک لەو کارەساتە گەورە زانستیانە و فێڵ و درۆ و بوهتان و تەدلیس و تەلبیسەکانی دەهێنین

تا خوێنەر هەڵنەخەڵەتێ بەم كارەی الكوثري وابزانێ هەموو ڕیوایەتەكانی تاريخ بغداد قسەیان لەسەر كراوە و جێگای مشتومڕن، چونكە كەسانێک هەن دڵ نەخۆشن ئەگەرچی وەک الكوثري نەبن بەڵام دڵیان خۆشە بە بەرگری كردن لە أبو حنيفة ئەگەرچی بە ناحەقیش بێت لەسەر حیسابی زانایانی تر بێت، جا هەر ئەوەندە ووترا الكوثري قسەی لەسەر ڕیوایەتەكانی تاريخ بغداد كردووە ئیتر هەمیشە دەیڵێتەوە (ڕیوایەتەكان قسەیان لەسەر كراوە) دەیەوێ بەم ڕستەیەی خۆڵ بخاتە چاوی خەڵكەوە وای نیشان بدات ئەم ڕیوایەتانە تا قیامەت خیلافین و ناتوانرێ صەحیح و زەعیفی لەیەكتر جیا بكرێتەوە یان دەیەوێ سەنگ بۆ ڕەخنەكانی الكوثري دابنێ كە نازانێ الكوثري كێیە كەی ژیاوە كەی مردووە، هەروەک چۆن بینیمان سليمان العلوان لە دەنگێكدا دەربارەی ڕیوایەتەكانی عبدالله بن الإمام أحمد لە كتێبی (السنة) دەڵێ: زۆرینەی زەعیفە ئەوانەشی كە صەحیحن بە نسبەت خاوەنی ووتەكە صەحیحە نەک بە نسبەت أبو حنيفة یان كەسەكە دەڵێ: أبو حنيفة وای ووت و وایكرد، ناڵێ: بیستم وای ووت یان بینیم وایكرد، كەواتە بە چاوی خۆیان و بە گوێی خۆیان ئەم شتانەیان لێی نەبیستووە و ڕیوایەتەكان زەعیفن، هەرچەندە لە بەشی سێیەم وەڵامی ئەم گومانەی سليمان العلوان-مان داوەتەوە، وە لە بابەتی دوای ئەمەش وەڵاممان داوەتەوە بە ناڕاستەوخۆ جا نامەوێ لێرەدا قسەی لەسەر بكەم بەڵام مەبەستم ئەوەیە كە العلوان ووتی ڕیوایەتەكانی السنة-ی عبدالله ئاوایە كەسانێک بەبێ سەیركردنی كتێبی السنة و ڕوانین لە سەنەدەكانی و شێوازی گێڕانەوەكان دەستی بەم ووتەیەی العلوان گرتووە دەیەوێ بە ووتەیەكی 3 خولەكی العلوان 179 ڕیوایەتی عبدالله دەربارەی أبو حنيفة یەكسان بكات بە خۆڵەمێش، جا هەیانە ئەم ووتەیەی العلوان گشتگیر دەكات لەسەر هەموو ڕیوایەتێک یان ووتەیەک دەربارەی أبو حنيفة هاتبێ لە هەر كتێبێكدا بێت هەمیشە دەڵێ: ئەو ووتانەی دەربارەی أبو حنيفة هاتوون زۆرینەی زەعیفن، ئەوانەشی كە صەحیحن دەربارەی خاوەن ووتەكە صەحیحە نەک دەربارەی أبو حنيفة، وە لە ڕیوایەتەكان ڕاوییەكان دەڵێ أبو حنيفة وایكرد و وایووت ناڵێن بینیمان وایكرد و بیستمان وایووت كەواتە زەعیفە، ئیتر ئەم ووتەیەی العلوان كراوە بە قاعیدە دەربارەی أبو حنيفة هەر دەم بكەنەوە ئەم سێ خاڵە باس دەكەن، هەر چەندە لە بەشی سێیەم و بابەتی دواتر بە

بەڵگەوە دەیسەلمێنین العلوان کەوتۆتە هەڵەوە لەم ووتەیەیدا بەڵام ئەو تەنها باسی کتێبی السنة دەکات لە ووتەکەی ئێوە بۆ گشتگیری دەکەن لەسەر هەموو کتێبەکان ؟ بۆیە بە دووری نازانم درۆ و فێڵ و بوهتانەکانی الكوثري-ش بکەن بە کۆڵەگەیەک و پشتی پێدا بدەن و بڵێن هەموو ڕیوایەتەکانی تاريخ بغداد قسەی لەسەرکراوە لەکاتێکدا الكوثري گەرسەنەد وەک خۆر بێت هەموو ڕاوییەکانی ئیمام بن هیچ بە خەیاڵی دانایەت تانەیان لێ بدات بە ناحەق تەنها بۆ بە زەعیف دانانی ڕیوایەتەکە لەپێناوی أبو حنيفة، هەربۆیە کاتێک عبدالرحمن بن يحيى المعلمي اليماني کتێبی (تأنیب الخطیب)ی الكوثري خوێندەوە خۆی بۆ نەگیرا وەک باسی دەکات بەهۆی زۆری درۆ و بوهتان و تانەدانی الكوثري لە پێشەوایانی ئەهلی سوننە بە چاکی زانی کتێبێک بنوسێ بۆ ڕەددانەوەی ئەم کتێبەی الكوثري، جا ئەوە بوو کتێبی (التنكيل بما في تأنيب الكوثري من الأباطيل)ی نوسی کە لە چوار چێوەی ئەم کتێبەدا زۆرێک لە ووتەکانی الكوثري لە (التأنيب) وە ووتەکانی المعلمي لە (التنكيل) نەقل دەکەین کە دەری دەخات الكوثري چ دەججالێک بووە، جا بۆیە تۆی خوێنەر بەوە هەڵنەخەڵەتێی بڵێی زۆربەی ڕیوایەتەکانی تاريخ بغداد قسەی لەسەر کراوە چونکە من هەموو ووتەکانی الكوثري یان هەردووک محقق-ی تاريخ بغداد دەهێنم دەربارەی ڕیوایەتەکان بۆ ڕەددانەوەیان ئیتر ئەمە پیشەی الكوثري-ە پاکترین سەنەدی بۆ بهێنە لە جیهان کە زەمی أبو حنيفة کراب بوو تێیدا تانەی لێدەدات و هەرگیز قبوڵی ناکات.

هەندێک لەو ئیمام و زانا ناودارانەی ئوممەت کە الكوثري تانەی لێداون:

هاوەڵی بەڕێز أنس بن مالك، هاوەڵی بەڕێز عبدالله بن عباس، ئیمام مالك، ئیمام الشافعي، ئیمام أحمد، سفيان الثوري، سفيان بن عيينة، الحميدي، علي بن المديني، نعيم بن حماد، البخاري، يعقوب بن سفيان الفسوي، ابن أبي حاتم، عبدالله بن الإمام أحمد، صالح بن الإمام أحمد، حرب الكرماني، عثمان بن سعيد الدارمي، ابن عدي، ابن تيمية، ابن القيم ... جگە لەوانەش، جا تانەی ئاوا ناشرین لە هەندێکیان دەدات تەزوو بە گیانت دادێت لەوە دەرچووە کە تەنها بە درۆ بڵێ زەعیفە گاڵتە بە عەقیدەیان دەکات زۆر جار.

# وەڵامدانەوەی دوو گومان لە ڕووی زانستی فەرموودە

پێش نەقل کردنی ڕیوایەتەکان دوو گومان هەیە دەمەوێ لە سەرەتاوە ئاماژەیان پێ بدەم چونکە زۆر دێنەوە بەردەممان لە ڕیوایەتەکاندا بۆیە لێرەدا یەکلایی دەکەینەوە پێویست ناکات هەموو جارێک هەمان شت دووبارە بکەینەوە.

**گومانی یەکەم:** کاتێک زانایەک کە توانای لەبەر کردنی لاوازە لە ڕیوایەت کردنی فەرموودەدا بەڵام لەڕووی عەدالەتەوە جێگای متمانەیە، ئەوا ئەم زانایە هەر شتێک ڕاستەوخۆ بگێڕێتەوە لە أبو حنيفة-ەوە بە زەعیفی دادەنێن بە بیانووی ئەوەی کە توانای لەبەر کردنی لاوازە.

لە وەڵامی ئەم گومانەدا دەڵێین:

ئەم زانایە کاتێک بەسەر هاتێک یان ووتەیەک دەگێڕێتەوە کە لەنێوان خۆیی و أبو حنيفة ڕوویداوە یان خۆی ئامادەی ڕووداوەکە بووە ئەوا لەم حاڵەتەدا ووتەکەی قبوڵ دەکەین و بە صەحیحی دادەنێین گەر ڕاوییەکانی تر سیقە بن، واتا گرنگی بەوە نادەین خودی خاوەن بەسەرهاتەکە یان ووتەکە توانای لەبەر کردنی چۆنە، چونکە ئەو ووتەیەک یان ڕووداوێک دەگەڕێتەوە کە بەسەر خۆی هاتووە یان خۆی ئامادە بووە تێیدا جا توانای لەبەر کردنی هەر چۆنێک بێت گرنگ نیە چونکە لە کەسانی ترەوە ڕیوایەتی ناکات تا بڵێین زەعیفە، هەر بۆیە لەکاتی قبوڵ کردنی شایەتیدا تەنها عەدالەتی شایەتەکان کراوەتە مەرج نەک توانای لەبەر کردنیان، بۆ نموونە شایەتحاڵێک کە ڕووداوێکی بینیوە لە دادگا وەکو شایەت ئامادە دەبێت بۆ شایەتیدان و گێڕانەوەی ڕووداوەکە لەسەر قازی پێویست نیە توانای لەبەر کردنی ئەم شایەتە بزانێ تەنها مەرجە لەڕووی عەدالەتەوە جێگای متمانە بێ، بۆیە کاتێک هاوڕێیەکت کە سیقەت پێیەتی هەر بەسەر هاتێکت بۆ دەگەڕێتەوە قبوڵی دەکەیت بەبێ بیر کردنەوە لەوەی ئایا ئەم هاوڕێیەت توانای لەبەر کردنی چۆنە، بەڵام کە دێتە سەر ڕیوایەت کردن و گێڕانەوەی فەرموودە یان بە سەنەدەوە ئەوکات دەخرێتە ژێر بنەماکانی جەرح و تەعدیل توانای لەبەر کردنی لاواز بێت لێی قبوڵ ناکەین،

گەر بێتو هەر لەڕووی عەقڵەوە سەیری بکەن دوور لەلایەنە زانستیەکە کاتێک من ڕووداوێک بە چاوی خۆم دەبینم یان بەگوێی خۆم دەبیستم ئەوا زۆر بە ئاسانی هەر کاتێک بمەوێ دەتوانم بیگێڕمەوە گەر ووشەکانیش هەموو دەقا و دەق نەگێڕمەوە ئەوا هەر هیچ نەبێت بە شێوەیەک دەیگێڕمەوە کە ڕاستی ڕووداوەکە یان ووتەکە ناگۆڕێ ئەگەرچی چەندین ساڵیشی بەسەردا تێپەڕ بوو بێت، بەڵام کاتێک فەرموودەیەک بە سەنەدەوە لە کەسانی ترەوە دەبیستم ئەوا لەبەر کردنی ڕاوییەکانی سەنەدەکە و مەتنی فەرموودە پێویستی بە توانایەکی باشی لەبەرکردن هەیە، جا ئەوەی مەبەستمە لێرەدا ئەوەیە هەندێک ڕیوایەت هەیە لە کتێبی السنة-ی عبدالله یان تاريخ بغداد-ی الخطيب ڕاوییەکانی هەموو سیقەن تا دەگات بە زاناکە زەعیفەکە کە ڕووداوی نێوان خۆیی أبو حنيفة دەگەڕێتەوە، بۆ نموونە سەنەدێکت هەیە لە الخطيب تا دەگات بە علي بن عاصم هەموو ڕاوییەکان سیقەن خاوەنی ووتەکە یان ڕووداوەکە علي بن عاصم-ە لە توانای لەبەر کردنی لاوازە، علي بن عاصم دەڵێ: من و أبو حنيفة بەیەکەوە بووین من ئاوا و ئاوام ووت، ئەویش ئاوا و ئاوای ووت، لێرەدا هەموو ڕاوییەکان سیقەن تا دەگاتە خاوەنی بەسەرهاتەکە کە علي بن عاصم-ە، سەیر دەکەی محقق-ی ئەم دوو کتێبە دەڵێن: سەنەدەکەی زەعیفە چونکە علي بن عاصم زەعیفە! نموونەی لەم شێوەیەی زۆر بەکارهێناوە بۆ تەزعیف کردنی ڕیوایەتەکان، ئێ لێرەدا علي بن عاصم خۆی خاوەنی ووتەکەیە ڕاوی سەنەدەکە نیە، شتێک دەگەڕێتەوە کە بەسەر خۆیی و أبو حنيفة هاتووە نەک شتێک بە سەنەدەوە لەکەسانی ترەوە ڕیوایەت بکات تا بڵێین زەعیفە، گەر بەم بیانووە ئەم ڕیوایەتانە تەزعیف بکەین ئەوا هەر یەکێک لە ئێمە هەر بەسەرهاتێک بگێڕێتەوە کە بەسەر خۆی هاتووە دەبێ ڕەتی بکەینەوە بە بیانووی ئەوەی ئەم کەسە توانای لەبەر کردنی زەعیفە، جا لەوەش کارەساتتر ئەوەیە بۆ نموونە زانایەک کە توانای لەبەر کردنی لاوازە دەڵێ: أبو حنيفة گومڕایە، ڕاوییەکانی سەنەدەکە هەمووی سیقەن کەچی دەبینی ئەم دوو محقق-ە دەڵێن: سەنەدەکە زەعیفە چونکە ئەو زانایەی کە ئەم قسەیەی کردووە توانای لەبەر کردنی لاوازە ! ئێ باشە خۆ هیچ شتێکی ڕیوایەت نەکردووە تا باسی لاوازی بکەین هاتووە ڕەئی خۆی دەربڕیوە دەربارەی أبو حنيفة لاواز بێت یان نا ئەمە کەی پەیوەندی بە بابەتەکەوە هەیە ؟! بۆ نموونە أبو

حنيفة تواناى لەبەر كردنى لاوازە بەڵام دەڵێ: فلان زانا گومڕایە، دەكرێ بڵێین ئەم ووتەیە زەعیفە چونكە أبو حنيفة زەعیفە لە ڕیوایەت كردندا ؟ ئەو تەنها ڕەئی خۆی ووتوە دەربارەی زاناكە هیچ شتێكی ڕیوایەت نەكردووە تا بڵێین زەعیفە، جا كارەساتی زانستی لەم شێوەیە لەلایەن دەمارگیران بۆ أبو حنيفة ڕوویداوە دەبینی بەم بیانووە بەتاڵانە ڕیوایەتەكان تەزعیف دەكەن بۆیە لێرەوە ئەم باسەم ڕوونكردەوە تا هەر ڕیوایەتێكی لەم شێوەیە هاتە پێشمان بۆتان ڕوون بێ كە باسەكە چۆنە، جا بۆ ئەوەی نەڵێن ئەمە زانستە و بنەمای خۆی هەیە و ئەم قسە بازاڕی و عەقڵانیانە قبوڵ ناكەین ئەوا نموونەش لەم جۆرە نیشان دەدەم تا بزانن ئەمە شتێك نیە كە بە عەقڵ و ئارەزووی خۆی دروستم كردبێ.

**البخاري** دەڵێ: حدثنا عبدالرحمن بن شيبة قال أخبرني يونس بن يحيى بن نباتة عن عبيدالله بن موهب عن شهر بن حوشب ووتی: **لەگەڵ ابن عمر چووینە دەرەوە، سالم بە ابن عمر-ی ووت: كاتی نوێژە ئەی باوكی عبدالرحمن.** [الأدب المفرد : 45]

ووتم: الألباني دەڵێ: سەنەدەكەی زەعیفە بەهۆی لاوازی تواناى لەبەركردنی شهر بن حوشب.

بڕوانە شهر بن حوشب خۆی لە ڕووداوەكەدا ئامادەبووە بەڵام لەبەر ئەوەی تواناى لەبەركردنی لاوازە الألباني بەهۆیەوە ڕیوایەتەكە تەزعیف دەكات، جا لێرەدا دەبوایە الألباني لە حاڵی ڕاوییەكانی تر بكۆڵێتەوە نەك شهر بن حوشب چونكە ئەو شتێك باس دەكات كە خۆی ئامادەی بووە وەك شایەتحاڵ وایە، هەر بۆیە خاوەنی كتێبی (الغصن الداني على مصنفات الألباني) لە تەعلیق دانی لەسەر ئەم حوكمەی الألباني دەڵێ: **ئەوەی الألباني ووتی جێگای تێڕامانە، چونكە شهر بن حوشب ووتەی سالم نەقل دەكات كە بە باوكی ووتوە كاتی نوێژە ئەی باوكی عبدالرحمن، كەواتە ڕیوایەتەكە مەقطوعە چونكە شهر بن حوشب ئەو ووتەیەی نەقل كردووە كە لە سالم-ی بیستووە، وە بەپێی ووتەكەی الألباني كە دەڵێ شهر بن حوشب لاوازە لەڕووی لەبەر كردندا، ئایا بە شهر بن حوشب دەووترێ: لەبەر ئەوەی تۆ زەعیفی ئەم ووتەیەت لێ قبوڵ ناكەین چونكە تەنها بوونی تۆ لە سەنەد دا دەبێتە هۆی تەزعیف كردن ؟! وەڵام: بە زەعیف دانانرێ نەقلەكەی بۆ چیرۆكێك كە بەسەر**

**خۆیدا هاتووە هەروەک لێرەدا ڕوویداوە، چونکە کەسی زەعیف کاتێک قسەیەک دەکات کە دراوەتە پاڵ خۆی یان ڕووداوێک دەگێڕێتەوە کە لەبەردەمی ڕوویداوە ئەوا لێرەدا هیچ پەیوەندی بە حوکمدان لەسەر سەنەد نیە، بەڵکو حوکم لەسەر ئەو سەنەدە دەدرێت کە دەگات بە ئەو، جا بەم پێیە ئەم سەنەدە مەقطوع و صەحیحە لە شهر بن حوشب-ەوە، والله أعلم.**

[الغصن الداني على مصنفات الألباني ومعه التذييل المرغوب : 342]

ووتم: کە دەڵێ مقطوعە واتا ووتەی تابعیە چونکە سالم تابعیە، مەقطوع بەمانای پچڕان نایەت لە سەنەد ئەویان پێی دەووترێ منقطع، هەر چەندە ئەم دەستەواژانە زۆر سەرەتایین بەڵام بۆ ئەوەی هەموو خوێنەرێک لای ڕوون بێت ڕوونی دەکەمەوە، جا بڕوانە هەمان ئەو شتەی ووت کە من باسم کرد، شهر دەڵێ: بیستم سالم ئاوای بە باوکی ووت، جا شهر زەعیفە یان نا هیچ پەیوەندی بە حوکمی سەنەدەکە نیە بەڵکو بۆ حوکمدان لەسەر سەنەدەکە دەبێ لە حاڵی ڕاوییەکانی تر بکۆڵینەوە کە ڕیوایەتی ئەم بەسەرهاتە دەکەن، بەهەمان شێوە کاتێک زانایەکی زەعیف دەڵێ: بیستم أبو حنیفة ئاوای ووت، کارمان بەوە دانیە ئەم زانایە زەعیفە یان نا لەڕووی لەبەر کردنەوە بەڵکو لە حاڵی ڕاوییەکانی تر دەکۆڵینەوە کە ئەم بەسەرهاتەیان ڕیوایەت کردووە، جا دوای ئەم ڕوونکردنەوەیە لەهەر شوێنێک حاڵەتی ئاوا هاتە پێشمان ئاماژە بەم نوسراوەی ئێرە دەدەم کە خوێنەر بگەڕێتەوە سەری، ئەم ووتانە دووبارە ناکەمەوە.

**البخاري** دەڵێ: حدثنا سعيد بن عفير قال حدثني الليث قال حدثني عبدالرحمن بن خالد عن ابن شهاب عن سالم بن عبدالله أن أباه حدثه أن **رسول الله ﷺ قال: (بينا رجل يجر إزاره إذ خسف به، فهو يتجلجل في الأرض إلى يوم القيامة).** [صحيح البخاري : 5790]

**البخاري** دەڵێ: حدثنا عبدالله بن محمد حدثنا وهب بن جرير أخبرنا أبي عن عمه جرير بن زيد قال كنت مع سالم بن عبدالله بن عمر على باب داره فقال سمعت أبا هريرة سمع النبي ﷺ ... نحوه.

ووتم: البخاري ئەم فەرموودەیەی بە دوو سەنەد هێناوە وەک دەبینن، سەنەدی یەکەم ابن شهاب الزهري لە سالم بن عبدالله بن عمر ئەویش لە عبدالله بن عمر ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ.

سەنەدی دووەم جریر بن زید لە سالم بن عبدالله بن عمر ئەویش لە أبو هريرة ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ.

کەواتە جیاوازی ئەم دوو سەنەدە بەم شێوەیە:

الزهري عن سالم عن ابن عمر

جرير عن سالم عن أبي هريرة

الزهري فەرموودەکەی دایە پاڵ ابن عمر، بەڵام جریر فەرموودەکەی دایە پاڵ أبو هريرة، ئایا کامەیان صەحیحترە ؟ فەرموودەکە هی ابن عمر-ە یان هی أبو هريرة-یە ؟

لەم حاڵەتەدا سەیری هەردووک ڕاوییەکە دەکرێ کامیان حفزی پتەوترە کامیان زیاتر مولازەمەی شێخەکەی کردووە، جا گەر سەیری حاڵی الزهري و جریر بن زید بکەین هەر بەراوورد ناکرێن الزهري چیایە قسەی لەسەر ناکرێ بەڵام جریر صدوق-ە واتا نەگەیشتۆتە پلەی ثقة، گەر بەراووردیان بکەین لەڕووی شێخەوە شێخەکەیان لەم ڕیوایەتەدا سالم-ە الزهري یەکێکە لە تایبەتی ترین و چەسپاو ترین قوتابی سالم-ە بەڵام جریر بەم شێوەیە نیە، جا بەپێی ئەم بەراووردانە بێت بە هەموو شێوەیەک سەنەدەکەی الزهري صەحیحترە لە سەنەدی جریر، بەڵام با بزانین ابن حجر چی دەڵێ دەربارەی ئەم دوو سەنەدە.

**ابن حجر** دەڵێ: **جریر بن زید هیچ فەرموودەیەکی نیە لە صحيح البخاري جگە لەم فەرموودەیە نەبێت، جریر لەم فەرموودەیە موخالەفەی الزهري کردووە، ووتی: عن سالم عن أبي هريرة، الزهري-ش دەڵێ: عن سالم عن أبيه، بەڵام لەلای البخاري عن سالم عن أبيه و عن سالم عن أبي هريرة هەردووکیان بەهێزە بەهۆی زۆر بەهێزی توانای لەبەرکردنی الزهري و شارەزایی بە فەرموودەکانی سالم، وە بەهۆی ووتەکەی جریر بن زید کە ووتی: (كنت مع سالم على باب داره، فقال سمعت أبا هريرة) -واتا: من لەگەڵ سالم بووم لەبەر دەرگای ماڵەکەی، جا ووتی: بیستم أبو هريرة- ئەمە ئاماژەیە کە جریر ئەم فەرموودەیەی لەبەرکردووە لە سالم-ەوە.**

[فتح الباري : 263/13]

ووتم: گەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە جرير بن زيد دەڵێ: لەگەڵ سالم وەستاوە لەبەر دەرگای ماڵیان ئەوا بێگومان البخاري ڕیوایەتەکەی الزهري بە صەحیح دەزانی کەچی لەگەڵ ئەوەی کە جرير بەراوورد ناکرێ لەگەڵ الزهري بەڵام شێوازی گێڕانەوەکەی دیارە ڕیوایەتەکەی زەبت کردووە، هەروەک چۆن کەسێک دەڵێ: زید وایووت، یەکێکی تر دەڵێ: زید وایووت، وە ئەم جلەی لەبەردا بوو یان لە فلان شوێن بوو یان لە فلان حاڵەتدا بوو کاتێک قسەکەی کرد، ئەوەی دووەمیان لە شێوازی گێڕانەوەکەی دیارە کە ووتەکەی بە باشی لەبەر کردووە سەرەڕای گێڕانەوەی ووتەکە شوێنەکەشی لە یاد ماوە یان هەندێک ڕووداوی لاوەکی لە یاد ماوە هاوکات لەگەڵ ووتەکەدا، جا کاتێک سەنگ بۆ ڕیوایەتەکەی جرير دابنرێ بەرامبەر ڕیوایەتی الزهري بەهۆی شێوازی گێڕانەوەکەی، ئەوا شتێکی زۆر بێ مانایە کە کاتێک زانایەک دەڵێ من لەگەڵ أبو حنيفة بووم ئەو ئاوای پێم ووت منیش ئاوام پێی ووت، بووترێ ئەم ڕیوایەتە زەعیفە چونکە ئەم زانایەی کە دەیگێڕێتەوە زەعیفە.

**گومانی دووەم:** خاڵێکی تریش کە کراوە بە بیانوو بەهۆیەوە زۆرێک لە ڕیوایەتە صەحیحەکانی پێ ڕەت دەکەنەوە ئەویش ئەوەیە دەڵێن: فلان زانا ووتی: أبو حنيفة ئاوای ووت، ئاوای کرد، بەڵام ئەم زانایە ناڵێ خۆم بیستم کە أبو حنيفة ئاوای ووت یان خۆم بینیم ئاوای کرد، ناڵێ سمعت یان رأيت، تەنها دەڵێ وای ووت و وایکرد، ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئەم زانایە ئەم شتەی لێ نەبیستووە یان لێی نەدیوە بۆیە ڕیوایەتەکە زەعیفە.

لە وەڵامی ئەم گومانەدا دەڵێین:

ئەم بابەتە بە شەرطی البخاري و شەرطی مسلم ناسراوە لای زانایان، شەرطی البخاري وەک باسکراوە دەربارەی ئەو ڕیوایەتانەی کە بە صیغەی محتمل هاتوون واتا ئەگەر هەیە متصل بن و ئەگەریش هەیە منقطع بن وەک (عن فلان ، قال فلان) بریتیە لە دوو شت (اللقيا والمعاصرة) واتا ئەو ڕاوییەی کە لە ڕاوی سەروو خۆی ڕیوایەت دەکات بە صیغەی (عن یان قال) دەبێ ئەم دوو مەرجە هەبێت لەنێوانیان، یەکەمیان: (المعاصرة) واتا هاوسەردەمی بوون، بێگومان ئەم دوو ڕاوییە دەبێت لەیەک سەردەمدا ژیابن تا حوکم بدرێ بەوەی کە سەنەدەکە متصل-ە ڕاوییەک ساڵی 200

مردووە ڕاوییەک ساڵی 201 لەدایکبووە ئێ چۆن بە ڕاوییەکەی تر گەیشتووە کە پێش لەدایکبوونی خۆی مردووە ؟ بێگومان دەبێ هەردووکیان لەیەک سەردەمدا ژیا بن، دووەمیان: (اللقیا) بەیەکتر گەیشتن ئەمەش مەرجێکە کە جێگای سەنگە چونکە ڕەنگە دوو ڕاوی لەیەک سەردەمدا بژین بەڵام هەرگیز بەیەکتر نەگەن، بۆ نموونە ئەمڕۆ چەندین زانا هەیە کە لە ژیاندان بەڵام تا ئەوکاتەی دەمرن بۆت نارەخسێ پێیان بگەیت زانستیان لێوەر بگریت بۆیە البخاري دەڵێ: تەنها ئەوەندە بەس نیە کە بزانین لەیەک سەردەمدا ژیاون دەبێ بزانین کە بەیەک گەیشتوون ئەگەر بۆ جارێکیش بێت، تەنانەت هەندێک دەڵێن بەوەندەش واز ناهێنێت کە بەیەک گەیشتبن دەبێ چەسپا بێ کە لەم بەیەک گەیشتنەدا فەرموودەی لێ بیستووە، چونکە چەندین تابعی هەیە البخاري لە کتێبی (التاريخ الكبير) لە ژیاننامەکەیاندا دەڵێ: گەیشتووە بە فلان هاوەڵ بەڵام هیچی لێ نەبیستووە، ئەم مەنهەجەش دوو دیارترین زانا کە پەیڕەویان کردبێ البخاري و شێخەکەیەتی بەناوی علي بن المديني، لە بەرامبەردا شەرطی مسلم کە وەک خۆی لە پێشەکی صەحیحەکەیدا باسی کردووە و هێرشی توندە کردۆتە سەر ئەوانەی کە لەسەر شەرطی پێشوون بەڵام بێ ناو هێنانی کەسەکان، گەر ڕاوی بە صیغەی محتمل ڕیوایەت لە ڕاوییەکی تر بکات مسلم ئەوە دەکات بە مەرج کە لەیەک سەردەمدا ژیا بن واتا (المعاصرة) بەڵام بەیەک گەیشتن (اللقيا) ناکات بە مەرج بەڵام دەڵێ بەو مەرجەی ئەگەری بەیەک گەیشتن هەبێ و هیچ بەڵگەیەکیش نەبێ کە بیسەلمێنێت ئەم دوو ڕاوییە بەیەکتر نەگەیشتوون، بۆ نموونە دوو ڕاوی هاوسەردەمن یەکێکیان لە عیراق دەژی ئەوی تریان لە یەمەن، گەر عیراقیەکە چوو بێت بۆ یەمەن یان یەمەنیەکە چوو بێت بۆ عیراق ئەوا بێگومان لێرەدا ئەگەر هەیە کە بەیەک گەیشتبن، وە ئەگەر ڕاوییەک لە عیراق بێت هەرگیز گەشتی نەکردبێ واتا لە عیراق نەچوو بێتە دەر، ڕاوییەکی تر لەهەمان سەردەم ژیاوە خەڵکی یەمەنە ئەویش هەرگیز گەشتی نەکردووە لە یەمەن نەچۆتە دەر ئەمە بەڵگەیە کە ئەم دوو ڕاوییە بەیەکتر نەگەیشتوون یان دەق هەیە لە ژمارەیەک زاناوە کە دان بەوە دەنێن فلان بە فلان نەگەیشتووە، یان جاری وا ڕاوییەکە خۆی دانی پێدەنێت دەڵێ چووم بۆلای کە گەیشتمە شارەکە ووتیان مردووە، ئەمانە بەڵگەن کە ئەم دوو ڕاوییە بەیەکتر نەگەیشتوون، کەواتە گەر ئەگەری بەیەک گەیشتن هەبوو، وە هیچ

بەڵگەیەكیش بە دەستەوە نەبوو كە ئەم دوو ڕاوییە بەیەكتر نەگەیشتوون ئەوا لەلای مسلم بە متصل هەژمارە، وە تەدلیس خاڵێكی ترە كە لەلای البخاري و مسلم و هەموو زانایاندا سەنگی بۆ دادەنرێ لەكاتی ڕیوایەت كردندا بە صیغەی (عن فلان ، قال فلان) كە لای زۆرێک بە عەنعەنەی مودەللیس وەسف دەكرێ ئەم بابەتە، چونكە كەسی مودەللیس كاتێک كە دەڵێ عن فلان یان قال فلان ڕەنگە لەنێوان خۆی و ئەم فلانەدا كەسێک یان زیاتر هەبێت كە زەعیف بێت بەڵام ئەو دەیشارێتەوە بەم صیغەیە دەری دەبڕێ، جا لەم بابەتەدا لەنێوان المتقدمین و المتأخرین خیلاف هەیە، المتأخرین دەڵێن: ڕاوی مودەللیس هەر كاتێک بە صیغەی محتمل ڕیوایەت بكات واتا بڵێ: عن فلان یان قال فلان ئەوا بە زەعیف دادەنرێ تا ئەو كاتەی تەصریح بە سەماع دەدات واتا دەڵێ: سمعت فلان یان حدثني فلان، بەڵام لەلای المتقدمین ئەم بابەتە بەم شێوەیە نیە كە عەنعەنەی مودەللیس بە ڕەهایی ڕەت بكەنەوە بەڵكو تەفصیلی پێدەدەن بەم شێوەیە:

ڕاوییەكان لە تەدلیس دا لە یەک ئاست نین هەیانە تەدلیسی زۆرە هەیانە تەدلیسی كەمە، جا ئەو ڕاوییەی كە تەدلیسی زۆرە تا نەڵێ حدثنا یان سمعت یان أخبرنا یان أنبأنا لێی قبوڵ ناكرێ گەر ووتی عن فلان یان قال فلان ڕەت دەكرێتەوە، یعقوب بن شیبة السدوسي لە علي بن المدیني دەپرسێ: ڕاوی مودەللیس كەی ڕیوایەتەكانی قبوڵ دەكرێ ؟ علي بن المدیني دەڵێ: گەر تەدلیسی زۆر بوو لێی قبوڵ ناكرێ تا دەڵێ: حدثنا. بۆ نموونە كەسێكی وەک الأعمش كە تەدلیسی زۆرە علي بن المدیني كە پرسیاری لێدەكرێ دەربارەی ڕیوایەتی الأعمش لە مجاهد دەڵێ: لێی قبوڵ ناكرێ تا دەڵێ: سمعت، ئەمەش نزیكەی 10 فەرموودە دەبێت كە لێی بیستووە، وە هەروەها علي بن المدیني دەربارەی ڕیوایەتی الأعمش لە أبو سفیان طلحة بن نافع دەڵێ: زیاتر لە 100 فەرموودەی لێ ڕیوایەت كردووە تەنها 4 فەرموودەی لێوە بیستووە، جا كە ڕاوییەک بەم شێوەیە تەدلیسی زۆر بێت یان بزانرێ كە تەدلیسی زۆرە لە ڕیوایەتەكانی شێخێكی دیاریكراو ئەوا لە ڕیوایەتەكانیدا تا تەصریح نەدات بە سەماع لێی قبوڵ ناكرێ واتا دەبێ بڵێ سمعت یان حدثنا یان أخبرنا یان أنبأنا، بەڵام گەر تەدلیسی كەم بوو یان هەر مودەللیس نەبوو ئەوا ڕیوایەتی قبوڵ دەكرێ لەلای المتقدمین گەر تەصریحیش نەدات بە سەماع، هەروەک علي بن المدیني ووتی: گەر تەدلیسی زۆر بوو قبوڵ ناكرێ

تا دەڵێ: حدثنا، کەواتە گەر تەدلیسی کەم بوو قبوڵ دەکرێ ئیللا مەگەر زانایەکی ئەهلی ئەم زانستە بە دیاریکراوی بڵێ ئەم ڕاوییە لەم ڕیوایەتەدا تەدلیسی کردووە، گەر مودەللیسیش نەبوو ئەوا هەر هیچ، بۆیە نابینین هیچ کام لە المتقدمین فەرموودەیەک تەزعیف بکەن تەنها بەهۆی بوونی عەنعەنەی مودەللیس، بەڵکو بەوە تەزعیفی دەکەن ئایا ڕاوییەکە لەم ڕیوایەتەدا تەدلیسی کردووە یان نا، کەواتە ئەنجامدانی تەدلیسەکە عیللەتە بۆ تەزعیف کردن، نەک عەنعەنەی مودەللیس بە ڕەهایی تەزعیف بکرێ وەک مەنهەجی المتأخرین کە دەڵێن: هەر کات ڕاوی مودەللیس ووتی: عن فلان، ئەوا زەعیفە ! کە ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە، بۆیە شێخ ناصر الفهد لە کتێبە ناوازەکەیدا دەڵێ: گەر بێتو ئەو فەرموودانە کۆ بکەمەوە کە زانایانی المتقدمین بە صەحیحیان داناوە سەنەدەکەش ڕاوی مودەللیسی تێدایە کە بە عەنعەنە ڕیوایەتی کردووە ئەوا دەبێت بەلانی کەم موجەلەدێک بنوسم. جا ئێمەش لەم کتێبەدا بە هەمان مەنهەجی المتقدمین مامەڵە دەکەین لەگەڵ ڕیوایەتی مدلس گەر ڕاوییەکە مودەللیس نەبوو یان تەدلیسی کەم بوو یان ناسراو بوو بە ڕیوایەت کردن لەو شێخەی کە فەرموودەکەی لێوە ڕیوایەت کردووە بە عەنعەنە ئەوا قبوڵی دەکەین، وە لەکاتی هاتنە پێشی ڕیوایەتی لەم شێوەیە لەناو کتێبەدا ئاماژەمان بە حاڵی ڕاوییەکە داوە لە ڕووی تەدلیسەوە هەروەها ئاماژەمان بە حاڵی ڕاوییەکە داوە لە ڕیوایەت کردنی لە شێخەکەی، بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی مەنهەجی المتقدمین لە تەدلیس ئەوا کتێبەکەی ناصر الفهد بخوێنەوە [منهج المتقدمين في التدليس] هەروەها کتێبی [منهج الإمام علي بن المديني في إعلال الحديث] فەصلی سێیەم (العلل المتعلقة بالاتصال والانقطاع) لە نوسینی: نضال إبراهيم ذيب ثلجي.

جا سەبارەت بە بەهێزی و تۆکمەیی شەرطی البخاري و مسلم بێگومان شەرطی البخاري بەهێزترە ئەمە تەنها بە عەقڵ دەزانرێ بەبێ ڕۆچوون تێیدا، بەڵام لێرەدا باسی ئەوە دەکرێ کامیان بەهێزترە نەک کامیان صەحیحە و کامیان زەعیفە، پێویستە ئەوە بزانرێ کە دەڵێین شەرطی البخاري بەهێزترە مانای ئەوە نیە شەرطی مسلم زەعیفە و قبوڵ نیە، بەڵکو هەردووکیان قبوڵ

كراون بەڵام وەک لایەنی بەهێزی گەر بەراوورد بکرێن بێگومان شەرطی البخاري بەهێزترە، وە ئەوەی بڵێ شەرطی مسلم قبوڵ ناکەم و بەلامەوە بە منقطع حیسابە ئەوا مولزەم دەبێت بەوەی کە کۆمەڵێک فەرموودەی صحیح مسلم بە زەعیف دابنێت بەم هۆیەوە.

دەربارەی ڕیوایەتەکانی زەمکردنی أبو حنیفة تێیدایە بە صیغەی سەماع واتا ڕاوی دەبێ بینیم یان بیستم یان پێی ووتم، وە هەیانە بە صیغەی محتمل-ە کە ڕاوی دەڵێ عن أبي حنيفة یان قال أبو حنیفة، لەم حاڵەتەی دووەم گەر ڕاوییەکە هاوسەردەمی بێت و لەشوێنی تر بیستنی هەبێ لە أبو حنیفة ئەوا لەسەر شەرطی البخاري بە متصل هەژمار دەکرێ، وە ئەگەر هاوسەردەمی بێت بەڵام لە هیچ شوێنێک نەهاتبێ کە بیستنی هەیە لە أبو حنیفة تەنها ئەگەر هەیە کە بەیەکتر گەیشتبن ئەوا لەسەر شەرطی مسلم بە متصل هەژمار دەکرێ گەر تەدلیسی زۆر نەبێت ، جا ڕەت کردنەوەی ڕیوایەت بەم بیانووە کارێکی زۆر هەڵەیە بەڵکو دەبێت ڕەچاوی ئەم شتانەی سەرەوە بکرێت کە باسمان کرد ئەگینا ڕەت کردنەوەی عەشوائی مولزەمتان دەکات بە ڕەت کردنەوەی ژمارەیەک فەرموودەی صحیح مسلم وەک باسمان کرد، وە ئەوەی کە باسکرا وانەبێ تەنها لە ڕیوایەتەکانی زەمکردن پشتی پێ ببەستین بەڵکو لە ڕیوایەتەکانی مەدحکردنیش قبوڵی دەکەین، چەندین ڕیوایەت هەیە لە بەشی دووەم بە صیغەی (عن یان قال) ڕەتمان نەکردۆتەوە بەم بیانووە مادام زانیبێتمان بەیەک گەیشتن هەیە یان ئەگەری بەیەک گەیشتن هەیە و ڕاوییەکەش مودەللیس نیە.

## بڕگەی یەکەم:

## بێ ڕێزی کردنی بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ وە ڕەتکردنەوە و گاڵتەکردن بە فەرموودەکانی.

پێش ئەوەی بچینە سەرهێنانی ووتە و ڕیوایەتەکان دەمەوێت وەڵامی ئەو گومانە بدەمەوە کە زانایانی سەردەم دروستیان کردووە بۆ بەرگری کردن لە أبو حنیفة لە بەرامبەر ڕەتکردنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ و کارکردن بە ڕەئی خۆی، لە وەڵامی ئەوەدا زانایانی سەردەم دەڵێن أبو حنیفة لە کوفە ژیاوە فەرموودەکانی عیراق بەتایبەتی شاری کوفە درۆی زۆر تێدابووە بۆیە أبو حنیفة فەرموودەی بە ئاسانی وەرنەدەگرت چونکە دەیزانی درۆ زۆر بڵاوە لە شارەکەیدا، ئەمەش هۆکاری ڕەتکردنەوەیەتی بۆ فەرموودەکان و کارکردن بە ڕەئی خۆی.

لە وەڵامی ئەمەدا دەڵێین: بەڵێ ڕاستە فەرموودە کوفییەکان درۆ و تەدلیسی زۆر تێدایە، بەڵام ئەوە نەبۆتە بیانوو بۆ هیچ زانایەک کە ژمارەیەکی زۆر فەرموودەی کوفییەکان ڕەت بکاتەوە لەکاتێکدا بزانێت سەنەدەکەی صەحیحە، دواتر با بزانین أبو حنیفة کێیە لە فەرموودەدا و لەچ پلەیەکدایە تا بتوانێ ئەم حوکمە بدات ؟ أبو حنیفة خۆی کەسێکی زەعیف یان مەتروکە لە فەرموودەدا ئەمە شتێکی ڕوونە بۆ هەر کەسێک کە بۆنی زانستەکانی فەرموودەناسی کردبێ بەتایبەتی زانستی جەرح و تەعدیل، بۆیە دەبینین لە (کتب الستة) هیچ ڕیوایەتێکی أبو حنیفة نیە جگە لەیەک دانە نەبێت لە (سنن الکبرى للنسائي) ئەویش النسائي خۆی دەڵێ کە فەرموودەکە زەعیفە، وە دانەیەکی تر لە (مسند الإمام أحمد) کە لە أبو یوسف ڕیوایەتی کردووە ئەویش لە أبو حنیفة، بەڵام ئیمام أحمد ناوی أبو حنیفة-ی کردووە بە أبو فلان حەزی نەکردووە ناوی هەبێت لە کتێبەکەیدا، عبدالله-ی کوڕی ئیمام أحمد دەڵێ باوکم بە ئەنقەست کردوویەتی بە أبو فلان، وە پاشان ئیمام أحمد لەوەش پەشیمان بۆتەوە کە ڕیوایەت بکرێ لە هاوەڵانی أبو حنیفة بەڵام ئەم ڕیوایەتەی هی کاتی گەنجی بووە کە تەمەنی 15 ساڵ بووە یەکەم شێخ کە چۆتە لای بۆ بیستنی

فەرمووده أبو یوسف بووه کە قوتابی أبو حنیفة-یه، لە بڕگەکانی دواتر باسی دەکەین کە دواتر ئیمام أحمد هەڵوێستی چۆن بووە لە ڕیوایەت کردن لە هاوەڵانی أبو حنیفة، تەنانەت ڕیوایەتی لە ڕاوی سیقە و ڕاستگۆ نەکردووە تەنها لەبەر ئەوەی هاوەڵی أبو حنیفة بووە، هەروەها ابن حبان دەڵێ: أبو حنیفة تەنها 130 فەرموودەی هەیە لە 120 دانە هەڵەی تێدا کردووە، ئایا کەسێک خۆی ئەمە حاڵی بێت گونجاوە بۆی کە توند بێت لە وەرگرتنی فەرموودەدا ؟ دواتر بۆچی نابینین لە کتێبەکانی جەرح و تەعدیل و عیلەلدا بەهیچ جۆرێک ناوی أبو حنیفة بهێنرێ لە جەرح کردنی ڕاوییەکان و تەعلیل کردنی ڕیوایەتەکان ؟ وە ئایا دەکرێت بەم شێوە بێ ئەدەبی و بێ ڕێزییە فەرموودە ڕەت بکاتەوە ؟ خۆ دەتوانێ بڵێ من ڕاوییەکە بە سیقە نازانم بۆیە ڕەتی دەکەمەوە، پاشان کوفە کۆمەڵێک فەرموودەناسی زۆر ناوداری تێدا هەڵکەوتووە وەکو: (إبراهیم النخعي و سفیان الثوري و أبو نعیم فضل بن دکین و الأعمش وأبو إسحاق السبیعي و منصور و یونس و إسرائیل و ابن أبي شیبة و عثمان بن أبي شیبة و... زۆرێکی تر) بۆچی هەموو ئەمانە بوون بە پێشەوا لەم زانستەدا و ناوێکی پڕشنگداریان هەیە لە سەنەدەکانی فەرموودەدا و فەرموودەیان ڕیوایەت کردووە و قبوڵیان کردووە، کەچی أبو حنیفة ناگات بە هیچ کام لەمانە نە لە توانای لەبەرکردندا نە لە زانست هەبوونی بە فەرموودە کەچی توندترە لە وەرگرتنی فەرموودە و ئەمانە شلن ؟! پاشان زانای زۆر ناودار هەن لە ئەهلی سوننەدا کە فەتوایان پێچەوانەی فەرموودەیە بەهۆی نەگەیشتنی فەرموودە پێیان بۆچی کەس هێرشی نەکردۆتە سەر ئەوان تەنها هێرشەکە أبو حنیفة-ی گرتۆتەوە ؟! چونکە أبو حنیفة کاتێک فەرموودەی پێدەگات وەری ناگرێت و زۆر بێ ئەدەبانە بە ووشەی ناشرین ڕەتی دەکاتەوە.

ئێستاش دەچینە سەر هێنانی ووتە و ڕیوایەتەکان دەربارەی زەمکردنی أبو حنیفة.

**ابن الجوزي** دەڵێ: **کەسانێک تانەیان لە أبو حنیفة داوە بەهۆی مەیل هەبوونی بۆ ڕەئی کە پێچەوانەی فەرموودەی صەحیحە، وە هەندێک خەڵک عوزریان بۆ دەهێنایەوە و دەیانووت: فەرموودەی پێنەگەیشتووە، ئەمەش قسەیەکی هیچە لەبەر دوو شت، یەکەمیان: کەسێک زۆربەی فەرموودە صەحیحەکانی لێ شاراوە بێت بۆی نیە فەتوا بدات، دووەمیان: ئەو کاتێک فەرموودەی پێ بووترایە پێچەوانەی قسەی خۆی بێت لە قسەکەی خۆی پەشیمان نەدەبوویەوە.** [المنتظم : 135/8]

ووتم: ئەمەش قسەیەکی ڕاستە، کەسێک بێ ئاگا بێت لە زۆربەی فەرموودەکان چۆن دەبێتە سەر مەزهەب و پێشەوا ؟ مەگەر تەنها بە ڕەئی خۆی فەتوا بدات، پاشان نموونە زۆرە کە فەرموودەی صەحیحی ڕەت کردۆتەوە دوای پێگەیشتنی وە هەر لەسەر ڕەئیەکەی خۆی ماوەتەوە، وەک لەم بڕگەیەدا باسی دەکەین.

**عبدالله بن الإمام أحمد** دەڵێ: حدثني إبراهيم حدثنا أبو صالح محبوب بن موسى الفراء عن يوسف بن أسباط ووتی: **أبو حنيفة ووتی: گەر پێغەمبەری الله ﷺ پێم گەیشتبوایە ئەوا زۆربەی قسەکانی منی وەردەگرت و کاری پێدەکرد.** [السنة : 300] **(سەنەدەکەی حەسەنە).**

**الخطيب البغدادي** دەڵێ: أخبرنا ابن رزق قال أخبرنا أحمد بن جعفر بن سلم قال حدثنا أحمد بن علي الأبار قال حدثنا إبراهيم بن سعيد قال حدثنا محبوب بن موسى ووتی: **بیستم يوسف بن أسباط ئەیووت: أبو حنيفة ووتی: گەر پێغەمبەری الله ﷺ پێم گەیشتبوایە ئەوا زۆربەی قسەکانی منی وەردەگرت و کاری پێدەکرد.** [تاريخ بغداد : 532/15] **(سەنەدەکەی حەسەنە).**

ووتم: محقق-ی تاريخ بغداد(١) و (٢) ئەم ڕیوایەتەیان بە زەعیف داناوە بە بیانووی ئەوەی يوسف بن أسباط زەعیفە !

بڕوانە لاپەڕە 27-32 وەڵامی ئەو گومانەمان داوەتەوە

ووتەی زانایان دەربارەی يوسف بن أسباط:

أحمد بن حنبل دەڵێ: سیقەیە.
يحيى بن معين دەڵێ: سیقەیە.
أبو حاتم الرازي دەڵێ: احتجاجی پێ ناکرێ.
البخاري دەڵێ: کتێبەکانی دەفن کران، جا پاشان فەرموودەکانی وەکو پێویست نەبوون.
العقيلي دەڵێ: لە عابیدەکان بوو، کتێبەکانی دەفن کران پاشان هەندێک فەرموودەی ڕیوایەت کرد کە ئەصلی نەبوو، وە لە هەندێکدا هەڵەی کرد.
ابن عدي دەڵێ: یوسف لەلای من ئەهلی ڕاستگۆییە، بەڵام کاتێک کتێبەکانی نەمان پشتی بە توانای لەبەرکردنی دەبەستی، جا هەڵەی دەکرد و لێی تێکدەچوو، وە نیازی درۆی نەبوو.
ابن حبان: لە چینی سێیەمی ڕاوییە سیقەکانی داناوە، دەڵێ: مستقيم الحديث بووە لەوانەیە هەڵە بکات، لە باشترین کەسی زەمانی خۆی بووە.

جا وەک دیارە خیلاف هەیە دەربارەی گەربڵێین زەعیفە و جێگای متمانە نیە ئەوا ئەم ووتانەی زانایانی جەرح و تەعدیل بۆ کاتێکە کە یوسف فەرموودەیەک ڕیوایەت بکات لە کەسانی ترەوە بۆی هەیە توشی هەڵە بێت، بەڵام لێرەدا خۆی لەسەردەمی أبو حنيفة-دا ژیاوە لەهەمان شاری أبو حنيفة-دا ژیاوە قسەیەک لە أبو حنيفة دەگێڕێتەوە ڕاستەوخۆ بەبێ گێڕانەوەی لە کەسێکی تر، وەک ئەوە وایە کەسێکی جێگای متمانە بڵێ فلان زانای ئەم سەردەمەی خۆمان وایووت، ئەویش کەسێکی زەعیف بێت لە ڕیوایەت کردنی فەرموودەدا کەس پێی ناڵێت قسەکەت وەرناگرین چونکە تۆ کەسێکی زەعیفی لە ڕیوایەتدا، کاتێک ئەم لێکدانەوەیە دەکرێت کە لەکەسانی ترەوە قسەکە بگێڕێتەوە، بەتایبەتی کەسێکی وەک یوسف کە بە زوهد ناسراوە گەر ژیاننامەکەی سەیر بکەیت توشی سەرسوڕمان دەبیت هەروەها موجاهید بووە لە سەنگەرەکان، ابن حبان بە باشترین کەسی سەردەمی خۆی وەسفی دەکات مەحاڵە کەسێکی ئاوا بە درۆ یان بەبێ لێکۆڵینەوە لە ڕاستی و دروستی قسەکە ڕێک بیداتە پاڵ أبو حنيفة، محمد بن الحسن الشيباني کە قوتابی أبو حنيفة-یە کەسێکی زەعیفە بەڵام ئەو ووتانەی لە أبو حنيفة-وە دەیگێڕێتەوە کەس ئینکاری ناکات لە وەرگرتنی.

گومانێکی تر کە الکوثري و محقق-ی تاريخ بغداد(٢) دەستیان پێوە گرتووە ئەوەیە کە ڕیوایەتێک هاتووە أبو حنيفة دەڵێ: (لو أدركني البتي لأخذ بكثير من قولي) واتا: گەر البتي پێم گەیشتبوایە زۆربەی ووتەکانی وەردەگرتم و کاری پێدەکرد، جا دەڵێن أبو حنيفة وتوویەتی (البتي) مەبەستی عثمان بن مسلم البتي-ە بەڵام ئەم البتي-ە بەهۆی تصحيف بۆتە (النبي) هەردوو ووشەکە هاوشێوەن لە وێنەدا تەنها خاڵەکانیان جیاوازە تصحيف-یش زۆرجار ڕوودەدات لەم ووشانەدا، ئەمەش ڕیوایەتەکەیە: عبدالله بن محمد بن يعقوب الحارثي دەڵێ: حدثني أبو طالب سعيد بن محمد بن أبان البرذعي في مسجد أبي الحسن الكرخي ببغداد حدثني أبو جعفر الطحاوي أنبأنا بكار بن قتيبة أنبأنا هلال بن يحيى الرأي البصري سمعت يوسف بن خالد السمتي ووتی: أبو حنيفة ووتی: (لو أدركني البتي لترك كثيرا من قوله) واتا: گەر البتي پێم گەیشتبوایە وازی لە زۆرێک لە ووتەکانی دەهێنا. [مناقب أبي حنيفة للموفق المكي : 102/2]

يوسف بن خالد السمتي لەمیانەی باسکردنی چیرۆکێکی درێژ کە لەنێوان خۆیی و أبو حنيفة و عثمان البتي ڕوویداوە ئینجا ئەم ووتەیەی أبو حنيفة دەگێڕێتەوە، چیرۆکەکە 9 لاپەڕەیە، بڕوانە [109-101/2] هەمان کتێب.

المعلمي دەڵێ: هەرکەسێک چیرۆکەکە بخوێنێتەوە گومانی لەوە نابێت کە درۆیە و دروستکراوە، وە دەڵێ: لەو کاتەدا البتي لە ژیاندابوایە نەمردووە تا أبو حنيفة قسەیەکی لەم شێوەیە بکات.

المعلمي ڕاست دەکات چونکە البتي 143 مردووە، أبو حنيفة 150 مردووە، گەر بووترێ مەبەستی ئەوە بووە کە البتي لە بەصرە بووە أبو حنيفة لە کوفە بووە بەیەکەوە کۆنەبوونەتەوە ئەوا وەک ووتمان سەرلەبەری چیرۆکەکە درۆیە و دروستکراوە.

الموفق المكي ئەم ڕیوایەتەی لە کتێبەکەی عبدالله بن محمد بن يعقوب الحارثي البخاري دەرهێناوە بەناوی (كشف الأستار) کە ئێستا کتێبەکە بوونی نەماوە لە سەرەتای بەشی دووەم ئاماژەی پێ دەدەین، عبدالله تۆمەتبارە بە درۆ، شێخەکەی بەناوی سعيد بن محمد بن أبان البرذعي وەک المعلمي دەڵێ: وابزانم تەنها ناوەکەی بوونی هەیە، لە یەک کتێبدا نەمدۆزییەوە ناوی هاتبێ جگە لەم شوێنە، الطحاوي و بكار سیقەن، هلال بن يحيى زەعیفە، يوسف بن خالد البتي کە خاوەنی

چیرۆکەکەیە ئەویش تۆمەتبارە بە درۆ، تەواوی ڕاوییەکانی سەنەدەکە حەنەفی مەزهەبن ئەمەش حاڵیانە وەک بینیتان، جگە لەوەش ئەوانەی کە ئەم ڕیوایەتەیان نەقل کردووە بە ووشەی (النبي) کەسیان لە یوسف بن خالد السمتي ڕیوایەتیان کردووە تا بڵێین ئەصلی ووشەکە (البتي) بووە کراوە بە (النبي) بەڵکو لە یوسف بن أسباط ڕیوایەتیان کردووە، خاڵێکی تریش ئەوەیە عبدالله لە السنة و ابن حبان لە المجروحين و ابن عدي لە الكامل و الخطيب لە تاريخ هەر چواریان ئەمەیان ڕیوایەت کردووە لە یوسف بن أسباط بە لەفزی (رسول الله) نەک (النبي) ئەمەش بیانووی ڕوودانی تصحيف هەڵدەوەشێنێتەوە، چونکە گەر (النبي و البتي) لە وێنەدا هاوشێوە بن تصحيف ڕوو بدات ئەوا (رسول الله و البتي) زۆر جیاوازن مەحاڵە تصحيف ڕوو بدات، بەڵام الخطيب دوو جار ئەم ڕیوایەتەی هێناوە جارێک بە (رسول الله) و جارێک بە (النبي) بۆیە ئەم گومانەیان دروست کردووە، وە پێم وایە ئەم ڕیوایەتە بۆیە دروستکراوە تا ڕیوایەتەکەی یوسف بن أسباط-ی پێ هەڵوەشێننەوە بەڵام هەوڵێکی نەزۆک بوو.

الكوثري و محقق تاريخ بغداد(٢) دەڵێن: الدارقطني وتوویەتی: أبو صالح الفراء محبوب بن موسى بەهێز نیە.

جگە لە الدارقطني کەسی تر وای نەووتوە، ابن حبان دەڵێ: متقن ئەمەش پلەیەکی بەرزە لە تەوسیق کردن، وە أبو داود و العجلي و الذهبي بە سیقەیان داناوە، أبو حاتم الرازي و ابن حجر بە صدوق-یان داناوە، وەک یەدەگ سەنەدەکە بە حەسەن دادەنێین ئەگینا لە صەحیحەوە نزیکترە.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني إبراهيم حدثنا أبو توبة عن **أبي إسحاق الفزاري ووتی: فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بۆ أبو حنيفة گێڕایەوە دژی خروج کردن، أبو حنيفة ووتی: ئەم فەرموودەیە خورافەیە.** [السنة : 304] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

**عبدالله** دەڵێ: حدثنا محمد بن هارون حدثنا أبو صالح ووتی: **بیستم الفزاري دەیووت: فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بۆ أبو حنيفة گێڕایەوە دژی خروج کردن، أبو حنيفة ووتی: ئەمە**

**خورافەیە.** [السنة : 351] (سەنەدەکەی حەسەنە).

ووتم: أبو حنيفة کاتێک ئەم قسەیەی کردووە کە براکەی أبو إسحاق الفزاري خروج دەکات دەچێتە ناو سوپاکەی إبراهيم بن عبدالله بن الحسن، کە لە بەصرە ساڵی 145 هـ لەدژی عەباسیەکان خروجی کرد، لەهەمان ساڵیشدا کوژرا، أبو حنيفة-ش ساڵی 150 هـ مردووە، کەواتە 5 ساڵ بەر لە مردنی ئەم قسەیەی کردووە، ئەمەش بۆیە باس دەکەم تاکو بیانووی ئەوانە ببڕین کە دەڵێن لەوانەیە سەرەتا ئاوا بوو بێت کە گەنج بووە دواتر پێگەیشتووە بۆتە زانایەکی گەورە و هاوشێوەی ئەم قسانە بەبێ بوونی هیچ بەڵگەیەک تەنها خەیاڵ بڵاوی خۆیانە، بۆیە کەی تەوبەکردنی لە دانە بەدانەی ئەو ووتانە بهێنن بۆمان کە لەم کتێبەدا باسی دەکەین ئەوکات ئێمەش بێدەنگ دەبین نەک بەم بیانووە بەتاڵانە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا أبو سعيد الحسن بن محمد بن عبدالله بن حسنويه الأصبهاني قال أخبرنا عبدالله بن محمد بن عيسى الخشاب قال حدثنا أحمد بن مهدي قال حدثنا أحمد بن إبراهيم قال حدثنا عبدالسلام بن عبدالرحمن قال حدثني إسماعيل بن عيسى بن علي الهاشمي قال حدثني **أبو إسحاق الفزاري ووتی: من دەچوومە لای أبو حنيفة پرسیارم لێدەکرد دەربارەی کاروباری جیهاد، جا پرسیاری بابەتێکم لێکرد ئەویش وەڵامی دایەوە، پێم ووت: دەربارەی ئەم بابەتە فەرموودە ڕیوایەت کراوە لە پێغەمبەر ﷺ کە ئاوا و ئاوا دەفەرمووێ ! أبو حنيفة ووتی: واز بێنە لەوە. أبو إسحاق الفزاري دەڵێ: ڕۆژێکی تر پرسیارم لێیکرد دەربارەی بابەتێک ئەویش وەڵامی دایەوە، پێم ووت: ئەم بابەتە فەرموودەی تێدا ڕیوایەت کراوە لە پێغەمبەر ﷺ ئاوا و ئاوا دەفەرمووێ ! أبو حنيفة ووتی: ئەمە بە کلکی بەراز بسڕەوە.** [تاريخ بغداد : 532/15] (سەنەدەکەی صەحیحە).

ووتم: الكوثري جەهمی کە ناسراوە بە شێتی أبو حنيفة دەڵێ: أبو إسحاق الفزاري منكر الحديث-ە وەک ابن سعد باسیکردووە، محقق-ی تاريخ بغداد(٢) هەمان ووتەی الكوثري دووبارە کردۆتەوە.

پێش هەموو شتێک گەر بڵێین أبو إسحاق زەعیفە هیچ کێشەی نیە چونکە ڕووداوێک دەگێڕێتەوە کە لەنێوان خۆیی و أبو حنيفة ڕوویداوە وەک لە لاپەڕە 27-32 ئاماژەمان پێیدا، بۆیە گەر زەعیفیش

بێت لە ڕیوایەتێکی لەم شێوەیە زەعیفیەکەی هیچ کاریگەری نیە، ئەمە لەکاتێکدا أبو إسحاق ئیمامی ئەهلی شامە لە فەرموودە لە سیرە لە جیهاد لە فیقهدا پێشەوایە قوتابی الأوزاعي-ە، گەر ابن سعد دەربارەی بڵێ: منكر الحديث، ئەوا کۆمەڵێک زانای زۆر گەورەتر لە ابن سعد تەوسیقیان کردووە بە پلەی زۆر بەرز بۆیە کەس ئاوڕی لەم تەزعیف کردنەی ابن سعد نەداوەتەوە.

أبو حاتم الرازي دەڵێ: ثقة مأمون إمام

أحمد بن حنبل دەڵێ: ثقة ثبت

الأوزاعي کە مامۆستایەتی دەڵێ: الصادق المصدوق

سفيان بن عيينة دەڵێ: ئیمام بوو

أبو صالح الفراء دەڵێ: فەرموودەیەکم بیست لە أبو إسحاق، ئینجا پرسیاری ئەم فەرموودەیەم لە سفيان بن عيينة کرد، سفیان ووتی: والله کەس نەدیوە کە پێش أبو إسحاق-ی بخەم

يحيى بن معين دەڵێ: ثقة ثقة (دوو جار دووبارەی کردۆتەوە بۆ تەئکید کردنەوە)

النسائي دەڵێ: ثقة مأمون، یەکێکە لە پێشەواکان

الذهبي دەڵێ: یەکێکە لە ئەعلامەکان

ابن حجر دەڵێ: ثقة حافظ

الجيلي دەڵێ: ثقة

الحاكم دەڵێ: ثقة

البخاري و مسلم احتجاجيان پێکردووە لە الصحيحين

ئەمە جگە لەم هەموو مەدحەی کراوە بۆی لەڕووی عەقیدە و جیهاد کردن و سیرەدا لەلایەن زۆرێک لە زانایان، جا وازلە هەموو ئەمانە بهێنین شوێنی ابن سعد بکەوین کە دەڵێ: منكر الحديث! لەکاتێکدا ابن سعد دەربارەی أبو إسحاق دەڵێ: ثقة فاضل خاوەنی عەقیدە و جیهادە، ئەگەرچی هەڵەی زۆرە لە فەرموودەدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زانایان ئاوڕیان لە ووتەکەی نەداوەتەوە تەنها الكوثري جەهمی نەبێت بۆ بەرگری کردن لە ئیمامەکەی نەقلی کردووە بەبێ ئاماژەدان بە ووتەکانی تر، ابن سعد قوتابی الواقدي-ە لە زۆربەی ووتەکانی لە جەرح و تەعدیلدا پشتی بە الواقدي

بەستووە کە الواقدي خۆی لە باشترین حاڵیدا تۆمەتبارە بە درۆ ژمارەیەکیش بە درۆزنیان داناوە بۆیە جەرح و تەعدیل کردنی سەنگێکی ئەوتۆی نیە بە تایبەت گەر موخالەفەی زانایانی تر بکات، چەند نموونەیەک لە ڕەتکردنەوەی حوکمە شازەکانی ابن سعد:

ابن حجر لە ژیاننامەی عبدالرحمن بن شریح دەڵێ: ابن سعد شتێکی شازی کردووە کە دەڵێ: منکر الحدیث، وە هیچ زانایەک ئاوڕی لەم ووتەیەی ابن سعد نەداوەتەوە چونکە زۆربەی پشت بەستنی بە الواقدي-ە لە حوکمدان لەسەر ڕاوییەکان، الواقدي-ش پشتی پێ نابەسترێ.

ابن حجر لە ژیاننامەی محارب بن دثار دەڵێ: ابن سعد دەڵێ: احتجاجی پێ ناکرێ !

ابن حجر دەڵێ: بەڵکو هەموو پێشەواکان احتجاجیان پێ کردووە، بەڵام ابن سعد تەقلیدی الواقدي دەکاتەوە.

ابن حجر لە ژیاننامەی نافع بن عمر الجمحي دەڵێ: پێشتر باسمان کرد تەزعیف کردنی ابن سعد جێگای تێڕامانە چونکە پشت بە الواقدي دەبەستێ.

الکوثري و محقق-ی تاریخ بغداد(٢) بەهەمان شێوە تەزعیفیان کردووە بەهۆی عبدالسلام بن عبدالرحمن گوایە زەعیفە، ئەویش لەبەر ئەوەی یحیی بن أکثم لە قازی بوون لایداوە چونکە لە فیقهدا زەعیف بووە، ئەمەش تەزعیف کردنێکە هیچ پەیوەندی بە ڕیوایەتەوە نیە، چەندین فقهاء هەن لە ڕیوایەت زەعیفن، وە چەندین فەرموودەناس هەن کە لە فیقهدا لاوازن، هەرچەندە دواتر گەڕاوەتەوە بۆ قازی بوون زانایان لێی ڕازی بوونە، المعلمي لە [التنكيل : 1/546-547] وەڵامی تۆمەتە ناڕەواکانی الکوثري داوەتەوە و ڕوونی کردۆتە کە عبدالسلام سیقەیە.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبو الحسن بن العطار محمد بن محمد سمعت أحمد يعني ابن شبويه ووتی: **بیستم وكيع دەیووت: أبو حنيفة بە ابن المبارك-ی ووت: دەستت بەرز دەکەیتەوە لەگەڵ هەموو تەکبیرەیەکی نوێژدا وەک بڵێی دەتەوێ بفڕیت ؟ ابن المبارك پێی ووت: گەر تۆ لە تەکبیرەی یەکەمی نوێژدا دەفڕی ئەوا منیش لەوانی تردا دەفڕم. وکیع جارێک یان دوو جار ووتی: ابن المبارك زۆر جوان وەڵامی دایەوە.** [السنة : 503] (سەنەدەکەی صەحیحە).

**البیهقي** دەڵێ: أخبرنا أبو عبدالله الحافظ أنبأنا الحسن بن حليم الصائغ بمرو حدثنا أبو الموجه أخبرني أبو نصر محمد بن أبي الخطاب السلمي وكان رجلا صالحا قال أخبرني علي بن يونس حدثنا **وكيع ووتی: نوێژم کرد لە مزگەوتی کوفە أبو حنيفة وەستابوو نوێژی دەکرد ابن المبارك-یش لە تەنیشتیەوە بوو نوێژی دەکرد، ابن المبارك هەرکاتێک رکوعی بردبوایە و بەرز بوایەوە دەستی بەرز دەکردەوە، أبو حنيفة دەستی بەرز نەدەکردەوە، جا کاتێک تەواو بوون لە نوێژەکە أبو حنيفة بە عبدالله بن المبارك-ی ووت: ئەی باوکی عبدالرحمن بینیم زۆر دەستت بەرز دەکەیتەوە، ویستت بفڕی ؟ عبدالله پێی ووت: ئەی أبو حنيفة بینیم دەستت بەرز کردەوە کاتێک دەستت بە نوێژ کرد، ویستت بفڕی ؟ جا أبو حنيفة بێ دەنگ بوو. وکیع دەڵێ: نەم بینی هیچ وەڵامێک وەکو وەڵامەکەی عبدالله بۆ أبو حنيفة زوو ئامادە بێت.** [سنن الكبرى : 2538]

ووتم: (أبو نصر) و (علي بن يونس) نەمبینی کەس باسی ژیاننامەیان بکات، بەڵام هەمان ڕیوایەتە صەحیحەکەی پێشووە بە هەندێک ووشەی زیادەوە، بۆیە زەعیفیەکەی کاریگەری نیە، ئەمەش گاڵتەکردنی أبو حنيفة-یە بە سوننەتی پێغەمبەرﷺ گەر دەووترێ نەیزانیوە سوننەتە، دەڵێین ئەی بۆچی لە ابن المبارك ناپرسێ پێش گاڵتەکردنی بە سوننەتەکە لەکاتێکدا ابن المبارك پێشەوایە و کەسێکی دوورە لەوەی لەخۆیەوە شتێک لە نوێژدا زیاد بکات، دواتر ئەمە سوننەتێکی ئەوەندە باوە تەنانەت خەڵکی عەوام دەیزانێت بێ ئاگایی أبو حنيفة لەم سوننەتە نیشانەی کەم زانستیەتی بە سوننەت.

**عبدالله** دەڵێ: حدثنا أبو الفضل حدثنا مسلم بن إبراهيم حدثنا عبدالوارث بن سعيد قال حدثنا **سعيد ووتی: دانیشتم لەلای أبو حنيفة لە مەککە، جا باسی شتێکی کرد، پیاوێک پێی ووت: لە عمر بن الخطاب ئەمە و ئەوە ڕیوایەت کراوە، أبو حنيفة ووتی: ئەمە ووتەی شەیتانە. پیاوێکی تر پێی ووت: ئەی لە پێغەمبەرﷺ ڕیوایەت نەکراوە کە فەرموویەتی: (أفطر الحاجم والمحجوم) ؟ أبو حنيفة ووتی: ئەمە سجع-ە. منیش توڕە بووم ووتم: هیچی تر ناگەڕێمەوە بۆ ئەم مەجلیسە ڕۆیشتم و جێم هێشت.** [السنة : 384] (سەنەدەکەی صەحیحە).

ووتم: (سجع) ووتەیەكە پیتی كۆتایی بڕگەكانی وەک یەكە، شێوەی جۆراو جۆری هەیە، واتا فەرموودەی (أفطر الحاجم والمحجوم) تەنها سەجع-ە وەک فەرمووده وەری ناگرم.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا أبو بكر البرقاني قال قرأت على محمد بن محمود المحمودي بمرو حدثكم محمد بن علي الحافظ حدثنا إسحاق بن منصور أخبرنا عبدالصمد عن أبيه ووتی: **فەرموودەی پێغەمبەری الله ﷺ (أفطر الحاجم والمحجوم) بۆ أبو حنيفة باسكرا، أبو حنيفة ووتی: ئەمە سجع-ە، وە حوكمێكی عمر-یان بۆی باسكرد لە قەزاوەت یان ووتەیەک لە ووتەكانی، أبو حنيفة ووتی: ئەمە ووتەی شەیتانە. [تاريخ بغداد : 533/15] (سەنەدەكەی صەحیحە).**

ووتم: محقق-ی تاريخ بغداد(٢) دەڵێ: عبدالصمد بن حبيب الأزدي أحمد بن حنبل و البخاري و الخطيب بە زەعیفیان داناوە.

نازانم ئەم كارەی بە هەڵە كردووە یان بۆ چەواشەكاری وایكردووە، چونكە ئەمە عبدالصمد بن حبيب نیە بەڵكو عبدالصمد بن عبدالوارث-ە، سیقەیە كەس تەزعیفی نەكردووە هەریەک لە أحمد بن حنبل و علي بن المديني و يحيى بن معين و شعبة بن الحجاج و ابن سعد و الحاكم والجيلي والذهبي بە سیقەیان داناوە، تەنها أبو حاتم الرازي بە صدوق-ی داناوە، ابن حجر-یش وەک أبو حاتم بە صدوق-ی داناوە، دانەرانی كتێبی (تحرير تقريب التذهيب) دەڵێن: شتێكی سەیرە ابن حجر وازلە تەوسیق كردنی هەموو ئەم زانایانە دەهێنێ شوێنی ووتەكەی أبو حاتم دەكەوێ كە تەنها خۆی بە صدوق-ی داناوە كەسی تری لەگەڵ نیە، لەكاتێكدا زانراوە كە أبو حاتم توندە لە حوكمدان لەسەر ڕاوییەكان.

خۆ گەر ووتەی ئەم زانایانە هیچیان بوونی نەبوایە تەنها ووتەكەی أبو حاتم هەبوایە ئەوا بەس بوو كە بڵێین سەنەدەكە حەسەنە.

**ابن حبان** دەڵێ: أخبرنا زكريا بن يحيى الساجي قال حدثنا أحمد بن سنان القطان ووتی: **بیستم علي بن عاصم دەیووت: بە أبو حنيفة-م ووت: إبراهيم لە علقمة-ەوە ڕیوایەت دەكات ئەویش لە عبدالله-ەوە ڕیوایەت دەكات كە پێغەمبەر ﷺ پێنج ركعات نوێژی پێكردن پاشان دوو سوجدەی**

**برد دوای سەلامدانەوە، أبو حنيفة ووتی: گەر لە ركعەتی چوارەم دانەنیشتبێ ئەوا ئەم نوێژە یەكسانە بەمە، ئاماژەی بۆ شتێك كرد لەسەر زەوی بوو جا هەڵی گرتەوە و فڕێیدا.**
[المجروحين : 407/2] **(سەنەدەكەی صەحیحە).**
ووتم: علي بن عاصم زەعیفە، بەڵام بەسەرهاتەكە لەنێوان خۆیی و أبو حنيفة ڕوویداوە لە كەسانی ترەوە نایگێڕێتەوە، لە لاپەڕە 27-32 وەڵامی ئەم گومانەمان داوەتەوە.
(إبراهيم عن علقمة عن عبدالله) إبراهيم بن سويد النخعي عن علقمة بن قيس النخعي عن عبدالله بن مسعود، لە هەردوو تەحقیقی حمدي السلفي و محمود إبراهيم زايد (إبراهيم عن علقمة) بۆتە (إبراهيم بن علقمة) واتا تەصحیف ڕوویداوە (عن) بۆتە (بن) نازانم چۆن ئەم هەڵەیە بەسەر هەردووكیان تێدەپەڕێ ! فەرموودەكەش صەحیحە مسلم و جگە لەویش ڕیوایەتیان كردووە، ڕیوایەتەكەش بێ ئەدەبی و جورئەتی أبو حنيفة نیشان دەدات بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ كە فەتوای ئەوە دەدات نوێژەكەی پێغەمبەر ﷺ هیچ نرخێكی نیە و بەتاڵە.

**البرذعي دەڵێ: أبو زرعة لە كتێبەكەی مندا فەرموودەیەكی بینی كە لە أبو حاتم ڕیوایەتم كردبوو ئەویش لە شێخێكی خۆیەوە ئەویش لە أيوب بن سويد ئەویش لە أبو حنيفة تا دەگاتە پێغەمبەرﷺ أبو حاتم-یش لە تەنیشت أبو زرعة دانیشتبوو، أبو زرعة پێی ووتم: گلەیی لە كێ دەكرێت لەم كارەدا (واتا: ڕیوایەت كردنی فەرموودەی أبو حنيفة) تۆ یان أبو حاتم ؟ ووتم: من، ووتی: بۆ ؟ ووتم: چونكە من ناچارم كرد بیخوێنێتەوە ئەو ڕازی نەبوو ئیللا دوای هەوڵێكی زۆر، جا أبو زرعة ووتەیەكی زۆر توندی پێ ووتم كە بیرم چۆتەوە لە كتێبەكەمدا لەو كاتەدا، منیش پێم ووت: إبراهيم بن أورمة گرنگی بە سەنەدەكانی أبو حنيفة دەدات، أبو زرعة ووتی: إنا لله وإنا إليه راجعون، موصیبەتەكەمان گەورە بووە دەربارەی إبراهيم، گرنگی پێ دەدا ! لەبەرچی باوەڕ بە أبو حنيفة دەكات ؟ لەبەر شوێنكەوتنی بۆ سوننەت ؟ لەبەر توانای بەهێزی لەبەركردنی ؟ پاشان ووتەیەكی توندی ووت دەربارەی إبراهيم لێرەدا باسم نەكردووە، پاشان ووتی: ڕەحمەتی الله لە أحمد بن حنبل بێت، پێم گەیشت كە دڵی تەنگ ببو بۆ ژمارەیەك فەرموودە كە دەركەوتبوون**

**لەلای المعلى بن منصور، ئەویش پێویستی پێیان بوو، المعلى لەناو ئەهلی ڕەئی لە هەموویان زیاتر لە زانا دەچوو، چونکە ئەو بەدوای عیلم دەگەڕا و گەشتی دەکرد بۆیی و گرنگی پێ دەدا، جا أحمد ئارامی گرت لەسەر ئەم فەرموودانە ویەک پیتیشی لە المعلى نەبیست، بەڵام علي بن المديني و أبو خيثمة و زۆرینەی هاوەڵەکانمان فەرموودەکانیان لێی بیست، جا چ شتێکی المعلى بە هی أبو حنيفة دەچێت ؟! المعلى صدوق-ە، أبو حنيفة سەنەدە پچڕاوەکانی دەکرد بە متصل، پاشان أبو زرعة ووتی: أبو حفيفة ڕیوایەتی کردووە لە موسى بن أبي عائشة عن عبدالله بن شداد عن جابر عن النبي ﷺ لە سەنەدەی فەرموودەکەدا جابر-ی زیاد کرد، واتا فەرموودەی قورئان خوێندن لە دوای ئیمام، وە أبو حنيفة دەیووت: قورئان مەخلوقە، وە فەرموودەکانی پێغەمبەری الله ﷺ ڕەت دەکردەوە، وە گاڵتەی بە ئاثارەکان دەکرد، وە بانگەوازی دەکرد بۆ بیدعە و گومڕاییەکان، دوای هەموو ئەمانە گرنگی بە ڕیوایەتەکانی دەدرێ ! کەس کاری ئاوا ناکات تەنها گێلێکی جاهیل نەبێ، یان ووتەیەکی لەم شێوەیەی ووت، ئینجا أبو زرعة توڕەیی خۆی بەسەر إبراهيم-دا ڕشت، وە ئەو فەرموودانەی أبو حنيفة-ی باس دەکرد کە هیچ ئەصلێکی نیە، جا لەمانەدا فەرموودەی علقمة بن مرثد عن ابن بريدة عن أبيه باسکرد (الدال على الخير كفاعله) وە ئینکاری فەرموودەیەکی تری لێکرد کە لە علقمة بن مرثد ڕیوایەتی دەکات عن ابن بريدة فەرموودەکەی عمر (جبريل هاتە لای پێغەمبەرﷺ ووتی: ئیمان چیە ...) أبو زرعة ووتی: أبو حنيفة و أبو سنان ووشەی (الإيمان)یان لە فەرموودەکەدا کرد بە (شرائع الإيمان) وە چەند فەرموودەیەکی تری باسکرد کە أبو حنيفة هەڵەی تێدا کردووە، وە ئینکاری ڕیواتەکانی کرد، پاشان پێی ووتم: ئەوەی ووتی قورئان مەخلوقە ئەوا کافرە، جا گرنگی بە سەنەدی کافران دەدرێ ؟! واتا ئەو قەومە.**

**[سؤالات البرذعي لأبي زرعة : 956]**

ووتم: ئەم کتێبە بە ناوێکی تریش چاپکراوە ئەویش (الضعفاء لأبي زرعة).

ئەم ووتەیە لە هەموو ڕیوایەتەکان بە نرخترە چونکە سەدان ڕیوایەتیش بهێنین کە أبو حنيفة وتوویەتی قورئان مەخلوقە و گاڵتەی بە فەرموودە کردووە و ڕەتی کردۆتەوە ئەوا کەسانێک هەر دەڵێن زەعیفە جا بەهەر بیانووێک بێت، بەڵام کاتێک زانایەکی گەورەی وەک أبو زرعة ئیثباتی

ئەوە دەكات كە أبو حنيفة ئەم شتانەی تێدا هەبووە واتا صەحیحن چونكە أبو زرعة ئیمامە لە زانستی فەرموودەدا مەحاڵە كۆمەڵێک ڕیوایەتی زەعیفی پێی بگات نەزانێت زەعیفن و بەپێی ئەم ڕیوایەتە زەعیفانە حوكم بدات لەسەر أبو حنيفة، أبو زرعة لەو ئاستەدا نیە لە شتێک دڵنیا نەبێت بە گومانەوە بیداتە پاڵ أبو حنيفة، پێتان وایە أبو زرعة بەهۆی ڕیوایەتی زەعیفەوە ئەم قەناعەتەی بۆ دروست بوو بێ دەربارەی أبو حنيفة ؟!

ووتەكەش تەكفیر كردنێكی ڕوونی أبو حنيفة-یە لەلایەن أبو زرعة، هەروەها ڕەت كردنەوەی فەرموودەكانی پێغەمبەرﷺ و گاڵتە كردن بە ئاثار و بانگەوازی كردن بۆ بیدعە و گومڕایی هەمووی دایە پاڵ أبو حنيفة، ئەمە لەكاتێكدا مشتومڕ هەیە لەسەر ئەوەی ئایا تەوبەی كردووە لە ووتنی قوڕئان مەخلوقە یان نا، كە أبو زرعة هەر سوورە لەسەر تەكفیر كردنی چونكە ڕەت كردنەوەی فەرموودە و گاڵتە كردن بە ئاثار هەر كوفرە، كاتی ئەوە نەهاتووە عەقڵتان بێننەوە بەر خۆتان و بڵێن ئەمانە دەستیان گرتووە بە ووتەی سەلەفەوە هیچ شتێكیان لە خۆیانەوە دروست نەكردووە، گەر لە تەكفیر كردنیش هاوڕایان نەبین دەبێ سوور بین لەسەر ئەوەی كە أبو حنيفة كەسێكی گومڕا و بیدعەچی بووە شایەنی ئەوەیە ڕقمان لێی بێ و بە بچووک سەیری بكەین نەک بیكەین بە پێشەوای ئەهلی سوننە دوای ئەم هەموو ووتانەی لەسەری چەسپاوە.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني محمد بن علي حدثنا إبراهيم بن بشار ووتی: **بیستم سفیان بن عيينة دەیووت: أبو حنيفة نموونەی بۆ فەرموودەی پێغەمبەری الله ﷺ دەهێنایەوە ئینجا ڕەتی دەكردەوە، پێی گەیشتبوو كە من فەرموودەیەک لە پێغەمبەری الله ﷺ دەگێڕمەوە كە فەرموویەتی: (البيعان بالخيار ما لم يفترقا) -واتا: كڕیار و فرۆشیار بۆیان هەیە پەشیمان ببنەوە تا ئەو كاتەی لەیەكتر جیا دەبنەوە لە شوێنی كڕین و فرۆشتنەكە- أبو حنيفة ووتی: ئەی ئەگەر لەناو كەشتیدا بوون چۆن لەیەكتر جیا دەبنەوە ؟ سفیان ووتی: لەم ووتەیە خراپترتان بیستووە ؟** [السنة : 342] **(سەنەدەكەی حەسەنە).**

**ابن حبان** دەڵێ: أخبرنا الفضل بن الحسين بهمذان قال حدثنا يحيى بن عبدالله بن ماهان عن **ابن**

**عيينة ووتی: فەرموودەیەکم بۆ أبو حنيفة گێڕایەوە لە پێغەمبەر ﷺ أبو حنيفة ووتی: میزی بەسەردا بکە.** [المجروحين : 410/2] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: الفضل بن الحسين ناسراوە بە (ابن تازي كره) سیقەیە، (يحيى بن عبدالله بن ماهان الكرابيسي) الخليلي بە سیقەی داناوە، أبو الفتح الأزدي بە زەعیفی داناوە، بەڵام گوێ بە تەزعیفی الأزدي نادرێ چونکە هەم خۆی زەعیفە هەم زیادەڕەویشە لە جەرحکردن.

ابن حجر دەربارەی أبو الفتح الأزدي دەڵێ: حیساب بۆ ووتەی الأزدي ناکرێ چونکە خۆی زەعیفە جا چۆن پشتی پێ دەبەسترێ لە تەزعیف کردنی سیقەکاندا ؟ هەروەها دەڵێ: الأزدي ووتەی قبوڵ نیە گەر بە تەنها خۆی ڕاوییەک تەزعیف بکات چ جای ئەوەی موخالەفەی زانایانی تر بکات ! هەروەها دەڵێ: پێشتر چەند جار باسمان کردووە کە حیساب بۆ جەرحکردنی الأزدي ناکرێت چونکە خۆی زەعیفە.

التهانوي دەربارەی جەرحی ڕەتکراوە دەڵێ: ئەوکەسەی جەرحی ڕاوییەکان دەکات گەر خۆی جەرحکراو بێت ئەوا ئەوکات دەست پێشخەری ناکرێ لە قبوڵ کردنی ووتەکەی بەهەمان شێوە تەعدیل کردنیشی تا ئەو کاتەی زانایانی تر موافەقەی دەکەن وەکو الأزدي زمانێکی توندی هەیە و زیادەڕەوە لە جەرحکردن.

بشار عواد معروف دەربارەی الأزدي دەڵێ: قسەی پێ ووتراوە و جەرحەکانی قبوڵ ناکرێ.

**الخطيب** دەڵێ: قال الأبار حدثنا محمد بن حسان الأزرق ووتی: **بیستم علي بن عاصم دەیووت: فەرمووەدەیەکم بۆ أبو حنيفة گێڕایەوە لە پێغەمبەر ﷺ أبو حنيفة ووتی: وەری ناگرم، ووتم: لە پێغەمبەرﷺ ! ووتی: وەری ناگرم.** [تاريخ بغداد : 533/15] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: هەر چەندە علي بن عاصم زەعیفە بەڵام پێم وانیە أبو حنيفة ئەو توانایەی هەبێت کە جەرح و تەعدیلی ڕاوییەکان بکات لەکاتێکدا خۆی داماوە لەم زانستەدا، گریمان لەبەر زەعیفی علي بن عاصم فەرموودەکەی وەرنەگرتبێ، بۆچی ناڵێ تۆ زەعیفی بۆیە لێتی وەرناگرم، بۆچی عیللەتی فەرموودەکە ڕوون ناکاتەوە بۆی ؟ علي دوو جار لێی دووبارە دەکاتەوە هەر دەڵێ وەری ناگرم بەبێ

ڕوونکردنەوەی هۆکارەکەی ! ئەمە لەکاتێکدا علي بن عاصم زۆر حاڵی باشترە لە أبو حنيفة لە ڕیوایەتدا.
الخطیب کتێبەکەی (الأبار) لەبەر دەستی دایە هەندێکجار ڕاستەوخۆ لە کتێبەکە ڕیوایەت نەقل دەکات هەندێکجار لەڕێگای ابن دوما، بۆیە ووتنی (قال الأبار) زیانی نیە بۆ سەنەدەکە وەک دواتر ڕوونی دەکەینەوە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا محمد بن عبدالملك القرشي أخبرنا أبو العباس أحمد بن محمد بن الحسين الرازي حدثنا أبو عمرو محمد بن يعقوب بن إبراهيم النيسابوري سمعت أبا عبدالله محمد بن نصر المروزي يقول سمعت إسحاق دەیووت: يحيى بن آدم ووتی: **ئەو فەرموودەیە بۆ أبو حنيفة باسکرا کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (دەست نوێژ نیوەی ئیمانە) أبو حنيفة ووتی: با دوو جار دەست نوێژ بشۆین تاکو ئیمانمان کامل بێت ! إسحاق دەڵێ: يحيى بن آدم ووتی: (دەست نوێژ نیوەی ئیمانە) واتا: نیوەی نوێژە، چونکە الله تعالى نوێژی بە ئیمان ناوبردووە ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْۚ﴾ إيمانكم واتا: صلاتكم، وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (نوێژ قبوڵ نیە تەنها بە دەست نوێژەوە نەبێت) جا دەست نوێژ نیوەی ئیمانە بەو مانایەی کە باسمان کرد کە نوێژ تەواو نابێت تەنها بە دەست نوێژ نەبێت. أبو عبدالله دەڵێ: إسحاق ووتی: يحيى بن آدم ووتی: ئەو ووتەیە بۆ أبو حنيفة باسکرا کە دەڵێ: (نازانم نیوەی عیلمە) أبو حنيفة ووتی: با دوو جار بڵێ نازانم تا عیلمەکەی کامل بێت ! يحيى ووتی: مانای ئەو ووتەیە کە دەڵێ: (نازانم نیوەی عیلمە) لەبەر ئەوەیە کە عیلم لە دەزانم و نازانم پێکهاتووە، جا هەر یەکێکیان نیوەی ئەوی ترە. [تاريخ بغداد : 534/15] (سەنەدەکەی صەحیحە).**

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا القاضي أبو القاسم عبدالواحد بن محمد بن عثمان البجلي حدثنا عمر بن محمد بن عمر بن الفياض حدثنا أبو طلحة أحمد بن محمد بن عبدالكريم الوساوسي حدثنا عبدالله بن خبيق حدثنا أبو صالح الفراء ووتی: **بيستم يوسف بن أسباط دەیووت: أبو حنيفة چوار سەد فەرموودەی پێغەمبەری الله ﷺ ڕەت کردەوە یان زیاتر، پێم ووت: ئەی باوکی محمد ئەو فەرموودانە دەزانی کامانەن ؟ ووتی: بەڵێ، ووتم: هەندێکیانم پێ بڵێ، ووتی: پێغەمبەری الله ﷺ**

**فەرموويەتی: (للفرس سهمان وللرجل سهم) -واتا: لە غەنیمەتدا ئەسپەکە دوو بەشی بەردەکەوێ کەسەکەش یەک بەش- أبو حنيفة ووتی: من بەشی ئاژەڵ لە بەشی ئیماندار زیاتر دانانێم. وە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی حوشتر و مانگاکانیان بریندار کرد لەکاتی حەجدا بۆ جیاکردنەوە و ناسینەوەی، أبو حنيفة ووتی: ئەمە هەتک کردنە. وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (البيعان بالخيار ما لم يفترقا) -واتا: کڕیار و فرۆشیار بۆیان هەیە پەشیمان ببنەوە پێش جیابوونەوەیان لەیەکتر لە شوێنی کڕین و فرۆشتنەکە- أبو حنيفة ووتی: گەر فرۆشتنەکە ئەنجامدرا پەشیمان بوونەوە نیە. وە پێغەمبەر ﷺ تیروپشکی دەکرد لەنێوان خێزانەکانی گەر ویستبوای دەرچێ بۆ سەفەر، أبو حنيفة ووتی: تیروپشک قومارە. وە أبو حنيفة ووتی: گەر پێغەمبەر ﷺ پێم گەیشتبوایە یان پێی گەیشتبوام ئاوا زۆربەی ووتەکانی منی وەردەگرت و کاری پێدەکرد، بۆ مەگەر دین جگە لە ڕەئی چاک چیترە ؟ [تاريخ بغداد : 536/15] (سەنەدەکەی حەسەنە).**

ووتم: محقق-ی تاريخ بغداد(١) و (٢) وەک پیشەی هەمیشەیان ووتەکانی یوسف بن أسباط دەربارەی أبو حنيفة بە زەعیف دادەنێن بە بیانووی ئەوەی کە یوسف زەعیفە ! ئەمەش سەرکەشیەکی زۆر سەیرە، خۆ ووتمان کەسی زەعیف کە قسەیەک بکات جیاوازە لەگەڵ ئەوەی فەرموودەیەک یان بەسەرهاتێک بە سەنەدەوە بگێڕێتەوە، جا لێرەدا کارەساتەکە گەورەترە چونکە ئەمە ووتەی یوسف خۆیەتی دەربارەی أبو حنيفة هیچ شتێک ناگێڕێتەوە لە هیچ کەسێک تا بڵێین زەعیفە ! دڵنیام خۆشیان هەست بەم هەڵە گەورەیە دەکەن بەڵام کە کار گەیشتە أبو حنيفة دەبێت هەموو جۆرە بەرگرییەک بخرێتە کارەوە ئەگەرچی لەشوێنی خۆشی نەبێت، دواتر تۆ بڵێی زاهیدێکی وەک یوسف بوهتان بۆ أبو حنيفة هەڵبەستێ ؟

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا ابن دوما أخبرنا بن سلم حدثنا الأبار حدثنا أبو عمار المروزي قال سمعت الفضل بن موسى السيناني دەیووت: **بیستم أبو حنيفة دەیووت: هاوەڵی وام هەیە بە قەدەر دوو گۆزە میز دەکات، مەبەستی ڕەتدانەوەی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بوو کە فەرموویەتی: (إذا كان الماء قلتين لم ينجس) واتا: گەر ئاو بە قەدەر دوو گۆزە بوو ئەوا پیس نابێت.**

[تاريخ بغداد : 535/15] (سەنەدەکەی صەحیحە).

ووتم: (قلة) لەشێوە وەک گۆزە وایە، کێشی یەک قلة بەپێوانەی سەردەم دەکاتە 102 کیلۆ گرام.

محقق-ی تاريخ بغداد(١) و (٢) پێش ئەوانیش الكوثري جەهمی هەموو ڕیوایەتەکانی (ابن دوما)یان بە زەعیف داناوە، ابن دوما یەکێکە لەو شێخانەی کە الخطيب ژمارەیەک ڕیوایەتی لێوە کردووە دەربارەی أبو حنيفة، المعلمي لە [التنكيل : 181/1] زۆر بە زانستیانە ڕەددی الكوثري داوەتەوە دەربارەی تەزعیف کردنی ڕیوایەتەکانی ابن دوما، کە من مەفهومی ووتەکەی دەنوسم لێرەدا، المعلمي دەڵێ: الخطيب ئەو ڕیوایەتانەی کە لە (الأبار) نەقلی دەکات کتێبەکانی (الأبار)ی لەبەر دەستدایە، بەڵام لە ڕێگای (ابن دوما عن ابن سلم عن الأبار) دەیگێڕێتەوە، جا گەر ابن دوما و ابن سلم هەر کێشەیەکیان هەبێت زیان بە ڕیوایەتەکە ناگات چونکە الخطيب کتێبەکەی (الأبار)ی لایە، ئەمەش وەکو ئەوە وایە کەسێک لە ئێمە فەرموودەیەکی صەحیحی بوخاری بە سەنەدەوە بگێڕێتەوە لە خۆیەوە تا دەگاتە بوخاری، ئینجا بووترێ: ئەم سەنەدە زوعفی تێدایە ! خۆ خودی فەرموودەکە لەناو صەحیحی بوخاریدا هەیە سەنەدەکەی نێوان من و بوخاری زەعیفیش بێت هیچ کێشە نیە مادام ئەصلی کتێبەکە بوونی هەیە، ئەم ڕیوایەتانەی الخطيب-یش کە لەڕێگای ابن دوما عن ابن سلم عن الأبار ڕیوایەتی دەکات هەمان شتە.

منیش دەڵێم: گەر کەسێک سەری لەم باسە دەرنەچێ و بڵێ ئەی بۆ الخطيب ڕاستەوخۆ لە کتێبەکەوە ڕیوایەتەکان نەقل ناکات لەڕێگای ابن دوما دەیگێڕێتەوە ؟ دەڵێین: هەموو زانایان لەو سەردەمەدا کە سەردەمی ئیسناد بووە پیشەیان بووە کە هەموو ووتەیەک بە سەنەدەوە بگێڕنەوە گەر سەنەدیان لەلا بێت چونکە هەبوونی سەنەد شانازییە بۆ خاوەنەکەی، ئەوەتا بوخاری الموطأ-ی مالك لەبەر دەستی دایە زۆر فەرموودەی الموطأ-ی لە صەحیحەکەیدا هێناوە، کەچی هیچیان ڕاستەوخۆ لە کتێبەکەوە نەقل ناکات، بەڵکو لەڕێگای قوتابیەکانی مالك ڕیوایەتی دەکات ئەوانیش لە مالك-ەوە، ئەمە پیشەی قەومەکە بووە هەوڵداوە هەموو ووتەیەک بە سەنەدەوە نەقل بکەن ئەگینا گەر سەنەد نەبوایە ئەوا کتێبی هەر زانایەک دەبووە کۆپی کتێبی زاناکانی پێش خۆی، هەر چەندە ئەم خاڵە شایستەی وەڵام داناوەش نیە چونکە ڕوونە بەڵام ڕەچاوی حاڵی خەڵکانێک

دەکەم و دەزانم سەریان لەم باسە دەرناچێت و پرسیاریان لەلا دروست دەبێ، ئەگینا وەک ووتم ئەم خاڵە شایستەی باس کردن نیە.
محقق-ی تاريخ بغداد(٢) دەڵێ: (الفضل بن موسى السيناني) علي بن المديني دەربارەی ووتوە: فەرموودەی مونکەری ڕیوایەت کردووە.
ئەمەش چەواشەکارییە تەواوی ووتەکەی نەهێناوە.
أبو حاتم الرازي دەڵێ : صدوق صالح
الحاكم: پێشەوایەکە لە پێشەوایانی فەرموودە لەسەردەمی خۆی، سیقەیە
الفضل بن دكين دەڵێ: لە ابن المبارك چەسپاوترە
علي بن المديني : سیقەیە، لەوانەیە شتی غەریب و مونکەر ڕیوایەت بکات
وكيع دەڵێ: ثبت
يحيى بن معين دەڵێ: سیقەیە، أمير المؤمنين-ە لە فەرموودە
البخاري دەڵێ: سیقەیە
ابن سعد دەڵێ: سیقەیە
ابن حبان: لە کتێبی (الثقات) هێناویەتی
الذهبي دەڵێ: ثقة حافظ
ابن حجر دەڵێ: یەکێکە لە سیقەکان، ئینجا هەمان ووتەی علي بن المديني دووبارە دەکاتەوە دانەرانی کتێبی (تحرير تقريب التهذيب) دەڵێن: ثقة ثبت، ووتنی (لەوانەیە فەرموودەی غەریب ڕیوایەت بکات) ئەمە تەنها علي بن المديني وای ووتوە
جا تۆ واز لە هەموو ئەمانە بهێنیت ووتەیەکی قرتاوی علي بن المديني نەقل بکەیت کە تفرد-ی کردووە بێگومان چەواشەکارییە.

**عبد الله** دەڵێ: حدثني أبو الفضل الخراساني حدثنا أبو نعيم ووتی: **شريك زۆر بە خراپی باسی أبو حنيفة و هاوەڵانی دەکرد، وە دەیووت: مەزهەبەکەیان ڕەتکردنەوەی فەرموودەی پێغەمبەری الله-**

**یە ﷺ. [السنة : 290] (سەنەدەکەی صەحیحە).**

***عبدالله*** دەڵێ: حدثني محمد بن هارون أبو نشيط حدثنا أبو صالح الفراء سمعت الفزاري يعني أبا إسحاق ووتی: **الأوزاعي پێی ووتم: ئێمە سەرزەنشتی أبو حنيفة دەکەین لەسەر ئەوەی کە فەرموودەی بۆ دەهات لە پێغەمبەر-ەوە ﷺ کەچی پێچەوانەی فەرموودەکەی دەکرد.**
**[السنة : 237] (سەنەدەکەی حەسەنە).**

***الخطيب*** دەڵێ: أخبرنا أبو بكر البرقاني قال قرئ على إسحاق النعالي وأنا أسمع حدثكم عبدالله ابن إسحاق المدايني قال حدثنا حنبل بن إسحاق ووتی: **بیستم مامم -واتا ئیمام أحمد- دەیووت: یعقوب أبو یوسف ئینصافی هەبوو لە فەرموودەدا، بەڵام أبو حنيفة و محمد بن الحسن پێچەوانەی فەرموودەیان دەکرد، ئەم دووانەش ڕەئی خراپیان هەیە، واتا أبو حنيفة و محمد بن الحسن.**
**[تاريخ بغداد : 570/2] (سەنەدەکەی صەحیحە).**

***ئیمام أحمد*** دەربارەی أبو حنيفة و هاوەڵانی دەڵێ: **وازمان لە ئەهلی ڕەئی هێنا، فەرموودەی زۆریان لەلابوو هیچمان لێیانەوە نەنوسیەوە، چونکە ئەوان عینادیان دەکرد بەرامبەر بە فەرموودە، کەس لەوان سەرفراز نابێت. [مسائل ابن هانئ للإمام أحمد : 1930]**

***ابن عبدالبر*** دەڵێ: **زۆرێک لە ئەهلی حەدیث بە جائیزیان دەزانی تانە بدەن لە أبو حنيفة بەهۆی ڕەت کردنەوەی زۆربەی فەرموودە ئاحادەکانی کەسانی خاوەن عەدالەت، چونکە أبو حنيفة هەر فەرموودەیەکی پێ گەیشتبوایە عەرزی دەکرد لەسەر فەرموودەکانی تر و ماناکانی قورئان، هەر شتێک پێچەوانەی ئەوان بوایە ڕەتی دەکردەوە و بە شاز ناوی دەبرد، لەگەڵ ئەمەشدا دەیووت: طاعەتەکان لە نوێژ و جگە لەویش پێیان ناووترێ ئیمان، وە هەرکەسێک لە ئەهلی سوننە کە ووتبێتی ئیمان ووتە و کرداوە ئەوا سەرزەنشتی ووتەکەی أبو حنيفة دەکەن و تەبدیعی دەکەن بەهۆی ئەمەوە. [الانتقاء : 149]**

ووتم: هەرچەندە ابن عبدالبر وەک زانایانی تری خەلەف بەرگری لە أبو حنيفة دەکات بەڵام بڕوانە

دەڵێ هەركەسێک لە ئەهلی سوننە ووتبێتی ئیمان ووتە و كردارە ئەوا تەبديعی أبو حنيفة-ی كردووە بەهۆی دەرهێنانی كردەوە لە ئیماندا، ئایا تۆش ئامادەی وەكو ئەهلی سوننە أبو حنيفة تەبديع بكەیت یان بە ئیمامی دەزانیت ؟

ئەمەش ووتەی پێنج كەسی شارەزا لە فەرمووده (الأوزاعي و أحمد و أبو زرعة الرازي و ابن عبدالبر وابن الجوزي) كە دان بەوە دەنێن أبو حنيفة فەرموودەی ڕەت كردۆتەوە دوای پێگەیشتنی فەرموودەكە، أبو زرعة-ش یەكێک بووە لەوانەی كە خۆی سەرەتا ئەهلی ڕەئی بووە و كاریگەر بووە بە أبو حنيفة وەكو زۆربەی خەڵكی خوڕاسان، وە بیانوو هێنانەوە بەوەی كە أبو حنيفة مەنهەجێكی تایبەتی هەبووە لە قبوڵ كردن و ڕەتكردنەوەی فەرموودەدا بیانووێكی لاوازە، چونكە وەک ئاماژەمان پێدا خۆی كەسێكی لاوازە لە فەرموودەدا و زانستی پێی نیە، جا لێرەدا یان دەبێت مەنهەجەكەی ئەو بەڕاست و دروست بزانین و مەنهەجی تەواوی فەرموودەناسان بەهەڵە دابنێین، وە یان بە پێچەوانەوە كە بێگومان پێچەوانەكەی ڕاستە، ئەمە جگە لە گاڵتەكردنی أبو حنيفة بە فەرموودەكان دوای پێگەیشتنی بۆیە نابینین بڵێت ئەم فەرموودەیە وەرناگرم چونكە كەسێكی زەعیفی تێدایە یان ئەم عیللەتەی هەیە بەڵكو بەبێ ڕێزی و گاڵتەوە ڕەتی دەكاتەوە، وە گەر سەیری مەزهەبی حەنەفی بەگشتی و فەتواكانی أبو حنيفة بەتایبەتی بكەین دەبینین زۆر فەتوای تێدایە كە پشتی بەستووە بە فەرموودەی زەعیف ئەمەش ئەم بیانووە هەڵدەوەشێنێتەوە كە بۆی دروست دەكەن گوایە لێزان بووە لە وەرگرتنی فەرموودەدا، ئایا دەكرێ بڵێین سەلەف ئەوەندە بێ ویژدان بوونە بەرامبەر أبو حنيفة و عوزرەكەیان زانیوە بەڵام لێیان قبوڵ نەكردووە ؟! یان عوزرەكە بۆ ئەوان شاراوە بووە ئێمە دركمان پێی كردووە ! وە ئەگەر بێتو ئەم بیانووە بۆ أبو حنيفة بهێنینەوە ئەوا دەبێت هەمان بیانووش بۆ موعتەزیلە بهێنینەوە كە مەنهەجێكی تایبەتیان بۆ خۆیان داناوە لە ڕەتكردنەوە و قبوڵ كردنی فەرموودە ئەوەی لەگەڵ عەقیدەیان نەگونجێت ڕەتی دەكەنەوە، أبو حنيفة-ش مەنهەجەكەی بەم شێوەیە كە فەرموودەی ئاحاد قبوڵ ناكات لە ئەحكامدا بۆیە دەبینین كۆمەڵێک فەرموودەی صەحیح بە هەوا و ئارەزووی خۆی ڕەت دەكاتەوە چونكە لەگەڵ مەزهەبە بۆگەنەی یەک ناگرێتەوە هەروەک لە بڕگەی هەشتەم باسی دەكەین.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني إبراهيم بن الحجاج الناجي حدثنا **حماد بن زيد ووتی: لەلای أبو حنيفة دانیشتم لە مەککە، پیاوێک هاتە لای ووتی: نەعلم لەبەرکردووە یان ووتی: سروال-م لەبەرکردووە کاتێک لە ئیحرام دابووم، یان ووتی: پێڵاوم لەپێ کردووە کاتێک لە ئیحرام دابووم -إبراهيم گومانی هەبووە کە کامەی پرسیوە- جا أبو حنيفة ووتی: لەسەرتە ئاژەڵێک سەر ببڕیت، حماد دەڵێ منیش بە پیاوەکەم ووت: نەعلت دەست کەوت یان جلی خوارەوەت (إزار) دەست کەوت ؟ ووتی: نەخێر، منیش ووتم: ئەی أبو حنيفة ئەمە دەڵێ دەستم نەکەوتووە بۆیە ئەمەم پۆشیومە، أبو حنيفة ووتی: وەکو یەکە دەستی بکەوێ یان نەکەوێ (واتا هەر دەبێت ئاژەڵێک سەر ببڕێ بۆ کەفارەتی ئەم کارەی) حماد دەڵێ ووتم: حدثنا عمرو بن دينار عن جابر بن زيد عن ابن عباس ﵁ ووتی: بیستم پێغەمبەری الله ﷺ دەیفەرموو: سراویل لەبەر بکەن ئەوانەی إزار-یان دەست ناکەوێ، وە پێڵاو لەپێ بکەن ئەوانەی نەعل-یان دەست ناکەوێ. وحدثنا أيوب عن نافع عن ابن عمر ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سراویل بۆ ئەوانەی کە إزار-یان دەست ناکەوێ، وە پێڵاو بۆ ئەوانەی نەعل-یان دەست ناکەوێ. أبو حنيفة بە دەستەکانی ئاوای کرد -إبراهيم کە ڕاوی ئەم بەسەرهاتەیە دەستی جوڵاند واتا بە دەستەکانی ئاماژەی بەوەدا کە ئەم فەرموودەیە هیچ نیە- حماد دەڵێ پێم ووت: ئەی تۆ لەکوێیە ئەم فەتوایە دەدەیت ؟ أبو حنيفة ووتی: حدثنا حماد عن إبراهيم ووتی: سەربڕینی ئاژەڵی لەسەرە، إزارو نەعلی دەست بکەوێ یان نا. حماد دەڵێ: هەڵسام لەلای، الحجاج بن أرطأة پێم گەیشت لەناو مزگەوت، منیش پێم ووت: ئەی باوکی أرطأة چی دەڵێی دەربارەی کەسێک کە ئیحرامی بەستووە سروال-ی لەبەر کردووە چونکە إزار-ی دەست نەکەوتووە ؟ وە پێڵاوی لەبەرکردووە چونکە نەعل-ی دەست نەکەوتووە ؟ ئەویش ووتی: حدثني عمرو بن دينار عن جابر بن زيد عن ابن عباس کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سراویل لەبەر بکەن ئەوانەی إزار-یان دەست ناکەوێ، وە پێڵاو لەپێ بکەن ئەوانەی نەعل-یان دەست ناکەوێ. هەروەها ووتی: حدثني نافع عن ابن عمر کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سراویل لەبەر بکەن ئەوانەی إزار-یان دەست ناکەوێ، وە پێڵاو لەپێ بکەن ئەوانەی نەعل-یان دەست ناکەوێ.**

**هەروەها ووتی: حدثني أبو إسحاق عن الحارث عن علي ﵁ که دەڵێ: سراویل لەبەر بکەن ئەوانەی إزار-یان دەست ناکەوێ، وە پێڵاو لەپێ بکەن ئەوانەی نەعل-یان دەست ناکەوێ. حماد دەڵێ پێم ووت: ئەی بۆچی هاوەڵەکەتان ئاوا و ئاوا دەڵێ ؟ الحجاج ووتی: ئەو کەسە کێیە ؟ هاوەڵی کێیە ؟ قبحه الله. [السنة : 283] (سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: وەک دەبینین حماد بن زيد دوو فەرموودەی صەحیح بۆ أبو حنيفة دەگێڕێتەوە بە سەنەدەوە، کەچی أبو حنيفة هەر سوورە لەسەر ئەوەی بە فەتوای إبراهيم النخعي فەتوا بدات و تەسلیمی فەرموودەکە نەبێ، وە بەبێ ئەدەبیەوە بە دەستەکانی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەم فەرموودەیە هیچ نیە.

إزار: ئەو پارچە قوماشەیە کە بەشی خوارەوەی لەش دادەپۆشێ، سروال: هەمان شتە، بەڵام جیاوازییەکە ئەوەیە إزار وەکو قوماشێک لەخۆتی دەئاڵێنی شوێنی نیە قاچەکانی تێبخرێ، هەرچی سروال-ە وەکو پانتۆڵی ئەم سەردەمە وایە دوو لقی هەیە قاچەکانی تێدەخرێ.

## بڕگەی دووەم:
# ووتنی قوڕئان مەخلوقە.

**المعلمي اليماني** دەڵێ: **بابەتی استتابە كردنی أبو حنيفة لە ووتنی قوڕئان مەخلوقە متواترە.** [التنكيل : 757/1]

ووتم: كە ووترا متواترە ئیتر دەرگای موناقەشە دادەخرێ.

**المعلمي** دەڵێ: **زۆر سەنەدی صەحیح هەیە دەربارەی چیرۆكی استتابە كردنی أبو حنيفة لە كوفردا دوو جار، وە زۆربەی سەنەدەكان زنجیرەیەك پیاوی ناسراویان تێدایە لە نێوان فەرموودەناسی سیقە و حافزی سیقە و پێشەوای ناسراو.** [التنكيل : 752/1]

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبي حدثنا شعيب بن حرب ووتی: **بیستم سفيان الثوري دەیووت: حەز ناكەم هاوڕایان بم لە حەقدا. عبدالله دەڵێ بە باوكم ووت: مەبەستی أبو حنيفة-یە ؟ ووتی: بەڵێ، پیاوێكە دوو جار لە ئیسلامدا استتابەی پێكراوە، عبدالله دەڵێ بە باوكم ووت: أبوحنيفة استتابەی پێكراوە ؟ ووتی: بەڵێ.** [السنة : 250] **(سەنەدەكەی صەحیحە).**

ووتم: ئەمەش ڕەددێكە بۆ ئەوانەی كە دەڵێن ئیمام أحمد وتوویەتی لەلامان بە صەحیحی نەچەسپاوە كە أبو حنيفة بڵێ قوڕئان مەخلوقە، وەك دواتر باسی دەكەین.

**عبدالله** دەڵێ: **بیستم باوكم** رَحِمَهُ ٱللَّهُ **دەیووت: وابزانم استتابەی پێكرا لەم ئایەتەدا:** ﴿سُبۡحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ **أبو حنيفة ووتی: ئەمە مەخلوقە، پێیان ووت: ئەمە كوفرە جا استتابەیان كرد.** [السنة : 251]

ووتم: هەندێك كەس ووشەی (وابزانم) دەكەن بە بیانوو گوایە ئیمام أحمد دڵنیا نیە لە ڕووداوەكە، خۆ ڕیوایەتی پێشوو ئەم گومانە ناهێڵێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەڵامی ئەم گومانە دەدەینەوە.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني عبيدالله بن معاذ العنبري قال سمعت أبي دەیووت: **بیستم سفيان الثوري دەیووت: أبو حنيفة دوو جار استتابەی پێكرا لە كوفر.** [السنة : 254] (سەنەدەكەی صەحیحە).

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أحمد بن إبراهيم الدورقي حدثنا هيثم بن جميل ووتی: **بە شريك بن عبدالله-م ووت: أبو حنيفة استتابە كراوە ؟ شريك ووتی: ئەو كچانەی تازە گەیشتوونەتە خوێن بینین لە پشتی پەردەكانیانەوە هەواڵی استتابە كردنی أبو حنيفة-یان زانی.**
[السنة : 289] (سەنەدەكەی صەحیحە).

ووتم: واتا استتابە كردنی أبو حنيفة هێندە ناسراو بووە لای خەڵكی تەنانەت كچانی تازە پێگەیشتووش كە لە ماڵەوەن و نایەنە دەرەوە ئەم شتەیان زانیوە بەهۆی بەربڵاوی باسەكە.

شريك بن عبدالله ئەگەرچی لە ڕیوایەتدا زەعیفە بەڵام كارەساتی زانستی زۆر دەربارەی ئەنجام دراوە لەلایەن هەردووك محقق-ی تاريخ بغداد، ئێمە لەم كتێبەدا هیچ ڕیوایەتێكی شريك-مان نەهێناوە چونكە زەعیفە بەڵام تەنها ووتەكانیمان هێناوە چونكە زانایە و قازی كوفە بووە جا لە هەموو ووتەكانیدا ڕەئی خۆی باس دەكات دەربارەی أبو حنيفة یان ڕووداوێك باس دەكات كە زۆر ناوبانگی هەیە كە استتابە كردنە لە سەردەمی خۆیدا ڕوویداوە واتا هیچ شتێك ڕیوایەت ناكات لە كەسەوە تا بووترێ زەعیفە، ناكرێ بە بیانووی ئەوەی كە زەعیفە ڕەئیەكانی ئەو ڕەت بكەیتەوە دەربارەی أبو حنيفة، لە چەندین شوێندا شريك ڕەئی خۆی ووتوە دەربارەی أبو حنيفة كەچی هەردووك محقق دەڵێن: سەنەدەكە زەعیفە چونكە شريك زەعیفە ! شريك هیچی ڕیوایەت نەكردووە ڕەئی خۆی دەربڕیوە واتا كەسێك گەر زەعیف بوو لە ڕیوایەتدا بۆی نیە ڕەئی خۆی دەربارەی هیچ كەسێك دەرببڕێ ؟! سەیری ئەم كارەساتە زانستیە ئابڕۆبەرە كە چەندین جار هەردووك محقق دووبارەیان كردۆتەوە دەربارەی شريك و هەندێك ڕاوی تر، هەروەك لە سەرەتای كتێبەكە ئاماژەم پێدا.

**الفسوي** دەڵێ: حدثني الوليد بن عتبة الدمشقي -وكان ممن يهمه نفسه- حدثنا أبو مسهر حدثنا يحيى بن حمزة -وە سعيد بن عبدالعزيز دانیشتبوو- قال حدثني **شريك بن عبدالله -قازی كوفە- ووتی:**

**أبو حنيفة دوو جار استتابەی پێكراوە لە زنديقيدا.**
**[المعرفة والتاريخ : 786/2] (سەنەدەكەی صەحيحە).**

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا علي بن محمد بن عبدالله المعدل أخبرنا محمد بن أحمد بن الحسن الصواف أخبرنا عبدالله بن أحمد بن حنبل إجازة حدثني أبو معمر ووتى: **بە شريك ووترا: لەچ شتێكدا استتابەتان بە أبو حنيفة كرد ؟ ووتى: لە كوفر. [تاريخ بغداد : 524/15] (سەنەدەكەی صەحيحە).**

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا ابن رزق و البرقاني قالا أخبرنا محمد بن جعفر بن الهيثم الأنباري قال حدثنا جعفر بن محمد بن شاكر، وأخبرنا الحسين بن شجاع الصوفي قال أخبرنا محمد بن عبدالله الشافعي قال حدثنا جعفر بن شاكر قال حدثنا رجاء وهو ابن السندي ووتى: **بيستم عبدالله بن إدريس دەيووت: أبو حنيفة دوو جار استتابە كرا، رجاء ووتى: وە بيستم ابن إدريس دەيووت: درۆ دەكات ئەوەی كە پێی واێ ئيمان زياد ناكات وكەم ناكات. [تاريخ بغداد : 526/15] (سەنەدەكەی صەحيحە).**

ووتم: محقق-ی تاريخ بغداد(١) دەڵێ: سەنەدەكە صەحيحە، ڕاستيش دەكات الخطيب بە دوو سەنەد ئەم ڕيوايەتەی هێناوە وەک ديارە، هی يەكەميان ڕاويەكان هەموويان سيقەن، هی دووەميش بەهەمان شێوە تەنها الحسين بن شجاع صدوق-ە،كەواتە سەنەدێكی صەحيحە و سەنەدێكی حەسەنە.

محقق-ی تاريخ بغداد(٢) دەربارەی محمد بن جعفر بن الهيثم الأنباري دەڵێ: الخطيب وتوويەتی: هەندێک شتی تێدايە.

لێرەوە بۆم دەركەوت كە ئەم محقق-ە هەمان تەعليقەكانی الكوثري جەهمی نەقل دەكات لە كتێبی (تأنيب الخطيب) بەبێ لێكۆڵينەوە، الكوثري دەڵێ: الخطيب وتوويەتی: هەندێک شتی تێدايە، محقق هەمان ووتەكەی نەقل كردووە، بەڵام ئەمە ڕاست نيە، الخطيب دەڵێ: پرسيارم لە البرقاني كرد دەربارەی الأنباري ئايا كەس جەرحی كردووە ؟ ووتی: نەخێر، وە بيستنەكانی صەحيح بوون بە دەستوخەتی باوكی، پاشان البرقاني لە ابن أبي الفوارس گێڕايەوە كە وتوويەتی: هەندێک شتی تێدايە، وە كتێبی هەبوو بە دەستوخەتی باوكی شتانێكی چاک بوو.

جا ووتەکە بەم شێوەیە کە الخطيب لە البرقاني ئەویش لە ابن أبي الفوارس دەیگێڕێتەوە، کەچی الكوثري وتوویەتی الخطيب وادەڵێ، محقق-یش بەبێ لێکۆڵینەوە هەمان شتی لە الكوثري نەقل کردووە، پاشان ووتەکەی ابن أبي الفوارس جەرحێکی جوزئیە مفسر نیە لەگەڵ ئەوەشدا دانی پێناوە کە ئەصلی کتێبەکەی چاکە، وە زانایانی تر تەوسیقیان کردووە، جا لێرەدا کە الكوثري و محقق لەکۆی ووتەکانی البرقاني تەنها یەک ووشە دەردەهێنن نیەت گڵاویان دەردەکەوێ.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبو عقيل يحيى بن حبيب بن إسماعيل بن عبدالله بن حبيب ابن أبي ثابت حدثنا غالب بن فائد حدثنا **شريك بن عبدالله ووتی: بينيم أبو حنيفة بەسەر ئەڵقەی دەرسی مزگەوتەکان دەگێڕدرا استتابەی پێ دەکرا.** [السنة : 309]

ووتم: غالب بن فائد خيلاف هەیە دەربارەی گەر زەعیفیش بێت ئەم بابەتە لەسەر ڕیوایەتەکەی ئەو نەوەستاوە.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أحمد بن محمد بن يحيى بن سعيد القطان حدثنا يحيى بن آدم حدثنا **شريك و حسن بن صالح: هەردووکیان شایەتیاندا کە أبو حنيفة دوو جار استتابە کراوە لە زندیقیدا.** [السنة : 319] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبي ﷬ ووتی: **بیستم ابن عيينة (سفيان) دەیووت: أبو حنيفة دوو جار استتابە کرا.** [السنة : 337] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

**عبدالله** دەڵێ: حدثنا موسى الأنصاري ووتی: **بیستم أبو خالد الأحمر دەیووت: أبو حنيفة دوو جار استتابەی پێکرا لە شتێکی گەورەدا.** [السنة : 355] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: القحطاني دەڵێ ئەم سەنەدە حەسەنە چونکە أبو خالد الأحمر صدوق-ە !

ئەمە کاتێک ڕاست دەبوو گەر أبو خالد ڕاوی بەسەرهاتەکە بوایە بەڵام لێرەدا خۆی خاوەنی ووتەکەیە سیقە بێت یان صدوق کارناکاتە سەر پلەی سەنەدەکە و هەر صەحیحە، جگە لەوەش خيلاف هەیە دەربارەی أبو خالد کە سیقەیە یان صدوق-ە، بۆی هەیە بپرسن صەحیح بێت یان

حەسەن جیاوازی نیە هەردووکی هەر قبوڵکراوە ئیتر ئەم موناقەشەیەی بۆ چیە ؟ بەڵێ ڕاستە بەڵام بۆیە ئاماژەم بەوەدا تا بزانن محقق چەندە بە بیانوو مامەڵە لەگەڵ ڕیوایەتەکاندا دەکات.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا علي بن طلحة المقرئ والحسن بن علي الجوهري قالا أخبرنا عبدالعزيز بن جعفر الخرقي حدثنا علي بن إسحاق بن زاطيا حدثنا أبو معمر القطيعي حدثنا حجاج الأعور عن **قيس بن الربيع ووتی: بینیم یوسف بن عمر ئەمیری کوفە أبو حنیفة-ی لەسەر سەکۆ دانابوو استتابەی پێدەکرد لە کوفر.** [تاريخ بغداد : 523/15] **(سەنەدەکەی حەسەنە).**

ووتم: محقق-ی تاريخ بغداد(١) دەڵێ: ئەم ڕیوایەتە زەعیفە بەهۆی قیس بن الربیع !

یەکەمیان: بەم شێوەیە نیە کە برا بێتەوە قیس زەعیف بێت، بەڵکو خیلاف هەیە دەربارەی، ووتەی 36 زانام خوێندەوە دەربارەی، 19 دانەیان بە زەعیفی دەزانن، 17 دانەیان بە سیقەی دەزانن یان دەڵێن لا بأس بە.

دووەمیان: بەچاوی خۆی ڕووداوەکەی بینیوە ئیتر لە ڕیوایەت کردنی فەرموودەدا زەعیف بێ یان نا ئەمە چ پەیوەندی بەوە هەیە کە شتێکی بینیبێت و بیگێڕێتەوە ؟! سوێندتان ئەدەم بە الله گەر باوکە پیرە نەخوێندەوارەکەتان لە بازاڕ بگەڕێتەوە ماڵەوە بڵێ بینیم ئەم شتە ڕوویدا لە بازاڕ، کەستان دەڵێن باوەڕ ناکەین چونکە باوکمان زەعیفە لە ڕیوایەت کردنی فەرموودەدا ؟ سەیرکەن چ کارەساتێکی زانستی ڕوودەدات لە حاشیەی هەردوو چاپەکەی تاريخ بغداد تەنها لەپێناوی بەرگری کردن لە أبو حنیفة !

یوسف بن عمر الثقفي لەنێوان ساڵانی 120 تا 127 ئەمیری کوفە بووە، دەتوانین بڵێین ئەمە استتابە کردنی یەکەمە، گریمان ساڵی 120 استتابەی کردووە ئەوا ئەوکات أبو حنیفة تەمەنی 40 ساڵ بووە لەو پەڕی پێگەیشتن دابووە ئەمەش خەیاڵ بڵاوی ئەو کەسانە هەڵدەوەشێنێتەوە کە دەڵێن ڕەنگە بە گەنجی ئاوا بوو بێت دواتر پێگەیشتووە بۆتە کەسێکی تر ! تەمەنی 40 ساڵی ئەوپەڕی لوتکەی پێگەیشتنی مرۆڤە، دواتر ئەم گومانە خەیاڵ بڵاوی دروستکردووە ئەگینا هیچ بەڵگەیەک نیە بڵێ لە تەمەنێکدا ئاوا بووە دواتر گۆڕاوە.

محقق-ی تاريخ بغداد(٢) دەڵێ: الخطيب وتوويەتی: حجاج الأعور تێكەڵی كردووە، وە ابن معين بە كوڕەكەی حجاج-ی ووتوە: مەهێڵە كەس بێتە لای باوكت، واتا تێكەڵ دەكات كەڵكی نەماوە فەرموودەی لێوە ببیستن.

ئەمەش چەواشەكارییەكی گەورەیە كە محقق دەربارەی زۆرێک لە ڕاوییەكان ئەنجامی دەدات بەهەمان نەفەسی الكوثري تەعليق دەدات لەسەر ڕاوییەكان، حجاج بن محمد الأعور ئیمامە سیقەیە حافزە ثبت-ە لە بەرزترین پلەكانی تەوسیق دایە، ئەوەی محقق باسیكرد الخطيب بە سەنەدێكی زەعیف ڕیوایەتی كردووە تەنانەت ڕاوییەكی تێدایە كە محقق هەمیشە دەڵێ زەعیفە كەچی لەوێدا تانەی لە ڕیوایەتەكە نەداوە هەر چەندە ڕاوییەكە زەعیف نیە بەڵام محقق زۆر دووبارەی دەكاتەوە كە ئەم ڕاوییە زەعیفە، بەڵام من هۆكاری تەزعیف كردنەكە بۆ ئەوە دەگەڕێنمەوە لە ڕاوییەكی مبهم باسەكە دەگێڕێتەوە، ابن سعد و ابن حزم و ابن حجر وتوويانە كە تێكەڵی كردووە لەكۆتایی تەمەنیدا كە دواجار چۆتە بغداد هەمووشیان پشتیان بە ڕیوایەتێكی زەعیف بەستووە كە إبراهيم الحربي دەڵێ: هاوڕێیەكم وای ووت، نازانین ئەم هاوڕێیەی كێیە، وە ابن حزم و ابن حجر دەڵێن: تێكەڵ كردنەكەی هیچ زیانی پێ نەگەیاندووە، ابن سعد-یش دەڵێ: سیقەیە و صدوق-ە، يحيى بن معين دەڵێ: كەسم نەدیوە لە بەصرە حفز كردنی لە حجاج پتەوتر بێ، علي بن المديني دەڵێ: سیقەیە، ئیمام أحمد دەڵێ: ئای چەندە حفزی مەزبوتە و فەرموودە چەندە صەحیحە، المعلى بن منصور الرازي دەڵێ: لە بەصرە نەمبینی لە هاوەڵانی ابن جريج كەس وەک حجاج حفزی پتەوتر بێ، مسلم و النسائي والذهبي الجيلي والخليلي بە سیقەیان داناوە، ابن حجر دەڵێ: یەكێكە لە چەسپاوەكان ئیجماعیان هەیە لەسەر تەوسیق كردنی، كەچی محقق هەموو ئەم ووتانە باس ناكات ئاماژە بە یەک ووتەی يحيى بن معين دەكات كە بە صەحیحی نەچەسپاوە بەڵام لە بەرژەوەندی أبو حنيفة-یە بۆیە دەیهێنێت، لەكاتێكدا زانایان نەیانووتوە حجاج ساڵی ئەوەندە تێكەڵی كردووە ئەوەی پێش ساڵی ئەوەندە لێی بیستبێ دروستە ئەوەی دواتر لێی بیستبێ زەعیفە هەروەک دەربارەی ڕاوییەكانی تر دەیڵێن كاتێک توشی ئەم حاڵە دەبن.

هەروەها محقق دەربارەی علي بن إسحاق بن زاطيا دەڵێ: ابن المنادي وتوويەتی: لم يكن بالمحمود.

ئەمەش جەرحێکی مفسر نیە، ابن السني دەڵێ: لا بأس به، الخطيب دەڵێ: صدوق-ە.

**الساجي** دەڵێ: حدثنا أبو حاتم الرازي حدثنا العباس بن عبدالعظيم عن **محمد بن يونس ووتی: أبو حنيفة استتابەی پێکرا چونکە دەیووت قوڕئان مەخلوقە. عيسى بن موسى استتابەی پێکرد.** [ابن عبدالبر نەقلی کردووە - الانتقاء : 151] (سەنەدەکەی صەحیحە).

ووتم: محمد بن حاتم بن يونس الجرجرائي المصيصي-ە، سیقەیە، چونکە لێرەدا بەناوی باوکی نەهاتووە بە ناوی باپیری هاتووە هەندێک کەس نایناسن وادەزانن مەجهولە.

دەتوانین بڵێین ئەمە استتابە کردنی دووەمە، چونکە عيسى بن موسى لەنێوانی ساڵانی 132 تا 146 ئەمیری کوفە بووە، گریمان ساڵی 135 استتابەی بە أبو حنيفة-ی کردبێ، ئەوکات أبو حنيفة تەمەنی 55 ساڵ بووە تەنها 15 ساڵی ماوە لە ژیان، سەیرکە باسی کەسێک دەکەین سێ بەشی ژیانی بەسەر بردووە بەشێکی ماوە باسی گەنجێکی هەرزەکار ناکەین، هەروەک لە بڕگەی یەکەمدا هێنامان لە تەمەنی 65 ساڵی واتا 5 ساڵ بەر لەمردنی گاڵتەی بە فەرموودە کردووە و ڕەتی کردۆتەوە و فەتوای خروج کردنی داوە.

***أبو زرعة الدمشقي*** دەڵێ: أخبرني محمد بن الوليد ووتی: بيستم أبو مسهر دەیووت: **سلمة بن عمرو القاضي لەسەر مینبەر ووتی: الله ڕەحم بە أبو حنيفة نەکات، ئەو یەکەم کەس بوو کە پێی وابوو قوڕئان مەخلوقە.** [تاريخ أبي زرعة الدمشقي : 1330]

ووتم: محمد بن الوليد بن هبيرة القلانسي الدمشقي صدوق-ە، أبو مسهر الغساني ئیمامێکی ناودارە، سلمة بن عمرو العقيلي قازی دمشق بووە، محقق تاريخ بغداد دەڵێ: سلمة بن عمرو مەجهولە هیچ بەڵگەیەک نیە لە ژیاننامەکەی کە نیشانی بدات سیقەیە ! ئەمە لەکاتێکدا يحيى بن حمزة دەڵێ: سیقەیە بە ئامادە بوونی الأوزاعي فەرموودەی دەووتەوە، تۆ بڵێی کەسێک مەجهول بێت جورئەت بکات لە مەجلیسێک الأوزاعي ئامادە بێت ئەویش ڕیوایەت بکات ؟ لەکاتێکدا ئەدەب و ڕێزی ئەوان بۆ زانایان بە جۆرێک بوو تا کەسانی زاناتر هەبووان ئەوانی تر جورئەتیان نەدەکرد فەرموودە ڕیوایەت بکەن لە مەجلیسدا، پاشان يحيى بن حمزة زانایەکی سیقەیە بە چ حەقێک

تەوسیق كردنی ئەو وەرناگریت و لەخۆتەوە دەڵێی هیچ بەڵگەیەک نیە كە سیقە بێت لەكاتێكدا هیچ زانایەک قسەی لەسەر نەكردووە ؟ دواتر أبو مسهر كە ئیمامی ئەهلی شامە لە فەرموودەدا ڕیوایەتی ئەم ووتەیەی كردووە لە سلمة بن عمرو خۆی لەخۆیدا ئەمە تەوسیقێكی نسبیە بۆ ئەم كەسە، دواتر ئەم كەسە قسەی خۆی كردووە دەربارەی أبو حنيفة نەهاتووە بە سەنەد قسەكە بگێڕێتەوە تا بڵێین مەجهولە، پاشان قازیش بووە زەحمەتە لەو سەردەمەدا كەسێک كە لەڕووی عەدالەت و ڕاستگۆیی نەناسراو بێت بكرێت بە قازی، ووتەكەشی كە دەڵێ: یەكەم كەس بووە وتوویەتی قورئان مەخلوقە، واتا یەكەم كەس لە كوفە، چونكە یەكەم كەس جەعد پاشان جەهم ووتیان قورئان مەخلوقە، هەروەها كە أبو مسهر دەڵێ: قال سلمة بن عمرو، الذهبي لە تاريخ الإسلام ئیثباتی بیستنی كردووە لەنێوان أبو مسهر و سلمة بن عمرو بۆیە ئەگەری پچڕان نامێنێت و لەسەر شەرطی بوخاری صەحیحە.

ابن عساكر لە تاريخ دمشق ئەمەی ڕیوایەت لە أبو زرعة الدمشقي بەڵام أبو حنيفة-ی كردووە بە أبو فلان، الذهبي-ش هەمان شتی كردووە لە تاريخ الإسلام بەڵام الخطيب وەک خۆی نەقلی كردووە لە تاريخ بغداد.

**ابن قتيبة** دەربارەی دەركەوتنی فیتنەی لەفزمان بە قورئان مەخلوقە یان نا دەڵێ: **گەر خەڵكی عاقڵ بێدەنگ بن لەم باسە ئەوا جاهیلەكان بێدەنگ نابن، گەر زمانەكان بگیرێن ئەوا دڵەكان ناگیرێن، وە ئەو كەسانەی كە دەستیان دایە ئەم باسە پێشەنگیان هەبوو لە زانایانی پێش خۆیان كاتێک جەهم و أبو حنيفة قسەیان كرد دەربارەی قورئان، پێش ئەم كاتە لەنێوان خەڵكیدا ئەم باسە نەبوو، وە نەزانرابوو.** [الاختلاف في اللفظ والرد على الجهمية والمشبهة : 60]

ووتم: بڕوانە ووتی خەڵكی جهم و أبو حنيفة-یان كردۆتە پێشەنگی خۆیان لەم بابەتەدا ! ئیمامەكەتان بۆتە پێشەنگ بۆ خەڵک لە كوفردا.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا العتيقي أخبرنا جعفر بن محمد بن علي الطاهري حدثنا أبو القاسم البغوي حدثنا زياد بن أيوب حدثني **حسن بن أبي مالك -كە لە باشترین بەندەكانی الله بوو- ووتی: بە قازی أبو**

**یوسف-م ووت: أبوحنیفة چی دەووت دەربارەی قورئان ؟ ووتی: دەیووت قورئان مەخلوقە، ووتم: ئەی تۆ أبو یوسف ؟ ووتی: نەخێر. أبو القاسم دەڵێ: ئەم ووتەیەم بۆ قازی البرتي گێڕایەوە، ووتی: ئەم حەسەنە کێیە ئەم حەسەنە کێیە؟ -واتا الحسن بن أبي مالك- أبو القاسم دەڵێ: بە البرتي-م ووت: ئەمە ووتەی أبوحنیفة یە ؟ ووتی: بەڵێ ووتەی ئەو شومەیە.** [تاریخ بغداد : 519/15]

ووتم: یەکێک لە معاصرین ئەم هەواڵەی بە زەعیف داناوە بەهۆی الحسن بن أبي مالك !

الحسن لە سەنەدەکەدا بەوە وەسفکراوە کە یەکێک بووە لە باشترین بەندەکانی الله، کەسێکیش ئەمە حاڵی بێت ئەستەمە درۆ بکات بە دەمی أبو یوسف، لەکاتێدا الحسن خۆی فەقیهێکی حەنەفی حەنەفی مەزهەبە و یەکێک بووە لە دیارترین قوتابیەکانی أبو یوسف، الصیمري حەنەفی مەزهەب دەربارەی الحسن بن أبي مالك دەڵێ: سیقەیە لە ڕیوایەتدا زانستی یەکجار زۆرە ڕیوایەتی گەلێک زۆرە، جگە لەمەش محقق-ی تاریخ بغداد(١) کە بەدوای بچووکترین بیانوو دەگەڕێ بۆ بە زەعیف دانانی ڕیوایەتەکان ئەم ڕیوایەتەی بە زەعیف دانەناوە، پاشان قازی البرتي کە خۆی فەقیهێکی حەنەفی مەزهەبە قوتابی محمد بن الحسن الشیباني بووە کە ئەویش قوتابی أبو حنیفة بووە، ووتەکە پشت ڕاست دەکاتەوە و ئینکاری لێ ناکات، جا کاتێک یەکێک لە نزیکترین قوتابیەکانی أبو حنیفة کە قازی أبو یوسف-ە، وە قازی البرتي کە قوتابی قوتابیەکەی أبو حنیفة بووە ئەم ووتەیە پشت ڕاست دەکەنەوە کە أبو حنیفة وتوویەتی قورئان مەخلوقە ئەوا بە نەفیکردنی کەسێکی وەک الطحاوي بۆ ئەم ووتەیە کە 89 ساڵ دوای مردنی أبو حنیفة لەدایکبووە ناتوانرێ ڕاستی بابەتەکە ئینکاری لێ بکرێت لەکاتێکدا هەواڵی استتابە کردنی أبو حنیفة لەم ووتەیە متواترە هەروەک باسمان کرد، سەیرەکە لەوەدایە ئەوەندە دەمارگیرن بۆ أبو حنیفة لەکاتێکدا دەووترێ استتابە کراوە واتا تەوبەی کردووە لەم ووتەیە، کەچی هەر ئامادە نین بڵێن بەڵێ ڕاستە ئەمەی ووتوە پاشان تەوبەی پێکراوە دوای تەوبەش هیچی لەسەر نامێنێت، بەڵام هەر لەسەر ئەوە سورن کە ئەم باسە ڕەت بکەنەوە !

وە محقق-ی تاریخ بغداد(٢) خیانەتێکی گەورەی کردووە لێرەدا دەربارەی أبو القاسم البغوي، زیاتر لە 10 زانا تەوسیقیان کردووە بە پلەی زۆر بەرز وەک: حافظ، ثبت، إمام، لە پلە بەرزەکانی

تەوسیق دایە تەنها ابن عدي و السليماني بە زەعیفیان داناوە كە هیچ زانایەک ئاوڕی لە ووتەكەی ئەوان نەداوەتەوە ئەوانەی تەوسیقیان كردوون پلە بەرزترن لەم دووانە، كەچی محقق باسی ووتەی هیچ كام لەم زانایانەی نەكردووە تەنها ووتەكەی ابن عدي نەقل كردووە !

**الخطيب** دەڵێ: **دەربارەی ووتنی قوڕئان مەخلوقە، دەووترێ أبو حنيفة وای نەووتوە، بەڵام ئەوەی ناوی دەركردووە لێی ئەوەیە كە وای ووتوە و استتابە كراوە.** [تاريخ بغداد : 516/15]

**المعلمي** دەڵێ: **هەندێک ووتەی أبو حنيفة دەگەیشت بە زاناكانی دیمەشق پێیان وابوو كوفرە، وە هەندێک لەم ووتانە لە خودی كتێبی (تأنيب الخطيب)ی الكوثري هاتووە، وە ڕواڵەتی سەنەدەكانی صەحیحە، جا هیچ ڕێگرێک نیە لەوەی كە لەسەر ڕواڵەتی ئەم ووتانە حوكمی لەسەر بدەن، جا هەر كەسێک حوكمەكەی لەسەر ڕواڵەت بنیاتنا و هەڵەی كرد ئەوا عوزری هەیە.**
[التنكيل : 525/1]

ووتم: لەكوێن ئەوانەی كە ئەمڕۆ موسڵمانان بە خەواریج دادەنێن لەپێناوی أبو حنيفة ئەم ووتەیە ببینن، هەر هیچ نەبێت ئەوەندەمان پێ ڕەوا ببینن كە لەسەر سەنەدی صەحیح حوكمەكانمان بنیات ناوە.

هەر چەندە لێرەدا ووتەكەی المعلمي جۆرێكە لە بەرگری كردن لە أبو حنيفة هەروەک لە پێشەكی كتێبەكەدا ئاماژەم پێیدا، بۆیە لێرەدا المعلمي كەوتۆتە گێژاوێكەوە نازانێت چۆن خۆی دەرباز بكات، لەلایەک ڕەددی الكوثري دەداتەوە لە تەزعیف كردنی بۆ ڕیوایەتەكانی ناو كتێبی تاريخ بغداد، الكوثري لە بەرامبەردا دەیخاتە گۆشەیەكی تەسكەوە و پێی دەڵێ: كەواتە مادام ڕەددی من دەدەیتەوە و ڕیوایەتەكان بە صەحیح دەزانیت ئەوا دەبێ أبو حنيفة تەكفیر بكەیت، ئەویش لە ووڵاتێكی وەک هیند دەژی و هەر لەوێ ئەم كتێبەی نوسیوە دەمارگیری خەڵكی هیندیش بۆ أبو حنيفة و مەزهەبەكەی لە ڕاددە بەدەرە، گەر لە هیندیش نەبوایە لە هەر ووڵاتێكی تر بوایە زانایەكی وەک المعلمي ناسراو لە جیهانی ئیسلامیدا بڵاو ببێتەوە كە تەكفیری أبو حنيفة دەكات بێگومان زۆر بە قورسی لەسەری دەووستێ جا كاریگەری سەردەم و شوێنەكە وای لێدەكات دەرچەیەک بۆ

خۆی بدۆزێتەوە و لەو ئیلزام كردنەی الكوثري ڕزگاری بێت، ئەوەتا لەخۆیەوە دەڵێ سەلەف بۆیە قسەیان بە أبو حنیفة ووتوە تاكو خەڵكی شوێنی نەكەون لە هەڵەكانیدا، یان دەڵێ هەندێک ووتەی هەیە كوفرە ڕواڵەتی سەنەدەكەی صەحیحە وەک بڵێی دەیەوێ پێمانی بڵێ عیللەتی خەفیان تێدایە! ئەی گەر تەنها بە ڕواڵەت صەحیحن بۆ زوعفی ڕیوایەتەكان ڕوون ناكەیتەوە تا خەڵكی گومڕا نەبن و تەكفیری نەكەن بە ناحەق ؟ هەر چەندە لێرەدا قسە لەسەر چەند ڕیوایەتێكی دیاریكراو دەكات كە نازانین بە دیاریكراوی مەبەستی كامەیە نەک مەبەستی هەموو ڕیوایەتەكان بەڵام هەر چۆنێک بێت مەعلومە كە ئەویش نەیتوانیوە لە كاریگەری سەردەم و دەوروبەرەكەی دەرچێت وەكو باقی خەڵكەكەی تر أبو حنیفة بە ئیمام ناو دەبات، جا لێرەدا ئێمە تەنها لەو ڕووە سوود لە المعلمي وەردەگرین كە لە قسەكردن لەسەر ڕیوایەتەكان و ڕاوییەكان زۆر بە زانستیانە قسە دەكات و ڕاستیەكان وەک خۆی باس دەكات خۆشەویستی و گەورەیی أبو حنیفة نەبۆتە ڕێگر لە بەردەمی كە ڕاستیەكان وەک خۆی ڕوون بكاتەوە لەڕووی زانستیەوە بەڵام لە ڕووەكەی تر كە تەئویل بۆ ئەم ووتانە دەكات و خۆی هەڵدەخەڵەتێنێ ئەوا ئێمە ئاوڕ لە ووتەكانی نادەینەوە، هەروەک چۆن لەم بەشەدا دەبینن ووتەی كۆمەڵێک زانای خەلەفم نەقل كردووە لەدژی أبو حنیفة لەكاتێكدا دڵنیام ئەم زانایانە أبو حنیفة بە ئیمام دەزانن بەڵام ئێمە لەو ڕووەدا سوود لە ووتەكانی زاناكان دەبینین كە ڕاستیەكان وەک خۆی باس دەكەن و ڕوونی دەكاتەوە یان حەقیقەتێک وەک خۆی نەقل دەكەن، بەڵام كە دێتە سەر بیانوو هێنانەوە و بەرگری كردن لە أبو حنیفة نرخ بۆ ووتەكانیان دانانێین چونكە هیچ كام لە زانایانی خەلەف و معاصرین نەهاتوون بە تێڕوانینێكی زانستی و بەڵگەی ڕوون و پتەو بەرگری لە أبو حنیفة بكەن و ڕەددی ووتەكانی سەلەف بدەنەوە، یەكێكیان دەیەوێ بڵێ بابەتی خلق القرآن درۆیە، یەكێک دەیەوێ بڵێ عەقیدەی خروج كردنی شتێكی ئاساییە زانایانی تریش لەگەڵیدا بوونە، یەكێک دەیەوێ بڵێ مورجیئە بوونەكەی هێندە سوک و ئاسانە وەكو گوناهێكی صەغیرە وایە تەنانەت هەندێكیان كردوویانە بە خیلافی لەفزی واتا هەر مورجیئە نەبووە ! یەكێک دەیەوێ بڵێ حەسادەتی نێوان زانا و مەزهەبەكان وایكردووە قسەی پێ بڵێن، یەكێک دەیەوێ بڵێ لە فەرموودەدا ڕیوایەتی قبوڵە و لە پلەی حەسەن دایە، یەكێک دەیەوێ بڵێ

فەرمووده بە صەحیحی لەلای نەچەسپاوە بۆیە ڕەتی کردۆتەوە، یەکێکی تر بێ شەرمانە دەڵێ سەلەف زوڵمیان لێ کردووە و زیادەڕەوییان کردووە بەرامبەری، ئەمە چەکی دەستی زانایانی خەلەف و معاصرین-ە بەرامبەر ئەم هەموو ووتە زۆر و زەبەندەی سەلەف کە بە هیچ بیانووێک ڕەت ناکرێتەوە تەنها بە خۆ هەڵخەڵەتاندن نەبێ.

## چەند ڕیوایەتێک هاتووە کە أبو حنیفة وتوویەتی قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە:

**الخطیب** دەڵێ: قال النخعي حدثنا أبو بكر المروذي ووتی: **بیستم باوکی عبدالله أحمد بن حنبل دەیووت: بە صەحیحی جێگیر نەبووە لەلامان کە أبو حنیفة بڵێ قورئان مەخلوقە.**

[تاريخ بغداد : 517/15]

ووتم: ڕاوی هەواڵەکە علي بن محمد بن كأس النخعي-ە حەنەفی مەزهەبە ئەهلی ڕەئیە، الخطیب بە سیقەی داناوە، ژمارەیەک هەواڵی ڕیوایەت کردووە دەربارەی مەدحکردنی أبو حنیفة کە تەنها ئەو ڕیوایەتی کردووە کەسی تر ڕیوایەتی نەکردووە، ئەمەش یەکێکە لەو هەواڵانە کە لەهیچ کام لەو کتێبانەی ڕیوایەتەکانی ئیمام أحمد-یان گێڕاوەتەوە ئەم ڕیوایەتەی تێدا نیە ، ئەگەر بڵێن شێک هەیە بەناوی غرائب ئەوا ئەم ڕیوایەتەی النخعي گونجاوترینە کە بووترێ غەریبە هەروەها تفرد-ی پێکردووە، هەر چەندە کتێبەکەی النخعي بەردەست نەماوە بەڵام الخطیب ژمارەیەک ڕیوایەتی لێ نەقل کردووە ئێمەش هەموومان هێناوە لە بەشی دووەمدا، دەبینی کام زانای سەلەف زۆر توند بووە بەرامبەر أبو حنیفة کەچی لەلای النخعي ڕیوایەتی هەیە کە مەدحی أبو حنیفة دەکات ! وە من گومانم لە تەوسیق کردنی الخطیب هەیە چونکە شلە لە تەوسیق کردندا، محمد خلف سلامة خاوەنی کتێبی (معجم لسان المحدثين) دەڵێ: هەندێک لەو زانایانەی جەرح و تەعدیل کە شلن لە بەکارهێنانی ووشەی (سیقە) بۆ ئەو ڕاوییانەی کە حەق وایە لە ووشەی (صدوق) زیاتر بۆیان بەکارنەیەت: الخطیب البغدادي و مسلمة بن قاسم و أبو علي الجياني وابن خلفون وابن عساكر

والذهبي.

وە محمد عوامة لە تەعلیق دانی لەسەر کتێبی (الكاشف)ی الذهبي دەڵێ: عادەتی ابن حجر وایە کە تەوسیق کردنی کەسانی وەک الخطیب ومسلمة بن قاسم دادەبەزێنێت بۆ صدوق.

[الكاشف : 555/2]

گەر بڵێین ئەم ڕیوایەتەی النخعي صەحیحیش بێت مانای ئەوە نیە کە استتابە کردنی أبو حنیفة لە ووتنی قورئان مەخلوقە ڕاست نیە بەڵکو دەتوانین بڵێین ئیمام أحمد بە سەنەدی صەحیح ئەم باسەی پێی نەگەیشتووە سەرەتا دواتر پێی گەیشتووە وەک بینیمان ووتی دوو جار استتابە کراوە، ئەی پاشان چی لە زاناکانی تر دەکەن کە ئیثباتی دەکەن ؟! ئەمە لەکاتێکدا عبدالله-ی کوڕی ئیمام أحمد لە باوکیەوە ڕیوایەتی کردووە کە أبو حنیفة استتابەی پێکراوە لە ئایەتی ﴿سُبۡحَـٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ وەک لە پێشوودا هێنامان عبدالله پرسیار لە باوکی دەکات ئایا أبو حنیفة استتابە کراوە ؟ دەڵێ : بەڵێ دوو جار استتابە کراوە، جا بێگومان ڕیوایەتی کوڕەکەی پێش دەخرێت بەسەر ڕیوایەتی کەسێکی حەنەفی مەزهەبی وەکو النخعي، هەندێک کەس ڕەخنە لەم ڕیوایەتەی عبدالله دەگرن بەوەی کە ئیمام أحمد دەڵێ: وابزانم لەم ئایەتەدا استتابەی پێکرا، دەڵێن ئەمەش ووتەیەکی گوماناویە چونکە ئیمام أحمد بە دڵنیاییەوە ئەم قسەیەی نەکردووە دەڵێ وابزانم ! لە وەڵامدا دەڵێین: ئیمام أحمد گومانی لەوە هەبووە کە ئایا ئەم ئایەتە بووە یان نا نەک گومانی لە چیرۆکەکە هەبێت، دواتر گومانی ئیمامێکی وەک أحمد لە حفظ-دا لە یەقینی زۆرێک لە خەڵکی بەهێزترە، پێشتریش ووتمان استتابە کردنی أبو حنیفة لەم بابەتەدا متواترە، گەر ئیمام أحمد بە صەحیحی پێی نەگەیشتبێ ئەوا کەسانێک هەبوونە بە چاوی خۆیان بینیویانە استتابە کراوە، وە زۆرێکیش ئیثباتی دەکەن وەک بینیتان، جگە لە هەموو ئەمانەش الذهبي ئەم ڕیوایەتەی النخعي هێناوە بە تەواوی کە الخطیب بە تەواوی نەیهێناوە، کاتێک خوێندمەوە ئیتر دڵنیا بووم کە ئەم ڕیوایەتە درۆیە، چونکە یەکێک شارەزای ووتەکانی ئیمام أحمد بێت هیچ گومانی لە درۆیی ئەم ڕیوایەتە نامێنێ هەروەک لە بڕگەکانی دواتر دەبینن کە ئیمام أحمد هەڵوێستی چۆنە بەرامبەر أبو

حنيفة، جا ئەوكات بەراووردی بكەن لەگەڵ ئەم ووتەیەی كە ئێستا دەیهێنین.

**الذهبي** دەڵێ: قال ابن كأس حدثنا أبو بكر المروذي ووتی: **بیستم باوكی عبدالله أحمد بن حنبل دەیووت: بە صەحیحی لەلامان نەچەسپاوە كە أبو حنيفة ﷺ بڵێ قورئان مەخلوقە. المروذي دەڵێ: ووتم الحمد لله ئەی باوكی عبدالله. أبو حنيفة پلەی هەیە لە عیلمدا. ئیمام أحمد ووتی: سبحان الله ! أبو حنيفة لە عیلم و وەرع و زوهد و پێشخستنی قیامەت لە پلەیەك دایە كە هیچ كەس پێی ناگات. بە قامچی لێیدرا تا ببێتە قازی بۆ أبو جعفر، نەیكرد.**
[مناقب أبي حنيفة وصاحبيه : 43]

ووتم: ابن كأس علي بن محمد بن كأس النخعي-ە هەر ئەو كەسەیە كە الخطيب ڕیوایەتەكەی لێوە نەقل كردووە، وەك دیارە ڕیوایەتەكەی الذهبي درێژترە لە هی الخطيب، ڕەنگە الخطيب تەنها بەشێكی ڕیوایەتەكەی هێنا بێت، بەڵام الذهبي بە تەواوی هێناویەتی لەوانەیە الذهبي كتێبەكەی النخعي لە بەر دەستدا بێ، جا من لێرەدا هیچ ناڵێم تەنها ئەوە دەڵێم سەیری بڕگەكانی تر بكەن بزانن ئیمام أحمد هەڵوێستی چۆن بووە بەرامبەر أبو حنيفة، ئەوكات بڕیار بدەن بزانن دەتوانن بڕوا بەخۆتان بكەن كە ئەمە ووتەی ئیمام أحمد بێت دەربارەی أبو حنيفة !

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا محمد بن أحمد بن رزق قال حدثنا علي بن أحمد بن محمد القزويني قال حدثنا أبو عبدالله محمد بن شيبان الرازي العطار بالري قال سمعت أحمد بن الحسن النرمقي قال سمعت الحكم بن بشير دەیووت: **بیستم سفيان بن سعيد الثوري والنعمان بن ثابت -أبو حنيفة- دەیانووت: قورئانی كەلامی الله یە و مەخلوق نیە.** [تاريخ بغداد : 517/15]

ووتم: محمد بن شيبان الرازي و أحمد بن الحسن النرمقي مەجهولن.

**الخطيب** دەڵێ: حدثنا القاضي أبو جعفر السماني قال حدثنا الحسن بن أبي عبدالله السماني قال حدثنا الحسين بن رحمة الويمي قال حدثنا محمد بن شجاع الثلجي قال حدثنا محمد بن سماعة عن **أبي يوسف ووتی: مونازەڕەم لەگەڵ أبو حنيفة كرد شەش مانگ، تاكو ووتی: هەر كەسێك بڵێ قورئان**

**مەخلوقە ئەوا کافرە.** [تاريخ بغداد : 517/15]
ووتم: محمد بن شجاع الثلجي درۆزنە، لە بەشی دووەمدا باسی حاڵی دەکەین.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الخلال قال أخبرنا الحريري أن النخعي حدثهم قال حدثنا أحمد بن الصلت قال حدثنا بشر بن الوليد عن أبي يوسف عن **أبي حنيفة ووتی: هەر کەسێک بڵێ قورئان مەخلوقە ئەوا بیدعەچیە، کەس وەک ئەو نەڵێت، وە کەس نوێژی لەدوا نەکات.** [تاريخ بغداد : 517/15]
ووتم: أحمد بن الصلت درۆزنە، لە بەشی دووەمدا باسی حاڵی دەکەین.

**الخطيب** دەڵێ: قال النخعي حدثنا نجيح بن إبراهيم قال حدثني ابن أبي كرامة وراق أبي بكر بن أبي شيبة ووتی: **ابن المبارك چووە لای أبو حنيفة، أبو حنيفة پێی ووت: ئەم شتە چیە لەناوتان بڵاو بۆتەوە ؟ ابن المبارك پێی ووت: پیاوێکە ناوی جەهم-ە، أبو حنيفة ووتی: چی دەڵێ ؟ ابن المبارك ووتی: دەڵێ قورئان مەخلوقە، أبو حنيفة ووتی:** ﴿كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ ۚ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا﴾. [تاريخ بغداد : 517/15]
ووتم: نجيح بن إبراهيم زەعیفە، ابن أبي كرامة وراق-ی ابن أبي شيبة بە أبو حنيفة نەگەیشتووە تا شتێکی لەم شێوەیە بگێڕێتەوە لە أبو حنيفة، پاشان جهم بن صفوان ساڵی 128 کوژرا ابن المبارك ساڵی 118 لەدایکبووە قسەکەی أبو حنيفة ئەو مانایە دەدات کە تازە عەقیدەکەی جەهم دەرکەوتووە ئەوکاتیش ابن المبارك لەدایک نەببوو، گریمان گەر ساڵی 128 واتا ساڵی کوشتنی جەهم أبو حنيفة ئەم پرسیارەی کردبێ ئەوا ئەوکات ابن المبارك تەمەنی 10 ساڵ بووە ئایا پرسیار لە منداڵێکی تەمەن 10 ساڵ دەکات ؟! جا ئەوکاتیش ابن أبي كرامة لەدایک نەبووە، بۆیە ڕوونە کە ئەم ڕیوایەتە زەعیفە.

**الخطيب** دەڵێ: قال النخعي حدثنا محمد بن شاذان الجوهري ووتی: **بيستم أبو سليمان الجوزجاني و معلى بن منصور الرازي دەیانووت: أبو حنيفة و أبو يوسف و زفر و محمد و هیچ کام لە هاوەڵانیان قسەیان نەکرد دەربارەی قورئان، بەڵکو بشر المريسي و ابن أبي دؤاد قسەیان**

**کرد دەربارەی قورئان، جا ئەمانە هاوەڵانی أبو حنیفة-یان ناشرین کرد.** [تاريخ بغداد : 518/15]
ووتم: أبو سليمان الجوزجاني و معلى من منصور الرازي دوو حەنەفی مەزهەبن کە لەدوای مردنی أبو حنيفة لە دایکبوونە، پاشان کاتێک بشر المريسي و ابن أبي دؤاد ڕۆڵیان بینی لە فیتنەی خلق القرآن ئەوکات ساڵی 218 بوو 68 ساڵ بەسەر مردنی أبو حنيفة تێپەڕ ببوو، ئێمە ڕیوایەتی ئەو زانایانەمان هێنا کە پێش دروست بوونی فیتنەی خلق القرآن مردوون بینیمان أبو حنيفة-یان کردووە، بۆیە ووتەی ئەوان لەپێشترە وەک لە ووتەی کەسێک کە دوای مردنی أبو حنيفة لە دایکبووە.

***البيهقي*** دەڵێ: قرأت في كتاب أبي عبدالله محمد بن محمد بن يوسف بن إبراهيم الدقاق بروايته عن القاسم بن أبي صالح الهمذاني عن محمد بن أيوب الرازي ووتی: بیستم محمد بن سابق دەیووت: **پرسیارم لە أبو یوسف کرد ووتم: ئایا أبو حنیفة دەیووت قورئان مەخلوقە ؟ ووتی: پەنا بە الله، منیش واناڵێم، ووتم: ئایا عەقیدەی وەک عەقیدەی جەهم بوو ؟ ووتی: پەنا بە الله، منیش واناڵێم. البیهقي دەڵێ: ڕاوییەکان سیقەن.** [الأسماء والصفات : 550]
ووتم: سەیری کتێبی (إتحاف المرتقي بتراجم شيوخ البيهقي)م کرد تاکو ژیاننامەی شێخەکەی بزانم، بەڵام نەمبینی ناوی (أبو عبدالله محمد بن محمد بن يوسف بن إبراهيم الدقاق)ی تێدا بێت، کە لەم کتێبەدا تەواوی شێخەکانی البيهقي کۆکراونەتەوە، شێخی تری هەیە بەناوی أبو عبدالله الدقاق بەڵام کەسێکی ترە و ناوێکی تری هەیە ئەم ناوە نیە، وە البيهقي شلە لە تەصحیح کردندا، هەروەها محقق-ی کتێبەکە لە حاشیەی ئەم ئەثەرەدا دەڵێ: ڕاوییەکان سیقەن تەنها أبو عبدالله الدقاق نەبێ نایناسم، بۆیە هەر کەسێک بڵێ فلان سیقەیە یان سەنەدەکە صەحیحە مولزەم نین بەوەی قبوڵی بکەین چونکە زانا هەیە شلە تەصحیحدا یان شلە لە تەعدیل کردندا دەبێ بزانین لەم حوکمەدا پێکاویەتی یان نا، بۆیە کاتێک ڕاوییەک دەڵێ: (حدثني ثقة) واتا سیقەیە لەلای بەڵام ناوی نەووتوە، زانایان قبوڵی ناکەن دەڵێن ئەگەرچی لەلای ئەو سیقە بووە بەڵام چونکە ناوی نەهێناوە لەلای ئێمە بە مەجهول حیسابە چونکە ڕەنگە لای ئەو سیقە بێت لای ئێمە وانەبێت، جا لێرەدا

ڕاستە البيهقي ناوی هێناوە بەڵام نەماندۆزییەوە و نەمانزانی حاڵی چۆنە.

**البيهقي** دەڵێ: أنبأني أبو عبدالله الحافظ إجازة أخبرنا أبو سعيد أحمد بن يعقوب الثقفي حدثنا عبدالله بن أحمد بن عبدالرحمن بن عبدالله الدشتكي قال سمعت أبي دەیووت: **بيستم أبو يوسف القاضي دەیووت: قسەم لەگەڵ أبو حنيفة كرد ساڵێكی تەواو دەربارەی ئەوەی قوڕئان مەخلوقە يان نا، جا ڕەئی ئەو و ڕەئی من يەكی گرت لەسەر ئەوەی هەر كەسێك بڵێ قوڕئان مەخلوقە ئەوا كافرە. البيهقي دەڵێ: أبو عبدالله ووتی: هەموو ڕاویيەكان سيقەن.** [الأسماء والصفات: 551]

ووتم: أبو عبدالله واتا الحاكم خاوەنی المستدرك، الحاكم-يش ناسراوە بە شلیەتی لە تەصحيح كردنی فەرموودەدا چ جای ئەثەر، تەنانەت فەرموودە هەیە درۆیە ئەو بە صەحیحی داناوە لەسەر شەرطی البخاري و مسلم يان يەكێكيان، هەروەها محقق-ی كتێبەكە دەڵێ: ئەم سەنەدە زەعيفە (أحمد بن يعقوب الثقفي) نايناسم، هەروەها (عبدالله بن أحمد الدشتكي) الذهبي لە كتێبی (ميزان الاعتدال) لە ژياننامەی الدشتكي دەڵێ: علي بن محمد بن مهرويه القزويني ڕيوايەتی لێوە كردووە جا فەرموودەيەكی درۆی باسكرد.

**اللالكائي** دەڵێ: سمعت أبا الحسن علي بن محمد بن عمر الفقيه الرازي يقول سمعت أبا بكر محمد بن مهروية الرازي يقول وهو معي في الطريق يسعى إلى تعزية إنسان فقال سمعت محمد بن أبي أيوب يقول سمعت محمد بن سعيد بن سابق دەیووت: **بە أبو يوسف القاضي-م ووت: تۆ دەڵێی قوڕئان مەخلوقە؟ ووتی: نەخێر، وەكو سەرزەنشت كردنم، نە ئەو -واتا أبو حنيفة- نە منيش وادەڵێم.**
[شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة: 470]

ووتم: ابن حجر لە كتێبی (لسان الميزان) لە ژياننامەی (منصور بن عبدالله أبو علي الذهلي الخالدي الهروي) فەرموودەيەک دەهێنێت كە سەنەدەكەی منصور الخالدي و أبو بكر محمد بن مهروية تێدايە، جا ابن حجر دەڵێ: ابن عساكر ووتی: ڕاويیەكانی سيقەن تەنها الخالدي و ابن مهروية نەبێت، كەواتە محمد بن مهروية بە زەعيف داناوە، هەر لە (لسان الميزان) لە ژياننامەی أبو بكر محمد بن مهروية الرازي دەڵێ: ابن عساكر تۆمەتباری كردووە بە درۆ.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: حدثنا أحمد بن محمد بن مسلم حدثنا علي بن الحسن الكراعي ووتی: **أبو يوسف ووتی: موونازەڕەم لەگەڵ أبو حنيفة-دا كرد ماوەی شەش مانگ، جا ڕەئی هەردووكمان يەكبوو لەسەر ئەوەی هەر كەسێك بڵێ قوڕئان مەخلوقە ئەوا كافرە.**

**[الذهبي نەقلی كردووە - العلو للعلي العظيم : 370]**

ووتم: أحمد بن محمد بن يزيد بن مسلم ناسراو بە (ابن أبي الخناجر) گەر ئەو بێت سيقەيە، علي بن الحسن البزاز التميمي الرازي ناسراو بە (كراع) گەر ئەو بێت دەتوانين بڵێين صدوق-ە، هەر چەندە تەصريحی نەداوە بە سماع دەڵێ: (قال أبو يوسف) بەڵام هاو سەردەمی أبو يوسف-ە هەروەها لە كوفە ژياوە ماوەيەك بۆيە لەسەر شەرطی مسلم دەتوانين بە سەنەدێكی متصل هەژماری بكەين، بەم پێيەش دەتوانين بڵێين ئەم سەنەدە حەسەنە بەڵام ئەمە مانای ئەوە نيە كە سەرەتا نەی ووتبێ قوڕئان مەخلوقە دەكرێ دواتر عەقيدەی گۆڕا بێت چونكە بابەتی استتابە كردنی متواترە بە هيچ شتێك لا ناچێت لەسەری، جا با وای دابنێين كە أبو حنيفة پەشيمان بۆتەوە لە ووتنی قوڕئان مەخلوقە، بەڵام چەند خاڵێك هەيە دەمەوێت ئاماژەی پێ بدەم:

**يەكەم:** أبو حنيفة دوو جار استتابەی پێكراوە بەهۆی ووتنی قوڕئان مەخلوقە، ئەمەش مانای ئەوەيە دوای استتابە كردنی يەكەم دووبارە گەڕاوەتەوە بۆ سەر ووتەكەی خۆی بۆيە دوو جار استتابە كراوە، ئەمە لەكاتێكدا نەوەكەی أبو حنيفة (إسماعيل بن حماد بن أبي حنيفة) دەڵێ: ووتنی قوڕئان مەخلوقە دينی باب و باپيرمە، ئەمەش ناڕوونی عەقيدەی أبو حنيفة نيشان دەدات لەم بابەتەدا، وە بە سەنەدی زەعيفيش هاتووە كە نەوەيەكی تری بەناوی (عمر بن حماد بن أبي حنيفة) دەڵێ: باپيرم لە ترسی كوشتن تەوبەكردنی نيشانداوە.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبو موسى الأنصاري ووتی: **بيستم إسماعيل بن حماد بن أبي حنيفة دەيووت: ئەمە دينی من و دينی باب و باپيرانمە، واتا ووتنی قوڕئان مەخلوقە.**

**[السنة : 221] (سەنەدەكەی صەحيحە).**

ووتم: محقق دەڵێ أبو موسى الأنصاري سيقەيە بەڵام إسماعيل زەعيفە كەواتە سەنەدەكە زەعيفە!

والله المستعان ئاخر إسماعيل هيچی ڕیوایەت نەكردووە تا بڵێین زەعیفە هاتووە عەقیدەی خۆی باسكردووە، ئێستا من كەسێكم توانای لەبەر كردنم لاوازە دەڵێم قوڕئان كەلامی الله یە و مەخلوق نیە، دەكرێ بڵێن ووتەكەت وەرناگرین تۆ زەعیفی ؟ ئێ من عەقیدەی خۆم باس دەكەم خۆ هیچ شتێكم ڕیوایەت نەكردووە تا بڵێن تۆ زەعیفی، دەبێ من لە ڕیوایەتدا توانای لەبەر كردنم زۆر باش بێت ئینجا بۆم هەیە باسی عەقیدەی خۆم یان باوك و باپیرم بكەم ؟! ئەمە چ كارەساتێكە دەگوزەرێ ! لەكاتێكدا ئەم سەنەدە دەبوو بە زەعیف گەر أبو موسى الأنصاري زەعیف بوایە نەك خاوەنی ووتەكە.

**ابن عدي** دەڵێ: أخبرنا زكريا الساجي حدثنا أبو حاتم الرازي حدثنا إسحاق بن موسى الأنصاري حدثنا سعيد بن سلم الباهلي ووتی: **بیستم إسماعيل بن حماد بن أبي حنيفة لە ماڵی مەئمون دەیووت: قوڕئان مەخلوقە، ئەمە دینی منە و دینی باوكمە و دینی باپیرمە.**

**[الكامل في ضعفاء الرجال : 125/2] (سەنەدەكەی حەسەنە).**

ووتم: زكريا الساجي و أبو حاتم الرازي و إسحاق بن موسى الأنصاري سێ ئیمامی گەورەن قسەیان لەسەر ناكرێ، ئەوەی دەمێنێتەوە سعيد بن سلم الباهلي، كە ناوی تەواوی سعيد بن سلم بن قتيبة بن مسلم بن عمرو البصري الباهلي-ە

العباس بن مصعب المروزي دەربارەی دەڵێ: زانا بوو بە فەرموودە و زمانی عەرەبی، الخطيب لە تاريخ بغداد نەقڵی كردووە.

الذهبي لە تاريخ الإسلام دەڵێ: بەرچاو ڕۆشن بوو بە فەرموودە و زمانی عەرەبی، فەرموودەی بیستووە لە ابن عون و القاضي أبو يوسف و جگە لەوانیش، وە علي بن خشرم و ابن الأعرابي و محمود بن غيلان ڕیوایەتیان لێوەی كردووە، هەروەها دەڵێ: ابن أبي حاتم دەڵێ: بیستم باوكم دەیووت: چوومە لای فەرموودەی لەلا بوو لە ابن عون-ەوە، صدوق-ە.

سەیری كتێبی (الجرح والتعديل لابن أبي حاتم)م كرد ژیاننامەكەی بەم شێوەیە هاتووە:

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: **سعيد بن سالم البصري: روى عن ابن عون، روى عنه ..... حدثنا عبدالرحمن قال سمعت أبي يقول: أتيته وكان عنده حديث عن ابن عون وكان محله الصدق.**
[الجرح والتعديل : القسم الأول/المجلد الثاني/31]
ووتم: ناوی باوكی لە سلم بۆتە سالم كە ئەمەش هەڵەیە، المعلمي اليماني كە محقق-ی كتێبەكەیە لە حاشیەكەیدا دەڵێ: لە نوسخەی كۆپرلی سالم بۆتە سلم. (واتا وەک خۆی هاتووە)
كەواتە هەر هەمان سعيد بن سلم الباهلي-ە وەک لە نوسخەی كۆپرلی هاتووە، چونكە المعلمي لە تەحقیقەكەیدا پشتی بە سێ نوسخەی دەست نوس (مخطوط) بەستووە نوسخەی كۆپرلی (ك) و نوسخەی ملا مراد (د) و نوسخەی دار الكتب المصرية (م) جا لەهەر شوێنێكدا خیلاف هەبێت لەنێوان نوسخەكاندا ئەوا لە حاشیە ئاماژەی پێدەدات وەک هەر محققێكی تر، وەک بینیتان ژیاننامەكە تۆزێک كەم و كورتی تێدایە بەڵام ئەوەی الذهبي لە تاريخ الإسلام نەقلی كردووە لە ابن أبي حاتم ئەو كەم و كورتیە پڕ كردۆتەوە، وە بێگومان ئەو نوسخەیەی كتێبەكە كە لەبەر دەستی الذهبي بووە بە نرخترو گرنگترە لەو نوسخانەی كە ئەمڕۆ بەردەستن، جا كاتێک الذهبي بە سعيد بن سلم نەقلی دەكات بۆمان دەردەكەوێ كە نوسخەكەی كۆپرلی ڕاستە دوو نوسخەكەی تر هەڵەن كە كراوە بە سعيد بن سالم، كەواتە ڕیوایەتەكە حەسەنە و سعيد مەجهول نیە، بینیم هەندێک بە مەجهولی دادەنێن بەهۆی ئەو هەڵەیەی كە لەناوی باوكیدا كراوە بۆیە درێژەم بە ڕوونكردنەوەدا لەسەری، هەروەها محقق-ی تاريخ الإسلام (عمر عبدالسلام تدمري) لە ژیاننامەی سعيد بن سلم لە حاشیەكەدا بە كورتی ئاماژەی بەم هەڵەیە داوە.
وە خودی المعلمي لە (التنكيل) ئاماژەی پێداوە كە سعيد بن سلم صەوابە وەک دواتر باسی دەكەین لە ڕیوایەتێكی تردا.

**المعلمي** دەڵێ: **ووتنی قورئان مەخلوقە زۆر بەربڵاو بووە لە أبو حنيفة-ەوە، نەوەكەی أبو حنيفة إسماعيل لەكاتی فیتنەی خلق القرآن هاواری دەكرد و دەیووت: ئەمە دینی باب و باپیرمە.**
[التنكيل : 526/1]

ووتم: جا لێرەدا دەووترێ نەوەكەی أبو حنيفة واتا إسماعيل كەسێكی زەعیف بووە لە ڕیوایەتدا قسەكەی قبوڵ نیە، ئێمەش دەڵێین بەڵێ خۆیی و باوك و باپیری زەعیفن بەڵام خۆ ئەمە ڕیوایەت نیە تا بووترێ زەعیفە باسی عەقیدەی خۆیی و باوك و باپیری دەكات، بێگومان هەر یەكێك لە ئێمە چاك دەزانێ عەقیدەی باوك و باپیری چۆنە گەر ژیا بێت لەگەڵیان، ئیتر ئەوەتان بە دەستەوە ماوەتەوە كە بڵێن چونكە خۆی وتوویەتی قوڕئان مەخلوقە ئیتر بە درۆ داویەتیە پاڵ باوك و باپیریشی، بەڵام لەمەدا هیچ بەڵگەیەكتان نیە كە بیسەلمێنن إسماعیل ئەم ووتەیەی بە درۆ هەڵبەستاوە بەناوی باوك و باپیری چونكە ئەگەرچی زەعیفیش بێت لە ڕیوایەت بەڵام بە درۆزن دانەنراوە، وە من دڵنیام گەر بێتو إسماعیل هەر بەم حاڵەیەوە بیووتبا باپیرم نەیدەووت قوڕئان مەخلوقە، ئێستا هەر ئێوە دەتانووت ئەوەتا نەوەكەی دەڵێ باپیرم وای نەووتوە بێگومان نەوەكەی باشتر ئاگاداری حاڵی باپیریەتی و قسەی ئەو لە پێش قسەی زاناكانی ترە، سەبارەت بەوەش كە ابن عبدالبر ڕیوایەتی كردووە كاتێك إسماعیل دەڵێ ئەمە دینی من و باوك و باپیرمە بشر بن الوليد پێی دەڵێ ڕەئی تۆیە بەڵام ڕەئی باوك و باپیرت نیە، لە بەشی دووەم ئەم ڕیوایەتەمان هێناوە و ڕوونمان كردۆتەوە كە زۆر زەعیفە، جگە لە هەموو ئەمانەش كۆمەڵێك زانا هەن دوای مردنی أبو حنيفة ژیاون كەچی ئیثباتی ئەوە دەكەن كە وتوویەتی قوڕئان مەخلوقە و بەمە لەكەداری دەكەن، وە زانیمان بابەتی استتابە كردنی متواترە كەواتە بۆ ئەم زانایانە گوێ بە استتابەكە نادەن و هەر باسی ئەم بابەتە دەكەن ؟! خۆی لەخۆیدا ئەمە جێگای تێڕامانە.

**دووەم:** أبو يوسف كە نزیكترین قوتابی أبو حنيفة بووە دەڵێ: شەش مانگ مونازەرەم لەگەڵی كرد تاكو قەناعەتم پێی هێنا كە ئەوەی بڵێ قوڕئان مەخلوقە كافرە، ئەمەش دووبارە خراپی عەقیدەكەی نیشان دەدات لەم بابەتەدا ئەگینا بۆ شەش مانگ دەخایەنێ ؟! ئیمامەكەتان پێویستی بە شەش مانگ بووە تا قەناعەت بكات ئەوەی بڵێ قوڕئان مەخلوقە كافرە !

**سێیەم:** هەریەك لە (يحيى بن معين و أبو زرعة الرازي) أبو حنيفة بە جەهمی ناو دەبەن و ئەوە جێگیر دەكەن لەسەری كە وتوویەتی قوڕئان مەخلوقە، ئەمەش جێگای هەڵوەستە

لەسەرکردنە چونکە ئەم دووانە دواى أبو حنيفة ژیاون واتا ئاگادارى استتابەکەن، هەردووکیشیان سەرەتا کاریگەر بوونە بە أبو حنيفة، يحيى بن معين سەرەتا لەلاى محمد بن الحسن الشيباني خوێندوویەتی کە دیارترین قوتابی أبو حنيفة بووە دواى أبو يوسف، تەنانەت هەندێک لە زانایان پێیان وایە يحيى بن معين لە فیقهدا حەنەفی مەزهەبە، کەچی بە صەحیحی لە يحيى بن معين هاتووە کە أبو حنيفة-ی بە جەهمی ناوبردووە، وە أبو زرعة الرازي بە حوکمی ئەوەی لە خوراسان ژیاوە وەکو زۆرینەی خەڵکەکەی ئەوێ کاریگەر بوونە بە أبو حنيفة و ڕەئیەکانی، دواتر گومڕایی أبو حنيفة-ی بۆ دەرکەوتووە و وازی لێ هێناوە هەروەک دواتر دێینە سەری، جا کاتێک ئەم دووانە جێگیری دەکەن لەسەر أبو حنيفة کە واى ووتوە ئەوا بەتاڵ کردنەوەی ئەوەی کە أبو حنيفة لەسەر ئەم عەقیدەیە مردووە شتێکی ئاوا ئاسان نیە، ئەگەرچی نیازی ئەوەشم نیە بە زۆر بەسەریدا بسەپێنم بەڵکو وەک یەدەگ وەرگرتن بۆ ئەوە دەچم کە تەوبەی کردبێ، بەڵام لێرەدا دەمەوێ نیشانی بدەم ئەو کەسەی کە ئێوە کردووتانە بە ئیمام ئەمە حاڵیەتی دوو جار استتابەی پێکراوە لەسەر قوڕئان، ڕوونیش نیە تەوبەی کردووە یان بەدرۆ واى نیشانداوە وەک نەوەکەی باسی دەکات.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا العتيقي قال حدثنا تمام بن محمد بن عبدالله الرازي بدمشق قال أخبرنا أبو الميمون عبدالرحمن بن عبدالله البجلي قال سمعت مضر بن محمد البغدادي دەیووت: **بيستم يحيى بن معين دەیووت: محمد بن الحسن الشيباني درۆزن بوو جەهمیش بوو، أبو حنيفة جەهمی بوو بەڵام درۆزن نەبوو.** [تاريخ بغداد : 580/15] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**
ووتم: (مضر) بۆتە (نصر) لە هەردوو چاپەکەی تاريخ بغداد ئەمەش هەڵەیە، المعلمي لە التنكيل ڕاستی کردۆتەوە.

هەندێک دەڵێن أبو حنيفة وتوویەتی جەهم کافرە ئیتر چۆن خۆی دەبێتە جەهمی یان دەڵێ قوڕئان مەخلوقە ؟

سەبارەت بە تەکفیر کردنی جەهم لەلایەن أبو حنيفة تەنها لە ڕێگای يحيى الحماني هاتووە

لە [تاريخ بغداد : 515/15] کە ئەویش خیلافێکی زۆر هەیە دەربارەی سیقەیە یان نا، بەڵام بە سەنەدێکی تر هاتووە لە [تاريخ بغداد : 514/15] کە صەحیحە أبو حنیفة دەڵێ: جەهمیە و مشبهة خراپترین دوو پۆلی خوراسانن، بەڵام ئەمە ڕێگر نیە لەوەی کە بڵێ قورئان مەخلوقە، چونکە سەلەف پیشەیان بووە هەر کەسێک بڵێ قورئان مەخلوقە دەڵێن جەهمیە جا هەر عەقیدەیەکی هەبێت، بۆیە تەکفیر کردنی جەهم یان بە خراپ وەسفکردنی ڕێگر نیە لەوەی کە بڵێ قورئان مەخلوقە چونکە جەهم کۆمەڵێک کوفری تێدا کۆ ببوویەوە، موعتەزیلەش دەڵێن قورئان مەخلوقە و کۆمەڵەیەکی جیان لە جەهمیەکان، بۆیە گونجاوترین کار بۆ خۆشەویستان و دەمارگیرانی أبو حنیفة ئەوەیە کە بڵێن بەڵێ وتوویەتی قورئان مەخلوقە بەڵام استتابە کراوە و تەوبەی کردووە، دوای تەوبەکردنیش هیچی لەسەر نامێنێت، بەڵام تا ئەو کاتەی ئەوان ئینکاری بابەتی استتابە کردنی أبو حنیفة بکەن هەمیشە ئەم بابەتە بە زیندوویی دەمێنێتەوە.

# بڕگەی سێیەم:
# هەبوونی عەقیدەی جەهمی لە بابەتی ئیماندا

**الفسوي** دەڵێ: حدثني علي بن عثمان بن نفيل حدثنا أبو مسهر حدثنا يحيى بن حمزة -وە سعيد گوێی گرتبوو- ووتی: **أبو حنيفة ووتی: گەر کەسێک ئەم نەعلە بپەرستێ بۆ نزیک بوونەوە پێی لە الله، ئەوا نابینم هیچی تێدا بێ. سعيد ووتی: ئەمە کوفرێکی صەریحە.**
[المعرفة والتاريخ : 784/2] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: پێم خۆشە بەدرێژی لەسەر ئەم سەنەدە بدوێم چونکە کوفرێکی بەواحە و هیچ بیانووێک هەڵناگرێ، دەمارگیرانیش بۆ أبو حنيفة لە معاصرین هەستیان بەم کوفرە بەواحە کردووە بۆیە دەستیان داوەتە بیانوو هێنانەوە بۆ بە زەعیف دانانی ئەم سەنەدە، ئەم ڕوایەتە لەلای الخطيب هاتووە لە تاريخ بغداد، وە لەلای ابن حبان هاتووە لە المجروحين، زۆربەیان قسە لەسەر ڕوایەتەکەی الخطيب و ابن حبان دەکەن، گوایە سەنەدەکەی الخطيب محمد بن جعفر بن درستويه-ی تێدایە کە کەسێکی زەعیفە زەعیفیش نیە هەروەک المعلمي لە [التنكيل : 478/1-487] ڕەددی الكوثري داوەتەوە، سەیرەکە لەوە دایە محقق-ی تاريخ بغداد(١) دەڵێ: سەنەدەکەی الخطيب صەحیحە بەڵام مەحاڵە کەسێکی عامی قسەی ئاوا بکات چ جای أبو حنيفة ! وە دەڵێن سەنەدەکەی ابن حبان کەسانی مەجهولی تێدایە کە ئەمەیان ڕاستە، بەڵام وازیان لە سەنەدەکەی الفسوي هێناوە کە بە سەنەدێکی عالی ڕوایەتی کردووە کە تەنها سێ کەس لەنێوان خۆیی و أبو حنيفة-دا هەیە، ئێستاش باسی ئەم سێ کەسە دەکەین بزانین حاڵیان چۆنە لەڕووی جەرح و تەعدیلەوە، چونکە وەک ووتم ئەم سەنەدە بەسە بۆ حوکمدان لەسەر کافر بوونی أبو حنيفة.

**ڕاوی یەکەم: (علي بن عثمان بن نفيل)**

النسائي دەڵێ: ثقة

الذهبي دەڵێ: صدوق

ابن حجر دەڵێ: لا بأس به
مسلم بن القاسم الأندلسي دەڵێ: ثقة
لە كتێبی (تحرير تقريب التهذيب) هاتووە: سیقەیە، كۆمەڵێک كەسی سیقە ڕیوایەتیان لێوەی كردووە لەوانە النسائي، وە هیچ جەرحێكی تێدا نەزانراوە.
ووتم: سەیرەكە لەوە دایە هەندێک لە معاصرين دەڵێن علي مەجهولە !

**ڕاوی دووەم: (أبو مسهر الغساني)**

أبو حاتم الرازي دەڵێ: ثقة
ابن حبان دەڵێ: ئیمامی ئەهلی شامە لە حفظ و إتقان دان، وە مەرجەعیانە لە جەرح و تەعدیلی شێخەكانیاندا.
أبو داود دەڵێ: كان من ثقات الناس
الحاكم دەڵێ: إمام ثقة
أبو يعلى الخليلي دەڵێ: ثقة حافظ إمام متفق عليه
أحمد بن حنبل دەڵێ: رحم الله أبا مسهر ما كان أثبته. واتا چەندە پتەو بووە لە حفظ دا.
أحمد بن صالح الجيلي دەڵێ: ثقة
ابن حجر العسقلاني دەڵێ: ثقة فاضل
الذهبي دەڵێ: لە گەورەترین و فەصیحترین و حافزترینی زانایانە.
محمد بن عثمان التنوخي دەڵێ: لە شام هیچ كەس نیە وەک أبو مسهر، حافزترین كەسە.
محمد بن وضاح دەڵێ: ئیمامە شێخی شامە، لە گەورەترین و فەصیحترین و حافزترینی زانایانە.

**ڕاوی سێیەم: (يحيى بن حمزة)**

يحيى بن معين دەڵێ: ثقة
علي بن المديني دەڵێ: لەلای هاوەڵانمان سیقەیە
أبو حاتم الرازي دەڵێ: صدوق

العجلي دەڵێ: ثقة
الذهبي دەڵێ: قازی دیمەشق، ئیمامێکی سیقەیە
أبو داود دەڵێ: ثقة
الفسوي دەڵێ: سیقەیە ناسراوە
هشام بن عمار دەڵێ: قازی دیمەش بوو سیقە بوو
دحيم دەڵێ: سیقەیە زانایە، گومانم نیە زانایە
ابن الغلابي دەڵێ: سیقەیە

جا بەرگریکەران لە أبو حنيفة ئەمە دەکەن بە بیانوو کە (يحيى بن حمزة) خەڵکی دیمەشق بووە، أبو حنيفة-ش لە عیراق بووە هەرگیز نەچۆتە دیمەشق، يحيى هاوەڵایەتی أبو حنيفة-ی نەکردووە ئیتر ئەم ووتەیەی چۆن بیستووە لە أبو حنيفة ؟ بۆیە بەم بیانووە هاتوون سەنەدەکە بە زەعیف دادەنێن. لە وەڵامدا دەڵێین: بەڵێ ڕاستە أبو حنيفة نەچۆتە شام بەڵام دەیسەلمێنین يحيى هاتۆتە عیراق بگرە چۆتە کوفە لە سەردەمی أبو حنيفة-دا تەنانەت يحيى ڕیوایەتی هەیە لە سفيان الثوري کە سفیان لەیەک شارو لەیەک کاتدا لەگەڵ أبو حنيفة ژیاوە، ئیتر بۆ دەبێت أبو حنيفة-ی نەدیبێ ؟ گەر دەڵێن: ئەگەر بینیویەتی بۆچی ڕیوایەتی لە أبو حنيفة نەکردووە ؟ دەڵێین: جا کوا ئەهلی سوننە ڕیوایەت لە أبو حنيفة دەکەن تاکو يحيى ڕیوایەتی لێ بکات ؟ ئەوەتا کتێبەکانی فەرموودە بەتاڵە لەناوی أبو حنيفة، پاشان يحيى ئەم کوفرەی لێدیوە ئیتر چۆن ڕیوایەت لە کافر دەکات ؟ ئێستاش بەڵگەکان دەخەینە ڕوو کە يحيى چۆتە عیراق تەنانەت شارەکەی أبو حنيفة کە کوفەیە.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: **پرسیارم لە باوکم کرد دەربارەی فەرموودەیەک کە يحيى بن حمزة ڕیوایەتی دەکات لە سليمان بن داود پێم ووت: ئەم سليمان-ە کێیە ؟ باوکم ووتی: هەندێک خەڵک دەڵێن: سليمان بن أرقم-ە.**
**باوکم ووتی: يحيى بن حمزة هاتە عیراق، جا خەڵکی وادەبینن (أرقم) نازناوی سليمان بێ، داود-یش**

**ناوی باوکی بێت. وە هەندێک خەڵک دەڵێن: سليمان بن داود الدمشقي-ە شێخی يحيى بن حمزة، جا نازانم ئەم سليمانە کامەیانە، وە پێم وانیە دیمەشقیەکە بێت. وە دەووترێ: ئەم فەرموودەیان لە عیراق بیستووە لە فەرموودەی سليمان بن أرقم.** [العلل لابن أبي حاتم : 644]

ووتم: أبو حاتم الرازي ووتی کە يحيى هاتۆتە عیراق ئەمەش بەڵگەیە کە ئەگەری بینینی أبو حنيفة هەیە لەلایەن يحيى، هەروەها (سليمان بن داود يان بن أرقم) کە شێخی يحيى بن حمزة-یە خەڵکی بەصرەیە کونیەکەی (أبو معاذ البصري)ە وەک لە تهذيب الكمال و تقريب التهذيب هاتووە.

**أبو الحجاج المزي: لە ژیاننامەی (يحيى بن حمزة) ناوی شێخەکانی يحيى دەهێنێت لە چوارچێوەی ئەواندا ناوی سفيان الثوري دەهێنێت، کە هاوشار و هاوسەردەمی أبو حنيفة بووە. بڕوانە** [تهذيب الكمال : 31/278-279]

**ابن عساكر: لە ژیاننامەی (يحيى بن حمزة) ناوی شێخەکانی يحيى دەهێنێت، لە چوار چێوەی ئەواندا ناوی سفيان الثوري دەهێنێت. بڕوانە** [تاريخ دمشق : 64/125]

جا کاتێک يحيى هاتبێتە عیراق و ڕیوایەتی کردبێ لە سفيان الثوري کە هاو شار و هاو سەردەمی أبو حنيفة بووە لێرەدا بەپێی شەرطی مسلم صەحیحە چونکە يحيى بن حمزة و أبو حنيفة لەیەک سەردەمدا ژیاون ئەگەری بینینیش هەیە هیچ بەڵگەیەکیش نیە کە ئەوە یەکلایی بکاتەوە کە يحيى أبو حنيفة-ی نەدیوە، وە يحيى ناسراو نیە بە تەدلیس، جگە لەمەش ابن حبان بە سەنەدێکی زەعیف ڕیوایەتی کردووە کە تێیدا يحيى بن حمزة و سعيد بن عبدالعزيز دەڵێن بیستمان لە أبو حنيفة کە ئاوای ووت (قالا سمعنا أبا حنيفة يقول) بەڵام لەلای ابن حبان ووشەی (نعل) بۆتە (بغل) واتا هێستر، هەر چەندە سەنەدەکەی زەعیفە بەڵام تەنها لەبەر تصريح دانیان بە سەماع هێناومە.

**ابن حبان** دەڵێ: أخبرنا الثقفي قال حدثنا أحمد بن الوليد الكرخي قال حدثنا الحسن بن الصباح

قال حدثنا محفوظ بن أبي توبة قال حدثني ابن أبي مسهر قال حدثنا **يحيى بن حمزة و سعيد بن عبدالعزيز ووتيان: بيستمان أبو حنيفة دەيووت: گەر كەسێک ئەم هێسترە بپەرستێ بۆ ئەوەی نزیک بێتەوە لە الله جل وعلا، ئەوا نابینم هیچی تێدا بێ.** [المجروحين : 413/2]

ووتم: الكوثري جەهمی دونیا سەراوژوور دەكات بۆ بەرگری كردن لە أبو حنيفة تەنانەت هەندێكجار پەلاماری هاوەڵانیش دەدات گەر هیچ چارێكی نەبێت بۆ بەرگری كردن لێی، بەڵام دەربارەی ئەم ڕیوایەتەی يحيى بن حمزة تەنها یەک شتی كردووە بە بیانوو ئەویش ئەوەیە كە يحيى بن حمزة قەدەری بووە، ئینجا الكوثري دەڵێ: ووتەی قەدەرییەک نابێتە بەڵگە لەدژی پێشەوایەكی ئەهلی سوننە -واتا أبو حنيفة- المعلمي لە وەڵامی ئەم گومانەدا دەڵێ: يحيى بن حمزة بە ڕەئی خۆی قسە بكات بەڵێ نابێتە بەڵگە بەڵام ڕیوایەتەكانی هیچ ڕێگایەک نیە بۆ ڕەتكردنەوەی هەروەک لە قاعیدەكاندا باسمان كرد، وە يحيى بن معين و دحيم و أبو داود والنسائي و يعقوب بن شيبة و جگە لەوانیش تەوسیقیان كردووە، وە البخاري و مسلم احتجاجيان پێ كردووە لە الصحيحين، وە باقی پێشەواكانی تریش، وە بە هیچ شتێک لەكەدار نەكراوە تەنها قەدەر نەبێت، وە بانگەوازكەر نەبووە بۆ بیدعەكەی، وە موتابەعەش كراوە لەم ڕیوایەتەدا هەروەک پێشتر تێپەڕی بەسەرماندا لە ژیاننامەی القاسم بن حبيب، والله أعلم. [التنكيل : 846/1]

(محفوظ بن أبي توبة) لەهەردوو چاپی كتێبەكە توبة بۆتە ثوبة، توبة ڕاستە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا ابن رزق قال أخبرنا أحمد بن جعفر بن سلم قال حدثنا أحمد بن علي الأبار قال حدثنا عبدالأعلى بن واصل قال حدثنا أبي قال حدثنا ابن فضيل عن **القاسم بن حبيب ووتی: نەعلەكەم لەناو ووردە بەرد دانا، پاشان بە أبو حنيفة-م ووت: گەر كەسێک نوێژ بكات بۆ ئەم نەعلە تا دەمرێت بەڵام لە دڵیەوە الله دەناسێت، چی دەڵێی دەربارەی ؟ أبو حنيفة ووتی: ئیمانداره، منیش ووتم: تا هەتایە قسەت لەگەڵ ناكەم.** [تاريخ بغداد : 510/15]

ووتم: ئەم ڕیوایەتەی القاسم بن حبيب موتابەعەیە بۆ ڕیوایەتەكەی يحيى بن حمزة، ئەگەرچی هەردووک محقق-ی تاريخ بغداد وەک الكوثري ڕیوایەتەكەیان بە زەعیف داناوە بەهۆی القاسم بن

حبيب، بڕوانە بۆ [التنكيل : 1/632-635] المعلمي وەڵامی الكوثري داوەتەوە دەربارەی القاسم بن حبيب ئەگەرچی زەعیفیشە، هەر چەندە ڕیوایەتەكەی يحيى بن حمزة صەحیحە پێویستی بە موتابەعە نیە بۆ تەصحیح كردنی بەڵام ئەم ڕیوایەتەش پاڵپشتیەكی باشە بۆ ڕیوایەتەكەی ئەو تا نەڵێن جگە لە كەسێكی شامی كەس ئەم شتەی نەگێڕاوەتەوە لە أبو حنيفة، القاسم بن حبيب كوفیە هاوشار و هاوسەردەمی أبو حنيفة بووە، ئەمە لەكاتێكدا القاسم بن حبيب خۆی لەناو بەسەرهاتەكەدا بووە نەوەك بە سەنەد بیگێڕێتەوە تا بڵێین زەعیفە، ئایا كەسێك بەسەرهاتی نێوان خۆیی و هاوڕێیەكی بگێڕێتەوە كەس ڕەتی دەكاتەوە بە بیانووی ئەوەی ئەم كەسە زەعیفە لە ڕیوایەت كردنی فەرموودەدا ؟!

**الفسوي** دەڵێ: حدثنا أبو بكر الحميدي حدثنا حمزة بن الحارث مولى عمر بن الخطاب عن أبيه (الحارث بن عمير) ووتی: **بیستم پیاوێك پرسیاری لە أبو حنيفة دەكرد لە مزگەوتی حەڕام دەربارەی كەسێك كە بڵێ: شایەتی دەدەم كەعبە حەقە بەڵام نازانم ئەمە كەعبەیە یان نا ؟ أبو حنيفة ووتی: ئیمانداری حەقە. وە پرسیاری لێكرد دەربارەی كەسێك كە بڵێ: شایەتی دەدەم محمد كوڕی عبدالله پێغەمبەرە بەڵام نازانم محمد ئەو كەسەیە كە گۆڕەكەی لە مەدینەیە یان نا ؟ أبو حنيفة ووتی: ئیمانداری حەقە. أبو بكر الحميدي ووتی: هەر كەسێك وابڵێ ئەوا كافر بووە.**
**[المعرفة والتاريخ : 2/787]**

ووتم: أبو بكر الحميدي ئیمامە و حافزێكی ناسراوە قسەی لەسەر ناكرێ.

حمزة بن الحارث مولى عمر بن الخطاب ووتەی زانایانی جەرح و تەعدیل بەم شێوەیە دەربارەی:

ابن سعد دەڵێ: سیقەیە فەرموودەی كەمە

ابن حبان لە كتێبی (الثقات) هێناویەتی

ابن حجر دەڵێ: سیقەیە

المزي: ئاماژەی بە تەوسیقی ابن سعد و ابن حبان داوە

الذهبي دەڵێ: ابن سعد و جگە لەویش تەوسیقیان كردووە

جگە لەمانەش کەسی تر قسەی لەسەر نەکردووە، وە لە هیچ زانایەک نەهاتووە کە تەزعیفی بکات.

(الحارث بن عمير أبو عمير البصري) باوکی حمزة کە ڕاوی ئەم بەسەرهاتەیە، ووتەی زانایانی جەرح و تەعدیل بەم شێوەیە دەربارەی:

أبو بكر بن أبي شيبة دەڵێ: ثقة

أبو حاتم الرازي دەڵێ: ثقة

أبو زرعة الرازي دەڵێ: ثقة رجل صالح

يحيى بن معين دەڵێ: ثقة

الفسوي دەڵێ : ثقة

النسائي دەڵێ : ثقة

أحمد بن صالح الجيلي دەڵێ: ثقة

الدارقطني دەڵێ: ثقة

حرب بن سليمان دەڵێ: حماد بن زيد الحارث-ی پێش دەخست و ستایشی دەکرد، وە دەڵێ: لە هاوەڵە سیقەکانی أيوب السختياني-ە.

أبو الفتح الأزدي دەڵێ: ضعيف منكر الحديث

ابن الجوزي لە ابن خزيمة نەقل دەکات کە وتوویەتی: درۆزنە

ابن حبان دەڵێ: لە کەسە سیقەکانەوە شتانێکی هەڵبەستراو دەگەڕێتەوە، وە دەڵێ: زەعیفە، فەرموودەی مونکەری هەیە.

الحاكم دەڵێ: لە حميد الطويل و جعفر بن محمد چەند فەرموودەیەکی هەڵبەستراو دەگێڕێتەوە، وە دەڵێ: زەعیفە.

الذهبي دەڵێ: وای نابینم جگە لەوەی کە زەعیفە زۆر بە ڕوونی، وە پێم سەیرە النسائي چۆن ڕیوایەتی لێوە کردووە ! وە دەڵێ: وانازانم کەسێک لە المتقدمين بە زەعیفی دانابێت پێش ابن حبان، وە کارێکی چاکی کردووە ابن حبان.

ابن حجر دەڵێ: جمهوری زانایان بە سیقەیان داناوە، وە فەرموودەكانی شتی مونكەریان تێدایە، بەهۆی ئەمەوە أبو الفتح الأزدي و ابن حبان و جگە لەوانیش بە زەعیفیان داناوە، وە لەوانەیە لەكۆتایی تەمەنیدا توانای لەبەر كردنی گۆڕا بێت.

جا وەک دەیبینن خیلاف هەیە دەربارەی، بەڵام ئەوانەی كە بە سیقەیان داناوە باڵا دەسترن لە عیلمەكەدا وەک لەوانەی بە زەعیفیان داناوە، چونكە ئەوانەی بە سیقەیان داناوە لە پێشەوایانی المتقدمین-ن كە هیچ كام لە ابن خزيمة و ابن حبان و أبو الفتح و الحاكم ناگەن بە ئاستی ئەوان، مەحاڵیشە ڕاوییەک لە سەردەمی زێڕینی فەرموودەدا لەلای ئەم زانا گەورانە سیقە بێت، دواتر لە سەدەی چوار بەدواوە دەركەوێ كە زەعیف بووە، ئەمە جگە لەوەی كە المعلمي ئەوەی یەكلا كردۆتەوە كە ووتەی ئەو زانایانە وەردەگیرێت كە بە سیقەیان داناوە نەک ئەوانی دواتر، وە دەڵێ: عبدالرحمن بن مهدي ڕیوایەتی كردووە لە الحارث، وە ووتەی ئیمام أحمد نەقل دەكات كە دەڵێ: عبدالرحمن بن مهدي ڕیوایەت ناكات تەنها لە كەسانی سیقەوە نەبێت، سەرەڕای ئەمەش المعلمي وەڵامی ئەوانەشی داوەتەوە كە بە زەعیفیان داناوە، من پوختەكەی ووتەكەی المعلمي نەقل دەكەم بە ماناوە، المعلمي دەڵێ: ابن الجوزي بەبێ سەنەد ووتەكەی ابن خزيمة-ی نەقل كردووە، وە لە نەقل كردنی ووتەكاندا وورد نیە، ئینجا چەند هەڵەیەكی ابن الجوزي باسكردووە دەربارەی ڕاوییەكان لەكاتی نەقل كردنی ووتەی زانایانی جەرح و تەعدیل، وە بە ووتەی الذهبي و ابن حجر پشت ڕاستی دەكاتەوە كە ابن الجوزي ووتە نەقل دەكات بەبێ لێكۆڵینەوە لێی، دەربارەی ابن حبان دەڵێ: ابن حبان دوو فەرموودەی الحارث بن عمير-ی بە مونكەر داناوە بۆیە پێی وایە زەعیفە، وەڵامی ئەم دوو فەرموودەیەشی داوەتەوە كە هەڵەكە لەپێشترە لەسەر ڕاوییەكی تر حیساب بكرێ نەک لەسەر الحارث، وە المعلمي پێی وایە كە الحاكم لاسایی ابن حبان-ی كردۆتەوە لە بە زەعیف دانانی الحارث، وە أبو الفتح الأزدي خۆی قسەی لەسەر هەیە بۆیە قسەی ئەو دەربارەی ڕاوییەكان قبوڵ ناكرێ، ووتەی ابن حجر نەقل دەكات كە وتوویەتی: أبو الفتح الأزدي خۆی زەعیفە چۆن ووتەی قبوڵ دەكرێ لە جەرح كردنی ڕاوییە سیقەكان.

بڕوانە [التنكيل : 1/367-376]

پاشان لێرەدا الحارث بن عمير خۆی ووتەکەی بیستووە و لە شوێنەکەدا ئامادە بووە لە هیچ کەسێکی ڕیوایەت ناکات تا بڵێین زەعیفە، هەروەک لە لاپەڕە 27-32 وەڵامی ئەم گومانەمان داوەتەوە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني الحسن بن محمد الخلال قال حدثنا محمد بن العباس الخزاز قال حدثنا محمد بن محمد الباغندي قال حدثنا أبي ووتی: **من لەلای عبدالله بن الزبير (الحميدي) بووم نامەی أحمد بن حنبل-ی بۆ هات، تێیدا نوسرابوو: ناشرینترین بابەتم بۆ بنوسە دەربارەی أبو حنيفة، الحميدي بۆی نوسی: حدثنا الحارث بن عمير ووتی: بیستم أبو حنيفة دەیووت: گەر کەسێک بڵێ: دەزانم الله ماڵێکی هەیە بەڵام نازانم ئەو ماڵەیە کە لە مەککە دایە یان ماڵێکی ترە، ئایا ئیماندارە؟ ووتی: بەڵێ، وە ئەگەر کەسێک بڵێ: دەزانم پێغەمبەر ﷺ مردووە بەڵام نازانم لە مەدینە نێژرا یان لە شوێنێکی تر، ئایا ئیماندارە ؟ ووتی: بەڵێ.**

**الحارث بن عمير ووتی: وە بیستم دەیووت: گەر دوو شایەت شایەتی بدەن لەلای قازی کە فلانی کوڕی فلان ژنەکەی تەڵاق داوە، وە هەردووکیشیان بزانن کە بە درۆ شایەتی دەدەن، جا قازی ژن و مێردەکە لەیەکتر جیا بکاتەوە (بەهۆی شایەتیەکەی ئەوان) پاشان یەکێک لەم شایەتانە بۆی هەیە ژنەکە مارە بکات ؟ ووتی: بەڵێ، ووتی: پاشان قازی زانی کە بە درۆ شایەتیان داوە، بۆی هەیە لەیەکیان جیا بکاتەوە ؟ (واتا: شایەتمانەکە و ژنەکە) ووتی: نەخێر. [تاريخ بغداد : 15/507-508]**

ووتم: محقق-ی تاريخ بغداد(١) ئەمەشی بە زەعیف داناوە بەهۆی (الحارث بن عمير) ئێمەش وەڵاممان داوەتەوە، بەڵام المعلمي سەرەڕای بە صەحیح دانانی ڕیوایەتەکە پێی وایە سەنەدەکە بەم شێوەیە (الحميدي عن حمزة بن الحارث عن الحارث بن عمير) واتا (حمزة بن الحارث) کەوتووە لە سەنەدەکەدا لەنێوان الحميدي و الحارث-ی باوکی، هەڵەی ئەمەشی لەسەر محمد بن محمد الباغندي حیساب کردووە، پێم وایە ئەمەش ڕاستە چونکە لە سەنەدەکانی تر الحميدي لە حمزة ڕیوایەت دەکات حمزة-ش لە الحارث-ی باوکی، بەڵام لێرەدا حمزة بوونی نیە، محقق-ی تاريخ

بغداد(٢) تەزعیفی کردووە بەهۆی محمد بن محمد الباغندي، خیلاف زۆرە دەربارەی بەڵام ئەوەی پێی ووتراوە دەربارەی تەدلیس بووە کە زۆر بە خراپی تەدلیسی کردووە ئەگینا صدوق-ە، وە ئێمە ئەم ڕیوایەتەمان وەک پشتگیری هێناوە نەک پشت بەستمان تەنها بەم ڕیوایەتە بێ.
هەروەها عباد بن کثیر هەمان ووتەی لە أبو حنیفة گێڕاوەیەوە وەک لە [تاريخ بغداد : 508/15] هاتووە، ئەگەرچی عباد بن كثير الثقفي مەتروکە بەڵام خۆی ووتەکەی بیستووە لە أبو حنيفة ڕیوایەتی نەکات لە کەسێکی ترەوە بەڵام لە سەنەدەکەیدا مؤمل بن إسماعيل هەیە کە حفزی باش نیە بۆیە نەمهێناوە، بەڵام کەسیان ئینکاری لە صالحی و دینداری و فەزڵی عباد بن کثیر ناکەن، کەسێک ئەمە حاڵی بێت بەسەرهاتێک بگێڕێتەوە کە خۆی لەوێدا ئامادەبووە جیاوازە لەگەڵ گێڕانەوەی لە کەسانی ترەوە هەر چەندە نامەوێ ئەم ڕیوایەتەی عباد بکەم بە بەڵگە چونکە کردوومە بە مەرج تەنها ڕیوایەتی صحيح و حسن بهێنم لەم کتێبەدا، بەڵام باسکردنی هەمان بەسەرهات لەلایەن عباد-ەوە مانای ئەوە دەدات کە الحارث بن حمزة ڕاست دەکات و بەسەرهاتەکە بوونی هەیە، هەروەها مؤمل لە متابعات و شواهد پشتی پێ دەبەسترێ.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني إبراهيم بن سعيد حدثنا أبو توبة عن **أبي إسحاق الفزاري ووتی: أبو حنيفة دەیووت: ئیمانی ئیبلیس و ئیمانی أبو بكر الصديق** رضي الله عنه **یەک شتە، أبو بكر ووتی: یا رب، ئیبلیسیش ووتی: یا رب.** [السنة : 352] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**
ووتم: ووتەکەی هەمان ووتەی جەهمی کوڕی صەفوانە، بەڵام ڕیوایەتێک هاتووە لەلای ابن عدي کە پێچەوانەی ئەمەیە.

**ابن عدي** دەڵێ: حدثنا أحمد بن حفص حدثنا حفص بن طرخان حدثنا غسان بن الفضل حدثنا حماد بن زيد ووتی: **بە أبو حنيفة-م ووت: جابر لە تۆوە دەیگێڕێتەوە کە دەڵێی: ئیمانم وەک ئیمانی جبريل و ميكائيل وایە، أبو حنيفة ووتی: من وام نەووتوە، وە هەر کەسێک وابڵێ ئەوا بیدعەچیە. غسان بن الفضل دەڵێ: منیش ئەم ووتەیەی حماد بن زيد-م گێڕایەوە بۆ محمد بن الحسن-ی ئەهلی ڕەئی، محمد ووتی: حماد ڕاست دەکات، أبو حنيفة حەزی نەدەکرد ئەمە بووترێ.**

[الكامل في ضعفاء الرجال : 127/10]

ووتم: شێخى ابن عدي لەم ڕيوايەتەدا (أحمد بن حفص السعدي)ە.

الذهبي دەڵێ: شێخى ابن عدي-ە فەرموودەى مونكەرى هەيە، هەروەها دەڵێ: زەعيفە هيچ نيە.

حمزة السهمي دەڵێ: بە ئەنقەست درۆ ناكات. (واتا: فەرموودەى درۆى هەيە بەڵام بەهۆى هەڵەوە توشى دەبێت).

ابن عدي دەڵێ: فەرموودەى مونكەرى گێڕايەوە كەس موتابەعەى نەكردووە (واتا: كەس نەى گێڕاوەتەوە جگە لەو) ئينجا دواى هێنانى ژمارەيەک فەرمووى أحمد بن حفص، ابن عدي دەڵێ: هەمووى لە ڕيوايەتى هشام بن عروة-يە لە باوكيەوە ئەويش لە عائيشەوە بە سەنەدێكى دروستكراو لەلايەن أحمد-ەوە، پاشان دەڵێ: ئەمانە هەمووى مونكەرن جگە لە أحمد كەس نەى گێڕاوەتەوە، وە أحمد لەلاى من لەوانەيە كە بە ئەنقەست درۆ ناكات، لەوانەيە كە فەرموودەى لێ تێكەڵ دەبێت و دەى گێڕێتەوە لە حفزييەوە ئينجا هەڵەى تێدا دەكات.

منيش دەڵێم: مەرج نيە ئيللا درۆزن بێ تەنها زەعيف بوونى بەسە بۆ ڕەت كردنەوەى ڕيوايەتەكەى. ڕاوى دووەم (حفص بن طرخان) مەجهولە، هەروەها ڕاوى سێيەم (غسان بن الفضل) ابن حجر بە مەقبول-ى داناوە، مەقبوليش لاى ئەو وەک خۆى باسى دەكات گەر موتابەعەى هەبوو حەسەنە، گەر نەيبوو زەعيفە لێرەدا موتابەعەى نيە، ابن حبان-يش لە كتێبى (الثقات) هێناويەتى بەبێ تەوسيق كردنى ئەمەش جێگاى تێڕامانە كاتێک ابن حبان ڕاوييەک لە كتێبى (الثقات) دەهێنێت هيچ لەفزێكى تەعديل كردنى بۆ بەكار ناهێنێت و لێى بێ دەنگ دەبێت، المعلمي مەنهەجى ابن حبان-ى لە كتێبى (الثقات) بۆ پێنج پلە دابەش كردووە كە پلەى پێنجەميان ئەو جۆرەيانە كە ابن حبان بێدەنگ دەبێت لە ڕاوييەكە، المعلمي دەڵێ: لەم جۆرەيان حوكمەكەى ابن حبان لە هەڵە بەدەر نيە، شوێنەكە هى درێژكردنەوە نيە زەعيفى و جەهالەتى دوو ڕاوييەكەى تر بەسە بۆ بە زەعيف دانانى ئەم ڕيوايەتە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا أبو القاسم عبدالرحمن بن محمد بن عبدالله السراج بنيسابور أخبرنا أبو

الحسن أحمد بن محمد بن عبدوس الطرائفي حدثنا عثمان بن سعيد الدارمي حدثنا محبوب بن موسى الأنطاكي ووتى: **بيستم أبو إسحاق الفزاري دەيووت: بيستم أبو حنيفة دەيووت: ئيمانى أبو بكر الصديق و ئيمانى ئيبليس يەک شتە، ئيبليس ووتى: يا رب، أبوبكر ووتى: يا رب. أبو إسحاق الفزاري ووتى: هەركەسێک لە مورجيئەكان واناڵێت ئەوا ووتەكەى بەسەريدا دەشكێتەوە.**

**[تاريخ بغداد : 509/15] (سەنەدەكەى حەسەنە).**

ووتم: ئەمەش مولزەم كردنى مورجيئەيە لەلايەن أبو إسحاق-ەوە كە هەموو مورجيئەيەک عەقيدەكەى مولزەمى دەكات بەوەى كەوا بڵێت، گەر ئامادە نەبوو وابڵێت ئەوا عەقيدە ئيرجائەكەى بەسەريدا دەشكێتەوە، بۆيە بەلاتەوە سەير نەبێت كە أبو حنيفة چۆن قسەيەكى ئاواى كردووە.

**الفسوي** دەڵێ: حدثني أبو بكر عن أبي صالح الفراء **عن الفزاري ووتى: أبو حنيفة ووتى: ئيمانى آدم و ئيمانى ئيبليس يەک شتە، ئيبليس ووتى:** ﴿رَبِّ بِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي﴾ **وە ووتى:** ﴿رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ﴾ **وە آدم ووتى:** ﴿رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا﴾. **[المعرفة والتاريخ : 788/2] (سەنەدەكەى حەسەنە).**

**عبدالله** دەڵێ: حدثني محمود بن غيلان حدثنا **محمد بن سعيد بن سلم عن أبيه ووتى: پرسيارم لە أبو يوسف كرد كە لە (جرجان) بوو دەربارەى أبو حنيفة، ووتى: چى لێدەكەى ؟ بە جەهميەتى مرد. [السنة : 217]**

ووتم: الكوثري ئەم ڕيوايەتەى بە زەعيف داناوە بەهۆى محمد بن سعيد بن سلم، گوايە زانايانى جەرح و تەعديل وتوويانە زەعيفە و فەرموودە تێكەڵ دەكات، بەڵام وەک المعلمي وەڵامى داوەتەوە محمد بن سعيد بن سلم الباهلي كەسێكى ترە ئەو كەسە نيە كە الكوثري بۆى چيە، وە المعلمي ئەوەشى داوەتە پاڵ الكوثري كە دەزانێ ئەم محمد-ە ئەوە نيە كە جەرح كراوە بەڵام وەكو فێڵكردن لە خوێنەر ويستوويەتى بيكات بەو محمد-ە كە زەعيفە تاكو بەهۆيەوە ڕيوايەتەكەى پێ تەزعيف بكات، ئەگينا محمد بن سعيد بن سلم جەرح نەكراوە. بڕوانە [طليعة التنكيل : 26-28]

ئەگەرچی محمد بن سعيد بن سلم جەرح و تەعدیلی بۆ نەکراوە بەڵام ڕیوایەتێکی تر هەیە لە تاريخ بغداد کە ئەمە پشت ڕاست دەکاتەوە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني الحسن بن محمد الخلال قال حدثنا أحمد بن إبراهيم بن الحسن قال حدثنا عمر بن الحسن القاضي قال حدثنا إسماعيل بن إسحاق قال حدثنا نصر بن علي قال حدثنا الأصمعي قال حدثنا **سعيد بن سلم الباهلي ووتی: ووتمان بە أبو يوسف بۆچی فەرموودەمان بۆ ڕیوایەت ناکەی لە أبو حنيفة-ەوە ؟ أبو يوسف ووتی: چی لێدەکەن ؟ ئەو ڕۆژەی کە مرد دەیووت قورئان مەخلوقە.**
[تاريخ بغداد : 519/15]

ووتم: الأصمعي صدوق-ە نزیکە لە ثقة، سعيد بن سلم الباهلي باسمان کرد کە صدوق-ە، ڕاوییەکانی تر هەموویان سیقە و حافزن، تەنها عمر بن الحسن القاضي الأشناني نەبێت خیلافی لەسەرە، محقق-ی تاريخ بغداد(١) دەربارەی دەڵێ: الدارقطني بە درۆزنی داناوە بۆیە هەڵبەستراوە. الذهبي لە ميزان الاعتدال دەڵێ: الدارقطني و الحسن بن محمد الخلال بە زەعیفیان داناوە، وە ڕیوایەت کراوە لە الدارقطني کە بە درۆزنی داناوە ئەمەش ڕاست نیە، بەڵام الأشناني خاوەنی بەڵایە. الخطيب البغدادي دەڵێ: لە سەردەمی إبراهيم الحربي فەرموودەی ڕیوایەت وتۆتەوە، ئەمەش بۆی گەورەترین شانازییە، بەڵگەشە کە ئەو لەچاوی خەڵکیدا گەورە بووە و پلەی لەلای خەڵکی بەڕێز بووە.

طلحة بن محمد دەڵێ: یەکێک بووە لە کەسە گەورەکان، وە یەکێکە لە هاوەڵانی فەرموودە کە بە باشی لێی دەزانێت، وە یەکێکە لە حافزەکان، وە فەرموودەی زۆری ڕیوایەت کردووە، وە خەڵکیش لێیان وەرگرتووە لە کۆن و ئێستاشدا.

الحاكم پرسیار لە أبو علي الهروي دەکات دەربارەی الأشناني: دەڵێ صدوق-ە، الحاكم پێی دەڵێ: هاوەڵانمان لە بغداد قسەی لەسەر دەکەن، أبو علي الهروي دەڵێ: نەمان بیستووە هیچ کەس قسەی پێ بڵێ تەنها ئەوە نەبێ کە ئیجازە بە سەماع دادەنێت، وە فەرموودە ڕیوایەت ناکات تەنها لە کتێبەکانیەوە نەبێ.

الحاكم دەڵێ: بە الدارقطني-م ووت أبو علي الحافظ وادەڵێ، الدارقطني ووتی: شێخەکەمان قسەیەکی خراپی کردووە.
أبو سعد السمعاني دەڵێ: خاوەنی فەرموودە بوو بە چاکی لێی دەزانی، زانستێکی چاکی هەبوو، فەرموودەی زۆری ڕیوایەت کرد و لێیان وەرگرت.

جا وەک دەبینن خیلاف هەیە دەربارەی گەر بڵێین زەعیفیشە ئەوا تەنها خۆی ئەمەی ڕیوایەت نەکردووە، لە ڕیوایەتی پێشووی عبدالله الأشناني تێدا نەبوو لە سەنەدەکە، گەر بڵێن کوڕەکەی سعيد بن سلم-ی تێدابوو جەرحی تەعدیلی بۆ نەکراوە، ئەوا عبدالله بە مانایەکی نزیک لەمە هێناویەتی بە سەنەدێکی جیاوازتر لەوەی خۆی کە کوڕەکەی سعيد بن سلم-ی تێدا نیە، وە عالی تر لە سەنەدی الخطيب کە الأشناني تێدا نیە.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني إسماعيل بن إسحاق القاضي الأزدي حدثني نصر بن علي حدثنا الأصمعي عن **سعيد بن سلم ووتی: بە أبو يوسف-م ووت: ئايا أبو حنيفة هەمان قسەی جەهمی دەکرد ؟ ووتی: بەڵێ.** [السنة : 218] **(سەنەدەکەی حەسەنە).**
ووتم: إسماعيل و نصر و الأصمعي و سعيد هەمان کەسانی سەنەدەکەی الخطيب-ن بەڵام بەهۆی عالی بوونی سەنەدەکەی عبدالله دەربازمان بوو لە الأشناني.

**الفسوي** دەڵێ: حدثنا عبيدالله بن معاذ حدثني محمد بن معاذ ووتی: **بيستم سعيد بن مسلم ووتی: بە أبو يوسف-م ووت: ئايا أبو حنيفة جەهمی بوو ؟ ووتی: بەڵێ، ووتم: ئايا مورجيئە بوو ؟ ووتی: بەڵێ.** [المعرفة والتاريخ : 782/2]
ووتم: لێرەدا سعيد بن سلم بۆتە سعيد بن مسلم، هەرچەندە محقق ئاماژەی بەمە نەداوە لە حاشيە، وە منيش نوسخەی دەستنوسم لەبەردەست نيە تا بگەڕێمەوە سەری، وە هەرچەندە لە تەحقيقی خليل المنصور بەهەمان شێوە بە سعيد بن مسلم هاتووە، بەڵام پێش ئەمە چوار ڕيوايەتمان هێنا بەدوای يەکتردا کە لە هەر چواریاندا سعيد بن سلم ئەم پرسيارە لە أبو يوسف

دەکات ئەویش ئاوا وەڵامی دەداتەوە، بۆیە تەنها بە بەراووورد کردنی چوار ڕیوایەتەکەی تر لەگەڵ ئەم ڕیوایەتە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم ڕاوییە سعید بن سلم-ە بەهەڵە بۆتە سعید بن مسلم.

**الفسوي** دەڵێ: حدثنا أبو جزء عن عمرو بن سعيد بن مسلم ووتی: **بیستم باپیرم ووتی: بە أبو یوسف-م ووت: ئایا أبو حنيفة مورجيئە بوو ؟ ووتی: بەڵێ، ووتم: ئایا جەهمی بوو ؟ ووتی: بەڵێ.**

[المعرفة والتاريخ : 783/2]

ووتم: ئەم سەنەدە زۆر بە کێشەیە، محقق لە حاشیەدا دەڵێ: لە نوسخەی دەستنوس بە (أبو جزي) هاتووە بەڵام الذهبي لە میزان الاعتدال بە (أبو جزء) هێناویەتی منیش لەسەر ئەو ڕاستم کردۆتەوە، ئینجا ووتەی زانایانی جەرح و تەعدیل دەربارەی أبو جزء نصر بن طريف نەقل دەکات کە مەتروکە، وە دەڵێ: الفسوي لە ڕێگای أحمد بن الخليل ئەمەی ڕیوایەت کردووە لە أبو جزء.

منیش دەڵێم: ڕاستە الذهبي لە میزان الاعتدال کەسێکی هێناوە بەناوی (أبو جزء القصاب نصر بن طريف) بەڵام الذهبي بەهیچ جۆرێک باسی ئەم سەنەدەی الفسوي نەکردووە و ئاماژەی پێنەداوە تا بڵێین ئەم ڕاوییە أبو جزء-ە لە نوسخەکەی بەردەستی الذهبي هەر بە أبو جزء هاتووە، بە چ بەڵگەیەک الذهبي باسی ئەم ڕاوییە دەکات ؟ بۆیە قسەکەی محقق لەجێگای خۆیدا نیە کە دەڵێ لەسەر کتێبەکەی الذهبي ڕاستم کردۆتەوە.

وە بەپێی قسەکەی محقق کە دەڵێ أبو جزء ڕاستە نەک أبو جزي، کەواتە الفسوي دەڵێ: (حدثنا أبو جزء) هیچ بەڵگەیەکیش نیە کە لەنێوان الفسوي و أبو جزء ڕاوییەکی تر هەبێت، ئەمەش مەحاڵە الفسوي لە أبو جزء ڕیوایەت بکات ڕاستەوخۆ چونکە أبو جزء ساڵی 170 مردووە ئەوکات الفسوي لە دایک نەبووە، هەر بۆیە محقق تا لەم کۆسپە دەربازی بێت لەخۆیەوە دەڵێ لەنێوان الفسوي و أبو جزء أحمد بن الخليل هەیە بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەک بهێنێت بۆ سەلماندنی قسەکەی بۆ نموونە بڵێ لە یەکێک لە نوسخە دەستنوسەکان لەنێوان الفسوي و أبو جزء أحمد بن الخليل هەیە لەم سەنەدەدا، پاشان أبو جزء ڕیوایەتی هەیە لە قتادة کە تابعیە

ساڵی 118 مردووە، کەسێک سەنەدی ئاوا عالی بێت و بە قتادة بگات چۆن لە ڕێگای عمرو بن سعید بن مسلم ئەویش لە ڕێگای باپیریەوە ڕیوایەت دەکات لە أبو یوسف ؟! بۆیە ئەستەمە أبو جزء کە ڕاستەوخۆ لە قتادة ڕیوایەت دەکات پێویستی بە دوو ڕاوی بێت تا بگات بە أبو یوسف لەکاتێکدا أبو یوسف تەمەنی 5 ساڵ بووە کە قتادة مردووە، پاشان أبو جزء ڕیوایەتی هەیە لە حماد بن أبي سلیمان کە شێخی أبو حنیفة-یە أبو یوسف تەمەنی 7 ساڵ بووە کە حماد مردووە، ئایا دەکرێ أبو جزء ڕاستەوخۆ لە شێخی أبو حنیفة ڕیوایەت بکات بەڵام بۆ ئەوەی ڕیوایەت لە قوتابیەکەی أبو حنیفة بکات پێویستی بە دوو ڕاوی تر بێت تا پێی بگات ؟!

بەهەمان شێوە محقق-ی تاریخ بغداد(١) باسی هەڵەکەی محقق دەکات، بۆ ئەوە دەچێت کە سەنەدەکە بەم شێوەیە بێت (أبو جزي بن عمرو) نەک (أبو جزء عن عمرو) دەڵێ: لە هەندێک نوسخەی دەستنوس (أبو جزي بن عمرو) هاتووە کە ئەوەیان دروستە بەڵام لە هەندێکیان (بن) گۆڕاوە بۆ (عن) کە هەڵەیە، کەواتە عمرو باوکی أبو جزي-ە، وە دەڵێ: گەر بە قسەی محقق-ی کتێبەکەی الفسوي بێت کە دەڵێ: (أبو جزء عن عمرو بن سعید بن مسلم) ئەوا هیچ ڕاویەک لە کتێبەکاندا نیە بەناوی عمرو بن سعید بن مسلم تا بڵێین أبو جزء ڕیوایەتی لێوە کردووە، وە دەڵێ: پێم وایە بەم شێوەیە صەوابە (حدثنا أبو جزي بن عمرو بن سعید بن سالم قال سمعت جدي) أبو جزي نەوەی سعید بن سالم القداح-ە لە باپیریەوە ڕیوایەتی کردووە.
بڕوانە حاشیەی [تاریخ بغداد : 15/512-513]

منیش دەڵێم: ئەوەی محقق-ی تاریخ بغداد بۆی چوو لە ڕەددانەوەی محقق-ی کتێبی المعرفة والتاریخ دروستە، بەڵام پێم وایە محقق-ی تاریخ بغداد لەوەدا کەوتۆتە هەڵەوە کە (سعید بن مسلم) دەکات بە (سعید بن سالم القداح) چونکە بەپێی ئەم هەموو ڕیوایەتانەی پێشوو کە هێنامان (سعید بن سلم الباهلي) ئەم پرسیارە لە أبو یوسف دەکات، وە تەنها لەڕێگای ئەو ئەم ووتەیەی أبو یوسف ڕیوایەت کراوە کەسی تر ڕیوایەتی نەکردووە، بۆیە لەپێشترە کە بڵێین ئەم سعید بن مسلم-ە سعید بن سلم-ە هەروەک لە ڕیوایەتی پێشوودا ئاماژەمان پێدا، ئەم ڕیوایەتەش

زەعیفە چونکە نازانین أبو جزي و عمرو حاڵیان چۆنە، گەر أبو جزء-یش بێت بەپێی قسەی محقق ئەوا سەنەدەکە زۆر زەعیفە چونکە أبو جزء مەتروکە، بەڵام بۆیە هێنام کاتێک چوار کەسی جیاواز هەمان شت لە سعيد بن سلم الباهلي ڕیوایەت دەکەن ئەوا ئەم دوو ڕیوایەتەش هەر بۆ ئەوەمان دەبەن کە سعيد بن مسلم هەر سعيد بن سلم بێت بەڵام تصحيف ڕوویدا بێت بۆتە (مسلم) دوای هێنانی ئەم هەموو ڕیوایەتەش تەواو دڵنیا دەبینەوە لە دروستی ئەم ووتەیەی أبو يوسف.

هەروەها المعلمي لە [التنكيل : 852/1] ئاماژەی پێداوە کە ئەم ڕاوییە ناوی (أبو جزي بن عمرو بن سعيد بن سلم الباهلي)ە.

الكوثري دەڵێ: سعيد بن سلم دروستە بەڵام نەزانراوە کە سعيد بن سلم کوڕی هەبێت بەناوی عمرو، وە نەزانراوە کە نەوەی هەبێت کونیەکەی أبو جزي بێت.

المعلمي دەڵێ: نەخێر بەڵکو ئەم شتە زانراوە، لە [الخصائص لابن جني : 308/3] شیعرێکی الأصمعي هاتووە کە ابن جني دەڵێ: الأصمعي ئەم شیعرەی بۆ أبو توبة ميمون بن حفص پەروەردەکەری عمرو بن سعيد بن سلم ووتوە بە ئامادە بوونی سعيد.

هەروەها المعلمي دەڵێ: لە [الكامل في اللغة والأدب للمبرد : 30/2] تێیدا هاتووە: وحدثني علي بن القاسم قال حدثني أبو قلابة الجرمي ووتی: حەجمان کرد جارێکیان لەگەڵ أبو جزء بن عمرو بن سعيد.

المعلمي دەڵێ: أبو جزء کوڕی عمرو ئەمیر بووە، عمرو کوڕی سعيد ئەمیر بووە، سعيد کوڕی سلم ئەمیر بووە، سلم کوڕی قتيبة ئەمیر بووە، قتيبة ئەمیر بووە.

منیش دەڵێم: هەموو ئەم بەڵگانە پشت ڕاستی دەکەنەوە کە سەنەدەکە بەم شێوەیە (أبو جزي بن عمرو بن سعيد بن سلم قال سمعت جدي) واتا أبو جزي لە سعيد بن سلم-ی باپیری ڕیوایەتی کردووە، لێرەدا مەبەست ئەوە نیە بڵێین أبو جزي سیقەیە یان نا کەس باسی نەکردووە لەم ڕووەدا، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە سعيد بن مسلم یان سعيد بن سالم هەردووکیان هەڵەیە ڕاستەکەی سعيد بن سلم-ە کە کەسێکی صدوق-ە وەک لە ڕیوایەتەکانی پێشوو باسمان کرد، سەبارەت بەوەش کە لەلای المبرد بە أبو جزء هاتووە نەک أبو جزي ڕەنگە ئەمە هەڵەی چاپ بێ، گریمان أبو

جزء-یش بێت ئەو کەسە نیە کە محقق-ی کتێبەکەی الفسوي بۆی چوو چونکە ئەمەیان وەک زانیمان کوڕی عمرو بن سعید بن سلم-ە ئەوەی محقق بۆی چوو ناوی نصر بن طریف أبو جزء القصاب بوو دوور و نزیک پەیوەندی بەمەوە نیە، بگرە الفسوي دوای مردنی ئەمە لەدایکبووە وەک باسمان کرد ئیتر چۆن ڕیوایەتی لێوە دەکات ؟!

**البرذعي** دەڵێ: **بیستم أبو زرعة دەیووت: أبو حنیفة جەهمی بوو، وە محمد بن الحسن جەهمی بوو، وە أبو یوسف جەهمی بوو جەهمی بوونێکی ڕوون.** [سؤالات البرذعي لأبي زرعة : 494] ووتم: لێرەدا ئاوا هاتووە (وكان أبو يوسف جهميا بين التجهم) واتا جەهمی بوونێکی ڕوون، بەڵام لە تاریخ بغداد هاتووە (وكان أبو يوسف سليما من التجهم) واتا سەلامەت بووە لە جەهمی بوون، وە لە لسان الميزان هاتووە (وكان أبو يوسف بعيدا عن التجهم) واتا دوور بووە لە جەهمی بوون، وە پێم وایە أبو یوسف جەهمی نەبووە ئەگەرچی گومڕایی و بیدعەو هەڵەی گەلێک زۆرە و فەتوای فێڵاوی زۆر داوە، بەڵام ئەوەی مەبەستمانە لێرەدا أبو حنیفة-یە کە بە جەهمی دانراوە لەلایەن زانایەکی گەورەوە، سەنەدیش لە ئارادا نیە تا بڵێن زەعیفە.

## بڕگەی چوارەم:
## هەبوونی عەقیدەی موڕجیئە.

شتێک نەبووە لەلای سەلەف بەناوی (مرجئة الفقهاء) أبو حنيفة و هاوەڵەکانی بە موڕجیئە و أهل الرأي ناوبراون لەلای سەلەف نەوەک بەم ناوە چونکە خودی ناوەکە جۆرێک لە پلە بەرز کردنەوەی تێدایە بۆ أبو حنيفة، بۆیە ئەم زاراوەیە دانراوی خەلەفە بۆ جیاکردنەوەی ئیرجائی أبو حنيفة لە ئیرجائی جەهمیەکان.

مورجیئە بوونی أبو حنيفة ئەوەندە ڕوونە تەنانەت لای زۆرێک لە خۆشەویستانی أبو حنيفة ئەوانەی دەمارگیریان بۆی هەیە ئەوە دەزانن کە مورجیئە بووە و ناتوانن ئینکاری لێ بکەن، بۆیە پێویستی بەوە نەدەکرد باسی ئەم لایەنە بکەین، بەڵام کە دەبینم لای کەسانێک لە خەلەف و معاصرین کراون بە ئەهلی سوننە و ڕەددی ئەوانە دەدەنەوە کە بە ئەهلی بیدعە ناویان دەبەن، بۆیە بە پێویستم زانی زۆر لەسەری بدوێم کە خۆی بابەتەکە شایەنی زۆر  ووتن نیە چونکە ڕوونە، بەڵام تاکو نەتوانن بیدعەچیەکمان لێ بکەن بە ئەهلی سوننە، ئەهلی سوننەیەکیش کە ڕقی لەم بیدعەچیە بێت بیکەن بە خەواریج و جاهیل ...هتد، سەیرەکە لەوەدایە هەندێک لەوانەی کە دەزانن أبو حنيفة مورجیئە بووە وە دەزانن مورجیئە کۆمەڵەیەکی بیدعەچی و گومڕان کەچی سەرەڕای ئەوەش ئامادە نین بە أبو حنيفة بڵێن بیدعەچی یان گومڕا، بەهیچ ووشەیەک ڕازی نین بۆی بەکار  بێت جگە لە ئیمام ! یان هەندێکیان دەڵێن: خیلافی أبو حنيفة لە بابەتی ئیماندا خیلافێکی لەفزی بووە ! زۆر سەیرە ئەوانەی لەگەڵ أبو حنيفة ژیاون نەیانزانیوە أبو حنيفة خیلافەکەی لەگەڵ ئەواندا لەفزییە کەسێک دوای سەدان ساڵ هاتووە دەڵێ: ئێوە نەتانزانی خیلافی أبو حنيفة لەفزی بوو لەگەڵ ئێوەدا ! ئەی أبو حنيفة خۆی دەمی نەبوو بڵێ من خیلافەکەم لەگەڵ ئێوەدا لەفزییە منیش هەمان عەقیدەی ئێوەم هەیە دژم مەوەستن ؟ دوای سەدان ساڵ کەسانێک هاتن دەوری صولحیان بینی ووتیان ئێوە هیچ خیلافێکتان نیە تەنها لەفزییە ! یان هەیانە دەڵێ: ڕاستە مورجیئە بووە بەڵام ئیرجائەکەی ئەوەندە کاڵ دەکاتەوە وەک بڵێی تەنها وەک

نەزەر وابووە كە بە ئاوی دەست نوێژ دەڕوات هەر شایەنی باسكردن نیە ! نازانم بۆ ئەم بیدعە پیسەی أبو حنیفة كە ئیرجائە ئاوا بە سووكی و بچوكی سەیر دەكرێت ؟! بۆ مەگەر تا ئێستاش موسڵمانان بە دەست ئەم بیدعە پیسەوە ناڵێنن ؟ تەنها ووتنی ئەوەی كە كردار لە ئیماندا نیە بەسە كە بڵێین مورجیئەیە و گومڕا و بیدعەچیە، ئیتر بچووك كردنەوە و كەم كردنەوەی ووشەی ئیرجاء لە قەبارەی خۆیدا لەپێناوی أبو حنیفة بۆ ؟!

سەلەف كاتێك ووشەی مورجیئەیان بە ڕەهایی بەكارهێناوە مەبەستیان پێی مورجیئەی وەك أبو حنیفة و هاوشێوەكانی بووە نەک جەهمیەكان، ئەگەرچی جەهمیەكانیش مورجیئەن بەڵام زیادەڕەون بۆیە پێیان دەووترێ: (غلاة المرجئة) زانینی ئەمە گرنگە تا ئەو ووتانەی سەلەف كە دەربارەی مورجیئە ووتراوە نەیبەنەوە سەر جەهمیەكان بەڵكو جەهمیەكان بەناوی خۆیان ناوبراون لەلای سەلەف، نموونەش لەسەر ئەم جیاوازی كردنە:

**الخلال** دەڵێ: أخبرني أحمد بن أصرم أن **أبا عبدالله -واتا ئیمام أحمد- پرسیاری لێكرا دەربارەی مورجیئە، كێن ئەوان ؟ ووتی: ئەوانەن كە دەڵێن: ئیمان ووتەیە.**
**[السنة : 976] (سەنەدەكەی صەحیحە).**

**الخلال** دەڵێ: أخبرني محمد بن موسى و محمد بن علي أن حمدان بن علي الوراق حدثهم ووتی: **لای أحمد باسی مورجیئە كرا، پرسیارم لێیكرد و پێم ووت: ئەوان دەڵێن گەر كەسێك لە دڵیەوە پەروەردگاری ناسی ئیمانداره، أحمد ووتی: مورجیئەكان واناڵێن بەڵكو جەهمیەكان وادەڵێن.**
**[السنة : 980] (سەنەدەكەی صەحیحە).**

**الطبري** دەڵێ: سمعت عبدالله بن أحمد بن شبويه المروزي قال سمعت أبا رجاء دەیووت: **بیستم وكیع دەیووت: لەنێوان ووتەی جەهمیەكان و مورجیئەكان جیاوازییەكی گەورە نیە، جەهمیەكان ووتیان: ئیمان ناسینی دڵە، وە مورجیئەكان ووتیان: دان پێدانانە بە زمان. (واتا: ناسینی دڵیش).**
**[تهذيب الآثار: 2913] (سەنەدەكەی صەحیحە).**

# ووتەكانی سەلەف دەربارەی زەمكردنی مورجیئە:

پێش نەقل كردنی ڕیوایەتەكان دەمەوێ بڵێم لێرەدا نەم كردۆتەوە مەرج تەنها ڕیوایەتی صەحیح بهێنم بۆیە صەحیح و زەعیف تێكەڵە چونكە قسە ووتنی سەلەف بە مورجیئە پێویستی بەوە نیە لە سەنەدەكانی بكۆڵدرێتەوە گەر بێتو تەواوی ووتەی سەلەف دەربارەی ئەم گروپە نەقل بكەین ئەوا پێویستە چەند كتێبێك بنوسین، بۆیە گەڕان بەدوای سەنەدی صەحیح لە بابەتێكی ئاوادا لەجێگای خۆی نیە و دوورە لەپیشەی زانایان لە كۆن و نوێدا، بەڵام كاتێك دەچینە سەر زەمكردنی أبو حنيفة ئەوكات دووبارە پابەند دەبینەوە بە مەرجی كتێبەكە كە تەنها هێنانی ڕیوایەتی صەحیحە.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبي حدثني عبدالرحمن بن مهدي حدثنا حماد بن سلمة عن عطاء بن السائب عن **سعيد بن جبير ووتی: نموونەی مورجیئە وەكو نموونەی صابئیەكان وایە.** [السنة : 603]

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبي حدثنا مؤمل حدثنا سفيان حدثنا سعيد بن صالح ووتی: **إبراهيم ووتی: فیتنەی مورجیئە ترسناكترە لەسەر ئەم ئوممەتە لە فیتنەی ئەزاریقە. (واتا خەواریج).** [السنة : 604]

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبي حدثنا مؤمل بیستم سفيان دەیووت: **إبراهيم ووتی: مورجیئە ئەم دینەی والێكرد لە جلی ژێرەوە تەنكتر بێ.** [السنة : 605]

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبي حدثنا معاوية بن عمرو حدثنا أبو إسحاق ووتی: الأوزاعي ووتی: **يحيى و قتادة دەیانووت: لە بیدعەكاندا هیچ شتێك بەلایانەوە ترسناكتر نیە لەسەر ئوممەت لە مورجیئە.** [السنة : 620]

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبي حدثنا محمد بن عبدالله حدثنا عبدالله بن حبيب عن أمه ووتی: **بیستم باسی مورجیئە كرا، سعيد بن جبير ووتی: یەهود.** [السنة : 639]

**عبدالله** دەڵێ: حدثنا الحسن بن حماد الحضرمي سجادة حدثنا محمد بن فضيل عن مسلم الملائي عن إبراهيم ووتی: **خەواریج لەلای من عوزریان زیاترە لە مورجیئە.** [السنة : 684]

**عبدالله** دەڵێ: حدثني إسحاق بن بهلول ووتی: **بە يزيد بن هارون-م ووت: نوێژ بكەم لەدوای جەهمی ؟ ووتی: نەخێر، ووتم: نوێژ بكەم لەدوای مورجیئە ؟ ووتی: ئەوان پیسن.** [السنة : 57]

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبي حدثنا حجاج ووتی: **بیستم باسی مورجیئە كرا شريك ووتی: ئەوان پیسترین قەومن، پیسیەتی ڕافیزە بەسە، بەڵام مورجیئە درۆ دەكەن بەناوی الله تعالى.** [السنة : 601]

**اللالكائي** دەڵێ: أخبرنا محمد بن المظفر المقرئ قال حدثنا الحسين بن محمد بن حبش المقرئ قال حدثنا أبو محمد عبدالرحمن بن أبي حاتم ووتی: **پرسیارم لە باوكم و لە أبو زرعة كرد دەربارەی مەزهەبەكانی ئەهلی سوننە دەربارەی أصول الدين، وە چیان بینیوە لە زانایانی شارەكان و بیروباوەڕیان چۆن بووە لەم بارەیەوە ؟ جا ووتیان:** ... (لە بەشێكی وەڵامەكەیان باسی مورجیئە هاتووە كە دەڵێن) **مورجیئە بیدعەچی گومڕان.** [شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة : 321]

**الآجري** دەڵێ: حدثنا أبو بكر عبدالله بن محمد بن عبدالحميد الواسطي قال حدثنا زهير بن محمد المروزي قال حدثنا محمد بن كثير عن الأوزاعي عن **الزهري** ووتی: **لە ئیسلامدا هیچ بیدعەیەك دانەهێنراوە زیان بەخشتر بێ لەسەر ئوممەت لەم بیدعەی ئیرجائە.** [الشريعة : 275]

**اللالكائي** دەڵێ: أخبرنا عبدالرحمن بن عمر إجازة أخبرنا محمد بن أحمد بن يعقوب حدثنا جدي يعقوب بن شيبة قال حدثني يوسف بن موسى قال حدثنا جرير عن مفضل بن مهلهل عن **منصور بن المعتمر ووتی: ئەوان دوژمنی الله-ن مورجیئە و ڕافیزە.**
[شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة : 1817]

**الخلال** دەڵێ: أخبرنا أحمد بن محمد بن الحجاج أبو بكر المروذي قال سمعت أبا عبدالله دەیووت: ابن نمير ووتی: **بیستم سفیان دەیووت: دینی نوێ دینی ئیرجائە.** [السنة : 952]

**اللالكائي** دەڵێ: أخبرنا محمد بن الحسين بن يعقوب أخبرنا دعلج قال حدثنا أحمد بن علي الأبار قال حدثنا أبو غسان -يعني محمد بن عمرو- قال حدثنا إبراهيم بن المغيرة -كە لایەنگری حەججاج بوو- ووتی: **پرسیارم لە سفیان الثوري كرد، نوێژ بكەم لەدوای ئەو كەسەی كە دەڵێ: ئیمان ووتەیە بەبێ كردار ؟ ووتی: نەخێر، وە هیچ كەرامەتی نیە.** [شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة : 1825]

**الطبري** دەڵێ: حدثني عبدالله بن عمير الرازي قال سمعت إبراهيم بن موسى يعني الفراء الرازي ووتی: **پرسیار لە ابن عيينة كرا دەربارەی ئیرجاء، ووتی: ئیرجاء دوو جۆرە: كەسانێک دەربارەی علي و عثمان حوكم نادەن و هەڵی دەگرن بۆ الله ئەمانە ڕۆیشتن و بوونیان نەماوە، بەڵام مورجیئەی ئەمڕۆ دەڵێن: ئیمان ووتەیە بەبێ كردار، جا لەگەڵیان دامەنیشن و لەگەڵیان مەخۆن و مەخۆنەوە و نوێژیان لەگەڵ مەكەن و نوێژیان لەسەر مەكەن.** [تهذيب الآثار: 2909]

**ابن أبي يعلى** دەڵێ: **الخلال باسی أبو عبدالرحمن البوشنجي كردووە لە چوار چێوەی هاوەڵانی ئیمام أحمد، وە لە ئیمامەكەمان -واتا ئیمام أحمد- هەندێک شتی ڕیوایەت كردووە، یەكێک لەوانە: دەڵێ: بیستم أحمد دەیووت: نزیک بنەوە لە الله تعالى بە ڕق لێبوونەوەی ئەهلی ئیرجاء، ئەمە پتەوترین كارە لەلای ئێمە.** [طبقات الحنابلة : 264/1]

**ابن سعد** دەڵێ: أخبرنا محمد بن الصلت قال حدثنا منصور بن أبي الأسود عن الأعمش ووتی: **لەلای إبراهيم النخعي باسی مورجیئە كرا، جا ووتی: والله ئەوانم زیاتر ڕق لێ دەبێتەوە لە ئەهلی كیتاب.** [الطبقات الكبير : 392/8]

**ابن سعد** دەڵێ: أخبرنا محمد بن عبدالله قال حدثنا محل ووتی: **إبراهيم پێی ووتین: لەگەڵیان دامەنیشن. (واتا: لەگەڵ مورجیئە).** [الطبقات الكبير : 392/8]

**البخاري** دەڵێ: حدثنا مسدد قال حدثنا حماد بن زيد عن أيوب ووتی: **کەسم نەبینیوە خاوەن عیبادەت بێ وەکو طلق بن حبیب، سعید بن جبیر منی لەگەڵ ئەودا بینی، جا ووتی: لەگەڵ طلق دامەنیشە. أیوب دەڵێ: طلق عەقیدەی ئیرجائی هەبوو.** [التاريخ الأوسط : 369/1]

**ابن تیمیة** دەڵێ: **سەلەف زۆر سەرزەنشت کردنیان لەسەر مورجیئە توند بوو کاتێک کردەوەیان دەرهێنا لە ئیمان، وە ووتیان: ئیمانی خەڵکی وەکو یەکە، بێگومان ئەم ووتەیەیان کە ئیمانی خەڵک یەکسانە لە گەورەترین هەڵەکانە، بەڵکو خەڵکی لە باوەڕهێنان و خۆشویستن و ترسان و زانست یەکسان نین وجیان لە زۆر ڕوودا.** [مجموع الفتاوى : 555/7]

**ابن تیمیة** دەڵێ: **بیدعە کە بەهۆیەوە کەسێک بە ئەهلی هەواو ئارەزوو دادەنرێ لەلای خاوەن زانستەکان بە سوننەت ئەوەیە کە پێچەوانەی قورئان و سوننەت بێ، وەک بیدعەی خەواریج و ڕافیزە وقەدەرییە و مورجیئە.** [مجموع الفتاوى : 414/35]

ووتم: ئەمە دڵۆپێک بوو لە دەریایەک دەربارەی مورجیئە، بەم شێوەیە سەلەف باسی مورجیئەیان کردووە، ئیتر نازانم بۆ أبو حنیفة سەرەڕای مورجیئە بوونی هیچ کام لەم ووتانەی سەرەوە نایگرێتەوە ! نە گومڕایە و نە بیدعەچیە تەنانەت ناوبردنی بە مورجیئەش ئەستەمە، تەنها و تەنها دەبێ بە ئیمامی ئەهلی سوننە ناو ببرێ ! موسڵمان هۆش بهێنەرەوە بەر خۆت بزانە کە ئەم ووتانەی سەرەوە هەمووی أبو حنیفة دەگرێتەوە چونکە ئەو نەک تەنها مورجیئە بووە بەڵکو بانگەوازیشی کردووە بۆ ئیرجاء ئیتر چ ڕێگریەک هەیە ئەم ووتانە ئەو نەگرێتەوە ؟

# ووتەی زانایان دەربارەی مورجیئە بوونی أبو حنیفة:

**عبدالله** دەڵێ: حدثني هارون بن عبدالله أبو موسى حدثنا سليمان بن حرب عن **حماد بن زيد ووتی: لەلای أبو حنیفة دانیشتم لە مەککە، جا باسی سعید بن جبیر-ی کرد وای باسکرد کە مورجیئە بووە، منیش پێم ووت: ئەی أبو حنیفة کێ ئەمەی بۆ گێڕاویتەوە ؟ ووتی: سالم الأفطس، منیش پێم ووت: سالم مورجیئە بوو، بەڵام أیوب پێی ووتم: سعید بن جبیر منی بینی لەلای طلق بن حبیب دانیشتبووم، پێی ووتم: بۆ دەتبینم لەلای طلق دادەنیشیت ؟ لەگەڵی دامەنیشە. أبو حنیفة ووتی: وابوو، ئینجا پیاوێک بانگی کرد ووتی: ئەی أبو حنیفة طلق عەقیدەی چۆن بوو ؟ أبو حنیفة وەڵامی نەدایەوە، پاشان دیسان بانگی کرد، دیسان وەڵامی نەدایەوە، جا کە زۆر دووبارەی کردەوە، أبو حنیفة ووتی: طلق عەقیدەی عەدل بوو.** [السنة : 285] (سەنەدەکەی صەحیحە).

ووتم: المعلمي لە [التنكيل : 470/1] دەڵێ: أبو حنیفة مەبەستی لە (عەدل) ئەوەیە کە ئیرجاء حەقە. الكوثري دەیەوێ ووشەی (عەدل) بە قەدەر لەیەک بداتەوە چونکە قەدەریەکان نەفیکردنی قەدەر بە (عەدل) ناو دەبەن، جا مەبەستی ئەوەیە کە أبو حنیفة ئیرجائی بە عەدل ناو نەبردووە، لە بەشی دووەمدا وەڵامی ئەم گومانەم داوەتەوە، بە کورتی ئەوە بزانە کە طلق تەنها بەهۆی ئیرجاء قسەی پێ ووتراوە وەک لە ڕیوایەتی البخاري هێنامان، کەس نەیداوەتە پاڵ قەدەریەکان.

**الخطيب** دەڵێ: **هیچ گومانمان نیە لەوەی کە أبو حنیفة دژی موعتەزیلەیە لەو دەقە شەرعیانەی کە هەڕەشەی تێدایە، چونکە أبو حنیفة مورجیئەیە.** [تاريخ بغداد : 515/15]

**عبدالله** دەڵێ: حدثني محمد بن عبدالملك بن زنجويه حدثنا عبدالرزاق: **بە عبدالرزاق ووترا: أبو حنیفة مورجیئە بوو ؟ ووتی: بەڵێ بەڕاستی.** [السنة : 377] (سەنەدەکەی صەحیحە).

ووتم: ووتنی (حدثنا عبدالرزاق: بە عبدالرزاق ووترا ...هتد) خوێنەر بۆی هەیە وا تێبگات هەڵەیە، بەڵام ڕاوی ئەم شێوازە بۆیە بەکار دەهێنێت تا بزانرێ خۆی بیستوویەتی لە کەسەکە هەرچەندە لەم حاڵەتانەدا ووشەی (سمعت) زیاتر بەکار دێت.

عبدالرزاق دەڵێ: (أي حقا) واتا بەڵێ بەڕاستی مورجیئه بوو، له تەحقیقی القحطاني بۆته (أتى حقا) واتا کارێکی چاکی کردووه که مورجیئه بووه، بەهۆی ئەم هەڵەیەوه القحطاني له حاشیەدا دەڵێ: نەمزانیوه عبدالرزاق مورجیئه بوو بێت ئەوەی دەربارەی ووتراوه شیعەگەری بووه، بەڵام دیاره ئەمەش زانیارییەکی نوێیه دەربارەی عبدالرزاق عبدالله لێرەدا باسیکردووه، جا ئاگاداربه (أي حقا) ڕاسته عبدالرزاق مورجیئه نەبووه.

**الفسوي** دەڵێ: حدثنا أحمد بن الخليل حدثنا عبدة ووتی: **بیستم باسی أبو حنيفة کرا پیاوێک له ابن المبارك-ی پرسی: أبو حنيفة هیچ بیدعەیەکی تێدا بوو ؟ ابن المبارك ووتی: بەڵێ، ئیرجاء.**
**[المعرفة والتاريخ : 783/2] (سەنەدەکەی حەسەنه).**

ووتم: أحمد بن الخليل أبو علي التاجر، ڕاوی تریش هەن به ناوی أحمد بن الخليل که زەعیفن یان مەتروکن، بەڵام ئەمەیان سیقەیه، بۆ دڵنیا بوون لەوەش که ئەمه أبو علي التاجر-ه له [تاريخ بغداد : 212/5] له ژیاننامەکەیدا هاتووه که يعقوب بن سفيان الفسوي ڕیوایەتی لێوه کردووه، هەروەها المزي له [تهذيب الكمال : 304/1] بەهەمان شێوه دەڵێ الفسوي ڕیوایەتی لێوه کردووه.

النسائي دەڵێ: سیقەیه، له شوێنێکی تر دەڵێ: لا بأس به

مسلمة بن القاسم دەڵێ: لا بأس به

أبو يحيى الخفاف دەڵێ: سیقەیه

الحاكم دەڵێ: ثقة مأمون

ابن حبان: لەکتێبی (الثقات) هێناویەتی

ابن حجر دەڵێ: سیقەیه

قاسم علي سعد دەڵێ: زانایانی جەرح و تەعدیل یەکدەنگن لەسەر ئەوەی که أحمد بن الخليل سیقەیه به ڕەهایی، تەنها مسلمة بن قاسم نەبێت پلەیەکی لێ کەم کردەوه بەبێ ڕوونکردنەوەی هۆکارەکەی، وادەردەکەوێ که مسلمة شوێنی یەکێک له دوو لەفزەکەی النسائي کەوتبێ (واتا: لا بأس به) ئەمه لەکاتێکدا النسائي ئەم لەفزه دەربارەی ئەوانه بەکاردەهێنێت که سیقەن به ڕەهایی،

وە زۆر جار دەربارەی ئەو کەسانە بەکاری دەهێنێت کە خۆی بە سیقەی داناون، پوختەی ووتە: أحمد بن الخليل سيقەيە فەرموودەی صەحيحە، والله أعلم. بڕوانە حاشيەی [منهج الإمام أبي عبد الرحمن النسائي في الجرح والتعديل : 153]

ڕاوييەکی تر هەيە بەناوی أحمد بن الخليل ناسراو بە (حور) کە زەعيفە، ژياننامەکەی لەدوای ژياننامەی ئەم أحمد بن الخليل-ە دێت لە تاريخ بغداد، الكوثري دەڵێ: ئەم أحمد بن الخليل خۆيەتی، المعلمي لە وەڵامی ئەمەدا دەڵێ: الكوثري لە تاريخ بغداد ژياننامەی هەردووکيان بينيوە دڵنيا بووە کە سيقەکە خۆيەتی بەڵام بۆ ئەوەی تانەی لێبدات کردوويەتی بەمە تا تەزعيفی بکات.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا أبو سعيد الحسن بن محمد بن حسنويه الكاتب بأصبهان أخبرنا عبدالله بن محمد بن عيسى بن مزيد الخشاب حدثنا أحمد بن مهدي بن رستم حدثنا أحمد بن إبراهيم حدثني عبد السلام يعني ابن عبد الرحمن قال حدثني إسماعيل بن عيسى بن علي ووتی: **شريك پێی ووتم: أبو حنيفة کافر بوو بە دوو ئايەت لە کتێبی الله تعالى، الله تعالى فەرموويەتی:** ﴿وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ﴾ **وە فەرموويەتی:** ﴿لِيَزۡدَادُوٓاْ إِيمَٰنٗا مَّعَ إِيمَٰنِهِمۡۗ﴾ **وە أبو حنيفة پێی وایە ئيمان نە زياد دەکات نە کەم دەکات، وە پێی وایە نوێژ لە دينی الله نيە. (واتا: لە ئيماندا نيە).**

**[تاريخ بغداد : 509/15]**

ووتم: محقق-ی تاريخ بغداد(١) دەڵێ: زەعيفە چونکە شريك لەکاتی تفرد فەرموودەی قبوڵ ناکرێ! والله پێم سەيرە کەسێک ئاستی زانستی خۆی ئاوا دابەزێنێت قسەيەکی ئاوا بەتاڵ بکات تەنها لەپێناوی بەرگری کردن لە أبو حنيفة، خۆ ئەمە ڕيوايەت نيە تا بڵێين زەعيفە ئەمە ووتەی خۆيەتی دەربارەی أبو حنيفة، شريك هاوشاری أبو حنيفة بووە و قازی کوفە بووە ئەوەندەشی پێ ڕەوا نابينن کە بڵێ أبو حنيفة مورجيئە بووە ؟ نازانم ئەمە چ قسەيەکە زانايەک بڵێ فلان کەس عەقيدەی ئاوایە تۆش بڵێی قسەکەت قبوڵ ناکەم چونکە تۆ لە ڕيوايەت کردنی فەرموودە زەعيفی !

محقق-ی تاريخ بغداد(٢) بەهەمان شێوە تەزعيفی کردووە بەهۆی شريك.

**ابن عدي** دەڵێ: حدثنا إسحاق بن أحمد الكاغذي حدثنا يعقوب الدورقي حدثني أبو خالد يزيد بن حكيم العسكري -باسی خێر و فەزڵی ئەویان كرد كە خاوەنی غەزا و جیهادە- أبو يوسف يعقوب الدورقي دەڵێ: -بينيم كەسانێک زۆر پلەيان بەرز دەكردەوە- قال حدثنا أبو عبدالرحمن السروجي -وكان رجلا مزاملا لوكيع في غزوه وحجه كان يحدث عن حماد بن زيد وغيره من البصريين- قال أخبرني **وكيع ووتی: لە ماڵێک لە كوفە شريك وابن أبي ليلى و سفيان الثوري وابن حي و أبو حنيفة كۆبوونەوە، چواريان ووتيان: ئێمە ئیماندارین هەروەک چۆن الله بە ئیماندار ناوی بردووین لە كتێبەكەيدا، وە بەو ئیمانەش مارەییمان دادەمەزرێ و ميرات وەردەگرين، جا گەر سزای داين ئەوا بەهۆی تاوانەكانمانەوەيە وە ئەگەر لێمان خۆشبوو بەهۆی ڕەحمی خۆيەتی، أبو حنيفة ووتی: ئاوا نيە وەک ئەوەی ئێوە دەيڵێن، ئیمانی وەكو ئیمانی جبريل-ە ئەگەرچی دايكيشی مارە بكات، جا هەندێكيان ووتيان: دەبێ لە كوفە نەفی بكرێ، وە هەندێكيان ووتيان: دەبێ جەلدەی لێ بدرێ، وە شريك شايەتی أبو حنيفة و هاوەڵانی قبوڵ نەدەكرد، وە الثوري قسەی لەگەڵ نەكرد تاكو مرد، گەر لە ڕێگادا بەرەو ڕووی هاتبوايە ڕووی لێوەردەگێڕا. يزيد أبو خالد دەڵێ: ئەم باسەم بۆ محمد بن الحارث بن عباد گێڕايەوە كە ئەو هەميشە لەگەڵ الحسن اللؤلؤي دابوو، جا محمد ووتی: ئەم شتە ئاوا بوو.**

**[الكامل في ضعفاء الرجال : 485/3]**

ووتم: أبو خالد يزيد بن حكيم العسكري نەمبينی كەس جەرح و تەعديلی بۆ بكات، لە (المعجم الكبير للطبراني) فەرموودەيەک هاتووە كە لە سەنەدەكەی يزيد بن حكيم-ی تێدايە، الهيثمي لە (مجمع الزوائد) دەڵێ: فەرموودەكە زەعيفە بەهۆی هەبوونی زياد بن أبي مليح لە سەنەدەكە، واتا باسی زەعيفی يان مەجهولی يزيد بن حكيم ناكات، جگە لەمەش يزيد زۆر مەدحكراوە لەلايەن يعقوب الدورقي وەک لە سەنەدەكەی ابن عدي هاتووە، هەر چەندە ڕوون نيە كە پلەيان بەرز كردۆتەوە مەبەستيان پێی لەڕووی ڕيوايەت بووە يان لەڕووی دینداری و جيهاد كردنی، بەڵام هەر خودی يزيد هەمان ڕووداوەكە بۆ محمد بن الحارث گێڕاوەتەوە ئەويش پشت ڕاستی كردۆتەوە، محمد بن الحارث هەميشە لەگەڵ الحسن بن زياد اللؤلؤلي دابووە كە يەكێكە لە قوتابيەكانی أبو حنيفة.

**الخلال** دەڵێ: أخبرنا سليمان بن الأشعث قال حدثنا إسحاق بن راهويه قال حدثنا يحيى بن آدم ووتی: **أبو يوسف لەلای شريك شايەتيدا، شريك پێی ووت: هەڵسە، ڕازی نەبوو شايەتی ئەو قبوڵ بكات، پێيان ووت: شايەتی ئەو ڕەت دەکەيتەوە ؟! ووتی: شايەتی پياوێک وەرگرم کە دەڵێ: نوێژ لە ئيماندا نيە ؟!** [السنة : 1024] **(سەنەدەکەی صەحيحە).**

ووتم: ئەمە هەڵوێستيەتی بەرامبەر قوتابی أبو حنيفة ئەی دەبێت بەرامبەر أبو حنيفة چۆن بێت کە بانگەوازکەر بووە بۆ ئيرجاء ؟

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الحسين بن محمد أخو الخلال قال أخبرنا جبريل بن محمد العدل بهمذان قال حدثنا محمد بن جبويه النخاس قال حدثنا محمود بن غيلان قال حدثنا وكيع ووتی: **بيستم الثوري دەيووت: ئێمە ئيمانداراين، وە ئەهلی قيبلەش ئيماندارن لەلامان لە مارەکردن و ميرات و نوێژ و دان پێدانان، وە تاوانمان هەيە نازانين حاڵمان چۆنە لای الله. وكيع دەڵێ: أبو حنيفة ووتی: هەر کەسێک ئەم قسەيەی سفيان بکات ئەوا لەلای ئێمە ئەو کەسە گومانی هەيە لە ئيمانەکەی، ئێمە ئيمانداراين لێرەدا و لای الله-ش بە حەق.**

**وكيع ووتی: ئێمەش هەمان قسەی سفيان دەکەين، وە قسەکەی أبو حنيفة لەلاماندا جورئەتە.**

[تاريخ بغداد : 506/15] **(سەنەدەکەی حەسەنە).**

ووتم: الكوثري (محمد بن جبويه بن بندار أبو جعفر النخاس) لەگەڵ (محمد بن حيويه بن المؤمل أبو بكر الكرجي) تێکەڵ کردووە، ئەوەی دووەميان تۆمەتبارە بە درۆ بۆيە الكوثري ڕيوايەتەکەی بە زەعيف داناوە، هەروەک المعلمي لە التنكيل و محقق-ی تاريخ بغداد(١) لە حاشيەدا ئاماژەيان پێداوە و وەڵاميان داوەتەوە، تەنانەت محقق دەڵێ: سەنەدەکە صەحيحە يان کەمترين شت حەسەنە، بەڵام محقق-ی تاريخ بغداد(٢) هەر زۆر دوورکەوتۆتەوە ئەمەی تێکەڵ کردووە لەگەڵ (محمد بن العباس الخزاز) وە دەڵێ گوايە الخطيب لە ژياننامەی ژمارە (1139) تەزعيفی کردووە، کەچی گەڕامەوە بۆ ئەم ژمارەيە ژياننامەی کەسێکی تر بوو، تەنانەت ئەو ووتەيەی کە ئەو نەقلی کرد هەر نەمدۆزيەوە الخطيب لە هيچ کتێبێکدا ئەمەی ووتبێ، بگرە ئەوەی ئەو باسی دەکات

الخطيب تەوسيقی کردووە، لەوەش سەيرتر محمد بن العباس الخزاز ساڵی 295 لە دايکبووە محمود بن غيلان ساڵی 239 مردووە کە لەم سەنەدە محمد ڕیوايەتی لێکردووە، ئيتر چۆن دەبێ ئەو محمد-ە بێت کە 56 ساڵ دوای مردنی محمود لە دايکبووە ! تەنانەت ئەوەی الكوثري-ش بۆی چوو نەگەيشتووە بە محمود بن غيلان دوای مردنی ئەو لە دايکبووە.

**الخلال** دەڵێ: أخبرني حرب بن إسماعيل ووتی: **بيستم پياوێک پرسياری کرد لە إسحاق ووتی: کەسێک دەڵێ: من ئيمانداری حەقم ؟ إسحاق ووتی: ئەوە کافرێکی حەقە.**
**[السنة : 974] (سەنەدەکەی صەحيحە).**

ووتم: لەلای ئەهلی سوننە ناووترێ من ئيماندارم بەڵکو دەووترێ من موسڵمانم، گەر بڵێن ئيماندارم (إن شاء الله)ی لەگەڵ دەڵێن بەو مانايەی نازانين لەلای الله تعالى کێ ئيمانداری ڕاستەقينەيە، بەڵام لەلای مورجيئە زۆر بە سانايی دەووترێ ئێمە ئيماندارين بە حەق، سەبارەت بە ووتەکەی إسحاق بن راهويه کە تەکفيری ئەو کەسەی کردووە کە وادەڵێ، ئەهلی سوننە لەوەدا لەگەڵی نين کە کەسەکە تەکفير بکرێت.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبي حدثنا أسود بن عامر ووتی: **بيستم أبوبكر بن عياش باسی أبو حنيفة و هاوەڵانی کرد ئەوانەی کە مشتومڕ دەکەن، جا ووتی: مغيرة دەيووت: والله الذي لا إله إلا هو من لەوان زياتر دەترسم لەسەر دين وەک لە فاسقەکان. وە الأعمش سوێندی خوارد ووتی: والله الذي لا إله إلا هو، نازانم کەس هەبێ لەوان خراپتر بێ، بە أبو بكر ووترا: واتا مورجيئە ؟ ووتی: جگە لە مورجيئە هی تر هەيە ؟! [السنة : 244] (سەنەدەکەی صەحيحە).**

**ابن تيمية** دەڵێ: **ئەهلی بيدعە لەناو غەيری حەنبەليەکان زۆر زياترە وەک لەناو حەنبەليەکان لە زۆر ڕوودا، چونکە ووتەکانی أحمد دەربارەی ووردەکاری سوننەت و نەفيکردنی بيدعە زۆر زياترە لە کەسانی تر، جا بيدعەچيەکان ئەوانەی لەسەر مەزهەبی أحمد نين گەر جەهمی بن يان يان قەدەری يان شيعە يان مورجيئە هيچ کام لەمانە مەزهەبی پێشەوايەک نيە.**

**تەنها ئیرجاء نەبێ عەقیدەی أبو حنیفة-یە، سەبارەت بە هەندێک لە جەهمیەت خیلاف هەیە لە نەقل کردن لێیەوە، هەر بۆیە هاوەڵەکانی کە خۆیان داوەتە پاڵی خیلافیان هەیە لە نێوان سوننی بوون و جەهمی بوون، نێر و مێ، مشبهة و مجسمة، چونکە ئوصولی أبو حنیفة نەفی بیدعە ناکات ئەگەرچی ئیثباتیشی نەکات.** [فضائل الأئمة الأربعة وما امتاز به كل إمام من الفضيلة : 13-14]

ووتم: ناوی (أبو حنیفة) لە چاپی مجموع الفتاوی دەستکاری کراوە کردوویانە بە (أبو فلان) بەڵام لەم نامیلکەیەدا کە بەم دواییە چاپکراوە وەک خۆی نوسراوە، جا کەسێک نەفی بیدعە نەکات چۆن دەبێتە ئەهلی سوننە لەکاتێکدا ئەهلی سوننە بە دژایەتی بیدعە ناسراون ؟ بەڵام بەداخەوە ابن تیمیة سەرەڕای نەقل کردنی ئەم هەموو ووتەیەی سەلەف دەربارەی أبو حنیفة بەتایبەتی ووتەکانی ئیمام أحمد کە خۆشی حەنبەلیە، کەچی لەمەدا موخالەفەی ئیمامەکەی دەکات و أبو حنیفة بە گەورە و پێشەوا وەسف دەکات ئەمە سەرەڕای ئەوەی خۆشی کۆمەڵێک هەڵەی زەقی ئەهلی ڕەئی باس دەکات و بە بیدعەچی و دوور لە سوننەت وەسفیان دەکات، ئەمەش تەنها ابن تیمیة وانیە بەڵکو زۆرینەی خەلەف بەوە ناسراون کە أبو حنیفة بە پێشەوای ئەهلی سوننە دەزانن شان بە شانی مالك و الشافعي و أحمد، سەرەڕای ئەم هەموو ووتەیەی سەلەف دەربارەی کە ڕاستەوخۆ و بەڕاشکاوی ناوی دەهێنن و کوفر و بیدعە و گومڕاییەکانی باس دەکەن، لێرەدا جیاوازی نێوان مەزهەبی سەلەف و خەلەف دەردەکەوێ، جا ئەوەی شوێنکەوتەی سەلەفە با شوێنی سەلەف بکەوێ ئەوەشی شوێنکەوتەی خەلەفە با شوێنی خەلەف بکەوێت و سەلەف بە توندڕەو و خەواریج و دڵ ڕەق و ئەم جۆرە شتانە وەسف بکات، گەر بەلاتانەوە قورسە موخالەفەی ابن تیمیة بکەن، ئەوا دەبێت زۆر بەلاتانەوە قورستر بێت موخالەفەی زۆرینەی زانایانی سەلەف بکەن، ئەمەش وەکو باسی ئەشعەرییەکان نیە بڵێین ووتەی تایبەتی سەلەفمان بەدەستەوە نیە دەربارەی دانە بەدانەی زانا ئەشعەرییەکان، خۆ لەمەدا ووتەی سەلەف ڕوونە دەربارەی أبو حنیفة.

# بڕگەی پێنجەم:
# بانگەواز کردنی بۆ ئیرجاء:

سەرەتا دەبێ ئەوە بزانین کە بانگەوازکەر بۆ بیدعە جیاوازە لەگەڵ بیدعەچیەک کە بانگەواز ناکات بۆ بیدعەکەی، ئەوەی بانگەوازکەرە حوکمەکەی توندترە لە دونیا و قیامەتیش.

**الخلال** دەڵێ: أخبرنا أبو بكر المروذي و سليمان بن الأشعث و أحمد بن أصرم المزني وهذا لفظ سليمان ووتی: **بە أحمد-م ووت: نوێژ لەدوای مورجیئە دەکرێ ؟ ووتی: گەر بانگەواز بکات بۆ بیدعەکەی نوێژی لەدوا ناکرێ.** [السنة : 1146] (سەنەدەکەی صەحیحە).

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا أبو القاسم إبراهيم بن محمد بن سليمان المؤدب بأصبهان قال أخبرنا أبو بكر ابن المقرئ قال حدثنا سلامة بن محمود القيسي بعسقلان قال حدثنا عبدالله بن محمد بن عمرو ووتی: **بيستم أبو مسهر دەیووت: أبو حنيفة سەرکردەی مورجیئە بوو.**

[تاريخ بغداد : 511/15] (سەنەدەکەی صەحیحە).

ووتم: أبو حنيفة کە سەرکردەی مورجیئەیە بێگومان بانگەوازی کردووە بۆ ئیرجاء ئەگینا سەرۆکایەتیەکەی هیچ مانایەکی نیە، سەیرە سەرکردەی مورجیئەیە و ئیمامی ئەهلی سوننەشە ! والله ئەم دوو وەسفە لە هیچ کەسێکدا کۆ نابێتەوە، تەنها مەنهەجە خێچ و خوارەکەی خەلەف وایکردووە کۆ ببێتەوە.

محقق-ی تاريخ بغداد(٢) دەڵێ: أبو بكر المقرئ محمد بن الحسن بن زياد النقاش تۆمەتبارە بە درۆ. ئەمەش لە جەهلەوە سەری هەڵداوە چونکە ئەم ڕاوییەی سەنەدەکە أبو بكر بن المقرئ-ە نەک أبو بكر المقرئ، تەنانەت لای ئەویش لە سەنەد هەر بە أبو بكر بن المقرئ هاتووە بۆیە عوزری پێنادەم بڵێم ڕەنگە لەو نوسخە دەستنوسەی کە ئەو پشتی پێ بەستووە (بن) کەوتبێ بۆیە لێی تێکەڵ بووە، جا أبو بكر بن المقرئ ئیمامە حافزە قسەی لەسەر ناکرێ ناوی محمد بن إبراهيم بن علي بن عاصم-ە خەڵکی ئەصفەهانە، أبو بكر المقرئ کە تۆمەتبارە بە درۆ ناوی محمد بن الحسن بن زياد

النقاش-ە خەڵکی موصل-ە.

**الخلال** دەڵێ: أخبرني حرب بن إسماعيل ووتی: **بیستم أحمد دەیووت: نوێژ ناکرێ لەدوای کەسێک کە پێی وابێ ئیمان ووتەیە گەر بانگەواز بکات بۆ بیدعەکەی.**
[السنة : 1147] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

**الخلال** دەڵێ: أخبرني محمد بن أبي هارون و محمد بن جعفر أن أبا الحارث حدثهم أن **أبا عبدالله ووتی: گەر مورجیئە بانگەوازکەر بوو قسەی لەگەڵ مەکە.**
[السنة : 1154] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

**اللالكائي** دەڵێ: أخبرنا محمد بن عبدالله بن نعيم إجازة قال حدثنا محمد بن صالح بن هانئ قال حدثنا أبو سعيد محمد بن شاذان قال سمعت محمد بن أسلم دەیووت: **بیستم يزيد بن هارون دەیووت: هەر کەسێک بانگەواز بکات بۆ ئیرجاء ئەوا گەر نوێژ لەدوای کرا دەبێ دووبارە بکرێتەوە.**
[شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة : 1828] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبو الفضل حدثنا **يحيى بن معين ووتی: أبو حنيفة مورجیئە بوو، وە لە بانگەوازکەران بوو، وە لە فەرموودەدا هیچ نەبوو، وە هاوەڵەکەی أبو یوسف کێشەی نەبوو. (واتا: لە فەرموودەدا).** [السنة : 383] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**
ووتم: گەر بووترێ چۆن يحيى بن معين جارێک دەڵێ أبو حنيفة جەهمیە و جارێکی تریش دەڵێ مورجیئەیە ؟ کە دەڵێ جەهمیە مەبەستی بابەتی خلق القرآن-ە، کە دەڵێ مورجیئەیە مەبەستی بابەتی ئیمانە.

**عبدالملك بن حبيب** دەربارەی ووتەیەکی کعب الأحبار کە بە ئیمامی عمر دەڵێ: (مەڕۆ بۆ عیراق، نۆ بەش لە دە بەشی سیحری لێیە، جنۆکە فاسیقەکانی لێیە، الداء العضال-ی لێیە) دەڵێ: **(الداء العضال) بە هیلاک چوونە لە دیندا، وە مطرف پێی ڕاگەیاندم کە پرسیاریان لە مالك کردووە دەربارەی**

**شەرحی (الداء العضال) لەم فەرموودەیەدا، ئەویش وتوویەتی: ئەمە أبو حنیفة و هاوەڵەکانیەتی، ئەو خەڵکی گومڕا کرد بە دوو ڕێگا: بە ئیرجاء و بە هەڵوەشاندنەوەی فەرموودەکان، بۆیە ئەو لەلامان شومترین کەسە کە لەدایکبووە لە ئیسلامدا، خەڵکێکی زۆر پێی گومڕا بوون، وە ئەوان بەردەوامن لە درێژە پێدان بە گومڕایی تاکو ڕۆژی قیامەت.** [تفسير غريب الموطأ : 2/160-161]

**ابن تیمیة** دەڵێ: **ئەمە مەزهەبی فوقەهایەکانی ئەهلی سوننەیە وەک أحمد و جگە لەویش: هەر کەسێک بانگەواز بکات بۆ بیدعەیەک شایستەی سزایە بۆ لابردنی زیانی لەسەر خەڵک، ئەگەرچی لە ناخیەوە موجتەهید بێ، وە کەمترین سزای ئەوەیە کە هەجر بکرێ هیچ پلەیەکی نەبێت لە دیندا زانستی لێوەر نەگیرێت و نەکرێت بە قازی و شایەتی قبوڵ نەکرێت و هاوشێوەی ئەمانە.**
[مجموع الفتاوى : 7/385]

ووتم: خۆزگە خەلەف و معاصرین ڕەچاوی ئەم مەنهەجەیان دەکرد دەربارەی أبو حنیفة و هاوشێوەکانی، ئەوەتا بیدعەچی بووە و بانگەوازیشی کردووە بۆ بیدعەکەی کە ئیرجائە.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني سويد بن سعيد حدثنا **عبدالله بن يزيد ووتی: أبو حنیفة بانگی کردم بۆ ئیرجاء.** [السنة : 389]

ووتم: (سوید بن سعید الهروي) دوای کوێر بوونی پشتی بە حفزی خۆی دەبەست نەی دەتوانی لە کتێبەکانیەوە فەرموودە ڕیوایەت بکات، جا هەڵەی زۆر دەکرد و وێران بوو، جا نازانم ئەم ڕیوایەتە هی کام کاتیەتی، بەڵام پێش کوێربوونیشی حاڵی باش نەبووە صدوق بووە لە زەعیفیەوە نزیکتر بووە، هەرچۆنێک بێت ڕیوایەتی دواتر ئەمە پشت ڕاست دەکاتەوە کە أبو حنیفة بانگەوازکەر بووە بۆ ئیرجاء.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبو الفضل حدثنا إبراهيم بن شماس حدثنا **أبو عبدالرحمن المقرئ ووتی: والله أبو حنیفة مورجیئە بوو، بانگی کردم بۆ ئیرجاء منیش ڕەتم کردەوە.**
[السنة : 367] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

**ابن عدي** دەڵێ: حدثنا عبدالملك حدثنا يحيي بن عبدك ووتی: **بيستم المقرئ دەيووت: حدثنا أبو حنيفة كە مورجيئە بوو، بە دەنگێكی زۆر بەرز ئەمەی دەووت، بە المقرئ ووترا: تۆ بۆچی ڕیوایەتی لێوە دەكەی مادام مورجيئە بووە ؟ المقرئ ووتی: من گۆشت بە ئێسكەوە دەفرۆشم.**
**[الكامل في ضعفاء الرجال : 125/10] (سەنەدەكەی صەحيحە).**

ووتم: (المقرئ) لە تەحقيقی مازن السرساوي بۆتە (المقدمي) ئینجا لە ڕیزی دواتر ناوی ڕاست كراوەتەوە بۆتە (المقرئ) لە تەحقيقەكانی تردا لەهەر دوو شوێندا ناوی هەر بە المقرئ هاتووە، (أبو عبدالرحمن المقرئ) ئیمامێكی ناودارە.

**ابن حبان** دەربارەی أبو حنيفة دەڵێ: **جائیز نیە احتجاجی پێ بكرێ چونكە ئەو بانگەوازی دەكرد بۆ ئیرجاء، وە بانگەوازكەر بۆ بیدعە جائیز نیە احتجاجی پێ بكرێ لەلایەن پێشەوا گەورەكانمان، نازانم لەنێوانیاندا خیلاف هەبێ كە پێشەوایانی موسڵمانان و ئەهلی وەرع لە دیندا لە هەموو شارەكان و ناوچەكانی تردا جەرحیان كردووە و لەكەداریان كردووە یەك بەدوای یەكتر.**
**[المجروحين : 406/2]**

ووتم: بڕوانە ئیجماعی زانایان لە شارەكان نەقل دەكات كە یەك بەدوای یەك قسەیان بە أبو حنيفة ووتوە.

# بڕگەی شەشەم:
# هەبوونی عەقیدەی خروج کردن.

لەوانەیە بەلاتانەوە سەیر بێت کەسێک مورجیئە بێت و بانگەواز بکات بۆ ئیرجاء بکات چۆن دەبێت بە خەواریج و هانی خەڵک دەدات بۆ خروج کردنی لە حاکمی زاڵم ؟! بەڵام کەسێک الله تعالی گومڕای بکات ئیتر ئاوایە، هەروەک سفیان الثوري و الأوزاعي وتوویانە: ووتەی مورجیئە بەرەو خروج کردن دەڕوات، وە أيوب السختياني: هەموو ئەهلی بیدعەکانی بە خەواریج ناودەبرد، وە دەیووت خەواریجەکان لەناوەکانیان جیاوازن بەڵام هەموویان کۆکن لەسەر خروج کردن، وە أبو قلابة دەڵێ: هیچ کەسانێک بیدعەیەک داناهێنن ئیللا خروج کردن بە حەلال دەزانن، وە الحسن البصري دەڵێ: خاوەنی هەموو بیدعەیەک حەروریە (حروري گروپێکی خەواریجن) وە سفیان الثوري دەڵێ: هەموو ئەهلی بیدعەکان شمشێر بە حەلال دەزانن بۆ سەر ئەهلی قیبلە.

عبدالله دەڵێ: حدثني أبو الفضل الخراساني حدثني إبراهيم بن شماس السمرقندي ووتی: **پیاوێک بە ابن المبارك-ی ووت ئێمەش لەلای بووین: أبو حنيفة مورجيئە بوو پێی وابوو دەبێ خروج بکرێ بە شمشێر، ابن المبارك ئینکاری ئەم شتەی لێنەکرد.** [السنة : 330] (سەنەدەکەی صەحیحە).

عبدالله دەڵێ: حدثني عبدة بن عبدالرحيم سمعت أبا الوزير محمد بن أعين ووتی: **پیاوێک هاتە لای ابن المبارك لە هاوەڵانی عبدالكريم، ماڵەکەش پڕ بوو لە فەرموودەناسان، پیاوەکە ووتی: ئەی باوکی عبدالرحمن بابەتی ئەوە و ئەوە، ابن المبارك-یش چەند فەرموودەیەکی بۆ گێڕایەوە لە پێغەمبەر ﷺ وهاوەڵانی، پیاوەکە ووتی: ئەی باوکی عبدالرحمن أبو حنيفة بەپێچەوانەی ئەمە فەتوا دەدات، ابن المبارك توڕە بوو، ووتی: فەرموودەت بۆ دەگێڕمەوە لە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی، تۆش ووتەی پیاوێکم بۆ دەهێنی کە پێی وابوو دەبێ خروج بکرێ بە شمشێر لەسەر ئوممەتی محمد ﷺ ؟!** [السنة : 331] (سەنەدەکەی حەسەنە).

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبو الفضل الخراساني حدثنا الحسن بن موسى الأشيب ووتی: **بیستم أبو یوسف دەیووت: أبو حنيفة بڕوای بە خروج کردن هەبوو بە شمشێر. ووتم: ئەی تۆ؟ ووتی: پەنا بە الله.** [السنة : 220] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: أبو یوسف کە نزیکترین قوتابی أبو حنيفة یە و هەر بە منداڵیەوە لەگەڵی بووە، ووتەی ئەو لەپێشترە وەک لە ووتەی الطحاوي حەنەفی مەزهەب کە لە عەقیدەکەیدا دەڵێ خروج ناکەین لە وەلی ئەمری موسڵمانان چونکە الطحاوي 89 ساڵ دوای مردنی أبو حنيفة لەدایکبووە، وە الطحاوي دەڵێ عەقیدەکەم بەپێی عەقیدەی أبو حنيفة و دوو هاوەڵەکەی نوسیوە واتا القاضي أبو یوسف و محمد بن الحسن الشيباني، ڕوونیشە کە ئەم دوو هەواڵەی لە أصول و فروع خیلافیان زۆربووە لەگەڵ أبو حنيفة، بۆیە مەرج نیە هەموو ووتەیەکی الطحاوي لە عەقیدەکەی ووتەی أبو حنيفة بێت.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني محمد بن هارون أبو نشيط حدثني أبو صالح يعني الفراء ووتی: **بیستم أبو إسحاق الفزاري دەیووت: أبو حنيفة مورجيئە بوو، پێی وابوو دەبێت خروج بکرێ بە شمشێر.** [السنة : 350] **(سەنەدەکەی حەسەنە).**

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبو الفضل الخراساني حدثنا أحمد بن الحجاج حدثنا سفيان بن عبدالملك حدثني **ابن المبارك ووتی: باسی أبو حنيفة-م کرد لەلای الأوزاعي جا باسی زانست و فیقهی ئەوم کرد، الأوزاعي ئەمەی پێ ناخۆش بوو تورە بوونی لێم دەرکەوت، ووتی: تۆدەزانی چی دەڵێی؟ مەدحی کەسێک دەکەی کە پێی وایە شمشێر بەکاربێت لەسەر ئەهلی ئیسلام؟ ووتم: من لەسەر ڕەئی ئەو نیم و لەسەر مەزهەبی ئەو نیم، ووتی: ئامۆژگاریم کردی پێت ناخۆش نەبێ، ووتم: قبوڵم کرد.** [السنة : 363] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

**عبدالله** دەڵێ: حدثني محمد حدثنا أبو صالح ووتی: **بیستم أبو إسحاق الفزاري دەیووت: أبو حنيفة ووتی: ئەی أبو إسحاق لەکوێ نیشتەجێی لە ئێستادا؟ منیش ووتم: لە (المصيصة) ووتی:**

**گەر بۆ ئەو شوێنە ڕۆشتبوای کە براکەت بۆی چوو باشتر بوو بۆت.**
**برای أبو إسحاق لەگەڵ جل سپیەکان خروجی کرد جل ڕەشەکان کوشتیان.**
**[السنة : 353] (سەنەدەکەی حەسەنە).**

ووتم: (المصيصة) سەنگەرێکە لە سەنگەرەکانی شام، أبو إسحاق لەوێدا لە سەنگەر بووە لەدژی ڕۆمەکان، براکەی أبو إسحاق لەگەڵ إبراهيم بن عبدالله لە بەصرە خروجیان کرد لەدژی عەبباسیەکان، جلی خروجکەرەکان سپی بوو جلی عەبباسیەکان ڕەش بوو.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا ابن الفضل أخبرنا ابن درستويه حدثنا يعقوب قال حدثني صفوان بن صالح الدمشقي حدثني عمر بن عبدالواحد السلمي ووتی: **بيستم إبراهيم بن محمد الفزاري -واتا: أبو إسحاق- بۆ الأوزاعي دەگێڕایەوە ووتی: برام کوژرا لەگەڵ إبراهيم الفاطمي لە بەصرە، منیش چووم تا سەیر بکەم بزانم چی لەدوای خۆی جێهێشتووە، جا بە أبو حنيفة گەیشتم، پێی ووتم: لەکوێ دێیت و بۆ کوێ دەڕۆیت ؟ منیش پێم ووت لە المصيصة هاتووم و دەمەوێ هەواڵی برام بزانم کە کوژراوە لەگەڵ إبراهيم، أبو حنيفة ووتی: گەر لەگەڵ برات کوژرابوای چاکتر بوو بۆت لەو شوێنەی کە لێوەی هاتووی، منیش ووتم: ئەی چی ڕێگری لە تۆ کردووە کە خروج نەکەیت ؟ ووتی: گەر ڕاسپاردە وکەل و پەلی خەڵکم لەلا نەبوایە ئەوا هیچ چاوەڕێم نەدەکرد.**
**[تاريخ بغداد : 529/15] (سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: الكوثري بوهتانی زۆری بۆ ابن درستويه هەڵبەستاوە و زوڵمی زۆر لێکردووە بە ناحەق، المعلمي لە التنكيل بە نزیکەی 10 لاپەڕە وەڵامی داوەتەوە وەک لە بڕگەی سێیەم بە کورتی ئاماژەم پێیدا لەبەر درێژی نەقل نەکردووە، بڕوانە [التنكيل : 478/1-487]

گریمان ووتەکەی الكوثري ڕاست بێ کە دەڵێ ابن درستويه درۆزنە -حاشا لەو- الخطيب ڕیوایەت لە کتێبەکەی الفسوي نەقل دەکات لە ڕێگای ابن درستويه، ئەوە ووتمان با ابن درستويه درۆزن بێ خۆ کتێبەکەی الفسوي بەردەستە ئەی چی لەو دەکەیت ؟ کاتێک ئەصلی کتێبەکە بەردەست بوو هیچ پێویستیمان بەوە نیە پشت بە ڕیوایەتەکانی الخطيب ببەستین کە لەهەمان کتێب نەقلی

دەكات، هەمان ئەم ڕیوایەتە لە كتێبەكەی الفسوي هاتووە كە ئێستا دەیهێنین، بەڵام بۆیە ئەم ڕیوایەتەی الخطیب-مان هێنا تا دەركەوێ ابن درستویە ڕیوایەتەكانی وەک خۆی نەقل كردووە بەبێ ئەوەی یەک ووشەی لێ زیاد و كەم بكات ئەمەش نیشانەی ئەوەیە كە سیقەیە، لەهەر شوێنێک الخطیب لە ڕێگای ابن درستویە ڕیوایەتەكانی كتێبەكەی الفسوي نەقل بكات دەبینین هاوتایە لەگەڵ ئەصلی كتێبە هیچ گۆڕانی تێدا نیە، الكوثري-ش دەڵێ: چەند درهەمێكی پێ بدە هەرچی ڕیوایەتی درۆ هەیە بۆتی دروست دەكات ! والله المستعان كەسێک زمانی بەرامبەر هاوەڵان نەپارێزی ابن درستویە كێیە تا لە زمانی سەلامەت بێ.

الخطیب 9 ڕیوایەتی هێناوە دەربارەی عەقیدەی خروج كردنی أبو حنیفة كە ئێمە تەنها ئەو دانەیەمان نەقل كردووە كە الخطیب-یش لە كتێبەكەی الفسوي نەقلی كردووە، بۆیەش ئەوەی الخطیب-مان هێنا بە مەبەستی بەرگری كردن لە ابن درستویە ئەگینا كارمان پێی نیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا محقق تاریخ بغداد(١) لە حاشیەی ڕیوایەتی كۆتایی دەڵێ: زۆربەی ئەو ڕیوایەتانەی كە گێڕدراوەتەوە لێی دەربارەی خروج كردنی لە حوكمی زاڵم صەحیحە، وە كردەوەكانیشی بەڵگەن لەسەر ئەمە، ئینجا هەڵوێستەكانی أبو حنیفة باس دەكات لەم بارەیەوە.

بڕوانە [تاریخ بغداد : 15/530-531]

**الفسوي** دەڵێ: حدثني صفوان بن صالح الدمشقي حدثنا عمر بن عبدالواحد السلمي ووتی: **بیستم إبراهیم بن محمد الفزاري (واتا: أبو إسحاق) بۆ الأوزاعي دەگێڕایەوە ووتی: برام كوژرا لەگەڵ إبراهیم الفاطمي لە بەصرە، منیش چووم تا سەیر بكەم بزانم چی لەدوای خۆی جێهێشتووە، جا بە أبو حنیفة گەیشتم، پێی ووتم: لەكوێ دێیت و بۆ كوێ دەڕۆیت ؟ منیش پێم ووت لە المصیصة هاتووم و دەمەوێ هەواڵی برام بزانم كە كوژراوە لەگەڵ إبراهیم، أبو حنیفة ووتی: گەر لەگەڵ برات كوژرابوای چاكتر بوو بۆت لەو شوێنەی كە لێوەی هاتووی، منیش ووتم: ئەی چی ڕێگری لە تۆ كردووە كە خروج نەكەیت ؟ ووتی: گەر ڕاسپاردە و كەل و پەلی خەڵكم لەلا نەبوایە ئەوا هیچ چاوەڕێم نەدەكرد.** [المعرفة والتاریخ : 2/788] (سەنەدەكەی صەحیحە).

**العقيلي** دەڵێ: حدثنا محمد بن عثمان بن أبي شيبة قال حدثنا أبو عامر عبدالله بن براد الأشعري ووتی: **بیستم عبدالله بن إدريس ووتی: أبو حنيفة وەستابوو لەسەر پەیژەكانی، بیستم دوو پیاویش پرسیاریان لێی دەكرد دەربارەی خروج كردن لەگەڵ إبراهیم، أبو حنيفة-ش بەوانی دەووت: خروج بكەن خروج بكەن.** [الضعفاء : 159/6] **(سەنەدەكەی حەسەنە).**

**عبدالله** دەڵێ: حدثني عبدة بن عبدالرحيم -خەڵكی مروه- ووتی: **چووینە سەردانی عبدالعزیز بن أبي رزمة نەخۆش بوو، من و أحمد بن شبويه و علي بن يونس، عبدالعزيز پێی ووتم: ئەی باوكی سعيد من نهێنیەكم لەلایە لەئێوەم دەشاردەوە جا پێتانی دەڵێم، جا دەستی لەژێر پێخەفەكەی دەرهێناو ووتی: بیستم ابن المبارك دەیووت: بیستم الأوزاعي دەیووت: ئارامان گرت لەسەر أبو حنيفة لەمە بە پەنجە ژماردی، وە ئارامان لەسەری گرت لەمە بە پەنجەی دووەم ژماردی، وە ئارامان گرت لەسەری لەمە بە پەنجەی سێیەمی ژماردی عەیبەكانی، هەتا خروج كردن بە شمشێر لەسەر ئوممەتی محمد ﷺ هات نەمانتوانی ئارامی لەسەر بگرین.**
[السنة : 228] **(سەنەدەكەی حەسەنە).**

**الفسوي** دەڵێ: حدثني صفوان بن صالح حدثنا عمر ووتی: **بیستم الأوزاعي دەیووت: شعيب بن إسحاق وابن أبي مالك وابن علاق وابن ناصح هاتنە لام ووتیان: هەندێك زانستمان لە أبو حنيفة وەرگرتووە سەیرێكی بكە، جا ئەوان هەر لەلام بوون بینیم ئەو شتەی بۆیان هێنابووم تێیدا خروج كردنی لە پێشەواكان بۆ حەلاڵ كردبوون.** [المعرفة والتاريخ : 791/2] **(سەنەدەكەی صەحیحە).**

ووتم: جا كەس نەڵێ سەرەتا مەزهەبی ئەهلی سوننە وابووە كە بە جائیزیان دەزانی خروج بكەن لە حاكمی زاڵم، یان بڵێ هەندێك زانای تریش فەتوای خروجیان داوە تەنها أبو حنيفة نەبووە، حاشا لەم زانا بەڕێزانە كە بۆ خۆیان شتێك بە جائیز بزانن یان خۆیان فەتوا بدەن لەسەری كەچی بۆ أبو حنيفة بیكەن بە تاوان و هێرشی بكەنە سەر ئەمە دووڕوویيە، بەڵێ هەندێك زانا دژی خروجكردنی إبراهیم و محمد-ی برای نەبوون لە عەبباسیەكان بەڵام جیاوازی ئەوان و أبو حنيفة

ئەوەیە کە لە ئەصلی عەقیدەی أبو حنیفة-دا خروج کردن جائیزە لە حاکمی موسڵمانی زاڵم بەڵام ئەو زانایانەی کە لە ڕووداێکدا یان لە کاتێکی دیاری کراودا دژی خروج کردن نەبوو بن ئەوا لە ئەصلی عەقیدەکەیان خروج کردن جائیز نیە لە حاکمی موسڵمانی زاڵم، بۆیە ئەمە تۆمەتێکی زۆر ناشرینە هەندێک کەس بێ ئاگایانە دەیدەنە پاڵ سەلەف دەڵێن: ئەوانیش خروجیان لە حاکمی زاڵ بە جائیز زانیوە ! واتای چی بۆ خۆیان بە جائیزی بزانن بۆ أبو حنیفة بە تاوانی بزانن ! دواتر ئەو فەرموودانەی دژی خروج کردن هاتوون هەمووی تایبەتە بە حاکمی زاڵم نەک حاکمێکی وەک عمر بن عبدالعزیز، ئێمە فرمانمان پێکراوە لەسەر زوڵمی حاکمی موسڵمان ئارام بگرین، جا پرسە لەخۆت بۆ تەنها قسە لەسەر خروجی أبو حنیفة دەکرێ و باسی ئەوانی تر ناکرێت کە گوایە ئەوانیش بە جائیزیان زانیوە ! ئێمە ناتوانین خۆمان بگێڕینەوە بۆ ئەو ڕۆژانە تا بزانین واقیعەکە چۆن بووە و کێ هەڵوێستی چۆن بووە و حاکمەکان بە ووردی حاڵیان چۆن بوونە، بەڵام کە زانایانی سەلەف زۆر بە توندی دژی خروجکردنی أبو حنیفة وەستاون ئەوەندە بەسە بۆ ئەوەی کە بزانین أبو حنیفة عەقیدەیەکی هەبووە زانایانی تر نەیان بووە بۆیە ئاوا دژی وەستاون.

## بڕگەی حەوتەم:
## فێڵ كردن لە فەتوادان (الحیل).

**السرخسي دەڵێ: زانایان خیلافیان هەیە دەربارەی كتێبی (الحیل) ئایا محمد بن الحسن دایناوە یان نا، أبو سلیمان الجوزجاني ئینكاری ئەوەی دەكرد و دەیووت: هەر كەسێک ووتی محمد كتێبێكی داناوە ناوی ناوە (الحیل) ئەوا باوەڕی پێمەكە، ئەو كتێبەی كە لەبەر دەستی خەڵک دایە پەڕاو نوسەكانی بەغداد كۆیان كردۆتەوە، وە دەڵێ: جاهیلەكان ئەم شتانە دەدەنە پاڵ زاناكانمان بۆ عەیبداركردنیان، جا چۆن گومان دەبردرێ بە محمد كە یەكێک لە كتێبەكانی بەم ناوەوە ناو نابێت تا ببێتە یارمەتیدەر بۆ جاهیلەكان لەو درۆیانەی كە دروستی دەكەن بەناوی زانایانەوە ؟! السرخسي دەڵێ: بەڵام أبو حفص دەڵێ: ئەم كتێبە دانراوی محمد-ە. السرخسي دەڵێ: أبو حفص ئەم كتێبەی لە محمد-ەوە ڕیوایەت دەكرد، وە قسەكەی ئەو ڕاسترە.**

[المبسوط : 209/30]

ووتم: أبو سلیمان الجوزجاني و أبو حفص هەردووكیان قوتابی محمد بن الحسن الشیباني بوونە، وە شتی ئیثبات كراو پێش شتی نەفیكراو دەخرێ، مادام أبو حفص كتێبەكەی لە محمد-ەوە ڕیوایەت كردووە واتا كتێبەكە هی محمد-ە، هەروەها السرخسي وەک بینیتان تەرجیحی ووتەكەی أبو حفص دەكات، وە ئەم كتێبەی السرخسي بە (الأصل) ناسراوە لەلای حەنەفیەكان، بۆتە عومدە لە مەزهەبی حەنەفیدا و گەورەترین كتێبی مەزهەبەكەیە.

**ابن حجر دەڵێ: أبو حفص الكبیر كتێبی (الحیل)ی لە محمد بن الحسن ڕیوایەت كردووە.**

[فتح الباري : 245/16]

**ابن حجر دەڵێ: فەتوادان بە فێڵ بەناوبانگ بووە لە حەنەفیەكانەوە، چونكە أبو یوسف كتێبێكی لەم بارەیەوە نوسی.** [فتح الباري : 237/16]

ووتم: ئەمەش لەوانەیە كتێبێكی تر بێ چونكە فێڵەكانی أبو یوسف-یش لە فەتوادان ڕوونن، وە

لەوانەیە هەر ئەو کتێبەی محمد بێ ابن حجر بیداتە پاڵ أبو یوسف، وەک زانراویشە أبو یوسف و محمد بن الحسن دوو قوتابی دیاری أبو حنیفة بوونە ئەوان بڵاو کەرەوەی مەزهەبەکەی ئەو بوونە، جا هەموو قوتابیەک لە کتێبە فقهیەکانیدا زۆر ئاماژە بە ووتەی شێخەکەی دەکات و بەڵگەی پێ دەهێنێتەوە، ئەم دووانەش لەم کتێبەدا فەتواکانی أبو حنیفة نەقل دەکەن، تەنانەت محمد کتێبەکەی بە (کتاب الحیل لأبي حنیفة) ناوناوە چونکە پرسیارەکانی خۆیی و وەڵامەکانی أبو حنیفة-ی تێدا نەقل کردووە، وە ابن المبارك-یش کتێبەکەی داوەتە پاڵ أبو حنیفة، وە بابەتی فێڵ کردنیش لە فەتوادان لەلای أبو حنیفة-ەوە ناودار بووە بۆیە لەم دوو کتێبەدا لۆمە دەچێتەوە سەر ئەو پێش قوتابیەکانی چونکە لە مەزهەبی ئەودا فێڵ کردن دروستە و قوتابیەکانیشی لەو بۆیان ماوەتەوە، هەروەک دێینە سەر ووتەیەی زانایانی تریش کە فێڵ کردنیان داوەتە پاڵ أبو حنیفة.

**الخطیب** دەڵێ: **محمد بن بشر أبو عبدالله الرقي لە خلف بن بیان-ەوە کتێبی (الحیل في الفقە لأبي حنیفة)ی ڕیوایەت کردووە، أبو الطیب محمد بن الحسین بن حمید بن الربیع الکوفي لە محمد بن بشر ڕیوایەتی کردووە، باسیکردووە کە لە محمد-ی بیستووە لەساڵی 258 لە سامراء.**
**[تاریخ بغداد : 440/2]**

ووتم: ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزە کە کتێبەکە بریتی بووە لە فەتواکانی أبو حنیفة کە قوتابیەکانی نەقلیان کردووە لێی و نوسیویانەتەوە، وەک کتێبەکانی مسائلی ئیمام أحمد کە قوتابیەکانی لە أحمد-ەوە فەتوا نەقل دەکەن، الکوثري جەهمی تانەی لەمەش داوە.
بڕوانە [التنکیل : 736/1-739] المعلمي لێی پوچەڵ کردۆتەوە.

**الخطیب** دەڵێ: أخبرنا محمد بن عبیدالله الحنائي قال أخبرنا محمد بن عبدالله الشافعي قال حدثنا محمد بن إسماعیل السلمي قال حدثنا أبو توبة الربیع بن نافع قال حدثنا **ابن المبارك ووتی: ئەوەی سەیری کتێبی (الحیل)ی أبو حنیفة بکات حەڕامی الله حەلال دەکات و حەلالی الله حەڕام دەکات.**
**[تاریخ بغداد : 555/15]** (سەنەدەکەی صەحیحە).

ووتم: ابن المبارك کتێبەکەی دایە پاڵ أبو حنیفة کە خۆی هاو سەردەمی أبو حنیفة بووە، ئەم ووتەیەش نرخی خۆی هەیە چونکە کەسێک نیە دوای أبو حنیفة ژیا بێت و نەزانێت واقیعەکە چۆن بووە.

محقق-ی تاریخ بغداد(٢) دەڵێ: ابن أبي حاتم دەربارەی محمد بن إسماعیل السلمي دەڵێ: قسەیان دەربارەی کردووە.

الدارقطني دەڵێ: ثقة صدوق، أبو حاتم قسەی دەربارەی کردووە

ابن حجر دەڵێ: ثقة حافظ ووتەکەی أبو حاتم ڕوون نیە کە چی ووتوە

النسائي دەڵێ: ثقة

الحاکم دەڵێ: ثقة المأمون

الخطیب البغدادي دەڵێ: متقن

الذهبي دەڵێ: الحافظ

مسلمة بن القاسم دەڵێ: ثقة

جا دوای ووتەی هەموو ئەمانە ووتە نادیارەکەی أبو حاتم قبوڵ ناکرێ کە نازانرێ چی ووتوە، وە أبو حاتم توندە لە حوکمدان لەسەر ڕاوییەکان.

**الطحاوي** دەڵێ: سمعت أحمد بن أبي عمران دەیووت: محمد بن سماعة ووتی: **بیستم محمد بن الحسن دەیووت: ئەم کتێبە -واتا کتێبی الحیل- هێ ئێمە نیە، فڕێ دراوەتە ناو کتێبەکانمان.**

**ابن أبي عمران ووتی: إسماعیل بن حماد بن أبي حنیفة ئەم کتێبەی داناوە.**

**[الذهبي نەقلی کردووە - مناقب أبي حنیفة وصاحبیه : 85]**

ووتم: ئەم سەنەدە صەحیحە، ابن أبي عمران دەڵێ: قال محمد بن سماعة، واتا تەصریح نادات بە سەماع، زۆرێک لە بەرگریکەران لە أبو حنیفة کاتێک ڕیوایەتەکانی زەمکردنی دەهێنین دەڵێن: ووتی قال نەی ووت سمعت، واتا خۆی ووتەکەی نەبیستووە لە أبو حنیفة بۆیە زەعیفە ئیللا دەبێت بڵێ بیستم وایووت ئینجا صەحیحە، گەر بە قسەی ئێوە بێت کەواتە ئەم ڕیوایەتەش

زەعیفە لەکاتێکدا ئەمە بەهێزترین بەڵگەیە بۆ لابردنی تۆمەتی ئەم کتێبە لەسەر أبو حنیفة ئەگینا تەنها ئەم کتێبە بەسە بۆ تەکفیر کردنی أبو حنیفة چونکە پڕیەتی لە فەتوای کوفری، بەڵام ئێمە نە لەبەر دڵی ئێوە نە لە ڕقی ئێوەش لەخۆمانەوە شت تەصحیح و تەزعیف ناکات بەڵکو لەسەر ئەو مەنهەجە دەڕۆین کە زانایانی فەرمووده لە المتقدمین لەسەری بوون، مادام ابن أبي عمران قوتابی ابن سماعة-یە سەماع ئیثبات بووە لەنێوانیان بەشێوەیەکی گشتی ئەوا گەر بڵێ عن یان قال هەر بە متصل حیسابە لەسەر شەرطی بوخاری مادام دڵنیا بین لەوەی کە تەدلیسی نەکردووە، بۆیە مەرج نیە ئیللا ڕاوی بڵێ سمعت یان حدثني بەڵکو عن یان قال وەک صیغەیەکی محتملە بۆیە بە متصل دانەنرێت هەندێکجار وە هەندێکجاریش بە منقطع دادەنرێت گەر زانیمان یەکتریان نەدیوە یان ڕاوی تەدلیسی زۆرە یان بە دیاریکراوی زانیمان لەم سەنەدە تەدلیسی کردووە، جا کاتێک ڕاوییەک هاوسەردەمی ڕاوییەک بێت و ئەگەری بینین هەبێت لەنێوانیان هیچ بەڵگەیەکیش نەبێت کە یەکلایی بکاتەوە کە ئەم دوو ڕاوییە یەکتریان نەدیوە ئەوا ئەوکات گەر بە (عن) یان (قال) ڕیوایەتیان لەیەکتر کرد بە متصل هەژمار دەکرێت لەسەر شەرطی مسلم بەو مەرجەی ئەمین بین لە تەدلیس.

هەر چەندە ئەم سەنەدە سەنەدێکی حەنەفیە هەموویان زانای حەنەفی مەزهەبن، پێچەوانەی ووتەی أبو حفص-ە کە خۆی قوتابی محمد بن الحسن بووە ئەم کتێبەی لەو ڕیوایەت کردووە چۆن محمد دەڵێ ئەم کتێبە هی ئێمە نیە لەهەمان کاتدا قوتابیەکەی لێی ڕیوایەت دەکات ! بێگومان ڕیوایەت کردن بە ئاگاداری نێوان شێخەکە و قوتابیەکەی ڕوو دەدات نەک تاک لایەن بێت لەلایەن قوتابیەکەوە بەبێ ئاگاداری شێخەکەی ئیللا مەگەر قوتابیەکە درۆ بە دەم شێخەکەیەوە بکات، پاشان گەر ئەم کتێبە هی أبو حنیفة و دوو قوتابیەکەشی نەبێت ئەوا هیچ گومان لەوە دانیە کە أبو حنیفة فێڵی بەکار هێناوە لە فەتوادان هەروەک لەم بڕگەیەدا باسی دەکەین، بۆیە خاوەنی ئەم کتێبە هەر کەسێک بێت فێڵ کردن لەسەر أبو حنیفة تاوانی لا ناچێت، هەروەها کە ابن أبي عمران دەڵێ: نەوەکەی أبو حنیفة ئەم کتێبەی نوسیوە، نەوەکەشی حەنەفی مەزهەبە و

تەنانەت دوای چاوکز بوونی محمد بن سماعة ئەو لە شوێنیدا بۆتە قازی، بۆیە إسماعیل کەسێکی نامۆ نیە بە أبو حنیفة و مەزهەبەکەی.

**الخطیب** دەڵێ: أخبرنا إبراهيم بن عمر البرمكي قال أخبرنا محمد بن عبدالله بن خلف الدقاق قال حدثنا عمر بن محمد الجوهري قال حدثنا أبو بكر الأثرم قال حدثني زكريا بن سهل المروزي قال سمعت الطالقاني أبا إسحاق دەیووت: **بیستم ابن المبارك دەیووت: هەرکەسێک کتێبی (الحیل) لەماڵەکەیدا بێت فەتوای پێ بدات یان کار بکات بەو شتانەی لەناو کتێبەکەدا هەیە ئەوا ئەو کەسە کافرە، ژنەکەی لێ جیا دەبێتەوە و حەجی بەتاڵ دەبێتەوە. أبو إسحاق دەڵێ: بە ابن المبارك ووترا: لەم کتێبەدا هاتووە گەر ژنێک بیەوێت جیا ببێتەوە لە مێردەکەی ئەوا هەڵدەگەڕێتەوە لە ئیسلام تا لێی جیا دەبێتەوە پاشان دەگەڕێتەوە بۆ ئیسلام. جا عبدالله بن المبارك ووتی: هەرکەسێک ئەم کتێبەی دانابێت ئەوا کافرە، ژنەکەی لێی جیا بۆتەوە و حەجەکەی بەتاڵ بۆتەوە، خاقان المؤذن بە ابن المبارك-ی ووت: کەس ئەم کتێبەی دانەناوە جگە لە ئیبلیس، عبدالله ووتی: ئەو کەسەی ئەم کتێبەی داناوە لەلای من لە ئیبلیس ئیبلیسترە. [تاريخ بغداد : 556/15] (سەنەدەکەی حەسەنە).**

**أبو داود** دەڵێ: **باسی فێڵەکانی ئەهلی ڕەئی کرا لەلای أحمد، بیستم ئەویش ووتی: فێڵ دەکەن بۆ هەڵوەشاندنەوەی سوننەتەکانی پێغەمبەری الله ﷺ.**
[مسائل أبي داود للإمام أحمد : 1784] ت: طارق عوض الله

**ابن أبي یعلی** لە ژیاننامەی عبدالخالق بن منصور دەڵێ: **لە ئیمامەکەمان چەند شتێکی گێڕاوەتەوە، یەکێک لەوانە: دەڵێ: بیستم أحمد بن حنبل دەیووت: هەرکەسێک کتێبی الحیل-ی لەلا بێت لە ماڵەکەیدا فەتوای پێ بدات ئەوا کافرە بەو قورئانەی کە بەسەر محمد ﷺ دابەزیوە.**
[طبقات الحنابلة : 218/1]

**ابن بطة** دەڵێ: حدثني أبو صالح محمد بن أحمد حدثنا أبو جعفر محمد بن داود حدثنا أبو الحارث الصائغ ووتی: **بیستم باوکی عبدالله -واتا ئیمام أحمد- ووتی: ئەم فێڵانەی کە ئەمانە دایان هێناوە**

**أبو حنيفة و هاوەڵانى، ئەمانە چوون بەرەو فەرموودەكان جا فێڵيان كرد بۆ هەڵوەشاندنەوەى، جا هاتن بۆ ئەو شتەى كە پێيان ووترا ئەمە حەڕامە جا فێڵيان تێدا كرد تاكو حەلاليان كرد.**
[إبطال الحيل : 52] (سەنەدەكەى حەسەنە).

**ابن تيمية** دەربارەى ووتەى أبو حنيفة لە زەكاتدا دەڵێ: ... (دواى باسكردنى هەندێك لە فەتواكانى پاشان دەڵێ) **زەكاتى سەر فترە و بەروبومى كشتوكاڵى لێدەرچێت ئەوانى تر بە واجب نازانێت تەنها لەسەر كەسانى مكلف نەبێ، وە بە جائيزى دەزانێت فێڵ بكرێت بۆ لابردنى زەكات لەسەر خاوەنەكەى.** [القواعد النورانية الفقهية : 134]
ووتم: مەبەست پێى لە كەسانى (مكلف) واتا منداڵ و شێت ناگرێتەوە.

**ابن تيمية** دەڵێ: **لە هەندێك لە ئەهلى ڕەئى گێڕدراوەتەوە كە بە ڕاشكاوى ووتويەتى: ئينكارى ئەوە لە ئێمە دەكەن كە ئێمە چووين بۆ شتانێكى حەڕام جا فێڵمان تێيدا كرد تا كردمان بە حەلال.**
[الفتاوى الكبرى : 83/6]

**ابن القيم** دەڵێ: **يەكێكى تر لە فێڵ و تەڵەكەكانى شەيتان كە لە ئيسلام و ئەهلەكەى دەكات: فێڵ كردن و هەڵخەڵەتاندنە كە حەلال كردنى حەڕامەكانى الله و لابردنى فەرزەكانى و دژايەتى كردنى فرمان و نەهيەكانى لەخۆ دەگرێت، ئەمەش لە ڕەئى باطلە كە سەلەف يەك دەنگ بوونە لەسەر زەمكردنى.** [إغاثة اللهفان : 581/1]

**ابن حبان** دەڵێ: أخبرنا محمد بن عبدالرحمن الفقيه قال سمعت محمد بن أحمد بن حكيم الشيباني يقول سمعت أبا إسحاق الطالقاني دەيووت: **بيستم ابن المبارك دەيووت: هەر كەسێك كتێبى (الحيل)ى لەلايە دەيەوێ كارى پێ بكات ئەوا ئەو كەسە كافرە ژنەكەى لێى جيا بۆتەوە و حەجەكەى بەتاڵ بۆتەوە، پاشان ووتى: فلان دەڵێ: گەر كەسێك بە خێزانەكەى بڵێ تۆ وەك پشتى دايكم واى بۆم (الظهار) جا هەڵگەڕێتەوە لە ئيسلام كەفارەتى ظيهارەكەى لەسەر لادەچێ، جا گەر كەسێك توشى حاڵەتێكى ئاوا بوو كەسێكيش پێى بڵێ ئاوا بكە (واتا ئەم فێڵە بەكاربهێنە خۆت مورتەد**

**بكەوە تا كەفارەتەكەت لەسەر لاچێ پاشان بگەڕێوە بۆ ئیسلام) ئەوا ئەم كەسە كافرە ژنەكەى لێ جیا بۆتەوە و حەجەكەى بەتاڵ بۆتەوە.** **[المجروحين : 411/2]**

ووتم: محمد بن عبدالرحمن بن العباس السامي الهروي سیقەیە، أبو إسحاق الطالقاني صدوق-ە، بەڵام محمد بن أحمد بن حكيم الشيباني تەنها ابن حبان لە كتێبی (الثقات) هێناویەتی بەبێ بەكارهێنانی هیچ لەفزێكی تەوسیق كردن بۆی، جا ئەوەی مەبەستمە لە هێنانی ئەم ڕیوایەتەدا ئەوەیە كە ابن حبان ئەم ووتەیەی ابن المبارك-ی لە ژیاننامەی (أبو حنيفة)دا هێناوە، ئەمەش مانای ئەوەیە كە كتێبی الحيل بەندە بەناوی أبو حنيفة-ەوە لەلای زانایان، دواتر بە صەحیحی هەمان ڕیوایەتمان هێنا لە ابن المبارك بۆیە لە حاڵەتی ئاوادا ڕیوایەتی كەسانی وەک محمد بن أحمد بن حكيم الشيباني قبوڵ دەكرێت.

**الكرجي القصاب** دەڵێ: **فێڵی نەهی لێكراو ئەوەی كە لە أبو حنيفة-ەوە ژمێردراوە وەكو زەم ئەو جۆرەیە كە حەرام حەلال دەكات و حەلال حەرام دەكات.**

**[نكت القرآن : 623/1]**

# أبو حنيفة و حەڵاڵ كردنى دامێنى حەڕام و سوك كردنى حوكمە شەرعيەكان تێيدا:

لێرەدا چەند فەتوايەكى ناشرين و قێزەون لە أبو حنيفة-ەوە نەقل دەكەين دەربارەى حەلال كردنى دامێنە حەڕامەكان و ئاسانكارى كردن و سووك كردنى حوكمى شەرعى تێيدا، كە ئەگەر بێتو ئەم فەتوايانە لەناو موسڵماناندا بڵاو بكرێتەوە و بووترێ ئەمە فەتواى يەكێك لە چوار مەزهەبەكەيە ئەوا فەسادێكى يەكجار گەورە ڕوو دەدات.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا ابن رزق قال حدثنا عثمان بن أحمد الدقاق قال حدثنا إدريس بن عبدالكريم قال سمعت يحيى بن أيوب ووتى: **هاوەڵێكى سيقەى خۆمان پێى ڕاگەياندين ووتى: من لەلاى أبو بكر بن عياش دانيشتبووم، جا إسماعيل بن حماد بن أبي حنيفة هات سەلامى كرد و دانيشت، أبو بكر ووتى: ئەمە كێيە ؟ ووتى: من إسماعيل-م ئەى أبو بكر، جا أبو بكر بە دەست لە چۆكى إسماعيل-ى دا، پاشان ووتى: ئاى چەند دامێنى حەڕام باپيرت حەلالى كرد.** [تاريخ بغداد : 563/15]

ووتم: شێخەكەى يحيى بن أيوب مبهم-ە ئەگەرچى بە سيقەش وەسفى كردووە بەڵام ناتوانين تەعديلەكەى وەربگرين چونكە ڕەنگە لاى زانايانى تر زەعيف بوايە گەر ناوى هێنابوايە، بەڵام ئەم ڕيوايەتەم هەروەك پێشەكيەك هێنا نەك وەك بەڵگە هێنانەوە ئەگينا بە صەحيحى لەلاى ابن حبان بە هەمان مانا هاتووە.

**ابن حبان** دەڵێ: سمعت الفضل بن الحسين يقول سمعت يحيى بن عبدالله بن ماهان دەيووت: **بيستم هدية بن عبدالوهاب دەيووت:**

**إذا ذو الرأي خاصم عن قياس *** وجاء ببدعة هنة سخيفة**

**أتيناهم بقول الله فيها *** وآثار نبوءة شريفة**

**فكم من فرج عفيف *** أحل حرامها بأبي حنيفة**

**واتا: گەر خاوەنى ڕەئى مشتومڕى كرد لەسەر قياس، وە بيدعەيەكى پيسى سەخيفى هێنا، ئێمەش**

**ووتەی الله و ئاثاری شەریفی پێغەمبەرایەتی دەهێنین بۆیان، چەندین دامێنی پاک حەڕام بوونی حەلال کرا بەهۆی أبو حنیفة.** [المجروحين : 413/2] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: (هدیة) بۆتە (هدبة) لەهەردوو چاپی کتێبەکەدا، ڕاستەکەی (هدیة)یە.

## ١. مارەیی بڕین بەبێ ئامادە بوونی وەلی ئەمری کچەکە:

**ابن قدامة** دەڵێ: **أبو حنیفة دەڵێ: ئافرەت بۆی هەیە خۆی بە شوو بدات و ئافرەتی تریش بە شوو بدات.** [المغني : 345/9]

ووتم: واتا دروستە بەبێ ئامادە بوونی وەلی ئەمرەکەی خۆی بە شوو بدات، ئەمە لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مارەیی دانامەزرێ ئیللا بە ئامادەبوونی وەلی ئەمری کچەکە) هەروەها فەرموویەتی: (هەر ژنێک مارە بکرێت بەبێ ئیزنی وەلی ئەمرەکەی، ئەوا مارەییەکەی بەتاڵە مارەییەکەی بەتاڵە مارەییەکەی بەتاڵە) سێ جار فەرموویەتی وەک تەئکید کردنەوە، هەروەها فەرموویەتی: (ئافرەت نابێت ئافرەت بە شوو بدات، وە نابێت خۆی بە شوو بدات) وەک بڵێی ئەم دینە تەنگی تێدایە بەڵام أبو حنیفة هاتووە ئەم تەنگیەی لاداوە و فراوانی کردووە لەسەر موسڵمانان و ئاسانکاری بۆ کردوون ! بۆیەش دوو نظامی زندیق پەیدا دەبن و دەڵێن زاناکانی ئێوە خۆیان کردووە بە تەشریع دانەر و ئێوەش شوێنیان کەوتوون کردووتانن بە خوای خۆتان، مانای چیە مەلا دەڵێ دەزانم نابێت بەبێ وەلی ئەمر مارە بکرێت بەڵام لە مەزهەبی حەنەفی دروستە کێشە نیە بەو مەزهەبە مارەتان دەکەم ؟! ئایا ئەم مەزهەبە حەرامەکەی حەلال کرد ؟! ئەمەش ئەمڕۆ بەڵایەکی گەورەی دروستکردووە لەناو ئوممەتدا، تا ئێستاش زۆربەی ووڵاتانی خوراسان و هیند لەسەر ئەم فەتوایە دەڕۆن و کچ بەبێ وەلی ئەمر شوو دەکات، تەنانەت لەو ووڵاتانەش کە مەزهەبەکەیان حەنەفی نیە گەر کچەکە لاسار بێت و ڕابکات بەدوای کوڕێکدا مەلایەکی دەجال گەر خۆشی حەنەفی نەبێت لەسەر مەزهەبی أبو حنیفة کوڕ و کچەکە لەیەکتر مارە دەکات یان

دەڵێ مادام دایکی کچەکە ئامادەیە کێشە نیە دەشزانێ لە فەرمووده هاتووه کە ئافرەت بۆی نیە ئافرەت بە شوو بدات، ئەوە ووتمان عوزر بۆ أبو حنيفة دەهێننەوە و پینە و پەڕۆی بۆ دەکەن، ئەی باشە مەلاکان چ عوزرێکیان هەیە دوای ئەوەی زانیان أبو حنيفة پێچەوانەی فەرموودەی کردووە کەچی هەر لەسەر مەزهەبەکەی ئەو دەڕۆن ؟

## ٢.بە جائیز دانانی زینا کردن لەگەڵ ئافرەتانی کافری شەڕکەر:

**السيوطي** دەڵێ: **ئایەتی:** ﴿وَلَا يَطَـُٔونَ مَوۡطِئًا ...﴾ **أبو حنيفة کردوویەتی بە بەڵگە لەسەر جائیز بوونی زینا کردن لەگەڵ ئافرەتانی ئەهلی حەرب لە دار الحرب.** [الإكليل : 145]

ووتم: هیچ موفەسیرێک ئەم ئایەتەی بەم شێوەیە تەفسیر نەکردووە، وە ئافرەتانی کافر دوای جیهاد و دابەش کردنی پشکی غەنیمەت وکەنیزەکەکان لەلایەن ئەمیربەسەر موجاهیداندا ئەوکات دەبێتە حەلالیان ئەگینا پێش ئەوکاتە نەخێر.

## ٣. بە جائیز دانانی مارە بەجاش:

**الكاساني** دەربارەی مارە بەجاش دەڵێ: **گەر بە دەم دانی پێ بنێن و بیکەن بە مەرج کە پیاوی دووەم بۆ ئەوە ژنەکە مارە دەکات تا بۆ پیاوی یەکەمی حەلال بکات ئەوا ئەم مارەییە دروستە لەلای أبو حنيفة و زفر، بەڵام کەراهەتی هەیە بۆ هەردووک مارەییەکە.** [بدائع الصنائع : 405/4]

ووتم: لە پێغەمبەرﷺ بە صەحیحی هاتووە کە الله لەعنەتی لە هەردوو پیاوەکە کردووە.

الكاساني زانایەکی حەنەفی مەزهەبە.

## ٤. حەڵاڵ کردنی دامێنی حەرام بە شایەتیدانی درۆ:

**ابن أبي شيبة دەڵێ: باسكراوە كە أبو حنيفة وتوويەتی: گەر دوو شايەت بە درۆ شايەتی بدەن لەلای قازی لەسەر ئەوەی كە پياوێک ژنەكەی تەڵاق داوە، قازيش بەهۆی شايەتی ئەوان ژن و مێردەكە لەيەكتر جيا بكاتەوە، ئەوا هيچی تێدا نيە گەر يەكێک لەم دوو شايەتە ژنەكە بخوازن.**

[المصنف : 203/20]

ووتم: لەوانەيە بووترێ ابن أبي شيبة دەڵێ (باسكراوە) ئەمەش صيغەی التمريض-ە كە زەعيفە، بەڵام بە سەنەدی صەحيح ئەم فەتوايەی أبو حنيفة-مان هێنا.

## ٥. زينا كردن لە دواوە حەددی لەسەر نيە:

**الكاساني دەڵێ: جووت بوون لە دواوە چ ئافرەت بێ يان پياو حەددی لەسەر نيە لەلای أبو حنيفة، ئەگەرچی حەڕامە بەڵام چونكە لە پێشەوە جووت نەبووە نابێتە زينا.**

[بدائع الصنائع : 184/9]

ووتم: جووت بوون لەگەڵ ئافرەت لە پێشەوە بێ يان لە دواوە هەر زينايە، پێغەمبەر ﷺ لەكاتی جێبەجێ كردنی حەد لەكەسی نەپرسيوە لە پێشەوە زينات كرد يان لە دواوە، لە پياوانيش هەر لە دواوە دەبێ، ئەمەش كاری قەومی لوط-ە، سزاكەشی يەكێكە لە قورسترين سزاكان كە كوشتنە.

## ٦. گەر ژنێكی عاقڵ خۆی بداتە بەر دەستی شێتێک يان منداڵێک حەددی لەسەر نيە:

**الوزير ابن هبيرة دەڵێ: زانايان خيلافيان هەيە دەربارەی ئافرەتێكی عاقڵ گەر خۆی بداتە بەر دەستی شێتێک و شێتەكە جووت بێ لەگەڵی، يان پياوێكی عاقڵ زينا لەگەڵ ژنێكی شێتدا بكات، مالك و الشافعي و أحمد دەڵێن: لەهەردوو باردا كەسە عاقڵەكە حەددی زينای لەسەرە، وە أبو حنيفة دەڵێ: ئافرەتی عاقڵ حەددی لەسەر نيە گەر شێتێک جووت بێ لەگەڵی و خۆی بداتە بەر**

دەستی شێتەکە، بەڵام گەر پیاوی عاقڵ زینا لەگەڵ ژنێکی شێت بکات ئەوا حەددی زینا لەسەر پیاوەکەیە. [الاختلاف الأئمة العلماء : 253/2]

الكاساني دەڵێ: منداڵ یان شێت گەر سواری ئافرەتێکی نامەحرەم بێت ئەوا حەد لەسەر منداڵەکە یان شێتەکە نیە، چونکە کاری منداڵ و شێت بە حەرام وەسف ناکرێت، بۆیە سوار بوونی ئەوان بە زینا دانانرێت، جا حەد لەسەر ئافرەتەکەش نیە گەر ملکەچی بێت لەلای هەر سێ هاوەڵەکانمان رضي الله عنهم. (واتا: أبو حنيفة و أبو يوسف و محمد بن الحسن الشيباني). [بدائع الصنائع : 9/183-184]

## ٧. ئەوەی کەسە مەحرەمەکانی مارە بکات حەددی لەسەر نیە:

ابن حزم دەڵێ: أبو حنيفة دەڵێ: حەد لەسەر ئەو کەسە نیە کە دایکی و کچی و خوشکی و داپیری و پوری لای باوکی و پوری لای دایکی و کچی برای و کچی خوشکی دەخوازێ، ئەگەرچی بشزانێ ئەمانە چی ئەون، وە بشزانێ کە حەرامن لەسەر ئەو، وە لەگەڵ هەموویان جووت بێ، ئەوا منداڵەکە دەبێتە هی خۆی، مارەیی ئەمانەش واجبە لەسەری کە پێیان بدات، هیچ شتێکی لەسەر نیە تەنها تەمبێ کردن (التعزير) ئەویش لە 40 قامچی کەمتر. [المحلى : 159/16]

ووتم: بە صەحیحی هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ البراء-ی ناردووە بۆ لای پیاوێک فرمانی پێکردووە کە بیکوژێت چونکە ژنی باوکی هێنا بوو.

السرخسي دەڵێ: پیاوێک ژنێک بخوازێت کە بۆی حەلال نیە ئینجا جووت بێ لەگەڵی ئەوا حەددی لەسەر نیە جا بزانێت ئەم کارە حەرامە یان نەزانێت وەک یەکە، ئەمەش ووتەی أبو حنيفة -یە رحمه الله، بەڵام سزا دەدرێت بە لێدان گەر بزانێت حەرامە. [المبسوط : 85/9]

ووتم: پێشتر باسمان کرد کە السرخسي یەکێکە لە زانا دیارەکانی مەزهەبی حەنەفی، هەروەها ابن المنذر لە [الأوسط في السنن والإجماع والإختلاف : 518/12] هەمان شتی باسکردووە دەربارەی أبو حنیفة.

## ٨. پیاوێك ژنێك بە كرێ بگرێت بۆ ئەوەی زینای لەگەڵ بكات حەددی لەسەر نیە:

**السرخسي دەڵێ: پیاوێک ژنێک بە کرێ بگرێت بۆ ئەوەی زینای لەگەڵ بکات، جا زینای لەگەڵ بکات ئەوا حەد لەسەر کەسیان نیە لە فەتوای أبو حنیفة-دا. [المبسوط : 58/9]**

ووتم: گەر خەڵکی ئەم فەتوایانە ببیستن و بووترێ ئەمەش فەتوای یەکێک لە مەزهەبەکانە و تا ئێستاش لە کتێبەکاندا بوونی ماوە چی ڕوو دەدات ؟ خۆتان دەزانن چەندەها کەسی فاسد و فاجر هەیە هیوا خوازە مەلایەک فەتوایەکی بۆ بدات بڵێ ئەم کارە حەلالە یان ڕێگای تێدەچێ یان خیلافیە، ئەی چ جای بووترێ ئەم کارانە لە مەزهەبی أبو حنیفة بەم شێوەیە؟ بۆیە زۆر ڕاستی کرد شاعیر کاتێک ووتی: چەندەها دامێنی پاک حەڕامیەکەی حەلال کرا بەهۆی أبو حنیفة.

## بڕگەی هەشتەم:
## فەتوادان بە ڕەئی.

حرب الكرماني دەڵێ: **ئەهلی ڕەئی بیدعەچی و گومڕان، دوژمنانی سوننەت و ئەثەرن، دین بە ڕەئی و قیاس و استحسان دەبینن، وە موخالەفەی ئاثار دەکەن و فەرمووده بەتاڵ دەکەنەوە، وە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕەت دەکەنەوە، وە أبو حنیفة وئەوانەی لەسەر ڕەئی ئەون دەکەن بە پێشەوا و دینداری دەکەن بە دینی ئەوان وهەمان قسەی ئەوان دەکەن، جا چ گومڕاییەک لەمە ڕوونترە کە کەسێک ئاوا بڵێت یان لەسەر ئەم عەقیدەیە بێت، واز لە ووتەی پێغەمبەر و هاوەڵانی بهێنێت شوێنی ووتەی أبو حنیفة و هاوەڵانی بکەوێت، ئەمەندە بەسە بۆ گومڕایی و طوغیان و ڕەت کردنەوە.** [السنة : 109]

حرب الكرماني دەربارەی مەزهەبی ئەهلی سوننە لە سەرەتای کتێبەکەیدا دەڵێ: **ئەمە مەزهەبی زانایان و خاوەنانی ئەثەرە لە ئەهلی سوننە کە ناسراون پێی و خەڵکی شوێنیان کەوتوون تێیدا، وە گەیشتم بە زانایانی عیراق و حیجاز و شام و جگە لەوانیش لەسەر ئەم مەزهەبە بوون، وە هەر کەسێکیش موخالەفەی شتێک بکات لەم مەزهەبە یان تانەی لێبدات یان خاوەنەکەی عەیبدار بکات ئەوا بیدعەچیە و دەرچووە لە کۆمەڵی موسڵمانان و لایداوە لە مەنهەجی سوننە و ڕێگای حەق، ئەمەش مەزهەبی أحمد وإسحاق بن إبراهيم بن مخلد وعبدالله بن الزبير الحميدي وسعيد بن منصور و جگە لەوانیشە لەوانەی کە لەگەڵیان دانیشتووین و زانستمان لێیان وەرگرتووە.** [السنة : 1]

ووتم: کەواتە هەر خاڵێک کە حرب الكرماني لەم کتێبەیدا نەقلی دەکات ئیجماعی زانایانی ئەهلی سوننەی لەسەرە، جا ووتەکانی باش بخەرە گوێتەوە و بە گرنگی بزانە.

کەواتە ووتەی پێشووی دەربارەی ئەهلی ڕەئی و أبو حنیفة ئیجماعی زانایانی ئەهلی سوننەی لەسەرە، گەر تۆ أبو حنیفة بە ئیمام بزانیت ئەوا ئەم وەسفانەی سەرەوە دەتگرێتەوە، زۆر سەیرە

ئیجماعی سەلەف لەسەر ئەم شتانە بووە کەچی ئێستا ئێمە گەیشتووین بەکوێ دەربارەی أبو حنيفة ؟!

**حرب الكرماني** دەڵێ: **خاوەنانی ڕەئی و قیاس لە دین بیدعەچی و جاهیل و گومڕان.** [السنة : 88]

**حرب الكرماني** دەربارەی پێشەوایانی ئەهلی سوننە دەڵێ: **خاوەنی قیاس و ڕەئی نین، چونکە قیاس لە دیندا باطلە، وە ڕەئیش بەهەمان شێوە لە قیاس باطلترە.** [السنة : 87]

**حمزة السهمي** دەڵێ: سمعت أبا أحمد عبدالله بن عدي الحافظ يقول سمعت أحمد بن العباس العدوي دەیووت: **بيستم إسماعيل بن سعيد الكسائي (الشالنجي) دەیووت: من چل ساڵ لە گومڕایی دابووم جا الله هیدایەتی دام، جا چ پیاوانێکم لەکیس چوو.**
**السهمي دەڵێ: أبو إسحاق -واتا إسماعيل الشالنجي- لەسەر مەزهەبی ئەهلی ڕەئی بوو پاشان الله هیدایەتی دا و فەرمووەدەی نوسی و بینی کە حەق ئەوەیە شوێنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بکەویت، پاشان ڕەددی دانەوە بە کتێبی (البيان).** [تاريخ جرجان : 159] **(سەنەدەکەی حەسەنە).**
ووتم: بڕوانە دەڵێ الله هیدایەتی وازی لە مەزهەبی ڕەئی هێنا و چووە سەر مەزهەبی ئەهلی سوننە، پاشان کتێبی نوسیوە بۆ ڕەتدانەوەی أبو حنيفة، کەواتە مەزهەبەکەی أبو حنيفة گومڕاییە و جیاوازە لە مەزهەبی ئەهلی سوننە، ئەی پێم ناڵێن أبو حنيفة چۆن بۆتە ئیمامی ئەهلی سوننە ؟!
إسماعيل الشالنجي: دوای تەوبەکردنی بوو بە یەکێک لە هاوەڵانی ئیمام أحمد، وەک باقی هاوەڵانی تری ئیمام أحمد کتێبی مسائلی هەیە بەناوی (مسائل أحمد برواية الشالنجي).

**الشوكاني** دەڵێ: **ئەمە پشت بەستنە بە ڕەئی بۆگەن کە سەرەنجامەکەی ڕەت کردنەوەی زۆرێک لە سوننەتی پاکە بەبێ بەڵگەیەکی ڕوون، لە چەندەها شوێندا خاوەنی شەرع دەڵێ ئاوا جائیز نیە ئاوا قبوڵ نیە ئاوا دروست نیە، کەچی ئەوانەی دەستیان گرتووە بەم ڕەئیەوە دەڵێن ئاوا**

**جائیزە و ئاوا قبوڵە و ئاوا دروستە، هەر لەبەر ئەمە سەلەف ئاگادارکردنەوەیان داوە لە ئەهلی ڕەئی.** [نيل الأوطار: 106/3]

ووتم: ئەم ووتەیەش نرخی گەلێک زۆرە لەلای خوێنەر چونکە زۆرینەی ئەمڕۆ پێیان وایە ووتەی خەلەف و معاصرین بەهێزترە لەم بابەتەدا لە ووتەی سەلەف چونکە ئێمە ئەوکات نەژیاوین نازانین دۆخەکە چۆن بووە، ئەوەتا الشوكاني کە 190 ساڵ لەمەوبەر مردووە بەم شێوەیە ئەهلی ڕەئی باس دەکات و ووتەی سەلەف دەربارەیان ئاماژە پێدەکات، ڕوونیشە لای زانایان کە ووترا ئەهلی ڕەئی واتا أبو حنيفة و هاوەڵانی، هەر بۆیە لە کتێبی (الجواهر المضية في طبقات الحنفية) عبدالقادر القرشي الحنفي زۆرجار زانایانی مەزهەبی حەنەفی بە پێشەوای ئەهلی ڕەئی ناو دەبات.

ئەمە ژمارەیەک ووتە بوو بۆ زانینی ئەوەی کە ئەهلی ڕەئی بریتین لە حەنەفیەکان کە ئیمامەکەیان أبو حنيفة-یە، وە جیاوازن لە ئەهلی سوننە بەڵکو هەمیشە بەرامبەر ئەهلی سوننە ناویان دەهێنرێت وەک دوو کۆمەڵەی دژ بەیەک.

**ابن حبان** لەژیاننامەی أبو حنيفة دەڵێ: **النعمان بن ثابت أبو حنيفة الكوفي خاوەنی ڕەئی.** [المجروحين: 405/2]

**الخطيب** لەژیاننامەی أبو حنيفة دەڵێ: **النعمان بن ثابت أبو حنيفة التيمي پێشەوای ئەهلی ڕەئی.** [تاريخ بغداد: 15/444-445]

**ابن الجوزي** لەژیاننامەی أبو حنيفة دەڵێ: **النعمان بن ثابت أبو حنيفة التيمي پێشەوای ئەهلی ڕەئی.** [المنتظم: 128/8]

ووتم: سەیر نیە أبو حنيفة ئیمامی ئەهلی ڕەئی بێت کەچی بکرێتە ئیمامی ئەهلی سوننە ؟! لەکاتێکدا دژایەتی نێوان ئەم دوو مەزهەبە ڕوونە هەر لەسەردەمی سەلەفەوە، نەبووە و نابێت کەسێک لە دوو مەزهەبی دژ بەیەکدا ئیمام بێت، جا دوای ئەوەی کە زانیمان ئەهلی ڕەئی چۆنن، وە زانیمان أبو حنيفة پێشەوای ئەهلی ڕەئیە، کەواتە هەر ووتەیەک کە دژی ئەهلی ڕەئی ووترا لەلایەن زانایان

ئەوا پێش هەموو كەس أبو حنيفة دەگرێتەوە چونكە ئەو پێشەوایانە.

مقبل بن هادي الوادعي دەڵێ: **برایەک لە براكانی شاری عەدەن پرسیاری لێكردم لە ڕێگای تەلەفۆنەوە دەربارەی أبو حنيفة، ئایا لە ئەهلی سوننە و جەماعەتە یان نا ؟ منیش بێدەنگ بووم، پاشان پێم وابوو كە واجبە ئەو شتە بڵێم كە باوەڕم پێیەتی و دینداری پێدەكەم، أبو حنيفة لە ئەهلی سوننە وجەماعەت نیە.** [البشائر في السماع المباشر لعبدالله بن عياش الأهدل: 62]

حرب الكرماني دەڵێ: **هەر كەسێک بڕوای بە تەقلید نەبێت و تەقلیدی كەس ناكات لە دیندا ئەوا ئەمە عەقیدەی فاسقێكی بیدعەچیە، دوژمنی الله و پێغەمبەرەكەی ﷺ و دینەكەی وكتێبەكەی و سوننەتی پێغەمبەرەكەیەتی عليه الصلاة والسلام، بەم ووتەیەی دەیەوێ ئەثەر بەتاڵ بكاتەوە و عیلم پەكبخات و سوننەت بكوژێنێتەوە و بە تەنها بۆخۆی ڕەئی و ووتە و بیدعە و خیلاف دابهێنێت، جا لەعنەتی الله و فریشتەكان و هەموو خەڵكی لەسەر خاوەنی ئەم ووتەیە بێت، ئەمە پیسترین ووتەی بیدعەچیەكانە، وە نزیكترینیەتی لە گومڕایی و لەناوچوون، بەڵكو ئەمە گومڕایەتیە، بڕوای بە تەقلید نیە كەچی أبو حنيفة و بشر المريسي و هاوەڵەكانی تەقلیدیان كرد لە دیندا، جا چ دوژمنێک بۆ دین دژایەتیكەرترە لەو كەسەی كە دەیەوێ سوننەتەكان هەڵوەشێنێتەوە و ڕیوایەت و ئاثارەكان بەتاڵ بكاتەوە و بڕوای بە تەقلید نەبێ ؟ لەكاتێكدا ئەوانەی ناوم هێنان بۆت لە دیندا تەقلیدیان كردۆتەوە، كە ئەوان پێشەوای گومڕایەتی و سەرانی بیدعە و سەرۆكی سەرپێچیكارانن، جا غەزەبی الله بڕژێ بەسەر خاوەنی ئەم ووتەیە.** [السنة : 89]

ووتم: تەقلید لەلای سەلەف واتا شوێنكەوتنی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی و لاسایی كردنەوەی ئەوان و پێشینە چاكەكانی پێش خۆیان، نەوەک تەقلید كردنەوەی فلان و علان بەبێ بەڵگە ئەگەرچی ووتەكەشی پێچەوانەی شەرع بێ، هەر بۆیە البربهاري دەڵێ: بزانە دین بە تەقلید كردنەوەیە، تەقلیدی هاوەڵانی محمد ﷺ دەكرێتەوە. هەروەها دەڵێ: دەست بگرە بە ئەثەر و خاوەنانی ئەثەر و تەقلید، چونكە دین بە تەقلیدە، واتا تەقلید كردنەوەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی.

إسحاق بن راهويه دەڵێ: ئێمە خاوەنانی شوێنكەوتن و تە قلیدكردنەوەی پێشەوا و پێشینی خۆمانین.

جا لێرەدا مەبەستی حرب الكرماني ئەوەیە كە كەسانێک دەڵێن ئێمە تەقلیدی پێشینی خۆمان ناكەین، ئەویش بە سەرسوڕمانە دەڵێ: أبو حنيفة و بشر المريسي كە سەرانی گومڕایی و بیدعەن تەنانەت ئەوانیش بەم هەموو خراپەی خۆیان قسەی لەم شێوەیە ناكەن، جا بڕوانە ناوی بشر المريسي لە پاڵ أبو حنيفة دەهێنێ، وە هەردووكیان بە پێشەوای گومڕایەتی و سەرانی بیدعە و سەرۆكی سەرپێچیكاران وەسف دەكات.

ابن أبي يعلى دەڵێ: **عمرو بن معمر أبو عثمان لە ئیمامەكەمانەوە -واتا ئیمام أحمد- هەندێک شتی ڕیوایەت كردووە، لەوانە: ئەوەی أبو بكر الخلال باسی كردووە لە (كتاب العلم) كە دەڵێ: أخبرني سعيد بن مسلم الطوسي حدثنا محمد بن الهيثم قال سمعت أبا عثمان عمرو بن معمر ووتی: أحمد بن حنبل و علي بن المديني ووتیان: گەر بینیت كەسێک خۆی دەپارێزێت لە أبو حنيفة و ڕەئیەكانی و سەیركردنی ڕەئیەكانی و دڵی پێی مورتاح نیە وە بەوانەش كە لەسەر مەزهەبی ئەون لەوانەی كە زیادەڕەوی دەكەن، وە بە ئیمامی دانانێت ئەوا هیوای خێرت بەم كەسە هەبێت.**
**[طبقات الحنابلة : 247/1]**

ووتم: سعيد بن مسلم الطوسي نەمدۆزییەوە.

هەروەها اللالكائي لە [شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة : 318] عەقیدەی علي بن المديني نەقل دەكات كە تێیدا هاتووە: گەر بینیت كەسێک أبو حنيفة و ڕەئیەكەی خۆش دەوێت و دەیخوێنێتەوە ئەوا لێی دڵنیا مەبە، وە لەو كەسەش كە لەسەر مەزهەبی ئەوە لەوانەی كە زیادەڕەوی دەكەن دەربارەی أبو حنيفة و دەیكەن بە ئیمام.

وەک دەبینن ماناكەی زۆر نزیكە لەوەی پێشوو، جا بزانە سەردەمە چۆن گۆڕاوە و تەواو پێچەوانە بۆتەوە، لە ئێستادا دەربارەی أبو حنيفة گەر بیانەوێ حوكم لەسەر كەسێک بدەن بەوە حوكمی لەسەر دەدەن كە ئایا ئەو كەسە أبو حنيفة تەكفیر دەكات یان تەبدیعی دەكات گەر وابوو ئەوا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ئەم كەسە كەسێكی خراپە وەک بڵێی نزیک بۆتەوە لە خەواریج، بەڵام گەر أبو حنيفة بە ئیمام بزانێت و بەرگری لێ بكات و زیادەڕەوی بكات لە گەورە كردنی ئەوا ئەهلی

سوننەیە ! لەکاتێکدا أحمد بن حنبل و علي بن المديني تەواو پێچەوانەی ئەمەیان ووت کە هەر کەسێک بە ئیمامی نەزانێت و زیادەڕەوی نەکات دەربارەی و لەسەر مەزهەب و ڕەئی ئەو نەبێت ئەوا هیوای خێرت پێی هەبێ.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا البرمكي أخبرنا محمد بن عبد الله بن خلف حدثنا عمر بن محمد الجوهري حدثنا أبو بكر الأثرم قال حدثنا يحيى بن محمد بن صاعد حدثنا **ابن نمير ووتی: بە خەڵکی گەیشتم بینیم فەرموودەیان لە أبو حنيفة-ەوە نەدەنوسیەوە، چ جای ڕەئیەکانی بنوسنەوە !**
[تاريخ بغداد : 575/15] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

**الخطيب** دەڵێ: **سەبارەت بە تانەدانی زانایانی ئەهلی ڕەئی و ئەهلی کەلام لە ئەهلی حەدیث، من هۆکاری ئەمە ڕوون دەکەمەوە تاکو ئەوانە بیزانن کە نایزانن. ئەهلی ڕەئی زۆربەی ئەو شتانەی پشتی پێ دەبەستن فەرموودەی زەعیفن لە ئەسڵەوە، زەعیفن لەلای فەرموودەناسان، جا کە پرسیارکرا لە ئەهلی حەدیث ئەوا حاڵی فەرموودەکان ڕوون دەکەنەوە و نیشانی دەدەن کە زەعیفە، جا ئەهلی ڕەئی ناتوانن ئینکاری ووتەی فەرموودەناسان بکەن لەم بارەیەوە و هەروەها دەربارەی مانای فەرموودەکانیش، لەکاتێکدا ئەوان ئەم فەرموودانەیان کردۆتە کۆڵەکە بۆخۆیان و پشتیان پێی داداوە، وە کردوویانە بە چەکی دەستیان، وە ئەو فەرموودانە سەرخستنی تێدایە بۆ مەزهەبەکەی خۆیان، وە گەورەترین یارمەتیدەریانە بۆ گەیشتن بە ویست و مەبەستەکانیان، جا بۆیە تانەدانی ئەهلی ڕەئی لە فەرموودەناسانی ئەهلی سوننە شاراوە نیە، وە شتانی خراپ دەدەنە پاڵیان و وازلە قبوڵ کردنی ئامۆژگاریەکانیان دەهێنن لە ڕوونکردنەوەی عیللەتی فەرموودەکان، وە ڕەفزی ئەو جەرح و تەعدیلانەش دەکەن کە بۆ ڕاوییەکانیان کردووە، چونکە فەرموودەناسان ئەو شتانەیان ڕووخاند کە ئەهلی ڕەئی بنیاتیان نابوو، وە ئەو شتانەیان بەتاڵ کردەوە کە بۆی چوو بوون و مەبەستیان بوو، وە ئەو فەرموودانەیان بە زەعیف دانا کە ئەوان پێیان وابوو صەحیحە وە باوەڕیان پێی هەبوو.** [الفقيه والمتفقه : 151/2]

ووتم: ئەوەی سەیری حاڵی (محمد زاهد الكوثري) جەهمی بکات کە ناسراوە بە (مجنون أبي حنيفة) شێتی أبو حنيفة، ئەوا دەزانێت ئەم وەصفانەی الخطيب هەمووی بە زیادەوەش لە الكوثري دا هەیە، هەرچی ووتەی سەلەف هەیە دەربارەی أبو حنيفة هەمووی ڕەت دەکاتەوە و تانە لە سەلەف دەدات و عەیبداریان دەکات، چونکە ئەوەی ئەو بە ئیمامی زانیوە سەلەف دەریان خستووە حاڵی چۆنە، ئەمە لەکاتێکدا الكوثري 9 سەدە دوای الخطيب ژیاوە.

**أبو عمرو الداني** دەڵێ:

**وامح الذي في الكتب والصحيفة *** من قول ذي الرأي أبي حنيفـة**

**وصحبـه إذ خالفـوا التنزيـلا *** وخالفوا في حكمه الرســـولا**

**واتا: بسڕەوە ئەوەی لە کتێب و پەڕاودا هەیە لە ووتەکانی خاوەنی ڕەئی أبو حنيفة، خۆیی و هاوەڵانی موخالەفەی قورئانیان کرد، وە موخالەفەی پێغەمبەریان کرد لە حوکمیدا.** [الأرجوزة المنبهة : 173]

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا أبو نعيم الحافظ قال حدثنا محمد بن أحمد بن الحسن الصواف قال حدثنا بشر بن موسى قال حدثنا الحميدي قال حدثنا سفيان عن **هشام بن عروة عن أبيه ووتی: بەردەوام کاروباری دین لەناو بەنی ئیسرائیلدا ڕێکبوو تاکو منداڵی سەبایەی ئوممەتەکان لەدایکبوون، جا بە ڕەئی خۆیان قسەیان لە دیندا کرد، گومڕا بوون و خەڵکیشیان گومڕا کرد. سفیان ووتی: بەردەوام کاروباوی خەڵکی ڕێکبوو تا ئەو أبو حنيفة-یە گۆڕی لە کوفە، وە البتي لە بەصرە، وە ربيعة لە مەدینە، جا سەیرمان کرد بینیمان هەر سێکیان منداڵی کەنیزەکی ئوممەتەکانن.**

**[تاريخ بغداد : 543/15] (سەنەدەکەی صەحیحە).**

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: حدثنا أبي حدثنا يونس بن عبدالأعلى ووتی: **بيستم الشافعي دەیووت: ڕۆژێک بە محمد بن الحسن-م ووت کە باسی مالك و أبو حنيفة کرا، محمد بن الحسن پێی ووتم: هاوەڵەکەمان نەدەکرا بێدەنگ بێت واتا أبو حنيفة، وە نەدەکرا هاوەڵەکەی ئێوە فەتوا بدات واتا مالك، منیش پێم ووت: سوێندت دەدەم بە الله، ئایا دەزانی هاوەڵەکەمان واتا مالك زانا بوو بە**

**كتێبی الله ؟ ووتی: بەڵێ، ووتم: سوێندت دەدەم بە الله، ئایا دەزانی هاوەڵەكەمان زانا بوو بە فەرموودەی پێغەمبەری الله ﷺ ؟ووتی: بەڵێ، ووتم: وە زانا بوو بە خیلافی نێوان هاوەڵانی پێغەمبەری الله ﷺ ؟ ووتی: بەڵێ، ووتم: ئایا عاقڵ بوو ؟ ووتی: نەخێر، ووتم: سوێندت دەدەم بە الله، ئایا دەزانی هاوەڵەكەت واتا أبو حنيفة جاهیل بوو بە كتێبی الله عز وجل ؟ ووتی: بەڵێ، ووتم: وە جاهیل بوو بە فەرموودەی پێغەمبەری الله ﷺ وە جاهیلیش بوو بە خیلافی نێوان هاوەڵانی پێغەمبەری الله ﷺ ؟ ووتی: بەڵێ، ووتم: ئایا عاقڵ بوو ؟ ووتی: بەڵێ، ووتم: لە هاوەڵەكەی ئێمەدا سێ شت كۆ دەبێتەوە كە فەتوا نابێ بدرێ بەبێ ئەم سێ شتە، وە شتێكی تێدا نیە، بەڵام هاوەڵەكەی ئێوە سێ شتی تێدایە نیە و یەك شتی تێدایە، ئینجاش دەڵێی: ناكرێ هاوەڵەكەی ئێمە قسە بكات و ناشكرێ هاوەڵەكەی ئێوە بێدەنگ بێ ؟!**

[آداب الشافعي ومناقبه : 154] **(سەنەدەكەی صەحیحە).**

ووتم: (بیستم الشافعي دەیووت: ڕۆژێك بە محمد بن الحسن-م ووت كە باسی مالك و أبو حنيفة كرا، محمد بن الحسن پێی ووتم) لەڕووی داڕشتنەوە هەڵە دەردەكەوێ، بەڵام خۆی لە عەرەبیەكە ئاوا هاتووە هەڵەی وەرگێڕان نیە.

ڕیوایەتەكەش شایەتی الشافعي و محمد لەسەر أبو حنيفة كە جاهیلە بە قورئان و سوننەت و خیلافی هاوەڵان، دواتریش دێینە سەر ئەو ووتەیەی كە گوایە شافعی وتوویەتی: خەڵكی لە فقهدا لەسەر أبو حنيفة حیسابن ! سەیرەكە لەوە دایە أبو يوسف ئینكاری لەوە ناكات كە أبو حنيفة هانی خروج كردنی داوە و جەهمی بووە، محمد بن الحسن الشيباني دەربارەی أبو حنيفة دەڵێ جاهیلە بە قورئان و سوننەت، البرتي ئینكاری لەوە ناكات كە وتوویەتی قورئان مەخلوقە، ئا ئەمە قسەی نزیكترین كەسانی أبو حنيفة-یە، كەچی لەسەردەمی خەلەف و معاصرین أبو حنيفة بۆتە ئیمامی ئەهلی سوننە و ئەم قسانە هەمووی ڕەت كرایەوە دەربارەی، كەواتە ئێوە دڵسۆزترن بۆ أبو حنيفة لە قوتابیەكانی !

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: حدثنا محمد بن عبدالله بن عبدالحكم ووتی: **بیستم الشافعي دەیووت: محمد بن الحسن پێی ووتم: كامەیان زاناترن هاوەڵەكەی ئێمە یان هاوەڵەكەی ئێوە ؟ (واتا: أبو حنیفة و مالك) الشافعي دەڵێ ووتم: بە ئینصافەوە ؟ محمد ووتی: بەڵێ، ووتم: سوێندت دەدەم بە الله كامەیان زاناترن بە قورئان هاوەڵەكەی ئێمە یان هاوەڵەكەی ئێوە ؟ ووتی: هاوەڵەكەی ئێوە (واتا: مالك) ووتم: كامەیان زاناترن بە سوننەت هاوەڵەكەی ئێمە یان هاوەڵەكەی ئێوە ؟ ووتی: هاوەڵەكەی ئێوە، ووتم: سوێندت دەدەم بە الله كامەیان زاناترن بە ووتەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و پێشینان هاوەڵەكەی ئێمە یان هاوەڵەكەی ئێوە ؟ ووتی: هاوەڵەكەی ئێوە، ووتم: هیچ نەماوەتەوە تەنها قیاس نەبێ، قیاسیش ناكرێ تەنها لەسەر ئەم شتانە نەبێ، جا ئەوەی ئەصلەكەی نەزانی لەسەر چ شتێك قیاس دەكات ؟ [آداب الشافعي ومناقبە : 119] (سەنەدەكەی صەحیحە).**

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: حدثنا الربيع بن سليمان المرادي ووتی: **بیستم الشافعي دەیووت: أبو حنیفة یەكەم بابەت بە هەڵە دادەنێت پاشان هەموو كتێبەكە لەسەر ئەو بابەتە قیاس دەكات. [آداب الشافعي ومناقبە : 129] (سەنەدەكەی صەحیحە).**

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: حدثنا محمد بن عبدالله بن عبدالحكم ووتی: **محمد بن إدریس الشافعي پێی ووتم: سەیری چەند كتێبێكی هاوەڵانی أبو حنیفة-م كرد، 130 پەڕ بوو، 80 پەڕم تێیدا ژمارد كە پێچەوانەی قورئان و سوننەت بوو. ابن أبي حاتم دەڵێ: چونكە ئەصلەكە هەڵە بووە جا فەرعەكانیش لەسەر هەڵە ڕۆیشتوون. [آداب الشافعي ومناقبە : 129] (سەنەدەكەی صەحیحە).**

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: قال أبي حدثنا هارون بن سعيد الأيلي ووتی: **بیستم الشافعي دەیووت: كەس ناناسم كتێبی نوسی بێت كتێبەكانی بین بە بەڵگە لەسەر عەیب و عاری ووتەكانی وەك أبو حنیفة. [آداب الشافعي ومناقبە : 130] (سەنەدەكەی صەحیحە).**

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: حدثنا أحمد بن سنان الواسطي ووتی: **بیستم محمد بن إدریس الشافعي**

**دەیووت: ڕەئی أبو حنيفة-م بەهیچ شتێک نە شوبهاندووە تەنها بە داوە دەزووی ساحیران نەبێ، ئاوا درێژی دەکەیتەوە دەبێتە زەرد ، ئاوا درێژی دەکەیتەوە دەبێتە سەوز.**

**[آداب الشافعي ومناقبه : 130] (سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: محقق-ی کتێبەکە دەڵێ: (خيط سحارة : داوە دەزووی ساحیران) شتێکە منداڵان یاری پێدەکەن.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: حدثنا أبي حدثنا أحمد بن أبي سريج ووتی: **بيستم الشافعي دەیووت: 60 دینارم سەرف کرد بۆ بە دەست هێنانی کتێبەکانی محمد بن الحسن، پاشان لێی وورد بوومەوە لەپاڵ هەر بابەتێکدا فەرموودەیەکم دانا. واتا: بۆ ڕەتدانەوەی.**

**[آداب الشافعي ومناقبه : 27] (سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: ئەم ووتەیەی کۆتایی (واتا: بۆ ڕەتدانەوەی) نازانم ووتەی ابن أبي حاتم-ە یان هی باوکیەتی یان هی ابن أبي سريج-ە.

جا دوای ئەم هەموو ڕیوایەتەی الشافعي دەربارەی أبو حنيفة هێشتا دڵتان بەوە خۆشکردووە کە الشافعي وتوویەتی: (الناس في الفقه عيال على أبي حنيفة) ؟ دواتر ئەم ووتەیەش ڕوون دەکەینەوە لە بەشی دووەمدا کە چۆنە.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: حدثنا أبي حدثنا ابن أبي سريج ووتی: بيستم الشافعي دەیووت: **بيستم بە مالك ووترا: أبو حنيفة دەناسیت ؟ ووتی: بەڵێ، گومانتان چیە بەرامبەر پیاوێک گەر بڵێ ئەم دینگەیە لە زێڕ دروستکراوە ئەوا هەر لەسەری بەردەوام دەبێت تاکو دەیکات بە زێڕ کەچی لە دار یان لە بەرد دروستکراوە ؟ ابن أبي حاتم دەڵێ: واتا أبو حنيفة لەسەر هەڵە دەمایەوە و بەڵگەی بۆ هەڵەکەی دەهێنایەوە، وە نەدەگەڕایەوە بۆ صەواب کاتێک بۆی دەردەکەوت.**

**[آداب الشافعي ومناقبه : 162] (سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: الحمد لله کە ابن أبي حاتم مەبەستی مالك-ی ڕوونکردەوە بۆمان، ئەگینا ئێستا ئەم ووتەیە وا باس دەکرا کە مالك مەدحی أبو حنيفة-ی کردووە، بەڵام سەرەڕای ئەمەش هێشتا دەمارگیرەکان

بۆ أبو حنيفة دەڵێن ئەم ووتەیە مەدحە بەڵام ابن أبي حاتم بە هەڵە لێی تێگەیشتووە !

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا البرقاني قال أخبرنا محمد بن عبدالله بن خميرويه قال أخبرنا الحسين بن إدريس ووتی: **ابن عمار ووتی: گەر لە شتێكدا گومانت هەبوو سەیری ووتەی أبو حنيفة-ت كرد و پێچەوانەی ئەوت كرد ئەوا حەقە، یان ووتی: بەرەكەت لەوە دایە پێچەوانەی ئەو بكەیت.**
[تاريخ بغداد : 562/15] **(سەنەدەكەی صەحیحە).**
ووتم: الحسين بن إدريس قوتابی ابن عمار بووە ووتنی (قال ابن عمار) هیچ زیانی نیە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا بشرى بن عبدالله الرومي قال أخبرنا عبدالعزيز بن جعفر الخرقي قال حدثنا إسماعيل بن العباس الوراق قال حدثنا إسحاق بن إبراهيم البغوي، وأخبرنا أبو سعيد محمد بن حسنويه بن إبراهيم الأبيوردي قال أخبرنا زاهر بن أحمد السرخسي قال حدثنا عبدالله بن أحمد بن ثابت البزاز قال حدثني إسحاق بن إبراهيم قال حدثنا أبو الجواب ووتی: **عمار بن رزيق پێی ووتم: پێچەوانەی أبو حنيفة بكە دەپێكی. الخطيب دەڵێ: بشرى ووتی: گەر پێچەوانەی أبو حنيفة بكەی ئەوا پێكاوتە.**
[تاريخ بغداد : 562/15] **(سەنەدەكەی حەسەنە).**
ووتم: سەیركەن أبو حنيفة بۆتە هێما بۆ خەڵكی، وایدەبینن پێچەوانەی ئەو بكەیت لەسەر حەق و پێكاوتە.
محقق- تاريخ بغداد(٢) دەڵێ: إسحاق بن إبراهيم الحنيني زەعیفە !
نازانم چۆن قسەیەكی لەم شێوەیە دەكات بیری لەكوێ بووە كاتێک ئەمەی ووتوە ؟ ئەمە إسحاق بن إبراهيم البغوي-ە وەک لە سەنەدەكە دیارە، گەرلەقەبەكەی نەهاتبوایە تەنها ناوی نوسرابوایە ئەوكات ڕێی تێدەچوو تێكەڵی بكات، إسحاق بن إبراهيم البغوي سیقەیە.
الخطيب بە دوو سەنەد ئەم ڕیوایەتەی هێناوە هەردووكیان دەگەڕێتەوە بۆ إسحاق بن إبراهيم البغوي، لە سەنەدی یەكەم نوسراوە البغوي لە سەنەدی دووەم نەنوسراوە، ئینجا محقق یان بێ ئاگایانە تەعلیق دەنوسێ لەسەر سەنەدەكان، یان دەیەوێ خۆی هەڵخەڵەتێنێ چونكە كەس بەم كارەی هەڵناخەڵەتێ.

**عبدالحليم بن تيمية** دەڵێ: **دەربارەی ووتەکەی أحمد کە دەڵێ: (فەرمووده ڕیوایەت ناکرێ لە ئەهلی ڕەئی) ابن عقيل قسەی لەسەر ئەم ووتەیە کردووە بە درێژی، لە ڕیوایەتی عبدالله هاتووە کە أحمد دەڵێ: ئەهلی ڕەئی ڕیوایەتی فەرموودەیان لێوە ناکرێ، القاضي أبو يعلى دەڵێ: ئەم ووتەیەی أحمد مەبەستی ئەهلی ڕەئیە لە المتكلمين وەک قەدەرییەکان و هاوشێوەکانیان، منیش دەڵێم: ئەمە وانیە، بەڵکو ووتەی أحمد لەم بارەیەوە زۆرە ئەمەش ئەوەیە کە دەربارەی بیدعەچی باسم کرد جۆرێکە لە هەجرکردن، أحمد دانی بەوە ناوە هەندێک لەوانەی کە ڕیوایەتیان لێ ناکات لە ئەهلی ڕەئی سیقەن وەک أبو يوسف، هەر بۆیەش هیچ کام لە ئەهلی ڕەئی ڕیوایەتیان لێوە نەکراوە لە کتێبە گەورەکانی فەرموودە وەک الصحيحين.** [المسودة في أصول الفقه : 256]

ووتم: واتا ئەهلی ڕەئی گەر سیقەش بن لە فەرموودەدا ئیمام أحمد ڕیوایەتیان لێوە ناکات و هەجریان دەکات، ابن تيمية-ش ئیقراری کردووە لەسەر ئەم ووتەیەی باوکی.

**العقيلي** دەڵێ: حدثنا عبدالله بن أحمد ووتی: **پرسیارم لە باوکم کرد دەربارەی أسد بن عمرو، صدوق-ە ؟ باوکم ووتی: هاوەڵانی أبو حنيفة نابێت هیچیان لێوە ڕیوایەت بکرێ.**
[الضعفاء : 105/1] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

**أبو داود** دەڵێ: **باسی بابەتێکم کرد بۆ أحمد لە پیاوێکەوە کە سەیری کتێبەکانی ئەهلی ڕەئی کردووە، وە ئەو پیاوە مەستورە، أحمد ووتی: بە دەگمەن هەیە کەسێک سەیری ڕەئی بکات و دڵی بۆگەن نەبێ.** [مسائل أبي داود للإمام أحمد : 1777]

ووتم: ئەوەی سەیری کتێبەکانی ئەهلی ڕەئی بکات دڵی بۆگەنە، ئەی ئیمامی ئەهلی ڕەئی دەبێ حاڵی چۆن بێ ؟

**عبدالله** دەڵێ: بیستم باوکم دەیووت: **لە عبدالرحمن بن مهدي-ەوە ووتی: یەکێک لە نیشانەکانی چاکی عیلمی پیاو ئەوەیە کە سەیری ڕەئی أبو حنيفة بکات.** [السنة : 213]

ووتم: ڕواڵەتی ووتەکەی عبدالرحمن وادەردەکەوێ کە مەدحە بۆ أبو حنيفة، بەڵام بە چوار خاڵ

ڕوونی دەکەینەوە کە هەڵە ڕوویداوە لەم مەتنەدا ووشەیەک گۆڕاوە:
یەکەم: عبدالله ئەم بەشەی تایبەت کردووە بە قسە ووتن بە أبو حنیفة لەلایەن زانایانەوە مەحاڵە یەکەم ڕیوایەت بە مەدحی أبو حنیفة دەست پێ بکات لەکاتێدا هیچ ڕیوایەتێکی مەدح کردنی نەهێناوە.
دووەم: عبدالرحمن بن مهدي زۆر توند بووە بەرامبەر أبو حنیفة بەناوبانگە بە زەمکردنی وەک لە بڕگەی دەیەم دەیهێنین بۆیە مەحاڵە قسەیەکی ئاوا بکات.
سێیەم: عبدالله ئەم ڕیوایەتەی لە کتێبی (العلل ومعرفة الرجال) هێناوە کە ماناکەی ڕوون دەکاتەوە زەمە نەک مەدح.
چوارەم: لە کتێبی (التدوين في أخبار قزوين) ڕیوایەتێکی نزیک لەم مانەیە هاتووە کە زەمکردنی ڕەئی أبو حنیفة-یە لەلایەن عبدالرحمن.

**عبدالله** دەڵێ: باوکم ووتی: **پێم گەیشت لە عبدالرحمن بن مهدي-ەوە کە وتوویەتی: دواهەمین شت لە عیلمی پیاو ئەوەیە کە سەیری ڕەئی أبو حنیفة بکات.**
**عبدالله دەڵێ: واتا بێ توانا بێ لە عیلم ئینجا وابکات.** [العلل ومعرفة الرجال : 1568]
ووتم: هەرچەندە ڕواڵەتی سەنەدی یەکەم لەوە دەچێ کە ئیمام أحمد لە عبدالرحمن-ی نەبیستبێ هەروەک ڕیوایەتی دووەمیش پشتڕاستی دەکاتەوە، هەربۆیە پشتم بەم ڕیوایەتەی دووەم نەبەستیوە تەنها بۆ ڕوونکردنەوەی مانای ڕیوایەتی یەکەم هێناومە، هەروەک عبدالله ماناکەی ڕوونکردەوە واتا گەر هیچ توانای نەبێ عیلم وەرگرێ دواهەمین شت ئینجا سەیری ڕەئی أبو حنیفة بکات.
هەروەها لە [التدوين في أخبار قزوين : 3/2] تێیدا هاتووە: کە بندار دەڵێ: بیستم عبدالرحمن بن مهدي دەیووت: هەرکەسێک سەیری ڕەئی أبو حنیفة-ی کرد با ماڵئاوایی بکات لە عیلم.
جا لە کۆی ئەم ڕیوایەتانە و حاڵی عبدالرحمن و هەڵوێستی عبدالله بۆمان دەردەکەوێ کە ڕیوایەتەکەی کتێبی (السنة) ووشەیەک بە هەڵە کەوتووە یان گۆڕاوە بۆیە ماناکەی گۆڕاوە، عادل آل حمدان دەڵێ: لەوانەیە ووشەی (لا) کەوتبێ واتا بەم شێوەیە بێ (أن لا ينظر في رأي أبي حنيفة).

**عبدالله** دەڵێ: حدثني عبدة بن عبدالرحيم ووتی: بيستم معاذ بن خالد بن شقيق ابن عم علي بن الحسن بن شقيق دەيووت: **لە حەج گەڕامەوە گەيشتم بە ابن المبارك لە عيراق، پرسيارم لێيكرد ووتم: ئەی باوكی عبدالرحمن هەندێک پارەم لاماوەتەوە لە خەرجی حەج، چۆنی دەبينی ڕەئيەكانی أبو حنيفة بنوسمەوە ؟ ووتی: نەخێر، ووتم: بۆ ؟ ووتی: چونكە عەقڵی پياوەكە بەم شێوەيە نيە.**
[السنة : 329] **(سەنەدەكەی حەسەنە).**

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا عبدالوارث بن سفيان حدثنا قاسم بن أصبغ و وهب بن مسرة قالا حدثنا ابن وضاح حدثنا أبو جعفر هارون بن سعيد بن الهيثم الأيلي قال حدثنا عبدالله بن مسلمة القرشي ووتی: **بيستم مالك دەيووت: بەردەوام كاروباری دين ڕێک بوو تاكو أبو حنيفة دەركەوت و دەستی دايە قياس، جا نە سەرفرازبوو نە سەركەوتوو بوو.**
[جامع بيان العلم وفضله : 2102] **(سەنەدەكەی صەحيحە).**
ووتم: ابن عبدالبر كە مالكی مەزهەبە ئامادە نيە ووتەی ئيمام مالك وەربگرێ دەربارەی أبو حنيفة بۆيە بيانوو بۆ أبو حنيفة دەهێنێتەوە چونكە لە سەدەی 5 مردووە توشی هەمان دەردەكەی خەلەف بووە، بەڵام دەبينين هاوەڵە كۆنەكانی مالك ئەم ووتانە لە مالك ڕيوايەت دەكەن بەبێ بيانوو هێنانەوە بۆ أبو حنيفة.

**ابن وضاح** دەڵێ: سمعت أبا جعفر الأيلي يقول سمعت خالد بن نزار دەيووت: **بيستم مالك دەيووت: گەر أبو حنيفة بە شمشێر خروجی كردبوايە لەسەر ئەم ئوممەتە، هێشتا سوكتر بوو لەو قياس و ڕەئيەی كە دەری خست تێياندا.**
[ابن عبدالبر نەقلی كردووە - جامع بيان العلم وفضله : 2103] **(سەنەدەكەی حەسەنە).**

**عبدالله** دەڵێ: حدثني عبدالرحمن بن صالح حدثنا طلق بن غنام ووتی: **بە حفص بن غياث-م ووت لە وەڵامدانەوەی بابەتێک دواكەوتبوو (واتا پێم ووت پەلە بكە) حفص ووتی: وەڵامدانەوەی ئەم پرسيارە بە ڕەئيە نە لە قورئاندا هەيە نە لە سوننەتدا، من لە گۆشتی خۆم دەبڕم كە وەڵام**

**دەدەمەوە، بینیم أبو حنیفة لە شتێكدا 10 جۆر وەڵامى دەدایەوە پاشان پەشیمان دەبوویەوە، ئەى من پەلەم چیە ؟!** [السنة : 357] **(سەنەدەكەى حەسەنە).**

**عبدالله** دەڵێ: حدثنا هارون بن سفیان أو غیره قال حدثنا طلق بن غنام ووتى: **پرسیار كرا لە حفص بن غیاث دەربارەى بابەتێك، ئەویش دواكەوت لە وەڵامدانەوەى، منیش پێم ووت: ئەى باوكى عمر ! (واتا پەلە بكە) حفص ووتى: لێم گەڕێ من لە گۆشتى خۆم دەبڕم، بینیم أبو حنیفة پرسیارى بابەتێكى لێدەكرا ئەویش لە یەك مەجلیسدا 10 جۆر قسەى تێدا دەكرد.**

[العلل ومعرفة الرجال : 5231]

ووتم: بۆ ڕوونكردنەوەى ماناى ڕیوایەتەكەى پێشوو هێنام ئەگینا پشت بە ڕیوایەتەكانى هارون بن سفیان نابەستم چونكە جەرح و تەعدیلى بۆ نەكراوە، وە عبدالله كە دەڵێ: حدثنا هارون بن سفیان أو غیره، واتا یان كەسێكى تر، بێگومان ئەم كەسە عبدالرحمن بن صالح-ە وەك لە ڕیوایەتى پێشتر هاتووە، كەسێكى صدوق-ە.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني هارون بن سفیان حدثني أسود بن سالم ووتى: **من لەگەڵ أبو بكر بن عیاش بووم لە مزگەوتى بني أسید، پیاوێك پرسیارى لێكرد دەربارەى بابەتێك، پیاوێكیش ووتى: أبو حنیفة ئاوا و ئاوا دەڵێ، أبو بكر بن عیاش ووتى: الله ڕووى أبو حنیفة ڕەش بكات، وە ڕووى ئەو كەسەش ڕەش بكات كە ئاوا دەڵێ.** [السنة : 362]

ووتم: هارون بن سفیان باسمان كرد، سەیرەكە لەوە دایە القحطاني لە حاشیەدا دەڵێ: سەنەدەكە كەسێكى نەناسراوى تێدایە ئەویش أسود بن سالم-ە، پێشتر باسمان كرد لە ڕیوایەتى 280.

كەچى سەیرى حاشیەى ڕیوایەتى 280 دەكەیت دەبینى القحطاني دەڵێ: أسود بن سالم أبو محمد العابد، أبو الفضل الخراساني ڕیوایەتى لێوە كردووە، ناسراوە بە چاكە كردن، الطبري تەوسیقى كردووە،ساڵى 213 مردووە.

ئەمە ووتەى القحطاني بوو لە حاشیەى ڕیوایەتى 280 دا، كەچى دواتر دەڵێ نەناسراوە بگەڕێوە بۆ ئەوێ ! شتێكى سەیرە، ئەمە لەكاتێكدا البزار-یش تەوسیقى كردووە، بۆیە القحطاني تەنها بیووتبا

سەنەدەکەی زەعیفە چونکە هارون بن سفیان جەرح و تەعدیلی بۆ نەکراوە ئەوا چاکتر بوو.
منیش بۆیە هێنام چونکە هارون موتابەعە کراوە لە ڕیوایەتی دواتردا.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا ابن رزق قال أخبرنا ابن سلم قال حدثنا الأبار قال حدثنا العباس بن صالح ووتی: بیستم أسود بن سالم دەیووت: **أبو بكر بن عياش ووتی: الله ڕووی أبو حنيفة ڕەش بكات.**
[تاريخ بغداد : 564/15]

ووتم: العباس بن صالح نەمدۆزییەوە، بەڵام بۆ پاڵپشتی ڕیوایەتەکەی هارون بن سفیان هێنام، وەک ئیمام أحمد دەڵێ: گەر کەسێک ووتی قورئان مەخلوقە هەموو بەڵایەکی پێوە بلکێنە، ئەم جۆرە ووتانەش دەربارەی أبو حنيفة زۆر ئاساییە تەکفیر کراوە لەعنەتی لێکراوە ڕوو ڕەش بوون زۆر ئاسانترە پێی بووترێ، وە نابینی هیچ کتێبێک لەسەر أبو حنيفة نوسرا بێت تەنها بەهێنانی ڕیوایەتی صەحیح چونکە حاڵی ئەو لەلای سەلەف ڕوون بووە هەرچی ووتراوە دەربارەی کۆیان کردۆتەوە گەر ڕیوایەتە زەعیفەکانم هەمووی هێنابوایە دەربارەی ئەوا کتێبەکە زۆر فراوانتر دەبوو بەڵام لەبەر ئەوەی لەئێستادا کراوە بە ئیمام بۆیە ناچارین تەنها ڕیوایەتی صەحیح بهێنین.

**ابن القيم** دەڵێ: **خیلاف نیە لە ئیمام أحمد-ەوە کە پێی وایە نابێت داوای فەتوا لە ئەهلی ڕەئی بکرێت کە موخالفی سوننەتی پێغەمبەرن ﷺ.** [أعلام الموقعين : 118/6]

**عبدالله** دەڵێ: **پرسیارم لە باوکم کرد دەربارەی کەسێک کە دەیەوێ پرسیار بکات لە بابەتێکی دینیدا کە توشی بووە دەربارەی سوێند خواردن لە تەڵاق و شتی تردا، ئەو کەسە لە شارێکدایە کە ئەهلی ڕەئی و ئەهلی حەدیثی تێدایە بەڵام ئەهلی حەدیثی شارەکە فەرموودەیان زۆر لەبەر نیە و نازانن فەرموودەی زەعیف و سەنەدی بەهێز جیا بکەنەوە، جا ئەم کەسە لە کێ دەپرسێ لە ئەهلی ڕەئی یان ئەهلی حەدیث لەکاتێکدا زانستیان کەمە بە فەرموودە ؟ باکم ووتی: پرسیار لە ئەهلی حەدیث دەکات، پرسیار لە ئەهلی ڕەئی ناکات، فەرموودەی زەعیف باشترە لە ڕەئی أبو حنيفة.**
[مسائل عبدالله للإمام أحمد : 1585]

ووتم: ئەمەش مانای ئەوەیە کە لەلای سەلەف ئەهلی ڕەئی واتا أبو حنیفة و هاوەڵانی، هەربۆیەش ئیمام أحمد لە پرسیارێکی ئاوادا ناوی أبو حنیفة دەهێنێت بەبێ ئەوەی عبدالله باسی أبو حنیفة بکات، جا لەهەر شوێنێک بینیتان قسە ووترا بە ئەهلی ڕەئی پێش هەموو کەسێک أبو حنیفة دەگرێتەوە وەک پێشتر باسمان کرد.

**أبو زرعة الدمشقي** دەڵێ: حدثني أحمد بن شبويه قال حدثنا علي بن الحسن بن شقيق ووتی: **بە ابن المبارك ووترا: جەماعەت کێیە ؟ ابن المبارك ووتی: محمد بن ثابت و الحسين بن واقد و أبو حمزة السكري.**
**أبو زرعة دەڵێ: أحمد بن شبويه پێی ووتین: ئەمانە هیچ شتێکیان تێدانیە لە ئیرجاء و ڕەئی أبو حنیفة.** [تاريخ أبي زرعة الدمشقي : 173-174] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

**أبو زرعة الدمشقي** دەڵێ: **أبو نعيم ووتی: من گەورەترم لە ڕەئی أبو حنیفة.**
[تاريخ أبي زرعة الدمشقي : 1326] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**
ووتم: واتا ڕەئیەکانی أبو حنیفة نوێ و داهێنراون، من پێش ڕەئیەکانی ئەو لەدایک بوومە.

**ابن أبي يعلى** لە ژیاننامەی أحمد بن فرات بن خالد الرازي دەڵێ: **هەندێک شتی نەقل کردووە لە ئیمامەکەمان، یەکێک لەوانە: دەڵێ: أحمد ووتی: هەر کەسێک ئەهلی ڕەئی نیشانی کەسێک بکات تا فەتوای بۆ بدات، ئەوا ئەم کەسە یارمەتیداوە لەسەر ڕووخاندنی ئیسلام.**
[طبقات الحنابلة : 54/1]
ووتم: مەبەستی ئەوەیە کەسێک پرسیارێکی هەبێت، تۆش پێی بڵێ: بڕۆ لە فلان کەسی ئەهلی ڕەئی پرسیارەکەت بکە با ئەو فەتوات بۆ بدات، ووشەی (لیفتيه) لە تحقيق-ی محمد حامد الفقي بۆتە (ليفتنه) بە پشت بەستن بە تەحقیقی عبدالرحمن بن سليمان العثيمين ڕاستم کردۆتەوە.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبو الفضل حدثني **أسود بن سالم ووتی: کاتێک ئەثەر هات ڕەئی أبو حنیفة و هاوەڵانی فڕێ دەدەینە ناو پیسایی.**

**پاشان أسود پێی ووتم: دەست بە ئەثەرەوە بگرە، گەیشتووم بە ئەهلی عیلم ڕقیان لە ڕەئی أبو حنیفة دەبوویەوە و عەیبداریان دەكرد.** [السنة : 371] **(سەنەدەكەی صەحیحە).**

ووتم: القحطاني دووبارە دەڵێ: أسود بن سالم-ی تێدایە كە ژیاننامەی نازانم لە ڕیوایەتی 280 باسمان كرد !

ئێمەش وەڵاممان دایەوە دەربارەی أسود بن سالم كە سیقەیە، بگرە خۆی وەڵامی خۆی داوەتەوە.

**الفسوي** دەڵێ: سلیمان بن حرب ووتی: **قسەم لەگەڵ یحیی بن أكثم كرد، یحیی ووتی: من ئەهلی ڕەئی نیم، جا باسی أبو حنیفة-ی كرد، منیش ووتم: واز لە خیلاف بهێنە، لە سەردەمی أبو حنیفة پێشەوا زۆر بوون لە كوفە و جگە لە كوفەش، پێم بڵێ یەك كەس بە باشە باسی أبو حنیفة و ڕەئیەكەی بكات ؟! سلیمان دەڵێ: یحیی دەمێك بێدەنگ بوو.**

[المعرفة والتاريخ : 794/2] **(سەنەدەكەی صەحیحە).**

ووتم: بڕوانە سلیمان بن حرب بە یحیی بن أكثم دەڵێ: پێم بڵێ یەك پێشەوا بە باشە باسی أبو حنیفة و ڕەئیەكەی كردبێ لە سەردەمی خۆیدا ! گەر هەبوایە یحیی بن أكثم وەڵامی دەدایەوە نەك بێدەنگ بێ، ئەی كە لە سەردەمی خۆی یەك پێشەوا نەبووە بە باشە باسی بكات پێم ناڵێن چۆن لە سەردەمەكانی دواتر بۆتە ئیمام ؟!

**ابن قتيبة** دەڵێ: **كەسم نەبینی زۆر بە گەرمی خەریكی باسكردنی ئەهلی ڕەئی بێت و لە پلەیان كەم بكاتەوە و بەدوای ووتە ناشرینەكانیان بگەڕێت و ئاگاداركردنەوەیان لێبدات وەك إسحاق بن إبراهيم الحنظلي ناسراو بە (ابن راهويه) ئەو دەیووت: ئەهلی ڕەئی كتێبی الله و سوننەتەكانی پێغەمبەرەكەیان فڕێدا، دەستیان گرت بە قیاس، وە كۆمەڵێكی لەمانە دەژمارد.**

[تأويل مختلف الحديث : 105]

ووتم: إسحاق بن راهويه ئەو كەسە بوو كە لەسەر مەزهەبی أبو حنیفة بوو، پێی وابوو كەس جورئەت ناكات موخالەفەی أبو حنیفة بكات، بەڵام كاتێك بینی لە دەرەوەی ناوچەی خوراسان دونیا بە جۆرێكی ترە و ئەهلی حەدیث چەندە دژی أبو حنیفة و مەزهەبەكەی و ڕەئیەكانی و

بیدعەكانین، ئەم كەسەی لێدەرچوو كە دەبینن ابن قتیبة چۆن باسی دەكات، ئایا ئێوەش ئامادە نین دوای ئەم هەموو بەڵگەیە دەست بكەن بە داماڵینی عەورەتی كافر و بیدعەچیەكان كە سەردەمانێك بە پێشەوای خۆتان زانیون ؟ یان هەر سوورن لە پەردەپۆش كردن و بەرگری كردن لێیان ؟ سەیركە إسحاق بن راهویە تەنها بەوە نەوەستا كە بڵێ چیتر بە ئیمامی نازانم بەڵكو دەستی دایە فەزح كردنیان و ڕەددانەوەیان.

**ابن قتیبة** دەڵێ: **إسحاق بن راهویە دەڵێ: پرسیار لە أبو حنیفة كرا دەربارەی خواردنەوە لە جامی خۆشكراو بە زیو ؟ ووتی: هیچ كێشەی تێدا نیە، وەكو ئەو ئەنگوستیلە زیوە وایە كە لە پەنجەت دایە دەستت دەخەیتە ناو ئاو و پێی دەخۆیتەوە. ابن قتیبة دەڵێ: إسحاق هاوشێوەی ئەمانەی زۆر دەژمارد، كتێبەكە درێژدەبێتەوە گەر باسی بكەین، وە لەمەش گەورەتر موخالەفە كردنی كتێبی الله-یە وەك بڵێی ئەوان -واتا أبو حنیفة و هاوەڵانی- نەیان خوێند بێتەوە، أبو حنیفة دەڵێ: وەلی ئەمری ئەو كەسەی كە بە ئەنقەست كوژراوە یان دەبێ لە بكوژەكە خۆشبێت یان تۆڵەی لێ بكاتەوە بۆی نیە حەقی خوێنەكەی لێوەرگرێ، ابن قتیبة دەڵێ: الله تبارك وتعالى دەفەرمووێ:** ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِى ٱلْقَتْلَى ۖ ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ ۚ فَمَنْ عُفِىَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَىْءٌ فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَٰنٍ ۗ ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ ۗ﴾ **واتا ئەوەی خۆشبوو لە خوێنی كوژراوەكەی لەبەرامبەر وەرگرتنی حەقی خوێنەكەی ئەوا با بەچاكی و جوانیەوە داوای حەقی خوێنەكەی بكات ماندوویان نەكات، وە دەبێت داوای وەلی كوژراوەكە بە چاكی و جوانی بدرێت و دوا ناخرێ لەكاتی خۆیدا، پاشان فەرموویەتی:** ﴿ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ ۗ﴾ **ئەم حوكمە بارسووك كردن و ڕەحمەت و ئاسانیە بۆ موسڵمانان، چونكە لای بەنی ئیسرائیل وەلی كوژراوەكە بۆی هەیە یان تۆڵە بكاتەوە یان لێی خۆشبێت، پاشان فەرموویەتی:** ﴿فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ﴾ **واتا ئەوەی دەست درێژی بكات و بیكوژێت دوای وەرگرتنی حەقی خوێنەكە** ﴿فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ **سزایەكی بە ئازاری بۆ هەیە، زانایان وتوویانە واتا: دەكوژرێت و حەقی خوێنی لێ وەرناگیرێت،**

**وە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (لە هیچ کەسێک خۆش نابم کە دوای وەرگرتنی حەقی خوێنەکە بیکوژێتەوە). ابن قتیبة دەڵێ: ئەمە و هاوشێوەی ئەمە لە موخالەفە کردنی قورئان هیچ عوزری تێدا نیە، وە هیچ عوزرنیە لە موخالەفە کردنی پێغەمبەری الله ﷺ دوای زانینی فەرموودەکەی.**
[تأويل مختلف الحديث : 107-108]

ووتم: وەک ابن قتيبة ووتی موخالەفە کردنی ئایەتێکی ڕوون و ڕاشکاوی قورئان هیچ بیانووێک هەڵناگرێت، چونکە ئایەتەکە لەفزەکانی ڕوونە، وە ئایەتی تر نیە پێچەوانەی بێت تا بڵێین ئەگەری نەسخ دێتە پێشەوە، یان بڵێین فەرموودە هەیە پێغەمبەرﷺ بە پێچەوانەی ئایەتەکە حوکمی کردووە دوای دابەزینی، فەرموودەش نیە بڵێین أبو حنيفة-ی جاهیل بە فەرموودە بە زەعیفی دانا بێت بۆیە موخالەفەی کردووە، بەڵام داخەکەم ئەمڕۆ گەرلە فیقهدا بە پێچەوانەی دەقی قورئان و سوننەتی صەحیح فەتوا بدەیت هیچ بە کێشەی نازانن بە بیانووی ئەوەی باسەکە فقهیە عەقیدەیی نیە ! ئەگەرچی ئایەت و فەرموودەکان صەریحیش بن و هیچ بیانووێک هەڵنەگرن.

**الفسوي** دەڵێ: حدثنا سليمان بن حرب حدثنا **حماد بن زيد ووتی: بینیم أبو حنيفة پرسیاری لێکرا دەربارەی وتر، ووتی: فەرزە، منیش ووتم: نوێژە فەرزەکان چەندن ؟ ووتی: پێنج، ووتم: ئەی وتر؟ ووتی: فەرزە.** [المعرفة والتاريخ : 793/2] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: حماد پرسیارێکی ئابڕووبەری لێکردووە، مادام پێت وایە وتر فەرزە بۆ ناڵێی شەش نوێژ فەرزە بۆ دەڵێی پێنج نوێژ فەرزە ؟!

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا بشرى بن عبدالله الرومي قال أخبرنا أحمد بن جعفر بن حمدان قال حدثنا محمد بن جعفر الراشدي قال حدثنا أبو بكر الأثرم ووتی: **باوکی عبدالله -واتا ئیمام أحمد- چەند فەرموودەیەکی بۆ گێڕاینەوە لە بابەتی عەقیقە کە فەرموودەی تێدابوو بە سەنەدەوە لە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان و تابعين، پاشان ووتی: أبو حنيفة دەڵێ: عەقیقە کارێکی سەردەمی جاهیلیە ! جا أحمد زەردەخەنەی کرد وەک سەرسوڕمان.** [تاريخ بغداد : 568/15] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني إبراهيم بن عمر البرمكي قال حدثنا عبيدالله بن محمد بن محمد بن حمدان العكبري قال حدثنا محمد بن أيوب بن المعافى البزاز ووتی: **بیستم إبراهيم الحربي دەیووت: أبو حنيفة شتانێکی داهێنا لە عیلم کە جوینی ئاو باشترە لەم شتانە، وە ڕۆژێک هەندێک لە بابەتەکانیم نیشانی أحمد بن حنبل دا، جا أحمد سەری لێی سوڕما، پاشان ووتی: وەک بڵێی تازە هاتۆتە ناو ئیسلام. [تاريخ بغداد : 571/15] (سەنەدەکەی حەسەنە).**

ووتم: محمد بن أيوب بن المعافى البزاز ناسراوە بە أبو بکر محمد بن أيوب العكبري.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا محمد بن الحسين بن محمد المتوثي أخبرنا عثمان بن أحمد الدقاق حدثنا أحمد بن بشر المرثدي حدثنا رجاء بن السندي ووتی: **بیستم بشر بن السري ووتی: چوومە لای أبو عوانة پێم ووت: پێم گەیشتووە کە تۆ کتێبێکی أبو حنيفة-ت لەلایە، ووتی: کوڕی شیرینم بیرت خستمەوە، جا هەڵسایەوە و چووە لای سندوقەکە و کتێبەکەی دەرهێنا و پارچە پارچەی کرد و فڕێیدا، ووتم: چی وای لێکردیت ئەمە بکەی ؟ ووتی: من لەلای أبو حنيفة دانیشتبووم پیاوێک بە پەلە هاتە لای لەلایەن دەسەڵاتدارەوە ووتی: ئەمیر دەڵێ پیاوێک دار خورمایەکی بچووکی دزیوە تۆ چی دەڵێی ؟ أبو حنيفة-ش بەبێ تەتەڵە کردنی زمان ووتی: گەر نرخەکەی دە درهەم بێت دەستی ببڕن، پیاوەکەش ڕۆیشت، منیش ووتم: ئەی أبو حنيفة ئایا لە الله ناترسی ؟ حدثني يحيى بن سعيد عن محمد بن يحيى بن حبان عن رافع بن خديج دەڵێ: پێغەمبەری الله ﷺ فەرموویەتی: (لا قطع في ثمر ولا كثر) -واتا: دەست نابڕدرێ لە دزینی بەروبوومی دار وکثر- بڕۆ بەدوای پیاوەکە بکەوە ئەگینا دەستی دەبڕن، أبو حنيفة بەبێ تەتەڵە کردنی زمان ووتی: ئەمە حوکمێکە دەرچووە و تەواو بووە، أبو عوانە دەڵێ: پیاوەکە دەستی بڕدرا، جا ئەم جۆرە کەسە نابێت کتێبی لەلام بێت.**

**[تاريخ بغداد : 537/15] (سەنەدەکەی حەسەنە).**

ووتم: (كثر) بەشی سەرەوەی دار خورمایە کە لقەکانی لێ دەبێتەوە و خورماکەی لێوە دەردەچێ.

محقق-ی تاريخ بغداد(٢) دەڵێ: عثمان بن أحمد الدقاق زەعیفە، الذهبي ڕیوایەتێکی ئەوی هێناوە پاشان وتوویەتی: ئەمە ناشرینترین درۆیە، وە پێویستە تانە لە عثمان بدرێ بەهۆی ڕیوایەت کردنی

بۆ ئەم ڕیوایەتە ئابڕۆبەرانە. ئەمە ووتەکەی الذهبي بوو لە (ميزان الاعتدال) بەڵام ابن حجر لە (لسان الميزان) وەڵامی الذهبي دەداتەوە و دەڵێ: ناکرێ تانە بدرێ لە عثمان، گەر الذهبي ئەم دەرگایە بۆ خۆی بکاتەوە کە هەر ڕاوییەک فەرموودەیەکی درۆی ڕیوایەت کرد و درۆکە لە ڕاوییەکی تر بوو لەخۆی نەبوو ئەوا هیچ ڕاوییەک بە سەلامەتی دەرناچێت لەژێر دەستی تەنها کەمێک لە المتقدمين چ جای لە المتأخرين، وە من خەم دەخۆم کە دەبینم الذهبي ئەم ڕاوییەی لەم کتێبەدا هێناوە بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەک و پێشینێکی هەبێت.

ئینجا ابن حجر ناوی ئەو زانایانە دەهێنێت کە تەوسیقیان کردووە.

بەڵام ئەوەمان بیرنەچێت محقق ووتەکەی الذهبي بە قرتاوی هێناوە، الذهبي دەڵێ: عثمان ڕاستگۆیە، ئەو فەرموودە درۆیەش کە ڕیوایەتی کردووە کێشەکە لەخۆی نیە لە ڕاوییەکانی سەرووخۆیەتی، کەواتە الذهبي-ش دان بەوە دەنێت ڕاستگۆیە بەڵام بۆیە ابن حجر ڕەخنەی لێگرت چونکە الذهبي ووتی: پێویستە تانەی لێ بدرێ چۆن شتێکی ئاوا درۆ ڕیوایەت دەکات.

عمر بن شاهين دەڵێ: ثقة المأمون

ابن القطان الفاسي: ثقة صالح صدوق

الحاكم دەڵێ: ثقة المأمون

الخطيب البغدادي دەڵێ: ثقة ثبت

الدارقطني دەڵێ: لە سيقەکانە

محقق-ی تاريخ بغداد(٢) دەڵێ: أبو حاتم دەربارەی أبو عوانة دەڵێ: سيقەيە هەڵە زۆر دەکات گەر لە حفزیەوە ڕیوایەت بکات.

أبو عوانة لای هەمووان سيقەيە حافزە ئیمامە لە پلەی بەرزی تەوسیق کردن دایە بەڵام حفز دوو جۆرە حفظ الصدر و حفظ الكتابة، لەوەی دووەمیان قسەی لەسەر نیە بەڵام لەوەی یەکەمیان هەڵە دەکات واتا گەر لە حفزی خۆیەوە ڕیوایەت بکات بەبێ گەڕانەوە بۆ کتێبەکانی، بەڵام ئەمەش مانای ئەوە نیە گەر لەسەر کتێب ڕیوایەتی نەکات بە ڕەهایی زەعیفە، جا گریمان هەر بە ڕەهایی زەعیف بێت لێرەدا شتێک دەگێڕێتەوە کە لەنێوان خۆیی و أبو حنيفة ڕوویداوە فەرموودە ڕیوایەت

ناکات لە کەسەوە، بۆیە گەر زەعیفیش بێت ڕیوایەتەکە هەر قبوڵکراوە وەک لە لاپەڕە 27-32 وەڵامی ئەم گومانەمان دایەوە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني إبراهيم بن مخلد المعدل قال حدثنا القاضي أبو بكر أحمد بن كامل إملاء قال حدثنا محمد بن إسماعيل السلمي قال حدثنا عبدالله بن الزبير الحميدي ووتی: **بیستم سفيان بن عيينة دەیووت: دوو شت هەبوون گومانم وانەبوو لە کوفە زیاتر تێپەڕن، کەچی لە دونیادا بڵاو بوونەوە، قیرائەی حمزة و ڕەئی أبو حنيفة.** [تاريخ بغداد : 475/14] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: زۆرێک لە زانایان ئەم ڕیوایەتە دەهێنن وەک مەدحێک بۆ أبو حنيفة، تەنانەت الخطيب ئەم ڕیوایەتەی لە بەشی مەدحکردنی أبو حنيفة هێناوە نەک لە بەشی زەمکردنی، بەڵام من هیچ گومانم نیە کە ئەم ووتەیەی سفيان زەمە نەک مەدح، چونکە ژمارەیەک زانای سەلەف ڕقیان لە قیرائەی حمزة دەبوویەوە سفيان-یش یەکێکە لەوانەی کە پێی وایە گەر ئیمام بە قیرائەی حمزة خوێندی ئەوا دەبێت مەئموم نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە، بەڵام قیرائەی حمزة یەکێکە لە 10 قیرائە متواترەکە کە بە (القراءات العشر) ناسراون بۆیە ڕق لێبوونەوە و خۆ بە دوورگرتنی هەر ئیمامێک لەم قیرائەتە نابێتە هۆی لاوازبوونی قیرائەکە یان بڵاو نەبوونەوەی و دیار نەمانی، چونکە الله تعالی بەڵێنی داوە بە پاراستنی ئەم قورئانە، ئەم قیرائەیەش وەک قیرائەکانی تر کەلامی الله-یە لەڕێگای جبريل دایبەزاندووە بۆ پێغەمبەر محمد ﷺ هاوەڵانیشی لە دەمی ئەو بیستوویانە ئێمەش لەوانەوە بۆمان نەقل کراوە بە سەنەدی متواتر، جا هەروەک چۆن سفيان کە ئەم قیرائەیەی پێ پەسەند نەبووە پێی سەیر بووە کە چۆن ئاوا بڵاو دەبێتەوە و تەشەنە دەکات بەهەمان شێوەش ڕەئی أبو حنيفة-ی پێ پەسەند نەبووە پێی سەیر بووە کە چۆن ئاوا بڵاو بۆتەوە، هەر خودی ووتەکەشی ڕوونە کە چاوەڕێی نەکردووە ڕەئی أبو حنيفة کوفە تێپەڕێنێت چونکە بە هیچی نەزانیوە، جا ئیمامی بەڕێز گەر ڕەئی خەواریج و ڕافیزە و مورجیئە و قەدەری و جەبری و موعتەزیلی و ئەشعەری کوفە و بەصرە تێپەڕێنن بە هەموو دونیادا بڵاو ببنەوە، ئەوا هیچ سەیر نیە کە ڕەئی أبو حنيفة-ش کوفە تێپەڕێنێ لەکاتێکدا أبو يوسف قوتابی أبو حنيفة کە گەورەی قازییەکانە هەرچی حەنەفی مەزهەب

هەیە دەیکات بە قازی لە شارەکان جا چۆن ئەم مەزهەبە بڵاو نابێتەوە ؟ بۆیەش ابن حزم دەڵێ: دوو مەزهەب هەن بە زەبری دەسەڵات بڵاو بوونەتەوە حەنەفی و مالکی، حەنەفی ڕوونە جا نازانم مالکی بۆ تێخستووە ! هۆکاری بڵاو بوونەوەی مەزهەبەکەش لە ئێستادا دەوڵەتی عوسمانی بوو کە حەنەفی مەزهەب بوون ئەم مەزهەبەیان کرد بە مەزهەبی ڕەسمی دەوڵەت، هەروەک چۆن قیرائەی (حفص عن عاصم)یان کرد بە قیرائەی ڕەسمی دەوڵەت، هەر بۆیەش لە ئێستادا زۆربەی وولاتانی بەناو ئیسلامی بە قیرائەی (حفص عن عاصم) دەخوێنن.

**ابن تيمية دەڵێ: پێشەوایان فرمانیان کردووە بە هەجر کردنی بانگەوازکەران بۆ بیدعە بەشێوەیەک نە بکرێن بە حاکم نە شایەت نە پێشەوا نە موفتی نە فەرمووودەناس نە لەگەڵیان دابنیشن نە قسەیان لەگەڵ بکەن.** [جامع المسائل - المجموعة الثامنة : 74]

ووتم: أبو حنيفة-ش ئەهلی بیدعە بووە و بانگەوازی بۆ بیدعە کردووە وەک لە پێشوودا هێنامان.

**القاضي عياض دەڵێ: أبو حنيفة قیاس و ئیعتیباری خستە پێشی سونەن و ئاثار، جا وازی لە دەقی أصول هێنا و دەستی گرت بە عەقڵ، وە ڕەئی و قیاس و استحسانی پێش خست، پاشان استحسانی بە پێش قیاس خست جا دوورکەوتەوە لە حەق هەر چەند بیەوێ.**
[ترتيب المدارك : 90/1]

**ابن تيمية دەڵێ: من ئەمەم تاقی کردۆتەوە وە هەر کەسێک تەدەبور لەمەدا بکات ئەوا دەبینێت کە ئەوانەی دەست دەگرن بە دەقی شەرعیەوە هەمیشە بە تواناترن لە فەتوادان و بە سوودترن بۆ موسڵمانان لەمەدا وەک لە ئەهلی ڕەئی داهێنراو، ئەوەی ئێمە دیومانە ئەوەیە کە ئەهلی کوفە لە هەموو خەڵک زانستیان کەمترە بە فەتوادان و کەمترین سوودیان هەیە بۆ موسڵمانان، سەرەڕای زۆری ژمارەیان و ئەو دەسەڵاتەی پێیان دراوە لەلای کاربەدەستان و زۆری ئەو پارە و سامانەی دەکەوێتە دەستیان لە وەقف و لەلای کاربەدەستان و جگە لەمانەش، کەچی لە فەتوادا سوودیان لە هەموو خەڵکی کەمترە، زۆر کەمە وەڵامی فەتوا بدەنەوە گەر وەڵامیش**

**بدەنەوە زۆر کەمە وەڵامێکی دروست بدەنەوە، سەبارەت بەوەش کە بە بەڵگەی شەرعی وەڵام بدەنەوە ئەوا دوورترین کەسن لەمەدا.** [الإستقامة : 12/1]

ووتم: زۆر ڕوونە کە باسی أبو حنيفة و هاوەڵانی دەکات چونکە ئەوان ئەهلی ڕەئین و خەڵکی کوفەن قازی أبو يوسف لەلایەن هارون الرشيد کراوە بە گەورەی قازییەکانی دەوڵەتی ئیسلامی، هەر ئەمەش وایکردووە مەزهەبی حەنەفی تەشەنە بکات لە وولاتانی ئیسلامیدا، چونکە أبو يوسف زانا حەنەفی مەزهەبەکانی دەکرد بە قازی لە وولاتان و شارەکاندا.

**ابن تيمية** دەڵێ: **ئەهلی سوننە و حەدیث هەجری کەسی بانگەوازکەر بۆ بیدعە دەکەن لە کەلام یان ڕەئی یان عیبادەت، هەر بۆیە ئەهلی سوننە خۆیان پاراست لە ڕیوایەت کردن لە بانگەوازکەران بۆ بیدعە لە ئەهلی کەلام وەک عمرو بن عبيد و جگە لەویش، وە لە ئەهلی ڕەئی لە کوفە.** [جامع المسائل - المجموعة الثامنة : 76]

ووتم: ابن تيمية وەک باقی زاناکانی تر کاریگەری سەردەم وای لێکردووە ناوی أبو حنيفة نەهێنێت ئەگینا دڵنیام و هیچ گومانم نیە لەوەی کە دەڵێ (ئەهلی ڕەئی لە کوفە) مەبەستی أبو حنيفة و هاوەڵانیەتی، جا کاتێک سەلەفی صالح بە دروستی نەزانن ڕیوایەت بکەن لە ئەهلی ڕەئی و هەجریان بکەن و بە بیدعەچی و گومڕا و دژە سوننەتیان بزانن، کەسێکی وەک ابن المبارك بگریەت و پەشیمان بێتەوە لەوەی ڕیوایەتی کردووە لە أبو حنيفة و بڵێ أستغفر الله وأتوب إليه لەو ڕیوایەتانەی کە کردوومە لە أبو حنيفة، پێم ناڵێن چۆن دروستە کەسێک بچێتە سەر مەزهەبی ئەوان و بە فەتوای ئەوان دینداری بکات ؟ بۆچی سەلەف ئەوەندە دژی ئەم مەزهەبە بوونە و هەوڵی بنەبڕکردنیان داوە کەچی ئێستا وای لێهاتووە بەبێ مەزهەبی حەنەفی دینی ئیسلام بەڕێوە ناچێت و کراوەتە شان بە شانی مەزهەبەکانی تری ئەهلی سوننە وەک مالکی و شافعی حەنبەلی ؟! خۆ ڕوونە ئەوان نەک هەر لە عەقیدەدا بەڵکو لە فقهیش پێچەوانەی ئەهلی سوننە بوونە لە مامەڵە کردن لەگەڵ دەقەکان.

**الزيلعي** دەڵێ: **بوخاری زۆر بەدوای ووتەکانی أبو حنيفة دەڕوات و ڕەددی دەداتەوە بە فەرموودە، جا فەرموودەکە باس دەکات پاشان ناوی ناهێنێت، جا دەڵێ: پێغەمبەری الله ﷺ ئاوا**

**وئاوا دەڵێ، وە هەندێک لە خەڵکی ئاوا وئاوا دەڵێن. مەبەستی (لە هەندێک لە خەڵکی) أبو حنیفة-یە بۆ ناشرین کردنی ناوی ناهێنێت بەهۆی موخالەفەکردنی فەرموودەوە** ... (پاشان الزيلعي دەڵێ) **بوخاری لە سەرەتای صەحیحەکەیدا دەڵێ: (الصلاة من الإيمان) نوێژ لە ئیمانەوەیە، پاشان فەرموودەکان دەهێنێت لەم بارەیەوە، مەبەستی ڕەددانەوەی أبو حنیفة-یە کە دەڵێ: کردەوەکان لە ئیماندا نیە.** [نصب الراية : 433/1]

ووتم: ئەوەی مەبەستمە لێرەدا خودی (الزيلعي)ە کە حەنەفی مەزهەبە، کەچی دان بەوە دەنێت کە أبو حنیفة ووتویەتی کردەوە لە ئیماندا نیە، کەچی (ابن أبي العز الحنفي) کە عەقیدەی سوننیە کاریگەرە بە ابن تيمية و ابن القيم بەڵام بەهۆی زاڵبوونی مەزهەبە فقهیەکەی بەسەریدا وای نیشان دەدات لە شەرحی عەقیدەی الطحاوي کە أبو حنیفة کردەوەی لە ئیمان دەرنەهێناوە خیلافەکە تەنها لەفزییە، ئەمە لەکاتێکدا سەلەف أبو حنیفة-یان ڕیسوا کردووە بەهۆی مورجیئە بوونی و دەرهێنانی کردەوە لە ئیماندا، تۆ بڵێی ابن أبي العز لە سەلەف زیاتر ئاگاداری حاڵی أبو حنیفة بن ؟ خۆ الطحاوي زۆر نزیکترە لە أبو حنیفة وەک لە ابن أبي العز ، کەچی دان بەوە دەنێت کە لە مەزهەبەکەی ئەواندا کردەوە لە ئیمان دەردەهێنن، سەیرەکە لەوە دایە معاصرین ئەو ووتانەی الطحاوي کە موافقی ئەهلی سوننەیە هەمووی لەسەر أبو حنیفة حیساب دەکەن ئەگەرچی أبو حنیفة واش نەڵێت، بەڵام ئەو ووتانەی الطحاوي کە موخالفی ئەهلی سوننەیە لەسەر أبو حنیفة-ی حیسابی ناکەن ئەگەرچی أبو حنیفة واش بڵێت، ئەمە لەکاتێکدا الطحاوي دەڵێ ئەم عەقیدەیەم لەسەر عەقیدەی أبو حنیفة و أبو یوسف و محمد بن الحسن الشيباني نوسیوە.

**العقيلي** دەڵێ: حدثنا عبدالرحمن بن محمد بن سلم الرازي قال حدثنا عبدالرحمن بن عمر الأصبهاني رسته قال سمعت عبدالرحمن بن مهدي يقول حدثني معاذ بن معاذ ووتی: **من لەلای سوار بن عبدالله بووم، جا کوڕێکی بچووک هات ووتی: زفر لەبەر دەرگایە، سوار ووتی: زفر-ی خاوەن ڕەئی، ڕێگای مەدە بێتە ژوورەوە بیدعەچیە، هەندێک لە دانیشتووانی مەجلیسەکە پێیان ووت: کوڕی مامت لە سەفەر گەڕاوەتەوە تۆ نەچووی بۆلای ئەو هاتووە بۆلات ئیزنی بدە، جا ئیزنی دا، ئەویش**

**هاتە ژوورەوە و سەلامی کرد، نەمبینی سوار وەڵامی بداتەوە، وە بینیم زفر دەستی بۆ درێژکرد تەوقە بکات لەگەڵی، سوار دەستی نەگرت، وە نەمبینی سوار سەیری بکات تاکو زفر هەڵسا و چووە دەرەوە.** [الضعفاء : 2/429-430] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: ڕەحمەتی الله برژێ بەسەرتدا سوار ئەمە چ غیرەتێکە هەتبووە بۆ دینەکەت کە ئاوا مامەڵە بکەیت لەگەڵ کوڕی مامەکەت، ئەی سەردەمی ئێمە ببینیت چی دەڵێی کە مامۆستاکەی زفر کراوە بە ئیمامی ئەهلی سوننە ؟!

زفر قوتابیەکی هەرە نزیکی أبو حنيفة بوو، دوای مردنی أبو حنيفة زفر لەشوێنی دانیشت بۆ دەرس ووتنەوە، گەر بۆ قوتابیەکە ئاوا بن ئەی بەرامبەر مامۆستاکەی چۆن دەبن ؟!

*الذهبي* دەڵێ: **السراج خاوەنی سامانێکی زۆر و بازرگانی بوو، خێر خواز و چاکەکار بوو، خاوەن عیبادەت و شەونوێژبوو، بەڵام ڕقی لە فەقیهەکانی ئەهلی ڕەئی دەبوویەوە، الله لێی خۆش بێت.** [سير أعلام النبلاء : 397/14]

ووتم: سەیری توانەوەی دین بکە لەلای الذهبي ئەم هەڵوێستەی السراج بە شتێکی خراپ دەبینێت بۆیە دوعای لێخۆشوونی بۆ دەکات ! لەکاتێکدا زاناکانی تر ئەم ووتانە نەقل دەکەن بۆ دەرخستنی ناشرینی ئەهلی ڕەئی.

*ابن تيمية* دەڵێ: **ئەهلی ڕەئی قەواعیدیان نوسراویان نیە نە لە أصولی دین نە لە أصولی فقە هەر بۆیە شوێنکەوتووانیان هەموو ئەهلی بیدعەکانی تێدایە لە موعتەزیلە و مورجیئە و جەهمیە و موجەسیمە و خەواریج و گوێڕایەڵیکەران.**

[فضائل الأئمة الأربعة وما امتاز به كل إمام من الفضيلة : 11]

*ابن تيمية* دەڵێ: **زۆربەی ئەهلی حەدیث تانەیاندا لە أبو حنيفة و هاوەڵەکانی، تانەدانێکی بەناوبانگ کە کتێبەکانی پڕ کرد، تا کار گەیشت بەوەی هیچ شتێکیان لێ ڕیوایەت نەکەن لە کتێبەکانی فەرموودەدا، هیچ ناویان نیە لە الصحيحين و سوننەکان.**

[الرد على السبكي في مسألة تعليق الطلاق : 837]

ووتم: ڕەحمەتت لێبێ کە ئەمە دەزانی ئەی چۆن أبو حنيفة لەلات بوو بە پێشەوا ؟! دەزانی کتێبی سەلەف پڕ بووە لە تانەدان لە أبو حنيفة بەڵام لە زۆربەی کتێبەکانیش هەر بە پێشەوا وەسفی دەکەیت شان بەشانی مالك و الشافعي وأحمد و الثوري وإسحاق والليث بن سعد ناوی دەهێنی، تۆ بڵێی ئەم زانایانە زیندوو بوان ڕازی دەبوون بەوەی أبو حنيفة شان بەشانی ئەوان ناوی بهێنرێ؟ سەیرەکە لەوە دایە ووتەی سەلەف دەزانن کەچی موخالەفەی دەکەن.

**الطوفي دەڵێ: ئەهلی ڕەئی لەلای سەلەف مەبەستیان پێی خەڵکی عیراقە کە ئەوانیش خەڵکی کوفەن أبو حنيفة و شوێنکەوتووانی، ئەمانە ناونراون بە ئەهلی ڕەئی چونکە وازیان لە زۆرێک فەرموودە هێنا و دەستیان گرت بە ڕەئی و قیاس، یان بەهۆی پێنەگەیشتنی فەرموودە یان بەهۆی پێچەوانە بوونی فەرموودەکە لەگەڵ قورئان یان بەهۆی ئەوەی کە ئەو هاوەڵەی ڕیوایەتی کردووە فەقیه نیە یان هاوەڵەکە ئینکاری لێ کردووە یان فەرموودەی ئاحادە لەو بابەتانەی کە دەربار بوون لێی نیە (تعم به البلوی) یان فەرموودەکە دەربارەی حدود و کەفارەتەکانە ئەوانیش ئەصلی خۆیان هەیە لەم بابەتانەدا، جا بەهۆی ئەم قەواعیدانەی کە دایان ڕشتووە مولزەمیان دەکات بەوەی وازبهێنن بە کارکردن بە کۆمەڵێک فەرموودە، تەنانەت أحمد رحمه الله وەک الخلال باسی کردووە لە جامعەکەی نزیکەی 100 یان 500 فەرموودەی صەحیح هەیە أبو حنيفة موخالەفەی کردووە، وە هەندێکیان زیادەڕەوییان کرد لە لەکەدارکردنی هەتا هەندێکیان کتێبی نوسیوە دەربارەی خیلافی نێوان پێغەمبەر ﷺ و أبو حنيفة، وە زۆر تانەی لێدراوە لەلایەن پێشەوایانی سەلەف تەنانەت گەیشتۆتە پلەیەک کە نەفس پێی خۆش نیە باسی بکات، بەڵام الله پاراستی لە شتانەی کە ووتیان و پاکی کرد لەو شتانەی کە دابوویانە پاڵی.** [شرح مختصر الروضة : 454/2]

ووتم: الطوفي بە جوانی ئاماژەی پێدا کە ئەهلی ڕەئی لەلای سەلەف واتا أبو حنيفة و هاوەڵانی، وە الطوفي ژمارەیەک بیانووی باسکرد کە ئەهلی ڕەئی فەرموودەی صەحیحی پێ ڕەت دەکەنەوە کە ئەهلی کەلامیش هەمان ئەم بیانووانە بەکاردێنن بۆ ڕەت کردنەوەی فەرموودەی صەحیح کاتێک

پێچەوانەی عەقیدەیان بێت، بەڵام جگە لەو هۆكارانەی باسیكرد دەبینین أبو حنيفة چەندەها جار فەرموودەی صەحیحی پێ ووتراوە زۆربەیێ ئەدەبی ڕەتی كردۆتەوە ئەمەش لەلایەن زانایانی سەلەفە باسكراوە وەكو پێشتر بە سەنەد هێنامان، جا گەر ئەمانە بیانوو بن بۆی ئەوا سەلەفی صالح لە ئێمە زاناتر و بەزەیی ترن تاكو ئەم بیانووانەی لێ قبوڵ بكەن، كە لێیان قبوڵ نەكردووە دیارە جێگای قبوڵ نیە ئەمە سەرەڕای بێ ڕێزی ئاشكرای أبو حنيفة بەرامبەر فەرموودەكان و پێغەمبەر ﷺ بەڵام الطوفي بۆ بەرگری كردن لە ئیمامی ئەهلی ڕەئی دەستی برد بۆ ڕەخنە گرتن لە سەلەف و تۆمەتی خستە پاڵیان وەك بڵێی زوڵمیان لە أبو حنيفة كردبێ لەپێشی هەمووشیان ئیمام أحمد، بێ ئاگایە لەوەی كە ئەم ووتانەی ئەو پێش ئەوەی بەرگری بێت لە أبو حنيفة تانەدانە لە دانە بەدانەی زانایانی سەلەف ئەوانەی كە قسەیان بە أبو حنيفة ووتوە، الطوفي ئەگەرچی حەنبەلیە بەڵام كافرێكی ڕافیزەی عەقیدە زۆر پیس و بۆگەنە، منیش كردوومەتە مەرج كە هەر زانایەك بە ناحەق بەرگری لە أبو حنيفة بكات لەم كتێبەدا كوفر و بیدعە و هەڵەكانی باس بكەم تا خەڵكی پێی هەڵنەخەڵەتێن و پلەكەی بزانن و لە ئاستی خۆی زیاتر بەرزی نەكەنەوە، بۆیە دەمەوێ لێرەدا بەشێكی كورت لە عەقیدەی الطوفي بخەمە ڕوو كە (ابن رجب الحنبلي) لە كتێبی (ذيل طبقات الحنابلة) باسیكردووە.

ابن رجب دەڵێ: لە ووتەكانیدا تێكەڵی و هەڵەی زۆر هەیە، قەسیدەی هەیە لە مەدحكردنی ئیمام أحمد بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شیعەیە لە سوننە لایداوە لە عەقیدەدا، تەنانەت دەربارەی خۆی دەڵێ: حنبلي رافضي أشعري *** ظاهري هذه إحدى العبر

وە دەربارەی ڕەفز چەند قەسیدەیەكی دۆزراوەتەوە، وە زۆربەی بەرهەمەكانی ئەمەی تێدا دەدرەوشێتەوە، تەنانەت كتێبی نوسیوە ناوی ناوە (العذاب الواصب على أرواح النواصب) وە یەكێك لە فێڵە شاراوە پیسەكانی لە شەرحی الأربعين النووي دەڵێ: هۆكاری خیلافی نێوان زانایان بەهۆی دژ بەیەك بوونی ڕیوایەتەكان و ئایەتەكانە، وە هەندێك لە خەڵكی هۆكاری ئەمە بۆ عمر بن الخطاب دەگێڕنەوە كە ڕێگای نەداوە هاوەڵان فەرموودە بنوسنەوە... سەیری ئەم ووتە پیسە بكە كە ئەوە لەخۆ دەگرێت ئەمیری ئیمانداران عمر رضي الله عنه ئوممەتی گومڕا كردووە بە ئەنقەست،

لەمەشدا درۆی کرد و سنوری بەزاند... الطوفي لە مەدینەدا نیشتەجێ بوو ماوەیەک هاوڕێیەتی السکاکیني ڕافیزە و موعتەزیلەی دەکرد، کۆ دەبوونەوە لەسەر گومڕاییەکانیان، الله هەتکی کرد و بەخێرایی تۆڵەی لێ سەندەوە لە مصر، لەوێدا بە ڕەفز ناسراو بوو هەروەها قسە ووتن بە أبو بکر و عائیشەی کچی ﵄ وە جگە لەوانیش لە هاوەڵانی تر ﵃ وە لەم بابەتەدا چەند شیعرێکی بە دەرکەوت بە دەست و خەتی خۆی، ئەوانەی هاوڕێیەتیان دەکرد و هاوڕای بوون لێیەوە نەقلیان کردووە، یەکێک لە قەسیدەکانی دەڵێ:

کم بین من شك في خلافته *** وبین من قیل أنه الله

واتا جیاوازی چەندە زۆرە لەنێوان ئەو کەسەی کە گومان هەبوو لە خیلافەتەکەی، لەگەڵ ئەو کەسەی کە دەربارەی ووترا اللە-یە ! (مەبەستی لە کەسی یەکەم أبو بکر الصدیق-ە ﵁ وە مەبەستی لە کەسی دووەم علي بن أبي طالب-ە ﵁ )

جا شکایەتی لێکرا لای قازی حەنبەلیەکان و بەڵگەی لەسەر چەسپا، جا لێیدرا و تەمبێ کرا و حاڵیشی باسکرا بۆ خەڵکی و بەناو خەڵکیدا گێڕایان هاواریان دەکرد کە ئەم کارەی کردووە، وە هەموو ئەو قوتابخانانەی لەبەردەستی دابوو لێی سەندرایەوە و چەند ڕۆژێک بەند کرا پاشان ئازاد کرا... هەندێک لە شێخەکانمان لە کەسێکی ترەوە گێڕایانەوە دەربارەی کە تەوبەی دەرخستووە کاتێک بەند کراوە، ئەمەش توقیە و نیفاقەکەیەتی چونکە ئەو لە کۆتایی تەمەنیدا لەگەڵ السکاکیني کۆ دەبوویەوە شێخی ڕافیزە و هاوڕێیەتی دەکرد، وە لە ڕەفزدا نەزمێکی نوسیوە کە جنێودان لە أبو بکر لەخۆ دەگرێت...هتد. (پوختەی قسەکانی ابن رجب-م نەقل کرد).

بڕوانە [ذیل طبقات الحنابلة : 4/404-415]

جا ئایا کامەیان لەپێشترن لە بەرگری کردن هاوەڵان یان أبو حنیفة ؟ وە ئایا کامەتان شایستەی قسە لەسەرکردنن تۆ ئەی الطوفي کە قسەی ناشرین بە هاوەڵان دەڵێی یان سەلەف کە قسەی ناشرین بە أبو حنیفة دەڵێن ؟!

**الخطیب** دەڵێ: أخبرنا البرقاني قال قرأت على أبي حفص بن الزیات حدثکم عمر بن محمد الکاغدي

قال حدثنا أبو السائب ووتی: **بیستم وكیع دەیووت: بینیمان أبو حنیفة موخالەفەی دوو سەد فەرموودەی كرد. [تاریخ بغداد : 536/15] (سەنەدەكەی صەحیحە).**

**عبدالله** دەڵێ: حدثني محمد بن هارون حدثنا أبو صالح ووتی: **بیستم یوسف بن أسباط دەیووت: أبو حنیفة 400 ئەثەری پێغەمبەر ﷺ ڕەت كردەوە. [السنة : 378] (سەنەدەكەی حەسەنە).**

**ابن أبي شيبة : لە كتێبە ناودارەكەیدا (المصنف) بەشێكی تایبەت كردووە بەناوی (كتاب الرد على أبي حنيفة) 125 بابەتی فقهی دەهێنێ كە تێیدا أبو حنیفة موخالەفەی 486 فەرموودە و ئەثەری كردووە.** بڕوانە [المصنف : 20/53-217]

**ابن الجوزي** دەڵێ: **ئەو باسانەی كە أبو حنیفة تێیدا موخالەفەی فەرموودەی كردووە زۆرە، بەڵام دیارترینیان فەرموودە صەحیحەكانن:**

**١. میزی كوڕی شیرە خۆرە كە دەستی بەخواردن نەكردبێ، گەر كەوتە سەر جل و بەرگ تەنها ئاو ڕشێن دەكرێ، أبو حنیفة دەڵێ: دەبێت جلەكە بشۆردرێت، فەرموودەكەش لە (الصحیحین) هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ تەنها ئاوی بەسەردا ڕشتووە.**

**٢. جائیز نیە عەرەق بكرێتە خەل، گەر بكرێتە خەل پاك نابێتەوە، أبو حنیفة دەڵێ: جائیزە و پاكیش دەبێتەوە، لە (صحیح مسلم) هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی عەرەقەكە بڕێژن و ڕێگای نەداوە بیكەن بە خەل كاتێك لێیان پرسیوە.**

**٣. دروستە پێش بەیانی بانگ بدرێت (واتا بانگی یەكەم) أبو حنیفة دەڵێ: جائیز نیە. لە (الصحیحین) هاتووە كە بلال بانگی یەكەمی داوە، وە ابن أم مكتوم بانگی دووەمی داوە هەردووكیشیان بە فرمانی پێغەمبەر ﷺ.**

**٤. گەر كەسێك نەیتوانی ركوع و سوجدە ببات، وەستانی ناو نوێژی لەسەر لاناچێ، أبو حنیفة دەڵێ: وەستانیشی لەسەر لادەچێ. لە (صحیح البخاري) هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە وەستاوی نوێژ بكە گەر نەتتوانی بە دانیشتنەوە گەر نەتتوانی بە پاڵكەوتنەوە.**

٥. سوننەتە دەست بەرز کەیتەوە لەکاتی چوون بۆ رکوع و هەڵسانەوە لە رکوع، أبو حنیفة دەڵێ: سوننەت نیە، لە (الصحیحین) هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ کە چۆتە ناو نوێژ دەستی بەرز کردۆتەوە لەکاتی چوون بۆ رکوع دەستی بەرز کردۆتەوە لەکاتی هەڵسانەوە لە رکوع دەستی بەرز کردۆتەوە و لەنێوان دوو سوجدەکەدا دەستی بەرز نەکردۆتەوە. ئەم فەرموودەیە نزیکەی 20 هاوەڵ ڕیوایەتیان کردووە.

٦. گەر خۆرهەڵات کەسێکیش لەناو نوێژی بەیانیدا بوو ئەوا نوێژەکەی تەواو دەکات، أبو حنیفة دەڵێ: نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، لە (الصحیحین) هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی گەیشت بە رکعەتێکی نوێژی بەیانی پێش هەڵاتنی خۆر ئەوا بە نوێژی بەیانی گەیشتووە.

٧. جائیزە بەیەک رکعەت نوێژی وتر بکەیت، أبو حنیفة دەڵێ: تەنها بە سێ رکعەت جائیزە، لە (الصحیحین) هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ بەیەک رکعەت نوێژی وتری کردووە.

٨. سوننەتە نوێژە بارانە ئەنجام بدەیت، أبو حنیفة دەڵێ: سوننەت نیە، لە پێغەمبەر ﷺ بە صەحیحی هاتووە کە ئەنجامی داوە.

٩. دروستە جلەکانت هەڵگێڕیتەوە لەکاتی نوێژە بارانە و پێش نوێژەکەش، أبو حنیفة دەڵێ: سوننەت نیە، لە پێغەمبەر ﷺ بە صەحیحی هاتووە کە ئەنجامی داوە.

١٠. موستەحەببە لەکاتی شۆردنی مردوو بەشێک لە کافور بەکاربهێنرێ لە شۆردنی کۆتاییدا، أبو حنیفة دەڵێ: موستەحەب نیە، لە (الصحیحین) هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ بەو ژنانەی فەرموو کە کچەکەیان دەشۆرد: (لە شۆردنی کۆتاییدا کافور بەکاربهێنن).

١١. سوننەتە دەست بدات لە ڕوکنی یەمانی لەکاتی طەوافدا، أبو حنیفة دەڵێ: سوننەت نیە، لە (صحیح مسلم) هاتووە کە ابن عمر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستی لەهیچ نەدەدا تەنها بەردە ڕەشەکە و ڕوکنی یەمانی نەبێت.

١٢. دەستنیشان کردن و شتێک لە مل کردنی ئاژەڵی قوربانی (حوشتر و مانگا) أبو حنیفة دەڵێ: مەکروهە جۆرێکە لە هەتک کردنی گیانی ئاژەڵەکە، بە صەحیحی لە پێغەمبەر ﷺ هاتووە کە

ئاژەڵەكەی بۆ قورباني بریندارکردووە وەک نیشان کردنی کە ئەم ئاژەڵە بۆ قوربانیە، وە شتێکی لە ملی ئاژەڵەکە هەڵواسیوە.

١٣. فرۆشتنی خورمایەک کە بە دارەوەیە (رطب) بە خورمایەكی تر كە لەسەر زەوییە (بيع العرايا) أبو حنيفة دەڵێ: جائیز نیە. لە (الصحيحين) هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ ڕێگای پێداوە.

١٤. گەر ئاژەڵێکی کڕی بە گوان پڕی وایزانی هەمیشە ئاوایە بەڵام خاوەنەکەی چەند ڕۆژێک نەیدۆشیوە تا لەکاتی فرۆشتن ئاوا دەرکەوێ، جا کڕیار دوای کڕینی کە زانی ئاژەڵەکە ئاوا نیە و فێڵی لێکراوە بۆی هەیە ئاژەڵەکە بگەڕێنێتەوە، أبو حنيفة دەڵێ: بۆی نیە وابکات. لە (الصحيحين) هاتووە کە بۆی هەیە بیگەڕێنێتەوە گەر نەیویست، بەڵام لەگەڵ صاعێک خورما دەیگەڕێنێتەوە.

١٥. جائیز نیە سەگ بفرۆشی ئەگەرچی سەگەکە ڕاهێنراو بێت، أبو حنيفة دەڵێ: جائیزە، لە (الصحيحين) هاتووە کە پێغەمبەرﷺ نەهی کردووە لە نرخی سەگ.

١٦. گەر موسڵمانێک عەرەقی ئەهلی کیتاب بڕێژێت یان بەرازەکەی بکوژێت هیچی لەسەر نیە، أبو حنيفة دەڵێ: لەسەریەتی حەقەکەی بدات، بە صەحیحی لە پێغەمبەرﷺ هاتووە فەرموویەتی: الله عەرەق و نرخەکەشی حەڕام کردووە.

١٧. موسڵمان گەر کافری کوشت ناکوژرێتەوە، أبو حنيفة دەڵێ: گەر ئەهلی کیتاب بکوژێ دەکوژرێتەوە، لە (صحيح البخاري) هاتووە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: موسڵمان لەبڕی کافر ناکوژرێ.

١٨. واجبە لەکاتی تۆڵەدا بەهەمان شێوە بکوژ بکوژرێتەوە، أبو حنيفة دەڵێ: واجب نیە تەنها لەو شتانەی کە حەددی لەسەرە، لە (الصحيحين) هاتووە یەهودییەک سەری ژنێکی خستۆتە نێوان دوو بەردەوە و کوشتوویەتی، پێغەمبەرﷺ بەهەمان شێوە یەهودییەکەی کوشتۆتەوە.

١٩. گەر کەسێک لە ئافرەتێکی دوو گیان بدات و ببێتە هۆی لەبارچوونی منداڵەکەی ئەوا دەبێت کۆیلەیەکی کوڕ یان کچ بێ عەیب بدات پێیان، أبو حنيفة دەڵێ: کۆرپەلە هیچی لەسەر نیە، لە (الصحيحين) هاتووە کە پێغەمبەرﷺ بەم شێوەیە حوکمی کردووە کاتێک کۆرپەلە لەبارچووە.

٢٠. موسڵمان مەرج نیە بۆ ڕەجم کردنی ژن و پیاوی زیناکەر، أبو حنیفة دەڵێ: مەرجە، بە صەحیحی هاتووە لە پێغەمبەرﷺ کە ژن و پیاوێکی یەهودی ڕەجم کردووە کە زینایان کردووە.

٢١. ئەو بڕەی دەستی دزی لەسەر دەبڕدرێ چارەگە دینارێکە یان سێ درهەم، أبو حنیفة دەڵێ: یەک دینار یان دە درهەم، لە (الصحیحین) هاتووە کە پێغەمبەرﷺ لە چارەگە دینار و بەسەرەوە دەستی دزی دەبڕی.

٢٢. گەر کەسێک سەیری خێزانت بکات لە ماڵەوە بۆت هەیە شتێک لەچاوی بگریت چاویشی دەرهات هیچت لەسەر نیە، أبو حنیفة دەڵێ: لەسەریەتی، لە (الصحیحین) هاتووە کە پیاوێک سەیری ژوورێک لە ژوورەکانی پێغەمبەری دەکرد ﷺ پێغەمبەریش شانەیەکی لە دەست بوو سەری پێ دەخوراند، جا فەرمووی: گەربمزانیبوایە سەیرم دەکەیت ئەوا شتێکم لە چاوت دەدا. هەر لە (الصحیحین) هاتووە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێک سەیری ماڵی کەسێکی کرد بەبێ ئیزن ئەوا بۆی حەلالە چاوی دەربهێنێت.

٢٣. ئیمامی موسڵمانان سەرپشکە لەوەی ئەسیرەکان بکوژێ یان بیانکات بە کۆیلە یان بە مننەت ئازادیان بکات یان فیدیە وەرگرێت لە بەرامبەر ئازاد کردنیان، أبو حنیفة دەڵێ: بە مننەت ئازاد کردنیان و فیدیە وەرگرتن جائیز نیە، بە صەحیحی هاتووە لە پێغەمبەرﷺ کە بە مننەت ثمامة بن أثال-ی ئازادکردووە، وە فیدیەی وەرگرتووە بەرامبەر ئازادکردنی ئەسیرەکانی جەنگی بەدر.

٢٤. ئەو خەڵاتەی دەدرێت بە کۆکەرەوەی زەکات وەک باقی ماڵەکانی تر وایە دەبێتە (الفیء) و نابێتە مولکی کەسەکە، أبو حنیفة دەڵێ: دەبێتە مولکی کەسەکە، لە (الصحیحین) هاتووە کە کابرای زەکات کۆکەرەوە ووتی ئەمەیان بەدیاری بە من داوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەوە چیە کۆکەرەوەی زەکات دەنێرین و دەڵێ ئەمە بۆ ئێوە ئەمەش بە من دراوە بە خەڵات ؟! ئایا گەر لەماڵی باوک و دایکی دانیشتبوایە چاوەڕێی دەکرد شتی پێ ببەخشن بە دیاری یان نا ؟! سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە هیچ کام لە ئێوە شتێک بە ناحەق نابات ئیللا ڕۆژی قیامەت بەسەر شانیەوە دەیهێنێت.

٢٥. جائیز نیە ئاژەڵ سەر ببڕدرێت بە ددان و نینۆک، أبو حنیفة دەڵێ: جائیزە گەر ددانەکە یان

نینۆکەکە جیا کرابێتەوە لە لاشەکە، لە (الصحيحين) هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ ڕێگای داوە بە هەموو شتێک سەری ئاژەڵ ببڕن جگە بە ددان و نینۆک نەبێت.

٢٦. خواردنی گۆشتی بزن مژە حەلالە، أبو حنيفة دەڵێ: حەلال نیە، بە صەحیحی لە پێغەمبەر ﷺ هاتووە کە نەیخواردووە چونکە حەزی بۆ نەچووە وبەلایەوە قێزەون بووە بەڵام ڕێگای داوە بخورێ و حەڕامی نەکردووە.

٢٧. خواردنی گۆشتی ئەسپ حەلالە، أبو حنيفة دەڵێ: حەلال نیە، لە (الصحيحين) هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ نەهی کردوە لە خواردنی گۆشتی کەر، وە ڕێگای داوە بە خواردنی گۆشتی ئەسپ و کەری کێوی.

٢٨. عەرەق حەڕامە، أبو حنيفة دەڵێ: ئەوەی سەرخۆشت دەکات حەڕامە، بە صەحیحی لە پێغەمبەر ﷺ هاتووە کە فەرموویەتی: هەموو سەر خۆشکەرێک حەرامە. وە لە فەرموویەکی تردا فەرموویەتی: ئەوەی بە خواردنەوەی بڕێکی زۆر پێی سەر خۆش بیت ئەوا خواردنەوەی بە قەدەر مشتێکیش حەرامە.

٢٩. حاکم گەرحوکمی داونەیپێکا شتەکە حەلال ناکات بۆ لایەنی براوە، أبو حنيفة دەڵێ: حەلالی دەکات لە بابەتی گرێبەست و هەڵوەشاندنەوە، لە (الصحيحين) هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: من مرۆڤم وەک ئێوە، حوکم دێت بۆلام هەندێکتان لە هەندێکتان زمان پاراوترن منیش وادەزانم ئەو ڕاست دەکات، جا حوکمەکە بۆ بەرژەوەندی ئەو دەدەم، جا هەر کەسێک حەقی موسڵمانێکی پێ بدەم ئەوا پارچەیەک لە ئاگرم پێی داوە، جا گەر دەیەوێت با بیبات یان وازی لێ بهێنێت.

٣٠. جائیزە حوکم بدرێ بە شایەتیدانی شایەت (الشاهد) و سوێند خواردنی کەسی بانگەشەکەر (المدعي) لە بابەتی سامان و ئەو شتانەی مەبەست پێی سامانە، أبو حنيفة دەڵێ: جائیز نیە، جابر بن عبدالله ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەر ﷺ حوکمی داوە بە سوێند خواردنی بانگەشەکەر و شایەتیدانی شایەت، وە عمر وعلي بن أبي طالب و ابن عباس و ابن عمر و ابن عمرو وزيد بن ثابت و أبو حزم و أنس وبلال بن الحارث و المغيرة بن شعبة و سلمة بن قيس و هاوەڵانی تریش ڕیوایەتیان

**کردووە. ئەمە تەنها بابەتە ناسراوەکان بوو ئەوانەی کە باسم نەکردووە دوو هێندە دەبن، لەبەر ئەوەی أبو حنيفة موخالەفەی هاوشێوەی ئەم فەرموودە صەحیحانەی کردووە ئەوانیش زمانیان واڵا کرد لە قسە ووتن پێی، هیچ ئیمامێکی موعتەبەر نەمایەوە ئیللا قسەی پێ ووت، جا سەیرەکە لە أبو حنيفة دایە کاتێک فەرموودەیەک ببینێت هیچ ئەصلی نەبێت واز لە قیاس دەهێنێت و بەرەو فەرموودەکە دەچێت، وەک فەرموودەی شکانی دەست نوێژ بە پێکەنین، ئەمە فەرموودەیەکە جێگیر نابێت بە صەحیحی کەچی وازی لە قیاس هێنا لەبەر ئەم فەرموودەیە.** **[المنتظم: 8/138-143]**

ووتم: کەسێک ئاوا بێت لە دوو حاڵەت دەرناچێ، یان بە ئەنقەست موخالەفەی فەرموودە دەکات، وە یان زۆر جاهیلە بە فەرموودە شایستەی ئەوە نیە ببێتە سەر مەزهەب و فەتوای لێوەر بگیرێت.

ابن أبي حاتم لە کتێبی [آداب الشافعي ومناقبه : 132] بە سەنەدەوە لە الشافعي ڕیوایەت دەکات کە مونازەرەی لەگەڵ بشر المريسي کردووە دەربارەی تیرو پشک (قورعە) بشر وتوویەتی: تیرو پشک قومارە، الشافعي دەڵێ ئەمەم بۆ أبو البختري گێڕایەوە کە قازی بوو، ووتی: شایەتێکی ترم بۆ بهێنە تا لە ملی بدەم. ئەمە تەنها لەبەر ئەوەی کە دەڵێ تیرو پشک قومارە، ئەی گەر دیبوای أبو حنيفة لە زیاتر لە 100 بابەتدا موخالەفەی فەرموودە دەکات لەچوار چێوەشیاندا ووتنی تیرو پشک قومارە، دەبوایە چی بڵێت ؟ ئەم ووتەیەی ابن الجوزي لەیادتان بێ کە ووتی: هیچ ئیمامێکی موعتەبەر نەمایەوە ئیللا قسەی پێ ووت !

**عبد الله** دەڵێ: حدثني إبراهيم حدثنا أبو سلمة عن أبي عوانة ووتی: **پرسیار کرا لە أبو حنيفة دەربارەی خواردنەوەکان، پرسیاری هەر شتێکی لێکرابوایە دەیووت حەلالە، وە پرسیاری لێکرا دەربارەی سەرخۆشکەر، ووتی: حەلالە.** **[السنة : 303]** **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: لەوانەیە مەبەستی لەوە بێت بڕێکی کەم کە سەرخۆشت ناکات، ئەم ووتەیەش لەلای کوفییەکان بەگشتی و حەنەفیەکان بە تایبەتی باوە دەربارەی (نبیذ)، أبو حنيفة و أبو يوسف بە جائیزی دەزانن، محمد بن الحسن بە حەڕامی دەزانێ، ئەمەش پێچەوانەی فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ کە فەرموویەتی: ئەوەی بە زۆر خواردنەوەی سەرخۆشت بکات کەم خواردنەوەشی حەڕامە.

**النووي** لە بابەتی تێکەڵ کردنی دوو جۆر میوە بۆ ئامادەکردنی (نبیذ) کە نەهی لێکراوە لە ژمارەیەک فەرموودەی صەحیح دەڵێ: **أبو حنيفة و أبو يوسف لە ڕیوایەتێک لێیەوە دەڵێن: کەڕاهیەتی نیە و هیچ کێشەی تێدا نیە، چونکە ئەوەی بە تەنها حەلال بێ بە تێکەڵیش حەلالە، وە جمهور سەرزەنشتیان کرد لەم فەتوایەی دا، وە ووتیان ئەمە دژایەتی کردنی خاوەنی شەرعە، فەرموودەی صەحیح و صەریح چەسپاوە لە نەهیکردن لێی، گەر حەڕامیش نەبێ ئەوا مەکڕوهە.**
[شرح صحيح مسلم : 132/7]

ووتم: (نبیذ) نَبَذَ واتا فڕێیدا، خورما یان میوەی تر فڕێ دەدرێتە ناو ئاو ئینجا تا سێ شەو دەخورێتەوە دوای ئەمە ناخورێتەوە چونکە مەترسی هەیە ببێت بە عەرەق و سەرخۆشت دەکات، پێغەمبەر ﷺ وەک لە صحیح مسلم هاتووە نبیذ-ی خواردۆتەوە بەڵام کە دەگەیشت بە شەوی سێیەم یان دەیدا بە خزمەتکارەکە یان دەیڕشت لە ترسی بوون بە عەرەق، جا ئەم کارە دروستە بەم شێوەیە بەڵام بەو مەرجەی بە یەک جۆر میوە ئامادە بکرێ نەک دوو جۆر تێکەڵ بکرێ، وە نەبێت بە عەرەق چونکە دوای ماوەیەک لە نبیذ-ەوە دەبێت بە خمر، بەڵام لەلای أبو حنيفة تیکەڵ کردنی دوو جۆر میوە جائیزە بۆ دروستکردنی نبیذ کە ئەمەش پێچەوانەی فەرموودەیە، وە دوای بوونی گۆڕانی نبیذ و پەیداکردنی سیفەتی سەرخۆشکردن لەلای أبو حنيفة هەر جائیزە بەڵام بەو مەرجەی کەمی لێ بخۆیتەوە نەگاتە حاڵەتی سەرخۆشکردن، ئەمەش پێچەوانەی فەرموودەیە هەر خواردنەوەیەک سیفەتی سەرخۆشکردنی هەبێت ئەوا خواردنەوەی قومێکیشی حەڕامە مادام بە زۆر خواردنەوەی سەرخۆش دەبیت، جا خواردنەوەی بڕێکی کەمی نبیذ دوای پەیداکردنی سیفەتی سەرخۆشکردن بە شێوەیەک کە سەرخۆشت نەکات ئەمە فەتوای زۆربەی زانا کوفییەکانە نەک تەنها أبو حنيفة، بەڵام لە تێکەڵ کردنی دوو جۆر میوە بۆ ئامادەکردنی نبیذ ئەمە تەنها فەتوای أبو حنيفة-یە.

**ابن عبدالبر** لەسەر هەمان بابەت دەڵێ: **أبو حنيفة ئەم فەرموودانەی ڕەت کردەوە بە ڕەئی خۆی، وە ووتی: خواردنەوەی دوو جۆری تێکەڵ کراو هیچی تێدا نیە.** [الاستذكار : 292/24]

**ابن العربي** دەربارەی الاستحسان دەڵێ: **الشافعي و هاوەڵانی ئینکاریان لێی کردووە، وە أبو حنیفة-یان تەکفیرکرد بەهۆی ئەمەوە جارێکیان، وە جارێکیان تەبدیعیان کرد.**
[المحصول في أصول الفقه : 131]

**الخطيب** دەڵێ: أنبأنا القاضي أبو بكر أحمد بن الحسن الحرشي أخبرنا أبو محمد حاجب بن أحمد الطوسي حدثنا عبدالرحيم بن منيب قال عفان ووتی: **بیستم أبو عوانه دەیووت: من دەچوومە لای أبو حنیفة تاکو شارەزا بووم لە ووتەکانی، پاشان چووم بۆ حەج، کاتێک گەڕامەوە چوومە مەجلیسەکەی، هاوەڵانی پرسیاریان لێم دەکرد دەربارەی شتانێک منیش بەشێوەیەک وەڵام دەدایەوە کە ئەوان موخالفی من بوون، منیش ووتم: ئەو شتانەی ووتم لە أبو حنیفة-م بیستووە، دواتر پرسیارم لێی دەکرد دەربارەی، زانیم کە لە ووتەکانی پاشگەز بۆتەوە، ووتی: بینیم ئەم ووتەیە چاکترە لەوەی پێشوو، منیش ووتم: هەر دینێک ڕاگواستنی تێدا بێت ئەوا پێویستیم پێی نیە، جلەکانم هەڵتەکاند و هیچی تر نەگەڕامەوە بۆلای.** [تاريخ بغداد : 553/15]
ووتم: محقق-ی تاريخ بغداد(١) وەک الكوثري ئەم ڕیوایەتەی بە زەعیف داناوە بەهۆی حاجب بن أحمد الطوسي گوایە الحاكم قسەی لەسەرکردووە، ئەمەش وانیە چونکە حاجب تەوسیق کراوە، ووتەکەی الحاكم-یش مانای تەزعیف کردن نادات هەروەک المعلمي لە [التنكيل : 366/1-367] وەڵامی ئەم بیانووەی الكوثري داوەتەوە، جگە لەوەش الخليلي بە سیقەی داناوە، هەروەها الكوثري دەڵێ: عبدالرحيم وتوویەتی (قال عفان) ئەمەش پچڕانە لە سەنەد، المعلمي ئەوەشی وەڵام داوەتەوە کە عبدالرحيم سیقەیە و مدلس نیە.

**الخليلي** دەڵێ: أخبرني إسماعيل بن حاجب في كتابه إلي وحدثني عنه جعفر بن محمد الأندلسي الحافظ حدثنا مهيب بن سليم ووتی: **بیستم محمد بن إسماعيل البخاري دەیووت: حدثنا محمد بن مقاتل، بە البخاري ووترا: محمد بن مقاتل الرازي ؟ البخاري ووتی: گەر لە ئاسمان بکەومە خوار بۆ سەر زەوی خۆشترە لەلام لەوەی ڕیوایەت بکەم لە محمد بن مقاتل الرازي.**
[الإرشاد : 905] (سەنەدەکەی صەحیحە).

ووتم: (مهيب) بۆتە (صهيب) لەم چاپەدا ئەمەش هەڵەيە، ناوی تەواوی (مهيب بن سليم بن مجاهد)ە.

ئەو محمد بن مقاتل-ە كە البخاري ڕیوایەتی لێكردووە المروزي-ە، ئەوی تریان محمد بن مقاتل الرازي-ە پێشەوای ئەهلی ڕەئی بوو بۆیە البخاري بەم شێوەیە باسی دەكات، أبو زرعة الرازي دەڵێ: دوای لاواز بوونی مەزهەبی أبو حنيفة لە عیراق محمد بن مقاتل هەوڵی بەهێزكردنی مەزهەبی أبو حنيفة-ی دەدا لە شاری الري.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني البرقاني قال حدثني محمد بن أحمد الأدمي قال حدثنا محمد بن علي الإيادي قال حدثنا زكريا بن يحيى الساجي قال حدثني محمد بن روح ووتی: **بیستم أحمد بن حنبل دەیووت: گەر كەسێك ببێتە قازی پاشان حوكم بكات بە ڕەئی أبو حنيفة، پاشان پرسیارم لێ بكرێ دەربارەی، ئەوا پێم وایە كە حوكمەكانی ڕەت بكرێنەوە. [تاريخ بغداد : 569/15] (سەنەدەكەی حەسەنە).**

ووتم: الكوثري ئەم ڕیوایەتەی بە زەعیف داناوە، گوایە محمد بن أحمد الأدمي ڕاستگۆ نیە و محمد بن روح العكبري مەجهولە، هەروەها تانەی لە زكريا الساجي داناوە كە ئەمەی كۆتایی هەر شایستەی وەڵام دانەوە نیە.

المعلمي دەڵێ: الخطيب لە ژیاننامەی محمد بن أحمد الأدمي دەڵێ: حمزة الدقاق پێی ووتم: الأدمي ڕاستگۆ نەبوو لە فەرموودەدا لە هەندێك كتێبدا دەیووت بیستوومە كە نەیبیستبوو، الخطيب دەڵێ: منیش پرسیارم لە البرقاني كرد دەربارەی الأدمي، پێی ووتم: جگە لە خێر هیچی تر نازانم دەربارەی، ئینجا المعلمي دەڵێ: لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ڕیوایەتە لە كتێبی (العلل)ی الساجي هاتووە، البرقاني كتێبەكەی الساجي لە الأدمي نەبیستووە تا سیقە بە دروستی بیستنی الأدمي بكات بۆ كتێبەكە یان دروستی نوسخەكە، وایدانێ البرقاني یان الخطيب بڵێ: (قال الساجي في العلل) ئەمەندە بەس نیە بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگە ؟ بڕوانە [التنكيل : 656/1]

لە پێشەكی كتێب ئاماژەم پێدا كە زانایەك كتێبی زانایەكی كۆنی بەردەستە و لێی ڕیوایەت دەكات گرنگی بە سەنەدی نێوان ئەم دوو زانایە نادەین چونكە كتێبەكە لای خەڵكی ئەو سەردەمە بوونی

هەیە و ناسراوە خۆ تەنها ئەم كتێبە لەلای الخطیب بوونی نیە تا بڵێین دەبێ لە سەنەدی نێوان الخطیب و خاوەن كتێب بكۆڵینەوە تا بزانین نوسخەكە دروستە یان نا، هەروەها محقق-ی تاریخ بغداد(١) سەرەڕای دەمارگیری بۆ أبو حنیفة لە حاشیەی ئەم ڕیوایەتەدا ئاماژەی بەم تەزعیفەی الكوثري داوە و پێی سەیرە، وە هەمان ووتەی المعلمي باس دەكات كە الأدمي تەنها ڕاوی كتێبەكەیە هیچ زیانی نیە بۆ سەنەدەكە، وە دەڵێ سەنەدەكە كێشەی نیە چونكە الخطیب لە ژیاننامەی محمد بن روح العكبري دەڵێ: هاوڕێی أحمد بن حنبل بووە، كاتێک أحمد دەچووە عكبرا لەلای ئەو دەمایەوە، ئینجا محقق دەڵێ: كەسێكیش ئەمە حاڵی بێت مەجهول نیە، هەروەها المعلمي لە دەربارەی محمد بن روح كە الكوثري بە مەجهولی داناوە دەڵێ: أحمد هاوڕێیەتی كەسێک ناكات و لەلای نامێنێتەوە ئیللا ئەم كەسە چاک و بەڕێزە، بڕوانە [التنكیل : 740/1]

**عبدالأول بن حماد الأنصاري** دەڵێ: **باوكم ووتی: هیچ كتێبێكم لەلا نیە دەربارەی فقهی حەنەفیەكان، وە فقهی ئەوان بریتیە لە ڕەئی.**

[المجموع في ترجمة حماد الأنصاري : 847] كتێبەكە لەلای نوسەر دەست دەكەوێ سەر بە دەزگای چاپ نیە

**عبدالأول بن حماد الأنصاري** دەڵێ: **بیستم باوكم دەیووت: الحافظ الخطیب البغدادي ئەم كتێبانەی نوسی (شرف أصحاب الحدیث) ، (الفقیه والمتفقه) ، (كتاب الاحتجاج) بۆ ڕەددانەوەی حەنەفیەكان كە ڕەخنە لە ئەهلی حەدیث دەگرن بەهۆی سەرقاڵ بوونیان بە فەرموودە و وازهێنانیان لە ڕەئی ئەوان.** [المجموع في ترجمة حماد الأنصاري : 529]

**أبو إسماعیل الهروي** دەڵێ: **بیستم باوكم دەیووت: یحیى بن عمار ووتی: گەر یحیى بن عمار لە یەكێک لە ئەهلی ڕەئی یەک فەرموودە بنوسێتەوە ئەوا الله پەنجەكانی ببڕێت.**

[ذم الكلام وأهله : 1414]

ووتم: باوكی أبو إسماعیل الهروي بە ڕاستگۆ وەسف كراوە لە پێشەكی محقق-ی كتێبەكەدا، ئەم وەسفەش بەسە بۆمان لە ڕیوایەتێكی لەم جۆرەدا، كەسێكی ناسراو نیە قسەی لەسەر نەكراوە.

**أبو إسماعيل الهروي** دەڵێ: **يحيى بن عمار ووتی: حامد بن محمد الرفاء لەسەر ئەهلی ڕەئی تەنگ كرد بوو نەیدەهێشت ڕیوایەتی لێوە بكەن، وە ئیزنی نەدەدا بێنە ماڵیەوە فەرموودەی لێوە ببیستن، جا كەسێك لە سەرانی بەلخ هاتە لای زۆریان لێیكرد، ئەویش ئیزنی دا، جا كە ئیزنی دا هاتە ژوورەوە ئەویش سەری بۆ بەرز نەكردەوە، وە ووتی: تۆ خەڵكی كوێی ؟ ووتی: بەلخ، ووتی: خاكی مورجیئەكان ! يحيى بن عمار دەڵێ: پاشان الرفاء پێی ووتم: كتێبی ڕەددەكەی الحميدي بخوێنەوە، منیش بەشێكی زۆرم بۆی خوێندەوە.** [ذم الكلام وأهله : 1290] (سەنەدەكەی صەحیحە).

ووتم: كتێبەكەی الحميدي ڕەددانەوەی أبو حنيفة بوو بەناوی (كتاب الرد على أبي حنيفة) ئەمەش وەك جەنگی دەروونی وایە كابرای مورجیئە هاتووە داوای ئیزن دەكات تاكو فەرموودە ببیستێ، كەچی ئەو كتێبی ڕەددانەوەی أبو حنيفة-ی بۆ دەخوێنێتەوە، لە ڕیوایەتی دواتر نموونەیەكی تری هاوشێوەی ئەمە هەیە.

**أبو إسماعيل الهروي** دەڵێ: بیستم محمد بن عثمان النجيمي دەیووت: **الحسين بن الشماخ الحافظ نەیدەهێشت هیچ كەسێك لە ئەهلی ڕەئی فەرموودەی لێوە بنوسنەوە، پیاوێكی خەڵكی مەغریب سوێندی دا بە الله كە فەرموودەی پێ بڵێ وە درێژی سەفەرەكەی بۆ باسكرد، ئەویش هەندێك لە شتە خراپەكانی أبو حنيفة-ی بۆ ڕیوایەت كرد، وە هیچ فەرموودەیەكی بۆ نەگێڕایەوە.** [ذم الكلام وأهله : 1289]

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني الخلال حدثنا أبو الفضل عبدالله بن عبدالرحمن بن محمد الزهري حدثنا عبدالله بن عبدالرحمن أبو محمد السكري حدثنا العباس بن عبيدالله الترقفي ووتی: **بیستم الفريابي دەیووت: ئێمە لە مەجلیسی سعيد بن عبدالعزيز بووین، پیاوێك ووتی: من خەونم بینی پێغەمبەر ﷺ لە دەرگای ڕۆژهەڵاتی مزگەوتەوە هاتە ژوورەوە، وە أبو بكر و عمر و چەند هاوەڵێكی تری لەگەڵ بوو، لەناویشیاندا پیاوێكی تێدا بوو جلێكی پیسی لەبەر بوو شێوەی ناشرین بوو، فەرمووی: دەزانی ئەمە كێیە ؟ ووتم: نەخێر، فەرمووی: ئەمە أبو حنيفة-یە، ئەمە بەهۆی عەقڵەكەیەوە یارمەتی**

**فجوری دا. الفريابي دەڵێ: سعيد بن عبدالعزيز بە خاوەنی خەونەکەی ووت: من شايەتی دەدەم کە تۆ ڕاستگۆی، چونکە گەر ئەم خەونەت نەديبوايە نەتدەزانی ئەم قسەيە بکەيت.**

**[تاريخ بغداد : 570/15] (سەنەدەکەی صەحيحە).**

ووتم: هەر چەندە خەون حوکمی لێوەر ناگیرێت بەڵام مەبەستم ووتەکەی سعيد-ە لێرەدا نەک خودی خەونەکە، ووتەکەی مانای ئەوە دەدات کە ئەم پياوە ئەهلی ئەوە نەبووە سەری لەم باسانە دەرچێت و بەم شێوەيە باسی أبو حنيفة بکات، واتا ئەم ڕيوايەتە هەڵوێستی سعيد نيشان دەدات بەرامبەر بە أبو حنيفة تانەدانەکە لەم بەشەدا خۆی دەبينێتەوە.

# ڕق لێبوونەوەی أبو هريرة ﷺ لەلایەن حەنەفیەکان:

حەنەفیەکانیش هاوشێوەی موعتەزیلەکان ڕقیان لە أبو هريرة دەبێتەوە چونکە ژمارەیەکی زۆر لە فەرموودەی ڕیوایەت کردووە کە مەزهەبەکەیان هەڵدەوەشێنێتەوە، بۆیە هەندێکیان بە ئاشکرا تانەی لێدەدەن و فەرموودەکانی ڕەت دەکەنەوە بە بیانووی ئەوەی فەقیهـ نەبووە نەیزانیوە چ باسە تەنها نەقلی کردووە ! الله لەوە زیاتر ڕیسوایان بکات و تۆڵەی ئەم هاوەڵە بەڕێزەیان لێ بکاتەوە.

عبدالأول بن حماد الأنصاري دەڵێ: **باوکم ووتی: حەنەفیەکان تووڕەن لە أبو هريرة ﷺ چونکە زۆربەی ئەو فەرموودانەی کە أبو هريرة ڕیوایەتی دەکات ڕەددی حەنەفیەکان دەداتەوە، ولله الحمد.** [المجموع في ترجمة حماد الأنصاري : 479]

عبدالأول بن حماد الأنصاري دەڵێ: **بیستم باوکم دەیووت: حەنەفیەکان دەڵێن: أبو هريرة ﷺ فەقیهـ نیە، وە هۆکاری ووتنی ئەم قسەیەش ئەوەیە کە أبو هريرة ﷺ خاوەنی فەرموودەی زۆرە، وە ئەو فەرموودانەی کە ئەو ڕیوایەتی دەکات زۆربەی ڕەئیەکانی ئەوان پوچەڵ دەکاتەوە.** [المجموع في ترجمة حماد الأنصاري : 522]

ابن القيم باسی ئەو کۆمەڵانە دەکات کە فەرموودەی ئاحاد ڕەت دەکەنەوە و دەڵێ: **کۆمەڵەی یانزدەم: ڕەتی دەکەنەوە گەر هاوەڵە ڕاوییەکە فەقیهـ نەبێت بە حیسابی خۆیان، وە ئەگەر فەقیهـ بێت قبوڵی دەکەن، جا بەم پێیە فەرموودەکانی أبو هريرة-یان ڕەت کردەوە ﷺ گەر پێچەوانەی ڕەئیەکانیان بێت، جا دەڵێن: أبو هريرة فەقیهـ نیە ! لەکاتێکدا أبو هريرة لە سەردەمی عمر بن الخطاب فەتوای داوە وعمر دانی ناوە بە فەتواکەی، وە کردوویەتی بە والی لە بەحرەین و شوێنی تریش، وە عبدالله بن عباس و هاوەڵانی تریش قوتابی ئەو بوونە، وە سعيد بن المسيب و تابعینی تریش، البخاري دەڵێ: 800 کەس لە هاوەڵان و تابعین عیلمیان لە أبو هريرة ڕیوایەت کردووە، یەکێک بووە لە زاناترینی هاوەڵان بە فەرموودە، وە لە هەمووان باشتر لەبەری کردووە.**

[مختصر الصواعق المرسلة : 1616-1617]

ووتم: محقق-ی کتێبەکە لە حاشیەدا دەڵێ: ئەم کۆمەڵەیەی کە ابن القیم باسی کردن حەنەفیەکانن.

**محمد الغزالي** دەڵێ: **ئێمە تەئکید لەوە دەکەینەوە کە فەرموودەی ئاحاد لە کۆن و ئێستاشدا تەنها ظنية-یە، وە ئیمام أبو حنیفة تێڕوانینێکی مەعقولی هەیە کاتێک فەرموودەی ئاحادی ڕەت کردەوە لە واجب بوونی شتەکان و حەرامکردنی حەرامکراوەکان، وە پێی وابوو کە ئەم بابەتانە پێویستی بە فەرموودەی قطعیة (واتا متواتر).** [دستور الوحدة الثقافية بين المسلمين : 56]

ووتم: ئەمە أبو حامد الغزالي نیە کەسێکی ترە کە لەم سەردەمەدا ژیاوە ساڵی 1996 مردووە، لە بێ ڕێزی کردن و ڕەت کردنەوەی فەرموودەدا ووتەکانی زۆر لە أبو حنیفة دەچێت، دەربارەی فەرموودەی دەرخستنی قاچی الله لە ڕۆژی قیامەت (یوم یکشف عن ساق) کە لە صحیح البخاري هاتووە محمد الغزالي دەڵێ: شانۆگەرییەکی بێ مانا و هیچە ! یان دەربارەی فەرموودەی تر دەڵێ: بیخە ژێر پێت ! چەند لە ووتەکانی أبو حنیفة دەچێت کە دەیووت: خورافەیە، میزی پێدا بکە.

**ابن برهان** دەڵێ: **أبو حنیفة دەڵێ: گەر ڕاوییەکە فەقیه بێت ئەوا ڕیوایەتەکەی پێشی قیاس دەخرێت، وە ئەگەر فەقیه نەبێت ئەوا قیاس پێشی ڕیوایەتەکەی دەخرێت.**

**ابن برهان دەڵێ: ئەو قیاسەی کە پێشی ڕیوایەت دەخرێت لای حەنەفیەکان أصول-ە.**

[الوصول إلى الأصول : 2/203]

ووتم: أصول واتا قورئان و سوننەت و ئیجماع، بەم پێیە هەر فەرموودەیەک بگات بە أبو حنیفة و شوێنکەوتوانی مەزهەبەکەی قیاسی دەکەنە سەر قورئان و سوننەت و ئیجماع لەگەڵ ئەمانەدا یەکی نەگرتەوە ئیتر ڕەتی دەکەنەوە با سەنەدەکەشی صەحیح بێت، جا گەر پێی بڵێی بە چ بیانووێک ڕەتت کردەوە ؟ ئەوا دەڵێ: ئەو هاوەڵەکەی کە ڕیوایەتی کردووە فەقیه نیە ! بەم پێیەش چەندەها فەرموودەی صەحیحیان ڕەت کردەوە کە لەلای مەزهەبەکانی تر قبوڵ کراوە و کاری پێدەکرێت، بۆیە حماد بن زید دەڵێ: دەزانن أبو حنیفة کێ بوو ؟ مشتومڕی دەکرد لە ئیرجائدا جا کاتێک ترسا

لە ڕوحی خۆی دەستی کرد بە ڕەئی، جا فەرموودەکانی پێغەمبەری الله ﷺ قیاس کردە سەر یەکتر تا بەتاڵیان بکاتەوە، وە فەرموودەکانی پێغەمبەری الله ﷺ قیاس ناکرێت.
جا حەنەفیەکان پێیان وایە حوکمێک لە قورئاندا هاتبێ پاشان سوننەت بێت ڕوونکردنەوەی زیاتری پێبدات ئەوا ئەم زیادەیە بە نەسخ حیسابە قورئانیش بە سوننەت نەسخ ناکرێتەوە، بۆیە زۆرێک فەرموودەی صەحیحیان ڕەت کردۆتەوە بەم بیانووە باطلە، بۆ نموونە لە فەرموودەی صەحیح هاتووە گەر کەسێک زەواجی نەکردبوو توشی زینا بوو ئەوا 100 جەلدەی لێدەدرێت و ساڵێک نەفی نەکرێت، حەنەفیەکان لەسەرووی هەمووشیانەوە أبو حنیفة پێیان وایە لە قورئاندا تەنها باسی ئەوە کراوە 100 جەلدەی لێ بدرێت باسی نەفیکردنی بۆ ماوەی ساڵێک نەکراوە، کەواتە ئەو حوکمەی کە لە فەرموودەدا هاتووە حوکمێکی زیادەوە و بە نەسخ حیسابە، فەرموودەش قورئان نەسخ ناکات بۆیە ڕەتی دەکەینەوە فەرموودەکەش أبو هریرة ڕیوایەتی کردووە کە فەقیه نیە بە حیسابی خۆیان ! لەکاتێکدا لای جمهوری زانایان ئەم حوکمە ڕوونکردنەوەیە نەک نەسخ بێت تەنانەت ئەوەی سەری لەم باسانەش دەرنەچێت دەزانێت نەسخ نیە چونکە فەرموودەکە 100 جەلدەکەی قورئانی وەک خۆی هێشتۆتەوە و نەیگۆڕیوە تا بڵێین نەسخی کردووە تەنها نەفیکردنەکەی زیادکردووە ئەمەش ڕوونکردنەوەی زیاترە، نموونەی ئاواش زۆرە لە سوننەتدا کە ڕوونکردنەوەی زیاتر دەدات بە حوکمەکانی قورئان، هەر بۆیە بشر المريسي جەهمی کافر گۆشتی کەری ماڵی حەلاڵ دەکات لەکاتێکدا لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە گۆشتی ئەسپ و کەری کێوی حەلالە و گۆشتی کەری ماڵی حەرامە، دەزانن بۆچی بشر المريسي بە حەلالی دەزانێت ؟ چونکە حەنەفی مەزهەبە و لەسەر أصولی أبو حنیفة دەڕوات، لە قورئاندا باسی حەڕامکراوەکان هاتووە باسی ئەوە نەکراوە گۆشتی کەری ماڵی حەرامە، لە فەرموودەدا ئەمە هاتووە کەواتەی بەپێی أصولی أبو حنیفة ئەم حوکمە زیادەیەی ناو فەرموودەکە نەسخە بۆ حوکمەکەی ناو قورئان، دەڵێن فەرموودەش نەسخی قورئان ناکات جا بۆیە فەرموودەکە ڕەت دەکەنەوە.

**عبدالقادر القرشي** لە ژیاننامەی بشر المريسي دەڵێ: **ووتەی سەیری هەیە لە مەزهەبەکەماندا، لەوانە: جائیز بوونی خواردنی گۆشتی کەر.** [الجواهر المضية في طبقات الحنفية : 450/1]

ووتم: بۆ ووتەکەی بشر المريسي بە سەیر دەزانیت ؟ خۆ شوێنی ئیمامەکەت کەوتووە، ئەوەندەی ئیمامەکەت بەم بیانووانە فەرموودەی ڕەت کردۆتەوە و بێ ڕێزی پێکردووە کێ وەک ئەوی کردووە؟ تەنانەت بۆتە ئیمام بۆ بەناو قورئانیە زندیقەکانی ئەم سەردە، دەڵێن دەستی خۆشبێت کارێکی چاکی کردووە هەموو فەرموودەیەکی صەحیحی وەرنەگرتووە تا لەگەڵ قورئاندا بەراووردی کردووە ئێمەش لەوەدا شوێنی دەکەوین و بە ئیمامی دەزانین، ئەگەرچی ئەم زندیقانەی ئەمڕۆ تەنها بۆ خۆ دەربازکردن أبو حنيفة وەک قەڵغانێک بەکاردێنن بەڵام بەڕاستی مەزهەبەکەی سەرچاوەی دەرکەوتنی کوفر و بیدعە وگومڕاییە، بۆیە ژینگەیەکی زۆر لەباری سازکردووە بۆ کافر و گومڕاکان تا بتوانن لە مەزهەبەکەیدا جێگایان ببێتەوە، جەهمی بوون تێیدا دەرکەوت، مورجیئە بوونیان تێیدا دەرکەوت، ووتنی خلق القرآن تێیدا دەرکەوت، ڕەتکردنەوە و بێ ڕێزی کردن بە فەرموودە تێیدا دەرکەوت، فەتواوادان بە ڕەئی و فێڵ کردن کە ئەمڕۆ پێی دەووترێ حیلەی شەرعی تێیدا دەرکەوت، خروجکردن تێیدا دەرکەوت، ئیتر ئیمامی مەزهەبێک هەموو ئەمانەی تێدا دەرکەوێ چۆن مەزهەبەکەی نابێتە ژینگەیەکی لەبار بۆ کافر و گومڕاکان و دانانی گەراکانیان تێیدا ؟

بە صەحیحی لە پێغەمبەر ﷺ هاتووە کە فەرموویەتی: من قورئانم و هاوشێوەی قورئانم پێدراوە لەگەڵ قورئان، نزیکە پیاوێکی سک تێر لە جێگاکەیدا پاڵداتەوە و بڵێ: دەست بگرن بەم قورئانەوە چیتان تێیدا بینی لە حەلالکراوەکان بە حەلالی بزانن، وە چیتان تێیدا بینی لە حەرامکراوەکان بە حەرامی بزانن ... تا کۆتایی فەرموودەکە، کە باسی ئەوانە دەکات کە حوکمەکانی ناو فەرموودە وەرناگرن.

**الخطابي** دەربارەی ئەم فەرموودەیە دەڵێ: **لەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەیە لەسەر ئەوەی کە فەرموودە پێویستی بەوە نیە بەراوورد بکرێت بە قورئان بەڵکو هەر کاتێک بە صەحیحی بچەسپێت**

**لە پێغەمبەری الله ﷺ ئەوا خودی فەرموودەکە بۆخۆی دەبێتە بەڵگە، سەبارەت بەوەش کە هەندێکیان ڕیوایەتی دەکەن کە هاتووە لە فەرموودەدا: (گەر فەرموودەتان پێگەیشت ئەوا بەراووردی بکەن لەگەڵ قورئاندا گەر لەگەڵ قورئان یەکی گرت وەری بگرن گەر پێچەوانەی قورئان بوو وازی لێ بهێنن) ئەم فەرموودەیە باطلە ئەصلی نیە، وە زکریا بن یحیی الساجي لە یحیی بن معین گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: ئەم فەرموودەیە زندیقەکان هەڵیان بەستاوە.**

[معالم السنن : 299/4]

فەرمووەدەی المصراة لە الصحیحین هاتووە وەک پێشتر ابن الجوزي باسیکرد یەکێکە بوو لەو فەرموودانەی کە أبو حنیفة ڕەتی کردۆتەوە، وە حەنەفیەکان بە گشتی ناسراون بە ڕەت کردنەوەی ئەم فەرموودەیە کە أبو هریرة ڕیوایەتی کردووە، فەرموودەکە بەم ناوە ناسراوە چونکە پێغەمبەر ﷺ نەهی دەکات لە (تصریة) کردنی ئاژەڵ واتا نەدۆشینی و گلدانەوەی شیرەکەی لە گوانی، ئەو کەسەی کە دەیەوێت ئاژەڵەکەی بفرۆشێت بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک ئاژەڵەی نادۆشێت تاکو گوانی پڕ شیر بێت و کڕیار وابزانێ ئاژەڵێکی باشە و شیری زۆرە، کەچی کە دەیکرێت و پاشان دەیدۆشێت و گوانی بەتاڵ دەبێت دەبینێت گوانی وەک جاری سەرەتای لێ نایەتەوە، جا لەم کاتەدا کڕیار سەر پشک کراوە گەر ڕازی بوو ئەوە لای خۆی دەیهێڵێتەوە، گەر ڕازیش نەبوو ئەوا ئاژەڵەکە دەباتەوە بۆ خاوەنەکەی لەگەڵ صاعێک خورما بەرامبەر ئەو شیرەی کە لێی دۆشیوە، ئەم فەرموودەیە لای جمهور قبوڵکراوە، أبو حنیفة و حەنەفیەکان ڕەتی دەکەنەوە بە بیانووی ئەوەی کە پێدانی صاعێک خورما بە خاوەنەکەی دەبێتە ڕیبا، ئەو شیری دۆشیوە نە شیر هەمان نرخی خورمای هەیە، نە هەمان بڕی خورمایە کەواتە دەبێتە ڕیبا، أبو هریرة-ش دەکەن بە بیانوو گوایە هاوەڵێکی فەقیهـ نیە ڕیوایەتەکەی دژی قورئان و سوننەت و ئیجماعە و ڕێگا دەدات بە پێدانی ڕیبا.

**ابن القیم** رحمه الله **الشافعي ووتی: مونازەرەم لەگەڵ محمد کرد -واتا الشیباني قوتابیەکەی أبو حنیفة- دەربارەی بابەتی المصراة، جا فەرموودەکەم بۆ باسکرد، محمد ووتی: ئەم فەرموودەیە أبو هریرة ڕیوایەتی کردووە، الشافعي ووتی: ئەو وەڵامەی کە دایەوە خراپتر بوو لەو شتەی کە لێی**

**ڕایکرد.** [مختصر الصواعق المرسلة : 1617-1618]

ووتم: واتا موخالەفەکردنی فەرموودەکە هێشتا سووکتر بوو لەو کارەی کە کردی کە تانەدان بوو لە أبو هريرة، چونکە بەهەر بیانووێک فەرموودە وەرنەگرێت ئەوا هیچ بیانووێکی نیە لە تانەدان لە أبو هريرة.

ابن حزم دەڵێ: **بەڵگە هێنانەوەی أبو حنيفة بە فەرموودەی المصراة کارەساتێکە لە کارەساتەکانی سەردەم، أبو حنيفة یەکەم کەسە کە موخالەفەی ئەم فەرموودەیەی کردووە و عەیبداری کردووە و تانەی لێداوە، موخالفی هەموو ئەم شتانەیە کە لە فەرموودەکەدا هاتوون، جارێکیان حەنەفیە خاوەن وەرعەکان بە مەنسوخی دەزانن بە حەرام بوونی ڕیبا، ئەمەش هەمووی درۆیە ڕیبا هیچ پەیوەندی بەم فەرموودەیەوە نیە، وە جارێکیان حەنەفیەکان فەرموودەکە بە درۆ دەزانن و دەیدەنە پاڵ أبو هريرة، الله تعالى پاداشتی ئەم کارەیان دەداتەوە لە دونیا و ئاخیرەتدا، ئەوان خۆیان ئەهلی درۆن نەک أبو هريرة-ی گەورە و چاکەکار ڕەزای الله لەسەر ئەو و هەموو هاوەڵان بێت، وە کەسی تانەدەر لە یەکێک لە هاوەڵان هەڵگێڕێتەوە بەسەر دەم و لوتیدا.**
[المحلى : 83/10]

ووتم: ابن حزم لە [المحلى : 578/10-585] بە درێژی موناقەشەی هەموو بیانووەکانیان دەکات و ڕەددیان دەداتەوە دەربارەی فەرموودەی المصراة، کە هەموو بیانووەکان ڕەئی خۆیانن.

ابن حزم دەربارەی فەرموودەیەکی الصحيحين کە دەربارەی کەسی موفلیس هاتووە دەڵێ: **ڕیوایەتمان کرد لەڕێگای أبو عبيد-ەوە کە ووتی: مونازەرەم لەگەڵ محمد بن الحسن کرد دەربارەی ئەم بابەتە، جا هیچی لانەبووە تەنها ئەوە نەبێ کە وتوویەتی: ئەمە فەرموودەی أبو هريرة-یە.**
**ابن حزم دەڵێ: بەڵێ والله ئەمە فەرموودەی أبو هريرة-ی چاکەکاری ڕاستگۆیە نەک فەرموودەی کەسانی هاوشێوەی محمد بن الحسن بێت، کە بە عبدالله بن المبارك ووترا: کامەیان فەقیهترن أبو يوسف یان محمد بن الحسن ؟ ووتی: بڵێ کامەیان درۆزنترن.** [المحلى : 174/9]

**أبو سعد السمعاني** دەڵێ: سمعت أبا المعمر المبارك بن أحمد سمعت أبا القاسم يوسف بن علي الزنجاني الفقيه سمعت الفقيه أبا إسحاق الفيروزآبادي سمعت القاضي أبا الطيب دەیووت: **ئێمە لە مەجلیسێک بووین لە مزگەوتی المنصور، گەنجێکی خوراسانی هات پرسیاری کرد دەربارەی المصراة، جا داوای بەڵگەی کرد، تا بەڵگە هێنرایەوە بە فەرموودەکەی أبو هريرة کە لەم بارەیەوە هاتووە، گەنجەکە حەنەفی بوو ووتی: فەرموودەی أبو هريرة قبوڵ ناکرێت، ووتەکەی تەواو نەکرد تا مارێکی گەورە بەسەریدا بەربوویەوە لە سەقفی مزگەوتەکە، خەڵکیش هەڵسانەوە لەبەر مارەکە، گەنجەکەش ڕایکرد لێی، مارەکەش بەدوای دەکەوت، پێی ووترا: تەوبە بکە تەوبە بکە، ئەویش ووتی: تەوبەم کرد، ئینجا مارەکە دیارنەما و هیچ ئاسەوارێکی نەبینرا.**

**الذهبي دەڵێ: ڕاوییەکانی سەنەدەکە هەمووی پێشەوان.**

[الذهبي نەقلی کردووە - سير أعلام النبلاء : 618/2]

ووتم: لە بڕگەی دووەمدا دەربارەی بابەتی ووتنی قوڕئان مەخلوقە لەلایەن أبو حنيفة-ەوە ڕیوایەتێکی البيهقي-مان هێنا کە البيهقي لەکۆتاییدا دەڵێ: ڕاوییەکان هەمووی سیقەن، بەڵام ووتەکەمان قبوڵ نەکرد و تەزعیفمان کرد، جا لێرەشدا کە الذهبي دەڵێ: ڕاوییەکان هەمووی پێشەوان ئاوا بە ئاسانی قبوڵی ناکەین بەڵکو لێمان کۆڵیەوە کە هەموو ڕاوییەکان خاوەن کتێبن و لە ڕیوایەتدا کێشەیان نیە ئەگەرچی هەموویان بە پێشەوا نازانین بەڵام الذهبي زۆر شلە لە بەکارهێنانی ئەم نازناوانە.

دەبێت کێ ئەم گەنجە کێ فێری کردبێت کە بڵێ فەرموودەی أبو هريرة قبوڵ نیە ؟ پێتان وایە ئیجتیهادی خۆی بێت ؟ جا کە أبو حنيفة-ی خاوەن مەزهەب و حەنەفیەکانی شوێنکەوتەی فەرموودەی صەحیح ڕەت بکەنەوە لە حەرام و حەلالدا بە بیانووی ئەوەی هاوەڵەکە فەقیهـ نیە کە ڕیوایەتی کردووە، یان بە بیانووی ئەوەی ئاحادە، ئەوا جەهمیەکانیش دەڵێن ئێمەش فەرموودەی ئاحاد وەرناگرین لە بابەتی عەقیدەدا چونکە گەر أبو حنيفة لە بابەتی ئەحکام وەری نەگرێت ئەی چۆن ئێمە لە عەقیدەدا وەری بگرین، جا بە هەموو پێوەرێک ڕەت کردنەوەی ئەم فەرموودانە لە بابەتی عەقیدەدا لەپێشترە، هەر بۆیە الكوثري جەهمی کە بە شێتی أبو حنيفة

ناسراوه فەرموودەی جارییەكە ڕەت دەكاتەوە كە لە صحيح مسلم هاتووە (فقال لها أين الله ؟ قالت: في السماء) بە بیانووی ئەوەی ئەو هاوەڵەی كە ڕیوایەتی كردووە (معاوية بن الحكم السلمي) فەقیھ نیە لەناو نوێژدا قسەی كردووە !

# ژمارەیەک زندیق و مولحید و موڕتەدی ناسراو کە حەنەفی مەزهەب بوونە:

ابن سينا: مولحید و ئیمامی مولحیدەکان وەک ابن القيم وەسفی کردووە.

بشر المريسي: جەهمی کافر ڕۆڵی سەرەکی بینی لە فیتنەی خلق القرآن لە سەردەمی المأمون دا.

ابن أبي دؤاد: جەهمی کافر ڕۆڵی سەرەکی بینی لە فیتنەی خلق القرآن لە سەردەمی المعتصم دا.

أبو علي الجبائي: یەکێکە لە سەرانی موعتەزیلە مامۆستای أبو الحسن الأشعري بوو، أبو الحسن ئیعتیزالی لەو وەرگرت پێش ئەوەی ببێت بە ئەشعەری.

محمد بن كرام: پێشەوای گروپی کەررامی کە گروپێکی مورجیئەیە ئێستا نەماون.

أبو منصور الماتريدي: پێشەوای گروپی ماتوریدی کە زانایەکی حەنەفی ناسراوە، بە دەگمەن هەیە کەسێک ماتوریدی بێت و حەنەفی نەبێت.

الزمخشري: موعتەزیلەی کافر، شانازی بە موعتەزیلە بوونی خۆی دەکرد و بەئاشکرا دەیووت قورئان مەخلوقە، ئەهلی سوننەی بە الحشوية ناو دەبرد وەک گاڵتە و سوکایەتی پێکردن چونکە ئیثباتی صیفات دەکەن لەسەر ظاهر.

جمال الدين الأفغاني: ماسۆنی و دەججال و زندیق و مولحید، خۆی دانی پێدەنێت کە حەنەفیە.

محمد عبده: قوتابی جمال الدين الأفغاني لەسەر ڕێچکەی مامۆستاکەی ڕۆیشتووە ئەویش حەنەفی مەزهەبە.

ئێستا دەڵێن جا أبو حنيفة چی بکات خۆ ئەو ئەمانەی فێر نەکردووە کە ئاوا بن، دواتر لە مەزهەبەکانی تریش کەسانی موڕتەد هەن خۆ تەنها لە مەزهەبی حەنەفی نیە، دەڵێین بەڵێ ڕاستە، بەڵام مەبەستمان ئەوەیە کە مەزهەبەکەی ژینگەیەکی لەبارە بۆ زندیق و مولحید و کافرەکان، هەروەک ابن تيمية ووتی: أصولی أبو حنيفة نەفی بیدعە ناکات ئەگەرچی ئیثباتیشی نەکات بۆیە مەزهەبەکەی لە تەواوی ئەهلی بیدعەکان پێکدێت، ڕاستی کرد ابن تيمية بەڵام هێشتا نەرمی نواند

بەرامبەرى، چۆن أصولی أبو حنيفة ئیثباتی بیدعە ناكات لەكاتێكدا خۆی خاوەنی كۆمەڵێک كوفر و بیدعەیە ؟!

دروستبوونی فیتنەی خلق القرآن كە یەكێكە لە گەورەترین فیتنەكان لە مێژووی ئیسلامدا هۆكارەكەی كێ بوو ؟ مەگەر بشر المريسي و ابن أبي دؤاد و موعتەزیلەكانی بەصرە نەبوون چوونە پاڵ خەلیفە عەبباسیەكان و ئەم كوفرەیان خستە ناو مێشكیانەوە ؟ بشر المريسي و ابن أبي دؤاد دوو حەنەفی مەزهەبن كە ئیمامەكەیان پێش ئەوان وتوویەتی قورئان مەخلوقە ئیتر بۆ سەیرە ئەوانیش وابڵێن كە لە ژینگەیەكی ئاوا لەبار بۆ كوفر و بیدعە پێگەیشتوون.

**ئیمام أحمد** دەربارەی الجهم بن صفوان دەڵێ: **قورئانی تەفسیر كرد بە تەفسیرێكی تر كە لەشوێنی خۆی نەبوو، وە فەرموودەی پێغەمبەری الله ﷺ بە درۆ زانی، وە پێی وابوو هەر كەسێك الله وەصف بكات بەو شتانەی كە لە قورئاندا پێی وەصف كراوە یان پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودە وەصفی كردووە ئەوا كافرە، وە كەسێک بوو لە المشبهة. جا بەهۆی ووتەكانی كەسانێكی زۆری گومڕا كرد، وە كەسانێک شوێنی ووتەكانی كەوتن لە هاوەڵانی أبو حنيفة و عمرو بن عبيد لە بەصرە، وە دینی جەهمی داهێنا.** [الرد على الجهمية والزنادقة : 97]
ووتم: بۆ هاوەڵانی أبو حنيفة شوێنی دەكەون هاوەڵانی مالك و الشافعي و أحمد شوێنی ناكەون؟ چونكە ئیمامەكەیان ژینگەیەكی لەباری بۆ سازكردوون.

هەر بۆیە المعلمي لە ڕەددانەوەی الكوثري ئاماژە بەوە دەكات كە أبو حنيفة هۆكارێكی ناڕاستەوخۆ بووە بۆ دروست بوونی فیتنەی خلق القرآن و ڕەت كردنەوەی فەرموودە، كاتێک الكوثري دەڵێ: چۆن دەبێت الثوري و الأوزاعي بڵێن: لە ئیسلامدا كەس لە دایک نەبووە شومتر بێت لە أبو حنيفة ! چۆن زانیان ئەو شومترین كەسە ؟

**المعلمي** لە وەڵامی ئەم ووتەیەی الكوثري دەڵێ: **الثوري و الأوزاعي وەكو زۆرینەی پێشەواكانی پێش خۆیان و سەردەمی خۆشیان پێیان وابوو كە ئیرجاء و ڕەت كردنەوەی فەرموودە بە ڕەئی و بڕوا**

**بوون بە هەندێک لە عەقیدەی جەهمیەکان هەموو ئەمانە گومڕایین، دەبێتە هۆی ئەوەی کە زیانی توند بێت بەسەر ئوممەت لە دین و دونیایدا، وە الثوري والأوزاعي بینیان أبو حنیفة و شوێنکەوتوانی لەوانەی هەڵەن یان پێکاویانە جددی بوون لە بڵاوکردنەوەی ئەم شتانە، وە بەردەوام ووتەکانیان بڵاو دەبوویەوە و بەرەو خراپتر دەڕۆیشت، تەنانەت وای لێهات کەسانێک بڵێن فەرموودەی ئاحاد بە ڕەهایی ڕەت دەکرێتەوە، وە هەندێکیان ووتیان فەرموودە بە ڕەهایی ڕەت دەکرێتەوە هەروەک الشافعي باسی کردووە، پاشان وای لێهات بڵێن دەقە شەرعیەکان نابێتە بەڵگە لە بابەتە عەقیدەییەکاندا، پاشان درۆیان دایە پاڵ پێغەمبەری الله عز وجل، وە دایانە پاڵ الله سبحانە هەروەک لە بەشی عەقیدەدا باسم کرد، جا الثوري والأوزاعي بەشێک لەم شتانەیان بینی و حاڵەتەکە ئەمەی نیشاندان کە سەرەنجام چی لێدێت، جا ئەوان چۆنیان گومان برد هەروا دەرچوو، وە ئایا فیتنەی خلق القرآن لە سەردەمی المأمون والمعتصم والواثق هەڵگیرسا تەنها لەسەر دەستی هاوەڵانی ئێوە نەبێت کە ووتەکانیان دەدایە پاڵ أبو حنیفة ؟ وە لە کتێبی (قضاة مصر) بەشێک لەمە ڕووداوانە باس کراوە، وە ئایا هیچ شتێک وایکرد ئەم ووتانە تەشەنە بکەن و بڵاو ببنەوە تەنها ئەم فیتنەیە نەبێت ؟ وە چ زیانێک بە ئوممەت گەیشت کە گەورەتر بێت لە زیانی ئەم ووتانە ؟** [التنکیل : 1/433-434]

عثمان بن سعيد الدارمي لە ڕەددانەوەی بشر المریسي و ابن الثلجي کە دوو جەهمین دەڵێ:
**بەهەمان شێوە سەرکردە ناوەندییەکەتان یعقوب أبو یوسف ڕیوایەتی کردووە لە الشعبي-ەوە گەرقەناعەتتان بێت بە ڕیوایەتەکەی.** [نقض عثمان بن سعيد الدارمي على بشر المريسي : 17]
ووتم: الدارمي قازی أبو یوسف کە ناودارترین قوتابی أبو حنیفة-یە بە سەرکردەی ناوەندی ناو دەبات، ئەی سەرکردەی یەکەمیان کێیە ؟ بێگومان أبو حنیفة-یە، ئەمە لەکاتێکدا أبو یوسف جەهمیش نەبووە وەک أبو حنیفة.

# داهێنانی بیدعەی حەسەنە لەلایەن أبو حنيفة:

**ابن المنذر** دوای هێنانی بەڵگەكان لەسەر (التثويب) لە بانگی بەیانیدا دەڵێ: **النعمان (واتا: أبو حنيفة) موخالەفەی هەموو ئەم بەڵگانەی كرد كە باسمان كرد، يعقوب -واتا أبو يوسف- لە أبو حنيفة-ەوە گێڕاویەتیەوە لە كتێبی (الجامع الصغير) كە وتوویەتی: ئەو تەثویبەی كە خەڵك دەیكەن لە بانگی بەیانیدا لەنێوان بانگ و قامەت دایە، دوو جار دەووترێ حي على الصلاة، دوو جار دەووترێ حي على الفلاح، وە أبو حنيفة تەثویبی بە مەكروهـ زانیوە لە بانگی عیشا و باقی نوێژەكانی تردا.**

**ابن المنذر دەڵێ: موخالەفەی ئەو فەرموودانەی كرد كە لە بانگ بێژانی پێغەمبەری الله ﷺ چەسپاوە بلال و أبي محذورة، وە فەرمووده لە ابن عمر و أنس بن مالك ڕیوایەت كراوە، وە خەڵكی مەككە و مەدینە لەسەری دەڕۆن هەر لە سەردەمی پێغەمبەری الله ﷺ تاوەكو ئەمڕۆمان، جیل دوای جیل لەیەكتری وەردەگرن كاری پێدەكەن لە هەموو سەردەمێكدا بە ئاشكرایی لە بانگی بەیانیدا لە هەموو ڕۆژێك، پاشان بەوەش نەوەستا كە موخالەفەی هەموو ئەو بەڵگانەی كرد تاكو بیدعەیەكی حەسەنەی داهێنا كە لە هیچ كام لە دوو بانگ بێژەكەی پێغەمبەری الله ﷺ ڕیوایەت نەكراوە، وە كاریشی پێ نەكراوە لە سەردەمی هیچ كام لە هاوەڵەكانی پێغەمبەر، وە لە كتێبی محمد بن الحسن هاتووە كە دەڵێ: تەثویب سەرەتا دوای بانگ بوو دەیانووت: الصلاة خير من النوم، خەڵكیش ئەم تەثویبەیان داهێنا -واتا ئەوەی أبو حنيفة- ئەمەش شتێكی چاكە.**

**ابن المنذر دەڵێ: وە چەسپاوە فەرمووده لە دوو بانگ بێژەكەی پێغەمبەری الله ﷺ و هاوەڵەكانی كە باسمان كرد تەثویب لەناو خودی بانگەكە دایە پێش تەواو بوونی، جا ئەوەی محمد ووتی كە سەرەتا تەثویب دوای بانگ بووە ئەمە مەحاڵە و هیچ مانای نیە، لەگەڵ ئەوەشدا خیلافی ئەوەیە كە خەڵكی حیجاز و شام و مصر لەسەرینە، وە خیلافی ووتەی سفيان الثوري-ە، پاشان بە شتێكی چاكی دانا و دانی پێدانا كە داهێنراوە، وە هەموو شتێكی داهێنراویش بیدعەیە.**

[الأوسط في السنن والإجماع والإختلاف : 3/155-156]

ووتم: التثويب واتا ووتنى (الصلاة خير من النوم) دوو جار لە بانگى بەيانيدا لەدواى ووتنى (حي على الفلاح) ئەمە شتێكە زانا و عەوام دەيزانێت و هەموو ڕۆژێک خەڵک دەيبيستێ، كەچى أبو حنيفة بەمە ڕازى نەبووە و ڕەتى كردۆتەوە، لە برى ئەوە هاتووە بيدعەيەكى حەسەنەى داهێناوە! لەجياتى ئەم تەثويبە كە لەناو بانگدا هەيە دواى تەواو بوونى بانگەكە بڵێن حي على الصلاة دوو جار، حي على الفلاح دوو جار، واتا هەم كاتى ووتنەكە پێچەوانەى فەرموودەيە هەم خودى ووشەكە پێچەوانەى فەرموودەيە و شتێكى بيدعەيە، وە محمد بن الحسن الشيباني بە بيدعەيەكى حەسەنى دەزانێت !

جگە لەم بابەتانەش كە هێنامان بڕوانن بۆ كتێبى (المغني لابن قدامة) بە نموونە، كە كتێبێكە دەربارەى فيقهى مقارن نوسراوە، ووتەى هەر چوار مەزهەبەكە نەقل دەكات لە بابەتەكاندا، لە چەندەها شوێن دەبينى ابن قدامة دەڵێ: ئێمە (واتا حەنبەليەكان) و مالكيەكان و شافعيەكان وادەڵێين بەڵگەشمان ئەم فەرموودەيە، بەڵام حەنەفيەكان وانالێن شتێكى تر دەڵێن.

كەسانێک دەڵێن: ئيمام مالك (عمل أهل المدينة) بەلايەوە حوججە بووە فەرموودەى ڕەت دەكردۆتەوە بە بيانووى ئەوەى پێچەوانەى عمل أهل المدينة-يە.

لە وەڵامى ئەمەدا دەڵێين:

سەرەتا دەبێ ئەوە بزانين كە هيچ زانايەک بۆى نيە لەخۆيەوە هەندێک شت وەک أصول دابنێت بۆ مەزهەبەكەى بەهۆى ئەمەوە فەرموودەى صەحيحى پێ ڕەت بكاتەوە، ئەمە نە بۆ مالك نە بۆ غەيرى مالك دروست نيە ئەنجامى بدات، كارەكە بەم شێوەيە نيە كە هەندێک جاهيل لێى تێگەيشتوون كە گوايە مالك هاتووە دەڵێ مەزهەبى من ئاوايە هەر فەرموودەيەک لەگەڵى يەک نەگرێتەوە قبوڵى ناكەم، الشافعي لەولا دەڵێ مەزهەبى منيش ئاوايە هەر فەرموودەيەک يەک نەگرێتەوە لەگەڵى وەرى ناگرم، يەكێكى تر لەولاوە بەهەمان شێوە، ئوممەتيش لە بەرامبەر ئەم ووتانە دەڵێن: زۆر ئاساييە هەريەكێكيان بۆخۆى با أصول-ى مەزهەبەكەى دابنێت كام فەرموودەى يەكى نەگرتەوە لەگەڵ مەزهەبەكەى با وەرى نەگرێت ئێمەش لەمەدا شوێنى دەكەوين ! حاشا

زانایانی ئەهلی سوننە بەرین لەم جۆرە ووتە و كارانە، ئوممەتیش ئەم جۆرە ووتە و كارانە لە هیچ كەسێک قبوڵ ناكەن جا هەر زانایەک بێت و هەر پلەیەكی هەبێت، سەبارەت بەوەش كە (عمل أهل المدينة) حوججەیە لەلای ئیمام مالك بەڵێ وایە بەڵام دەربارەی ئەم بابەتە تا ئێستاش لەناو زانایانی ئوممەتدا خیلاف هەیە، هەم لەناو خودی زانا مالكیەكان هەم لەناو زانایانی مەزهەبەكانی تردا، كە ئایا عمل أهل المدينة چ عەمەلێک دەگرێتەوە ئەوانەی نەقلین یان ئیجتیهادین ؟ وە ئایا تا چ سەردەمێک دەبێتە حوججە؟ تا سەردەمی كوژرانی ئیمام عثمان حوججەیە یان تا سەردەمی هەر چوار خەلیفەكە یان تا سەردەمی تەواوی هاوەڵان یان تا سەردەمی تابعین یان تا سەردەمی أتباع التابعين هەموو ئەم باسانە تاكو ئێستاش
جێگای مشتومڕن لەلای زانایاندا.

هەر بۆیە **الزركشي** دەربارەی عمل أهل المدينة دەڵێ: **تاكو ئێستاش ئەم بابەتە كێشەی لەسەرە.**
**[البحر المحيط: 4/488]**

دەپرسین بۆچی زانایان گفتوگۆی ئەم بابەتە دەكەن و بگرە لە هەندێک بەشی بابەتەكە هاوڕای ئیمام مالك-ن ؟ بۆ هەروەک چۆن هێرشیان كردە سەر أبو حنيفة لە ڕەتكردنەوەی بۆ فەرموودە بەهەمان شێوە هێرش ناكەنە سەر مالك ؟ دیارە ئەو شتانەی كە لە أبو حنيفة-دا هەبووە كە فەرموودەی ڕەت كردۆتەوە بە شێوازێكی زۆر ناشرین و دوای پێگەیشتنی هەر لەسەر قسەكەی خۆی ماوەتەوە ئەم شتانە لە مالك-دا بوونیان نەبووە ئەگینا زانایان بەرین لەوەی كە دوو فاق بكەن بەرامبەر كەسێک ئاوا بن و بەرامبەر ئەوی تر جۆرێكی تر بن لەكاتێكدا ئەم دووانە هیچ جیاوازییان نەبێت، پاشان مەدینە شاری پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان بووە، گەر عمل أهل المدينة تا سەردەمی كوژرانی ئیمام عثمان یان چوار خەلیفەكە یان تەواوی هاوەڵان حوججە بێت لەلای مالك ئەوا حوججەیەكی بەهێزە و بە ئاسانی ڕەت ناكرێتەوە ئەگەرچی ئەمە نابێتە بیانوو بۆ مالك و هیچ كەسێكی تر كە فەرموودەی صەحیحی پێ ڕەت بكاتەوە، بەڵام شارێک كە شاری دابەزینی وەحی و ئایەتەكانی حەرام و حەلال بێت و پێغەمبەر و هاوەڵان تێیدا ژیابن و خەڵكی ئەم

شارە لەسەر کارێک یەکدەنگ بن و لەسەری بڕۆن ئەوا خۆی لە خۆیدا ئەمە هێزێک پەیدا دەکات کە ووتە و کاری خەڵکی شارەکانی تر ئەم هێزەی نیە چونکە باقی شارەکانی تری وەک کوفە و بەصرە و دمشق و قاهیرە زانست کاتێک تێیدا بڵاو بۆتەوە کە ژمارەیەک لە هاوەڵان تێیدا نیشتەجێ بوونە.

**ابن تيمية** ئیجماعی أهل المدينة-ی کردۆتە چوار پلە، پوختەی ووتەکەی نەقل دەکەم بە ماناوە:

**پلەی یەکەم: ئەوەی نەقل کراوە لە پێغەمبەر ﷺ هەروەک نەقل کردنیان بۆ بڕی صاع و مُد، خەڵکی مەدینە صاعەکانیان لەسەر هەمان صاع-ی پێغەمبەر دروست کردووە، یان نەبوونی زەکات لەسەر سەوزە و میوە کە لە سەردەمی پێغەمبەردا لە خەڵکی وەرنەگیراوە و خەڵک ئەم زەکاتەیان دەرنەکردووە، یان ئەو شتانەی کە وەقف کراون بەهەمان شێوە زەکاتی ئەمانە لە خەڵکی وەرنەگیراون، ئەم جۆرەیان بە یەکدەنگی هەموو زانایان حوججەیە بەبێ خیلاف لە هەموو مەزهەبەکاندا.**

**پلەی دووەم: عەمەلی کۆنی خەڵکی مەدینە لە سەردەمی پێش کوژرانی ئیمام عثمان، ئەم جۆرەیان حوججەیە لە مەزهەبی مالك، دەقی ئیمام الشافعي لەسەرە کە بە یونس بن عبدالأعلى دەڵێ: گەر بینیت خەڵکە کۆنەکەی مەدینە لەسەر شتێک کۆکن ئەوا با لە دڵت هیچ گومانێک ڕات نەگرێت کە ئەم شتە حەقە، وە لە مەزهەبی ئیمام أحمد-یش ئەوەی خولەفای راشدین لەسەری ڕۆشتوون حوججەیە و شوێنکەوتنی واجبە، ئەوەشی لە أبو حنيفة گێڕدراوەتەوە ئەوەی لێ دەکەوێتەوە کە ووتەی خولەفای راشدین حوججەیە، وە نازانرێ هیچ عەمەلێکی خەڵکی مەدینە لە سەردەمی خولەفای راشدین پێچەوانەی سوننەتێکی پێغەمبەر ﷺ بوو بێت.**

**پلەی سێیەم: گەر لە بابەتێکدا دوو بەڵگە دژ بەیەک بوون وەک دوو فەرموودە و دوو قیاس، نەیزانی کامەی راجحترە و دانەیەکیان عەمەلی خەڵکی مەدینەی لەسەر بوو، ئەوا لەمەدا خیلاف هەیە، لە مەزهەبی مالك والشافعي تەرجیحی عەمەلی ئەهلی مەدینە دەکرێت، لە مەزهەبی أبو حنيفة تەرجیحی لایەنێک ناکرێ بە پشت بەستن بە عەمەلی ئەهلی مەدینە، وە لەلای هاوەڵانی أحمد-یش دوو ووتە هەیە، یەکەمیان: تەرجیح ناکرێ بە عەمەلی ئەهلی مەدینە، ئەمەش ووتەی**

**القاضي أبو يعلى و ابن عقيل-ە، دووەمیان: تەرجیح دەکرێ بە عەمەلی ئەهلی مەدینە، ئەمەش ووتەی أبو الخطاب و جگە لەویشە، وە ووتراوە کە ئەمەی دووەم دەقی ووتەی أحمد-ە، کە لە ووتەکەیدا دەڵێ: (گەر خەڵکی مەدینە فەرموودەیەکیان بینی و کاریان پێ کرد ئەوا ئەمە ئامانجە) وە أحمد فەتوای دەدا لەسەر مەزهەبی خەڵکی مەدینە وپێشی دەخست بەسەر مەزهەبی خەڵکی عیراق، وە حەزی نەدەکرد ڕەددی ئەهلی مەدینە بدرێتەوە هەروەک چۆن ڕەددی ئەهلی ڕەئی دەدرێتەوە، دەیووت: خەڵکی مەدینە شوێنی ئاثار کەوتوون، جا ئەمە ووتەی زۆربەی پێشەواکانە کە هاوڕای مالك-ن دەربارەی تەرجیح کردنی عەمەلی خەڵکی مەدینە.**

**پلەی چوارەم: عەمەلی سەردەمی دواتری خەڵکی مەدینە، ئایا ئەمە حوججەیەکی شەرعیە واجبە شوێنی بکەوین ؟ ئەوەی پێشەوایانی لەسەرە ئەوەیە کە حوججە نیە، ئەمەش ووتە زانا موحەقیقەکانی مەزهەبی مالك-ە، کە القاضي عبدالوهاب وجگە لەویش باسیان کردووە کە ئەم جۆرە عەمەلە نە ئیجماعە و نە حوججەیە لەلای زانا موحەقیقەکانی مەزهەبی مالك، لەوانەیە هەندێک لە هاوەڵانی مالك لە مەغریب بیکەن بە حوججە بەڵام هیچ دەق وبەڵگەیەکیان لەلا نیە لە پێشەواکانەوە بەڵکو ئەمانە ئەهلی تەقلیدن.** بڕوانە [مجموع الفتاوى : 20/306-320]

ووتم: بڕوانە ووتەکەی کە دەڵێ: أحمد حەزی نەدەکرد ڕەددی ئەهلی مەدینە بدرێتەوە هەروەک چۆن ڕەددی ئەهلی ڕەئی دەدرایەوە، ئەمەش شتێک نیە کە لە هەوا و هەوەسە أحمد ئەنجامی بدات، وە لە تەواوی ووتەکانی ابن تيمية-دا پشتگیرییەکی زۆر لە زانایانی مەدینە و عەمەلی ئەهلی مەدینە دەکات.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەو شوێنانەی کە مالك موخالەفەی فەرموودەی صەحیحی کردووە بە بیانووی ئەوەی عەمەلی ئەهلی مەدینە پێچەوانەیەتی ئەوا ووتەکەی مالك ڕەت کراوەیە بەبێ گومان، بۆیە زانایان فەرموودەی صەحیحی ئاحاد وەردەگرن و کاری پێدەکەن ئەگەرچی خیلافی عەمەلی ئەهلی مەدینەش بێت، جا بۆیە مالك و جگە لەویش کەس لێی قبوڵ نەکراوە فەرموودەی صەحیح ڕەت بکاتەوە بەهەر بیانوویەک بێت، بەڵام سەیرکەن ڕەت کردنەوەی کارکردن بە هەندێک

فەرموودەی ئاحادی صەحیح لەلای مالك بەهۆی ئەوەی پێچەوانەی عەمەلی ئەهلی مەدینەیە چەندە جیاواز و دوورە لە ڕەت کردنەوەی فەرموودەی صەحیح لەلایەن أبو حنيفة بە ووتەی زۆر بێ ئەدەب و ناشرین وەک: ئەمە بسڕەوە بە کلکی بەراز، ئەمە هیچ نیە، ئەمە خورافەیە، دواتر هەڵوێستی زانایان بەرامبەر أبو حنيفة و مالك زۆر جیاوازە ئەمەش بەڵگەیە کە جیاوازیەکی ڕوون هەیە لە نێوانیاندا لەم بابەتەدا، ئێمە ووتەی زانایانی سەلەفمان لەبەر دەست دایە دەربارەی ئەم کارەی مالك و أبو حنيفة، چیان ووتبێ دەربارەیان ئێمەش هەر ئەوە دەڵێین و لێی لانادەین، ئەو کەسەش کە پێی وایە مالك خاتری گیراوە بەڵام أبو حنيفة زوڵمی لێکراوە ئەوا تۆمەتێکی زۆر قێزەونی داوەتە پاڵ سەلەف هەست بکات یان نا، دواتر کەسێکی وەک أبو حنيفة کە هەموو گیانی کوفر و بیدعە و گومڕایی بووە چۆن لەگەڵ مالك دەکرێت بەیەک کە لە بابەتێکدا نەیپێکاوە و عوزرەکەی زۆر بەهێزترە لەهی أبو حنيفة ؟ لەگەڵ ئەوەشدا بە هەڵە دەڵێین هەڵە مالك بیکات یان هەر کەسێکی تر.

وە دەووترێ لەکاتی مونازەرەی نێوان أبو يوسف-ی قوتابی أبو حنيفة لەگەڵ ئیمام مالك، کاتێک أبو يوسف بە یاوەری هارون الرشيد دەچێتە مەدینە، مونازەرە دەکات لەگەڵ مالك دەربارەی صاع و زەکاتی سەوزەوات و وەقف، لەلای خەڵکی مەدینە صاع یەکسانە بە پێنج رطل و سێیەکی رطل بە رطلی عیراقی، لای حەنەفیەکان صاع یەکسانە بە هەشت رطل بە رطلی عیراقی، ئینجا مالك صاعی خەڵکی مەدینەی نیشان دەدات کە دەستاو دەست لە باب و باپیرانیان لەسەری ڕۆیشتوون خەڵکەکە تا دەگاتە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ وە پێی دەڵێ: ئایا پێت وایە ئەم خەڵکە هەموویان درۆ بکەن ؟ أبو يوسف دەڵێ: نەخێر درۆ ناکەن، گەر هاوەڵەکەشم -واتا أبو حنيفة- ئەمەی دیبوایە کە من بینیم ئەوا پەشیمان دەبوویەوە لە ڕەئیەکەی.

هەر چەندە لە هیچ کتێبێکدا بە سەنەد ئەم مونازەرەیەم نەدۆزیەوە بەڵام هێندە ناوبانگی هەیە مونازەرەکە کە پێویست بە گەڕان بەدوای سەنەد و حاڵی سەنەدەکە ناکات چونکە لەشتی ئاوادا شلی نواندن هەبووە لەلای زانایان بۆ نموونە سەر بڕینی الجعد بن درهم لەلایەن خالد بن

عبدالله القسري لەڕۆژی جەژنی قورباندا هەرچەندە بە هیچ سەنەدێکی صەحیح نەچەسپاوە بەڵام ناوبانگی چیرۆکەکە لەوە دەرچووە کە ڕەت بکرێتەوە بە بیانووی زەعیفی سەنەدەکەی بۆیە زانایان قبوڵیان کردووە و دەستاو دەستیان پێکردووە، جا لێرەدا دەڵێن: أبو یوسف ووتی: گەر ئەوەی من بینیم واتا صاعی سەردەمی پێغەمبەر أبو حنیفة-ش دیبوای ئەوا ڕەئی دەگۆڕی، کەواتە أبو حنیفة کەسێک بووە دوای پێگەیشتنی حەق ملکەچی حەقەکە بووە و لە ووتەی خۆی پەشیمان بۆتەوە، ئەمەش مانای ئەوە دەدات کە لەهەر شتێکدا موخالەفەی حەقی کردبێ لەبەر ئەوە بووە کە پێی نەگەیشتووە ئەگینا پێی گەیشتبوایە تەسلیم دەبوو.

لە وەڵامی ئەمەدا دەڵێین:

**یەکەم:** بینیمان أبو حنیفة کە چەندەها فەرموودەی صەحیحی پێگەیشت زۆر بێ ئەدەبانە ڕەتی کردەوە بەبێ ئەوەی هۆکاری ڕەت کردنەوەی باس بکات.

**دووەم:** ووتەی سفیان بن عیینة-مان هێنا کە دەڵێ: ئێمە سەرزەنشتی أبو حنیفة دەکەین لەوەی کە کاتێک فەرموودەی پێدەگەیشت وازی لە ڕەئیەکەی خۆی نەدەهێنا.

**سێیەم:** ووتەی مالك-مان هێنا کە دەڵێ: گەر أبو حنیفة دینگەیەکی دار یان بەرد ببینێ و بڵێ ئەم دینگەیە لە زێڕ دروستکراوە ئەوا واز ناهێنێت تا دەیکات بە زێڕ، کە ابن أبي حاتم لە شەرحی ئەم ووتەیەی مالك دەڵێ: واتا دوای ڕوون بوونەوەی هەڵەکەی وازی لێ ناهێنێت و بەڵگەی بۆ دەهێنێتەوە.

**چوارەم:** لەم بابەتەدا مەگەر کەسێک زۆر ملهور بێت ئینکاری بکات ئەگینا هەرکەسێک بەچاوی خۆی ببینێت شاری پێغەمبەر ﷺ هەمووی لەسەر صاعی پێغەمبەر ﷺ دەڕۆن ناڵێ من ئەم صاعەم پێ قبوڵ نیە و هەرئەوەی خۆم دامناوە ڕاستە ! هەر چەندە گەڕانەوە بۆ حەق باشترە لە درێژەدان بە باطل بەڵام لە حاڵێکی ئاوادا هەموو موسڵمانێک هیچ چارێکی نیە جگە لە تەسلیم بوون بۆیە ئەمە شتێک نیە ببێتە فەزیلەت بۆ أبو حنیفة گەر ئەنجامیشی دابوایە.

**پێنجەم:** ئەمە گومانی أبو یوسف-ە بە مامۆستاكەی نەک شتێک بێت بە حەقیقی لە أبو حنیفة بینرابێ، ئایا گەر أبو یوسف بیووتبا أبو حنیفة ئەم صاعەشی دیبوایە هەر ئینکاری دەکرد و لە ووتەی خۆی پەشیمان نەدەبوویەوە، ئەوکات قبوڵتان دەکرد ووتەکەی ؟ یان دەتانووت ئەمە گومانی أبو یوسف-ە کێ دەڵێ أبو حنیفة صاعەکەی دیبوایە پەشیمان نەدەبوویەوە، گومان هیچ شتێکی لەسەر بنیات نانرێ ؟ بێگومان ڕوونە ئەوەی دووەمتان دەووت، کەواتە ئەی بۆ لێرە گومانەکەی أبو یوسف وەردەگرن بەڵام حەقیقەتی أبو حنیفة پشت گوێ دەخەن کە چەندەها فەرموودەی زۆر بێ ئەدەبانە ڕەت کردۆتەوە ؟!

**شەشەم:** ووتەی أبو یوسف-مان هێنا کە دەڵێ: أبو حنیفة بە جەهمیەتی مرد، ئایا ئەم ووتەیەشی قبوڵ دەکەن ؟ یان تەنها گومانەکەی قبوڵ دەکەن ؟

**حەوتەم:** گریمان أبو حنیفة صاعی پێغەمبەر ﷺ دیبوایە پەشیمان دەبوویەوە، ئایا پێی نەگەیشتبوو عەقیدەی ئەهلی سوننە لە ئیماندا چۆنە بۆیە جەهمی و مورجیئە بوو ؟ ئایا پێی نەگەیشتبوو خروج کردن دروست نیە لە موسڵمانان بۆیە هانی خەڵکی دەدا بۆ خروج ؟ ئایا پێی نەگەیشتبوو قورئان مەخلوق نیە بۆیە ووتی مەخلوقە ؟ ئایا پێی نەگەیشتبوو فێڵ نیە لە شەرعدا بۆ گۆڕینی حەرام و حەلالەکان بۆیە فێڵی بەکار دەهێنا ؟ ئایا پێی نەگەیشتبوو فەتوادان بە ڕەئی نابێت بۆیە بە ڕەئی خۆی فەتوای دەدا ؟ ئایا پێی نەگەیشتبوو کە دەبێت ڕێز لە پێغەمبەر ﷺ و فەرموودەکانی بگیرێت بۆیە ئاوا بێ ڕێزی بەرامبەر فەرموودەکانی دەکرد ؟

## بڕگەی نۆیەم:
## لاوازی لە فەرموودەدا.

ئەوەی بۆنی زانستی جەرح و تەعدیلی کردبێ دەزانێ أبو حنیفة زەعیفە لە فەرموودەدا، وە فەرموودەشی زۆر کەم ڕیوایەت کردووە، بۆیە باسکردنی ئەوەندە بە پێویست نازانم چونکە لاوازی ڕاوییەک لە فەرموودەدا نابێتە هۆی لەکەدارکردنی عەقیدە و دینداریەکەی، چەندەها زانای زۆر پەیا بەرز هەن بەڵام لە فەرموودەدا زەعیفن، بۆیە نیازی ئەوەم نەبوو لەم کتێبەدا ئەم بەشەی تایبەت بە لاوازی أبو حنیفة لە فەرموودەدا بهێنم، بەڵام کاتێک بینیم هەندێک لە معاصرین بە جۆرێک دەمارگیریان بۆی هەیە پێیان ئەستەمە بڵێن بەڵێ لە فەرموودەدا زەعیف بووە، لەکاتێکدا توانای لەبەرکردنی نابێتە هۆی لەکەدارکردنی عەقیدە و عیبادەت و پلەی کەسەکە، کەچی لەمەشدا دەیانەوێت هەموو ئەو جەرحانەی بۆی کراوە هەڵیوەشێننەوە و بڵێن فەرموودەکانی بۆ استشهاد بە کەڵک دێت تەنانەت هەندێکیان دەڵێن فەرموودەکانی حەسەنن ! شتێکی تریش کە بەدیم کردووە لەوانەی کە بەرگری لە أبو حنیفة دەکەن و بە پێشەوای دەزانن ئەوەیە کە لە بابەتی فەرموودەدا زۆر بە ئاسانی ووتەی زانایان وەردەگرن دەڵێن بەڵێ أبو حنیفة زەعیف بووە و ئینکاری لێ ناکەین، ئەمە لەکاتێکدا زۆربەی ئەو زانایانەی کە جەرحی أبو حنیفة-یان کردووە لە ڕیوایەتدا کەسانێکن کە دوای مردنی أبو حنیفة لە دایکبوونە، بەشێکیان زیاتر لە 100 ساڵ دوای أبو حنیفة ژیاوە، کەچی زۆربەی لە دەمارگیران بۆ أبو حنیفة بەبێ ئینکاری کردن زۆر بە ئاسانی ووتەی ئەمانە وەردەگرن چونکە دەزانن زەعیفی لە ڕیوایەتدا کاریگەری بەسەر عەقیدەوە نیە و عەیبداری ناکات، بەڵام کە دێینە سەر بابەتی ووتنی قورئان مەخلوقە و جەهمی بوون و مورجیئە بوون و گاڵتەکردن و ڕەتکردنەوەی فەرموودە و خەواریج بوون و فەتوادان بە فێڵ و ڕەئی، ووتەی زانایانی سەردەمی أبو حنیفة نەقل دەکەین کەچی قبوڵی ناکەن و ڕەتی دەکەنەوە هەر یەکێکیان بە بیانوویێک چونکە دەزانن ئەم ڕیوایەتانە عەقیدەی أبو حنیفة لەکەدار دەکات، جا لەخۆتان بپرسن ووتەی کامەیان لەپێشترە قبوڵ بکرێ ئەوانەی لەگەڵی ژیاون و باسی عەقیدەکەیان کردووە یان

ئەوانەی دوای خۆی هاتوون باسی ڕیوایەتەکانیان کردووە ؟ بۆچی ئەوەی دووەم وەردەگرن و ئەوەی یەکەم ڕەت دەکەنەوە کە ئەوەی یەکەم بەهێزترە لە هەموو ڕوویەکەوە ؟!

# ووتەی زانایانی جەرح و تەعدیل دەربارەی أبو حنیفة:

تێبینی: تەرجومەی حەرفی بۆ دەستەواژەکانی جەرح و تەعدیلی زانایان ناکەم، چونکە هەر دەستەواژەیەک مانایەکی خۆی هەیە و بەپێی زاناکە هەندێک جار ماناکەی دەگۆڕێ، بۆیە هەڵەیە دەستەواژەکانی جەرح و تەعدیل تەرجومە بکرێن مەگەر دەستەواژەکە زۆر ڕوون بێت وەک: درۆزنە و هاوشێوەی ئەمە کە لە تەرجومەکردنی هیچ کێشەیەک ڕوو نەدات لە ڕووی گەیاندنی ماناکە وەک خۆی.

**البخاري** دەڵێ: **مورجیئە بوو، سكتوا عنه وعن رأيه وعن حديثه.**

[التاريخ الكبير: القسم الثاني/المجلد الرابع/81]

ووتم: (سكتوا عنه) لەلای بوخاری واتا (تركوه) مەتروکە، وەک الذهبي دەڵێ: دوای ووردبوونەوە بۆمان دەرکەوت (سكتوا عنه) بوخاری ئەم ووشەیە بۆ ئەو ڕاوییانە بەکاردەهێنێت کە مەتروکن، کەواتە بوخاری دەڵێ: تەرکیان کردووە خۆیی و ڕەئیەکەی و فەرموودەکانی، یەکێک لە جاهیلە دەرمارگیرەکان بۆ أبو حنيفة دەیووت: بوخاری دەڵێ: سكتوا عنه واتا بێدەنگ بوونە لێی، ئێمەش بێدەنگ دەبین لێی !

**البخاري** دەڵێ: **ئەوانەی دەربارەیان ووتوومە (منكر الحديث) ڕیوایەتیان لێوە ناکەم، وە ئەگەر ووتم (سكتوا عنه) بەهەمان شێوە ڕیوایەتیان لێوە ناکەم.** [التاريخ الأوسط: 107/2]

**مسلم** دەڵێ: **ئەهلی ڕەئیە، مضطرب الحديث، فەرموودەی صەحیحی زۆر نیە.**

[الكنى والأسماء: 963]

**النسائي** دەڵێ: **ليس بالقوي في الحديث، وە هەڵەی زۆرە سەرەڕای کەمی ڕیوایەتەکانی.**
[الضعفاء والمتروكين : 614]

**ابن عدي** دەڵێ: **له أحاديث صالحة، زۆربەی ئەوانەی ڕیوایەتی دەكات هەڵەیە و گۆڕانی پێت و زیادكردن لە سەنەد و مەتنەكانیدا هەیە، هەروەها هەڵەكردن لەناوی ڕاوییەک، جا زۆربەی ئەوانەی ڕیوایەتی دەكات ئاوایە، وە لە هەموو ڕیوایەتەكانیدا هیچی صەحیح نیە جگە لە سەرووی 10 فەرموودە نەبێ، لەكاتێكدا لەوانەیە زیاتر لە 300 فەرموودەی ڕیوایەت كردبێ لە فەرموودەی ناسراو و نامۆ هەمووشی بەم شێوەیە، چونكە ئەو ئەهلی حەدیث نیە، وە لەو كەسانەش ڕیوایەتی ناكات كە ئەهلی حەدیث بن.** [الكامل في ضعفاء الرجال : 10/133-134]

**ابن سعد** دەڵێ: **زەعیف بوو لە فەرموودەدا.** [الطبقات الكبير : 8/489]

**العقيلي** دەڵێ: حدثنا عبدالله بن أحمد ووتی: **بیستم باوكم دەیووت: فەرموودەی أبو حنيفة زەعیفە.** [الضعفاء : 6/165] (سەنەدەكەی صەحیحە).

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: حدثنا حجاج بن حمزة قال حدثنا عبدان ابن عثمان ووتی: **بیستم ابن المبارك دەیووت: أبو حنيفة داماو بوو لە فەرموودەدا.**
[الجرح والتعديل : القسم الأول/المجلد الرابع/450] (سەنەدەكەی صەحیحە).

**ابن حبان** دەڵێ: **فەرموودە لە پیشەی ئەودا نەبوو، 130 فەرموودەی گێڕایەوە لە دونیادا لەوەندە فەرموودەیە زیاتری نەبوو، لە 120 فەرموودەدا هەڵەی كرد، یان سەنەدەكەی وەردەگێڕا یان مەتنەكەی دەگۆڕی بەشێوەیەک هەر نازانرێ، جا كاتێک هەڵەی لە صەوابی زیاتر بوو شایستەی ئەوەبوو كە تەرك بكرێ لە احتجاج پێكردنی لە نەقل كردنی فەرموودەدا.**
[المجروحين : 2/406]

**الدارقطني** دەڵێ: **كەس ئەم فەرموودەیەی لە موسى بن أبي عائشة بە موسنەدی ڕیوایەت**

**نەكردووە جگە لە أبو حنیفة و الحسن بن عمارة، ئەوانیش هەردووكیان زەعیفن.**
[سنن الدارقطني : 321/1]

**ابن عدي** دەڵێ: حدثنا علي بن أحمد بن سليمان حدثنا ابن أبي مريم ووتی: **پرسیارم لە يحيى بن معين كرد دەربارەی أبو حنيفة، ووتی: فەرموودەكانی نانوسرێنەوە.**
**[الكامل في ضعفاء الرجال : 121/10] (سەنەدەكەی صەحیحە).**
ووتم: واتا بۆ اعتبار-یش بە كەڵک نایەت چ جای احتجاج.

**العقيلي** دەڵێ: حدثنا محمد بن عثمان ووتی: **بیستم پرسیار لە يحيى بن معين كرا دەربارەی أبو حنيفة، ووتی: زەعیف بوو لە فەرموودەدا. [الضعفاء : 165/6] (سەنەدەكەی حەسەنە).**
ووتم: لە يحيى بن معين ڕیوایەت كراوە كە تەوسیقی أبو حنيفة-ی كردووە، لە بەشی دووەم باسی دەكەین.

**العقيلي** دەڵێ: حدثنا عبدالله بن أحمد ووتی: **بیستم باوكم دەیووت: فەرموودەی أبو حنيفة زەعیفە و ڕەئیشی زەعیفە. [الضعفاء : 165/6] (سەنەدەكەی صەحیحە).**

**الترمذي** دەڵێ: بیستم محمود بن غيلان دەیووت: بیستم المقرئ دەیووت: **بیستم أبو حنيفة دەیووت: زۆربەی ئەو فەرموودانەی بۆم گێڕانەوە هەڵەیە.**
**[العلل الكبير : 388] (سەنەدەكەی صەحیحە).**
ووتم: دان پێدانانی خۆی گەورەترین بەڵگەیە.

**العقيلي** دەڵێ: حدثنا سليمان بن داود القزاز قال سمعت أحمد بن الحسن الترمذي دەیووت: **بیستم أحمد بن حنبل دەیووت: أبو حنيفة درۆ دەكات. [الضعفاء : 164/6] (سەنەدەكەی صەحیحە).**
ووتم: (يكذب) بە لەهجەی حیجازییەكان هەندێكجار بە مانای (يخطئ) دێت واتا هەڵە دەكات، بەڵام ئیمام أحمد حیجازی نیە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا عبدالوارث حدثنا قاسم حدثنا أحمد بن زهير ووتی: **باوكم لەسەر ئەصلی كتێبەی فەرموودەی ئەهلی كوفەی دەخوێندەوە بۆمان، جا كاتێک گەیشتبوایە بەو فەرموودانەی كە لە أبو حنيفة-ەوە ڕیوایەت كراون بۆی نەدەخوێندینەوە.** [الانتقاء : 148]

ووتم: عبدالوارث بن سفيان بن جبرون پتەوترین كەسە لە ڕیوایەتی قاسم بن أصبغ-دا وەک الذهبي باسی كردووە، قاسم بن أصبغ و أحمد بن زهير كە ناسراوە بە ابن أبي خيثمة دوو حافزن، بۆیە كەمترین شت بووترێ دەربارەی ئەم سەنەدە ئەوەیە كە حەسەنە.

**مسلم** دەڵێ: **ڕیوایەتی أبي سنان عن علقمة لە مەتنی ئەم فەرموودەیەدا كە دەڵێ: (جبريل عليه السلام ووتی هاتووم پرسیاری شەرائیعەكانی ئیسلامت لێ بكەم) ئەم بڕگەیە زیادەیەكی دروستكراوە لە هیچ لەفزێكدا بوونی نیە، ئەم بڕگەیە كەسانێک زیادیان كرد لە ڕیوایەتی ئەم فەرموودەیەدا وەک النعمان بن ثابت (واتا: أبو حنيفة) و سعيد بن سنان و ئەوانەی ڕێگای ئەمانەیان گرتۆتە بەر لە ئیرجاء، ویستیان ئەمە بوو لەم كارەدا كە ووتەكەی خۆیان لە بابەتی ئیماندا بەڕاست دابنێن و عەقیدەی ئیرجائی لەسەر دابمەزرێنن، ئەم كارەش لە زیاتر لاوازكردنی ووتەكەیان هیچی تر نەبوو، وە زیاتر لە حەق دووركەوتنەوە كە لەخۆیانەوە شتیان زیادكرد لە ڕیوایەتی فەرموودەدا.** [التمييز : 199]

ووتم: أبو حنيفة لە فەرموودەی پرسیاركردنی جبريل لە پێغەمبەرﷺ دەربارەی ئیمان و ئیسلام و ئیحسان لەخۆیەوە ووشەیەكی زیاد كردووە تا بەم هۆیەوە نوێژ و زەكات و حەج و ڕۆژووگرتن لە ئیماندا دەربهێنێت، هەروەک ئیمام مسلم ڕوونی كردۆتەوە، ئەمەش تۆمەتێكی زۆر پیسە كە ئاڕاستەی كراوە ئەویش درۆكردنە لە فەرموودەدا لەپێناو سەرخستنی عەقیدەكەی.

**ابن عدي** دەڵێ: حدثنا محمد بن أحمد بن حماد سمعت عمرو بن علي يقول سمعت يحيى بن سعيد دەیووت: **پرسیارم لە سفيان كرد ووتم: فەرموودەی ئافرەتی مورتەدت بیستووە لە عاصم ؟ ووتم: بیستووتە كەس لە عاصم-ەوە ڕیوایەتی بكات ؟ ووتی: كەسی سیقە ڕیوایەتی نەكردووە.**

[الكامل في ضعفاء الرجال : 120/10] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: فەرموودەی ئافرەتی مورتەد، ئەو فەرموودەیە کە دەڵێ: ئافرەت مورتەد بێتەوە بەند دەکرێ و ناکوژرێ، ئەم فەرموودەیەش تەنها أبو حنیفة ڕیوایەتی کردووە لە عاصم ئەویش لە أبو رزین ئەویش لە ابن عباس ﵁ ئەمەش زەعیفە، سفیان کە دەڵێ: کەسی سیقە ڕیوایەتی نەکردووە لە عاصم مەبەستی أبو حنیفة-یە، حەنەفیەکان لەم بابەتەدا پێچەوانەی هەر سێ مەزهەبەکەی ترن، لەلای سێ مەزهەبەکە مورتەد دەکوژرێ ژن بێ یان پیاو، لای حەنەفیەکان ژن مورتەد بێتەوە ناکوژرێ گەر لە دار الحرب بێت.

**عبدالله** دەربارەی فەرموودەی ئافرەتی مورتەد دەڵێ: **باوکم ووتی: أبو حنیفة ئەم فەرموودەیەی دەگێڕایەوە لە عاصم.** [العلل ومعرفة الرجال : 4236]

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا عبيدالله بن عمر الواعظ قال حدثنا أبي قال حدثنا أحمد بن محمد بن مغلس قال حدثنا مجاهد بن موسى قال حدثنا أبو سلمة منصور بن سلمة الخزاعي ووتی: **بیستم أبو بكر بن عياش فەرموودەکەی عاصم-ی باسکرد، ووتی: والله أبو حنیفة هەرگیز نەیبیستووە.**
[تاريخ بغداد : 577/15] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: مەبەستی ئەوەیە تەدلیسی کردووە نەک مەبەستی درۆ بێت، چونکە أبو حنیفة بە صیغەی عەنعەنە ڕیوایەتی کردووە تەصریحی نەداوە بە سەماع.

(أحمد بن محمد بن مغلس) سیقەیە کونیەکەی أبو عبدالله البزاز-ە، کەسێکی تر هەیە بەناوی (أحمد بن محمد بن مغلس) کونیەکەی أبو العباس الحماني-ە، ناسراوە بە أحمد بن الصلت کەسێکی درۆزنە، جا ئەم دووانە تێکەڵ مەکەن کە ناوی سیانیان وەک یەکە.

بڕوانە [تاريخ بغداد : 285/6] ژیاننامەی هەردووکیان بەدوای یەکتردا هاتووە.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: أخبرنا إبراهيم بن يعقوب الجوزجاني فيما كتب إلي قال حدثني إسحاق بن راهويه ووتی: بیستم جرير دەیووت: **محمد بن جابر اليمامي ووتی: أبو حنیفة کتێبەکانی حماد-ی لە**

**من دزی. [الجرح والتعديل : القسم الأول/المجلد الرابع/450] (سەنەدەكەی صەحیحە).**

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: حدثنا أبي حدثنا الحميدي حدثنا **وكيع ووتی: حدثنا أبو حنيفة ووتی: بیستم لە عطاء. وكيع دەڵێ: ئەگەر گوێ بیستی بوو بێ !**
**[الجرح والتعديل : القسم الأول/المجلد الرابع/449] (سەنەدەكەی صەحیحە).**
ووتم: ئەمەش گومان كردنی وكيع-ە لە أبو حنيفة كە درۆ بكات لە عطاء-ی نەبیستبێ، چونكە ڕاوی ووتی بیستم لە فلان كەس، ئەوا دەبێت وای دابنێین بیستوویەتی مەگەر تەنها ڕاوییەكە گومانی درۆی لێ بكرێ یان درۆزن بێت.
بۆیە محقق-ی تاريخ بغداد(١) بەم ووتەیەی وكيع قەڵس بووە و دەڵێ: مادام أبو حنيفة ووتی بیستم ئیتر هیچ مانایەكی نامێنێتەوە كە وكيع گومان دروست بكات بیستوویەتی یان نا.
منیش دەڵێم: بیستبێتی یان نا ئەوە مەبەستی ئێمە نیە، مەبەستی ئێمە ئەوەیە كە وكيع سیقەی بە أبو حنيفة نەبووە.

**المعلمي** لە وەڵامی ووتەیەكی الكوثري كە وتوویەتی (سفيان الثوري و الأوزاعي مەزهەبەكانیان بوونی نەماوە وەك لەكەدار كردنیان) دەڵێ: **هیوا هەبوون بە پاداشت لەسەر شوێن كەوتنی حەق لەمەدا الثوري والأوزاعي پشكی فراوانیان هەیە بەهۆی بڵاوكردنەوەیان بۆ سوننەت بە عیلم و عەمەل، ئەمەش شەش كتێبەكەی فەرموودەیە كە خەڵكی دەستاو دەستی پێدەكەن پڕیەتی لە فەرموودەی ڕیوایەت كراو لە ڕێگای الثوري و الأوزاعي، وە یەك فەرموودەش لەم كتێبانەدا نیە كە أبو حنيفة و هاوەڵە ناودارەكانی ڕیوایەتیان كردبێ، وە ئیمام أبو عبدالله محمد بن إسماعيل البخاري لە (تاريخ الكبير) لە ژیاننامەی الثوري دەڵێ: قال لنا عبدان عن ابن المبارك: من گەر بم ویستایە سفيان ببینم صەلەوات لێدەدات دەمبینی، وە بم ویستایە بە فەرموودەناسی ببینم دەمبینی، وە گەر بم ویستایە لە بابەتی فیقهی وورد ببینم دەمبینی، وە مەجلیسێك كە بینیومە هیچ صەلەواتی لەسەر پێغەمبەر ﷺ لێنەدراوە مەجلیسی النعمان بووە. [التنكيل : 435/1]**
ووتم: دەبێ ئەوانەی كە دەمارگیرن بۆ أبو حنيفة كە بە زۆر دەیانەوێ وای نیشان بدەن سیقەیە

فەرموودەكانی بە حسن و صحیح دادەنێن لە قیامەت چ وەڵامێكی پێغەمبەرﷺ بدەنەوە كە لەبڕی بەرگری كردن لە فەرموودەكانی و پاك ڕاگرتنی لە فەرموودەی درۆ و زەعیف هاتوونە بەرگری لە أبو حنیفة دەكەن و فەرموودە زەعیفەكانی قبوڵ دەكەن ؟!

ولله الحمد ئەوانەی قسەیان بە أبو حنیفة ووتوە ناوەكانیان سەنەدی فەرموودەكانی پڕ كردووە، لە هەموو كتێبێكی فەرموودەدا ڕیوایەتیان هەیە، كەچی أبو حنیفة نە لە كتێبە صەحیحەكاندا نە لە سوننە و مەسانیدەكان ڕیوایەتی هەیە.

## بڕگەی دەیەم:

# ئەو ووتانەی دەربارەی ووتراوە بە شێوەیەکی گشتی بەبێ باسکردنی هۆکارەکەی

هەرکەسێک کە هەڵەی زۆربوو لە عەقیدەدا ئیترزانایان قسەی پێ دەڵێن بەبێ ئەوەی باسی هۆکارەکەی بکەن، ئەمەش لەبەر ڕوونی حاڵی کەسەکەیە چونکە ئەوەندە هەڵەی زۆرە کەس ناپرسێ بۆ وادەڵێن دەربارەی، جا هەر کەسێکیان بە هۆکارێک قسەی پێ دەڵێت، هەیانە لەبەر ئیرجائەکەی هەیانە لەبەر خروجەکەی هەیانە لەبەر جەهمیەتەکەی هەیانە لەبەر ڕەئیەکانی هەیانە لەبەر ڕەت کردنەوەی فەرموودە و بێ ڕێزی کردنی بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ ..هتد، جا ئەو قسانەی کە دەربارەی ووتراوە بەبێ باسکردنی هۆکارەکەی بەوە لێکدەدرێتەوە کە بەهۆی کوفر و بیدعە و هەڵەکانی پێشووی بووە.

**ابن الجارود** لە کتێبی (الضعفاء والمتروكين) دەڵێ: **النعمان بن ثابت أبو حنيفة خيلاف هەبووە دەربارەی موسڵمان بوونی.** [ابن عبدالبر نەقلی کردووە - الانتقاء : 150]

ووتم: ئایا کەسێک خیلاف هەبێت لەسەری لەنێوان موسڵمان بوون و نەبوون، شایستەی ئەوەیە بکرێت بە پێشەوا و نەیارانی بە خەواریج وەسف بکرێن ؟ ئەمە لەکاتێکدا زۆربەی ئەوانەی تەکفیریان نەکردووە بە گومڕا و بیدعەچیان زانیوە نەک بە پێشەوای بزانن، جا بۆیە کە دەووترێ خیلاف هەیە مانای ئەوەیە هەندێک تەکفیری دەکەن و هەندێک تەبدیعی دەکەن، نەک بەو مانایە بێت هەندێک تەکفیری بکەن و هەندێکیش بڵێن ئیمامە.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني محمد بن هارون حدثنا أبو صالح ووتی: **بيستم يوسف بن أسباط دەيووت: أبو حنيفة لەسەر فيطرەت لەدايک نەبووە.** [السنة : 378] (سەنەدەکەی حەسەنە).

ووتم: لەبەر خراپیەکەی وەک موبالەغە کردن وادەڵێ، ئەگینا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (كل مولود يولد على الفطرة) هەموو منداڵێک لەسەر فیطرەت لە دایک دەبێ کە ئیسلامەتیە، وە

لەوانەشە مەبەستی ئەوە بێت کە هەر لە سەرەتاوە الله بۆی نوسیوە کە بە کافری دەمرێت، هەر چەندە فیطرەت لەلای سەلەف بە چەند مانایەک هاتووە کە هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ یەک شت ئەویش ئیسلامە، جا با بڵێین یوسف بن أسباط زیادەڕەوی کردووە لەم تەعبیرە ئایا خودی تەعبیرەکە بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە أبو حنیفة-ی بە شتێکی زۆر پیس و خراپ داناوە ؟ ئێمە مەبەستمان دەرخستنی هەڵوێستی زاناکانە بەرامبەر أبو حنیفة بێگومان ئەم ووتەیە بەرامبەر کەسێک دەووترێ کە لە پیسیدا گەیشتبێتە لوتکە لە بیروڕای خاوەن ووتەکەدا.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني محمد بن هارون حدثنا أبو صالح ووتی: بیستم الفزاري دەیووت: **الأوزاعي و سفیان (الثوري) دەیانووت: لە ئیسلامدا هیچ کەسێک لەدایک نەبووە شوومتر بێ بۆ سەر ئەم ئوممەتە لە أبو حنیفة.** [السنة : 238] **(سەنەدەکەی حەسەنە).**

**أبو بكر المروزي** دەڵێ: بیستم بندار دەیووت: **بیستم عبدالرحمن بن مهدي دەیووت: هیچ فیتنەیەک لە ئاسمانەوە دانەبەزیوە بۆ سەر زەوی زیان بەخشتر بێ لە أبو حنیفة.**
[أخبار الشيوخ وأخلاقهم : 276] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

**الكوسج** دەڵێ: **بە أحمد-م ووت: کەسێک پاداشت وەردەگرێت لەسەر ئەوەی ڕقی لە هاوەڵانی أبو حنیفة ببێتەوە ؟ ووتی: ئەرێ والله.** [مسائل الكوسج للإمام أحمد و إسحاق بن راهويه : 3441]

**البخاري** دەربارەی أبو حنیفة دەڵێ: **بڕوای وایە بەرازی ووشکانی جائیزە، وە بڕوای بە خروج هەیە بە شمشێر لەسەر ئوممەت، وە بڕوای وایە فرمانی الله لە ڕابردوو و داهاتوودا مەخلوقە، وە بڕوای وانیە نوێژ لە ئیماندا بێت.** [خير الكلام في القراءة خلف الإمام : 38]

ووتم: هەر چەندە ئەم ووتەیە هۆکارەکەی باسکراوە بەڵام بۆیە لە بڕگەکانی تر نەمهێنا چونکە دەبوایە لە بڕگەی ووتنی قورئان مەخلوقە و فەتوادان بە ڕەئی و ئیرجاء و خروج ئەم ووتەیە چوار جار دووبارە بکەمەوە، بۆیە لێرەدا هێنام تا یەکجار ببێتە بەڵگە بۆ هەر چوار بڕگەکە.

البخاري لەم ووتەیەدا چوار شتی یەکجار گەورەی باسکردووە دەربارەی أبو حنيفة، یەکەمیان: حەلال کردنی حەرامێک کە ئیجماعی لەسەرە ئەویش گۆشتی بەرازی ووشکانیە ئەو بەرازەی کە پێستەکەی ڕەشە، دووەمیان: خروج کردن، سێیەم: ووتنی قورئان مەخلوقە، چوارەمیان: ئیرجاء کە دەرهێنانی کردەوەیە لە ئیمان، ئێوەش هەر بڵێن ئیمامە بەکوێرایی چاوی خەواریجەکان ! بەڵام نازانم بۆ کەس جورئەت ناکات قسە بەو ئیمامانە بڵێت کە قسەیان بە أبو حنيفة ووتوە کەچی کاتێک ئێمە قسەی ئەو ئیمامانە نەقل دەکەین و شوێنی ئەوان دەکەوین سەنگەرمان لێدەگرن ؟!
ابن تيمية وەک باقی خەلەف بەرگری لە أبو حنيفة دەکات و دەڵێ: بابەتی بەرازی ووشکانی ڕاست نیە بۆ ناشرین کردنی دراوەتە پاڵی !
البخاري زۆر زاناتر و شارەزاترە لە ابن تيمية، وە زۆریش شارەزاترە بە حاڵی أبو حنيفة و مەزهەبەکەیان، بۆیە لە زۆربەی کتێبەکانیدا هەر هەلێکی دەست کەوتبێ بۆ ڕەددانەوەیان درێغی نەکردووە، البخاري دەربارەی خۆی دەڵێ: دانەنیشتم لە مەجلیس بۆ فەرموودە ووتنەوە تاکو فەرموودەی صەحیح و زەعیفم لەیەکتر جیاکردەوە، وە تاکو سەیری کتێبەکانی ئەهلی ڕەئیم کرد، گەر لەسەر ووتەکەی ابن تيمية بڕۆین دەبێ البخاري تۆمەتبار بکەین !

**العباس بن مصعب** دەڵێ: **نعيم بن حماد چەند کتێبێکی نوسی لە ڕەتدانەوەی أبو حنيفة، وە محمد بن الحسن-ی هەڵوەشاندەوە.** [سير أعلام النبلاء : 599/10]

**القاضي عياض** دەڵێ: **القاضي إسماعيل بن إسحاق المالكي کتێبی نوسیوە لە ڕەتدانەوەی أبو حنيفة.** [ترتيب المدارك : 291/4]

**أبو النجيب سداد بن إبراهيم : قەصیدەیەکی درێژی هەیە کە تێیدا ڕەددی أبو حنيفة دەداتەوە. بڕوانە** [بغية الطلب في تاريخ حلب : 4196/9]

**أبو نعيم الأصبهاني : لەکتێبی (حلية الأولياء وطبقات الأصفياء) ناوی نزیکەی 700 زانا و عابید وزاهید دەهێنێت وەک ئەولیاء باسیان دەکات، زۆرێک لەوانەی تێدایە کە لەگەڵ أبو حنيفة**

**ژیاون بەڵام ناوی أبو حنیفة-ی تێدا نیە کە ئەوکات یەکێک بووە لەسەر مەزهەبەکان و مەزهەبەکەی بە باشی تەشەنەی کردووە، لەهەمان کاتدا هەندێک ڕیوایەت نەقل دەکات کە لە دژی أبو حنیفة-یە.**

*أبو زرعة الرازي* دەڵێ: **ئەهلی ڕەئی توشی فیتنە ببون بەهۆی أبو حنیفة-ەوە، ئێمەش گەنج بووین لەگەڵ ئەو خەڵکە دەڕۆیشتین، وە من خەریکی کۆکردنەوەی فەرموودەکانی أبو حنیفة بووم پرسیاری ئەم کارەم لە أبو نعیم کرد، وە پێم وابوو کارێکی چاک دەکەم، الحمیدي کتێبی (الرد على أبي حنیفة)ی دەخوێندەوە منیش خەریک بوو هەڵسمەوە بۆی، تاکو الله منەتی بەسەردا کردین گومڕایی ئەوانمان زانی.** [سؤالات البرذعي لأبي زرعة : 1008]
ووتم: حاڵی أبو زرعة و زۆرینەی خەڵکی خوراسان چەندە لە حاڵی خەڵکی ئێستا دەچێت کە هەموویان وادەزانن أبو حنیفة ئیمامە و کەس نابێت قسەی پێ بڵێ، کاتێک کتێبێکی وەک کتێبەکەی (الحمیدي) دەبینن توڕە و قەڵس دەبن پێی، وادەزانن هێرش کراوەتە سەر ئیسلام !
بڕوانە ووتەکەی کە دەڵێ (ئێمەش لەگەڵ ئەو خەڵکە دەڕۆیشتین) واتا چاوت داخە و خەڵکی لەسەرچی بوون تۆش هەر لەسەر ئەوە بڕۆ، ئەمڕۆش چەندە زۆرن ئەوانەی کە بێ ئاگان لە کتێبەکانی سەلەف و هەر لەسەر ئەوە دەڕۆن کە بیستوویانە و بۆیان باسکراوە، بگرە کاتێک ئەو شتانە دەبیستن کە لە سەلەفەوە ڕیوایەت کراوە خەریکە پەلامارت بکەن وەک أبو زرعة کە ویستی پەلاماری الحمیدي بدات.

*أبو بكر المروزي* دەڵێ: **القاسم بن محمد بن الحارث هاتە لامان پرسیارمان لێیکرد دەربارەی قەصیدەکەی أبو تمیلة دەربارەی ابن المبارك، ووتی: بیستم إسحاق بن راهویە دەیووت: من ئەهلی ڕەئی بووم، کاتێک ویستم بچم بۆ حەج سەیری کتێبەکانی عبدالله بن المبارك-م کرد، جا ئەو فەرموودانەم تێیدا دەرهێنا کە موافقی ڕەئی أبو حنیفة-یە، گەیشتە نزیکەی 300 فەرموودە، ووتم: پرسیاری ئەم باسانە لە شێخەکانی عبدالله بن المبارك دەکەم ئەوانەی لە حیجاز و عیراقن، وە من پێم وابوو کەس جورئەت ناکات موخالەفەی أبو حنیفة بکات، کاتێک چوومە**

**بەصرە لەلای عبدالرحمن بن مهدي دانیشتم، پێی ووتم: تۆ خەڵکی کوێی ؟ ووتم: خەڵکی مرو، جا ڕەحمەتی نارد بۆ ابن المبارك (چونکە ئەویش خەڵکی مرو بوو) عبدالرحمن زۆر ابن المبارك-ی خۆش دەویست ووتی: هیچ شیعرێکت لایە بەسەر ابن المبارك-دا بیڵێی ؟ ووتم: بەڵێ، منیش شیعرەکەی أبو تميلة يحيى بن واضح الأنصاري-م بۆ ووت، عبدالرحمن-یش هەر دەگریا منیش هەربۆم دەووت تا گەیشتە ئەوەی ووتم: (وبرأي النعمان كنت بصيرا) -واتا: بە ڕەئی أبو حنيفة من بەرچاو ڕۆشنم- عبدالرحمن پێی ووتم: بێدەنگ بە قەصیدەکەت تێکدا، منیش ووتم: دوای ئەم دێڕانە دێڕی جوانی تێدایە، ووتی: وازی لێ بهێنە، ڕیوایەتەکانی عبدالله بن المبارك-ت لەبیرە لە أبو حنيفة-ەوە لە کتێبی مناقب ؟ نازانین ابن المبارك توشی هیچ زەللەیەک بوو بێت لە عیراقدا ئیللا ئەوە نەبێت کە ڕیوایەتی کردووە لە أبو حنيفة، وە خۆزگە دەخوازم کە ڕیوایەتی لەو نەکردبوایە ئامادەم لەپێناوی ئەم خۆزگەیەم زۆربەی ماڵەکەم ببەخشم، إسحاق دەڵێ ووتم: ئەی باوکی سعيد بۆچی ئاوا قسە بە أبو حنيفة دەڵێی ؟ گەر ئەو فەتوا بدات بە ڕەئی، مالك و سفيان و الأوزاعي-ش فەتوا دەدەن بە رەئی، ووتی: أبو حنيفة دەهێنیتەوە هاوشانی ئەمانە ؟! أبو حنيفة لە عیلمدا بەهیچ ناچێت جگە لە ووشترێکی دەرکراوی تەنها کە لە دۆڵێکی ووشکدا دەلەوەڕێ، هەموو ووشترەکانی تریش لە دۆڵێکی تردا دەلەوەڕن، إسحاق دەڵێ: پاشان سەیرم کرد بینیم خەڵکی دەربارەی أبو حنيفة جیاوازن لەوەی کە ئێمە لەسەری بووین لە خوراسان.**

[أخبار الشيوخ وأخلاقهم : 275] (سەنەدەکەی صەحیحە).

ووتم: پێت وایە عبدالرحمن بن مهدي قەدری ابن المبارك نەزانێت کە بەم شێوەیە باسی دەکات ؟ سەیرکە سەرەتا بۆی دەگریەت و ڕەحمەتی بۆ دەنێرێت، چونکە ابن المبارك زانایەکی عابید و موجاهید و خاوەن وەرع و زوهد و سەخاوەت و هەرچی وەسفی جوان هەیە تێیدا کۆبۆتەوە، بەشێوەیەک بووە کە سفيان الثوري کە شێخی ابن المبارك بووە دەڵێ: هەوڵمدا ساڵێک وەک ابن المبارك بژیم کەچی نەمتوانی سێ ڕۆژیش وەک ئەو بژیم، بەڵام کاتێک إسحاق بن راهويه لە هەڵەدا شوێنی ابن المبارك دەکەوێ ببینە عبدالرحمن چۆن هەڵوێستی دەگۆڕێ و کارەکەی ابن المبارك بە زەللە ناو دەبات، سەیری ئەوە ناکات ابن المبارك کێیە و چ پلەیەکی هەیە بە هەڵە دەڵێ هەڵە، نەک

وەک ئەوانەی ئەمڕۆ دەڵێن موجاهیدان وتوویانە فلان ئیمامە تۆش لە ماڵەکەی خۆت دانیشتووی دەڵێی نەخێر ئیمام نین کافرن، تۆ زیرەکتری لەوان ؟! قەدری موجاهید لەسەر سەرم هەروەک چۆن عبدالرحمن قەدری ابن المبارك-ی گرت، بەڵام بە هەڵە دەڵێین هەڵە، موجاهید مەعصوم نیە کە ووتمان لەمەدا نەیان پێکاوە مانای ئەوە نیە بێ ڕێزی دەکەین بەرامبەریان بەڵام حەقمان لە هەموو کەسێک خۆشتر دەوێت جا هەر پلەیەکی هەبێت کە نەیپێکا دەڵێین نەتپێکا و لەگەڵت نین، دواتر لۆمەی من مەکەن لۆمەی سەلەف بکەن بڵێن نەدەبوایە ئاوا توند بن بەرامبەر أبو حنیفة چونکە لە سەدەکانی دواتر موجاهید پەیدا دەبن دەیکەن بە ئیمام ! خۆ ئەم کتێبە بە پشت بەستن بە ووتەکانی سەلەف نوسراوە گەر لۆمە کردنێک لە ئارادا بێت ئەوا ڕووی لە زانایانی سەلەف بکەن نەک من چونکە من تەنها تەقلیدی ئەوانم کردۆتەوە، وە پاشان گەر زانایانی سەلەف زیندوو ببنەوە لە ئێستادا پێتان وایە هەڵوێستی خۆیان بگۆڕن و شوێنی موجاهیدانی سەردەم بکەون ؟ یان لەسەر هەڵوێستی خۆیان دەمێنن و دەبێت موجاهیدان شوێنیان بکەون و واز لە تەقلیدی خەلەف بهێنن ؟ دواتر با واز لە سەلەف و خەلەف و معاصرین و موجاهیدین بهێنین، وەرن بە بەڵگەی قورئان و سوننەت یەکلایی بکەینەوە، دوای ئەم هەموو ووتەیەی هێنامان دەربارەی أبو حنیفة ئایا شایستەی چ وەسفێکە پێی بدرێ ؟ گەر تۆزێک ئینصافتان تێدا هەبێ دەست بەجێ هەست بەوە ناکەن کە کردنی أبو حنیفة بە ئیمام لەلایەن خەلەف و معاصرین گەورەترین هەڵەی مەنهەجیە و زاڵکردنی ناحەقە بەسەر حەقدا ؟

زكريا الساجي دەڵێ: أخبرنا الحسين بن عبدالله النيسابوري ووتی: **شایەتی دەدەم لەسەر عبدالله بن المبارك شایەتی دانێک کە الله پرسیارم لێبکات لەسەری، ئەویش ئەوەیە کە عبدالله پێی ووتم: ئەی حسین وازم لە هەموو شتێک هێنا کە ڕیوایەتم کرد بێت لە أبو حنیفة-ەوە، داوای لێخۆشبوون دەکەم لە الله و تەوبە دەکەم لێی.** [الخطيب نەقلی کردووە - تاريخ بغداد : 556/15]

ووتم: ئەوانەی دڵیان بە مەدحی ابن المبارك خۆشە بۆ أبو حنیفة، دوای ئەمە چی دەڵێن ؟ ابن المبارك-یش بوو بە خەواریج و فکرەی غولاتەکان چوو بە مێشکیدا بۆیە ئەم بڕیارەی دا ؟

**الخطيب** دەڵێ: حدثنا محمد بن علي بن مخلد الوراق لفظا قال في كتابي عن أبي بكر محمد بن عبدالله بن صالح الأبهري الفقيه المالكي ووتی: **بیستم أبو بكر كوڕی أبو داود السجستاني ڕۆژێک بە هاوەڵانی دەووت: چی دەڵێن دەربارەی بابەتێک کە مالك و هاوەڵانی و الشافعي و هاوەڵانی و الأوزاعي و هاوەڵانی و الحسن بن صالح و هاوەڵانی و سفيان الثوري و هاوەڵانی و أحمد بن حنبل و هاوەڵانی لەسەری کۆک بن ؟ پێیان ووت: ئەی أبو بكر هیچ بابەتێک لەم بابەتە ڕاستر نیە، جا ووتی: هەموو ئەمانە کۆکن لەسەر بە گومڕا دانانی أبو حنيفة.**

**[تاريخ بغداد : 527/15] (سەنەدەکە صەحیحە).**

ووتم: هەندێک دەڵێن أبو بكر كوڕی أبو داود درۆزنە زۆرینەی دەڵێن حافزە و ئیمامە، بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی بڕوانن بۆ [سير أعلام النبلاء : 13/223-233] ، [ميزان الاعتدال : 4/113-116] ، [التنكيل : 1/499-511] الذهبي و المعلمي تەواوی ووتەی زانایانیان نەقل کردووە دەربارەی أبو بكر لەگەڵ تەرجیح کردنی ووتەکان، وە محقق-ی تاريخ بغداد(١) تەوسیقی کردووە سەرەڕای لایەنگری بۆ أبو حنيفة، لەبەر درێژ نەبوونەوە ووتەکان نەقل ناکەم بەڵام دوای خوێندنەوەی ئەم سەرچاوانە گومانتان لەوە نامێنێت کە أبو بكر سیقەیە، پاشان زانایانی جەرح و تەعدیل بەپێی ڕیوایەتەکانی ڕاوی حوکم دەدەن لەسەر ڕاوییەکە، کە دەڵێن فلان درۆزنە فلان زەعیفە فلان سیقەیە فلان حافزە ئەم وەسفانە بەپێی دینداری و عیبادەت و ئەخلاق و چاکەکاری ڕاوییەکە بەکار نایەت بەڵکو سەیری ڕیوایەتەکانی دەکەن بە بەراوورد کردنی ڕیوایەتەکانی لەگەڵ ڕیوایەتی پێشەوایە حافزەکان ئەم وەسفانە وەردەگرێت، جا أبو بكر کاتێک دیراسەی ڕیوایەتەکانی دەکرێ دەبینرێ وەک ڕیوایەتی سیقەکانە بۆیە لای زۆرینە بە سیقە دانراوە تەنها ووتەکەی باوکی دەربارەی بۆتە کێشە کە ئەویش قبوڵ نەکراوە لەلای زۆرینەی زانایان، بۆیە ابن عدي لە کتێبی (الكامل في ضعفاء الرجال) دەڵێ: کردوومەتە مەرج لەم کتێبەدا کە هەر کەسێک جەرح کرا بێت ناوی بهێنم ئەگینا ناوی أبو بكر-م نەدەهێنا لەم کتێبەدا، وە دەڵێ: نازانم باوکی چی لێ بینیوە کە ئاوا دەڵێ ؟! جگە لەوەش لێرەدا أبو بكر شتێکی باس کردووە سەنەدی تێدا نیە، بەڵکو دەڵێ ئەم زانایانە یەکدەنگ بوونە لەسەر گومڕایی أبو حنيفة، ئەمەش ووتەیەکی ڕاستە لەم کتێبەدا ووتەی هەموو

ئەم زانایانەی تێدایە دژی أبو حنیفة، جا أبو بكر ئەم قسەیە بكات یان نا، درۆزن بێت یان نا، ئەوا ووتەکەی هەر ڕاستە و لە واقیعدا بوونی هەیە.
سەیرکە هەموو ئەم زانایانە یەکدەنگن لەسەر گومڕایی أبو حنیفة، هەموو خەلەفیش یەکدەنگن لەسەر پێشەوایەتی أبو حنیفة ! والله المستعان، کەچی دەرمارگیرەکان بۆ أبو حنیفة دەڵێن: تۆ لە خەلەف زاناتری بە مەزهەبی سەلەف دەڵێی خەلەف نەیان پێکاوە و لەسەر مەزهەبی سەلەف نەڕۆیشتوون ؟!

**ابن عدي** دەڵێ: **بیستم ابن أبي داود دەیووت: قسە ووتن بە أبو حنیفة ئیجماعی زانایانە، چونکە ئیمامی بەصرە أيوب السختياني قسەی پێ ووتوە، وە ئیمامی کوفە سفيان الثوري قسەی پێ ووتوە، وە ئیمامی حیجاز مالك قسەی پێ ووتوە، وە ئیمامی مصر الليث قسەی پێ ووتوە، وە ئیمامی شام الأوزاعي قسەی پێ ووتوە، وە ئیمامی خوراسان عبدالله بن المبارك قسەی پێ ووتوە، جا قسە ووتن بە أبو حنیفة ئیجماعی زانایانە لە هەموو شوێنێکدا.**
[الكامل في ضعفاء الرجال : 129/10]
ووتم: گەر أبو بكر بن أبي داود درۆزنترین کەسی سەر زەوی بێت ئەوا لەمەدا ڕاستی ووتوە، چونکە ووتەی هەموو ئەم زانایانە بەردەستە کە قسەیان بە أبو حنیفة ووتوە.

**المعلمي** دەڵێ: **ووتەی پێشەوایانی ئەهلی سوننە لەو سەردەمەدا دەربارەی أبو حنیفة متواترە تەواتورێکی حەق.** [التنكيل : 657/1]
ووتم: المعلمي-ش درۆزنە کە هەمان ووتەی أبو بكر دەڵێتەوە ؟ زانیمان ئەمە هەڵوێستی سەلەف بووە دەربارەی أبو حنیفة، ئەی هەڵوێستی خەلەف چۆنە دەربارەی ؟ ئێستا جیاوازییەکە ڕوونە بۆتان لەنێوان ئەم دوو مەنهەجەدا ؟ یان هێشتا پێتان وایە ئێمە لە مەنهەجی سەلەف تێناگەین و هیچ چارمان نیە دەبێت بگەڕێینەوە بۆ خەلەف ئەوان چاکتر تێگەیشتوون ؟

**الضياء المقدسي** دەڵێ: **بیستم الحافظ عبدالغني المقدسي دەیووت: ئێمە لە موصل بوین**

**کتێبی (الضعفاء)ی العقیلي گوێ بیست دەبووین، خەڵکی موصل منیان گرت و بەندیان کردم و ویستیان بمکوژن بەهۆی ئەوەی شتێک باسکرا دەربارەی أبو حنیفة. جا پیاوێکی درێژ هات بۆلام شمشێرێکی بە دەستەوە بوو، ووتم: ئەمە دەمکوژێت و دەحەسێمەوە. بەڵام هیچی نەکرد. پاشان منیان ئازاد کرد. ابن البرني الواعظ لەگەڵی دابووە ئەو شتانەی سڕیوەتەوە دەربارەی أبو حنیفة هاتووە لە کتێبەکەدا، جا کەسانێکیان نارد تا کتێبەکە بپشکنن، هیچیان نەدۆزیەوە تێیدا بەم هۆیەوە ڕزگاری بوو.** [الذهبي نەقلی کردووە - سیر أعلام النبلاء : 459/21]

ووتم: کەسانێک دەڵێن ئەی بۆ دوای سەردەمی سەلەف قسەیان بە أبو حنیفة نەووتوە زۆربەیان مەدحیان کردووە ؟ ئەوەتا عبدالغني کە ساڵی 600 مردووە لەسەر خوێندنەوەی کتێبێک بەند دەکرێ و خەریکە بیکوژن، ئەی ئێوە چ جیاوازییەکتان هەیە لەگەڵ ئەم خەڵکەی ئەوکاتی موصل؟ مەگەر ئێوەش پێتان وانیە ئەوەی قسە بە أبو حنیفة بڵێ خەواریجە و شیاوی کوشتنە یان بەندکردن و تەمێ کردن ؟ ئەم عەقیدەیەی ئەمڕۆش درێژە پێدەری عەقیدەی ئەوکاتە.

*یحیی بن مندة* دەڵێ: **عبدالعزیز النخشبي هاتە لامان لەساڵی 433، قازی الخطبي لێیدا بەهۆی ئیمام أبو حنیفة، بە چاوی خۆم نیشانەی لێدانم بینی لەسەر پشتی.**

[الذهبي نەقلی کردووە - سیر أعلام النبلاء : 268/18]

ووتم: ببینن ئەوانەی قسەیان بە أبو حنیفة ووتوە حاڵیان چۆن بووە دوای سەلەف، گەر زانایانی سەلەف لەو سەردەمەدا ژیابوان دەبوایە لەژێر قامچی چیان بەسەر هاتبوایە ؟ لەجیاتی میحنەی خلق القرآن میحنەی أبو حنیفة دەهاتە کایەوە.

**الخطیب :** دوای باسکردنی ئەو ڕیوایەتانەی دەربارەی مەدحکردنی أبو حنیفة هێناویەتی، وە پێش هێنانی ئەو ڕیوایەتانەی دژی أبو حنیفة هاتوون دەڵێ: **ڕیوایەتمان هێنا لە أیوب السختیاني و سفیان الثوري و سفیان بن عیینة و أبو بکر بن عیاش و جگە لەوانیش لە پێشەوایان ڕیوایەتێکی زۆر کە مەدح و ستایشی أبو حنیفة لەخۆ دەگرێت، وە ئەوەی صەوابە لەلایەن نەقلکەرانی فەرمووده لە پێشەوایانی المتقدمین و ئەوانەشی کە ناومان هێنان دەربارەی أبو حنیفة پێچەوانەی ئەو**

**ووتانەیە، وە ووتەكانیان دەربارەی أبو حنیفة زۆرە بەهۆی شتی ناشرینەوە كە لێیەوە گێڕدراوتەوە هەندێكیان پەیوەستە بە أصولی دین و هەندێكیشی بە فروع، وە ئێمەش باسیان دەكەین بە ویستی الله.** [تاريخ بغداد : 504/15]

ووتم: ئەم ووتەیە پشت شكێنەرە بۆ ئەوانەی كە دەڵێن ڕاستە قسەی پێ ووتراوە بەڵام مەدحیش كراوە، دەیانەوێ مەدحەكە زاڵ بكەن بەسەر زەمەكە، كەچی الخطیب ووتەی جەرحكەران پێش دەخات بەسەر ووتەی تەعدیلكەران.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا ابن رزق و البرقاني قالا أخبرنا محمد بن جعفر بن الهيثم الأنباري قال حدثنا جعفر بن محمد بن شاكر قال حدثنا رجاء بن السندي قال سمعت سليمان بن حسان الحلبي دەیووت: **ناتوانم بژمێرم كە چەندەها جار گوێم لە الأوزاعي بووە دەیووت: أبو حنیفة بەرەو گرێكانی ئیسلام ڕۆیشت گرێ گرێ هەڵیوەشاندەوە.** [تاريخ بغداد : 547/15] **(سەنەدەكەی صەحیحە).**

ووتم: الكوثري تەزعیفی كردووە بەهۆی الأنباري گوایە زەعیفە، هەروەها الحلبي گوایە مەجهولە.

لێرەدا تەنها ووتەی محقق-ی تاريخ بغداد(١) نەقل دەكەم كەخۆی ڕەددی الكوثري داوەتەوە دەڵێ: الكوثري ئەم ڕیوایەتەی تەزعیف كردووە بەهۆی الأنباري، هیچ كەسێكیش جەرحی نەكردووە هەروەک البرقاني باسیكردووە، هەروەها الكوثري دەڵێ: الحلبي مەجهولە، چونكە ابن أبي حاتم پرسیاری لە باوكی كردووە دەربارەی ئەو، باوكی وتوویەتی: پرسیارم لە ابن أبي غالب كرد دەربارەی ئەو، ووتی: نایناسم، وە نابینم بەغدادییەكان ڕیوایەتی لێوە بكەن، ابن أبي حاتم دەڵێ: بە باوكم ووت: تۆ چی دەڵێی دەربارەی ؟ ووتی: فەرموودەكانی صەحیحە، جا الكوثري بەهۆی ئەم ووتەیە بە مەجهولی داناوە، لەكاتێكدا بە صەحیح دانانی فەرموودەكانی واتا تەوسیق كردنی ئەم ڕاوییە لەلایەم أبو حاتم.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا ابن رزق قال أخبرنا ابن سلم قال حدثنا الأبار قال حدثنا الحسن بن علي قال حدثنا أبو توبة قال حدثنا سلمة بن كلثوم -یەكێک بوو لە عیبادەت كەران وە هیچ كام لە هاوەڵانی الأوزاعي

لەو ڕێکتر نەبوو- ووتی: **کاتێک أبو حنیفة مرد الأوزاعي ووتی: الحمد لله، گرێکانی ئیسلامی هەڵدەوەشاندەوە دانە بە دانە.** [تاريخ بغداد : 548/15] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: الكوثري تانەی داوە لە الحسن بن علي الحلواني گوایە ئیمام أحمد قسەی لەسەر کردووە، الحسن بەبێ خیلاف لای زانایان سیقەیە حافزە ثبت-ە، بەڵام ئیمام أحمد لەو ڕووە دژی وەستا کە ووتی ئەوەی بڵێ قوڕئان مەخلوقە تەکفیری ناکەم نەک لەڕووی ڕیوایەت، ڕیوایەتیشی هەیە لە الصحيحين.

**عبدالله** دەڵێ: بیستم باوکم ﷺ دەیووت: **عبدالله بن إدريس ووتی: بە مالك-م ووت: لای ئێمە علقمة و الأسود هەبوو (واتا لە کوفە) مالك ووتی: لای ئێوە کەسێک هەبوو شتەکانی ئاوا هەڵگێڕایەوە. عبدالله دەڵێ: باوکم ناو دەستی هەڵگێڕایەوە بەسەر پشتی دەستی، مالك مەبەستی أبو حنیفة بوو.** [السنة : 358] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: ئیمام أحمد سەماعی هەیە لە عبدالله بن إدريس، وە مدلس نیە بۆیە ووتنی (قال عبدالله بن إدريس) کێشەی نیە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا البرقاني حدثني محمد بن العباس أبو عمر الخزاز حدثنا أبو الفضل جعفر بن محمد الصندلي -أبو عمر زۆر ستایشی کرد- حدثني المروذي أبو بكر أحمد بن الحجاج ووتی: **پرسیارم کرد لە باوکی عبدالله -واتا: أحمد بن حنبل- دەربارەی أبو حنیفة و عمرو بن عبيد، أحمد ووتی: أبو حنیفة خراپترە بۆ موسڵمانان لە عمرو بن عبيد، چونکە أبو حنیفة هاوەڵی هەیە.**

[تاريخ بغداد : 567/15] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: (عمرو بن عبيد) یەکێکە لەسەرانی موعتەزیلە تەکفیر کراوە لەلایەن سەلەف.

محقق-ی تاريخ بغداد(٢) تەزعیفی ئەم ڕیوایەتەی کردووە بەهۆی محمد بن العباس الخزاز، پێشتر ڕوونمان کردەوە کە لەگەڵ ڕاوییەکی تر تێکەڵی کردووە ئەمەیان سیقەیە.

**العقيلي** دەڵێ: حدثنا زكريا بن يحيى الحلواني قال سمعت محمد بن بشار العبدي بندار دەیووت:

**عبدالرحمن بن مهدي هیچ كاتێک ناوی أبو حنیفە-ی نەدەهێنا ئیللا دەیووت لەنێوان أبو حنیفة و حەقدا بەربەست هەیە.** [الضعفاء : 160/6] (سەنەدەكەی صەحیحە).

ووتم: پێم وایە زكریا الحلواني هەر زكریا الساجي بێت، ڕوونكردنەوەی ئەمەش زۆری دەوێت لەترسی درێژ نەبوونەوە باسی ناكەم، بەڵام ڕیوایەتی دواتر زكریا-ی تێدا نیە ئەم گومانە لادەبات.

**الفسوي** دەڵێ: حدثنا محمد بن بشار ووتی: **بیستم عبدالرحمن دەیووت: لەنێوان أبو حنیفة و حەقدا بەربەست هەیە.** [المعرفة والتاريخ : 784/2] (سەنەدەكەی صەحیحە).

ووتم: لەبەر ئەوەی الخطیب ئەم ڕیوایەتەی هێناوە لە تاريخ بغداد هەر لەڕێگای الفسوي ئەوا بێگومان دەبێ ڕەخنەی الكوثري ئامادە بێت وەک هەمیشە، الكوثري تانەی لە محمد بن بشار داوە دەڵێ: المتقدمين قسەیان لەسەر كردووە تەنانەت تۆمەتباریان كردووە بە درۆ.

محمد بن بشار العبدي ناسراو بە بندار شێخی خاوەنانی كتب الستة-یە هەر شەشیان ڕیوایەتیان لێوەی كردووە، سیقەیە حافزە ئەوانەی كە قسەیان دەربارەی كردووە بەڵگەیان بەدەستەوە نیە، هەروەک زانراویشە بە دەگمەن ڕاوی هەیە سەلامەت بێ لە قسەی هەمووان، الكوثري-ش پیشەی ئەوەیە كە تەنها جەرحەكان نەقل بكات گەر 10 زانا بڵێن سیقەیە، 1 زانا جەرحی بكات بەبێ بەڵگە ئەوا ووتەی تاكە زاناكە نەقل دەكات زۆر جاریش بە قرتاوی نەقلی دەكات یان جەرحێكی مفسر نیە یان بگرە هەر جەرح نیە هەروەک چەند نموونەیەكمان بینی لەپێشتردا، ئەوەندە بەسە بۆ محمد بن بشار كە البخاري نزیكەی 200 فەرموودەی لێ ڕیوایەت كردووە لە صەحیحەكەی، وە مسلم نزیكەی 400 فەرموودەی لێ ڕیوایەت كردووە لە صەحیحەكەی.

**أبو نعيم الأصبهاني** دەڵێ: حدثنا أحمد بن إسحاق حدثنا عبدالرحمن بن محمد حدثنا عبدالرحمن بن عمر ووتی: **پرسیارم لە عبدالرحمن بن مهدي كرد ووتم: ئەو شتانە لە أبو حنیفة وەرگرین كە ئەثەرە و موافقی حەقە ؟ ووتی: نەخێر، هیچ كەرامەتی نیە، هات بەرەو ئیسلام گرێ گرێ هەڵی دەوەشێنێتەوە، هیچی لێ قبوڵ ناكرێ.** [حلية الأولياء : 10/9] (سەنەدەكەی صەحیحە).

**أبو نعيم الأصبهاني** دەڵێ: حدثنا أحمد بن إسحاق حدثنا عبدالرحمن بن محمد بن سلم حدثنا عبدالرحمن بن عمر ووتی: **بیستم پیاوێک پرسیاری لە عبدالرحمن بن مهدي کرد، ووتی: ئەی باوکی سعيد پێم گەیشتووە کە تۆ وتووتە: مالك لە أبو حنيفة زاناترە، عبدالرحمن بن مهدي ووتی: من وام نەوتووە، بەڵکو دەڵێم: مالك لە مامۆستاکەی أبو حنيفة زاناتر بوو -واتا حماد بن أبي سليمان- عبدالرحمن بن عمر دەڵێ: وە بیستم باسی أبو حنيفة کرا عبدالرحمن بن مهدي ووتی:** ﴿لِيَحۡمِلُوٓاْ أَوۡزَارَهُمۡ كَامِلَةٗ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَمِنۡ أَوۡزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيۡرِ عِلۡمٍۗ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ﴾ **(واتا: باری تاوانەکانیان بە تەواوی بەبێ کەم کردن هەڵدەگرن بەسەر شانیاندا، وە باری تاوانی ئەو کەسانەش هەڵدەگرن کە گومڕایان کردوون بە جەهلەوە، ئای چەندە شتێکی خراپە کە تاوانی خۆیان و شوێنکەوتوانیان هەڵدەگرن) عبدالرحمن بن عمر دەڵێ: وە بیستم عبدالرحمن بن مهدي دەیووت: أبو حنيفة نەیدەزانی عیلم چیە.** [حلية الأولياء : 11/9] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني محمد بن أحمد بن يعقوب أخبرنا محمد بن نعيم الضبي قال سمعت محمد بن حامد البزاز يقول سمعت الحسن بن منصور يقول سمعت محمد بن عبدالوهاب دەیووت: **بە علي بن عثام-م ووت: أبو حنيفة حوججەیە ؟ ووتی: نە بۆ دین نە بۆ دونیا.**

[تاريخ بغداد : 564/15] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: الكوثري دەڵێ: محمد بن عبدالوهاب معلول-ە لەلای الخليلي !

وەک المعلمي دەڵێ: بەکارهێنانی ووشەی (معلول) بۆ ڕاوی بیدعەیەکە الكوثري دایهێناوە، چونکە ووشەی (معلول) بۆ فەرموودە بەکاردێ نەک بۆ ڕاوی، پاشان هەروەک جارانی پێشوو چەواشەکاری کردووە، ووتەکە هی الخليلي نیە بەڵکو الخليلي لە عبدالله بن محمد الحافظ نەقلی کردووە کە دەڵێ: ئەم فەرموودەیە معلول و فرد-ە عیللەتی فەرموودەکەش لە ڕاوییەکی ترە بەناوی سعير بن الخمس نەک لە محمد بن عبدالوهاب، جا ووتەکەی دەربارەی فەرموودەکەیە نەک ڕاوییەکە، سەبارەت بەوەش کە دەڵێ پێم سەیرە چۆن مسلم ڕیوایەتی کردووە لە محمد بن عبدالوهاب، مەبەستی ئەوەیە سەنەدەکە نازل-ە محمد بن عبدالوهاب 11 ساڵ دوای مسلم مردووە، کەواتە

ووتەكەی عبدالله مەبەستی ئەوەیە فەرموودەكە معلول-ە وە سەنەدەكەش نازل-ە بە نسبەت مسلم، ئەگینا محمد بن عبدالوهاب أبو أحمد الفراء سیقەیە مسلم والنسائي والحاكم والذهبي وابن حجر بە سیقەیان داناوە كەس تەزعیفی نەكردووە. بڕوانە [طليعة التنكيل : 34-35]

تەنانەت محقق-ی تاریخ بغداد(١) دەڵێ: الكوثري ڕیوایەتەكەی تەزعیف كردووە بەهۆی محمد بن عبدالوهاب، بەڵام سیقەیە.

محقق-ی تاریخ بغداد(٢) دەڵێ: علي بن عثام مەجهولە !

أبو حاتم الرازي و الحاكم و ابن حجر بە سیقەیان داناوە، الذهبي بە صدوق-ی داناوە، ڕەنگە لای محقق مجهول بێ چونكە زانستی نیە بە علم الرجال.

***عبدالله*** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثنا إسحاق بن عيسى الطباع عن **ابن عيينة ووتی: بە سفیان الثوري-م ووت: لەوانەیە ئەمە وا لەتۆ بكات كە فەتوا بدەیت كاتێك دەبینی كەسێك ئەهلی فەتوادان نیە فەتوا دەدات بۆیە تۆش فەتوا دەدەیت. عبدالله دەڵێ: باوكم ووتی: مەبەستی أبو حنیفة بوو. [العلل ومعرفة الرجال : 2456] (سەنەدەكەی حەسەنە).**

***عبدالله*** دەڵێ: حدثني مهنا بن يحيى الشامي ووتی: **بیستم أحمد بن حنبل دەیووت: ووتەی أبو حنیفة و قشپل لەلامدا وەک یەک وان. [السنة : 216] (سەنەدەكەی صەحیحە).**

ووتم: مهنا بن يحيى الشامي هاوەڵی ئیمام أحمد-ە، ابن حبان و الدارقطني بە سیقەیان داناوە، أبو الفتح الأزدي بە زەعیفی داناوە، پێشتر باسمان كرد كە جەرحی الأزدي قبوڵ ناكرێ گەر پێچەوانەی زانایانی تر بێت چونكە خۆی مەجروحە و زیادەڕەویشە لە جەرح كردن.

***الخطيب*** دەڵێ: أخبرنا طلحة بن علي الكتاني قال أخبرنا محمد بن عبدالله بن إبراهيم الشافعي قال حدثنا أبو الشيخ الأصبهاني قال حدثنا الأثرم ووتی: **بینیم أبو عبدالله -واتا ئیمام أحمد- چەندین جار أبو حنیفة و مەزهەبەكەی عەیبدار دەكرد، وە هەندێك لە ووتەكانی دەگێڕایەوە بۆ سەرزەنشت كردن و سەرسوڕمان. [تاریخ بغداد : 568/15] (سەنەدەكەی حەسەنە).**

ووتم: الكوثري دەڵێ: أبو الشيخ الأصبهاني تەزعيف كراوە لەلايەن أبو أحمد العسال، محقق-ى تاريخ بغداد(٢) هەمان ووتەى الكوثري دووبارە كردۆتەوە.
دوو أبو الشيخ الأصبهاني هەيە، يەكێكيان ناوى عبدالله بن محمد بن جعفر-ە زانايەكى ناودارە خاوەن چەند كتێبێكە حافزە سيقەيە متقن-ە قسەى لەسەر ناكرێ، الكوثري ڕاوى سەنەدەكەى بەم أبو الشيخ-ە هەژمار كردووە، جا وەسفى هەموو ئەم زانايانەى باس نەكردووە تەنها ئاماژەى بە تەزعيف كردنى العسال داوە بۆ أبو الشيخ، ئەمە لەكاتێكدا ئەم أبو الشيخ-ە ئەوەيان نيە كە الكوثري بۆى چيە بەڵكو ئەوى تريانە كە ناوى محمد بن الحسين بن إبراهيم بن زياد بن عجلان-ە الخطيب بە سيقەى داناوە كەسى تريش قسەى لەسەر نەكردووە بۆيە بەلانى كەم سەنەدەكە حەسەنە گەر تەوسيقى الخطيب بهێنينە خوارەوە بۆ پلەى صدوق، بەڵگەش بۆ ئەمە الخطيب لە ژياننامەكەيدا دەڵێ: ڕيوايەتى هەيە لە أبو بكر الأثرم، وە محمد بن عبدالله الشافعي ڕيوايەتى لێوە كردووە، وەك دەبينين لەم سەنەدە محمد بن عبدالله ڕيوايەتى لێوە كردووە ئەويش ڕيوايەتى لە الأثرم كردووە، جگە لەوەش بەڵگەيەكى تر كە يەكلا كەرەوەيە ئەويش ئەمەيە كە أبو بكر الأثرم ساڵى 273 مردووە بەڵام ئەو أبو الشيخ-ەى كە الكوثري بۆى چيە ساڵى 274 لە دايكبووە واتا ساڵێك دواى مردنى ئەو لە دايكبووە ئيتر چۆن ڕيوايەتى لێوە دەكات و دەڵێ: حدثنا الأثرم ؟! هەر چەندە الكوثري لە كتێبى (الترحيب) دانى بەم هەڵەيەى داناوە ناچاريشە دانى پێ بنێت چونكە بوارى مراوغة كردنى نيە چونكە گەر بێتو لە كەسێكى نەخوێندەوار بپرسين كەسێك ساڵێك دواى مردنى كەسێكى تر لە دايكبووە ئايا دەكرێ ئەم دووانە بەيەكتر بگەن و ڕيوايەت لەيەكتر بكەن ؟ بێگومان دەڵێ نەخێر، جا الكوثري-ش لێرەدا هيچ بوارى بۆ نەماوەتەوە بۆيە تەسليم بووە ئەگينا كەسێكى حەق ويست نيە، هەركەسێكيش كتێبى (التنكيل) بخوێنێتەوە گومانى لەم ڕاستيە نابێت، سەبارەت بەوەش كە دەڵێ: أبو أحمد العسال تەزعيفى أبو الشيخ-ى كردووە، لێرەدا ئێمە كارمان بە أبو الشيخ نەماوە كاتێك زانيمان الكوثري تێكەڵى كردووە لەگەڵ يەكێكى تر بەڵام وەك بەرگرى كردن لەم زانايە وەڵامى ئەم گومانەش دەدەينەوە:
الألباني لە تەحقيقى (الطليعة) دەڵێ: ئەم تەزعيف كردنەى العسال بۆ أبو الشيخ نەچەسپاوە، وە

المعلمي له (التنكيل) دەربارەی ووتەكەی الكوثري دەڵێ: نەمدۆزیوەتەوە كه العسال وابڵێ، وه لەوێدا دەڵێ: هیچ هەواڵێكم پێ نەگەیشت تەنها ئەوە نەبێت كه كەسێك پێی ڕاگەیاندم كه لەگەڵ خودی الكوثري كۆبۆتەوە، ئەمە دوا ووتەی المعلمي-ە.

الألباني دەڵێ: ئەنجامی كۆبوونەوەكەی باس نەكرد، بۆیە نامەم بۆ شێخ محمد نصيف نارد داوای ڕوونكردنەوەم لێیكرد دەربارەی ئەم ووتەیەی المعلمي، ئەویش نامەی بۆ شێخ سليمان الصنيع نارد كه ئەندامی مەجلیسی شورا بوو له مكة المكرمة، وه بەڕێوەبەری پێشووی كتێبخانەی الحرم المكي بوو، پرسیاری لێكرد دەربارەی ئەم ووتەیەی المعلمي دەربارەی كۆبوونەوەكه، شێخ سليمان الصنيع له وەڵامدا ووتی: من چەند جارێك لەگەڵ الكوثري كۆبوومەوە له ماڵەكەیدا له مصر پرسیاری ئەم بابەتەم لێكرد بەڵام هیچ ئەنجامێكم دەست نەكەوت، گەر الكوثري ڕاستگۆ بوایه دەربارەی ئەو ووتەیەی كه داویەتیە پاڵ أبو أحمد العسال ئەوا بۆی ڕوون دەكردمەوە كاتێك پرسیارم لێیكرد، وه ئەوەی بۆم دەركەوت ئەوەیە كه الكوثري درۆ دەكات بەبێ ئامادەكاری و بیركردنەوە لێی.

بڕوانە حاشیەی [الطليعة : 29]

جگه لەمەش محقق-ی تاريخ بغداد(١) دەڵێ: تەزعیف كردنی بەهۆی أبو الشيخ سەركەشیە لەلایەن الكوثري-ە.

**العقيلي** دەڵێ: حدثنا محمد بن إسماعيل قال حدثنا سليمان بن حرب قال سمعت حماد بن زيد ووتی: **بيستم الحجاج بن أرطاة دەیووت: أبو حنيفة كێیه ؟! كێ عیلم له أبو حنيفة وەردەگرێ ؟! أبو حنيفة چیه ؟!** [الضعفاء : 163/6] **(سەنەدەكەی صەحیحه).**

ووتم: ئەم ووتەیه بێ هۆ نیه، هۆكاری زۆری له پشته كه الحجاج بن أرطاة وابڵێ، بەڵام پێم سەیره چۆن كەسێك له سەردەمەكەی خۆیدا ئاوا وەسف بكرێ له سەردەمەكانی تردا دەبێته پێشەوا ؟! الحجاج بن أرطأة له فەرمووده زەعیفه، بەڵام ئەمه ڕەئی خۆیەتی دەری بڕیوه هیچ پەیوەندی به ڕیوایەت نیه تا بڵێین زەعیفه، بۆیه ئەمه باس دەكەم چونكه ئەمەش كراوه به بیانوو.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا البرمكي قال أخبرنا محمد بن عبدالله بن خلف قال حدثنا عمر بن محمد

الجوهري قال حدثنا أبو بكر الأثرم قال حدثنا سنيد بن داود قال حدثنا حجاج ووتی: **پرسیارم لە قیس بن الربیع كرد دەربارەی أبو حنیفة، قیس ووتی: من لە هەموو كەسێك شارەزاترم بە أبو حنیفة، ئەو جاهیلترین كەسە بەو شتانەی كە بوونیان هەیە، وە زاناترین كەسە بەو شتانەی كە بوونیان نیە.**
[تاريخ بغداد : 558/15] **(سەنەدەكەی حەسەنە).**

ووتم: محقق-ی تاریخ بغداد(١) و (٢) دەڵێن: سەنەدەكە زەعیفە چونكە قیس زەعیفە !
والله المستعان قیس خۆی خاوەنی ووتەكەیە ڕەئی خۆی دەربارەی أبو حنیفة ووتوە، سەنەدەكە چ پەیوەندی بە زەعیف بوونی قیس هەیە ؟! بڕوانە لاپەڕە 27-32 وەڵامی ئەم گومانەمان داوەتەوە.
محقق-ی تاریخ بغداد(٢) دەڵێ: الخطیب دەربارەی عمر بن محمد الجوهري وتوویەتی: هەندێك لە فەرموودەكانی مونكەرە.
ئەمە ڕاستە الذهبي-ش هەمان شتی ووتوە، بەڵام وەك المعلمي لە [التنكيل : 625/1] ئاماژەی پێداوە الجوهري لە كتێبەكەی أبو بكر الأثرم ڕیوایەت دەكات تەنها نوسخەی كتێبەكە صەحیح بێت بەسیەتی.
گەر بڵێین زەعیفە و پشتی پێ نابەسترێ ئەوا موتابەعە كراوە لەلایەن عبدالله بن عبدالرحمن ئەویش هەمان شت لە قیس بن الربیع دەگێڕێتەوە وەك لە [تاريخ بغداد : 558/15] هاتووە بە لەفزی: پرسیار لە قیس بن الربیع كرا دەربارەی أبو حنیفة، ووتی: جاهیلترین كەسە بەو شتانەی كە بوونیان هەیە، وە زاناترین كەسە بەو شتانەی كە بوونیان نیە.
مەبەست لەم ووتەیەش ئەوەیە كە زۆربەی ووتەكانی أبو حنیفة گریمانەین وەك مەتەڵ وان گەر پیاوێك ئاوای كرد حوكمی چیە گەر پیاوێك ئاوای بەسەرهات حوكمی چیە، زۆربەی فەتواكانی لەم جۆرەیە كە بە دەگمەن دەبینیت شتی ئاوا ڕوو بدات لە واقیعدا، كەچی ئەو شتانەی كە بەڵگەیان لەسەر هاتووە بێ ئاگایە لێی.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني عبدة بن عبدالرحيم بيستم معروف دەیووت: **أبو حنیفة چووە سەردانی الأعمش كە نەخۆش بوو، جا أبو حنیفة ووتی: ئەی باوكی محمد گەر هاتنم لەسەرت قورس**

**نەبوایە ئەوا هەموو ڕۆژێک سەردانتم دەکرد، الأعمش ووتی: ئەمە کێیە ؟ ووتیان: أبو حنیفة-یە، ووتی: ئەی النعمان والله تۆ لە ماڵەکەی خۆتدا قورسی بەسەرمەوە چ جای ئەوەی بێیت بۆ لام ؟!** [السنة : 243]

ووتم: معروف بن حسان السمرقندي زەعیفە، بەڵام القحطاني لە حاشیەدا دەڵێ: ناوی معرف-ە نەک معروف.

بەپێی ئەم قسەیەی القحطاني بێت (معرف بن واصل السعدي)ە کەواتە سیقەیە، هەر بۆیەش القحطاني سەنەدەکەی بە حەسەن داناوە چونکە عبدة صدوق-ە، معرف و معروف هەردووکیان لەیەک سەردەمدا ژیاون و هەردووکیان ڕیوایەتیان هەیە لە الأعمش، معرف و الأعمش هەردووکیان خەڵکی کوفەن، بەڵام معروف خەڵکی سەمەرقەندە هەر ئەمەش وای کردووە القحطاني پێی وابێ معرف ڕاستە نەک معروف چونکە معرف کوفی بووە ئەو زیاتر دەگونجێ کە لە ماڵی الأعمش بوو بێت لەو کاتەدا، بەڵام ابن عدي لە کتێبی (الکامل في ضعفاء الرجال) لە ژیاننامەی معروف بن حسان السمرقندي هەمان ئەم بەسەرهاتەی الأعمش و أبو حنیفة ڕیوایەت دەکات لە سەنەدەکە ناوی معروف بن حسان دەهێنێت، وە دەڵێ: معروف بن حسان فەرموودەکانی مونکەرە. جا بۆیە صەواب ئەوەیە کە ئەمە معروف بێت نەک معرف، بەڵام معروف خۆی لە ماڵی الأعمش دابووە کاتێک أبو حنیفة سەردانی کردووە، واتا خۆی شایەتی بەسەرهاتەکە بووە نەک بۆیان گێڕا بێتەوە، ئەم جۆرە ڕیوایەتانەش وەک هەر بەسەرهاتێکی تر وایە کە ئێمە ڕۆژانە دەیبینین و دەیبیستین و دەیگێڕینەوە، وەک لە لاپەڕە 27-32 ئاماژەمان پێدا.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني محمد بن عمرو بن عباس الباهلي حدثنا الأصمعي ووتی: **سفیان الثوري ووتی: هیچ منداڵێک لە کوفە لەدایک نەبووە -یان لەم ئوممەتەدا- بە زیانتر بێت لەسەر ئوممەت لە أبو حنیفة.** [السنة : 264] **(سەنەدەکەی حەسەنە).**

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبو الفضل حدثنا أحمد بن عبدالله بن یونس حدثنا نعیم بن یحیی السعیدي ووتی: **بیستم سفیان الثوري دەیووت: کەس شتی دانەهێناوە لە ئیسلامدا وەک أبو حنیفة مەگەر**

**أبو الخطايا.** [السنة : 267] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: أبو الخطايا کەسێکی زندیق بوو لە سێدارە درا بەهۆی زندیق بوونی.

(أحمد بن عبدالله بن يونس) بۆتە (حمد بن عبدالله بن يونس) لە تەحقیقی عادل آل حمدان ئەمەش هەڵەیە، لەسەر تەحقیقی القحطاني ڕاستم کردۆتەوە.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني هارون بن سفيان ووتی: **بيستم أبو عاصم ووتی: هەواڵی مردنی أبو حنيفة-م برد بۆ سفيان، هیچی نەووت جگە لەوەی کە ووتی: الحمد لله کە سەلامەتی کردم لە زۆرێک لەو بەڵایانەی کە زۆربەی خەڵکی پێی تاقی کراونەتەوە. أبو عاصم دەڵێ: سەیرم بە سفیان هات.** [السنة : 275]

ووتم: أبو عاصم بۆیە سەیری بە ووتەکەی سفيان الثوري هاتووە چونکە خۆی لەگەڵ ئەهلی ڕەئی دادەنیشت، عبدالله دەڵێ: بیستم باوکم دەیووت: بە أبو عاصم-م ووت: چیتە بۆ بە هاوەڵەکانت ناچیت وەک ابن عون نیت ؟ ئەمەش لەبەر ئەوەی لەگەڵ هلال دادەنیشت کە ئەهلی ڕەئی بوو. [العلل ومعرفة الرجال : 995]

هارون بن سفيان جەرح و تەعدیلی بۆ نەکراوە بەڵام بۆیە ئەم ڕیوایەتەم هێنا تا حاڵی أبو عاصم دەرکەوێ گەر لە شوێنێک مەدحی أبو حنيفة-ی کرد تا بزانن چ باسە، ئەگینا ئەم ڕیوایەتە لەلای الخطيب هاتووە لە تاريخ بغداد بە صەحیحی کە پشت ڕاستی ئەم ڕیوایەتە دەکاتەوە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا أبو سعيد محمد بن موسى الصيرفي قال حدثنا أبو العباس محمد بن يعقوب الأصم قال حدثنا محمد بن علي الوراق قال حدثنا مسدد ووتی: **بيستم أبو عاصم دەيووت: لای سفيان باسی مردنی أبو حنيفة کرا، نەمبیست نە بڵێ رحمه الله نە هیچ شتێک، ووتی: الحمد لله کە ئێمەی سەلامەت کرد لەو بەڵایانەی کە أبو حنيفة توشی بوو.**

[تاريخ بغداد : 585/15] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبو معمر عن الوليد بن مسلم ووتی: **مالك بن أنس پێی ووتم: باسی أبو**

**حنيفة دەکرێ لە شارەکەتان ؟ ووتم: بەڵێ، ووتی: ناکرێ لە شارەکەی ئێوە نیشتەجێ بێت.**
[السنة : 280]

ووتم: ڕواڵەتی سەنەدەکە صەحیحە، أبو معمر سیقەیە، الولید سیقەیە بەڵام تەدلیسی التسوية ئەنجام دەدات کە پیسترین جۆریەتی بەڵام لێرەدا تەصریحی داوە بە سەماع بۆیە مەترسی تەدلیس نەماوە، بەڵام عبدالله لە کتێبی [العلل ومعرفة الرجال : 4732] هەمان ئەم ڕیوایەتە دەهێنی پاشان دەڵێ: وای نابینم أبو معمر ئەمەی بیستبێ لە الولید.
بەڵام الخطيب لە [تاريخ بغداد : 551/15] هێناویەتی کە أبو معمر دەڵێ: حدثنا الوليد بن مسلم، واتا تەصریحی داوە بە سەماع، بەڵام هەندێکجار پێشەوایانی زانستی فەرموودە دەڵێن فلان هیچی نەبیستووە لە فلان، کەچی دەبینین لەکتێبێکدا ئەم فلانەی یەکەم دەڵێ: سمعت فلانی دووەم، جا لێرەدا ڕەنگە بووترێ ئەم زانایە ووتی هیچی لێ نەبیستووە کەچی لەم کتێبەدا ئیثباتی سەماع کراوە! لێرەدا ووتەی زاناکە پێش دەخرێ چونکە ئەم کتێبە تا گەیشتووە بە دەستمان ئەم هەموو نوسخەیەی لێ نوسراوەتەوە و چاپکراوە ڕەنگە هەڵە تێیدا ڕوویدا بێت (عن) بکرێ بە (حدثنا یان سمعت) ژمارەیەک نموونەی ئاواش هەیە، بەڵام لێرەدا عبدالله دڵنیا نیە لەوەی کە أبو معمر لە الولید-ی نەبیستووە بەڵکو دەڵێ وای نابینم لە الولید-ی بیستبێ، هەست دەکەی کە ووتەکەی ظني-ە نەک یقيني بێت، هەروەها ابن حبان-یش هێناویەتی لە [المجروحين : 413/2] کە أبو معمر تەصریح دەدات بە سەماع، بۆیە ئیثبات کردنی سەماعەکە هێزی خۆی هەیە گەر قسەکەی عبدالله-ش ڕاست بێ ئەوا مالك تا بەم قسەیە ڕادەگات تەکفیریشی کردووە وەک دواتر دەیهێنین.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا أبو العلاء محمد بن الحسن الوراق أخبرنا أحمد بن كامل القاضي وأخبرنا محمد بن عمر النرسي أخبرنا محمد بن عبدالله الشافعي أخبرنا عبدالملك بن محمد بن عبدالله الواعظ أخبرنا أحمد بن الفضل بن خزيمة قالوا حدثنا أبو إسماعيل الترمذي حدثنا أبو توبة حدثنا الفزاري ووتی: **بیستم الأوزاعي وسفيان (الثوري) دەیانووت: لە ئیسلامدا هیچ منداڵێک لە دایک نەبووە کە شومتر بێت بۆیان لە أبو حنيفة. وە الشافعي ووتی: خراپتر بێت لە أبو حنيفة.**

[تاريخ بغداد : 549/15] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: الكوثري دەڵێ: (أحمد بن كامل القاضي) الدارقطني دەربارەی دەڵێ: لە حفزی خۆیەوە ڕیوایەت دەکات کە لە کتێبەکانیدا نیە، سەرسام بوون بەخۆی بە هیلاکی برد حیسابی بۆ یەکێک لە فقهاء نەدەکرد.

هەروەک المعلمي وەڵامی داوەتە: ڕاوی فەرموودەیەک ڕیوایەت بکات فەرموودەکە لەناو کتێبەکانی دانەبێت ئەمە نابێتە جەرح، خۆ مەرج ڕاوی هەرچی حفز کردووە هەمووی لەناو کتێبەکانی نوسی بێتەوە، سەربارەت بەوەش کە حیسابی بۆ فقهاء نەکردووە الدارقطني مەبەستی ئەوەیە کە لەسەر مەزهەبی خۆی بووە شوێنی مەزهەبی هیچ زانایەکی تر نەکەوتووە، ئەمەش ببێتە مەدح نابێتە زەم. جگە لەو وەڵامەی المعلمي، الذهبي بە حافظ وەسفی کردووە، ابن رزقويه دەڵێ: چاوەکانم کەسی نەدیوە وەک ئەو بێت، الخطيب دەڵێ: لە زانایانی الأحكام وعلوم القرآن والنحو والشعر والتاريخ بوو کتێبی زۆری هەیە.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبو الفضل الخراساني حدثنا إسماعيل بن أبي أويس ووتی: **خاڵم مالك بن أنس پێی ووتم: أبو حنيفة لە دەردە بێ دەرمانەکانە. وە مالك ووتی: أبو حنيفة فەرموودەکان هەڵدەوەشێنێتەوە.** [السنة : 281]

ووتم: إسماعيل بن أبي أويس زەعیفە، البخاري لە صەحیحەکەیدا لە ڕێگای إسماعيل بەشێک لە فەرموودەکانی الموطأ ڕیوایەت دەکات لە مالك-ەوە، بەڵام البخاري لە ئەصلی کتێبەکەی إسماعيل فەرموودەکانی وەرگرتووە کامەی بەلاوە صەحیح بووە ڕیوایەتی کردووە ئەمەش پێی دەووترێ (الانتقاء) هەڵبژاردکردنی فەرموودە صەحیحەکانی ڕاوی زەعیف، ئەم ڕوونکردنەوەیەم وەک بەرگرییەک بوو بۆ صحيح البخاري، تا کەسانێک وا تێنەگەن هەر ڕاوییەک کە ووترا زەعیفە و لەهەمان کاتدا لە الصحيحين ڕیوایەتی هەبوو کەواتە فەرموودەی الصحيحين زەعیفە، بەڵکو مامەڵەیەکی جیاواز دەکرێت لەگەڵ ڕاوییە زەعیفەکانی الصحيحين چونکە البخاري و مسلم فەرموودە صەحیحەکانی ڕاوییە زەعیفەکانیان دەرهێناوە نەک هەرچەمەکی ڕیوایەت بکەن لێیانەوە.

إسماعیل لەم ڕیوایەتەدا موتابەعە کراوە پێشتر هێنامان کە عبدالملك بن حبیب لە مطرف دەیگێڕێتەوە ئەویش لە مالك.

**البخاري** دەڵێ: بیستم الحمیدي دەیووت: **أبو حنیفة ووتی: چوومە مەککە سێ سوننەت فێربووم لەو کەسەی کە سەرتاشی بۆ کردم کاتێک لەبەر دەستی دانیشتم، پێی ووتم: ڕووت لە قیبلە بکە، جا بەلای ڕاستی سەرمەوە دەستی پێکرد، وە تاکو دوو ئێسکەکە هێنای. الحمیدي ووتی: کەسێک سوننەتەکانی لانەبێت کە لە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی ڕیوایەت کراوە دەربارەی مەناسیکەکان و جگە لەویش چۆن ئەم کەسە تەقلید دەکرێتەوە لە میرات و فەرزەکان و زەکات و نوێژ و کاروبارەکانی ئیسلام ؟!** [التاریخ الأوسط : 2/37-38] (سەنەدەکەی صەحیحە).

**عبدالله** دەڵێ: حدثني منصور بن أبي مزاحم ووتی: **بیستم شریك دەیووت: گەر هەموو ماڵێک لە ماڵەکانی کوفە عەرەق فرۆشی تێدا بێت و عەرەق بفرۆشێت باشترە لەوەی کەسێکی تێدا بێت کە هەمان عەقیدەی أبو حنیفة-ی هەبێت.** [السنة : 287] (سەنەدەکەی صەحیحە).

ووتم: محقق-ی تاریخ بغداد(۱) و (۲) دیسان دەڵێن: سەنەدەکەی زەعیفە چونکە شریك زەعیفە ! بەڕاستی ئەمە کارەساتی زانستیە، بگەڕێوە بۆ لاپەڕە 27-32 وەڵاممان داوەتەوە.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني إبراهیم سمعت عمر بن حفص بن غیاث یحدث عن أبیه **(حفص بن غیاث) ووتی: من لەلای أبو حنیفة دادەنیشتم، جا دەمبیست لێی فەتوای دەدا لە بابەتێکدا بە پێنج ووتە لەیەک ڕۆژدا، جا کاتێک ئەمەم بینی وازم لێی هێنا و ڕووم کردە فەرموودە.**
[السنة : 298] (سەنەدەکەی صەحیحە).

ووتم: کە دەڵێ: (وازم لێی هێناو ڕووم کردە فەرموودە) دەزانن ئەم ووتەیە واتای چیە ؟ واتا أبو حنیفة ئەهلی ڕەئی بووە و بە ڕەئی فەتوای داوە، کەی وازت لەو هێنا ئینجا دەچیتە ڕیزی ئەهلی سوننە و حەدیث.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني محمد بن أبي عمر الدوري المقرئ ووتی: **بیستم أبو عبید القاسم بن سلام**

**دەیووت: من دانیشتبووم أسود بن سالم-یش لەگەڵمان بوو، جا باسی بابەتێک کرا، منیش ووتم: أبو حنيفة لەم بابەتەدا ئاوا و ئاوا دەڵێ، أسود ئاوڕی لێم دایەوە ووتی: باسی أبو حنيفة دەکەیت لەناو مزگەوتدا ؟! أبو عبيد دەڵێ: أسود تاكو مرد قسەی لەگەڵم نەکردەوە.** [السنة : 311]

ووتم: محمد بن حفص بن عمر الدوري جەرح و تەعدیلی بۆ نەکراوە، بەڵام بەپێی ئەو ژیاننامەیەی کە لە (الجرح والتعديل لابن أبي حاتم) و (تاريخ بغداد للخطيب) هاتووە دەتوانین بڵێین ڕیوایەتێکی لەم شێوەیە شایستەی قبوڵ کردنە.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني محمد بن أبي عتاب الأعين حدثني أبو نعيم ووتی: **بیستم شريك دەیووت: هاوەڵانی أبو حنيفة-م بە هیچ نەشوبهاندوون تەنها بە دەف لێدەران نەبێت، گەر یەکێک لەوان سمتی بەدەرکەوێ لەناو مزگەوتدا هیچ بە خەیاڵیدا نایەت کێ دەیبینێت.**

[السنة : 317] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: القحطاني دەڵێ: سەنەدەکە حەسەنە، محمد بن أبي عتاب الأعين صدوق-ە.

پێم وایە دەربارەی زۆربەی ڕاوییەکان پشتی بە کتێبی (تقريب التهذيب)ی ابن حجر بەستووە، بەپێی تەجروبە ئەمەم بەدی کرد، زۆربەی حوکمەکانی دەربارەی ڕاوییەکان هەمان حوکمی ناو ئەم کتێبەیە، ئەمەش کارێکی باش نیە ناکرێ تەنها پشت بە یەک کتێب ببەسترێ.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني محمد بن عبدالعزيز بن أبي رزمة ووتی: بیستم باوکم دەیووت: **ئێمە لەلای حماد بن سلمة بووین، جا باسی بابەتێکیان کرد، ووترا: أبو حنيفة وادەڵێ، حماد ووتی: ئەمە والله ووتەی ئەم لە دین دەرچووەیە.** [السنة : 323] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: ئەمەش تەکفیر کردنی أبو حنيفة-یە لەلایەن پێشەوای گەورە حماد بن سلمة.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أحمد بن إبراهيم الدورقي حدثنا الهيثم بن جميل ووتی: **بیستم حماد بن سلمة دەربارەی أبو حنيفة دەیووت: ئەمە الله سەراو ژوور دەیخاتە ناو ئاگر.**

[السنة : 325] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: ئەمەش وەک دوعاکردن ووتراوە نەک هەواڵ پێدان.
القحطاني دەڵێ: الهيثم بن جميل مێشکی تێکچوو جا تەرک کرا.
ئەم حوکمەی لە (تقريب التهذيب)ی ابن حجر دەرهێناوە، بەڵام وەک خۆی نەقلی نەکردووە چونکە ابن حجر دەڵێ: سیقەیە، وەک بڵێی مێشکی تێکچووە و تەرک کراوە.
ئەمەشی بۆ گونجاندنی ووتەکەی أبو نعيم الأصبهاني ووتوە چونکە أبو نعيم دەڵێ مەتروکە.
بەڵام هەر یەک لە ئیمام أحمد وإبراهيم الحربي وابن سعد وابن حبان والدارقطني وأحمد بن صالح الجيلي والذهبي بە سیقەیان داناوە، هەربۆیە دانەرانی کتێبی (تحرير تقريب التهذيب) دەڵێن: ئەو ووتەیەی ابن حجر کە دەڵێ: لەوانەیە مێشکی تێکچوو بێت و تەرک کرا بێت، نەمان دۆزییەوە پێش ئەو کەس ئەمەی ووتبێ.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبو معمر عن إسحاق بن عيسى ووتی: **پرسیارم لە حماد بن سلمة کرد دەربارەی أبو حنيفة، ووتی: ئەمە أبو جيفة-یە، ئەمە أبو جيفة-یە، الله عز وجل زەوی پێ داخست.** [السنة : 326] **(سەنەدەکەی حەسەنە).**
ووتم: (جيفة) واتا: کەلاکی تۆپیو.
لە تەحقیقی عادل آل حمدان (إسحاق بن عيسى) بۆتە (ابن إسحاق بن عيسى) ئەمەش هەڵەیە، إسحاق بن عيسى الطباع صدوق-ە، برای محمد بن عيسى الطباع-ە.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني محمد بن أبي عتاب الأعين حدثنا منصور بن سلمة الخزاعي ووتی: **بیستم حماد بن سلمة لەعنەتی لە أبو حنيفة دەکرد. أبو سلمة ووتی: شعبة-ش لەعنەتی لە أبو حنيفة دەکرد.** [السنة : 327] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**
ووتم: چەند ڕیوایەتێک پێش ئێستا یەکێک لە سەنەدەکان محمد بن أبي عتاب الأعين-ی تێدا بوو. القحطاني ووتی: سەنەدەکە حەسەنە چونکە محمد صدوق-ە، لەم ڕیوایەتەشدا محمد بوونی هەیە کەچی القحطاني دەڵێ سەنەدەکەی صەحیحە ! چەند جارێک هەڵەی لەم شێوەیەی دووبارە کردۆتەوە، بۆ نموونە: لە ڕیوایەتی 358 و 359 و 360 شێخەکەی عبدالله ناوی محمد بن علي-ە.

القحطاني لە حاشیەدا دەربارەی ڕیوایەتی 358 دەڵێ: محمد بن علي جەرح و تەعدیلی بۆ نەکراوە، کەچی لەهەمان حاشیەدا دەربارەی ڕیوایەتی 359 و 360 دەڵێ: ڕاوییەکان سیقەن !

**عبدالله** دەڵێ: حدثني عبدة بن عبدالرحيم -مروزي شيخ صالح- أخبرنا سلمة بن سليمان ووتی: **حمزة البزاز هاتە لای ابن المبارك، ووتی: ئەی باوکی عبدالرحمن پێم گەیشتووە دەربارەی ڕۆشن بینی أبو حنيفة لە فەرموودەدا و خۆماندوو کردنی لە عیبادەتدا، تا وای لێهات وانازانم کەسێک هەبێت شان لەشانی بدات، ابن المبارك ووتی: سەبارەت بەوەی کە ووتت ڕۆشن بین بوو لە فەرموودەدا ئەوا ئەهلی ئەوە نەبوو، من دەچوومە لای بە نهێنی لەبەر سفيان الثوري، وە هاوەڵانم لۆمەیان دەکردم لەسەر چونم بۆلای، وە دەیانووت: کتێبەکانی محمد بن جابر-ی کەوتە دەست و ڕیوایەتی کرد، سەبارەت بەوەش کە ووتت خۆی ماندوو دەکرد لە عیبادەتدا ئەوا ئەهلی ئەوە نەبوو، بەیانی دەکردەوە زۆر چالاک بوو لە پرسیار وەڵامدانەوە، ئەمەش عادەتی بوو تاکو لەوانەبوو قەیلولەی لە دەست چووبوایە، پاشان ئێوارەی دەکردەوە هەر چالاک بوو، خاوەنی عیبادەت و شەونخونیش بەیانی دەکاتەوە ماندووە. [السنة : 328] (سەنەدەکەی حەسەنە).**

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني محمد بن أحمد بن يعقوب قال أخبرنا محمد بن نعيم الضبي قال سمعت أبا سعيد عبدالرحمن بن أحمد المقرئ يقول سمعت أبا بكر أحمد بن محمد بن الحسين البلخي يقول سمعت محمد بن على بن حسن بن شقيق دەیووت: **بیستم باوکم دەیووت: بیستم عبدالله بن المبارك دەیووت: یەک فەرموودە لە فەرموودەکانی الزهري لەلام خۆشەویسترە لە هەموو ووتەکانی أبو حنيفة. [تاريخ بغداد : 574/15] (سەنەدەکەی صەحیحە).**

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبو الفضل الخراساني حدثنا إبراهيم بن شماس السمرقندي ووتی: **عبدالله بن المبارك لە أبو حنيفة-ەوە ڕیوایەتی بۆ کردین لە سەنگەردا، جا پیاوێک هەڵسایەوە بۆی کونیەکەی أبو خداش بوو ووتی: ئەی باوکی عبدالرحمن ڕیوایەتمان بۆ مەکە لە أبو حنيفة-ەوە ئەو مورجیئە بوو، ابن المبارك ئینکاری ئەم شتەی لێنەکرد، جا دوای ئەمە گەر فەرموودەکە لە**

**أبوحنيفة-ەوە بوايە يان ڕەئى أبو حنيفة بوايە ابن المبارك زەربى بەسەردا دەهێنا لە كتێبەكانيدا، وە وازى هێنا لە ڕیوایەت كردن لە أبوحنيفة-ەوە. ئەم ڕیواتانەش دوا ڕیوایەت بوو كە ابن المبارك بۆ خەڵكى گێڕایەوە لە سەنگەردا، پاشان گەڕایەوە و مرد. إبراهيم دەڵێ: من لەگەڵيدا بووم لەناو كەشتيدا كاتێك لە سەنگەر گەڕایەوە، وە ئەو فەرموودەى بۆ دەگێڕاینەوە جا بەسەر هەندێك فەرموودەى أبو حنيفة تێپەڕى بە ئێمەى ووت: زەرب بهێنن بەسەر فەرموودەى أبو حنيفة من لە فەرموودە و ڕەئى أبوحنيفة دەرچووم‌ه. إبراهيم دەڵێ: ابن المبارك لە گەڕانەوەى لەم سەنگەرەدا مرد. إبراهيم دەڵێ: پیاوێك بە ابن المبارك-ى ووت ئێمەش لەلاى بووين: أبو حنيفة مورجيئه بوو بڕواى بە خروج كردن هەبوو، ابن المبارك ئینكارى ئەم شتەى لێنەكرد.**
**[السنة : 330] (سەنەدەكەى صەحیحە).**

ووتم: ئەم ڕیوایەتەش دەرى دەخات كە ابن المبارك لەكۆتايى تەمەنیدا پەشیمان بۆتەوە لە ڕیوایەت كردنى لە أبو حنيفة، وە هەڵوێستى بەرامبەرى گۆڕاوە، ئەمەش وەڵامێكى بەهێزە بۆ ئەوانەى كە دەڵێن ابن المبارك مەدحى أبو حنيفة-ى كردووە.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني القاسم بن محمد الخراساني حدثنا عبدان عن **ابن المبارك ووتى: مەجليسێك كە نازانم هەرگیز صەلەواتى تێدا درابێ لەسەر پێغەمبەر ﷺ مەجليسێك بوو، پاشان بێدەنگ بوو باسى نەكرد، جا ووتى: واتا مەجليسى أبو حنيفة.**
**[السنة : 332] (سەنەدەكەى صەحیحە).**

**عبدالله** دەڵێ: حدثني عبدالله بن أحمد بن شبويه قال سمعت عبدان دەيووت: بيستم سفيان بن عبدالملك دەيووت: **بيستم عبدالله بن المبارك دەربارەى فەتوايەكى أبو حنيفة دەيووت: جەردەيى و ڕێگرى هەندێك جار لەمە باشترە. [السنة : 335] (سەنەدەكەى صەحیحە).**

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبو الحسن بن العطار محمد بن محمد سمعت أحمد بن شبويه يقول أنبأنا أبو صالح سليمان بن صالح ووتى: **بە ابن المبارك ووترا: ڕیوایەت دەكەى لە أبو حنيفة-ەوە ؟!**

**ابن المبارك ووتی: پێی تاقی كرامەوە.** [السنة : 336] **(سەنەدەكەی صەحیحە).**

ووتم: (أبو صالح سليمان بن صالح) ناسراو بە سلمويه هاوەڵی ابن المبارك-ە سیقەیە، لە تەحقیقی عادل آل حمدان بۆتە (أبو صالح يود بن هانئ) عادل لە حاشیە دەڵێ: بەم شێوەیە بوو لە نوسخەی دەستنوس نازانم مانای چیە، وە القحطاني-ش لە حاشیەدا دەڵێ: لە نوسخەی دەستنوس بە (يود بن هانئ) بەڵام بەپێی كتێبەكانی تر چاكم كردۆتەوە.

بێگومان ئەوەی القحطاني دروستە چونكە هیچ ڕاوییەك نیە بەناوی (يود بن هانئ) بگرە ناوی يود زۆر نامۆیە، هەروەها الذهبي لە (سير أعلام النبلاء) لە ژیاننامەی أبو صالح سليمان بن صالح دەڵێ: هاوەڵی ابن المبارك بووە، أحمد بن شبويه و إسحاق بن راهويه ڕیوایەتیان لێوەی كردووە.

وەك دەبینن لەم سەنەدە أحمد بن شبويه ڕیوایەتی كردووە لە سليمان ئەویش ڕیوایەتی كردووە لە ابن المبارك، بۆیە سەنەدەكە صەحیحە.

**ابن حبان** دەڵێ: سمعت محمد بن محمود بن عدي يقول سمعت بن قهزاد دەیووت: **بیستم علي بن جرير دەیووت: بە عبدالله بن المبارك-م ووت: پیاوێك پێی وایە أبو حنيفة زاناترە لە قەزاوەت كردن لە پێغەمبەری الله ﷺ عبدالله ووتی: ئەمە كوفرە، منیش ووتم: ئەی باوكی عبدالرحمن بەهۆی تۆوە كوفر لەناو خەڵكی بڵاو بوویەوە، خەڵكی ووتیان تۆ ڕیوایەتت لە أبو حنيفة كردووە ئەوانیش ڕیوایەتیان لێیكرد، ابن المبارك ووتی: بە أبو حنيفة تاقی كرامەوە، وە چاوەكانی فرمێسكی لێدەهات.** [الثقات : 464/8]

ووتم: محمد بن محمود بن عدي بن خالد أبو عمرو المروزي یان النسوي، نەمبینی كەس جەرح و تەعدیلی بۆ بكات تەنها ئەوە نەبێ كە الخطيب دەڵێ: هاتە بغداد فەرموودەی گێڕایەوە لە فلان و فلان ... هتد، فەرموودەكانی دروست بوون، وە محمد بن عبدالله بن قهزاد المروزي سیقەیە، ڕیوایەتی دواتر ئەم ڕیوایەتە پشت ڕاست دەكاتەوە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا ابن رزق قال أخبرنا ابن سلم قال أخبرنا الأبار قال أخبرنا محمد بن المهلب السرخسي قال حدثنا **علي بن جرير ووتی: من لە كوفە بووم چووم بۆ بەصرە ابن المبارك لە بەصرە**

**بوو، پێی ووتم: خەڵكیت چۆن جێهێشت ؟ ووتم: خەڵكانێكم جێهێشت لە كوفە پێیان وایە أبو حنیفة زاناترە لە پێغەمبەری الله ﷺ ابن المبارك ووتی: ئەمە كوفرە، ووتم: تۆیان لە كوفردا كرد بە ئیمام، جا گریا تا ڕیشی تەڕ بوو، واتا: ڕیوایەتی لە أبو حنیفة كرد.**

**[تاریخ بغداد : 572/15] (سەنەدەكەی حەسەنە).**

ووتم: ووتەی كۆتایی نازانم هی كێیە كە دەڵێ (واتا ڕیوایەتی لە أبو حنیفة كرد) ماناكەی ئەوەیە كە بینیان تۆ دەچیتە لای و گوێی بۆ دەگری خەڵكیش بەهۆی تۆوە هەڵخەڵەتان و گەورەیان كرد.

**زكريا الساجي** دەڵێ: حدثني محمد بن روح المدايني قال حدثني معلى بن أسد ووتی: **بە ابن المبارك-م ووت: خەڵكی دەڵێن تۆ دەچیتە لای أبو حنیفة ! ووتی: هەموو ئەو شتانەی خەڵك دەیڵێن مەرج نیە ڕاست بێ، ئێمە دەچووینە لای و نەمان دەناسی، كاتێك ناسیمان وازمان لێ هێنا.**

**[ابن عبدالبر نەقلی كردووە - الانتقاء : 151]**

ووتم: (محمد بن روح المدايني) گەر محمد بن روح العكبري بێت كە زكريا الساجي ڕیوایەتی لێوە كردووە ئەوا پێشتر باسمان كرد، گەر ئەویش نەبێت ئەوا نایناسم و نەمدۆزییەوە.

**زكريا الساجي** دەڵێ: بیستم محمد بن الوليد البسري ووتی: **ووتەكانی أبو حنیفة-م لەبەركرد، جا ڕۆژێك لەلای أبو عاصم بووم، هەندێك لە بابەتەكانی أبو حنیفة-م لەلای خوێند، ووتی: توانای لەبەركردنت چەندە باشە، بەڵام چی وای لێكردیت شتێك لەبەر بكەیت كە پێویستت بەوە بێ تەوبەی لێ بكەیت بۆلای الله ؟!**

**[الخطيب نەقلی كردووە - تاریخ بغداد : 559/15] (سەنەدەكەی صەحیحە).**

**عبدالله** دەڵێ: حدثني إسحاق بن منصور الكوسج حدثنا محمد بن يوسف الفريابي ووتی: بیستم سفیان دەیووت: **بە سوار ووترا: سەیرێكی بەشێك لە ووتەكانی أبو حنیفة و باسەكانی بكە، سوار ووتی: چۆن ووتە لە پیاوێك قبوڵ بكەم كە نەرم ونیانی پێ نەبەخشراوە لە دینەكەیدا !**

**[السنة : 245] (سەنەدەكەی صەحیحە).**

ووتم: لە [تاریخ بغداد : 550/15] لەڕێگای الفريابي-ەوە هاتووە صەحیحە سوار دەڵێ: چۆن سەیری

ووتەی کەسێک بکەم کە نەرم و نیانی پێ نەبەخشراوە لە دینەکەیدا.

**محمد الغزالي** دەڵێ: **سەرکردەی پێشووی سەلەفیەکانی مصر شێخ حامد الفقي سوێندی خوارد بە الله کە أبو حنیفة کافرە، وە تاکو ئێستاش ئەو پیاوانەی کە ئەم سوێندە خراپەیان بیست زیندوون.** [سر تأخر العرب والمسلمين : 52]

**محمد بن عبدالله** دەڵێ: **هادەوییەکان ناسراون بەوەی کە لە فیقهدا ووتەی حەنەفیەکان وەردەگرن، ناوبانگی ئەمەش پێویستی بە نەقل کردنی ووتە نیە لەم بارەیەوە، وە زانراوە کە مەزهەبی حەنەفی دوورترین مەزهەبە لە سوننەت لەنێوان چوار مەزهەبەکەدا، لەبەر ئەم هۆکارانە:**

**١. أبو حنيفة کەوتۆتە ناو لادانی عەقیدەیی و کرداری، وەک ووتنی قورئان مەخلوقە و ئیرجاء و خروج کردن لەسەر حاکمەکان.**

**٢. پشت بەستنی بە ڕەئی تەنانەت زۆرێک لە فەرموودەکانی پێغەمبەری الله ﷺ ڕەت کردەوە، ابن أبي شيبة 125 بابەتی باسکردووە کە أبو حنيفة تێیدا موخالەفەی فەرموودەی پێغەمبەری الله ﷺ کردووە.**

**٣. أبو حنيفة لێزان نەبووە لە زانستی فەرموودەدا هەر بۆیە ڕیوایەتی کەمە سەرەڕای زۆری چوونە ناویەوە، لەبەر ئەو هۆکارەی کە باسمان کرد زانایانی فەرموودە أبو حنيفة-یان لەکەدار کرد، وە مقبل بن هادي الوادعي هەڵسا بە نوسینی کتێبەکەی (نشر الصحيفة في ذكر الصحيح من أقوال أئمة الجرح والتعديل في أبي حنيفة) تێیدا ووتەی پێشەوایانی جەرح و تەعدیلی کۆکردۆتەوە کە زیاترن لە 70 زانا، وە زۆر کەمە شتێکی ئاوا ڕووبدات کەسێک بەم ژمارە زۆرەوە قسەی پێ بووترێ، جا کە حاڵی أبو حنيفة بەم شێوەیە بوو کە باسم کرد بۆیە زۆربەی شوێنکەوتوانی موعتەزیلە بوون هەروەک زیاتر لە زانایەک ئەمەیان ووتوە، وە بەشێکمان لەمە باسکرد لە کتێبەکەماندا (القول المبين في أصناف المبدلين) وە لەوانەیە ئەمە هۆکار بێت کە زەیدییەکان و هادەوییەکان بابەتی فروع لە حەنەفیەکان وەربگرن.** [رافضة اليمن على مر الزمن : 609]

ووتم: زەیدییەکانی ئەمڕۆ پێیان دەووترێ هادەوییە، کە کۆمەڵێکی ڕافیزەن جیاوازییان هەیە لەگەڵ

زەیدییە کۆنەکان.

**عبدالله** دەڵێ: **پرسیارم لە باوکم کرد دەربارەی شعیب بن إسحاق، ووتی: نابینم هیچ عەیبێکی هەبێ (واتا لە فەرموودەدا) بەڵام لەگەڵ ئەهلی ڕەئی دانیشت، لەگەڵ أبو حنیفة دانیشت.** [العلل ومعرفة الرجال : 3127]

ووتم: ئەمەش نموونەیەکە لەسەر جەرح کردنی ڕاوی سیقە لەلایەن سەلەفەوە تەنها لەبەر نزیکیان لە أبو حنیفة.

**عبدالله** دەڵێ: **پرسیارم لە باوکم کرد دەربارەی أسد بن عمرو، ووتی: صدوق-ە، وە أبو یوسف-یش صدوق-ە، بەڵام هاوەڵانی أبو حنیفة نابێ ڕیوایەتیان لێوە بکرێ.**

[العلل ومعرفة الرجال : 5332]

ووتم: عمرو بن أسد و أبو یوسف ئەهلی صیدقن، بەڵام هەردووکیان هاوەڵی أبو حنیفة-ن بۆیە ئیمام أحمد وادەڵێ، ئەمەش جەرح کردنە بەهۆی أبو حنیفة-وە.

**أبو إسماعيل الهروي** دەڵێ: أخبرنا الحسن بن يحيى أخبرنا أحمد بن محمد بن العباس أخبرنا أحمد بن أحيد بن حمدان البخاري -بها إملاء- حدثنا أبو عاصم عمرو بن عاصم المروزي سمعت علي بن محمود بن خليل سمعت عاصم بن عصمة ووتی: **من لەلای أبو سليمان الجوزجاني بووم نامەی أحمد بن حنبل-ی بۆ هات، تێیدا هاتبوو: (گەر واز بهێنیت لە ڕیوایەت کردنی کتێبەکانی أبو حنیفة ئەوا دێینە لات و گوێ بیستی کتێبەکانی عبدالله بن المبارك دەبین لێت).** [ذم الكلام وأهله : 416]

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبو الفضل الخراساني حدثنا أبو الأحوص محمد بن حيان ووتی: **ڕۆژێکیان پیاوێک پرسیاری لە هشیم کرد دەربارەی بابەتێک، هشیم فەرموودەیەکی بۆ گێڕایەوە، پیاوەکە ووتی: أبو حنیفة و محمد بن الحسن و هاوەڵەکانی واناڵێن ! هشیم ووتی: ئەی عبدالله عیلم لە کەسانی سووک و نزم وەرناگیرێت.** [السنة : 386] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

**الفسوي** دەڵێ: حدثنا أبو بكر بن خلاد قال سمعت عبد الرحمن بن مهدي قال سمعت حماد بن زيد دەیووت: **بیستم باسی أبو حنيفة كرا، أيوب ووتی:** ﴿يُرِيدُونَ أَن يُطۡفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَيَأۡبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ﴾ **(واتا: دەیانەوێ نوری الله كە دینی ئیسلامە بكوژێننەوە بە فوی دەمیان و نەیهێڵن، وە الله ڕازی نابێت تەنها بە تەواوكردن و سەرخستنی دینەكەی نەبێت).**
[المعرفة والتاريخ : 785/2] **(سەنەدەكەی صەحیحە).**

**الفسوي** دەڵێ: حدثنا سليمان بن حرب حدثنا حماد بن زيد ووتی: **ابن عون ووتی: پێم ڕاگەیاندراوە كە لەناو ئێوەدا كەسانێك هەن ڕێگرن لەبەردەم هاتنی خەڵك بۆ سەر ڕێگای الله.**
**الفسوي دەڵێ: سليمان بن حرب ووتی: أبو حنيفة و هاوەڵەكانی لەوانەن كە ڕێگری دەكەن لە هاتنی خەڵك بۆ سەر ڕێگای الله.** [المعرفة والتاريخ : 786/2] **(سەنەدەكەی صەحیحە).**

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا ابن رزق أخبرنا أبو بكر الشافعي حدثنا جعفر بن محمد بن الحسن القاضي قال سمعت منصور بن أبي مزاحم دەیووت: **بیستم مالك دەیووت: أبو حنيفة دژایەتی دینی كرد، وە هەر كەسێك دژایەتی دین بكات دینی نیە.** [تاريخ بغداد : 552/15] **(سەنەدەكەی صەحیحە).**
ووتم: دینی نیە واتا چی ؟ كەسێك بە دژایەتی كردنی دین وەسف بكرێ حوكمی چیە ؟

**الخطيب** دەڵێ: جعفر ووتی: حدثنا الحسن بن علي الحلواني ووتی: بیستم مطرف دەیووت: **بیستم مالك دەیووت: الداء العضال لەناوچوونی دینە، وە أبو حنيفة-ش لە الداء العضال-ە.**
[تاريخ بغداد : 552/15] **(سەنەدەكەی صەحیحە).**
ووتم: ئەمجارە عبدالملك بن حبيب لە مطرف ڕیوایەتی نەكردووە تا بووترێ زەعیفە، گەر بیانووش بەوە بهێندرێتە كە مطرف شتی مونكەر لە مالك ڕیوایەت دەكات ئەوا ابن حجر وەڵامی ئەم گومانەی ابن عدي داوەتەوە، المعلمي-ش لە [التنكيل : 803/1-808] بە درێژی وەڵامی داوەتەوە، پاشان تەنها مطرف ئەمەی ڕیوایەت نەكردووە لە مالك إسماعيل بن أبي أويس-یش ڕیوایەتی كردووە، ئەمەش فەرموودە نیە تا ئاوا توند بكرێ مطرف یەكێكە لە نزیكترین قوتابیەكانی مالك لەبەردەمی پرسیار

لە مالك دەكرێ كە (الداء العضال) مانای چیە ئەویش وەڵامەكەی مالك-ی نەقل كردووە.
كە الخطيب دەڵێ: (جعفر ووتی) واتا الخطيب لە ابن رزق ڕیوایەت دەكات ئەویش لە أبو بكر الشافعي ئەویش لە جعفر، ئەمە پیشەی زۆرێك لە المتأخرين-ە كاتێك سەنەد دووبارە دەبێتەوە ڕاویە دووبارەكانی سەرەتا نانوسن، لە ڕیوایەتی پێش ئەمە الخطيب لە ابن رزق ئەویش لە أبو بكر ئەویش لە جعفر ڕیوایەت دەكات، ئەم ڕیوایەتەش كە لەدوای ئەو هاتووە بەهەمان شێوەیە الخطيب لە ابن رزق ئەویش لە أبو بكر ئەویش لە جعفر، بەڵام الخطيب ناوی دوو ڕاویە دووبارەكەی نەنوسیوەتە ڕێك چۆتە سەر جعفر، ابن عبدالبر-یش نموونەی ئاوای زۆرە لە كتێبی (الانتقاء) وەك لە بەشی دووەم دەیبینن، ئەمەی كە باسم كرد وەك ئەلف و بێ وایە هەر پێویست بە باسكردن ناكات بەڵام جاهیل و دەمارگیر بۆ أبو حنيفة هێندە زۆرن دەترسم یەكێك بچێ لەم سەنەدە بكۆڵێتەوە بڵێ الخطيب لە جعفر ڕیوایەت دەكات الخطيب دوای مردنی جعفر لە دایكبووە كەواتە سەنەدەكە منقطع-ە ! بۆیە دەمەوێت هەموو كەلێنێك دابخەم بەپێی توانا.

**أبو نعيم الأصبهاني** دەڵێ: حدثنا سليمان بن أحمد حدثنا عبدالله بن أحمد بن حنبل حدثني منصور بن أبي مزاحم ووتی: **بیستم باسی أبو حنيفة كرا، مالك بن أنس ووتی: دژایەتی دینی كرد، وە هەركەسێك دژایەتی دین بكات ئەهلی دین نیە.**
**[حلية الأولياء : 325/6] (سەنەدەكەی صەحیحە).**

**عبدالله** دەڵێ: حدثني منصور بن أبي مزاحم ووتی: **بیستم مالك باسی أبوحنيفة-ی كرد، جا بە ووتەیەكی خراپ باسی كرد، وە ووتی: دژایەتی دینی كرد، وە هەر كەسێك دژایەتی دین بكات لە دیندا نیە. [السنة : 278] (سەنەدەكەی صەحیحە).**
ووتم: ڕیوایەتی دواتر ڕوونی دەكاتەوە منصور مەبەستی چیە لە خراپ باس كردن.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني منصور جارێكی تر ووتی: **بیستم مالك دەربارەی أبو حنيفة قسەیەكی دەكرد كە لە دین دەیبردە دەرەوە، وە ووتی أبو حنيفة دژایەتی هیچی نەكرد تەنها دین نەبێت.**

**[السنة : 279] (سەنەدەكەی صەحیحە).**

ووتم: عبدالله كە دەڵێ: (حدثني منصور جارێكی تر) واتا لە دوو مەجلیسی جیادا منصور ئەم ووتانەی مالك-ی گێڕاوەتەوە بۆ عبدالله، نەك یەك مەجلیس بێت و عبدالله هەر جارەو بە شێوەیەك بیگێڕێتەوە، منصور لە ڕیوایەتی دووەمدا ڕوونی كردۆتەوە كە خراپ باسكردنی أبو حنیفة لەلایەن مالك بریتی بووە لە خستنە دەرەوەی لە دین، ئەمەش تەكفیر كردنە.

جا كە ئەم سەنەدە صەحیحانەمان هەبێ كە لەنێوان عبدالله و مالك تەنها منصور هەیە هیچ گومانێكی زەعیفی لێ ناكرێ چۆن وازلەم سەنەدانە دەهێنین و ئاوڕ لە تەئویل و عوزر هێنانەوەی ابن عبدالبر و أبو الولید الباجي دەدەینەوە كە دوو مالكی مەزهەبن و لە سەدەی پێنجەم مردوون.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: **لە مالك رحمه الله ڕیوایەت كراوە كە دەربارەی أبو حنیفة ووتەیەكی نزیك لەوەی سفیان-ی ووتوە: خراپترین منداڵە كە لە دایكبووە لە ئیسلامدا، وە ئەگەر خروجی كردبوایە لەسەر ئەم ئوممەتە بە شمشێر هێشتا سووكتر بوو، وە ڕیوایەت كراوە لێی كە پرسیاری لێكراوە دەربارەی ووتەكەی عمر (عیراق الداء العضال-ی تێدایە) مالك وتوویەتی: أبوحنیفة-یە، هەموو ئەم ووتانە هاوەڵانی مالك لە ئەهلی حەدیث ڕیوایەتیان كردووە لە مالك، بەڵام هاوەڵانی مالك لە ئەهلی ڕەئی هیچ شتێكی لەم جۆرە لە مالك ڕیوایەت ناكەن. [الانتقاء: 150]**

ووتم: ابن عبدالبر دوای هێنانی ڕیوایەتەكانی مەدحكردنی أبو حنیفة لەلایان زانایانەوە ئینجا بەم شێوەیە باسی ڕیوایەتەكانی زەمكردنی أبو حنیفة دەكات، ئەوەتا ڕیوایەتەكانی مالك بەشێوەی تمریض دەگێڕێتەوە بە سەنەد نایهێنێت دەڵێ (رُوِيَ) واتا: ڕیوایەت كراوە تا وای نیشان بدات بۆ خوێنەر كە دیار نیە صەحیحە یان نا، لەكاتێكدا هێنامان هەموو بە سەنەدی صەحیحەوە لە مالك ڕیوایەت كرابوو، وە كە دەڵێ: هاوەڵانی مالك لە ئەهلی حەدیث ئەم شتانەیان ڕیوایەت كردووە لە مالك، هاوەڵانی ئەهلی ڕەئی ڕیوایەتیان نەكردووە قسەیەكی سەیرە ! كێ هەیە ڕیوایەت بكات لە دژی ئیمامەكەی ؟ دواتر ووتەی ئەهلی حەدیث لەپێشترە یان ئەهلی ڕەئی ؟ ئەی پاشان ئەوەی شتێك ڕیوایەت دەكات كە كەسێكی تر ڕیوایەتی نەكات مانای وایە ئەم شتە بوونی نیە ؟

چەندان فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ تەنها یەک هاوەڵ ڕیوایەتی کردووە هاوەڵانی تر ڕیوایەتیان نەکردووە، لە بەشی دووەمدا بە درێژی باسی ابن عبدالبر و کتێبەکەی و ڕیوایەتەکان دەکەین.

**أبو الوليد الباجي** دەڵێ: **عبدالملك بن حبيب ڕیوایەتی کردووە دەڵێ: أخبرني مطرف ووتی: ئەوان پرسیاریان لە مالك کرد دەربارەی تەفسیری (الداء العضال) لەم فەرموویەدا، مالك ووتی: ئەمە أبو حنيفة و هاوەڵەکانیەتی، چونکە ئەو بە دوو ڕێگا خەڵکی گومڕا کرد: بە ئیرجاء و بە هەڵوەشاندنەوەی فەرموودەکان بە ڕەئی. أبو الوليد دەڵێ: أبو جعفر الداودي ووتی: ئەمەی عبدالملك بن حبيب باسی کرد گەر سەلامەت بێ لە هەڵە و چەسپا بێ ئەوا مالك لە کاتێکدا ئەم قسەیەی کردووە کە دڵی تەنگ بووە ناچار بووە کە شتێکی أبو حنيفة-یان بۆی باسکردووە کە پێی ناخۆش بووە و دڵی پێی تەنگ بووە جا ئەمەی ووتوە، زاناش هەندێکجار توشی دڵتەنگی دەبێ، وە بەلای منەوە ئەم ڕیوایەتە صەحیح نیە لە مالك-ەوە، چونکە مالك رضي الله عنه ئەوەی پێی ناسراوە لە عەقڵی و لە عیلمی و لە فەزلی و لە دینی و لە دەست هەڵگرتن لە باسکردنی خەڵکی تەنها بە حەق و بەڵگەوە نەبێ، قسە ناکات دەربارەی هیچ کەسێک لە موسڵمانان کە لێی نەکۆڵیبێتەوە، وە یەکێک لە هاوەڵانی أبو حنيفة عبدالله بن المبارك-ە، وە ڕێزگرتنی مالك بۆ ابن المبارك و تەفزیل کردنی بەناوبانگە. أبو الوليد دەڵێ: وە زانراوە کە مالك أبو حنيفة-ی باسکردووە بەوەی کە عیلمی هەیە بە بابەتەکان، وە أبو حنيفة فەرموودەی وەرگرتووە لە مالك، وە محمد بن الحسن کتێبی (الموطأ)ی وەرگرتووە لە مالك کە ڕیوایەتی دەکات لە أبي ذر عبد بن أحمد رضي الله عنه، وە أبو حنيفة ناوبانگی هەیە کە لە عیبادەت و زوهد هەبوون بەرامبەر بە دونیا گەیشتۆتە لوتکە، وە توشی مەینەتی بوو لێیدرا بە قامچی تا ببێتە قازی ئامادە نەبوو بیکات، وە مالك بۆی شیاونیە قسە بکات دەربارەی کەسێکی وەک ئەو تەنها بە شێوەیەک نەبێت کە شایستەبێ بە فەزلی أبو حنيفة، وە نازانین مالك قسەی کرد بێت دەربارەی هیچ کەسێک لە ئەهلی ڕەئی، بەڵکو قسەی کردووە دەربارەی هەندێک لە ئەهلی حەدیث لەڕووی ڕیوایەتەوە.** [المنتقى شرح موطأ مالك : 463/9]

ووتم: سەیری ئەم مالكی مەزهەبانە چۆن ئیمامەكەیان ناشرین دەكەن لەپێناوی بەرگری كردن لە أبو حنیفة، دەڵێ: لەوانەیە كاتێک مالك ئەم قسەیەی كردبێ دڵی تەنگ بووە لە أبو حنیفة بۆیە وای ووتوە ! ئەمە چ سوكایەتی كردنێكە بە مالك كە خۆشیان هەستی پێ ناكەن، ئایا ئیمامێكی وەک مالك دڵی لەهەر كەسێک تەنگ بێ لەخۆیەوە تۆمەتی مورجیئە و گومڕاكردنی خەڵكی دەداتە پاڵ تەنها لەبەر ئەوەی دڵی لێی تەنگ بووە ؟ گەر مالك كەسێكی ئاوابێ ئەوا عەدالەتی لە دەست دەدات بەڵام حاشا لە مالك كە ئاوا بێت ئەمە تەنها ووڕێنەكردنی متأخرین-ی مالكیەكانە و هیچی تر نیە، ئەگینا خیلافی نێوان مالك و اللیث بن سعد زۆر بووە لەگەلێک بابەتدا كەچی ڕێزگرتنێكی یەكجار زۆر هەبووە لەنێوانیان، ئەمە چ گاڵتەجارییەكە تۆ دڵت لە كەسێک تەنگ بێ لەخۆتەوە بڵێی مورجیئەیە و ئەهلی ڕەئیە خەڵكی گومڕا كردووە !

پاشان بە زەعیف دانانی ڕیوایەتەكەی عبدالملك لەشوێنی خۆی نیە، ڕاستە عبدالملك لە ڕیوایەت كردنی فەرموودە زەعیفە بەڵام ئیمامێكی مالكیە قسەی جێگای سەنگە لە نەقل كردنی ووتەكانی مەزهەبی مالكی، وەک ابن القطان الفاسي دەربارەی عبدالملك دەڵێ: محقق بوو بۆ لەبەركردنی مەزهەبی مالك و سەرخستنی و بەرگری كردن لێی، بە هاوەڵە گەورەكانی مالك گەیشتووە، بەڵام لە فەرموودەدا ڕێنموونی پێ نەدراوە و لە شێخێكی سەركەوتوو وەری نەگرتووە.

إبراهیم بن قاسم بن هلال دەربارەی دەڵێ: ڕەحمەتی الله لە عبدالملك بن حبیب بێ، بەرگری دەكرد لە ووتەی مالك.

الذهبي دەربارەی دەڵێ: بە لێزانی وەسف كرابوو لە مەزهەبی مالك-دا.

هەروەها عبدالملك یەكێكە لە زانا متقدمین-ەكانی مەزهەبەكە كاتێک مالك مردووە ئەو منداڵ بووە زۆرێک لە قوتابیە نزیكەكانی مالك-ی دیوە و زانست و مەزهەبی مالكی لێوەر گرتوون، ئەم ڕیوایەتەشی لە مطرف بیستووە كە قوتابی مالك بووە، جا گەر ووتەی هەر فەقیهێک وەرنەگرین دەربارەی ووتەی ئیمامی مەزهەبەكەی بە بیانووی ئەوەی لاوازە لە فەرموودە، ئەوا دەبێ كاتێک كە محمد بن الحسن الشیباني ووتەكانی أبو حنیفة نەقل دەكات هەمووی ڕەت بكەینەوە چونكە محمد زەعیفە، یان هەر محقق-ی مەزهەبێک كاتێک ووتەی خاوەن مەزهەبەكەی نەقل دەكات

دەبێ ڕەتی بكەینەوە بە بیانووی نەبوونی سەنەد ! جگە لەمەش عبدالملك لەم ڕیوایەتەدا موتابەعە كراوە وەک پێشتر هێنامان لە إسماعیل بن أبي أویس كە هەمان شت دەگێڕێتەوە لە مالك واتا تەنها مطرف ئەمەی نەبیستووە لە مالك ووتەكە ناسراو بووە.

سەبارەت بەوەش كە دەڵێ: ابن المبارك حەنەفی مەزهەب بووە، شایستەی وەڵامدانەوە نیە دوای ئەم هەموو ڕیوایەتەی لە ابن المبارك هێنامان.

دەربارەی ووتەكەی أبو الولید كە دەڵێ: مالك مەدحی أبو حنیفة-ی كردووە، دەپرسین كوا ووتەكەی مالك ؟ بگرە مالك أبو حنیفة-ی تەكفیر كردووە چ جای مەدحكردنی.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا البرقاني أخبرنا بشر بن أحمد الإسفراييني حدثنا عبدالله بن محمد بن سيار الفرهياني قال سمعت القاسم بن عبدالملك أبا عثمان دەیووت: **بیستم أبو مسهر دەیووت: ئیمامەكان لەعنەتیان لە أبو فلان دەكرد لەسەرئەم مینبەرە، وە ئاماژەی كرد بۆ مینبەری دیمەشق.**
**الفرهياني دەڵێ: أبو فلان أبو حنیفة-یە. [تاريخ بغداد : 570/15] (سەنەدەكەی صەحیحە).**

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا إبراهيم بن محمد بن سليمان المؤدب الأصبهاني قال أخبرنا أبو بكر ابن المقرئ قال حدثنا سلامة بن محمود القيسي قال حدثنا أيوب بن إسحاق بن سافري قال حدثنا رجاء السندي ووتی: **عبدالله بن إدريس ووتی: أبو حنیفة گومڕایەكی گومڕاكەر بوو، وە أبو یوسف فاسقێک بوو لە فاسقەكان. [تاريخ بغداد : 566/15] (سەنەدەكەی حەسەنە).**

ووتم: رجاء السندي سەماعی هەیە لە عبدالله بن إدريس.

محقق-ی تاریخ بغداد(٢) دەڵێ: الخطیب لە ابن یونس نەقلی كردووە كە دەڵێ: أیوب بن إسحاق بن سافري ئەخلاقی ناشرین بوو.

هەر الخطیب لە ابن أبي حاتم نەقلی كردووە كە دەڵێ: لە الرملة فەرمووودەمان لێیەوە نوسی، بۆ باوكم باسكرد باوكم ئەوی ناسیەوە ووتی: صدوق-ە.

جا أبو حاتم بڵێ صدوق-ە ئەمە وەک تەوسیق كردنی زاناكانی ترە چونكە أبو حاتم توندە، بەڵام محقق ئەم ووتەیەی الخطیب-ی نەقل نەكردووە تەنها ئەو ووتەكەی نەقل كردووە كە بە دڵیەتی.

**الخطیب** دەڵێ: أخبرنا ابن رزق قال أخبرنا عثمان بن أحمد قال حدثنا حنبل بن إسحاق ووتی: **بیستم الحمیدي کاتێک ناوی أبو حنیفة-ی هێنابوایە پێی دەووت: أبو جیفة، وە دەیووت: ئەم کەسە کونیەی بۆ دانانرێ، وە بە ئاشکرا ئەم قسەیەی دەکرد لە مسجد الحرام لە بازنەی دەرس ووتنیدا خەڵکی لە چوار دەوریەوە بوون. [تاریخ بغداد : 561/15] (سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: کونیە لە زمانی عەرەبیدا وەک ڕێزگرتن بەکار دێت، لەجیاتی ناوی کەسەکە دەڵێن: أبو فلان یان ابن فلان و هاوشێوەی ئەمانە، هەر بۆیە الحمیدي پێی وایە أبو حنیفة شایستەی ئەوە نیە بە کونیە ناوی ببرێت، بۆیە کاتێک لەلای ابن المبارك ناوی أبو یوسف دەهێنرێ کە قوتابی أبو حنیفة-یە و ناوی یعقوب-ە، ابن المبارك دەڵێ: نەخێر هیچ کەرامەتی نیە، بڵێ یعقوب.
بڕوانە [الضعفاء للعقیلي : 423/6]

**الخطیب** دەڵێ: أخبرني الحسن بن أبي طالب قال أخبرنا أحمد بن محمد بن یوسف قال حدثنا محمد بن جعفر المطیري قال حدثنا عیسى بن عبدالله الطیالسي قال حدثنا الحمیدي ووتی: **بیستم ابن المبارك دەیووت: نوێژێکم لەدوای أبو حنیفة-ەوە کرد لە ناخەوە پێی مورتاح نەبووم. الحمیدي دەڵێ: وە بیستم ابن المبارك دەیووت: 400 فەرمووودەم لە أبو حنیفة نوسیوەتەوە کە گەڕامەوە بۆ عیراق إن شاء الله دەیانسڕمەوە. [تاریخ بغداد : 572/15] (سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: الکوثري ئەم ڕیوایەتەی بە زەعیف داناوە بەهۆی أحمد بن محمد بن یوسف وە بەتایبەتی کاتێک کە لە محمد بن جعفر المطیري ڕیوایەت دەکات، بەڵام هەر خودی ژیاننامەکەی أحمد لە تاریخ بغداد ڕەددانەوەیە بۆ الکوثري، بڕوانە [التنکیل : 1/332-335] المعلمي وەڵامێکی بەهێزی الکوثري داوەتەوە دەربارەی تەزعیف کردنی ئەم ڕیوایەتە بەهۆی أحمد بن محمد بن یوسف.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أبو بکر بن زنجویه حدثنا أبو جعفر الحراني ووتی: **بیستم عیسى بن یونس دەیووت: الأوزاعي هاتە دەرەوە لێمان من والمعافى بن عمران و موسى بن أعین لەلای بووین لە بەیروت، کتێبی السیر و ڕەددانەوەی أبو حنیفة-ی لە دەست بوو، جا ووتی: گەر ئەم هەڵەیە لە ئوممەتی محمد ﷺ بێت ئەوا بەشی هەموویان دەکات، پاشان ووتی: لە ئیسلامدا هیچ منداڵێک**

**لە دایک نەبووە شومتر بێت بۆیان لە أبو حنیفة.** [السنة : 235] **(سەنەدەكەی صەحیحە).**

ووتم: القحطاني لە تەحقیقەكەیدا دەڵێ: أبو جعفر الحراني نەمدۆزییەوە كەس باسی بكات !

أبو جعفر الحراني ناوی (عبدالله بن محمد بن علي بن نفیل)ە سیقە و حافز و متقن-ە، بەڵام لۆمەی القحطاني ناكەم لەمەدا، چونكە لەم سەردەمەی ئێستادا بەهۆی ئینتەرنێتەوە ژیاننامەی زۆربەی ڕاوییەكانمان بە كلیكێك دێتە بەر دەست بە ووردەكارییەوە، كەچی الله تعالى خۆی دەزانێ كە چەندە ماندوو دەبم لە گەڕان بەدوای حاڵی ڕاوییەكان، چ جای سەردەمی القحطاني كە ساڵی 1986 تەحقیقی ئەم كتێبەی كردووە.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني أحمد بن محمد حدثنا يحيى بن آدم قال حدثنا **سفيان وشريك وحسن بن صالح ووتیان: أبو حنیفة-مان بینی هیچ ناسراو نەبوو لە فیقهدا تەنها بە مشتومڕ و دەمەدەمێ ناسراو بوو.** [السنة : 320] **(سەنەدەكەی حەسەنە).**

**الفسوي** دەڵێ: حدثني عبيدالله بن موسى ووتی: **باسی أبو یوسف و أبو حنیفة كرا لەلای سفیان الثوري، جا ووتی: ئەوانە كێن پاشان ئەوانە چین ؟! سفیان ووتی: ئێمە نەدەچووینە لای حماد تەنها بە نهێنی لە هاوەڵەكانمانەوە نەبێ، پێیان دەووتین: دەچیتە لای ! لەگەڵی دادەنیشیت ! جا نەدەچووینە لای تەنها بە نهێنی نەبێ.** [المعرفة والتاريخ : 791/2] **(سەنەدەكەی صەحیحە).**

ووتم: حماد شێخی أبو حنیفة بوو، حماد بن أبي سلیمان، أبو حنیفة لە خۆشەویستی ئەو كوڕەكەی ناوناوە حماد، أبو حنیفة دەڵێ: دوای هەموو نوێژێك دوعا بۆ حماد دەكەم لەگەڵ دایك و باوكم.

**الفسوي** دەڵێ: بیستم أبو حذيفة موسى بن مسعود ووتی: **سفیان ووتی: من دەگەیشتم بە حماد دوای ئەوەی كە بیدعەكەی داهێنا جا سەلامم لێ نەدەكرد.**
[المعرفة والتاريخ : 791/2] **(سەنەدەكەی حەسەنە).**

**أبو زرعة الدمشقي** دەڵێ: **بیستم پیاوێك بە أبو نعیم-ی ووت: سفیان قسەی لەگەڵ أبو**

**حنيفة دەکرد ؟ أبو نعيم بەسەر ئاماژەی کرد، واتا: نەخێر.**

**أبو زرعة دەڵێ: أبو نعيم پێی ووتين: أبو حنيفة دەستی دەکرد بە قسەکردن لەگەڵ سفيان.**

**[تاريخ أبي زرعة الدمشقي : 1327-1328]**

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: حدثنا صالح بن أحمد بن محمد بن حنبل قال حدثنا علي بن المديني ووتی: **بيستم يحيى بن سعيد دەيووت: أبو حنيفة بەلامدا تێپەڕی منيش لە بازاڕی کوفەدا بووم، جا پرسياری هيچ شتێکم لێی نەکرد، وە أبو حنيفة دراوسێم بوو لە کوفە نە لێی نزيک بوومەوە نە پرسياری هيچ شتێکم لێی کرد.**

**[الجرح والتعديل : القسم الأول/المجلد الرابع/449] (سەنەدەکەی صەحيحە).**

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا محمد بن أحمد بن رزق قال أخبرنا أبو بكر أحمد بن جعفر بن محمد بن سلم الختلي قال أملى علينا أبو العباس أحمد بن علي بن مسلم الأبار في شهر جمادي الآخرة من سنة ثمان وثمانين ومئتين ووتی: **باسکردنی ئەو کەسانەی کە ڕەددی أبو حنيفة-يان داوەتەوە: أيوب السختياني وجرير بن حازم وهمام بن يحيى وحماد بن سلمة وحماد بن زيد وأبو عوانة وعبدالوارث وسوار العنبري القاضي ويزيد بن زريع وعلي بن عاصم ومالك بن أنس وجعفر بن محمد وعمر بن قيس وأبوعبدالرحمن المقرئ وسعيد بن عبدالعزيز والأوزاعي وعبدالله بن المبارك وأبو إسحاق الفزاري ويوسف بن أسباط ومحمد بن جابر وسفيان الثوري وسفيان بن عيينة وحماد بن أبي سليمان وابن أبي ليلى وحفص بن غياث وأبو بكر بن عياش وشريك بن عبدالله و وكيع بن الجراح ورقبة بن مصقلة والفضل بن موسى وعيسى بن يونس والحجاج بن أرطاة ومالك بن مغول والقاسم بن حبيب وابن شبرمة. [تاريخ بغداد : 505/15] (سەنەدەکەی صەحيحە).**

ووتم: ئەمە 35 زانا کە قسەيان پێی ووتوە، جگە لەوانی تريش کە باسنەکراوە لێرەدا، کە مقبل الوادعي ژماردوويەتی گەيشتۆتە 77 زانا، جا ئايا دەکرێ هەموو ڕيوايەتەکانی ئەمانە زەعيف بن ؟ دەکرێ هەموويان درۆيان بە دەمی هەڵبەستبێ لەبەر حەسودی ؟ دەکرێ هەموويان زوڵميان لێ کردبێ و بەهەڵە ئەم شتانەی بدەنە پاڵی ؟ بێگومان نەخێر. بەڵام زۆرێک لە متأخرين و معاصرين

ئەم بیانووە بەتاڵانە بەكار دەهێنن، دەبینی یەكێكیان دەڵێ: هەمووی زەعیفە، ئەوی تریان دەڵێ: درۆیە، ئەوی تریان دەڵێ: لەبەر حەسودی وایان كردووە ! ئاخر دەبێ چ شتێك لە أبو حنيفة-دا هەبێ و لەو زانایانە بوونی نەبێ تا حەسودی پێ ببەن ؟ ئەم ووتەیە بوهتانێكی چەندە گەورە و ناشرینە دەیدەنە پاڵ زانایانی سەلەف، ئەمە وادەكات سیقەمان بە قسەكانیان نەمێنێت لە جەرح و تەعدیلدا مادام بە میزاجی خۆیان حوكم دەدەن لەسەر كەسەكان، یەكێكی تریان دەڵێ: لەبەر خیلافی فیقهی مەزهەبەكان ئەم شتانەیان بۆ أبو حنيفة دروستكردووە ! ئەی باشە بۆ أحمد قسە بە الشافعي ناڵێ بۆ الشافعي قسە بە مالك ناڵێ بۆ مالك قسە بە سفيان ناڵێ بۆ سفيان قسە بە الأوزاعي ناڵێ ؟ بۆ تەنها ئەم خیلافە فقهیە بەرامبەر أبو حنيفة ئاوا توند بووە ؟ یەكێكی تریان بەچاوی سەردەمەكەی خۆی سەیری بابەتەكە دەكات و حوكم دەدات، دەبینێت أبو حنيفة بە (الإمام الأعظم) ناونراوە و مەزهەبەكەی وەك باقی مەزهەبەكانی تر بەربڵاوە، وە ناوی أبو حنيفة هەمیشە لەپاڵ ناوی سێ ئیمامەكەی تر دێت و ناویان لێنراوە (الأئمة الأربعة) دەبینی لە بابەتە فقهیەكان ووتەی ئەو وەك ووتەی ئەوانی تر باس دەكرێ و سەنگ و قورسایی خۆی هەیە، ئیتر هەموو ئەمانە وادەكات زۆر بە سانایی هەموو ڕیوایەتەكانی سەلەف دەربارەی أبو حنيفة زەربی سفر بكات و بڵێ أبو حنيفة ئیمامێكی ئاوا گەورەیە چۆن دەكرێت ئەم ووتانە دەربارەی ئەو ڕاست بێت ؟! واقعی سەردەمەكەی خۆی دەكات بە حاكم بەسەر ڕیوایەتە صەحیحەكانی ئەو كەسانەی كە لەگەڵ أبو حنيفة-دا ژیاون و شارەزای حاڵی بوونە.

**المعلمي** لە ڕەددانەوەی ووتەی الكوثري كە وتوویەتی (ئەم زانایانە توڕە بوونە لە أبو حنيفة بۆیە ئاوایان پێ ووتوە) دەڵێ: **گەر هەموو ئەم زانایانە توڕە بن لە أبو حنيفة بەم شێوەیەی كە الكوثري باسی دەكات، ئەوا خۆزگە دەمزانی كە كێ ماوەتەوە جگە لەم پێشەوایانەی دین كە دروست بێ بووترێ ئەم كەسە ڕازییە لە أبو حنيفة ؟ كەسی تر ماوە جگە لە شكاوێك و كوێرێك و بێ خێرێك؟** [التنكيل : 1/170-171]

**المعلمي** دەڵێ: **بە دڵنیاییەوە هەوڵدانی الكوثري لەمیانەی بەرگری كردنی لە أبو حنيفة بۆ**

**تانەدان لە پێشەوایانی ئیسلام وەک سفیان الثوري وأبو إسحاق إبراهيم بن محمد الفزاري وعبدالله بن الزبير الحميدي والإمام أحمد بن حنبل والإمام أبو عبدالله البخاري و جگە لەوانیش لە پێشەوایان ئەم کارەی بە زیانترە بۆ سەر أبو حنیفة وەک لە ووتەی ئەم پێشەوایانە دەربارەی أبو حنیفة، گەر کەسێک بڵێ: ناتوانرێ أبو حنیفة ڕاست بکرێتەوە ئیللا بە لابردنی چیایە ڕۆچووەکان بە زەویدا ئەوا ئەم ووتەیە بەلای أبو حنیفة سووکترە لەوەی کە بووترێ: ناتوانرێ أبو حنیفة ڕاست بکرێتەوە ئیللا بە تانەدان لەم پێشەوایانە نەبێت، وە کارەکەی الکوثري بە زیانترە بۆ سەر أبو حنیفة لە هەموو ئەم شتانە، چونکە خەڵکی دەڵێن الکوثري زانایەکی شارەزا و نوسەرێکی کارامەیە، گەر کەسێک بتوانێ بەرگری لە أبو حنیفة بکات ئەوا الکوثري-ە، بەڵام گەر توانیبوای ئەم کارە بکات بەبێ تانەدان لەم پێشەوایانە و ئەنجامدانی هەڵەی ناشرین ئەوا لە هەموو کەس دوورتر دەبوو لەم کارانە.** [التنكيل : 716/1]

ووتم: ڕاست دەکات کەسێکی وەک الکوثري کە سەیری دەستنوس (مخطوط)ی دەکرد دەیزانی کێ نوسیویەتی و خاوەنی خەتەکەی دەناسیەوە بەم هەموو خوێندنەوە زۆرەی کە هەیەتی، بەڵام کاتێک هاتنە مەیدانی بەرگری کردن لە أبو حنیفة ئەمە حاڵی بوو، هەر لە هاوەڵانەوە بگرە پەلاماریدان تا دەگاتە دوا زانای سەردەمی خۆی، وە کۆمەڵێک هەڵەی زانستی گەلێک قێزەونی ئەنجامدا لەم پێناوەدا بە زانستەوە نەک بە جەهلەوە کە بووە هۆی ئابڕووچوونی، وە بە دڵنیاییەوە گەر ڕێگای تر هەبوایە جگە لەمە ئەوا الکوثري دەیگرتە بەر وخۆی توشی ئەم گێژاوە نەدەکرد بە درۆ و فێڵ و تەدلیس و بوهتان و تۆمەتبارکردنی زانایان بەرگری لە أبو حنیفة بکات، جا تۆی خوێنەریش حاڵت لەو خراپتر بێت باشتر نابێت گەر بتەوێ خۆی بخەیتە گێژاوی لەم شێوەیە و بەرگری لە أبو حنیفة بکەیت.

بە دەگمەن کەسی ئاوا دەدۆزرێتەوە لە کتێبەکانی جەرح و تەعدیل کە ئەم هەموو هۆکارەی تێدا بێت بۆ جەرح کردنی، تەنها لە (تاريخ بغداد) الخطيب ناوی 35 زانای هێناوە کە قسەی پێ دەڵێن، (مقبل بن هادي الوادعي) لە کتێبی (نشر الصحيفة في ذكر الصحيح من أقوال أئمة الجرح

والتعديل في أبي حنيفة) ژمارەی ئەو زانایانەی کە قسەیان بە أبو حنيفة ووتوە دەیگەیەنێتە 77 زانا هەمووی بە سەنەدی صەحیح و حەسەن، ئایا کەس دەدۆزنەوە ئەم هەموو ژمارە زۆرە لە زانایان قسەی پێ بڵێن ؟ کەسێک دەدۆزنەوە کە مالك و دوو سوفیانەکە و دوو حەممادەکە و الأوزاعي وابن المبارك و الشافعي وأحمد والبخاري ومسلم قسەی پێ بڵێن جگە لە أبو حنيفة ؟ ئایا دوای هەموو ئەمانە هێشتا ئامادە نین قسەتان بخەنە پاڵ قسەی زانایانی سەلەف دەربارەی ئەم کەسە ؟ یان هێشتا سوورن لەسەر ئەوەی کە بڵێن ئیمامی ئەهلی سوننەیە ئەوەی بە خراپە باسی بکات لە ئەهلی سوننە لایداوە و چۆتە ڕیزی خەواریج و غولاتی تەکفیر ؟ بینیتان هیچ کام لەم زانایانەی سەلەف بڵێن: دەزانین أبو حنيفة کوفر و بیدعە و گومڕایی زۆرە بەڵام لەبەر ئەوەی خاوەن مەزهەبە چاوپۆشی لەم شتانەی دەکەین و پلەو پایەی بەرز ڕادەگرین و ڕەحمەتی بۆ دەنێرین و عوزری بۆ دەهێنینەوە ؟ هەروەک چۆن لە ئێستادا ئەم جۆرە قسانە دەکرێت بۆ پەردەپۆش کردنی کوفری زاناکان !

**ئیمام مالك** دەڵێ: **ئەوەی لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دین نەبێت، ئەمڕۆش نابێتە دین.**

**بڕوانە** [الإحكام في أصول الأحكام لابن حزم : 58/6]

ووتم: ئەم ووتەیە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ بوونی نەبووە کە بووترێ زانا کوفری کرد تەکفیری ناکەین و ڕەحمەتی بۆ دەنێرین و پلەی بەرز ڕادەگرین و عوزری بۆ دەهێنینەوە، قورئان و سوننەت بەرین لەم ووتەیە لەکوێ هێناتان ؟

## دوو قاعیدە دەربارەی جەرح و تەعدیل:

پێش ئەوەی بچینە سەر نەقل كردنی ڕیوایەتەكان دەربارەی مەدحكردنی أبو حنيفة پێویستە چەند خاڵێک باس بكەین كە چەسپاوە لەلای زانایان تاكو ئاڵۆزی دروست نەبێ لە مامەڵە كردن لەگەڵ ڕیوایەتەكانی زەمكردنی و مەدحكردنی.

**یەكەم: (جەرحی ڕوونكراوە پێشی تەعدیل دەخرێت).**

ئەم ووتەیە لای زانایانی جەرح و تەعدیل بە قاعیدەی (الجرح المفسر مقدم على التعديل) ناسراوە، بگرە خەڵكانی ئاسایی لەكاتی دوو هەواڵی دژ بەیەكدا ئەم قاعیدەیە بەكاردەهێنن بەبێ ئەوەی هەستی پێ بكەن، وەک دواتر باسی (قيد) بەندەكانی ئەم قاعیدەیە دەكەین كە چ كاتێک بەكار دێت و چ كاتێک بەكار نایەت.

سەرەتا هەردوو ووشەی (جەرح و تەعدیل) ڕوون دەكەینەوە ئینجا دواتر ئەم قاعیدەیە شی دەكەینەوە:

جەرح: واتا قسە ووتن بە كەسێک جا چ لەڕووی عەقیدەكەی بێت یان لەڕووی ئەخلاقیەوە یان لەڕووی عیبادەتیەوە یان لەڕووی خراپی توانای لەبەركردنی فەرموودەوە بێت ...هتد.

تەعدیل: واتا ستایشكردنی كەسێک لەو شتانەی كە لە سەرەوە باسمان كرد.

الجرح المفسر مقدم على التعديل: واتا ئەو جەرحەی كە هۆكارەكەی ڕوونكراوەتەوە پێشی ئەو تەعدیلە دەخرێت كە موجمەلە و ناتوانێ بەرامبەر جەرحەكە بوەستێ.

ووشەی (المفسر) زۆر گرنگە لەو قاعیدەیەدا چونكە ئەو كەسەی كە تەعدیل دەكرێ لای زانایەكی شارەزا بەهۆكارەكانی جەرح و تەعدیل ئەوا ئەصل وایە ئەم تەعدیلە قبوڵ بكرێ تا ئەو كاتەی زانایەک دێت جەرحی دەكات بە بەڵگەوە، واتا هۆكاری جەرح كردنەكەی تەفسیر دەكات و ڕوونی دەكاتەوە كە بۆچی جەرحی ئەم كەسە دەكات، جا كە ڕوونی كردەوە هۆكارەكەی چیە ئەوكات جەرحی ئەو پێش تەعدیلی زاناكەی تر دەخرێت كە تەعدیلی كردووە بە موجمەلی، چونكە ئەو

زانایەی کە جەرحی کردووە زانیارییەکی زیاتری هەیە دەربارەی کەسەکە کە زاناکەی تر ئەم زانیارییەی نیە، هەروەها گرنگی ڕوونکردەوە و تەفسیرکردنی جەرحەکە بۆ ئەوەشە کە بزانین ئایا خودی ئەم شتەی کە کەسەکەی پێ جەرح کراوە شایەنی ئەوەیە کە پێی جەرح بکرێ یان نا، ئەگەر شایەنی بوو وەردەگیرێت، گەر شایەنی نەبوو ڕەت دەکرێتەوە، وە دەبێت پلەی ئەو زانایەش بزانین کە تەعدیلی دەکات یان جەرحی دەکات بەتایبەتی لە جەرح وتەعدیل کردن لە بابەتی فەرموودەدا، وە زۆربەی زانایانیش کە دەڵێن ئەم قاعیدەیە بە ڕەهایی وەرناگیرێت مەبەستیان زیاتر بابەتی فەرموودەیە نەک بابەتی عەقیدە، چونکە زانایانی جەرح و تەعدیل لە جەرح و تەعدیل کردنی ڕاوییەکانی فەرموودە هەم لە زانستەکەدا پلەیان جیاوازە هەم لە مەنهەجدا جیاوازن، هەیانە توندە لە جەرح کردن بە بچووکترین شت جەرحی ڕاوی دەکات، لەم کاتە ووتەی ئەو زانایانە پێش دەخرێت کە تەعدیلیان کردووە و لە مەنهەجدا مامناوەندن، یان زانا هەیە ناسراوە بە شلی لە تەعدیل کردندا ڕاوییەک تەعدیل دەکات لەکاتێک زانایەکی تر کە پلەی لەو بەرزترە یان مەنهەجی مامناوەندە بە توندی و شلی ناسراو نیە تەعدیلی ڕاوییەکە دەکات ئەوکات تەعدیلی ئەو پێش دەخرێت، بەڵام لە بابەتی عەقیدەدا نابینین خیلافێکی ئەوتۆ هەبێت مەگەر زاناکە عەقیدەی پاک نەبێ ئینجا خیلاف دروست بکات، ئەگینا کێ هەیە تەکفیری جەهمیەکان نەکات، کێ هەیە تەکفیری ئەو کەسە نەکات کە دەڵێ قورئان مەخلوقە، کێ هەیە مورجیئە بە گومڕا و بیدعەچی نەزانێت، کێ هەیە فکرەی خەواریج بە بیدعەیەکی پیس و گومڕایی نەزانێت، کێ هەیە ئەهلی ڕەئی بە گومڕا و بیدعەچی نەزانێت، کێ هەیە فێڵ کردن لە شەرعدا بە حەڕام و تاوانێکی گەورە نەزانێت، کێ هەیە دژایەتی بانگەوازکەرانی ئیرجاء نەکات، کەس هەیە تەکفیری ئەو کەسە نەکات کە گاڵتە بە فەرموودە دەکات و زۆر بێ ئەدەبانە ڕەتی دەکاتەوە ؟ کەس نیە تەنها کەسانی گومڕا و خاوەن عەقیدەی پیس ئەم شتانە بەلایانەوە ئاساییە، هەر بۆیە نەمان بینی لەم خاڵانەی سەرەوە کەس خیلافی هەبێت دەربارەی أبو حنيفة، لەڕووی فەرموودەوەش هەموویان بە مەتروك و زەعیفی دەزانن تەنها يحيى بن معين نەبێت دوو ڕیوایەتی جیاوازی لێوە کراوە لەشوێنێک تەزعیفی دەکات و لە شوێنێک تەوسیقی دەکات، جا گەر واز لەم هەموو ووتەیە بهێنن و شوێنی ووتەیەکی گوماناوی

یحیی بن معین بکەون ئەوا هیچ شتێکمان نیە بۆ ووتن بۆ ئەم جۆرە کەسانە، لەڕووی عەقیدەش ئەو ووتانەی کە دەربارەی أبو حنیفة ووتراوە هەمووی تەفسیر کراون کە هۆکارەکەی چیە وەک لە بڕگەی یەکەم تا بڕگەی نۆیەم هێنامان واتا هۆکاری جەرحەکە ڕوونکراوەتەوە، ئەو ووتانەش کە لە بڕگەی دەیەم هێنامان کە بەشێوەیەکی گشتی دەربارەی ووتراوە بەبێ باسکردنی هۆکارەکەی ئەوا هەر بە هۆکارەکانی پێشوو لێک دەدرێتەوە، دوای ئەوەی زانیمان أبو حنیفة ئەم هەموو کوفر و بیدعە و گومڕاییەی هەبووە ئیتر ناپرسین بۆچی سفیان الثوري و الأوزاعي بۆ ووتیان أبو حنیفة شومترین کەسە کە لە ئیسلامدا لەدایکبووە، ناپرسین شریك بۆ ووتی گەر هەر ماڵێک لە کوفە عەرەق بفرۆشن ئەوا باشترە عەقیدەیان وەک أبو حنیفة بێت، ناپرسین عبدالرحمن بن مهدي بۆ ووتی هیچ فیتنەیەک لە ئاسمان دانەبەزیوە خراپتر بێت لە أبو حنیفة، ناپرسین مالك بۆ ووتی أبو حنیفة دژایەتی دینی کردین ...هتد، چونکە هەموو ئەم جەرحانە بەهۆی بڕگەکانی پێشوو تەفسیر دەکرێن، بۆ نموونە کەسێکی ناسراو لە کوردستان دەژی کۆمەڵێک کوفر وبیدعە وگومڕایی بەسەردا ساغ بۆتەوە، کە کەسێک دەڵێ: ئەم کەسە گومڕایە بیدعەچیە کافرە گومڕاکەرە ...هتد، تۆ لێی ناپرسیت بۆچی وای پێ دەڵێی، چونکە حاڵی کەسەکە دەزانی، جا بۆیە کاتێک لە بەشی دووەم ڕیوایەتەکانی مەدحکردن دەهێنین کە زانایەک دەڵێ أبو حنیفة زیرەک بوو، یەکێک دەڵێ خاوەن وەرع بوو، یەکێک دەڵێ سەخی بوو، یەکێک دەڵێ دەست پاک بوو، یەکێک دەڵێ ئەمانەت پارێز بوو... هتد، هەموو ئەمانە تەعدیلی موجمەلن بەهیچ جۆرێک جەرحە تەفسیر کراوەکانی ئەم هەموو زانایەی پێ ڕەت ناکرێتەوە، دواتر ئەمانە بابەتی ترن پەیوەندییان بە کوفر و بیدعەکانیەوە نیە، خۆ ئەمڕۆش دەبینین چەندین زانای مورتەد قورئان و دوو صەحیحەکەی لەبەرە و دەست پاک و دەم پاکە و خۆی لە بچووکترین گوناه بە دوور دەگرێت، هەموو سوننەتێکی تێدا بەدی دەکرێت لە ڕووکەشدا و خاوەن شەو نوێژ و ڕۆژوو گرتن و بەخشینی زۆرە، بگرە لەزۆر بابەتی دیندا بلیمەتە کەچی هیچ کام لەم وەسفانە ڕێگر نین لەوەی کە پێی بڵێین مورتەدە و گومڕا و گومڕاکەرە.

**الخطيب** دەربارەی ئەوەی گەر جەرح و تەعدیل لە کەسێکدا کۆ ببێتەوە کامەی پێش دەخرێت دەڵێ: **زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە کەسێک یەکێک و دووان جەرحی بکەن وە هەمان ژمارەش تەعدیلی بکەن ئەوا جەرح لە پێشترە، هۆکاری ئەم پێشخستنەی جەرح ئەوەیە کە کەسی جەرحکەر هەواڵ دەدات دەربارەی شتێکی شاراوە کە زانیویەتی، ووتەی کەسی تەعدیلکەریش پشت ڕاست دەکاتەوە و پێی دەڵێ ئەوەی تۆ دەربارەی حاڵی کەسەکە زانیوتە لە ڕواڵەت ئەوا زانیوتە، بەڵام من شتێکی تر دەزانم لە لێکۆڵینەوەم بۆ بارودۆخی کەسەکە کە تۆ نەتزانیوە.**
[الكفاية في علم الرواية : 105-106]

**محمد عجاج الخطيب** باسی مەنهەجی زانایان دەکات لەکاتی دژ بەیەک بوونی جەرح و تەعدیل دەڵێ: **زانایان سێ ووتەیان هەیە لەم بارەیەوە: ووتەی یەکەم: پێشخستنی جەرح بەسەر تەعدیل ئەگەرچی تەعدیلکەران ژمارەیان زیاتر بێت، چونکە جەرحکەر شتێکی بۆ دەرکەوتووە کە تەعدیلکەر بۆی دەرنەکەوتووە، ئەمەش ووتەی جمهوری زانایانە ...** (دوای هێنانی ووتەی دووەم و سێیەم ئینجا دەڵێ) **ووتەی یەکەم فەرموودەناسانی المتقدمين و المتأخرين بۆی چوونە.**
[أصول الحديث علومه ومصطلحه : 174-175]

**القاضي عياض** دەڵێ: **فەرموودەناسان و فەقیهەکان و ئوصولیەکان خیلافیان هەیە لە بابەتی ڕیوایەت و شایەتیدان گەر تەعدیلکەران کەسێک تەعدیل بکەن و کەسانی تریش جەرحی بکەن، جا جەرحەکە لەپێشترە و ئیجماعی زانایانیان گێڕاوەتەوە لەمەدا، بەڵگەکەش ئەوەیە کە کەسی جەرحکەر شتێکی زیاتر دەزانێ کە تەعدیلکەر نایزانێ ئەمەش ڕوونە و خیلافی تێدا نیە گەر ژمارەی جەرحکەران زیاتر بێت.** بڕوانە [مقدمة ابن الصلاح ومحاسن الاصطلاح : 293]

**مقبل بن هادي الوادعي** دەڵێ: **جەرحی أبو حنيفة تەفسیر کراوە هەروەک باسی دەکەین إن شاء الله تعالى، وە جەرح لە کەسێکەوە دەرچێت کە زانا بێت بە هۆکارەکانی جەرحکردن ئەوا تەعدیل لای نابات، هەروەک چۆن زانراوە لە کتێبی المصطلح دا.** [نشر الصحيفة : 5]

ووتم: هەم باسی قاعیدەکەی کرد بە گشتی، وە هەم نموونەی بە أبو حنیفة هێنایەوە، جا مقبل الوادعي عەقیدەی هەر چۆنێک بێت ئینکاری لەوە ناکرێت کە زانایە لە زانستەکەی خۆیدا کە فەرموودەیە، تا بیانووی ئەوانەش ببڕین کە دەڵێن ئەم قاعیدەیە بە ڕەهای وەرناگیرێت، ئەوەتا دەربارەی أبو حنیفة بەکاری دەهێنێت، نزیکەی 100 زانا قسەیان بە أبو حنیفة ووتوە ئەم هەموو جەرحە بە چ بیانووێک ڕەت دەکرێتەوە ؟ مەگەر وەک الكوثري خۆتان بکەن بە مەجنونی أبو حنیفة هەرچی زانا هەیە تانەی لێ بدەن و حیساب بۆ ووتەکانیان نەکەن.

**دووەم: (ڕەتکردنەوەی جەرحی ڕوونکراوە بەبێ هیچ بەڵگەیەک واتای تانەدانە لە کەسە جەرحکەرەکە، بەڵام ڕەت کردنەوەی تەعدیلی موجمەل مانای تانەدان نیە لە کەسە تەعدیلکەرەکە).**

جەرحی ڕوونکراوە کاتێک ڕەت دەکرێتەوە کە بزانرێ کەسە جەرحکراوەکە پەشیمان بۆتەوە یان ئەو ووتەیەی دەربارەی ووتراوە ڕاست نیە، یان کەسە جەرحکەرەکە زیادەڕەوی کردووە بە شتێک جەرحی دەکات کە شایستەی جەرح کردن نیە وەک لە خاڵی پێشوو باسمان کرد، بەڵام کاتێک هیچ بەڵگەیەکی ئاوامان بەدەستەوە نەبێت جەرحی زانایەکی شارەزا بە زانستی جەرح و تەعدیل ڕەت بکەینەوە ئەوا مانای تانەدانە لەو زانایە چونکە ووتەکەی ئەو ڕەت دەکەیتەوە و هیچ نرخی بۆ دانانێیت.

**الخطيب دەڵێ: هەواڵ پێدانی تەعدیلکەر دەربارەی عەدالەتی ڕواڵەتی کەسێک مانای ئەوە نیە کە ڕاستگۆیی ووتەی جەرحکەر نەفی بکات لە جەرحکردنی بۆ کەسەکە، ئەمەش وادەکات کە جەرح لە پێشتر بێت وەک لە تەعدیل. [الكفاية في علم الرواية : 106]**

**السخاوي دەڵێ: ئەوپەڕی ووتەی تەعدیلکەر ئەوەیە کە هیچ فسقێک نازانێت دەربارەی کەسەکە، وە گومانی وانیە کە فاسق بێت بۆیە وا گومان دەبات کە عەدالەتی هەبێ، چونکە زانست هەبوون بەشتێک کە بوونی نەبێت نایەتەدی، وە کەسی جەرحکەر دەڵێ من فاسق بوونی**

**ئەو کەسەم زانی، جا لەم کاتەدا گەر بڵێین فاسق نیە ئەوا جەرحکەرەکە دەبێتە درۆزن، بەڵام گەر بڵێین فاسقە ئەوا تەعدیلکەر و جەرحکەر هەردووکیان ڕاستگۆ دەردەچن لەو ووتەیەی دەربارەی کەسەکە وتوویانە.** [فتح المغيث : 189/2]

**الخطیب** دەڵێ: **ئەوەی کاربکات بە ووتەی جەرحکەر ئەوا ئەو کەسەی تۆمەتبار نەکردووە کە تەعدیلی کردووە وعەدالەتیشی لەکەدار نەکردووە، وە هەر کاتێک کار نەکەین بە ووتەی جەرحکەر ئەوا ئەمە دەبێتە هۆی بە درۆ خستنەوەی و هەڵوەشاندنەوەی عەدالەتەکەی.**

[الكفاية في علم الرواية : 106-107]

ووتم: قبوڵ کردنی ووتەی جەرحکەر هیچ بێ ڕێزییەکی تێدا نیە بۆ کەسی تەعدیلکەر، چونکە کەسی جەرحکەر شتێکی زانیوە کە تەعدیلکەر نەیزانیوە، وە هیچ بە درۆ خستنەوەیەکی تێدا نیە بۆ کەسی تەعدیلکەر، بەڵام قبوڵ نەکردنی ووتەی جەرحکەر واتا من هیچ نرخ بۆ جەرحەکەی تۆ دانانێم و متمانەم بە ووتەکەت نیە، وە بە درۆزنت دەزانم لەو شتانەی کە باسی دەکەیت دەربارەی کەسەکە، بەتایبەتی گەر کەسە جەرحکەرەکان ژمارەیان زۆر بێت و جەرحەکەشیان ڕوونکراوە بێت ئەوا تانەدانێکی زۆر گەورەیە لێیان کاتێک ووتەکانیان قبوڵ ناکەن دەربارەی کەسەکە، ئەمە لەکاتێکدا ئەو جەرحانەی کە بۆ أبو حنیفة کراون تەعدیلەکان بەرامبەری نەوەستاون بەڵکو لەلایەنی تر تەعدیل کراوە، بۆ نموونە یەکێک دەڵێ جەهمی بوو، ئەوی تر دەڵێ خاوەن وەرع بوو زۆر سەخی و دەست پاک بوو، ئەم تەعدیلە گەر بە صەحیحیش هاتبێ ئەوا بەهیچ جۆرێک نەفی جەرحەکە ناکات، کاتێک نەفی دەکات کە بە بەڵگەی زۆر بەهێز بیسەلمێنن ئەم شتانەی دەربارەی ووتراوە هیچی ڕاست نین، بگرە تەنها ئەوەش نا چونکە ووتنی جەهمی نەبوو مەدح نیە، ووتنی بیدعەچی و گومڕا نەبوو مەدح نیە تەنها ئەستۆ پاکیە لەو شتەی کە دراوەتە پاڵی، بەڵکو ئەوە مەدحە کە لە سەردەمی خۆی پلەی ئیمامەتی پێدرابێ و بە ئەهلی سوننە حیساب کرابێ و زانایان ڕێزیان لێ گرتبێ و بە شان و باڵیان هەڵدابێ.

# ووتەکان نامرن بە مردنی خاوەنەکانیان:

بەڵێ ڕاستە ئەو زانایانەی کە زەمی أبو حنيفة-یان کردووە مردوون، بەڵام ووتەکانیان نامرن هەر بە زیندوویی دەمێنن و سەنگ و قورسایی خۆیان هەیە و دەبێ قبوڵیان بکەین، نەک لەگەڵ مردنی خاوەنەکانیان ووتەکانیشیان بخەینە ژێر خاک.

**ابن القيم** دەڵێ: **ووتەکان نامرن بە مردنی خاوەنەکانیان، هەروەک چۆن ڕیوایەتەکان نامرن بە مردنی ڕاوییەکان و نەقلکەرانی ڕیوایەتەکان.** [أعلام الموقعين : 129/6]

**محمد بن صالح** دەڵێ: **ئەگەر بڵێین ووتەی مرۆڤ دەمرێت دوای مردنی خاوەنەکەی ئەوا خەڵکی سوود لە ووتەکەی نابینن دوای مردنی، جا بێگومان صەواب ئەوەیە کە ووتەکان نامرن بە مردنی خاوەنەکانیان و دەمێننەوە، جا بەپێی ئەمە گەر کەسێک بڵێ خەڵکی ئەم سەردەمە لەسەر ووتەیەک ئیجماعیان هەیە، دەڵێین بەڵام خەڵکی سەردەمی زوو یان بەشێک لەوان موخالەفەیان کردوون، جا بۆیە ئیجماع دروست نابێت.** [شرح الأصول من علم الأصول : 503]

ووتم: گەر لەم سەردەمەدا زۆربەی زانایان کۆکن لەسەر پێشەوایەتی کەسێک، بەڵام ئەوانەی کە لە پێشوودا مردوون ئەو کەسەیان تەکفیر کردووە یان تەبدیع و تەفسیق کردووە و بە گومڕایان زانیوە، ئەوا ووتەکانیان هەر ماون و زیندوون ئەگەرچی خۆشیان مردوون، بۆیە ئەوەی لەسەردەمی ئەواندا ئیجماعی لەسەر بووە ئیجماعی سەردەمەکانی تر هەڵی ناوەشێنێتەوە، بەڵکو مەحاڵە دوو ئیجماعی دژ بەیەک دابمەزرێن.

سەرەتا دەمەوێ ئاماژە بەوە بدەم کە لە گەڕانم بەدوای ئەو کتێبانەی کە دەربارەی أبو حنيفة ووتەی تێدا نەقل کراوە چ بە چاکە باسکردن بێ یان بە خراپە باسکردن، سەرنجی شتێکمدا ئەویش ئەوە بوو کە هەموو ئەو کتێبانەی کە ڕیوایەتی مەدحی أبو حنيفة-ی تێدا هاتووە یان خاوەنی کتێبەکە خۆی مەدحی أبو حنيفة-ی کردووە گشتیان دوای سەدەی سێیەم نوسراون، واتا هیچ کتێبێک لە سەدەی دووەم و سێیەم نادۆزیتەوە بۆ بەرگری کردن یان مەدحکردنی أبو حنيفة نوسرابێ، تەنها چەند ڕیوایەتێک هەیە لە (تاريخ يحيى بن معين) کە مەدحی أبو حنيفة-ی تێدا کراوە، يحيى بن معين سەرەتا مەیلی هەبووە بەلای مەزهەبی حەنەفی و دەمارگیری هەیە بەرامبەر الشافعي وەک دیارە، دەڵێ: پێم باشترە موسڵمان شوێنی ڕەئی أبو حنيفة بکەوێت نەک ڕەئی الشافعي، زیادەڕەوی يحيى بن معين بەرامبەر الشافعي ڕوونە تەنانەت تەزعیفی کردووە لەکاتێکدا هیچ کەسێک الشافعي تەزعیف نەکردووە، سەبارەت بەوەش کە دەڵێ ڕەئی أبو حنيفة باشترە ئەمە وەک بەراوورد بە ڕەئی الشافعي وادەڵێ، خۆ گەر بێتو ڕەئی أبو حنيفة بە چاک بزانێت ئەوا دەبێتە پەڵەیەک بە نێوچەوانی يحيى نەک ببێتە بەرگری بۆ أبو حنيفة، چونکە وەک بینیتان بڕگەی هەشتەم کە دەربارەی ئەهلی ڕەئی بوو لە هەمووی فراوانتر بوو لە هێنانی ووتەکان، جا کاتێک ئەم هەموو زانایە زەمی ڕەئی أبو حنيفة بکەن ئەوا مەدحی يحيى نەک نابێتە بەرگری بۆی بەڵکو بەسەر يحيى دەشکێتەوە دەبێت کەسێک بێت بەرگری لە يحيى بکات کە چۆن هەڵەیەکی لەم شێوەیەی کردووە، گەر بێتو عوزریشی بۆ بهێنینەوە ئەوا دەتوانین بڵێین لە سەرەتادا ئەم قسەیەی کردووە چونکە سەرەتا لەلای محمد بن الحسن الشيباني کتێبەکانی أبو حنيفة-ی خوێندووە کاریگەر بووە پێی، ئەوەشمان بیر نەچێت کە هەر يحيى بوو ووتی أبو حنيفة جەهمی بوو، جا لێرەدا مەبەستم ئەوەبوو کە دەبینین کتێبەکانی سەدەی دووەم و سێیەم خاڵین لە مەدحکردنی أبو حنيفة مەگەر بە دەگمەن ئەگینا تەنها زەمکردنی هاتووە، ئەوانەی کە بەرگرییان لێی کردووە یان مەدحیان کردووە دوای سەدەی سێیەم هاتوون.

بۆ نموونە:

(المصنف - ابن أبي شيبة) 235 هـ

(السنة - عبدالله) 290 هـ

(المعرفة والتاريخ - الفسوي) 277 هـ

(التاريخ الكبير والتاريخ الأوسط - البخاري) 256 هـ

(العلل - زكريا الساجي) 307 هـ

(الطبقات الكبير - ابن سعد) 230 هـ

(سؤالات البرذعي لأبي زرعة الرازي) 264 هـ

(الجرح والتعديل - ابن أبي حاتم) 327 هـ

(تاريخ أبي زرعة الدمشقي) 281 هـ

(الضعفاء والمتروكين - ابن الجارود) 307 هـ

(الكنى والأسماء - مسلم) 261 هـ

(الضعفاء والمتروكين - النسائي) 303 هـ

تەنانەت هەندێک لەو کتێبانەش کە خاوەنەکانیان لەدوای سەدەی سێ ژیاون پڕپەتی لە زەمی أبو حنيفة، وەک:

(الضعفاء - العقيلي) 322 هـ

(الكامل في ضعفاء الرجال - ابن عدي) 365 هـ تەنها چەند ڕوایەتێکی کەمی مەدح کردنی هێناوە

(المجروحين - ابن حبان) 354 هـ

(ذم الكلام وأهله - أبو إسماعيل الهروي) 481 هـ

جگە لە کۆمەڵێک کتێب کە بۆ ڕەددانەوەی أبو حنيفة نوسراون بەناوی (الرد على أبي حنيفة) وەک کتێبەکەی الحميدي 219 هـ، کتێبەکەی نعيم بن حماد 228 هـ، کە ئێستا بوونیان نەماوە، هەموو ئەم کتێبانە نابینیت یەک ڕوایەتی تێدا بێت مەدحی أبو حنيفة بکات، هەمووی بە خراپە باسی دەکات، کەچی دەبینین لەدوای سەدەی سێیەم کەسانێک پەیدابوون کۆمەڵێک ڕوایەت نەقل دەکەن کە تێیدا مەدحی أبو حنيفة کراوە و زۆر بەرزکراوەتەوە لەلایەن ئەو کەسانەی کە هەر لەم کتێبانەی سەرەوە قسەی زۆر خراپیان پێی وتووە، جا تۆ بڵێی ئەم کەسانە دوو ڕووبن

لەلایەک بەناخی زەویدا بیبەنە خوارەوە لەلایەکی تریش بەرزی کەنەوە بۆ ئاسمان ؟ یان زاناکانی سەلەف زۆر حەسود و زاڵم بووبن تەنها ووتە خراپەکانیان نەقل کردبێ ؟ یان ئەو ووتانەی کە مەدحی أبو حنیفة-ی تێدا کراوە لەلایەن سەلەف تەنها دەستی زاناکانی سەدەی چوارەم و پێنجەم و شەشەم و دواتر کەوتووە، زاناکانی سەدەی دووەم و سێیەم لێی بێ ئاگابوونە ؟! ئەی باشە گەر ئەم هەموو زانایە بە شان و باڵی أبو حنیفة-یان هەڵداوە بۆ کەسیان کتێبێکی نەنوسی بۆ بەرگری کردن لە أبو حنیفة و ڕەددانەوەی ئەو ووتانەی کە لەدژی ووتراوە ؟ بۆچی سەدەی دووەم و سێیەم پڕاوپڕە لە قسە ووتن بە أبو حنیفة لە تەکفیر کردن بگرە تا بچووکترین قسە کەسیش ئینکاری لێ ناکات، کەچی لە سەدەکانی دواتر ئەم شتە تەواو پێچەوانە دەبێتەوە ؟ دەبێت چی ڕووی دابێت ؟ بۆیە پێم وایە زۆربەی ڕیوایەتەکان کە مەدحی أبو حنیفة-ی تێدا کراوە بۆنی درۆی لێدێت یان زۆر زەعیفە یان کەسانی مەجهول لە سەنەدەکانیدا هەیە، وە گریمان صەحیحیش بن هەمووی تەعدیلی موجمەلە کە ناتوانرێ جەرحە موفەسەرەکان ڕەت بکاتەوە هەروەک پێشتر باسمان کرد (جەرحی ڕوونکراوە پێشی تەعدیل دەخرێت) أبو حنیفة مورجیئە بووە بگرە بانگەوازی کردووە بۆ ئیرجاء فەتوای داوە بۆ خروج کردن گاڵتەی بە فەرموودە کردووە و ڕەتی کردۆتەوە و جەهمی بووە و فەتوای فێڵاوی داوە و کوفری بەواحی هەبووە ئیتر کەسێک بێت بڵێ کەسم نەدیوە وەک أبو حنیفة زیرەک بێ یان لە فیقهدا زۆر زیرەکە و هاوشێوەی ئەم ووتانە دەربارەی بووترێ، چۆن ئەم هەموو تاوانە گەورەیەی لەسەر لادەچێ بە مەدحێکی ئاوا ؟!

# هەڵوەستەیەک لەسەر ئەو کتێبانەی کە دەربارەی مەدح کردنی لە أبو حنيفة نوسراون:

وەک پێش ئێستا باسمان کرد کتێبەکانی سەدەی دووەم و سێیەم خاڵین لە مەدحی أبو حنيفة، بۆیە ئەوەی بەدەستەوە لە مەدحکردنی أبو حنيفة-دا هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ دوای سەدەی سێیەم، زۆربەشیان حەنەفی مەزهەبن هەر ئەوانیش سەرەتا هەڵساون بەم کارە، ئەمەش شتێکی چاوەڕوانکراوە و سەیر نیە کە بەرگری لە پێشەوایەکەیان بکەن.

### أحمد بن الصلت (308 هـ)

ناوی (أحمد بن محمد بن الصلت بن المغلس)ە، کونیەکەی (أبو العباس الحماني)ە، هەندێکیش وەک تەدلیس بە أحمد بن عطية ناوی دەبەن تاکو بیشارنەوە لە سەنەد دا.

حەنەفی مەزهەبێکی درۆزنە، ناسراوە بە درۆکردن بە دەمی پێغەمبەر ﷺ وە دروستکردنی ڕیوایەتی درۆ بۆ مەدحکردنی أبو حنيفة، والله المستعان یەکەم کەس حەنەفی مەزهەبێکی دەمارگیری درۆزن دەستی داوەتە ئەم کارە، بێگومان ئەوانەی دوای ئەویش دێن پشت بەو دەبەستن، هەروەک چۆن ئەوانەی دوای الفسوي و عبدالله هاتوون ڕیوایەتی زەمکردنی أبو حنيفة نەقل دەکەن پشتیان بە ژمارەیەک ڕیوایەتی ئەوان بەستووە، ئەمەش بەهەمان شێوەیە، بۆیە هیچ کتێبێک نەنوسراوە دەربارەی مەدحی أبو حنيفة ئیللا ڕیوایەتی أحمد بن الصلت-ی تێدایە.

ابن عدي دەربارەی أحمد بن الصلت دەڵێ: ڕیوایەت دەکات لەو شێخانەی کە مردوون پێش لەدایکبوونی خۆی بە سەردەمێکی زۆر، لە درۆزنەکان کەسم نەدیوە لەو بێ حەیاتر بێ.

أبو الفتح بن أبي الفوارس دەڵێ: فەرمووده هەڵدەبەستێ.

أبو بكر البرقاني دەڵێ: فەرمووده هەڵدەبەستێ، لە مەتروکەکانە.

ابن حبان دەڵێ: فەرمووده هەڵدەبەستێ.

أبو نعيم الأصبهاني دەڵێ: ڕیوایەت لەو شێخانە دەکات کە پێیان نەگەیشتووە، هیچ نیە.

ابن عراق دەڵێ: فەرموودە هەڵدەبەستێ.
الخطيب البغدادي دەڵێ: فەرموودەی زۆری گێڕایەوە، زۆرینەی باطل بوون، خۆی دروستی کردبوون.
سبط ابن العجمي دەڵێ : درۆزن و فەرموودە هەڵبەستە.
ابن حبان دەڵێ: هاوەڵەکانم هانیاندام کە بڕۆم فەرموودەی لێوە ببیستم، کاتێک چووم بینیم دوو فەرموودەی دروستکراوی گێڕایەوە، زانیم فەرموودە هەڵدەبەستێ، نەچوومەوە بۆلای، وە ڕیوایەتی لە ژمارەیەک شێخ دەکرد کە وانازانم ئەوانی بینیبێت.
الدارقطني دەڵێ: فەرموودەی هەڵدەبەستا.
الحاکم دەڵێ: فەرموودەی ڕیوایەت کردووە لە القعنبي ومسدد وابن أبي أويس و بشر بن الوليد کە خۆی دروستی کردوون، وە هەروەها چەندین مەتنی دروستکردووە، سەرەڕای درۆکردنی لەوەی کە دەڵێ بەم شێخانە گەیشتووم.

## مكرم بن أحمد أبو بكر القاضي (345 هـ)

قوتابی أحمد بن الصلت-ە هەڵدەستێ بە نوسینی کتێبێک بەناوی (مناقب أبي حنيفة) کە پڕیەتی لە ڕیوایەتی درۆ دەربارەی مەدحکردنی أبو حنيفة کە لە شێخەکەیەوە ڕیوایەتی کردووە.

**الخطيب** لە ژیاننامەی أحمد بن الصلت کە دەکاتە شێخی مكرم بن أحمد دەڵێ: **لە بشر بن الحارث (واتا: بشر الحافي) و يحيى بن معين و علي بن المديني ڕیوایەت دەگێڕێتەوە کە کۆی کردۆتەوە دوای دروستکردنی دەربارەی مەدحکردنی أبو حنيفة.** [تاريخ بغداد: 338/5]
ووتم: (دوای دروستکردنی) واتا خۆی ڕیوایەتەکانی دروستکردووە.

**الخطيب** دەڵێ: حدثني أبو القاسم الأزهري ووتی: **پرسیار کرا لە أبو الحسن علي بن عمر الدارقطني منیش گوێم گرتبوو، دەربارەی کتێبەکەی (مكرم بن أحمد) کۆکراوەی ڕیوایەتەکانی مەدحکردنی أبو حنيفة، الدارقطني ووتی: هەڵبەستراوە هەمووی درۆیە، أحمد بن المغلس**

**الحماني هەڵی بەستاوە، خزمی جبارة.** [تاريخ بغداد : 342/5] (سەنەدەکەی صەحیحە).

ووتم: أحمد بن المغلس الحماني واتا أحمد بن الصلت، وەک پێش ئێستا ناومان هێنا، (جبارة) مامی أحمد بوو.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا القاضي أبو عبدالله الحسين بن علي الصيمري قال أخبرنا عبدالله بن محمد الحلواني قال حدثنا مكرم بن أحمد قال حدثنا أحمد بن محمد -يعني الحماني- قال حدثنا محمد بن مثنى صاحب بشر بن الحارث ووتی: **بيستم ابن عيينة ووتی: زاناکان ئەمانەن: ابن عباس لە سەردەمی خۆی، الشعبي لە سەردەمی خۆی، أبو حنيفة لە سەردەمی خۆی، الثوري لە سەردەمی خۆی.**

**الخطيب دەڵێ: ناوهێنانی أبو حنيفة لەم ڕیوایەتدا الحماني زیادی کردووە، ئەوەی ڕاستە ئەمەیە:** أخبرنا علي بن محمد بن عبدالله المقرئ الحذاء قال أخبرنا أحمد بن جعفر بن سلم الختلي قال حدثنا أبو بكر أحمد بن محمد بن عبدالخالق قال حدثنا أبو بكر المروزي قال حدثني محمد بن أبي محمد عن **سفيان ابن عيينة ووتی: زانایانی سەردەم سیانن: ابن عباس لە سەردەمی خۆی، الشعبي لە سەردەمی خۆی، سفيان الثوري لە سەردەمی خۆی.**

**الخطيب دەڵێ: گەر وترا بۆ ئینکاری لێدەکەی ئەی ئەگەر ڕیوایەتەکەی الحماني صەحیح بێت و ڕیوایەتی دووەم ناوی أبو حنيفة-ی تێدا سڕابێتەوە لەلایەن ڕاوییەکان؟ دەڵێم: دوو شت ڕێگری لەم ئەگەرە دەکەن: یەکەمیان: عبدالرزاق بن همام ئەم ووتەیەی ڕیوایەت کردووە لە سفيان بن عيينة ڕێک وەک ڕیوایەتی دووەم، دووەمیان: ئەوەی بە صەحیحی لە سفيان بن عيينة هاتووە قسە ووتن بووە بە أبو حنيفة ...** (پاشان الخطيب بە سەنەدەوە ئەو ڕیوایەتە دەهێنێ کە سفيان بن عيينة دەڵێ: هیچ منداڵێک لەدایک نەبووە لە ئیسلام زیانی زیاتر بێت لە أبو حنيفة بۆ سەر ئەهلی ئیسلام، ئینجا الخطيب دەڵێ) **وە سفيان بن عيينة جگە لەم ووتەیە ووتەی تری زۆرە دەربارەی أبو حنيفة کە لەمە دەچێت لە مانادا لە ژیاننامەی أبو حنيفة-دا باسمان کرد، جا گەر سفيان بن عيينة ئاوا أبو حنيفة بە گەورە بزانێ و بە چوارەم پێشەوای ئیسلامی دابنێ قسەی لەم شێوەیەی پێ ناڵێت، جا دەرکەوت کە ووتمان أحمد بن المغلس زیادی کردووە لە ڕیوایەتەکەدا و خۆی دروستی کردووە.**

[تاريخ بغداد : 5/340-341]

ووتم: ئەوانەی کاتێک ڕیوایەتەکانی زەمکردنی أبو حنيفة دەبینن خێرا دەچن بەبێ لێکۆڵینەوە ڕیوایەتەکانی مەدحکردنی أبو حنيفة دەهێنن، خۆزگە وەک الخطيب ئاوا بە ئینصافەوە سەیری بابەتەکە بکەن، نەوەک ڕیوایەتەکان بەیەکتردا بدەن بەبێ تێڕوانین لە سەنەدەکانیان، ئەوەتا الخطيب کە لەلای چەسپاوە بە صەحیحی سفيان بن عيينة قسەی بە أبو حنيفة ووتوە، کە کاتێک دەبینێت سفيان لە ڕیوایەتێکی تر مەدحی أبو حنيفة دەکات بە درۆی دادەنێت، وە بەهەمان شێوە کاتێک ڕیوایەتەکانی مەدحکردنی أبو حنيفة دەهێنێت لە تاريخ بغداد پێش ئەوەی بچێتە سەر ڕیوایەتەکانی زەمکردنی أبو حنيفة ئاماژە بەوە دەدات کە ئەوەی لەلایەن زانایانەوە چەسپاوە و دروستە پێچەوانەی ئەم مەدحانەیە، ئێوەش کە بینیتان لە بەشی یەکەم ئەو هەموو زانایە قسەیان بە أبو حنيفة ووت کە کاتێک دەبینن هەمان زانا مەدحی أبو حنيفة دەکات بەهەمان شێوەی الخطيب مامەڵە بکەن، ناکرێ زانایەک تەکفیری بکات یان بە گومڕا و جاهیل و خەواریج و مورجیئە و ئەهلی ڕەئی وەسفی بکات لەهەمان کاتدا بەرزی بکاتەوە و بە شان و باڵی هەڵدات، ئەمە وەک حوکمێکی حسي، جگە لەوەی دوای لێکۆڵینەوە لە سەنەدەکان دەبینین زۆربەی ئەو ڕیوایەتانەی مەدحی تێداکراوە درۆیە یان زەعیفە، ئەوانەشی کە صەحیحن تەنها مەدحێکی موجمەلە نابێتە هۆی ڕەت کردنەوەی جەرحە ڕوونکراوەکان.

## أبو جعفر الطحاوي (321 هـ)

حەنەفی مەزهەبە، دەووترێ کتێبێکی هەبووە دەربارەی مەدحی أبو حنيفة بەناوی (عقود المرجان في مناقب أبي حنيفة النعمان) بەڵام کتێبەکە بوونی نەماوە.

## علي بن محمد بن الحسن بن كأس النخعي (324 هـ)

حەنەفی مەزهەبە، کتێبێکی هەبووە دەربارەی مەدحی أبو حنيفة بەناوی (تحفة السلطان في مناقب النعمان) بەڵام کتێبەکە بوونی نەماوە، بەشی یەکەمدا ئاماژەمان پێدا کە چەند ڕیوایەتێکی هەیە لە تاريخ بغداد جگە لەو کەسی تر ڕیوایەتی نەکردووە دەربارەی أبو حنيفة، وە هەندێک ڕیوایەتی ئەومان نەقل کرد لەڕێگای الخطيب-ەوە، وەک لە بەشەشدا هەندێکی دەهێنین.

## عبدالله بن محمد بن أبي العوام (؟؟؟ هـ)

حەنەفی مەزهەبە، ناسراوە بە (ابن أبي العوام) کتێبەکەی چاپکراوە و بەردەستە بەناوی (فضائل أبي حنيفة وأخباره ومناقبه) محقق-ی کتێبەکە لەسەر بەرگەکەی نوسیویەتی ساڵی (335 هـ) مردووە، وە هیچ پاڵپشتیەکیشی بۆ ئەم زانیارییە نەهێناوە، بەڵام التنوخي لە کتێبی [تاريخ علماء النحويين من البصريين والكوفيين وغيرهم : 57] دەڵێ: فإن أبا القاسم عبدالله بن محمد بن يحيى بن أبي العوام المصري حدث سنة أربع وأربعين وثلاثمائة، قال حدثني يموت بن المزرع البصري. واتا: التنوخي دەڵێ: ابن أبي العوام ساڵی 344 هـ ڕیوایەتی کردووە لە يموت بن المزرع. ئەمەش بەیەکەوە ناگونجێ ساڵی 335 مردبێ و ساڵی 344 ڕیوایەت بگێڕێتەوە، بەڵام محقق-ی کتێبەکەی التنوخي دەڵێ ئەم ڕیوایەتە کێشەی تێدایە چونکە يموت بن المزرع ساڵی 304 مردووە چۆن ابن أبي العوام ساڵی 344 ڕیوایەتی لێوە دەکات ؟ ئینجا هاتووە چارەی بۆ ئەمە دۆزیوەتەوە گوایە لەوانەیە کوڕەکەی بێ بەناوی مهلهل بن يموت بن مزرع یان سەنەدەکە بەم شێوەیە بێ: ابن أبي العوام عن مهلهل عن أبيه. بەڵام محقق-ی کتێبەکەی التنوخي-ش کەوتۆتە هەڵەوە لەمەدا چونکە ئەگەرچی يموت ساڵی 304 مردووە، زۆر ئاساییە قوتابیەکی ئەو دوای 40 ساڵ ڕیوایەت لە شێخەکەی بگێڕێتەوە، بۆ نموونە البخاري شێخێکی هەیە ساڵی 230 مردووە، البخاري لە ساڵی 250 ڕیوایەتێک لە شێخەکەی دەگێڕێتەوە، دەووترێ البخاري لە ساڵی 250 ڕیوایەتی کرد لە شێخەکەی، ئەمە ساڵی گێڕانەوەی ڕیوایەتەکەیە نەک ساڵی بیستنی لە شێخەکەی، شێخەکە ساڵی 230 مردووە بێگومان البخاري پێش ئەو ساڵە لێی بیستووە، بەڵام دوای مردنی شێخەکەی ڕیوایەتەکەی گێڕاوەتەوە.

عبدالله بن أبي العوام کە نوسەری کتێبەکەیە، کوڕێکی هەیە بەناوی محمد، ئەویش کوڕێکی هەیە بە ناوی أحمد، واتا أحمد نەوەی عبدالله-یە، هەر ئەویش ئەم کتێبەی لە باپیریەوە ڕیوایەت کردووە و بڵاوی کردۆتەوە، هەروەک محقق لە لاپەڕە 11 ی کتێبەکە دەڵێ کاتێک عبدالله ڕەشنوسی کتێبەکەی تەواوکرد مرد، ئینجا نەوەکەی بۆی تەواو کرد لەگەڵ زیادە خستنە سەری هەندێک

ڕیوایەت، کەواتە ئەم کتێبە لە ڕیوایەتی أحمد-ە لە محمد-ی باوکی ئەویش لە عبدالله-ی باوکی کە هەرسێکیان ناسراون بە ابن أبي العوام، بۆیە لە هەموو سەنەدەکانی ناوکتێبەکە نوسراوە (حدثني أبي قال حدثني أبي) تەنها چەند ڕیوایەتێکی کەم نەبێت کە ابن أبي العوام-ی نەوە خۆی زیادی کردۆتە سەر کتێبەکە.

**ڕوونکردنەوەی حاڵی ئەم کوڕ و باوک و باپیرەیە:**

عبدالله بن أبي العوام - باپیرە، دانەری کتێب.
محمد بن عبدالله بن أبي العوام - کوڕ ، ڕاوی کتێب لە باوکی.
أحمد بن محمد بن عبدالله بن أبي العوام - نەوە، ڕاوی کتێب لە باوکی، هەروەها بڵاوکەرەوەی کتێبەکەیە.

یەکەمیان: باپیرە، ناوی تەواوی (عبدالله بن محمد بن أحمد بن أبي العوام)ە، کونیەکەی (أبو القاسم السعدي)ە.
هیچ باسی ژیاننامەی نەکراوە کە کەسێکی چۆن بووە، تەنها ئەوەندە نەبێ کە عبدالقادر القرشي الحنفي لە کتێبی (الجواهر المضية في طبقات الحنفية) دەڵێ: باپیری أحمد بن محمد-ە کوڕەکەی ناوی محمد بووە. هیچی تر باس ناکات دەربارەی هەر ئەوەندە، لە کتێبی تریش باسی ژیاننامەی نەکراوە. بڕوانە [الجواهر المضية في طبقات الحنفية : 327/2]

دووەمیان: کوڕەکە، ناوی تەواوی (محمد بن عبدالله بن محمد بن أحمد بن أبي العوام)ە.
ئەمەشیان هیچ باسی ژیاننامەی نەکراوە لە کتێبەکاندا، عبدالقادر القرشي الحنفي لە ژیاننامەی عبدالله-ی باوکی دەڵێ: کوڕەکەی ناوی محمد-ە، دواتر باسی ژیاننامەی دەکەم، بەڵام باسی ناکات، جا نازانم بیری چووە یان چی ؟ وانەبێ باسی کردبێ بەڵام من نەمدۆزی بێتەوە، بەڵکو محقق-ی کتێبەکەش نەڵێ نەمدۆزیەوە ژیاننامەی محمد لە کتێبەکەدا.

سێیەمیان: نەوەکە، ناوی تەواوی (أحمد بن محمد بن عبدالله بن محمد بن أحمد بن أبي العوام)ە، کونیەکەی (أبو العباس السعدي)ە.
ئەمەیان عبدالقادر باسی ژیاننامەی کردووە لە (الجواهر المضية في طبقات الحنفية) وە ابن حجر لە کتێبی (رفع الإصر عن قضاة مصر) شتی زیاتری باسکردووە لە ژیاننامەکەی، وە تقي الدين التميمي لە کتێبی (الطبقات السنية في تراجم الحنفية) هەر لە عبدالقادر نەقلی کردووە، وە ژیاننامەکەشی دەری دەخات کە چ جۆرە کەسێک بووە.

لەساڵی (349 هـ) لەدایکبووە، لە سەردەمی عوبەیدییەکان لە مصر ژیاوە، کە ناسراون بە دەوڵەتی فاطمییەکان، کە بۆماوەی 200 ساڵ حوکمی مصر-یان کرد لەنێوان ساڵانی (362 - 567) دەوڵەتێکی ڕافیزەی زندیقی کافر بوون بە ئیجماعی زانایان، کوفریان زۆر زیاتر بووە لە ڕافیزەی ئێستا، ئەم أحمد-ە قازی بووە لە دەوڵەتەکەی ئەواندا وە بە مەزهەبی ئەوان حوکمی کردووە، هەروەک لە (الجواهر المضية) و (رفع الإصر عن قضاة مصر) هاتووە پاشای ئەوکات بەناوی (الحاكم بأمر الله) لەسەر قسەی (أبو الفضل جعفر الضرير) أحمد دەکات بە قازی، بەڵام ڕەخنەی لێدەگرن کە أحمد لەسەر مەزهەبی الحاكم نیە، ئەویش لەسەر أحمد دەیکات بە مەرج کە کاتێک لە مەجلیسی حوکم دانیشت چوار فەقیهی لەگەڵ بێت کە لەسەر مەزهەبی الحاكم بن بۆ ئەوەی هیچ حوکمێک دەرنەکات ئیللا لەسەر مەزهەبەکەی الحاكم بێت، ئەویش دەبێتە قازی لە ساڵی 405، وە دوای مردنی الحاكم بالله، کوڕەکەی دێتە سەر حوکم بەناوی (الظاهر لإعزاز دين الله) ئەویش هەر أحمد بە قازی دەهێڵێتەوە لەشوێنی خۆیدا.
بڕوانە [رفع الإصر عن قضاة مصر : 71-75]
جا ئەمە حاڵی نەوەکەیە، باوک و باپیریشی حاڵیان دیار نیە کە چۆن بوونە.

تێبینی: الخطیب لە [تاريخ بغداد : 2/245-246] باسی کەسێک دەکات بەناوی (ابن أبي العوام) کە الدارقطني وتوویەتی: صدوق-ە، بەڵام ئەویان ناوی (محمد بن أحمد بن أبي العوام بن يزيد بن دينار أبو بكر الرياحي التميمي)ە، خەڵکی بەغدادە ساڵی 276 مردووە، پەیوەندی بەمانەوە

نیە كە خەڵكی مصر بوونە، ناوەكەی و ساڵی مردنی بەسە بۆ زانینی ئەمە.

ووتەی هەندێک لە زانایان دەربارەی عوبەیدییەكان:

**أبو شامة المقدسي** دەڵێ: **دەڵێن دەوڵەتی فاطمیە یان دەوڵەتی عەلەوییە، بەڵكو دەوڵەتی یەهودییە یان مەجوسی باطنی مولحیدە.**
[كتاب الروضتين في إخبار الدولتين : 140/2]

**الذهبي** دەربارەی ڕووخاندنی دەوڵەتی عوبەیدییەكان لەلایەن صلاح الدين الأيوبي دەڵێ: **ئەم كارە لە ڕێزدارترین كارەكانی بوو، باشترین كاری كرد، چونكە ئەوانە باطنی زندیق بوون، بانگەشەی تناسخ-ی ڕوحەكانیان دەكرد، وە باوەڕیان بە شی بوونەوەی بەشێک لە الله لە ڕوحەكانیاندا هەبوو.** [تاريخ الإسلام : 276/39]
ووتم: (تناسخ الأرواح) واتا: كە كەسێک دەمرێ ڕوحەكەی دەچێتە ناو لاشەی كەسێكی تر.

**الذهبي** دەڵێ: **عوبەیدییەكان دوژمنی الله و پێغەمبەرەكەین.** [سير أعلام النبلاء : 373/15]

**الذهبي** دەڵێ: **القاضي عياض لە ژیاننامەی أبو محمد الكستراتي نەقلی كردووە كە پرسیاری لێكراوە: كەسێک بني عبيد زۆری لێبكەن كە بچێتە ناو بانگەوازەكەیان یان دەیكوژن ؟ ووتی: كوشتن هەڵدەبژێرێ و عوزری نیە، وە واجبە لەسەری ڕابكات چونكە نیشتەجێ بوون لە شوێنێكدا كە داوای پەكخستنی شرائع لە خەڵكەكەی دەكرێ جائیز نیە.** [سير أعلام النبلاء : 151/15]
ووتم: ئەمەش وەڵامێكە بۆ ئەوانەی كە بیانەوێ عوزر بۆ ئەم كارەی ابن أبي العوام بهێننەوە گوایە لەترسی گیانی بۆتە قازی.

**الذهبي** دەڵێ: **القاضي عياض ووتی: زانایانی قەیرەوان یەكدەنگ بوون لەسەر ئەوەی كە حاڵی بني عبيد حاڵی مورتەد و زندیقەكانە.** [سير أعلام النبلاء : 151/15]

**ابن تيمية** دەربارەی عوبەیدییەکان دەڵێ: **لە ناخەوە مولحیدن، دەستیان دایە مەزهەبی فەیلەسوف و مەجوسەکان لەگەڵ تێکەڵ کردنی ووتەی ڕافیزە لەگەڵی، جا وای لێهات باشترین شت کە دەریان دەخست لە ئیسلامدا دینی ڕافیزە بوو، بەڵام لە ناخەوە مولحید بوون لە یەهود و نەصارا خراپتر بوون، وە ئەوەی نەگەیشتبێ بە لوتکەی بانگەوازەکەیان ئەوا بە ڕافیزەیی دەمێنێتەوە لەناو ئیسلامدا، بۆیە هەندێک لە زانایان دەربارەیان وتوویانە: ڕواڵەتی مەزهەبەکەیان ڕەفزە، ناخەکەشی کوفرێکی صافە.** [الرد على البكري : 494]

**ابن تيمية** دەڵێ: **هەواڵی عوبەیدییەکان لەلای زانایان بەناوبانگە بە ئیلحاد و دژایەتی الله و پێغەمبەرەکەی و هەڵگەڕانەوە و نیفاق.** [منهاج السنة النبوية : 101/4]

ووتەی هەندێک لە زانایان دەربارەی الحاكم بأمر الله:

**الذهبي** لە ژیاننامەی الحاكم دەڵێ: **عوبەیدی مصری رافیزی، بەڵکو ئیسماعیلیەکی زندیقە، بانگەشەی ربوبیەتی دەکرد، شەیتان بوو، فیرعەونی سەردەمی خۆی بوو، لەهەر کاتێکدا حوکمێکی دەردەکرد خەڵکیشی ناچار دەکرد کە پێی پابەند بن، فرمانی دەکرد بە جوێندان بە هاوەڵان، وە نوسینی لەسەر دەرگای مزگەوت و شەقامەکان، وە فرمانی بە ژێردەستەکانی دەکرد کە جوێن بدەن بە هاوەڵان، وە ئەو ماسیانەی حەڕام کردبوو کە پولەکەیان پێوە نیە، کەسێکی کەوتە بەردەست کە ئەم جۆرە ماسیەی فرۆشت بوو کوشتی، وە لە ساڵی 402 فرۆشتنی خورمای حەڕام کرد، بەشێکی زۆری لێ کۆکردەوە وسوتاندی، وە فرۆشتنی ترێی قەدەغە کرد، وە نەصاڕاکانی پابەند کرد کە صەلیب لە ملیان هەڵواسن، وە یەهودییەکانی پاند کرد کە سەری ئەو گایە لە ملیان هەڵواسن کە دەیپەرستن، وە دەووترێ بانگەشەی خوایەتی کرد، بەڵام کەسە نزیکەکانی ترسانیان بەوەی کە خەڵک لێی هەڵسێتەوە ئەویش وازی هێنا.**

بڕوانە [سير أعلام النبلاء : 15/173-176]

**ابن كثير دەڵێ: گەر ووتاربێژ ناوی الحاکم-ی هێنابوایە هەموو خەڵکی هەڵدەستانەوە سەرپێ، وە هەمان شتیان دەکرد لە مصر لەگەڵ زیادکردنی سوجدە بردنیش، سوجدەیان دەبرد لەکاتی ناوهێنانیدا، ئەوەی لەناو نوێژ بوایە سوجدەی دەبرد، ئەوەی لە بازاڕ بوایە سوجدەی دەبرد، وە خەڵکیش سوجدەیان دەبرد لەگەڵ سوجدەی ئەوان، لعنهم الله سبحانه وتعالى.**

[البداية والنهاية : 511/15]

ووتم: جا ئەمە ئەو کەسە بووە کە ابن أبي العوام لە سەردەمی ئەودا بۆتە قازی و بەپێی مەزهەبی ئەو حوکمی کردووە.

## عبدالله بن محمد بن أحمد الحارثي البخاري (340 هـ)

حەنەفی مەزهەبە، کونیەکەی (أبو محمد)ە، ناسراوە بە (الأستاذ) کتێبێکی هەیە بەناوی (کشف الأستار) دەربارەی مەدحی أبو حنيفة، بەڵام بوونی نەماوە.

ابن الجوزي دەڵێ: أبو سعيد الرواس ووتی: تۆمەتبار بوو بە هەڵبەستنی فەرموودە.

أحمد السليماني دەڵێ: سەنەدی هەڵدەبەستا بۆ مەتن و مەتنی هەڵدەبەستا بۆ سەنەد، ئەمەش جۆرێکە لە فەرموودە هەڵبەستان.

حمزة السهمي دەڵێ: پرسیارم لە أبو زرعة أحمد بن الحسين الرازي کرد، ووتی: زەعیفە.

الحاكم دەڵێ: خاوەنی گێڕانەوەی فەرموودەی عەجیبە لە کەسە سیقەکانەوە، وە بەتەنها ئەو ڕیوایەتی کردووە.

الخطيب البغدادي دەڵێ: احتجاجی پێ ناکرێ، وە دەڵێ: خاوەنی فەرموودەی عەجیب و غەریب و مونکەرە، شایستەی احتجاج پێ کردن نیە.

جا یەکێک ئەمە حاڵی بێت درۆ بکات بە دەمی پێغەمبەر ﷺ زۆر لەلای ئاسانترە درۆ بکات لەپێناوی أبو حنيفة کە پێشەوایەتی.

## يوسف بن أحمد بن يوسف بن الدخيل أبو يعقوب الصيدلاني المكي (388 هـ)

کتێبێکی هەیە بەناوی (سيرة أبي حنيفة) بوونی نەماوە، بەڵام بەهۆی کتێبەکەی ابن عبدالبر-ەوە

(الإنتقاء في فضائل الأئمة الثلاثة الفقهاء) زۆربەی ڕیوایەتەکانی ئەم کتێبەمان دەست کەوتووە گەر هەمووی نەبێ، ڕیوایەتەکانی مەدحکردنی أبو حنیفة لە (الانتقاء) گەر بکەین بە سێ بەش دوو بەش زیاتری لە کتێبەکەی یوسف بن أحمد ڕیوایەت کردووە، لە ڕێگای حکم بن منذر بن سعید بن عبدالله، جا هەندێکجار ابن عبدالبر لەڕێگای حکم بن منذر ڕیوایەت دەکات لە یوسف بن أحمد، هەندێکجاریش ناوی حکم بن منذر لە سەنەدەکە لادەبات و ڕاستەوخۆ دەڵێ: قال أبو یعقوب یان قال یوسف بن أحمد.

یوسف بن أحمد قوتابی العقیلي بووە، کتێبی (الضعفاء)ی لە العقیلي ڕیوایەت کردووە جگە لەویش کەسانی تر ڕیوایەتیان کردووە. جەرح و تەعدیلی بۆ نەکراوە تەنها الذهبي نەبێ بە (مُسنِد مكة) ناوی دەبات ئەمەش وەسفێکە لای زانایان خیلافی لەسەرە کە بە چ مانایەک دێت زۆرینەی موتەئەخیرین دەڵێن ئەو کەسەیە کە گرنگی بە ڕیوایەت کردنی فەرموودە موسنەدەکان دەدات ئەگەرچی زانستێکی ئەوتۆی نەبێ بە فەرموودە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە خاوەن کتێب و ڕاوی کتێب بووە ئەمە تۆزێک پلەی بەرزتر دەکاتەوە ئەگەرچی تەوسیقیش نەکرابێ بەڵام ئەم جۆرە ڕاوییانە لەکاتی موخالەفە کردنی ڕیوایەتی سیقەکان و هێنانی ڕیوایەتی غەریب ئەوا ڕیوایەتەکانیان ڕەت دەکرێتەوە، جا نازانم بۆ چاوی لە شێخەکەی نەکردووە کە لە کتێبی (الضعفاء) هیچ ڕیوایەتێکی مەدحکردنی أبو حنیفة-ی نەهێناوە تەنها ئەو ڕیوایەتانەی هێناوە کە تێیدا زەمکراوە، وە نازانم چ سودێکی لە کتێبی شێخەکەی بینیوە کە ڕیوایەتی کردووە !

حکم بن منذر ئەویش کە قوتابی یوسف بن أحمد-ە و شێخی ابن عبدالبر-ە، بەهەمان شێوە جەرح و تەعدیلی بۆ نەکراوە لەڕووی ڕیوایەتەوە، تەنها ابن بشکوال و ابن حزم باسیان کردووە.

**ابن بشکوال** دەڵێ: **أبو علي ووتی: بیستم أبو أحمد جعفر بن عبدالله دەیووت: حکم بن منذر ئەهلی مەعریفە و زیرەکی بوو، بیری زۆر تیژ بوو، زانستێکی زۆری هەبوو لە ئەدەب کەس شانی**

**لەشان نەدەدا.** [الصلة في تاريخ أئمة الأندلس : 210/1]

ووتم: الذهبي لە تاريخ الإسلام ژیاننامەی حكم بن منذر-ی لە ابن بشكوال نەقل کردووە بەڵام بە کورتی هێناویەتی.

**ابن حزم** دەڵێ: **حكم سەرۆکی موعتەزیلەیە لە ئەندەلوس، وە گەورەیانە و ئوستازیانە و قسەکەریانە و خواپەرست و زاهیدیانە. لەگەڵ ئەوەشدا شاعیرێکی باش و فەقیهە.**
[طوق الحمامة : 45]

## الحسين بن علي بن محمد بن جعفر الصيمري (436 هـ)

حەنەفی مەزهەبە، کونیەکەی (أبو عبدالله)یە ناسراوە بە (الصميري) کتێبێکی هەیە دەربارەی مەدحی أبو حنيفة چاپکراوە ئێستا بەردەستە بەناوی (أخبار أبي حنيفة وأصحابه).
شێخی الخطيب البغدادي-ە، دەمارگیری هەیە بۆ أبو حنيفة و هاوەڵانی، الذهبي لە (سير أعلام النبلاء) لە الخطيب-ەوە نەقل دەکات کە دەڵێ: الصيمري پێی ووتم: لە الدارقطني-م بیست بەشێک لە سونەنەکەی، وە لێی دابڕام چونکە أبو يوسف-ی بە زەعیف دەزانی، وە خۆزگە ئاوام نەکردبوایە چ زیانێک بە الدارقطني گەیشت کە من جێم هێشت؟

الخطيب بە سیقەی داناوە، زۆربەی ڕیوایەتەکانی مكرم بن أحمد لە کتێبەکەیدا نەقل کردووە وەک پێشتریش ئاماژەمان پێیدا، باسی ئەوەشمان کرد کە الدارقطني دەڵێ کتێبەکەی مكرم هەمووی درۆیە أحمد بن الصلت ڕیوایەتەکانی هەڵبەستاوە، ئەم کتێبەی الصيمري دەتوانم بڵێم سێ بەش زیاتری لە ڕیوایەتەکانی مكرم بن أحمد عن أحمد بن الصلت پێکهاتووە، تەنها کەمێکی نەبێ بەدەر لەوەیە.

## ابن عبدالبر و الخطيب البغدادي

مالکی مەزهەب و شافعی مەزهەب هەردووکیان ساڵی 463 هـ مردوون، ابن عبدالبر لە کتێبی (الانتقاء) ڕیوایەتەکانی مەدحکردن و زەمکردنی أبو حنيفة نەقل دەکات، وە الخطيب البغدادي

لە كتێبی (تاريخ بغداد) بەهەمان شێوە هەردوو جۆر ڕیوایەتەكان نەقل دەكات، دواتر هەموو ڕیوایەتەكانیان دەهێنین.

ژمارەیەكی تریش كتێبیان نوسیوە دەربارەی مەدحی أبو حنیفة، كە هەموویان لە كتێبەكانی پێش خۆیان نەقلیان كردووە شتی نوێی تێدا نیە، زۆربەیان بێ سەنەدە نەقلیان كردووە هەیانە بە سەنەدەوە، وەک:

**الزمخشري - حەنەفی ( 538 هـ)**

**الموفق بن أحمد المكي الخوارزمي- حەنەفی (568 هـ)**

**المرغيناني - حەنەفی (593 هـ)**

**سبط ابن الجوزي ( 654 هـ)**

**الذهبي (748 هـ)**

**عبدالقادر القرشي - حەنەفی (775 هـ)**

**محمد بن محمد الكردري البزازي - حەنەفی (827 هـ)**

**السيوطي - شافعی (911 هـ)**

**محمد بن يوسف الصالحي - شافعی (942 هـ)**

**ابن حجر الهيتمي - شافعی (973 هـ)**

**الملا علي القاري - حەنەفی (1014 هـ)**

**أبو عمر ابن عبدالبر النمري (463 هـ)**

ابن عبدالبر لە كتێبی (الانتقاء) كە تایبەت بە مەدحكردنی أبو حنیفة ومالك والشافعي نوسیویەتی، تێیدا ڕیوایەتەكانی مەدحكردنی أبو حنیفة نەقل دەكات، زۆربەشیان لە كتێبەكەی یوسف بن أحمد نەقل دەكات وەک باسم كرد پێش ئێستا، وە هەندێكیشی لە عبدالوارث بن سفیان نەقل دەكات، بەهەمان شێوە هەندێک لەو ڕیوایەتانەش نەقل دەكات كە بە خراپە باسی أبو حنیفة-ی تێدا كراوە، بەڵام دەمارگیری بە ڕوونی پێوە دیارە بۆ أبو حنیفة، تۆمەتی حەسودی دەداتە پاڵ

سەلەف گوایە حەسودیان بە أبو حنیفة بردووە و زیادەڕەوییان کردووە دەربارەی بۆیە ئەم تۆمەتانەیان داوەتە پاڵی ! بۆ ئەوەی بەرگری لەیەک کەس بکات تۆمەت دەداتە پاڵ کۆمەڵێک پێشەوای سەلەف ! منیش لەم کتێبەدا هەر زانایەک بەرگری دەمارگیرانە لە أبو حنیفة بکات یان تۆمەت بداتە پاڵ سەلەف یان بیەوێ هەڵەکانی أبو حنیفة بە بچووکی سەیر بکات، یان خەڵکی بەهۆی زانستەکەیەوە پێی سەرسام بن و لاسایی کوێرانەی بکەنەوە دەربارەی أبو حنیفة بڵێن ئەوەتا فلان زانا بە پێشەوا ناوی أبو حنیفة دەبات گەر أبو حنیفة ئاوا بێ چۆن زانایەکی وەک ئەو بە پێشەوا ناوی دەبات و هاوشێوەی ئەم جۆرە قسانە، ئەوا ناچار دەبم هەڵسم بە ڕوونکردنەوەی هەڵەکانی ئەو زانایە تا خەڵکی پێی گومڕا نەبن دەربارەی أبو حنیفة، وە پلەی زاناکە بزانن و لە قەبارەی خۆی زیاتر گەورەی نەکەن، ابن عبدالبر-یش یەکێکە لەوان.

**ابن الصلاح** دەربارەی زانینی ژیاننامەی هاوەڵان دەڵێ: **ئەمە زانستێکی گەورەیە، زانایان کتێبی زۆریان لەبارەیەوە نوسیوە، وە گەورەترین و بە سودترینیان کتێبی (الاستیعاب)ی ابن عبدالبر-ە، گەر ناشرینی نەکردبوایە بەهێنانی زۆرێک لەو ناکۆکیانەی لەنێوان هاوەڵان ڕوویانداوە، وە گێڕانەوەکانی لەو کەسانەوەیە کە تەنها خەریکی گێڕانەوەی بەسەرهاتن نەک لە فەرموودەناسان، ئەم جۆرە کەسانەش ناسراون بەوەی کە شت زۆر دەگێڕنەوە و تێکەڵی دەکەن لە گێڕانەوەیان.**
[مقدمة ابن الصلاح : 291]

**ابن عبدالبر** لە ژیاننامەی هاوەڵ الولید بن عقبة بن أبي معیط ﷺ دەڵێ: **بەسەرهاتی هەیە کە شتی مونکەر و ناشرینی تێدایە ئەوە یەکلایی دەکاتەوە کە حاڵی خراپ بووە و کردەوەی ناشرینی هەبووە، الله لە ئێمە و ئەویش خۆشبێ، الأصمعي وأبو عبیدة وابن الکلبي و جگە لەوانیش دەڵێن: الولید بن عقبة فاسق بوو عەرەق خۆر بوو، بەسەرهاتی الولید دەربارەی عەرەق خواردنەوە و شەوچەرەیان لە عەرەق خواردنەوەدا لەگەڵ أبو زبید الطائي بەناوبانگە، بەلامەوە ناشرینە لێرە باسی بکەم، وە لێرەدا بەشێکی لێ باس دەکەم.** بڕوانە [الاستیعاب : 115/4]

**ابن حجر** لە ژیاننامەی الولید دەڵێ: **ابن الجوزي ژیاننامەکەی درێژکردۆتەوە، لە کتێبی ابن عبدالبر نەقلی کردووە، هەڵە و ناشرینی تێدایە، الولید هاوەڵایەتی چەسپاوە، وە تاوانیشی هەیە کاروباری بۆلای الله تعالی دەگەڕێتەوە، صەواب ئەوەیە بێ دەنگ بین لەسەری، والله تعالی أعلم.**
[تهذيب التهذيب : 321/4]

**ئیمام أحمد** دەڵێ: **هەر کەسێک لە پلەی یەکێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کەم کردەوە یان ڕقی لێ بوویەوە بەهۆی کارێک کە ئەنجامی داوە یان باسی خراپەکانی کرد ئەوا ئەم کەسە بیدعەچیە، تا ڕەحمەت بۆ هەموویان دەنێرێت و دڵیشی بەرامبەریان سەلامەت دەبێ.**
[أصول السنة : 9]

**ئیمام أحمد** دەڵێ: **یەکێک لە حوججە ڕوون و چەسپاوەکان بریتیە لە باسکردنی چاکەی هاوەڵانی پێغەمبەری الله ﷺ هەموویان، وە دەست هەڵگرتن لە باسکردنی خراپەکانیان و باس کردنی ئەو خیلافەی کە لە نێوانیان ڕوویداوە.**
**هەروەها دەڵێ: بۆ هیچ کەسێک جائیز نیە شتێک لە خراپەی هاوەڵان باس بکات و تانە بدات لە یەکێکیان بە عەیبێک و بە کەم و کورتییەک، هەر کەسێک وابکات ئەوا واجبە لەسەر دەسەڵاتدار تەمبێ بکات و سزای بدات، بۆی نیە لێی خۆشبێت، بەڵکو سزای دەدات و تەوبەی پێدەکات، گەر تەوبەی کرد لێی قبوڵ دەکرێ، وە ئەگەر لەسەری مایەوە ئەوا دووبارە سزای دەدات و لە بەندیخانە دەیهێڵێتەوە تا دەمرێت یان تەوبە دەکات.** بڕوانە [طبقات الحنابلة : 30/1]

ووتم: ابن عبدالبر کە ئاوا دەمارگیرانە بەرگری لە أبو حنیفة دەکات و تۆمەتی حەسودی دەداتە پاڵ سەلەف، خۆزگە کەمێکیش بەرگری لەم هاوەڵە بەڕێزە کردبوایە و باسی هەڵەکانی نەکردبوایە، کە تەنها فەزلی یەک هاوەڵ لە فەزلی هەر زانایەکی تری ئوممەت زیاترە، تەنانەت هیچ کام لە باشترین تابعینەکانیش بەراوورد ناکرێن بە هاوەڵان، چ جای أبو حنیفة کە تەنها یەک ڕۆژێک لە هاوەڵێتی الولید رضي الله عنه لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لە تەواوی ژیانی أبو حنیفة خێردارترە، جگە لەمەش ووتەی سەلەف بە سەنەدی صەحیح دەربارەی أبو حنیفة ڕەت دەکاتەوە بە بیانووی پڕو پوچ،

کەچی ووتەی الأصمعي فلان و علان وەردەگرێ دەربارەی هاوەڵێک کە 70 بۆ 80 ساڵ پێش لەدایکبوونی الأصمعي وەفاتی کردووە ! وە دەزانین عەرەق خواردنەوەی الولید بە صەحیحی هاتووە لە صحیح مسلم، بەڵام ئەو بەرگرییەی کە لە أبو حنیفة-ی دەکەیت الولید زۆر لە پێشترە.

عبدالله بن محمد بن عقيل کە یەکێکە لە ڕاویەکانی فەرموودە، ابن حجر ووتەی زانایانی جەرح و تەعدیلی لە بارەیەوە نەقل کردووە بەم شێوەیە:

ابن سعد دەڵێ: منكر الحديث، احتجاج بە فەرموودەکانی ناکرێ.

بشر بن عمر دەڵێ: مالك ڕیوایەتی لێی نەدەکرد.

علي بن المديني دەڵێ: يحيى بن سعيد ڕیوایەتی لێی نەدەکرد.

يعقوب بن شيبة دەڵێ: فەرموودەکانی زۆر لاوازن.

سفيان بن عيينة دەڵێ: چوار کەس هەن لە قورەیش واز لە فەرموودەکانیان دەهێنرێ، تێیاندا ناوی عبدالله-ی برد.

أحمد بن حنبل دەڵێ: منكر الحديث.

يحيى بن معين دەڵێ: احتجاج بە فەرموودەکانی ناکرێ، وە هەروەها وتوویەتی زەعیفە.

الجوزجاني دەڵێ: زۆربەی ئەو فەرموودانەی ڕیوایەتی دەکات غەریبە.

أبو حاتم الرازي دەڵێ: فەرموودەی لاوازە بەهێز نیە، لەوانە نیە کە احتجاجی پێ بکرێ.

النسائي دەڵێ: زەعیفە.

ابن خزيمة دەڵێ: احتجاجی پێ ناکەم بەهۆی خراپی لەبەرکردنی.

ابن حبان دەڵێ: لەبەرکردنی خراپە، بە وەهم فەرموودەی دەگێڕایەوە، جا پێویست بوو کە واز لە ڕیوایەتەکانی بهێنرێ.

الخطيب البغدادي دەڵێ: لەبەرکردنی خراپە.

ئینجا دوای هەموو ووتەکان ابن حجر ووتەی ابن عبدالبر نەقل دەکات دەربارەی عبدالله کە وتوویەتی: لە هەموو ئەوانە سیقەترە کە قسەیان پێی ووتوە !

ابن حجر-یش دەربارەی ئەم ووتەیەی ابن عبدالبر دەڵێ: ئەمە زیادەڕەوییە.

بڕوانە [تهذيب التهذيب : 2/424-426]

ووتم: قسەكەی ابن عبدالبر سەركەشیەكی یەكجار گەورەیە و مایەی سەرسوڕمان و پێكەنینە، عبدالله لە هەموو ئەمانە سیقەترە كە قسەیان پێی ووتوە ؟! دووبارە سەیری ناوی ئەو زانایانە بكەن كە قسەیان پێی ووتوە تا ناشرینی ووتەكەی ابن عبدالبر هەست پێ بكەن.

جا ئەمە كورتەیەك بوو لە تێكەڵ كردنی ابن عبدالبر لە قسەكردنی دەربارەی كەسەكان، ئەمە جگە لە تەئویل كردنی هەندێك لە صیفەتەكانی الله تعالی، وەك صیفەتی: الضحك والمكر والكيد والاستهزاء والاستحياء والاعراض، بەڵام لەلای خەلەف و معاصرين بەهۆی تەئویلی ئەشعەرییەكانەوە ئەوەندە نەرمیان نواندووە بەرامبەر تەئویلكەرانی صيفات، ئێستا ئەوەی تەئویلی ئەم صیفەتانە بخوێنێتەوە لەلایەن ابن عبدالبر بەلایەوە شتێكی گەورە نیە بەڵكو وەك تاوانێكی بچووك سەیری دەكات، چونكە لەبیری خۆیدا دەڵێ النووي و ابن حجر زۆر لەوە خراپترن لە صیفاتدا كەچی هەر پێشەوا و بەڕێزن و كەس بە خراپ باسیان ناكات، چ جای ابن عبدالبر كە وەك ئەوان تێوەنەگلاوە. بڕوانە [عقيدة ابن عبدالبر في التوحيد والإيمان : 386-395]

**أبو العباس السراج** دەڵێ: **هەر كەسێك دان بەوە نەنێت و باوەڕی پێ نەبێت كە الله تعالى سەیری پێ دێت و پێدەكەنێت و هەموو شەوێك دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا و دەفەرمووێ: كێ داوا دەكات تا پێی ببەخشم، ئەوا ئەم كەسە زنديقە كافرە استتابە دەكرێ گەر تەوبە نەكات لە ملی دەدرێ و نوێژی لەسەرناكرێ و لە گۆڕستانی موسڵمانانیش نانێژرێ.**

**[الذهبي نەقلی كردووە - العلو للعلي العظيم : 1231]**

## أحمد بن علي بن ثابت أبو بكر الخطيب البغدادي (463 هـ)

الخطيب البغدادي لەناو ئەوانەی كە بەرگرییان لە أبو حنيفة كردووە لە هەموویان باشترە لەم

بابەتەدا، چونکە هەروەک چۆن ڕیوایەتەکانی مەدحکردنی هێناوە ڕیوایەتەکانی زەمکردنیشی هێناوە بگرە بە زیاتریشەوە، وە ئەو ڕیوایەتانەی بە صەواب داناوە کە تێیدا زەمکراوە هەروەک لە بەشی یەکەمدا باسمان کرد، بەڵام ئەویش وەک زۆرینەی زاناکانی تر سەرەڕای ئەوەی کە بۆی دەرکەوتووە ڕیوایەتەکان صەحیحین بەڵام أبو حنیفة هەر بە پێشەوا دەزانێت و بە گەورە وەسفی دەکات وەک بڵێی ئەم ڕیوایەتانەی کە هێناویەتی دەربارەی زەمکردنی خەون و خەیاڵ بێ هیچ نرخێکی نەبێ !

**الخطيب** پێش هێنانی ڕیوایەتەکانی زەمکردنی أبو حنیفة دەڵێ: **ڕیوایەتمان هێنا لە أیوب السختیاني وسفیان الثوري وسفیان بن عیینة وأبو بکر بن عیاش وجگە لەوانیش لە پێشەوایان ڕیوایەتێکی زۆر کە مەدح و ستایشی أبو حنیفة لەخۆ دەگرێت، وە ئەوەی صەوابە لەلایەن نەقلکەرانی فەرموودە لە پێشەوایانی المتقدمین وئەوانەشی کە ناومان هێنان دەربارەی أبو حنیفة پێچەوانەی ئەو ووتانەیە، وە ووتەکانیان دەربارەی أبو حنیفة زۆرە بەهۆی شتی ناشرینەوە کە لێیەوە گێڕدراوتەوە هەندێکیان پەیوەستە بە أصولی دین و هەندێکیشی بە فروع، وە ئێمەش باسیان دەکەین بە ویستی الله. وە داوای لێبوردن دەکەین لەو کەسەی کە ووتەکان دەبینێت و حەزی لێ نیە گوێ بیستیان بێت، چونکە أبو حنیفة لەلای ئێمە قەدری گەورەیە و پێشەنگە بۆ گەلێک زانای تر کە ناومان هێناون لەم کتێبەدا.** [تاريخ بغداد : 504/15-505]

ووتم: گەر أبو حنیفة هەر پێشەوا بێت و ووتەی ئەم زانایانە صەحیحیش بن هەر کاری تێنەکات و لە پلەی کەم نەکاتەوە، ئیتر نازانم سودی هێنانی ئەم ڕیوایەتانە چیە کە الخطیب هێناویەتی دەربارەی زەمکردنی أبو حنیفة کە نزیکەی 260 ڕیوایەت دەبێ بە صەحیح و زەعیفەوە ؟! هەر چەندە بەهۆی هێنانی ئەم ڕیوایەتانە الخطیب هێرشی زۆر توندی کراوەتە سەر لەلایەن دەمارگیران بۆ أبو حنیفة تەنانەت کتێبیشی لەسەر نوسراوە، وەک کتێبەکەی الکوثري (تأنیب الخطیب)، وە کاتێک تاریخ بغداد لە ووڵاتی هیند چاپکرا کە گەیشتن بە ژیاننامەی أبو حنیفة بڕیاریاندا چاپەکە ڕاگرن چونکە ووڵاتی هیند حەنەفی مەزهەبن، دواتر بڕیاریاندا بەردەوام بن لە چاپکردنی بەڵام بەو مەرجەی کتێبی (سهم المصيب في كبد الخطيب) لەگەڵی چاپ کرێت و بلکێندرێ بە تاریخ بغداد.

وە کاتێکیش لە الأزهر بڕیاردرا تاريخ بغداد چاپ بکرێ دژی وەستان بەهۆی ژیاننامەی أبو حنيفة دواتر چاپکرا بەو مەرجەی کە خۆیان تەعلیق لەسەر ڕیوایەتەکان بنوسن، بەشێوەیەک بێت کە هیچ پەڵەیەک لەسەر أبو حنيفة نەنیشێت، لەئێستاشدا کە دوو چاپی تاريخ بغداد بەردەستە بە تەحقیقی (مصطفى عبدالقادر عطا) و (بشار عواد معروف) کە هەردووکیان لە حاشیەکاندا درێغیان نەکردووە لە بەرگری کردن لە أبو حنيفة، لە تەعلیق دان لەسەر ڕیوایەتەکان و تەزعیف کردنی کۆمەڵێک ڕیوایەتی صەحیح و حەسەن.

**ابن الجوزي** دەڵێ: **أبو بكر الخطيب سەرەتا لەسەر مەزهەبی أحمد بن حنبل بوو، جا هاوەڵانمان (واتا: حەنبەلیەکان) هێرشیان کردە سەری کاتێک بینیان مەیلی دەچێ بەلای بیدعەچیەکان وە ئازاریاندا، جا چووە سەر مەزهەبی شافعی.** [المنتظم : 132/16]

ووتم: ابن الجوزي لەبەر دەمارگیری مەزهەبی ئەم قسانە دەکات نەک لە خەمخۆری بۆ عەقیدەی ئەهلی سوننە، ئەگینا خۆی عەقیدەی لە الخطيب خراپترە، بەڵام دوای گۆڕانی مەزهەبی الخطيب لە حەنبەلیەوە بۆ شافعی دەمارگیری الخطيب بەرامبەر حەنبەلیەکان ڕوونە، ئەمەش وایکردووە ابن الجوزي قسەی لەسەر بکات، بەڵام لە زۆرێک لە ووتەکانی دەربارەی الخطيب پێکاویەتی.

**ابن الجوزي** دەڵێ: أنبأنا أبو زرعة طاهر بن محمد بن طاهر المقدسي عن أبيه ووتی: **بیستم إسماعيل بن أبي الفضل القومسي -کە زانا بوو بە فەرموودە- دەیووت: سێ کەس هەن لە حافزەکان خۆشم ناوێن بەهۆی دەمارگیریان و کەمی ئینصافیان: الحاكم و أبو نعيم الأصبهاني و الخطيب البغدادي.**

**ابن الجوزي دەڵێ: إسماعيل ڕاستی ووت، وە لە حافرە گەورەکان بوو، سیقە و صدوق بوو، زانستێکی باشی هەبوو بە ڕاوییەکان و مەتنەکان، وە قسەیەکی حەقی کردووە، چونکە الحاكم شیعەگەری هەبوو زۆر بەڕوونی، دووانەکەی تریش (واتا: أبو نعيم والخطيب) دەمارگیریان هەبوو بۆ ئەهلی کەلام و ئەشعەرییەکان، ئەم شتەش شیاو نیە بە ئەهلی حەدیث چونکە حەدیث هاتووە لەسەر زەم کردنی کەلام، وە الشافعي جەختی کردۆتەوە لەسەر ئەمە تەنانەت ووتویەتی: ڕەئیم**

**وایە دەربارەی أهل الکلام کە لەسەر هێستر بارکرێن و بەناو خەڵکیدا بگێڕدرێن.**
[المنتظم : 16/133-134]
ووتم: الخطیب البغدادي قوتابی أبو نعیم الأصبهاني بوو کە ئەویش مەیلی زۆرە بۆلای ئەشعەرییەکان و کێشەی زۆر بووە لەگەڵ ئەهلی سوننە لە سەردەمی خۆیدا، بۆیە الخطیب ڕەنگە کاریگەری ئەم شێخەی بەسەریەوە بێت.

أبو إسماعیل الهروي دەڵێ: **بیستم زید بن محمد الأصبهاني و جگە لەویش دەیانووت: خەڵکی أصبهان گەر بیاندیبوایە کەسێک نزیکی أبو نعیم الحافظ دەکەوێتەوە، ئەوا بەرد بارانیان دەکرد بە ووردە بەرد.** [ذم الکلام وأهله : 1330]

الخطیب دەڵێ: **سەبارەت بە تانەدانی زانایانی ئەهلی ڕەئی و ئەهلی کەلام لە ئەهلی حەدیث، من هۆکاری ئەمە ڕوون دەکەمەوە تا ئەوانە بیزانن کە نایزانن** (ووتەکەی دەربارەی ئەهلی ڕەئی لە بەشی یەکەمدا هێنامان، ئێستاش تەنها ووتەکەی دەربارەی هۆکاری تانەدانی ئەهلی کەلام لە ئەهلی سوننە دەهێنین، دەڵێ) **ئەهلی کەلام عوزریان هەیە لەو بەکەم سەیرکردنەیان بۆ ئەهلی حەدیث کە دەری دەبڕن و عەیبداریان دەکەن، چونکە جیاوازی هەیە لەنێوانیان کە دەبێتە هۆکاری ڕق لێبوونەوە و ناکۆکی.** [الفقیه والمتفقه : 2/151]
ووتم: ابن الجوزي ڕاستی کرد کە الخطیب دەمارگیری هەیە بۆ ئەهلی کەلام و ئینصافی نیە، ئەوەتا عوزر دەدات بە ئەهلی کەلام لە ڕق لێبوونەوەیان و بەکەم سەیرکردنیان بۆ ئەهلی سوننە، ئایا کەسێک ئەهلی سوننە بێ بەم شێوەیە باسی خیلافی نێوان ئەهلی سوننە و ئەهلی کەلام دەکات ؟ وا خۆی نیشان دەدات کە وەک ناوبژیوانێک ڕۆڵ دەگێڕێ لەنێوانیان حەق بە کەسیان نادات، دژی کەسیان نیە و دۆستی کەسیشیان نیە ؟!
هەروەها الخطیب زۆر بە گەورەیی وەسفی أبو الحسن الأشعري و أبو بکر الباقلاني و أبو القاسم القشیري دەکات لە تاریخ بغداد، لەکاتێکدا باسی ژیاننامەی کەسێکی وەک البربهاري ناکات کە لە بغداد ژیاوە بەپێی مەرجی کتێبەکەی دەبێ باسی بکات، کە دێتە سەر ابن بطة العکبري هێرشی

دەکاتە سەر و تۆمەتی درۆکردنی دەداتە پاڵ، بەڵام ابن الجوزي پاشان المعلمي و دواتر عثمان عبدالله آدم الأثيوبي کە تەحقیقی کتێبی (الإبانة الكبرى) ابن بطة-ی کردووە لە بەشی قەدەر دا لاپەرە (83-96) وەڵامی گومانەکانی الخطيب-ی بە جوانی داوەتەوە دەربارەی ابن بطة، هەروەها الخطيب لە ژیاننامەی أبو عبدالله ابن مجاهد قوتابی أبو الحسن الأشعري دەڵێ: کتێبی چاکی هەیە دەربارەی أصول، زۆرێک لە شێخەکانمان باسیان کردووە بۆمان کە دینداریيەکی چاک و ڕێبازێکی جوانی هەبوو، وە أبو بكر البرقاني (شێخی الخطيب) زۆر بەجوانی ستایشی دەکرد، پاشان الخطيب ئەم پارچەی شیعرەی ابن مجاهد دەهێنێت و لێی بێدەنگ دەبێ

أيها المغتدي ليطلب علمـــــا *** كل علم عبد لعلم الكلام

تطلب الفقه كي تصحح حكما *** ثم أغفلت منزل الأحكـام

(كل علم عبد لعلم الكلام) واتا: هەموو علمێک بەندەی علمی کەلامە ! ئەمەش کوفرە، کەچی الخطيب لێی بێ دەنگ دەبێ و سەرەڕای ئەمەش بە خاوەن ڕێبازێکی جوان وەسفی دەکات.

هەروەها لە ژیاننامەی الوليد بن أبان الكرابيسي دەڵێ: یەکێکە لە ئەهلی کەلام لە أصول، لەسەر مەزهەبی ئەهلی حەق، مامۆستای الحسين الكرابيسي-ە.

ئەهلی کەلامە لە عەقیدەدا لەسەر مەزهەبی ئەهلی حەق ! هەرگیز ئەهلی کەلام بە ئەهلی حەق وەسف نەکراون لەلای ئەهلی سوننە، پاشان مامۆستای الحسين الكرابيسي بووە، ئیمام أحمد دەربارەی الكرابيسي دەڵێ: ئەو لەلای ئێمە کافرە، هەروەها دەڵێ: بشر المريسي مرد الحسين الكرابيسي لەدوای خۆی جێهێشت.

**الذهبي** دەڵێ: أخبرنا إسماعيل بن عبدالرحمن العدل أخبرنا عبدالله بن أحمد الفقيه أخبرنا المبارك بن علي الصيرفي في كتابه أخبرنا محمد بن مرزوق الزعفراني أخبرنا **الحافظ أبو بكر الخطيب ووتی: قسەکردن لە صیفاتدا ئەوەی بە صەحیحی ڕیوایەت کراوە لە فەرموودەکاندا مەزهەبی سەلەف ئەوەیە صیفەتەکە ئیثبات بکرێ و ڕواندنی لەسەر ڕواڵەت و نەفیکردنی چۆنیەتی ولێکچواندنی صیفەتەکە. ئەصل لەم بابەتەشدا ئەوەیە کە قسەکردن لە صیفاتدا لقێکە لە قسەکردنی لە**

**زات، بۆیە لەسەر هەمان ڕێچکە و هاوشێوەی ئەو دەڕوات، جا کە زانراو بوو ئیثبات کردنی رب العالمین ئیثبات کردنی وجودیەتی نەک ئیثبات کردنی دیاریکردن و چۆنیەتی، بەهەمان شێوە ئیثبات کردنی صیفەتەکانی ئیثبات کردنی وجودی صیفەتەکەیە نەک ئیثبات کردنی دیاریکردن و چۆنیەتی صیفەتەکە، جا کاتێک کە ووتمان دەست و بیستن و بینین، ئەمانە ئیثبات کردنی صیفاتن کە الله ئیثباتی کردووە بۆخۆی، وە ناڵێین: دەست واتا قودرەت، وە ناڵێین: بیستن و بینین واتا عیلم، وە ناڵێین: ئەمانە ئەندامن و کاریان پێ ئەنجام دەدرێ، وە دەڵێین: واجبە ئیثباتی بکەین چونکە لە دەقی شەرعیدا هاتووە، وە واجبە نەفی لێکچواندن بکەین لە صیفەتەکاندا، چونکە الله تعالی فەرموویەتی:** ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ **وە فەرموویەتی:** ﴿وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ﴾. **[العلو للعلي العظيم : 1335]**

ووتم: ووتەکانی سەرەتای هەمان ووتەی سەلەفە و هیچ کێشەی تێدا نیە، بەڵام ووتەکانی دواتری پەڵەی ئەشعەریەتی پێوەیە کە دەڵێ: ناڵێین دەست و بیستن و بینین کاریان پێ ئەنجام دەدرێ، لەکاتێکدا الله تعالی فەرموویەتی: ﴿قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسۡجُدَ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّۖ﴾ واتا: الله تعالی فەرمووی بە ئیبلیس: چ شتێک ڕێگری لێ کردیت کە سوجدە ببەیت بۆ ئادەم کە بە دوو دەستەکانم دروستم کردووە.

ابن تيمية دەڵێ: **ڕێگای نەفیکەرانی صیفات لە ئەهلی کەلام وەک موعتەزیلە و جگە لەوانیش بگرە تەواوی ئەوانەی کە شتێک لە صیفەتەکاندا نەفی دەکەن لازمی ووتەکەی تەعطیل و نەفیکردنە لەگەڵ دان پێدانانی بە ئیثبات کردنی، جا دەبێتە کۆکەرەوە لەنێوان دوو شتی دژ بەیەکدا.** **[شرح العقيدة الأصفهانية : 101-102]**

ووتم: ڕاستی ووت ئەمە حاڵی ئەهلی کەلامە ئەوانەی کە دراونەتە پاڵ ئەهلی سوننە، دەبینیت بە لەفزێک ئیثباتی صیفات دەکات بە لەفزێکی تر هەڵیدەوەشێنێتەوە، وەک ئێستای ئەمەی الخطیب کە بینیتان.

**الخطيب** دەڵێ: **فەرمووودەناس دەبێ لە مەجلیسەکانی ووتنەوەی فەرمووودەدا خۆی بپارێزێ لەو ڕیوایەتانەی کە عەقڵی خەڵکی عەوام بەرگەی ناگرێ، چونکە ئەمین نابین لێیان لە هەڵە و وەهم، الله بشوبهێنن بە دروستکراوەکانی و شتانێکی بدەنە پاڵ کە مەحاڵە پێی وەسف بکرێ، ئەمانەش هاوشێوەی فەرمووودەکانی صیفات کە ڕواڵەتەکەی تشبیە وتەجسیم-ی لێدەکەوێتەوە، وە ئیثبات کردنی ئەندامەکانی لێدەکەوێتەوە بۆ الله-ی ئەزەلی قەدیم ئەگەرچی فەرمووودەکانیش صەحیح بن، وە لە تەئویل کردنیشیدا چەند ڕێگایەک هەیە، بەڵام حەق ئەوەیە کە نەگێڕدرێنەوە تەنها بۆ ئەهلی خۆی، لەترسی ئەوەی کەسانێک پێی گومڕا بن کە لە ماناکانی تێناگەن جا بە ڕواڵەت وەری دەگرن یان ئینکاری لێدەکەن و ڕەتی دەکەنەوە و ڕاوییەکانی بە درۆزن دادەنێن.**
[الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع : 300]

ووتم: ئەمەش ووتەی جەهمی و ئەشعەرییەکانە ئەگینا خۆی صیفات هەر دەبێ بە ڕواڵەت وەربگیرێ، کە پێش ئێستا خۆی باسیکرد، ئەی بۆ دەترسی لەوەی خەڵکی عەوام بە ڕواڵەت وەری بگرن دوور لە تعطیل و تأویل ؟ دواتر چی لە ئایەتەکانی قوڕئان دەکەیت کە هەموو خەڵکێکی عەوام دەیبیستێ کە کۆمەڵێک صیفاتی تێدایە، وە پێغەمبەر ﷺ لەکاتی باسکردنی صیفەتی السمع والبصر ئاماژەی بۆ گوێ و چاوی کردووە، لەکاتی باسکردنی صیفەتی الاصبع ئاماژەی بە پەنجەکانی کردووە، وە هەروەها زۆرێک لە فەرمووودەناسان لەکاتی ووتنەوەی فەرمووودەکانی صیفات ئاماژەیان بۆ ئەندامەکانی لاشەیان کردووە، وە هیچ کام لە موسڵمانانیش ئەمەیان بە خەیاڵدا نەهاتووە کە دەستی الله وەک دەستی ئێمەی مرۆڤە یان چاوی الله وەک چاوی ئێمەیە، عەقیدەی لێکچواندنی صیفەتەکانی الله بە صیفەتی مەخلوقات لەناو موسڵماناندا بوونی نەبووە تا ئەهلی کەلام پەیدابوون بە بەکارهێنانی لەفزی مجسمة و مشبهة وایان نیشاندا کە هەرکەسێک باسی صیفەتێکی الله بکات ئەم صیفەتە لە مەخلوقاتدا هەبێ ئەوا ئەم کەسە الله-ی شوبهاندووە بە مەخلوقاتەکانی، ئەگینا چ موسڵمانێکی عەوام کاتێک ئایەتی (يد الله فوق أيديهم) دەخوێنێتەوە بیری بۆ ئەوە دەچێت کە دەستی الله وەک دەستی ئێمەی مرۆڤە ؟ ڕیوایەت لە سەلەفیش ئەوەندە زۆرە لەسەر ئەوەی کە فەرمووودەکانی صیفات لەناو خەڵکی عەوامدا بخوێندرێتەوە لەترسی درێژ

بوونەوە هەندێكی دەهێنم.

**الخلال** دەڵێ: بیستم أبو بكر بن صدقة دەیووت: **إبراهيم الحربي ڕۆژێك باسی فەرموودەی ليث عن مجاهد-ی كرد، ووتی: ئەم فەرموودەیە عثمان بن أبي شيبة گێڕایەوە لە مەجلیس لەناو خەڵكیدا، پێت وایە چەند كەس لە مەجلیسەكەدا بوون ؟ بیست هەزار، تۆ وای دەبینی گەر كەسێك هەستابوایە بە عثمان-ی ووتبایە ئەم فەرموودەیە مەگێڕەوە یان ئینكاری لێكردبوایە پێت وایە لەم شوێنەدا دەردەچوو بەبێ كوشتن ؟**

**الخلال دەڵێ: أبو بكر بن صدقة ووتی: إبراهيم ڕاستی كرد، حوكمی ئەو كەسە هیچ نیە لەلای من جگە لە كوشتن. [السنة : 254] (سەنەدەكەی صەحیحە).**

ووتم: فەرموودەی ليث عن مجاهد، ئەثەرێكە لە مجاهد ڕیوایەت كراوە لە تەفسیری ئایەتی: ﴿عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا﴾ مجاهد دەڵێ: الله پێغەمبەرﷺ لەسەر عەرش دادەنیشێنێت لە ڕۆژی قیامەت.

**الطبري** دەڵێ: حدثني المثنى قال حدثنا هدبة بن خالد قال حدثنا حماد بن سلمة عن ثابن عن أنس ووتی: **پێغەمبەر ﷺ ئایەتی:** ﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا﴾ **خوێندەوە، أنس دەڵێ: پەنجە مۆری لە نزیك سەری پەنجە بچووكەكەی كۆتایی دانا، فەرمووی: چیاكە ڕۆچوو.**

**حماد دەڵێ: حميد بە ثابت-ی ووت: ئەم فەرموودەیە دەگێڕیتەوە ؟! ثابت دەستی بەرز كردەوە دای لە سینگی حميد، وە ووتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی، أنس فەرموویەتی، منیش بیشارمەوە ؟! [تفسير الطبري : 429/10] (سەنەدەكەی صەحیحە).**

ووتم: پێغەمبەر ﷺ سەرە پەنجەی سەرەتا و كۆتایی بەیەكناوە بازنەیەكی بچووكی دروستكردووە، واتا الله تعالى بە قەدەر ئەم بازنەیە خۆی دەر خستووە بۆ چیاكە.

لە عەرەبیەكە (الإبهام و الخنصر) هاتووە، ئێمەش بە الإبهام دەڵێین پەنجە مۆر بۆیە بەم شێوە وەرم گێڕاوە تا تێگەیشتنی ئاسانتر بێ، الخنصر-یش پەنجە بچووكەكەی كۆتاییە كە ئەنگوستیلەی تێدەخرێ، نازانم بە كوردی چی پێ دەڵێن.

**ابن تيمية** دەڵێ: **ووتەی ئەو کەسەی کە دەڵێ: داوای لێدەکەین باسی فەرموودەکان و ئایەتەکانی صیفات نەکات لەلای خەڵکی عەوام و بە نامە نەینوسێت بۆ شارەکان و لە فەتوا پەیوەندیدارەکان باسی نەکات، ئەم ووتەیە بەتاڵ کردنەوەی گەورەترین أصولی دین و کۆڵەگەی تەوحیدی لەخۆ گرتووە، چونکە گەورەترین ئایەتی صیفات ئایەتی کورسیە کە گەورەترین ئایەتە لە قورئان وەک لە فەرموودەی صەحیحدا چەسپاوە، وە (قل هو الله أحد) ئەو سوڕەتەیە کە یەکسانە بە سێیەکی قورئان.** [التسعينية : 121/1]

**الخطيب** دەڵێ: **ئێمە عیللەت بۆ کردەوەکانی الله دانانێین.** [الفقيه والمتفقه : 530/1]

ووتم: ئەمەش ووتەی ئەشعەرییەکانە کە لە بابەتی قەدەر دا جەبرین، پێیان وایە کردەوەکانی الله تعالی هیچ هۆکارێکی تێدا نیە، بەمەش حیکمەت لە کردەوەکانی الله دەردەهێنن، ئایەتی قورئانیش گەلێک زۆرە کە وەڵامی ئەم عەقیدەیە دەداتەوە، لێرەدا تەنها یەک ئایەت دەهێنم، الله تعالی فەرموویەتی: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ واتا: جنۆکە و مرۆڤم دروست نەکردووە تەنها بۆ پەرستنم نەبێ، کەواتە عیللەتی دروستکردنی جنۆکە و مرۆڤ لەلایەن الله بەندایەتی کردن و پەرستنە بۆی، هەروەها ابن عساکر کە خۆی ئەشعەرییە، الخطيب-ی بە یەکێک لە چینی چوارەمی هاوەڵانی أبو الحسن الأشعري داناوە لە کتێبی (تبيين كذب المفتري) هەروەها ابن المبرد لە کتێبی (جمع الجيوش والدساكر على ابن عساكر) پاڵ پشتی ئەوەی کردووە کە الخطيب ئەشعەرییە، لەکاتێکدا ئەم کتێبەی بۆ ڕەتدانەوەی ابن عساكر نوسیوە، وە ڕەددی ابن عساكر-ی داوەتەوە دەربارەی ئەو زانایانەی کە ئەشعەری نین بەڵام ابن عساكر بە ئەشعەری داناون لە کتێبی (تبيين كذب المفتري) بەڵام ابن المبرد دەمارگیری پێوە دیارە لە دژی الخطيب چونکە تۆمەتی ئەوەی داوەتە پاڵ الخطيب گوایە دەمارگیری هەیە لە دژی أبو حنيفة بۆیە ڕیوایەتەکانی زەمکردنی هێناوە، وە قسەی الخطيب قبوڵ ناکرێ دەربارەی أبو حنيفة، ئەمەش قسەیەکی بێ بنەما و بەتاڵە چونکە الخطيب ڕیوایەتی نەقل کردووە لە سەلەفەوە بە چاک و خراپەوە قسەی خۆی نەهێناوە دەربارەی أبو حنيفة تا بڵێی قبوڵ ناکرێ، وە زۆربەی ڕیوایەتەکانی الخطيب لەلای عبدالله بن الإمام

أحمد و يعقوب بن سفيان الفسوي و العقيلي وابن عدي هاتووە، الخطيب يەكەمين كەس و دواهەمين كەس نيە كە ڕيوايەتەكانى زەمكردنى أبو حنيفة نەقل بكات، پاشان الخطيب سەرەڕاى هێنانى ڕيوايەتەكان لە دژى أبو حنيفة كەچى أبو حنيفة هەر بە پێشەوا دەزانێت.

جا ئەمە حاڵى زۆرێک لەوانەيە كە كتێبيان نوسيوە بۆ بەرگرى كردن لە أبو حنيفة، وەک بينيتان كۆكراوەيەكن لەنێوان كەسانى كافر و بيدعەچى و درۆزن و نەناسراو، هەندێكيان كافر بوونيان ڕوونە، هەندێكيان بيدعەچين و ئەهلى سوننە نين، هەندێكيان درۆزن و هەندێكيان نەناسراون، بە پێچەوانەى ئەوانەى كە لە دژى أبو حنيفة كتێبيان نوسيوە يان قسەيان پێى ووتوە وەک الحميدي و نعيم بن حماد و البخاري و أبو زرعة الرازي و الفسوي و عبدالله و العقيلي و ابن عدي نابينى كەس پەنجەيان بە خراپە بۆ درێژ بكات تەنها بە چاكە نەبێت ناويان ناهێنرێ، تەنها دانەيەک لەمانە تۆمەتى ئەوەى دراوەتە پاڵ كە ڕيوايەتى درۆى دروستكردووە دەربارەى زەمكردنى أبو حنيفة، ئەويش (نعيم بن حماد)ە، كە يەكێكە لە شێخەكانى البخاري، حەنەفيە جەهميەكان دواى ئەوەى بەنديان كرد لەبەر ئەوەى نەيووت قوڕئان مەخلوقە، تەنانەت هەر لە بەنديخانەدا مرد بە كۆت و زنجيرەوە نێژرا بەبێ كفن و نوێژكردن لەسەرى، دواتر هاتوون تۆمەتى درۆكردنيان داوەتە پاڵى كەسێكى وەک أبو بشر الدولابي حەنەفى كە خۆى ئەولاترە بە درۆكردن لە نعيم لەڕووى دەمارگيرييەوە بۆ أبو حنيفة، الدولابي دەڵێ نعيم ڕيوايەتى درۆى لەدژى أبو حنيفة هەڵبەستاوە ! ئيمام أحمد نعيم-ى بە سيقە داناوە، أبو حاتم بە صدوق-ى داناوە، العجلي بە سيقەى داناوە، يحيى بن معين دەڵێ صدوق-ە سيقەيە پياوێكى چاكە من لە هەموو كەس باشتر دەيناسم، بەڵام هەندێک وەهمى هەيە هەڵە دەكات تێيدا، هەروەها البخاري لە صەحيحەكەى ڕيوايەتى لێوە كردووە لەپاڵ كەسێكى تر (مقرونا بغيره) لێرەدا نامەوێ ڕۆبچم لە هێنانى ووتەى زانايان دەربارەى نعيم و دەرخستنى حاڵى لە ڕيوايەت كردندا بەڵام هيچ گومان لە پێشەوايەتى نعيم نيە كە يەكێكە لە پێشەوايانى ئەهلى سوننە زۆر توند بووە بەرامبەر ئەهلى بيدعە، وە گومان لە ڕاستگۆيەتيدا نيە، بەڵام هەڵە و مناكير-ى هەيە لە ڕيوايەتدا، المعلمي لە كتێبى (التنكيل) بەدرێژى وەڵامى تۆمەتى

درۆکردنی داوەتەوە، بەرگرییەکی بەهێزی لە نعیم کردووە تەنانەت لەڕووی بە زەعیف دانانیشەوە بەرگری لێکردووە دەڵێ گەر تفرد-یش بکات ڕیوایەتەکانی شایستەی قبوڵ کردنە، بەڵام بۆ بیانوو بڕین لەم کتێبەدا هیچ ڕیوایەتێکی نعیم-م نەهێناوە دەربارەی أبو حنيفة.
بڕوانە [التنكيل : 824/1-836]

ئێستاش دەچینە سەرهێنانی ڕیوایەتەکان دەربارەی مەدحکردن و بەرگری کردن لە أبو حنيفة

# ڕیوایەتەکانی کتێبی (الانتقاء)

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا حكم بن منذر قال حدثنا أبو يعقوب يوسف بن أحمد قال حدثنا أبو العباس محمد بن الحسن بن الفارض قال حدثنا علي بن عبد العزيز قال حدثنا أبو إسحاق الطالقاني قال حدثنا عمر بن هارون عن أبي حمزة الثمالي ووتی: **ئێمە لەلای أبو جعفر بووین محمد بن علي، جا أبو حنيفة هاتە ژوورەوە پرسیاری چەند بابەتێکی لێکرد، محمد ابن علي-ش وەڵامی دایەوە، پاشان أبو حنيفة چووە دەرەوە، أبو جعفر پێی ووتین: ڕەوشت و شێوەی چەند جوان بوو، فقهی چەندە زۆر بوو.** [الانتقاء : 124]

ووتم: حكم بن منذر و يوسف بن أحمد لە پێشوودا باسمان کردن کە حاڵیان چۆنە، وە محمد بن الحسن بن الفارض مەجهولە، وە عمر بن هارون هەندێک بە درۆزنیان داناوە هەندێک بە مەتروکیان داناوە هەندێکیش بە زەعیف، هەروەها أبو حمزة الثمالي ڕافیزەیە 21 زانا بە زەعیف و مەتروکیان داناوە، نەمبینی کەس تەوسیقی بکات.

(أبو إسحاق الطالقاني) لە چاپی مكتبة القدسي بۆتە (أبو إسحاق الطائفي).

محمد بن الحسن بن الفارض هەندێکجار ناوی باوکی بە الحسن هاتووە هەندێکجاریش بە الحسين، عبدالفتاح أبو غدة لە تەحقیقەکەی هەمووی کردۆتە الحسين، ئەویش دڵنیا نیە الحسين ڕاستە یان الحسن، بەهەرحاڵ هەرکامیان بێت مەجهولە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب يوسف بن أحمد حدثنا أبو الحسين القاضي أحمد ابن محمد النيسابوري قال حدثنا محمد بن يزيد قال حدثنا عبدالله بن حماد بن أبي حنيفة قال أخبرنا حماد بن أبي حنيفة عن أبيه ووتی: **باوکم پرسیاری لە حماد بن أبي سليمان کرد دەربارەی بابەتێک لە تەڵاق، ئەویش وەڵامی دایەوە، جا أبو حنيفة ڕەددی دایەوە لە بابەتەکەدا تاکو حماد بێدەنگ بوو، جا کاتێک أبو حنيفة هەڵسایەوە، حماد ووتی: ئەمە سەرەڕای فقهەکەی شەو زیندوو دەکاتەوە و شەو نوێژ دەکات.** [الانتقاء : 124]

ووتم: محمد بن يزيد نەمزانی كێيە، وە عبدالله بن حماد بن أبي حنيفة الله هەر خۆی دەزانێ كە حاڵی چۆن بووە، چونكە لە نەوەكانی أبو حنيفة تەنها إسماعيل و عمر ناویان هاتووە و ڕیوایەتیان هەیە كە هەردووكیشیان زەعیفن، عبدالله لەهیچ شوێنێكدا ناوی نیە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا أبو محمد عبدالرحمن بن عبدالله المقرئ قال حدثنا محمد بن إسحاق بن سبويه قال حدثنا عبيدالله بن موسى ووتی: **بیستم مسعر بن كدام دەیووت: ڕەحمەتی الله لە أبو حنيفة بێت، فەقیهـ و زانا بوو.** [الانتقاء : 125]

ووتم: عبدالرحمن بن عبدالله المقرئ یەک ڕاوی ناسراو هەیە بەم ناوە كە سیقەیە و ساڵی 213 هـ مردووە، بەڵام أبو يعقوب 388 هـ مردووە وەک پێشتر باسمان كرد، بۆیە مەحاڵە ئەم ڕاوییەی سەنەدەكە هەمان ئەم عبدالرحمن-ە بێت چونكە گەر أبو يعقوب ئەمەی بیستبێ لە عبدالرحمن كەواتە أبو يعقوب بەلایەنی كەمەوە 185 ساڵ ژیاوە لەكاتێكدا خۆی قوتابی العقيلي بووە كە العقيلي ساڵی 322 هـ مردووە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا أبو حفص عمر بن شجاع الحلواني قال حدثنا علي بن عبد العزيز قال حدثنا عارم ووتی: **بیستم حماد بن زيد دەیووت: دەمویست حەج بكەم چومە لای أيوب تا ماڵئاوایی لێ بكەم، أيوب ووتی: پێم گەیشتووە فەقیهی ئەهلی كوفە أبو حنيفة دەیەوێ حەج بكات، جا گەر پێی گەیشتی لە منەوە سەلامی لێ بكە.** [الانتقاء : 125]

ووتم: لە چاپی مكتبة القدسي (قال أبو يعقوب) كەوتووە لە تەحقیقی (عبدالفتاح أبو غدة) ڕاستم كردۆتەوە.

عمر بن شجاع الحلواني یەكێكە لە قاریئەكان حاڵیم بۆ دەرنەكەوت، ئەم ڕیوایەتە وەک دەیبینن لە ڕیوایەتی علي بن عبدالعزيز-ە لە عارم-ەوە، علي و عارم هەردووكیان سیقەن، بەڵام عارم كە ناوی محمد بن الفضل السدوسي-ە، لەكۆتایی تەمەنی خڵەفاوە و بیری تێكچووە، جا ئەوانەی ڕیوایەتیان لێوەی كردووە پێش تێكچوونی بیری ڕیوایەتەكانی صەحیحە، ئەوانەشی دوای ئەم حاڵەتە ڕیوایەتیان لێوەی كردووە زەعیفە.

العقيلي دەڵێ: حدثني الحسين بن عبدالله الذارع حدثنا أبو داود ووتی: پێمان گەیشت كە عارم ساڵی 213 حاڵی تێكچوو پاشان عەقڵی بۆ گەڕایەوە، ئینجا ساڵی 216 بیر تێكچوون باڵی بەسەردا كێشا. [الضعفاء : 367/5]

ئینجا العقيلي دەڵێ: علي بن عبدالعزيز لەساڵی 217 گوێ بیستی عارم بووە، كەواتە ڕیوایەتی علي لە عارم زەعیفە.

بەڵام ابن أبي حاتم لە كتێبی (الجرح والتعديل) لە باوكیەوە نەقل دەكات كە عارم لەساڵی 220 بیری تێكچووە ئەوەی پێش ئەم كاتە ڕیوایەتی لێوە كردبێ چاكە، ئەمەش واتای ئەوە دەدات كە علي پێش بیر تێكچوون ڕیوایەتی لە عارم كردووە.

بەڵام باپیری العقيلي باسەكە یەكلایی دەكاتەوە، العقيلي دەڵێ: باپیرم ووتی: حەجم كرد ساڵی 215 وە گەڕامەوە بۆ بەصرە عارم بیری تێكچوو بوو، جا منیش هیچم گوێ نەگرت لێی تا مرد، وە لەساڵی 224 مرد. [الضعفاء : 369/5]

ئەمەش ئەوە دەردەخات كە ڕیوایەتی علي لە عارم زەعیفە چونكە دوای تێكچوونی بیری عارم بووە، جگە لەمەش لە بەشی یەكەمدا هێنامان كە حماد بن زيد و أيوب السختياني هەڵوێستیان چۆن بووە بەرامبەر أبو حنيفة، بۆیە مەحاڵە أيوب قسەیەكی ئاوا بكات.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا عمر بن أحمد بن عنزة الموصلي قال حدثنا أبو جعفر بن أبي المثنى قال سمعت محمد بن عبيد الطنافسي دەیووت: **الأعمش دەیویست بچێ بۆ حەج، جا كاتێك گەیشتە (الحيرة) بە علي بن مسهر-ی ووت: بڕۆ بۆلای أبو حنيفة تا مەناسیكەكانی حەج بنوسێت بۆمان.** [الانتقاء : 126]

ووتم: لە تەحقیقی أبو غدة (عمر بن أحمد بن عنزة الموصلي) بۆتە (محمد بن أحمد بن عزة الموصلي) هەر كامیان بێت نەمدۆزینەوە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا العباس بن محمد البزار قال حدثنا محمد بن عبيد بن غنام قال حدثنا محمد بن عبدالله بن نمير قال سمعت أبي دەیووت: **بیستم پرسیار لە الأعمش كرا**

**دەربارەی بابەتێک، ووتی: کەسێکی وەک النعمان بن ثابت الخزاز دەزانێ وەڵامی ئەم پرسیارە و هاوشێوەکانی بداتەوە، وایدەبینم بەرەکەت خرابێتە عیلمەکەیەوە.** [الانتقاء : 126]

ووتم: العباس بن محمد البزار نەمدۆزییەوە.

(محمد بن عبيد بن غنام) لە چاپی مكتبة القدسي بۆتە (محمد بن عبيد بن عنام).

باوکی کە دەکاتە عبيد بن غنام ناسراوە، بەڵام خۆی واتا محمد نەمدۆزیەوە کەس باسی بکات.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا أبو مروان عبدالملك بن بحر الجلاب وأبو العباس محمد بن الحسين الفارض قالا حدثنا محمد بن إسماعيل الصائغ ووتی: بيستم شبابة بن سوار دەيووت: **شعبة ڕەئی باش بوو بەرامبەر أبو حنيفة، وە دێڕە شیعرەکانی مساور الوراق-ی بۆ دەخوێندمەوە:**

**إذا ما الناس يوما قايسونا *** بآبدة من الفتيا طريفـــــــة**

**رميناهم بمقياس مصيــب *** صليب من طراز أبي حنيفـة**

**إذا سمع الفقيه به وعـــاه *** وأثبته بحبر في صحيفـــــــة**

[الانتقاء : 126]

ووتم: (عبدالملك بن بحر الجلاب) لە چاپی مكتبة القدسي بۆتە (عبدالملك بن الحر الجلاب).

شبابة بن سوار بانگەوازکەر بوو بۆ ئیرجاء بۆیە ئیمام أحمد تەرکی ڕیوایەتی کرد لێی ئەگەرچی سیقەشە، وە لە بەشی یەکەمدا بە صەحیحی هێنامان کە شعبة لەعنەتی لە أبو حنيفة کردووە، ئیتر نازانم چ ڕەئیەکی باشی هەبووە بەرامبەری ؟

وە دەکرێ سەرەتا حاڵی بۆ دەرنەکەوتبێ هاوشێوەی ابن المبارك کە سەرەتا مەدحی کردووە پاشان ناسیویەتی، وە ڕیوایەتی بیدعەچی گەر لە بەرژەوەندی مەزهەبەکەی بێ ئەوا ڕەت دەکرێتەوە لەلای زانایان.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا إسحاق بن أحمد الحلبي قال حدثنا سليمان بن سيف قال حدثنا عبدالصمد بن عبدالوارث ووتی: **ئێمە لەلای شعبة بووین پێی ووترا أبو حنيفة مرد، شعبة ووتی: فقهی کوفە ڕۆیشت لەگەڵیدا، الله فەزل بەسەر ئێمە و ئەویشدا بکات بە ڕەحمی خۆی.**

[الانتقاء : 126]

ووتم: إسحاق بن محمد بن أحمد بن يزيد الحلبي جەرح و تەعدیلی بۆ نەكراوە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا أحمد بن الحسن الحافظ قال حدثنا عبدالله بن أحمد بن إبراهيم الدورقي ووتی: **پرسیار لە يحيى بن معين كرا دەربارەی أبو حنيفة منیش گوێ بیست بووم، يحيى ووتی: سیقەیە، نەم بیستووە كەس بە زەعیفی بزانێ، ئەوەتا شعبة بن الحجاج نامەی بۆ دەنێری تا فەرموودە ڕیوایەت بكات و فرمانی پێدەكات، شعبة-ش شعبة-یە.** [الانتقاء : 127]

ووتم: كەسێكی وەك يحيى بن معين چۆن دەڵێ نەم بیستووە كەس أبو حنيفة بە زەعیف بزانێ ! لەكاتێكدا بە لێشاو ووتەی فەرموودەناسانمان هێنا لە بەشی یەكەمدا كە بە زەعیف و مەتروكیان داناوە، بگرە خودی يحيى بن معين لە ڕیوایەتی صەحیح هەیە كە بە زەعیفی داناوە كە هێنامان، ئینجا كەسێكی وەك شعبة كە زۆر توندە لە ڕیوایەتدا چۆن خۆی ئاوا نیشان دەدات بەرامبەر أبو حنيفة كە كەسێكی مەتروكە؟! لەكاتێكدا شعبة دەچووە سەر ئەو ڕاوییە زەعیفانەی كە فەرموودەیان دەووتەوە، پێی دەووتن وازبهێنن لە فەرموودە ووتنەوە ئەگینا دەسەڵات دەهێنمە سەرتان، ابن أبي حاتم دەڵێ: حدثنا أبي حدثني حرملة بن يحيى ووتی: بیستم الشافعي دەیووت: گەر شعبة نەبوایە فەرموودە نەدەناسرا لە عیراق، دەچووە لای پیاوێك پێی دەووت فەرموودە مەگێڕەوە ئەگینا دەسەڵات دەهێنمە سەرت. [آداب الشافعي ومناقبه : 160] دواتر گریمان صەحیحیش بێت بە صەحیحی هێنامان كە يحيى بن معين دەڵێ أبو حنيفة جەهمیە، ئیتر تەوسیق كردنی لە فەرموودەدا هیچ نرخێكی نیە، ڕەنگە سەرەتا تەوسیقی كردبێ پاشان حاڵی بۆ دەركەوتبێ ئینجا تەزعیفی كردبێ، نموونەی ئاواش زۆرە لە ڕاوییەكان.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا محمد بن الحسين الفارض قال حدثنا علي بن عبدالعزيز قال حدثنا إسماعيل بن إسحاق الطالقاني قال حدثنا الحسين بن واقد ووتی: **بابەتێك ڕوویدا لە (مرو) كەسم نەدۆزیەوە لێی بزانێ، چووم بۆ عیراق پرسیارم لە سفيان الثوري كرد، پێی ووتم: ئەی حسین نایزانم دوای ئەوەی دەمێك بێ دەنگ بوو، پێم ووت: تۆ دەڵێی نایزانم لەكاتێكدا تۆ پێشەوای ؟!**

**ووتی: وادەڵێم هەروەک چۆن ابن عمر پرسیاری دەربارەی شتێک لێكرا نەیزانی ووتی نازانم، حسین دەڵێ: چووم بۆ لای أبو حنیفة پرسیارەكەم لێیكرد، ئەویش فەتوای بۆ دام، منیش ئەمەم بۆ سفیان باسكرد، سفیان ووتی: أبو حنیفة چی پێ ووتی ؟ منیش ووتم: ئاوا و ئاوای ووت، سفیان دەمێک بێ دەنگ بوو، پاشان ووتی: ئەی حسین وەڵامەكە بەم شێوەیە كە أبو حنیفة پێی ووتی.** [الانتقاء : 127]

ووتم: محمد بن الحسین الفارض مەجهولە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو یعقوب حدثنا أبو محمد موسى بن محمد المري قال حدثنا محمد ابن عیسى البیاضي قال حدثنا نصر بن علي الجهضمي ووتی: بیستم عبدالله بن داود الخریبي دەیووت: **من لەلای سفیان الثوري بووم، پیاوێک پرسیاری لێكرد دەربارەی بابەتێک لە بابەتەكانی حەج، ئەویش وەڵامی دایەوە، پیاوەكەش پێی ووت: أبو حنیفة لەم بابەتەدا ئاوا و ئاوای ووت ! سفیان ووتی: أبو حنیفة چۆنی ووت ئاوایە، كێ قسەیەكی تر دەكات جگە لەمە ؟** [الانتقاء : 127]

ووتم: أبو محمد موسى بن محمد المري مەجهولە.

(عبدالله بن داود الخریبي) لە چاپی مكتبة القدسي بۆتە (عبدالله بن داود الحرمي).

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا أبو علي الأسیوطي قال حدثنا أحمد بن محمد بن سلامة قال حدثنا أحمد بن أبي عمران قال حدثنا محمد بن شجاع قال سمعت الحسن بن أبي مالك دەیووت: **بیستم أبو یوسف دەیووت: سفیان الثوري لە من زیاتر شوێنی أبو حنیفة دەكەوێ.** [الانتقاء : 128]

ووتم: محمد بن شجاع الثلجي درۆزنە، تەنانەت تەكفیریش كراوە لای هەندێكیان.

ابن عدي دەڵێ: فەرموودەی هەڵدەبەستا لە لێكچواندنی صیفاتەكانی الله بە مەخلوقات، وە دەیدایە پاڵ ئەهلی حەدیث، جا پێویست ناكات بەم كەسەوە خەریک بیت چونكە ئەهلی ڕیوایەت نیە، دەمارگیری وای لێكرد فەرموودە هەڵبەستێ بۆ تانەدان لە ئەهلی حەدیث.

أبو الفتح الأزدي دەڵێ: درۆزنە جائیز نیە ڕیوایەتی لێوە بكرێ بەهۆی خراپی مەزهەبەكەی و گومڕابوونی لە دیندا.

أحمد بن حنبل دەڵێ: بیدعەچیە خاوەنی بیدعەیە.

زكريا الساجي دەڵێ: درۆزن بوو، فێڵی كرد بۆ بەتاڵ كردنەوەی فەرموودەی پێغەمبەری الله ﷺ و ڕەت كردنەوەی، بۆ سەرخستنی فلان و مەزهەبەكەی (فلان: واتا أبو حنيفة، پێم وایە المزي لە تهذيب الكمال خۆی دەستكاری ئەم ووشەیەی كردبێ ئەگینا الساجي زۆر بوێر بووە لەناوهێنانی أبو حنيفة بەڵام كتێبەكانی بوونیان نەماوە، ووتەكانی لەكتێبی تردا نەقل كراوە بۆمان).

المزي دەڵێ: یەكێك بوو لە جەهمیەكان دەوەستا دەربارەی قوڕئان (واتا نەیدەووت مەخلوق نیە) وە كتێبی نوسیوە لەم بارەیەوە.

عبيدالله بن عمر القواريري دەڵێ: كافرە.

موسى بن القاسم الأشيب دەڵێ: درۆزنێكی پیسە.

محمد بن شجاع فەرموودەیەكی هەڵبەستا كە گوایە پێغەمبەر n فەرموویەتی: الله تعالى ئەسپێكی دروست كرد، ئینجا ئەم ئەسپە عەرەقی كرد، الله خۆی لە عەرەقی ئەسپەكە دروست كرد !

جا ئەم فەرموودەیەی دەدایە پاڵ ئەهلی سوننە تا ناشرینیان بكات.

ابن عبدالبر لەم سەنەدا نەیوتووە قال أبو يعقوب، دەست بەجێ لە أبو علي الأسيوطي دەستی پێكردووە، لەوانەشە هەڵەی چاپ بێ، بەڵام بێگومان حكم بن منذر و أبو يعقوب لە نێوانیاندا هەیە وەك باقی سەنەدەكانی تر، چونكە ابن عبدالبر 7 ساڵ دوای مردنی أبو علي الأسيوطي لە دایكبووە، أبو علي 361 مردووە، ابن عبدالبر 368 لە دایكبووە، بۆیە مەحاڵە ڕیوایەتی لێوە بكات.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا جدي رحمه الله قال حدثنا أبو الحسن بن مبشر بواسط قال حدثنا يوسف بن موسى قال حدثنا جرير بن عبدالحميد ووتی: **مغيرة پێی ووتم: ئەی جرير ناچیتە لای أبو حنيفة ؟ (واتا بڕۆ لای زانستی لێوەرگرە).** [الانتقاء : 128]

ووتم: باپیری أبو يعقوب مەجهولە.

(أبو الحسن بن مبشر) لە چاپی مكتبة القدسي بۆتە (أبو الحسن بن ميسر).

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا إسحاق بن أحمد الحلبي قال حدثنا سليمان بن سيف،

وحدثنا أبو محمد بن المقرئ قال حدثنا أحمد بن يحيى قالا حدثنا يحيى بن آدم ووتی: **بيستم الحسن بن صالح دەيووت: النعمان بن ثابت زانايەكی تێگەيشتوو بوو، چەسپاو بوو لە زانستەكەيدا، گەر فەرموودەيەكی پێغەمبەر ﷺ بە صەحيحی چەسپابوايە لەلای نەدەچوو بۆ شتی تر.**
[الانتقاء : 128]

ووتم: لێرەدا أبو يعقوب بە دوو سەنەد ڕیوايەتی كردووە، سەنەدی يەكەم لە ڕێگای إسحاق بن أحمد الحلبي كە پێشتر ئاماژەمان پێدا جەرح و تەعديلی بۆ نەكراوە، وە سەنەدی دووەم لە ڕێگای أبو محمد عبدالرحمن بن عبدالله المقرئ كە ووتمان هيچ كەسێكی ناسراو نيە بەم ناوە لە چينی أبو يعقوب بێت ئەوەی هەيە يەک ڕاوييە بەم ناوە كە ماوەی زەمەنی نێوان خۆی و أبو يعقوب گەلێک زۆرە وەک پێشتر باسمان كرد.
جگە لەمەش لە بەشی يەكەم هێنامان كە الحسن بن حي بن صالح هەڵوێستی چۆن بووە بەرامبەر أبو حنيفة، وە چەندان نموونەمان هێنا كە أبو حنيفة گاڵتەی بە فەرموودەی صەحيح كردووە و ڕەتی كردۆتەوە، هەروەها ووتەی سفيان بن عيينة-مان هێنا كە دەڵێ: أبو حنيفة فەرموودەی صەحيحی پێدەگەيشت وازی لێدەهێنا و كاری بە شتی تر دەكرد.
(سليمان بن سيف) لە چاپی مكتبة القدسي بۆتە (سليمان بن يوسف).

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا أبو بكر بن عثمان بن محمد الصدفي قال حدثنا عثمان بن أحمد الكرخي بطرسوس قال حدثنا حامد بن يحيى البلخي ووتی: **من لەلای سفيان بن عيينة بووم، پياوێک هاتە لای پرسياری بابەتێكی لێكرد، سفيان ووتی: الفقيه أبو حنيفة وتوويەتی ... (واتا بە وەڵامی أبو حنيفة وەڵامی دايەوە و بە فەقيھ ناوی برد).** [الانتقاء : 129]
ووتم: أبو بكر بن عثمان بن محمد الصدفي كە شێخی أبو يعقوب-ە مەجهولە.
عثمان بن أحمد الكرخي لە هيچ كتێبێک نەمدۆزيەوە، بەڵام ڕاوييەكی تر هەيە بەناوی عثمان بن أحمد الدقاق بەڵام هيچ كەسێک بە نازناوی الكرخي ناوی نەبردووە، بەڵكو بە (ابن السماك) ناسراوە، جا لەبەر ئەوەی عثمان بن أحمد الدقاق هەندێک شێخی هەيە لە طرسوس، گەر بە

گریمانە وای دابنێین کە ئەو بێت لێرەدا کرابێتە الکرخي، بەڵام ئەمەش هەر سەیرە چونکە شێخی عثمان لەم سەنەدا حامد بن یحیى البلخي-ە، عثمان ساڵی 344 مردووە، حامد ساڵی 242 مردووە و نیشتەجێی طرسوس بووە و لەوێدا مردووە، عثمان بەغدادیە گریمان گەر لە تەمەنی 18 ساڵی چووبێتە طرسوس گوێ بیستی حامد بووبێ، ئەوا دەکاتە عثمان 120 ساڵ ژیاوە، بەڵام عثمان خۆی سەنەدی عالی هەیە گەیشتووە بە هەندێک شێخی البخاري کە لەساڵانی 270 مردوون بەڵام گەیشتنی بە حامد بە شتێکی زۆر ئەستەمی دەزانم جگە لەمەش هیچ ڕیوایەتێک نیە کە پشتڕاستی بکاتەوە کە عثمان گەیشتووە بە حامد و ڕیوایەتی لێ کردووە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثني أبو علي أحمد بن عثمان الأصبهاني قال حدثنا أبو عبدالرحمن عبدالله بن محمد الضبي قال سمعت علي بن المديني دەیووت: **بیستم سفيان بن عيينة دەیووت: أبو حنيفة مروئەت و شەو نوێژی زۆری هەبوو.** [الانتقاء : 130]
ووتم: أبو عبدالرحمن عبدالله بن محمد الضبي مەجهولە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا أحمد بن الحسن قال حدثنا يحيى بن أبي طالب قال حدثنا عبدالوهاب بن عطاء الخفاف ووتی: **پرسیار لە سعيد بن أبي عروبة کرا دەربارەی بابەتێک لە تەڵاق، ئەویش وەڵامی دایەوە، پێی ووترا: أبو حنيفة ئاوای ووتوە لەم بابەتەدا، سعيد ووتی: أبو حنيفة زانای عیراق بوو.** [الانتقاء : 130]
ووتم: ابن عبدالبر ڕاستەوخۆ لە أحمد بن الحسن دەستی بە سەنەدەکە کردووە، لەنێوان ابن عبدالبر و أحمد بن الحسن، حكم بن منذر و أبو يعقوب هەیە وەک لە پێشوودا باسمان کرد، باقی ڕاوییەکانی تریش سیقەن.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا الحسن بن الخضر الأسيوطي قال حدثنا أبو بشر الدولابي قال حدثنا محمد بن سعدان قال حدثنا سليمان بن حرب ووتی: **بیستم حماد بن زيد دەیووت: والله من أبو حنيفة-م خۆشدەوێ چونکە ئەو أيوب-ی خۆشدەوێ (واتا: السختياني) وە حماد فەرموودەی**

**زۆری ڕیوایەت کردووە لە أبو حنیفة.** [الانتقاء : 130]

ووتم: أبو بشر الدولابي حەنەفی مەزهەبە، لەم سەنەدا شێخەکەی محمد بن سعدان-ە، دوو ڕاوی هەن بەم ناوە (محمد بن سعدان أبو جعفر النحوي) کە سیقەیە، وە (محمد بن سعدان البزار) کە نەناسراوە و ڕیوایەتی مونکەری لە عبدالله بن مسلمة القعنبي گێڕاوەتەوە، أبو بشر الدولابي خەڵکی (الري)ە کە دەکەوێتە ئێران، محمد بن سعدان أبو جعفر النحوي خەڵکی کوفەیە، أبو بشر ساڵی 224 هـ لە دایکبووە، محمد بن سعدان النحوي ساڵی 231 هـ مردووە، واتا کاتێک ئەو مردووە أبو بشر تەمەنی 7 ساڵ بووە، بۆیە ئەستەمە أبو بشر لە تەمەنی 7 ساڵی سەفەر بکات بۆ طەلەبی عیلم و ڕیوایەت کۆ بکاتەوە هەر بەلانی کەمەوە سەرەتا لە شارەکەی خۆی طەلەبی عیلم دەکات ئینجا کە پێگەیشت و بالغ بوو گەشت دەکات بۆ وولاتانی تر، ئەمە لەکاتێکدا ئەو شێخە عیراقیانەی کە أبو بشر ڕیوایەتی لێکردوون زۆربەیان لە چینی ئەوانەن کە ساڵانی 250 بەدواوە مردوون، گەر أبو بشر بە محمد بن سعدان بگات کە 231 مردووە ئەی بۆ هیچ ڕیوایەتێکی نیە لەو شێخە عیراقیانەی کە لەنێوان ساڵانی 230 بۆ 250 مردوون ؟ بۆیە دەگونجێ ئەم شێخە محمد بن سعدان البزار بێ کە نەناسراوە و ڕیوایەتی مونکەری هەیە، ڕاوییەکی تر هەیە بەناوی محمد بن سعدان بن عبدالله بن حیان بەڵام زوو تر ژیاوە لەچینی أبو بشر نیە چونکە ڕیوایەتی هەیە لە تابعین تەنانەت ڕیوایەتی هەیە لە باوکی یزید بن أبي عبید، خودی یزید تابعیە ساڵی 147 مردووە ئەی باوکی کەی مردووە ؟ پاشان قوتابیەکانی محمد بن سعدان بن عبدالله وەک الحمیدي و معن بن عیسی القزاز پێش لەدایکبوونی الدولابي مردوون، کەواتە ئەگەر زۆرە کە خۆی پێش ئەوانیش مردبێ، ئەو محمد بن سعدان-ە کە لە سەنەدەکە هاتووە سلیمان بن حرب شێخیەتی کە ساڵی 224 مردووە، هەروەها باسمان کرد کە محمد بن سعدان البزار کە مەجهولە و ڕیوایەتی مونکەری هەیە لە القعنبي دەگونجێ ئەو بێت چونکە القعنبي 221 مردووە لەگەڵ سلیمان بن حرب لەیەک سەردەم ژیاون، هەروەها ڕیوایەتی هەیە لە أبو سلیمان الجوزجاني کە ساڵی 220 مردووە هەمووە ئەمانە ئاماژەی بەهێزن کە ئەم ڕاوییە محمد بن سعدان البزار بێت، دواتر مونکەری مەتنەکەی بە ڕوونی دیارە چونکە چەندین ڕیوایەتی حماد بن زید-مان هێنا لە بەشی یەکەم بە

سەنەدی عالی و صەحیح کە دژی أبو حنيفة بووە، ئەی چۆن تەنها لەبەر ئەوە أبو حنيفة-ی خۆشدەوێ چونکە أبو حنيفة أيوب-ی خۆشویستووە، ئەمڕۆ زۆرێک کافر و بیدعەچی و گومڕا هەن کە مالك و الشافعي و أحمد-یان خۆشدەوێ ئایا کەس لە ئێوە ئامادەیە ئەمانەی خۆشبوێ تەنها لەبەر ئەوەی کە ئەم سێ ئیمامەیان خۆشدەوێ ؟ پاشان دەڵێ حماد بن زيد ڕیوایەتی زۆر کردووە لە أبو حنيفة، ئەی کوا ڕیوایەتی حماد لە أبو حنيفة لە كتب التسعة ؟ یەک دانەی بۆم بهێنن.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا أبو التريك محمد بن الحسين الأطرابلسى قال حدثنا محمد بن عوف الحمصي قال حدثنا الهيثم بن جميل ووتی: **بیستم شريك النخعي دەیووت: أبو حنيفة رحمه الله بێدەنگی درێژ خایەن بوو، هەردەم بیری دەکردەوە، کەم مشتومڕی لەگەڵ خەڵکدا دەکرد.** [الانتقاء : 131]
ووتم: (أبو التريك) لە هەردوو چاپەکەدا بۆتە (أبو الشريك) ناوی محمد بن الحسين السعدي الحمصي الأطرابلسي-ە مەجهولە، وە پاشان بە چەندین سەنەدی صەحیح هێنامان کە شريك هەڵوێستی یەکجار توند بووە بەرامبەر أبو حنيفة، هەروەها بە صەحیحی هێنامان کە سفيان الثوري و شريك بن عبدالله و الحسن بن صالح وتوویانە أبو حنيفة تەنها بە مشتومڕ ناسراو بوو، ئەی چۆن دەڵێ کەم مشتومڕی دەکرد ؟!
ئەم سەنەدەش لەڕێگای أبو يعقوب هاتووە، لەچاپی مكتبة القدسي ناوی نەهاتووە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثني جدي رحمه الله قال حدثنا محمد بن حماد قال حدثنا محمد بن مليح بن وكيع قال حدثنا أبي قال حدثنا يزيد بن كميت ووتی: **شريك دەربارەی فەرموودەیەک کە باسی کرد پێی ووتم: ابن شبرمة ووتی: ئافرەتان نەیانتوانی منداڵێکیان ببێت وەک النعمان (واتا: أبو حنيفة).** [الانتقاء : 131]
ووتم: باپیری أبو يعقوب مەجهولە، محمد بن مليح بن وكيع نەمدۆزییەوە، يزيد بن كميت مەتروکە، ناوی لە چاپی مكتبة القدسي بۆتە زيد بن كعب.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا عبدالوارث بن سفيان قال حدثنا قاسم بن أصبغ حدثنا أحمد بن زهير

بن حرب حدثنا يحيى بن معين ووتی: **يحيى بن سعيد القطان ووتی: گەر عەیبمان لە أبو حنيفة گرت لە شتێک، وە سەرزەنشتی هەندێک لە ووتەکانیمان کرد، دەتانەوێ واز لەو ووتانەشی بهێنین کە بە چاکی دەزانین و موافقی ئێمەیە تێیدا ؟!** [الانتقاء : 131]

ووتم: بەلانی کەم سەنەدەکە حەسەنە چونکە وەک پێشتر باسمان کرد عبدالوارث چەسپاوترین کەسە لە ڕیوایەتی قاسم بن أصبغ، ئەمە یەکێکە لەو ڕیوایەتانەی کە ابن عبدالبر لە کتێبەکەی أبو يعقوب نەقلی نەکردووە وەک ئەوانەی پێشوو، لە شێخەکەی خۆی عبدالوارث بن سفيان بن جبرون ڕیوایەتی کردووە، ئەمجارە ڕیوایەتەکە هی أبو يعقوب نەبوو سەنەدەکەی پاکتر بوو لە هەموو ڕیوایەتەکانی پێشوو، ئەمەش نیشانەی پرسیار لەسەر أبو يعقوب دروست دەکات، بەڵام پێم سەیرە ابن عبدالبر ئەم ڕیوایەتەی هێناوە وەک مەدح بۆ أبو حنيفة چونکە من هیچ مەدحێک لەم ڕیوایەتەدا نابینم ! جگە لەوەش لە بەشی یەکەمدا هێنامان کە يحيى بن سعيد القطان دەڵێ: أبو حنيفة دراوسێم بوو لە کوفە هەرگیز پرسیارم لێ نەکردووە.

***ابن عبدالبر*** دەڵێ: حدثنا عبدالوارث بن سفيان قال حدثنا قاسم بن أصبغ حدثنا أبو بكر أحمد بن زهير ابن أبي خيثمة حدثنا يحيى بن معين ووتی: **بیستم پیاوێک پرسیاری لە يحيى بن سعيد القطان کرد دەربارەی أبو حنيفة، يحيى بن معين دەڵێ: يحيى بن سعيد القطان موجامەلەی پیاوەکەی نەکرد شتێکی تری پێ بڵێ، ووتی: والله ئێمە گەر شتێک لە ووتەکانی بە باش بزانین وەری دەگرین.**
[الانتقاء : 131]

ووتم: هەمان سەنەدی ڕیوایەتی پێشووە.

***ابن عبدالبر*** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا محمد بن علي السامري المقرئ قال حدثنا أحمد بن منصور الرمادي قال سمعت يحيى بن معين دەیووت: **بیستم يحيى بن سعيد القطان دەیووت: درۆ لەگەڵ الله عزوجل ناکەین، چەندین شتی جوان هەبووە أبو حنيفة وتوویەتی، وە لەوانەیە شتێک لە ڕەئیەکانی بە باش بزانین وەری بگرین.**

**يحيى بن معين دەڵێ: يحيى بن سعيد لە فەتوادا لەسەر مەزهەبی کوفييەکان بوو.** [الانتقاء : 132]

ووتم: محمد بن علي السامري المقرئ مەجهولە، بڕوانن کە سەنەدەکە گەڕاوەتەوە سەر أبو يعقوب دیسان کەسانی مەجهول و غەریبی تێکەوت، وە کوفە تەنها أبو حنيفة-ی تێدا نیە تا ووتەکەی يحيى بن معين بەمە لێک بدرێتەوە مەبەستی أبو حنيفة بووە، دواتر من هیچ کام لەم ووتانەی يحيى بن سعيد القطان ناگۆڕمەوە بە ووتەکەی بەشی یەکەمی کە ابن أبي حاتم لە صالح-ی کوڕی ئیمام أحمد ڕیوایەتی کردووە ئەویش لە علي بن المديني ڕیوایەتی کردووە ئەویش لە يحيى بن سعيد القطان کە دەڵێ: أبو حنيفة دراوسێم بوو لە کوفە، نە لێی نزیک بوومەوە نە پرسیاریشم لێیکرد، سەیری ئەم سەنەدەکە بکە کەسانی ناسراو و گەورە و خاوەن پلەی بەرز لەیەکتری ڕیوایەت دەکەن، ئینجا بەراووردی بکە بە سەنەدەکانی ابن عبدالبر.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا أبو حفص عمر بن أحمد بن علي المروزي بمكة عند صناديد المراوزة في ذي الحجة قال حدثنا أبو الموجه قال حدثنا عبدالله بن عثمان ووتی: **بيستم عبدالله بن المبارك دەيووت: أبو حنيفة لە كۆندا بە الشعبي والنخعي گەيشتووە، وە جگە لەوانيش لە زانا گەورەكان، ئەو بەرچاو ڕوون بوو لە ڕەئيدا ئەم بابەتە بۆ ئەو يەكلايی كرابوويەوە، بەڵام هەتيو بوو لە فەرمووددەدا.** [الانتقاء : 132]

ووتم: ئەمەش پێچەوانەی ووتەی تەواوی زانایانە کە دەربارەی ڕەئی أبو حنيفة هێنامان، ڕەنگە ئەم ووتەیە پێش تەوبە کردنی ابن المبارك بێت دەربارەی أبو حنيفة، وەک زانیمان تەوبەی کرد و پەشیمان بوویەوە لە نزیکی لە أبو حنيفة.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا عبدالوارث بن سفيان قال حدثنا قاسم بن أصبغ حدثنا أبو بكر بن أبي خيثمة قال حدثنا الوليد بن شجاع قال حدثنا علي بن الحسن شقيق ووتی: **ابن المبارك دەيووت: گەر ئەم دووانە لەسەر شتێک کۆک بوون دەستی پێوە بگرە، واتا سفيان الثوري و أبو حنيفة.**

[الانتقاء : 132]

ووتم: ئەمە کاتی سەرەتایە کە ابن المبارك موبتەلا بوو بە أبو حنيفة وەک باقی خەڵکی خوراسان

کە باسمان کرد لە بەشی یەکەمدا، وە بە سەنەدی صەحیح هێنامان کاتێک ابن المبارك لەلای الأوزاعي مەدحی أبو حنيفة دەکات الأوزاعي چۆن وەڵامی دەداتەوە، وە خودی خۆشی دان بەوە دەنێت سەرەتا هاتوچۆی کردووە پاشان حاڵی بۆ دەرکەوتووە وازی لێ هێناوە، وە وتوویەتی مورجیئەیە، وە لەکۆتایی تەمەنی پەشیمان بۆتەوە لە ڕیوایەت کردن لێی وگریاوە وتەوبە و إستغفاری کردووە ئەمانەمان هێنا، وە چەند ڕۆژێک پێش مردنی فەرموودەکانی أبو حنيفة-ی سڕیوەتەوە.
أبو إسحاق الفزاري لە چاپی مكتبة القدسي جارێک بە هەڵە ناوی هاتووە کراوە بە أبو الحسن الفزاري دواتر چاک کراوەتەوە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب أخبرنا محمد بن أحمد بن يعقوب إجازه قال حدثنا جدي قال حدثنا محمد بن مسلم قال سمعت إسماعيل بن داود دەیووت: **ابن المبارك بە چاکە باسی أبو حنيفة-ی دەکرد و تەزکیەی دەکرد و ستایشی دەکرد، وە أبو إسحاق الفزاري ڕقی لە أبو حنيفة دەبوویەوە، جا گەر ئەو و ابن المبارك بەیەکەوە کۆببونایەوە أبو إسحاق الفزاري جورئەتی نەدەکرد باسی أبو حنيفة بکات بەهیچ شتێک لەبەردەم ابن المبارك.** [الانتقاء : 132]
ووتم: محمد بن مسلم بۆم دەرنەکەوت کێیە، إسماعيل بن داود دوو ڕاوی هەن بەم ناوە کە شێخەکانیان لەهەمان چینی ابن المبارك بێ، دانەیەکیان مەجهولە دانەکەی تریش زۆر زەعیفە، وە هیچ ڕاوییەکم نەدۆزییەوە بەم ناوە ڕیوایەتی هەبێ لە ابن المبارك، سەنەدەکەش ڕوون نیە کە إسماعيل بن داود بە ابن المبارك گەیشتووە یان نا.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا أبو عبدالله محمد بن حزام الفقيه قال حدثنا قاسم بن عباد قال حدثنا أحمد بن محمد السراج قال حدثنا عبدان ووتی: **پیاوێک لە مەجلیسی عبدالله بن المبارك تانەی لە أبو حنيفة دا، بیستم عبدالله بن المبارك پێی ووت: بێدەنگ بە، والله گەر أبو حنيفة ببینی ئەوا عەقڵ و شەرەف دەبینی.** [الانتقاء : 133]
ووتم: (محمد بن حزام الفقيه) لە چاپی مكتبة القدسي بۆتە (محمد بن حرام الفقيه) أبو غدة لە

تەحقیقەكەیدا دەڵێ: دڵنیا نیم كامەیانە بەڵام حزام بە ڕاجح دەزانم، وە ژیاننامەیم نەدۆزیوەتەوە، منیش گەڕام نەمدۆزییەوە، وە أحمد بن محمد السراج نەمدۆزییەوە تەنها لەناو كتێبی شیعەكان ڕیوایەتی هەبوو.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: وقال حدثنا قاسم بن عباد قال حدثنا أبو سليمان الجوزجاني ووتی: **بیستم عبدالله بن المبارك دەیووت: كەسم نەبینیوە زیاتر بترسێ لە الله لە سفيان الثوري، وە كەسم نەبینیوە عاقڵتر بێ لە أبو حنيفة.** [الانتقاء : 133]

ووتم: كە دەڵێ (وقال) لە سەرەتای سەنەدەكە مەبەستی محمد بن حزام الفقيه-ە كە لە قاسم بن عباد ڕیوایەتی دەكات چونكە ڕیوایەتی پێشووش لەڕێگای ئەو بوو بۆیە تەنها دەڵێ (وقال) بەبێ ناوهێنانی، وە باسمان كرد محمد بن حزام مەجهولە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا محمد بن محمد أبو العباس ابن شابور قال حدثنا علي بن عبد العزيز قال حدثنا الحسن بن الربيع ووتی: **بیستم عبدالله بن المبارك دەیووت:**

**رأيت أبا حنيفة كل يـــــوم *** يزيد نباهة ويزيد خيـــــرا**

**وينطق بالصواب ويصطفيه *** إذا ما قال أهل الجور جورا**

**يقايس من يقايسه بلـــــب *** ومن ذا تجعلون له نظيـــرا**

**كفانا فقد حماد وكانــــــت *** مصيبتنا به أمرا كبيـــــرا**

**رأيت أبا حنيفة حين يؤتـــى *** ويطلب علمه بحرا غزيـــرا**

**إذا ما المشكلات تدافعتهـــا *** رجال العلم كان بها بصيـــرا**

[الانتقاء : 133]

ووتم: محمد بن محمد أبو العباس ابن شابور مەجهولە، لە چاپی مكتبة القدسي (شابور) بۆتە (سابور).

**المعلمي** دەڵێ: **ئەوەی لە ابن المبارك-ەوە ڕیوایەت كراوە دەربارەی مەدحی أبو حنيفة ئەوا**

**بەپێی سەیرکردنی سەنەد و مەتنەکەی حاڵی ڕیوایەتەکە دەزانرێ، وەک ئەو بەیتە شیعرە سەخیفانەی کە حەنەفیەکان هەمیشە دەیڵێنەوە لەناویشیاندا الکوثري، کەسانێک خۆیان نەپاراست لە درۆ کردن بە دەمی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی مەدحی ئیمامەکەیان، جا چۆن بە دوور دەزانرێ کە درۆ بکەن بە دەمی ابن المبارك ؟! جا گەر شتێک لەم ڕیوایەتانەی مەدح کردن بەهێز بوو ئەوا بەراوورد دەکرێ بە ڕیوایەتەکانی زەم کردن، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ ڕێگرییەک نیە کە ستایشی پیاوێک بکرێ لە ڕوویێکەوە، وە زەمی بکرێ لە ڕوویێکی تردا، بەڵکو ئەم شتە بوونی زۆرە.**
**[التنكيل : 650/1]**

ووتم: مەبەستی ئەوەیە حەنەفیەکان درۆیان بە دەمی پێغەمبەر ﷺ هەڵبەستا بۆ مەدحکردنی أبو حنيفة گوایە لە فەرموودەدا ناوی هاتووە و مەدح کراوە وەک دواتر دەیهێنین، جا کەسانێک ئەمە حاڵیان بێت هیچ سەیر نیە درۆ بە دەمی ابن المبارك یان زانایانی تر بکەن بۆ مەدحکردنی أبو حنيفة.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا عبدالوارث بن سفيان حدثنا قاسم بن أصبغ حدثنا أحمد بن زهير حدثنا سليمان بن أبي شيخ قال حدثنا حجر بن عبدالجبار ووتی: **بە القاسم بن معن ووترا: تۆ کوڕی عبدالله بن مسعود-ی ڕازی دەبیت ببیت بە نۆکەری أبو حنيفة ؟ القاسم ووتی: خەڵکی لەلای هیچ کەسێکدا دانەنیشتوون بە سوودتر بێ لە مەجلیسی أبو حنيفة، القاسم پێی ووت: وەرە لەگەڵم بچینە لای، جا کاتێک لەلای دانیشت پابەند بوو پێیەوە، وە ووتی: هاوشێوەی ئەمەم نەبینیوە. سلیمان دەڵێ: أبو حنيفة نەرم و نیان و خاوەن وەرع و سەخی بوو. [الانتقاء : 134]**

ووتم: حجر بن عبدالجبار نەناسراوە، تەنها ابن حبان لە کتێبی (الثقات) ناوی هێناوە، ابن حبان-یش ناسراوە بە تەوسیق کردنی مەجهولەکان، جگە لەوەش هیچ لەفزێکی تەعدیل کردنی بۆ بەکار نەهێناوە وەک ئەوەی بڵێ: صدوق یان حافظ یان ثقة یان ثبت، تەنها فەرموودەیەکی ئەوی هێناوە، وە دەڵێ حجر لە عبدالملك بن عمير ڕیوایەتی هەیە، وە هشام بن محمد بن السائب ڕیوایەتی لە حجر کردووە، لەمە زیاتر هیچی تری نەووتوە دەربارەی، المعلمي پلەبەندی کردووە بۆ ئەو ڕاویانەی

كە ابن احبان لە كتێبی (الثقات) هێناویەتی كردوونی بە پێنج پلە بەم شێوەیە:

یەكەم: بە ڕاشكاوی بڵێ متقن بووە یان مستقیم الحدیث یان هاوشێوەی ئەم ووتانە.

دووەم: ڕاوییەكە شێخی ابن حبان بێ و لەگەڵی دانیشتبێ.

سێیەم: ناسراو بێ بەوەی كە فەرموودەی زۆری هەیە، وە بزانرێ كە ابن حبان فەرموودەی زۆری ئەوی بەرچاو كەوتووە.

چوارەم: لە چوارچێوەی ووتەكەی ابن حبان ئەوە دەركەوێ كە ابن حبان زۆر بە چاكی ئەم ڕاوییە دەناسێ.

پێنجەم: جگە لەم خاڵانەی سەرەوە بێ.

خاڵی یەكەم هیچی كەمتر نیە لە تەوسیق كردنی پێشەوایەكانی تر بەڵكو لەوانەیە لەهی زۆرێكیان چەسپاوتر بێ، خاڵی دووەم نزیكە لەوەی یەكەم، خاڵی سێیەم قبوڵ كراوە، خاڵی چوارەم صالحة، خاڵی پێنجەم لە هەڵە ئەمین نابێ، واللە أعلم.

بڕوانە [التنكيل : 734/1] ئەم ڕاوییەش لە جۆری پێنجەمە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا أبو جعفر العقيلي قال حدثنا أبو شعيب الحراني قال حدثنا علي بن الجعد ووتی: **ئێمە لەلای زهير بن معاوية بووین پیاوێك هاتە لای، زهير پێی ووت: لەكوێوە هاتی ؟ ووتی: لەلای أبو حنيفة، زهير ووتی: یەك ڕۆژ ڕۆیشتنت بۆلای أبو حنيفة بە سوودترە بۆت لە هاتنی مانگێكت بۆلای من.** [الانتقاء : 134]

ووتم: لە أبو يعقوب بەدواوە ڕاوییەكانی سیقەن.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا حكم بن منذر قال حدثنا أبو يعقوب يوسف بن أحمد الصيدلاني بمكة حدثنا أبو العباس محمد بن الحسين الفارض قال حدثنا محمد بن إسماعيل الصائغ قال حدثنا روح بن عبادة ووتی: **من لەلای ابن جريج بووم ساڵی 150 پێی ووترا: أبو حنيفة مرد، ووتی: رحمه الله زانستێكی زۆری لەگەڵ ڕۆیشت.** [الانتقاء : 135]

ووتم: أبو العباس محمد بن الحسين الفارض مەجهولە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب يوسف بن أحمد حدثنا أبو علي محمد بن علي السامري قال حدثنا أحمد من منصور الرمادي ووتی: **بیستم عبدالرزاق بن همام دەیووت: کەسم نەدیوە لە أبو حنیفة نەرم و نیانتر بێ، بینیم لە مسجد الحرام خەڵکی بازنەیان دروست کردبوو بە دەوریدا، پیاوێک پرسیاری بابەتێکی لێکرد ئەویش فەتوای بۆدا، پیاوێک پێی ووت: الحسن لەم بابەتەدا ئاوا و ئاوای ووت، وە عبدالله بن مسعود لەم بابەتەدا ئاوای ووت. أبو حنيفة ووتی: الحسن هەڵەی کرد و عبدالله بن مسعود پێکای، خەڵکەکە هاواریان لەسەری کرد. عبدالرزاق دەڵێ: سەیری بابەتەکەم کرد بینیم ووتەی ابن مسعود تێیدا هەمان ووتەی أبو حنیفة بوو، وە هاوەڵانی عبدالله بن مسعود شوێنی کەوتن.** [الانتقاء: 135]

ووتم: محمد بن علي السامري أبو علي المقرئ باسمان کرد مەجهولە، دواتر بە سەنەدی صەحیح هێنامان کە سوار بن عبدالله دەڵێ: أبو حنیفة نەرم و نیانی پێ نەبەخشراوە لە دینەکەیدا، وە هێنامان کە هەر ئەم عبدالرزاق-ە دەڵێ: بەڕاستی أبو حنیفة مورجیئە بوو.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا حكم قال حدثنا يوسف حدثنا محمد بن حفص بن عمرويه قدم علينا حاجا على باب التمارين قال سمعت عباس بن عزيز قال سمعت حرملة دەیووت: **بیستم الشافعي دەیووت: أبو حنیفة ووتەکانی لە فیقهدا قسەی لەسەر نیە و یەکلایی کراوەتە بۆی. عباس بن عزیز دەڵێ: وە بیستم حرملة دەیووت: بیستم الشافعي دەیووت: کێ دەیەوێ زانستی فراوان بکات لە المغازي ئەوا لەسەر محمد بن إسحاق حیسابە، وە ئەوەی فیقهی دەوێ ئەوا لەسەر أبو حنیفة حیسابە.** [الانتقاء: 135-136]

ووتم: محمد بن حفص بن عمرويه و عباس بن عزيز هەردووکیان مەجهولن، دواتر ڕیوایەتەکانی تریش دەهێنین لە (تاریخ بغداد) دەربارەی مەدحی الشافعي بۆ أبو حنیفة وەڵامیشی دەدەینەوە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا حكم بن منذر بن سعيد قال حدثنا يوسف بن أحمد بمكة قال حدثنا أبو سعيد بن الأعرابي قال حدثنا عباس الدوري ووتی: **بیستم یحیی بن معین دەیووت: کەسم نەبینیوە وەک وکیع، وە ئەو فەتوای دەدا بە ڕەئی أبو حنیفة.** [الانتقاء: 136]

ووتم: لە حكم بن منذر و يوسف بن أحمد بەدواوە ڕاوییەکان سیقەن، گەر ئەم ڕیوایەتە صەحیح بێت ئەوا پەڵەیەکی ڕەشە بە نێوچەوانی وکیع چونکە ڕیوایەتی زۆرمان هێنا لە سەلەف کە ڕەئی أبو حنيفة چۆنە و ئەوەی شوێنی ڕەئیەکانی بکەوێ حاڵی چۆنە، بەڵام بەم شێوەیە نیە کە يحيى باسی دەکات یان دەتوانین بڵێین ووتەکەی يحيى نابێت بە ڕواڵەت وەربگرین مەبەستی شتێکی تایبەت بووە، چونکە ئەوەی لە وکیع-ەوە ڕیوایەت کراوە تەواو پێچەوانەی ئەم ووتەیەی يحيى بن معين-ە.

***الترمذي*** دەڵێ: حدثنا أبو كريب قال حدثنا وكيع عن هشام الدستوائي عن قتادة عن أبي حسان الأعرج عن ابن عباس ووتی: **پێغەمبەر ﷺ دوو نەعلی لە ملی ئاژەڵەکەی هەڵواسی و لای ڕاستی ئاژەڵەکەی بریندار کرد لە (ذي الحليفة) وە خوێنەکەی سڕیەوە.**

**الترمذي دەڵێ: فەرموودەکەی ابن عباس فەرموودەیەکی حسن صحيح-ە. زانایانیش کار بەم فەرموودەیە دەکەن لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و جگە لەوانیش، بریندارکردنی ئاژەڵی قوربانی بۆ حەج بە سوننەت دەزانن، ئەمەش ووتەی الثوري و الشافعي وأحمد وإسحاق-ە.**

**الترمذي دەڵێ: بیستم يوسف بن عيسى دەیووت: بیستم وکیع کاتێک ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەت کرد دەیووت: سەیری ووتەی ئەهلی ڕەئی مەکەن لەم بابەتەدا، بریندار کردنی ئاژەڵ سوننەتە ووتەی ئەوانیش بیدعەیە.**

**الترمذي دەڵێ: وە بیستم أبو السائب دەیووت: ئێمە لەلای وکیع بووین، بە یەکێک لە پیاوەکانی ووت کە لەلای بوو سەیری ووتەکانی ئەهلی ڕەئی دەکرد: پێغەمبەر ﷺ ئاژەڵی بریندار کرد، أبو حنيفة-ش دەڵێ ئەم کارە هەتک کردنە، پیاوەکە ووتی: لە إبراهيم النخعي ڕیوایەت کراوە کە دەڵێ: بریندارکردنی ئاژەڵ هەتک کردنە، أبو السائب دەڵێ: بینیم وکیع توڕە بوو توڕە بوونێکی زۆر توند، ووتی: پێت دەڵێم پێغەمبەری الله ﷺ فەرمووی، تۆش دەڵێی إبراهيم وای ووت! چەندە شایستەی کە بەند بکرێی نەیەیتە دەرەوە تاکو دەست لەم ووتەیەت هەڵدەگری.** [جامع الترمذي : 906]

ووتم: موخالەفەکردنی أبو حنيفة بۆ بابەتی (إشعار) کە بریندارکردنێکی سوکی ئاژەڵی قوربانی

حاجیەكانە تا جیا بكرێتەوە و بناسرێتەوە هەروەها هەڵواسینی شتێك لە ملی ئاژەڵەكە بۆ هەمان مەبەست، لە بەشی یەكەمدا هێنامان لەو 30 فەرموودەیەی كە ابن الجوزي هێنابووی كە تێیدا أبو حنیفة موخالەفەی فەرموودەی صەحیحی كردووە، جا سەیری ووتەكانی وكیع بكەن دەربارەی أبو حنیفة و ئەهلی ڕەئی، سوێندتان دەدەم بە الله بڕوا دەكەن ئەمە ووتەی كەسێك بێ كە بەپێی ڕەئی أبو حنیفة فەتوا بدات ؟

**المباركفوري** لە شەرحی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێ: **ووتەكەی وكیع كە دەڵێ: سەیری ووتەی ئەهلی ڕەئی مەكەن إشعار سوننەتە، ووتەكەی ئەوانیش بیدعەیە. أبو الطیب السندي لە شەرحی الترمذي دەڵێ: وكیع بەم ووتەیەی ئاماژە بە ووتەی ئیمام أبو حنیفة دەكات، دەووترێ إشعار لەلای ئەو مەكروهە، وە دەووترێ بیدعەیە.**

**المباركفوري دەڵێ: خاوەنی كتێبی (العرف الشذي) دەڵێ: لەفزی (ئەهلی ڕەئی) بۆ بەكەم سەیركردن نیە بەڵكو بۆ فەقیهـ بەكاردەهێنرێ، بەڵام یەكەمجار ئەم لەفزە بۆ أبو حنیفة و هاوەڵەكانی بەكارهات، ئەو یەكەم كەس بوو فیقهی نوسیەوە، لە پاشاندا لەفزی ئەهلی ڕەئی بەكارهات بۆ هەموو فەقیهێك.**

**المباركفوري دەڵێ: بێگومان مەبەستی وكیع لە ووشەی (ئەهلی ڕەئی) أبو حنیفة و هاوەڵەكانیەتی، بەڵگەش بۆ ئەمە ووتەكەی دواتری وكیع-ە كە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ إشعار-ی كرد أبو حنیفة-ش دەڵێ إشعار هەتك كردنە، جا ئەم ووتەیەی وكیع و ووتەكەی تری كە دەڵێ: سەیری ووتەی ئەهلی ڕەئی مەكەن ...هتد، هەردووكیان بۆ سەرزەنشت كردنی ئیمام أبو حنیفة-یە كە دەڵێ إشعار هەتك كردنە یان مەكروهە، جا وكیع بەم دوو ووتەیە سەرزەنشتی أبو حنیفة و هاوەڵەكانی كرد سەرزەنشت كردنێكی توند، وە ڕەددی دایەوە ڕەددانەوەیەكی بەلیغ، جا بەم دوو ووتەیە دەركەوت كە وكیع حەنەفی مەزهەب نەبووە كە تەقلیدی ئیمام أبو حنیفة بكاتەوە، گەر وكیع حەنەفی بووایە ئەوا ئەم سەرزەنشت كردنەی نەدەكردن هەرگیز، جا ووتەكەی خاوەنی كتێبی (العرف الشذي) بەتاڵ بوویەوە كە دەڵێ وكیع حەنەفیە.**

**المباركفوري دەڵێ: گەر بڵێی: الذهبي لە كتێبی (تذكرة الحفاظ) لە ژیاننامەی وكیع-دا دەڵێ: یحيى ووتی: كەسم نەدیوە لە وكیع باشتر، شەونوێژی دەكرد و بەدوای یەكدا بە ڕۆژوو دەبوو، فەتوای دەدا بەپێی ڕەئی أبو حنیفة. جا ئەم ووتەی یحيى بەڵگەیە كە وكیع حەنەفی بووە.**

**دەڵێم: مەبەست لە ووتەكەی یحيى كە دەڵێ: (فەتوای دەدا بەپێی ڕەئی أبو حنیفة) ئەمە فەتوادانە بە جائیزبوونی خواردنەوەی (نبیذ)ی كوفیەكان، وكیع دەیخواردەوە و فەتوای جائیزبوونی دەدا بەپێی ووتەی أبو حنیفة، كەواتە مەبەست لە ووتەكەی یحيى فەتوای داوە بە ووتەی أبو حنیفة ئەمە خاصە نەک عام بێ، گەر واش دابنێین مەبەستی عامە ئەوا بێگومان مەبەستی ئەوەیە كە فەتوای داوە بە ووتەی أبو حنیفة لەو بابەتانەی كە ووتەكەی پێچەوانەی فەرموودە نەبووە، بەڵگەش بۆ ئەمە دوو ووتەكەی پێشووی وكیع-ە، سەبارەت بە ووتەكەی خاوەنی كتێبی (العرف الشذي) كە دەڵێ: لەفزی (ئەهلی ڕەئی) بەكاردێت بۆ فەقیهـ، وە كە دەڵێ: بۆ هەموو فەقیهێک بەكاردێت، ئەم لەفزە بۆ هەموو فەقیهێک بەكارنایەت هەروەک لە پێشەكیدا ڕوونمان كردووە.**

[تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي : 3/650-651]

ووتم: المباركفوري ئەم وەهمەی بەتاڵ كردەوە كە وكیع حەنەفی بوو بێت یان بەپێی ڕەئی أبو حنیفة فەتوا بدات، جا فەرموودەناسێكی ناسراوی وەک وكیع كە لە سەردەمی خۆیدا وەک دەووترێ گەشتی زانایان تەنها بۆلای ئەو بووە، گەر ئەو كار بە فەرموودە نەكات و شوێنی ڕەئی أبو حنیفة بكەوێ كێ تر دەمێنێ كە شوێنی أبو حنیفة نەكەوێ ؟! بەڵكو لە ووتەكانیدا دیارە كە دژی أبو حنیفة و ئەهلی ڕەئی بووە، سەبارەت بە (نبیذ)یش كە كوفیەكان بە جائیزیان داناوە ئەمە تەنها فەتوای أبو حنیفة نیە تا بڵێین لەمەدا شوێنی كەوتووە، بگرە ووتەی ژمارەیەک زانای تری كوفەیە كە نەک حەنەفی مەزهەب نین بگرە دژی أبو حنیفة-ن، بۆیە زانایەكی وەک عبدالله بن إدريس كە خەڵكی كوفەیە دەڵێ: لە دونیادا حەزم لە سێ شتە لە كوفەدا نەمێنن: قیرائەی حمزة و ڕەئی أبو حنیفة و خواردنەوەی نبیذ، سەبارەت بە خاوەنی كتێبی (العرف الشذي) أنور شاه الكشميري-ە كە حەنەفی مەزهەبە ووتەكەی هیچ نرخێكی نیە كە دەڵێ: لەفزی (ئەهلی ڕەئی) بۆ هەموو فەقیهێک بەكاردێ، ئەمە هەڵەیەكی زۆر گەورەیە و گۆڕینی ڕاستیەكانە، بە چەندین بەڵگە هێنامان كە ئەهلی

ئەهلی ڕەئی لای سەلەف واتا أبو حنيفة و شوێنکەوتوانی، ئەمە شتێک نیە شایەنی مشتومڕ کردن بێت، یان کە دەڵێ: بەکارهێنانی ووشەی (ئەهلی ڕەئی) بۆ بەکەم سەیرکردن نیە، بگەڕێن بزانن دەدۆزنەوە سەلەف بە باشە ناوی ئەهلی ڕەئی ببەن، بەڵکو باس نەکراون تەنها بە خراپە نەبێ.

***الترمذي*** دوای هێنانی فەرموودەی لەعنەت کردنی پێغەمبەر ﷺ لەو کەسانەی کە مارە بە جاش دەکەن (مێردە کاتیەکە ومێردی یەکەم) پاشان دەڵێ: **زانایان کار بەم فەرموودەیە دەکەن لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەوانە: عمر بن الخطاب وعثمان بن عفان وعبدالله بن عمرو جگە لەوانیش، وە ئەمە ووتەی فەقیهەکانە لە تابعین، وە ووتەی سفيان الثوري وابن المبارك والشافعي وأحمد وإسحاق-ە.**

**الترمذي دەڵێ: وە بیستم الجارود لە وكيع-ەوە باسی دەکرد کە ئەویش بەپێی ئەم فەرموودەیە فەتوای داوە، وە وتوویەتی: پێویستە بەم بابە (واتا بابی نەهیکردن لە مارە بە جاش) ووتەی ئەهلی ڕەئی فڕێ بدرێت.** [جامع الترمذي : 1120]

***المباركفوري*** دەڵێ: **ووتەکەی وكيع کە دەڵێ: پێویستە بەم بابە ووتەی ئەهلی ڕەئی فڕێ بدرێت، واتا أبو حنيفة و هاوەڵەکانی.** [تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي : 265/4]

***المباركفوري*** دەڵێ: **هەندێک لە حەنەفیەکان دەڵێن وكيع بن الجراح فەتوای دەدا بە ووتەی أبو حنيفة، وە فەرموودەی زۆری لە أبو حنيفة بیستووە، وە هەندێکیان پێیان وایە کە وكيع حەنەفی مەزهەب بووە فەتوای داوە بە ووتەی أبو حنيفة و تەقلیدی ئەوی کردۆتەوە. منیش دەڵێم: ووتنی ئەوەی کە وكيع حەنەفی بووە و تەقلیدی أبو حنيفة-ی کردۆتەوە زۆر باطلە، نابینی الترمذي لەم کتێبەیدا لە (باب إشعار البدن) دەڵێ:** ... (لێرەدا فەرموودەکەی سەرەوە دەهێنێ کە پێش ئێستا هێنامان، پاشان ووتەکەی وكيع دەهێنێ کە باسی أبو حنيفة دەکات ئینجا دەڵێ) **ئەم ووتەی وكيع لە سەرەتاوە تا کۆتاییەکەی هاوار دەکات بە دەنگێکی بەرز کە وكيع تەقلیدکەرەوەی أبو حنيفة نەبووە، وە تەقلیدکەرەوەی کەسی تریش نەبووە، بەڵکو شوێنکەوتەی سوننەت بووە زۆر**

**سەرزەنشتی ئەوانەی کردووە کە پێچەوانەی سوننەت دەکەن، وە سەرزەنشتی ئەو کەسەی کردووە کە لەلایدا باسی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دەکرێ ئەویش باسی ووتەی یەکێک لە خەڵکی دەکات کە پێچەوانەی فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ وە ئەو کەسەش کە ووتی وکیع فەتوای دەدا بە ووتەی أبو حنیفة مەبەستی ئەوە نیە کە لە هەموو بابەتێک بە ووتەی ئەو فەتوای دەدا، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە فەتوای داوە بە ووتەی ئەو لە هەندێک بابەتدا، وە فەتوادانی لەم هەندێک بابەتەشدا تەقلیدکردنەوەی أبو حنیفة نەبووە بەڵکو ئیجتیهادی خۆی بووە جا فەتواکەی موافقی فەتوای أبوحنیفة بووە، جا ئەو وایزانیوە کە بە ووتەی أبوحنیفة فەتوا دەدات، بەڵگەش بۆ هەموو ئەم قسانە ووتەکانی پێشووی وکیع-ە. [تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي : 22/1]**

ووتم: المباركفوري هیچی نەهێشتەوە کە باسی بکەین.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الحسين بن محمد أخو الخلال قال أخبرنا جبريل بن محمد العدل بهمذان قال حدثنا محمد بن جبويه النخاس قال حدثنا محمود بن غيلان قال حدثنا **وكيع ووتی: بیستم الثوري دەیووت: ئێمە ئیمانداریین، وە ئەهلی قیبلەش ئیماندارن لەلامان لە مارەکردن و میرات و نوێژ و دان پێدانان، وە تاوانمان هەیە نازانین حاڵمان چۆنە لەلای الله. وكيع دەڵێ: أبو حنيفة ووتی: هەر کەسێک ئەم قسەیەی سفیان بکات ئەوا لەلای ئێمە ئەو کەسە گومانی هەیە لە ئیمانەکەی، ئێمە ئیمانداریین لێرەدا و لەلای الله-ش بە حەق. وكيع ووتی: ئێمەش هەمان قسەی سفیان دەکەین، وە قسەکەی أبو حنيفة لەلاماندا جورئەتە. [تاريخ بغداد : 506/15] (سەنەدەکەی حەسەنە).**

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني الحسن بن محمد بن الحسن الخلال حدثنا محمد بن العباس الخزار حدثنا أبو بكر بن أبي داود حدثنا علي بن خشرم ووتی: **بیستم وكيع چەندین جار دەیووت: ئەی لاوینە خۆتان فێری فیقهی فەرموودە بکەن، گەر ئێوە لە فیقهی فەرموودە تێگەیشتن ئەوا ئەهلی ڕەئی بەسەرتاندا زاڵ نابن. [الفقيه والمتفقه : 161/2] (سەنەدەکەی صەحیحە).**

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الحسن بن الحسين بن العباس النعالي أخبرنا أبو بكر أحمد بن جعفر بن محمد

بن سلم الختلي حدثنا أحمد بن علي الأبار حدثنا علي بن خشرم المروزي ووتی: **بیستم وكیع بە ئەهلی حەدیثی دەیووت: گەر ئێوە لە فەرموودە تێبگەن و فێری ببن ئەوا ئەهلی ڕەئی بەسەرتاندا زاڵ نابن، أبو حنيفة لە هیچ بابەتێكدا قسەی نەكردووە پێویستمان پێی بێ ئیللا ئێمە لەم بابەتەدا بابێك ڕیوایەت دەكەین.** [الفقيه والمتفقه : 162/2] **(سەنەدەكەی صەحیحە).**

ووتم: واتا گەر أبو حنيفة لە بابەتێكدا قسەیەكی كردبێ كە ئێوە پێتان وایە پێویستیتان بەم قسەیەی ئەو هەیە و دەبێ گوێی لێبگرن و كاری پێ بكەن، ئەوا ئێمە لەم بابەتەدا ژمارەیەك لە فەرموودە ڕیوایەت دەكەین، بۆیە فەرموودەمان لەبەر دەستە لە بابەتەكان پێویستیمان بە قسەی ئەو نیە، جا ئەم ووتانەی وكیع دووری و دژایەتی وكیع بەرامبەر ئەهلی ڕەئی دەردەخات كە پێشەوایەكەیان أبو حنيفة-یە، وە لە بەشی یەكەمدا هێنامان كە وكیع دەڵێ: أبو حنيفة موخالەفەی 200 فەرموودەی كرد، وە وكیع گومانی هەبوو لەوەی كە أبو حنيفة گوێ بیستی فەرموودە بووبێ لە عطاء لە كاتێكدا أبو حنيفة دەڵێ: سمعت عطاء، وكیع دەڵێ: ئەگەر بیستبێتی، ئەمەش گومانی درۆكردنە لێی، دوای هەموو ئەمانە دەووترێ: وكیع شوێنی ڕەئی أبو حنيفة كەوتووە!

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا حكم بن منذر قال حدثنا يوسف بن أحمد قال حدثنا حدثنا محمد بن علي السمناني قال حدثنا أحمد بن حماد قال حدثنا القاسم بن عباد قال حدثنا محمد بن علي قال سمعت يزيد بن هارون دەیووت: **خالد الواسطي پێی ووتم: سەیری ووتەكانی أبو حنيفة بكە تا فێری فیقهـ بیت چونكە پێویستیت پێیەتی.** [الانتقاء : 136]

ووتم: (خالد الواسطي) لە چاپی مكتبة القدسي بۆتە (خلد الواسطي) نازانم كێیە ڕەنگە خالد بن عبدالله الطحان بێ، وە محمد بن علي السمناني مەجهولە، وە أحمد بن حماد نەمدۆزییەوە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا حكم بن منذر قال حدثنا أبو يعقوب يوسف بن أحمد قال حدثنا جعفر بن إدريس المقرئ قال حدثنا الحسن بن محمد بن هارون قال حدثنا محمد بن أبي منصور قال حدثنا حاتم بن آدم ووتی: **بە الفضل بن موسى السيناني-م ووت: چی دەڵێی دەربارەی ئەوانەی قسە بە أبو حنيفة دەڵێن ؟ ووتی: أبو حنيفة لە زانستدا شتی ئاوای بۆهێنان كە تێیدەگەیشتن و شتی ئاوای بۆ هێنان**

**كە تێینەدەگەیشتن، هیچ شتێكی بۆیان جێنەهێشت، جا حەسودییان پێی برد.** [الانتقاء : 136]
ووتم: جعفر بن إدريس المقرئ زەعیفە، الحسن بن محمد بن هارون لە تەحقیقی أبو غدة بۆتە الحسين، گەر الحسن بێ سیقەیە گەر الحسين بێ نەمدۆزییەوە، محمد بن أبي منصور و حاتم بن آدم-یش بەهەمان شێوە نەمدۆزینەوە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا جعفر بن إدريس القزويني قال حدثنا محمد بن عيسى الطرسوسي قال سمعت سليمان الشاذكوني ووتی: **عيسى بن يونس ووتی: قسە دەربارەی أبو حنيفة مەكە بە خراپە، وە باوەڕ بە هیچ كەسێكیش مەكە كە بە خراپ قسەی لەسەر دەكات، والله من لەو چاكترم نەدیوە، لەو بە وەرعترم نەدیوە، لەوفەقیهترم نەدیوە.** [الانتقاء : 136]
ووتم: جعفر بن إدريس باسمان كرد كە زەعیفە، محمد بن عيسى الطرسوسي خیلاف هەیە دەربارەی لە زەعیفیەوە نزیكترە ابن عدي وابن حبان والهيثمي تەزعیفیان كردووە، الحاكم بە سیقەی داناوە، بەهەرحاڵ زەعیفی جعفر بن إدريس بەسیەتی.

**ابن عبدالبر** دوای هێنانی مەدحی ئەم زانایانە بۆ أبو حنيفة ئینجا ناوی 41 زانای تر دەهێنێ كە دەڵێ ئەمانەش ستایش و مەدحی أبو حنيفة-یان كردووە. بەڵام سەنەد و مەتنی ڕیوایەتەكانیان ناهێنێ، كە ئەمانەن: **عبدالحميد بن يحيى الحماني ومعمر بن راشد والنضر بن محمد ويونس بن أبي إسحاق وإسرائيل بن يونس وزفر بن الهذيل وعثمان البتي وجرير بن عبدالحميد وأبو مقاتل حفص بن مسلم وأبو يوسف القاضي وسلم بن سالم ويحيى بن آدم ويزيد بن هارون وابن أبي رزمة وسعيد بن سالم القداح وشداد بن حكيم وخارجة بن مصعب وخلف بن أيوب وأبو عبدالرحمن المقرئ ومحمد بن السائب الكلبي والحسن بن عمارة وأبو نعيم الفضل بن دكين والحكم بن هشام ويزيد بن زريع وعبدالله بن داود الخريبي ومحمد بن فضيل وزكريا بن أبي زائدة وابنه يحيى بن زكريا بن أبي زائدة وزائدة بن قدامة ويحيى بن معين ومالك بن مغول وأبو بكر بن عياش وأبو خالد الأحمر وقيس بن الربيع وأبو عاصم النبيل وعبدالله بن موسى ومحمد بن جابر والأصمعي وشقيق البلخي وعلى بن عاصم ويحيى بن نصر.**

**هەموو ئەمانە ستایشی أبو حنیفة-یان کردووە و مەدحیان کردووە بە لەفزی جیاواز، هەموو ئەمانە أبو یعقوب یوسف بن أحمد بن یوسف المكي باسی کردووە لەو کتێبەیدا کە فضائل و هەواڵی أبو حنیفة-ی تێدا کۆکردۆتەوە، حکم من منذر کتێبەکەی بۆ ڕیوایەت کردین رحمه الله. بڕوانە** [الانتقاء : 137]

ووتم: دڵنیام بهێنابوایە وەک باقی سەنەدەکانی تر دەبوو پڕاوپڕ لە کەسانی زەعیف و مەجهول کە لە نزیکەی 40 ڕیوایەتدا تەنها دوو ڕیوایەتی سەلامەت دەرچوون، ئەمە جگە لەحاڵی حکم بن منذر و أبو یعقوب-ی خاوەنی کتێب کە پێشتر باسمان کرد، وە 10 لەو زانایانەی کە ناوی هێناون لە بەشی یەکەمدا بە صەحیحی ووتەکانیمان هێناون کە قسەیان بە أبو حنیفة ووتوە.

***ابن عبدالبر*** دەڵێ: حدثنا عبدالوارث بن سفيان قال حدثنا قاسم حدثنا أحمد بن زهير قال حدثنا سليمان بن أبي شيخ قال حدثني حمزة بن المغيرة -ساڵی 180 مرد تەمەنی نزیکەی 90 ساڵ بوو- ووتی: **ئێمە نوێژمان دەکرد لەدوای عمر بن ذر لە مانگی ڕەمەزاندا لە شەو نوێژ، جا أبو حنيفة دەهات و دایکیشی لەگەڵ خۆی دەهێنا، وە شوێنەکەی ئەو زۆر دوور بوو، وە عمر بن ذر تا نزیکی پارشێو نوێژی دەکرد.** [الانتقاء : 139]

ووتم: سەنەدەکەی حەسەنە، ئەمەش گەر لێی وورد بینەوە پەڵەیەکی ڕەشی تری أبو حنیفة-یە نەک مەدح و ستایش بێ بۆی، چونکە ئیمامەکە عمر بن ذر بووە کە یەکێکە لە سەرانی مورجیئە و بانگەوازی بۆ ئیرجاء کردووە، أبو حنیفة-ش ماڵی زۆر دوور بووە کەچی ئەم ڕێگا دوورەی بڕیوە تا لەدوای ئیمامێکی وەک خۆی مورجیئە نوێژ بکات، پاشان ئێمە نەمان ووتوە شەو نوێژی نەکردووە لە ڕەمەزاندا تا ئەم جۆرە ڕیوایەتانە بیێتە وەڵام بۆمان ؟

***ابن عبدالبر*** دەڵێ: ذكر الدولابي حدثنا أحمد بن القاسم قال حدثني ابن أبي رزمة قال حدثني خالد بن صبيح ووتی: **بیستم أبو یوسف دەیووت: ئێمە خیلافمان دەبوو دەربارەی بابەتێک، جا أبو حنيفة دەهات پرسیارمان لێ دەکرد، وەک بڵێی وەڵامەکەی لەناو گیرفانی دەردەهێنا و پێی دەداین، أبو یوسف دەڵێ: کەسم نەدیوە لە أبو حنیفة زاناتر بێ لە لێکدانەوەی مانای فەرموودە.** [الانتقاء : 139]

ووتم: أحمد بن القاسم نەمدۆزییەوە، گەر صەحیحیش بێت ئاساییە قوتابی یەکەمی أبو حنیفة مەدحی شێخەکەی بکات، بەڵام هەر ئەم قوتابیە لە بەشی یەکەمدا هێنامان کە دەڵێ أبو حنیفة بە جەهمیەتی مرد و بڕوای بە خروج کردن هەبوو.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال الدولابي سمعت أبا عبدالله محمد بن شجاع يقول سمعت إسماعيل بن حماد بن أبي سليمان لە بازنەی دەرس ووتنەوەی أبو حنیفة لە کوفەدا دەیووت: **أبو حنيفة ووتی: ئەوەی ئێمە تێیداین ڕەئیە، کەس ناچار ناکەین لەسەری، وە ناڵێین هیچ کەسێک بە زۆر لەسەریەتی قبوڵی بکات، جا هەر کەسێک شتێکی لەمە باشتری پێیە با بیهێنێت.** [الانتقاء : 139]

ووتم: گەر صەحیح بووایە دەبوو بە پەڵەیەکی تر، ئەوەتا دەڵێ ئێمە لەسەر ڕەئی دەڕۆین کێ باشتری لایە با بیهێنێت ! یەکەم: یەکلای دەکاتەوە کە ئەهلی ڕەئیە نەک ئەهلی حەدیث، دووەم: بۆ مەگەر عەقڵی بەوە ناشکێ کە قورئان و سوننەت باشترە لە ڕەئی ؟! بەڵام ڕیوایەتەکە درۆیە چونکە محمد بن شجاع الثلجي تێدایە کە حەنەفی مەزهەبە و ئەهلی ڕەئیە و درۆزنە وەک پێشتر باسمان کرد.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا حكم بن منذر قال حدثنا أبو يعقوب يوسف بن أحمد قال حدثنا أبو داود أحمد بن محمد القيسراني قال حدثنا علي بن عمرو بن خالد قال حدثنا أبي قال حدثنا **زهير بن معاوية ووتی: پرسیام لە أبو حنیفة کرد دەربارەی ئەمان پێدانی دوژمن لەلایەن کۆیلەوە، ووتی: گەر کۆیلەکە شەڕ نەکات ئەمانەکەی بەتاڵە، منیش پێم ووت: حدثني عاصم الأحول عن الفضيل بن يزيد الرقاشي ووتی: ئێمە دوژمنمان گەمارۆ دەدا، جا تیرێکیان بۆ دەهاوێژرا ئەمانی تێدا بوو، ئەوانیش دەیانووت: ئەمانتان پێ داین، ئێمەش دەمان ووت ئەمە کۆیلەیەک ئەم ئەمانەی پێداون، ووتیان واللە ئێمە کۆیلە و ئازاد لەیەکتر جیا ناکەیتەوە لەناوتاندا، ئێمەش نامەمان بۆ عمر نارد دەربارەی ئەمە، ئەویش نامەی نارد ووتی: ئەمان پێدانی کۆیلە بە دروست بزانن، جا أبو حنیفة بێدەنگ بوو، پاشان من کوفەم جێهێشت بۆ ماوەی 10 ساڵ، پاشان هاتمەوە کوفە چوومە لای أبوحنیفة پرسیارم لێکرد دەربارەی ئەمان پێدانی کۆیلە، بە فەرموودەکەی عاصم وەڵامی دامەوەو لە ووتەکەی خۆی پەشیمان بوویەوە، جا زانیم کە شوێنی ئەو فەرموودانە دەکەوێ کە**

**دەیبیستێ. وە پرسیارم لە سفيان الثوري كرد دەربارەی ئەمە، ووتی: ئەمانەت پێدانی دروستە شەڕ بكات يان نەيكات، وە فەرموودەكەی عاصم الأحول-ی باسكرد.** [الانتقاء: 140]

ووتم: أحمد بن محمد القيسراني مەجهولە، علي بن عمرو بن خالد ئەويش مەجهولە.

***ابن عبدالبر*** دەڵێ: حدثنا حكم بن منذر قال حدثنا يوسف بن أحمد قال حدثنا أبو العباس الفارض قال حدثنا محمد بن إسماعيل الصائغ قال حدثنا داود بن المحبر ووتی: **بە أبو حنيفة ووترا: ئەو كەسەی ئيحرامی بەستووە إزار-ی دەست ناكەوێ سراويل لەبەر دەكات، ووتی: نەخێر، بەڵكو إزار لەبەر دەكات، پێی ووترا: إزار-ی نيە، ووتی: سراويل دەفرۆشێ إزار-ی پێ دەكڕێ، پێی ووترا: پێغەمبەر ﷺ ووتاريدا فەرمووی: ئەوەی ئيحرامی بەستووە سراويل لەبەر دەكات گەر إزار-ی دەست نەكەوت، أبو حنيفة ووتی: لەم بارەيەوە هيچ فەرموودەيەک لە پێغەمبەرەوە ﷺ بە صەحيحی لەلامدا نەچەسپاوە كە فەتوای پێبدەم، وە هەموو كەسێكيش فەتوا بەوە دەدات كە بيستوويەتی، وە لەلای ئێمەش بە صەحيحی چەسپاوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتی: ئەو كەسەی ئيحرامی بەستووە سراويل لەبەر ناكات، ئێمەش فەتوا بەوە دەدەين كە بيستوومانە، پێی ووترا: موخالەفەی پێغەمبەر ﷺ دەكەيت ؟ ووتی: الله لەعنەتی لەو كەسە كردووە كە موخالەفەی پێغەمبەر ﷺ دەكات، الله بەهۆی ئەوەوە ڕێزی لێگرتين و بەهۆی ئەوەوە ڕزگاری كردين.** [الانتقاء: 140-141]

ووتم: پێم خۆشبوو هەموو ڕیوایەتەکانی مەدحکردنی أبو حنيفة بەم شێوەیە بوایە، کە دەڵێین جەهمی بووە ڕیوایەت هەبێ ڕەددی ئەمە بداتەوە، کە دەڵێین مورجیئە بووە ڕیوایەت هەبێ ڕەددی ئەمە بداتەوە، کە دەڵێین خەواریج بووە ڕیوایەت هەبێ ڕەددی ئەمە بداتەوە، کە دەڵێین بێ ئەدەبی بەرامبەر پێغەمبەر ﷺ و فەرموودەکانی کردووە و گاڵتەی بە فەرموودە کردووە و ڕەتی کردۆتەوە ڕیوایەت هەبێ ڕەددی ئەمانە بداتەوە، نەک کاتێک بە سەنەدی صەحیح ئەم هەموو کوفرو تاوانەی أبو حنيفة دەهێنین لایەنگرانی ئەویش لە بەرامبەردا ڕیوایەتی شەونوێژ و عیبادەت و ئەمانەت پارێزی و ئەم جۆرە شتانە بهێنن، جا لە بەشی یەکەمدا هێنامان کە حماد بن زيد فەرموودەی

لەبەرکردنی سراویل بۆ ئەو کەسەی کە ئیحرامی بەستووە گەر إزار-ی دەست نەکەوت بە سەنەدێکی صەحیح دەگێڕێتەوە کە ڕوخسەتی پێدراوە، تەنانەت البخاري دواتر لە صەحیحەکەی ئەم فەرموودەیەی هێناوە بەم سەنەدەوە، کەچی أبو حنیفة زۆر بەبێ ئەدەبی فەرموودەکە ڕەت دەکاتەوە و دەڵێ هیچ نیە، سەنەدەکەش بریتیە لە حماد بن زید عن عمرو بن دینار عن جابر بن زید عن ابن عباس عن النبي ﷺ أبو حنیفة گەر تۆزێک زانستی هەبوایە بە صەحیحی و زەعیفی بچووکترین گومانی نەدەبوو لە صەحیحی ئەم فەرموودەیە،

جا ئێستا دەڵێین ئەوەتا عوزرەکەی باسکردووە دەڵێ لەلای من نەچەسپاوە بە صەحیحی ئەم فەرموودەیە بۆیە ئاوای ووتوە، ئێمەش بە چەند خاڵێک وەڵامتان دەدەینەوە:

یەکەم: گەر فەرموودەکەی بەلاوە زەعیفیش بێ دەبێ بۆ حماد بن زید ڕوونی بکاتەوە کە ئەم فەرموودەیە زەعیفە، نەک ئاوا بەبێ ئەدەبی بە دەستەکانی ئاماژە بکات کە ئەم فەرموودەیە هیچ نیە، دواتر کام ڕاوی بە زەعیف داناوە لەم سەنەدە ؟ حماد ؟ کە ئیمام مالك-ی عیراقە ؟ یان عمرو بن دینار کە یەکێکە لەو شەش تابعیەی سەنەدی فەرموودە بە دەوریاندا دەخولێتەوە ؟ یان جابر بن زید ؟ کە موفتی بەصرە بووە ابن عباس خۆی بە شان و باڵی هەڵداوە و ستایشی کردووە.

دووەم: ئەم ڕیوایەتەی کە ابن عبدالبر هێناویەتی یان پێش بەسەرهاتەکەی حماد بن زید ڕوویداوە یان دوای ئەو ڕوویداوە، گەر پێش بەسەرهاتەکەی حماد ڕوویدابێ ئەوا دەبێ کاتێک کە حماد فەرموودەکە بۆ أبو حنیفة دەگێڕێتەوە أبو حنیفة تەسلیمی بێ چونکە پێشتر بانگەشەی ئەوەی کردووە بە صەحیحی لەلای نەچەسپاوە ئەوەتا حماد بە صەحیحی بۆی هێنا کەواتە درۆ دەکات، وە ئەگەر دوای بەسەرهاتەکەی حماد أبو حنیفة ئەم قسەیەی کردبێ ئەکەواتە سورە لەسەر ئینکاری کردنی فەرموودەکەی حماد و وەری ناگرێت، ڕوونیشمان کردەوە کە سەنەدەکە چۆنە جا نازانم أبو حنیفة لەبەرچی فەرموودەکەی بە هیچ نەزانیوە !

سێیەم: داود بن المحبر تۆمەتبارە بە درۆ، 20 زانای جەرح و تەعدیل بە زەعیف و مەتروکیان داناوە

خاوەنی كتێبی (العقل)ە كە پڕپەتی لە ڕیوایەتی درۆ، تەنانەت أبو غدة محقق-ی كتێبەكەی ابن عبدالبر كە قوتابی محمد زاهد الكوثري جەهمیە، لەسەر هەمان ڕێبازی الكوثري ڕۆیشتووە لە بەرگری كردنی لە أبو حنیفة، لە حاشیەكەدا دەڵێ: داود بن المحبر مەتروكە لەلای جمهوری زانایان.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: ذكر الدولابي حدثنا محمد بن حماد بن المبارك الهاشمي قال حدثنا علي بن الحسن بن علي بن شقيق أبو الحسن المروزي قال سمعت أبا بكر يذكر عن ابن المبارك ووتی: **بیستم سفیان الثوري دەیووت: أبو حنیفة بە توندی زانستی دەگرت، بەرگری لە حەڕامكراوەكانی الله دەكرد كە حەلاڵ بكرێن، كاری بەو فەرموودانە دەكرد كە لەلای صەحیح بوون كەسانی سیقە نەقلیان كردبوو، وە كردەوەكانی پێغەمبەری الله ﷺ و ئەوەی كە زانایانی كوفەی دیوە كە لەسەری بوونە، پاشان هەندێك كەس قسەیان پێی ووت، الله لە ئێمە و ئەوانیش خۆشبێت.** [الانتقاء : 142]
ووتم: محمد بن حماد بن المبارك الهاشمي مەجهولە، هەروەها أبو بكر بە صیغەی تمریض لە ابن المبارك ڕیوایەتی كردووە دەڵێ (یذكر) كە ئەمەش صیغەیەكی زەعیفە، هەر چەندە أبو غدة لە حاشیەدا دەڵێ: علي بن الحسن بن شقيق ڕاستەوخۆ لە ابن المبارك ڕیوایەتی دەكات، زیادكردنی أبو بكر لە سەنەدەكە لەجۆری (المزيد في متصل الأسانيد)ە، هەروەها ئاماژەی بەوە داوە كە نەسەب و كونیەی علي بن الحسن بن شقيق هەڵەیە، بەهەرحاڵ هەر چۆنێك بێت مەجهولی محمد بن حماد بەسە بۆ بە زەعیف دانانی ڕیوایەتەكە، مەتنەكەش مونكەڕە سفیان یەكێكە لەوانەی كە قسەی زۆری بە أبو حنیفة ووتوە، تەنانەت قسەشی لەگەڵ نەكردووە وەك لە بەشی یەكەمدا هێنامان، ئیتر چۆن قسەیەكی لەم شێوەیە دەكات ؟! پێم وایە مەتنەكە بۆنی درۆی لێدێت.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا عبدالوارث بن سفيان قال حدثنا قاسم قال حدثنا أحمد بن زهير قال حدثنا يحيى بن معين قال حدثنا عبيد بن أبي قرة عن يحيى بن ضريس ووتی: **بینیم سفیان الثوري پیاوێك هاتە لای كە بەشی هەبوو لە عیلم و عیبادەت، بە سفیان-ی ووت: ئەی باوكی عبدالله ئینكاری چ شتێك دەكەی لەسەر أبو حنیفة ؟ ووتی: چیەتی ؟ پیاوەكە ووتی: بیستم قسەیەكی دەكرد ئینصاف و بەڵگەی تێدا بوو، دەیووت: من كار دەكەم بە كتێبی الله گەر دەستم كەوت، ئەوەی لە قورئاندا**

**نەمدۆزیەوە کار بە سوننەتی پێغەمبەری الله ﷺ و ئاثارە صەحیحەکان دەکەم کە لێی ڕیوایەت کراوە کە بڵاو بۆتەوە لە دەستی سیقەکان بۆ سیقەکان، جا ئەگەر لە کتێبی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەی نەمدۆزییەوە، کار بە ووتەی ئەو هاوەڵانەی دەکەم کە دەمەوێ و ئەوەی نەمویست واز لە ووتەکەی دەهێنم، پاشان لە ووتەی ئەوان دەرناچن بۆ ووتەی کەسانی تر، جا کاتێک کارەکە گەیشتە إبراهیم والشعبي والحسن وعطاء وابن سیرین وسعید بن المسیب -ژمارەیەک پیاوی ژمارد- ئەوان کەسانێکن ئیجتیهادیان کردووە منیش بۆم هەیە ئیجتیهاد بکەم هەروەک چۆن ئەوان ئیجتیهادیان کردووە. بڕوانە** [الانتقاء : 143]

ووتم: لە تەحقیقی مکتبة القدسي ئەم ڕیوایەتە بە پچڕاوی و تێکەڵی هاتووە، بۆیە ئەم ڕیوایەتەم لە تەحقیقی أبو غدة نەقل کردووە چونکە ئەو بە دروستی هێناویەتی.

(عبید بن أبي قرة) لە چاپی مکتبة القدسي بۆتە (عبدالله بن أبي قرة) صدوق-ە ڕیوایەتی مونکەڕی هەیە سەرەڕای کەمی ڕیوایەتەکانی، گەر بڵێین سەنەدەکە حەسەنە ئەوا نابێتە هۆی لادانی ئەو ووتانەی بەشی یەکەم کە دەربارەی أبو حنیفة ووتراوە، قسەکانیشی زیاتر ڕەمزین ئەمڕۆ دەبینیت پیسترین مورتەد هەمان ئەم قسانە دەکات دەڵێ دەست بە قورئان و سوننەت و ووتەی هاوەڵان دەگرم کەچی لەهەر سێکیشیان بەریە، جا بۆیە ئەم ووتە ڕەمزیانە کردار پشتڕاستی دەکاتەوە یان بە درۆی دەخاتەوە، وە بینیمان أبو حنیفة کە موخالەفەی ئایەتی صەریحی قورئان و فەرموودەی صەحیحی کردووە، هەروەک ابن قتیبة ووتی: موخالەفە کردنی ئایەتی صەریحی قورئان هیچ عوزرێکی تێدا نیە.

***ابن عبدالبر*** دەڵێ: قال أبو یعقوب حدثنا محمد بن علي السمناني قال حدثنا أحمد بن حماد بن العباس قال حدثنا القاسم بن عباد ووتی: **بۆم باسکرا کە ابن أبي لیلی سکاڵای لە أبو حنیفة کرد لەلای المنصور، ووتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران لە کوفە پیاوێک هەیە من قەزاوەت ناکەم لە هیچ قەزیەیەکدا ئیللا ئەو موخالەفەم دەکات تێیدا، المنصور ووتی: کێیە ؟ ابن أبي لیلی ووتی: أبو حنیفة-یە، المنصور ووتی: بە حەق موخالەفەت دەکات یان بە باطل ؟ ووتی: بە حەق، جا ئەمە**

**کەوتە دڵی المنصور-ەوە هەر بەم هۆیەوەش دەست نیشانی کرد بۆخۆی، ابن أبي ليلى-ش پەشیمان بوویەوە کە ئەم شتەی باسکرد.** [الانتقاء : 145]

ووتم: محمد بن علي السمناني مەجهولە وەک پێشتر باسمان کرد، أحمد بن حماد بن العباس نەمدۆزییەوە پێشتر باسمان کرد، هەروەها القاسم بن عباد بە صیغەی تمریض ڕیوایەتی کردووە دەڵێ (ذُكِرَ لي) واتا بۆم باسکرا ئەمەش صیغەیەکی زەعیفە، هەروەها مەتنەکەش مونکەڕی پێوە دیارە بگرە بۆنی درۆی لێدێت، کەس هەیە بزانێ بەرامبەرەکەی بە حەق ڕەددی دەداتەوە کەچی سکاڵای لێ بکات و دان بەوەش بنێت کە بە حەق ڕەددی دەداتەوە نەک ناحەق ؟!

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب بەهەمان سەنەد لە القاسم بن عباد-ەوە قال حدثنا محمد بن شجاع قال حدثنا أبو رجاء -کە لە عیبادەت و چاکەدا پلەی هەبوو- ووتی: **محمد بن الحسن-م بینی لە خەوندا، ووتم: الله چی لێکردی؟ ووتی: لێم خۆشبوو، ووتم: ئەی أبو يوسف ؟ ووتی: ئەو پلەی لە من بەرزترە، ووتم: ئەی چی لە أبو حنيفة کرد ؟ ووتی: ئۆهۆ ئەو لە أعلى عليين-ە.** [الانتقاء : 145]

ووتم: أبو يعقوب بەهەمان سەنەدی پێشوو لە القاسم بن عباد ئەمەی ڕیوایەت کردووە ئەویش لە محمد بن شجاع الثلجي ئەویش لە أبو رجاء.

محمد بن شجاع الثلجي باسمان کە درۆزنە و تەکفیریش کراوە، جگە لەمەش خەون حوکمی لێ وەرناگیرێت تەنها بۆ دڵدانەوەیە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا أحمد بن الحسن الدينوري قال حدثنا القاسم بن عباد قال حدثنا صالح بن محمد بن رزين عن **أبي حنيفة ووتی: لە خەوندا بینیم گۆڕی پێغەمبەر** عليه السلام **هەڵدایەوە ئێسکەکانیم دەرهێنا و لە باوەشم گرت، جا ئەم خەونە منی ترساند، چوومە لای ابن سيرين بۆم گێڕایەوە، ووتی: گەر خەونەکەت ڕاست دەرچێ ئەوا سوننەتی پێغەمبەرەکەت محمد** ﷺ **زیندوو دەکەیتەوە.** [الانتقاء : 145]

ووتم: صالح بن محمد بن رزين مەجهولە.

أبو غدة دەڵێ: لە هەموو نوسخەکان بەم شێوەیە هاتووە سەنەدەکە، تەنها لە نوسخەیەک نەبێ

بەم شێوەیە هاتووە: صالح بن محمد بن یوسف عن یوسف بن رزین، واتا کەسێکی تریش لە سەنەدەکە زیادکراوە، ئەویش کەسیان ناناسێ بۆیە تەرجیحی نەکردووە کام سەنەدە دروستە، واقعیش تەواو پێچەوانەی ئەم ڕیوایەتەیە أبو حنیفة نە فەرموودەناس بووە تا دەستی هەبێ لە زیندووکردنەوەی سوننەت، وە لە فیقهیشدا ڕوونە کە چەندەها فەتوای هەیە پێچەوانەی سوننەتە، ئەوەندە بەسە کە خۆی ئیمامی ئەهلی ڕەئیە، ئەم مەزهەبەش پێچەوانەی مەزهەبی ئەهلی سوننەیە.

لە هەردوو چاپەکەدا (علیه السلام) بۆ پێغەمبەر ﷺ نوسراوە جاری یەکەم، جاری دووەم کراوە بە صلى الله عليه وسلم، منیش وەک خۆی نەقلم کردووە.

ابن عبدالبر دوو ڕیوایەتی تریشی هێناوە کە هەر خەونە هەمان مانا دەدات، یەکێکیان درۆیە محمد بن شجاع الثلجي تێدایە، ئەوی تریشیان زەعیفە یوسف بن عثمان الصباغ دەڵێ: پیاوێک بۆی گێڕامەوە کە خەونی دیبوو، نازانین ئەم پیاوە کێیە (مبهم)ە، هەروەها یوسف خۆشی دیار نیە کە حاڵی چۆنە نەمدۆزییەوە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا أحمد بن الحسن الحافظ قال حدثنا علي بن الحسن بن بشر قال حدثنا علي بن سلمة ووتی: **بیستم عبدالحميد بن عبدالرحمن الحماني دەیووت: بینیم لە خەوندا وەک بڵێی ئەستێرەیەک لە ئاسماندا کەوت، ووترا أبو حنیفة-یە، پاشان دانەیەکی تر کەوت، ووترا مسعر-ە، پاشان دانەیەکی تر کەوت، ووترا سفیان-ە، جا أبو حنیفة پێش مسعر مرد پاشان مسعر پاشان سفیان.** [الانتقاء: 146]

ووتم: علي بن الحسن بن بشر نەمدۆزییەوە، تەنانەت أبو غدة دەڵێ: لە نوسخەیەک بە علي بن الحسين بن بشير هاتووە، تەرجیحیشی نەکردووە کامەی ڕاستە، ئەمەش بەڵگەیە کە ئەویش نایناسێ ئەگینا محقق لە شتێکی ئاوا بێدەنگ نابێ.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا أبو إسحاق إبراهيم بن أحمد بن فراس قال حدثنا موسى بن هارون قال حدثنا يحيى بن عبدالحميد الحماني عن علي بن مسهر ووتی: **من لای سفیان الثوري بووم**

**پیاوێک پرسیاری لێکرد دەربارەی پیاوێک کە دەست نوێژی هەڵگرتووە بە ئاوێک کە کەسێکی تر دەست نوێژی پێ هەڵگرتبوو، سفیان ووتی: دروستە ئاوەکە پاکە، پێم ووت: أبو حنيفة دەڵێ: دەست نوێژی پێ هەڵناگیری، سفیان پێی ووتم: بۆچی وای ووتوە ؟ ووتم: ئەو دەڵێ ئاوەکە بەکارهاتووە، علي بن مسهر دەڵێ: پاشان من لەلای سفیان بووم چەند ڕۆژێک دوای ئەمە، پیاوێک هاتە لای پرسیاری دەست نوێژ هەڵگرتنی لێکرد بە ئاوێکی بەکارهێنراو، سفیان ووتی: دەست نوێژی پێ هەڵناگیرێ چونکە ئاوێکی بەکارهێنراوە، جا گەڕایەوە سەر ووتەکەی أبو حنيفة لەم بابەتەدا.**
[الانتقاء : 146]

ووتم: يحيى الحماني لە بەشی یەکەم باسمان خیلاف زۆرە دەربارەی، مەتنەکەش مونکەری هەست پێ دەکرێ، مانای چیە تەنها لەبەر ئەوەی وتوویەتی ئاوەکە بەکارهاتووە ئیتر سفیان چۆتە سەر قسەی ئەو ؟! بۆ سفیان نەیدەزانی ئاوەکە بەکارهاتووە ؟

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا أبو علي أحمد بن عثمان الحافظ قال حدثنا أحمد بن العباس الضبي قال حدثنا سليمان ابن أبي شيخ قال حدثنا محمد بن عمر الحنفي عن أبي عباد الكوفي ووتی: **الأعمش پێی ووتم: چۆن هاوەڵەکەتان -واتا أبو حنيفة- وازی لە ووتەی ابن مسعود هێنا کە دەڵێ: فرۆشتنی کەنیزەک واتا تەڵاقدانی ؟ ووتم: بەهۆی فەرموودەکەی تۆ کە گێڕاتەوە، ووتی: کامە فەرموودە ؟ ووتم: أبو حنيفة دەڵێ: تۆ بۆت گێڕاوەتەوە لە إبراهيم عن الأسود عن عائشة کە دەڵێ: بريرة کاتێک فرۆشرا و ئازاد کرا سەرپشک کرا. الأعمش ووتی: بەڕاستی أبو حنيفة فەقیهە، ئەم شتە سەرسامی کرد.** [الانتقاء : 147]

ووتم: أحمد بن عثمان الحافظ و أحمد بن العباس الضبي و محمد بن عمر الحنفي ئەم سێیانەم نەدۆزییەوە، وە أبو عباد الكوفي کە ناوی عمران بن عطية-یە لە هیچ کتێبێکدا نەمدۆزییەوە تەنها کتێبی ڕاوییە شیعەکان نەبێ کە دەڵێن هاوەڵی جعفر الصادق بووە، وە لە چاپی مكتبة القدسي (أبو عباد) بۆتە (أبو عياد).

مانای ووتەکەی ابن مسعود ئەوەیە کە دەڵێ: گەر کۆیلە شووی کرد پاشان خاوەنەکەی فرۆشتی

بە کەسێکی تر جگە لە مێردەکەی ئەوا تەڵاقی دەکەوێ، فەرموودەکەی عائشة-ش دەڵێ: بریرة کاتێک فرۆشرا و ئازاد کرا سەرپشک کرا، جا گەر تەڵاقی کەوتبوایە ئەوا سەرپشک نەدەکرا لەوەی لەلای مێردەکەی دەمێنێتەوە یان نا.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا أحمد بن محمد قال حدثنا أحمد بن الفضل قال حدثنا محمد بن جرير الطبري قال سمعت محمد بن إسماعيل الضراري دەیووت: **خەڵکی لەلای أبو عبدالرحمن المقرئ بوو بە خیلافیان، هەندێک ووتیان: لە أبو حنيفة-ەوە ڕیوایەتمان بۆبکە، هەندێکی تر ووتیان: پێویستمان بە أبو حنيفة نیە، بیستم أبو عبدالرحمن المقرئ ووتی: هاوار بە حاڵتان دەزانن أبو حنيفة کێ بوو ؟ کەسم نەدیوە وەک أبو حنيفة.** [الانتقاء : 147]

ووتم: أحمد بن الفضل بن العباس الدينوري قوتابیەکەی الطبري زەعیفە.

هەروەها لە بەشی یەکەم بە صەحیحی هێنامان کە أبو عبدالرحمن المقرئ دەیووت: أبو حنيفة مورجیئە بوو بانگی کردم بۆ ئیرجاء ڕەتم کردەوە، وە گەر ڕیوایەتی لێ کردبوایە دەیووت: حدثني أبو حنيفة وكان مرجئا، پڕ بە دەنگی ئەمەی دەووت.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا حكم بن منذر قال حدثنا أبو يعقوب يوسف بن أحمد قال حدثنا أبو محمد عبدالرحمن بن أسد الفقيه قال حدثنا هلال بن العلاء الرقي قال حدثنا أبي قال حدثنا **عبيدالله بن عمرو الرقي ووتی: أبو حنيفة لێی درا بەهۆی ئەوەی کە ڕازی نەبوو ببێتە قازی، جا دوژمنەکانی بەمە دڵخۆش بوون و ووتیان: استتابە کرا.** [الانتقاء : 150]

ووتم: أبو محمد عبدالرحمن بن أسد الفقيه مەجهولە.

هلال بن العلاء بن هلال لە باوکی ڕیوایەتی کردووە، هلال بن العلاء صدوق-ە بەڵام النسائي دەڵێ: شتی مونکەر لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە جا نازانم هەڵەکە لە خۆیەتی یان لە باوکی.

هەڵەکە لە باوکیەتی بێگومان، چونکە باوکی زۆر زەعیفە ڕیوایەتی مونکەری زۆرە، ئەمەش ووتەی زانایان دەربارەی باوکی:

أبو حاتم الرازي دەڵێ: منكر الحديث، ضعيف الحديث، لە ابن زريع ژمارەیەك فەرموودەی هەڵبەستراو ڕیوایەت دەكات.

ابن حبان دەڵێ: لەو كەسانە بوو كە سەنەدی هەڵدەگێڕایەوە و ناوی ڕاوییەكانی دەگۆڕی، بەهیچ جۆرێك نابێ احتجاجی پێ بكرێ.

ابن حجر دەڵێ: لاوازی تێدا بوو.

الخطيب البغدادي دەڵێ: هەندێك لە فەرموودەكانی مونكەرە.

سبط ابن العجمي دەڵێ: منكر الحديث ضعيف.

هەروەها دانەرانی كتێبی (تحرير تقريب التهذيب) بە ضعيف جدا دایاننناوە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا أبو قتيبة سلم بن الفضل قال حدثنا محمد بن يونس الكديمي ووتی: **بیستم ڕۆژێك بە عبدالله بن داود الخريبي ووترا: ئەی باوكی عبدالرحمن معاذ لە سفيان الثوري ڕیوایەت دەكات كە ووتویەتی: أبو حنيفة دوو جار استتابە كراوە، جا عبدالله بن داود ووتی: ئەمە والله درۆیە، علي والحسن دوو كوڕەكەی صالح بن حي لە كوفە بوون ئەوانیش پلەیەكیان هەیە لە وەرع كە هاوشێوەی نیە، وە أبو حنيفة بە ئامادەبوونی ئەم دووانە فەتوای دەدا، گەر شتێكی ئاوا هەبوایە ئەوا پێی ڕازی نەدەبوون، وە من سەردەمێك لە كوفە بووم ئەم شتەم نەبیست.** [الانتقاء: 150]

ووتم: محمد بن يونس الكديمي درۆزنە.

ابن عدي دەڵێ: الكديمي تۆمەتبار كراوە بە هەڵبەستنی فەرموودە بە درۆ، هەروەها دەڵێ: بانگەشەی ئەوەی دەكرد كە كەسانێكی دیوە لە ڕاوییەكان كەچی نەشی دیبوون، زۆرینەی شێخەكانمان وازیان هێنا لە ڕیوایەت كردن لێی.

ابن حبان دەڵێ: لەوانەیە زیاتر لە هەزار فەرموودەی هەڵبەستابێ بە درۆ.

أبو الحسين بن المنادي: فەرموودەمان لە الكديمي نوسیەوە، پاشان ووتەی أبو داود-مان پێگەیشت دەربارەی الكديمي، جا ئەوەی كە لەومان بیستبوو فڕێماندا.

الآجري دەڵێ: بينيم أبو داود ووشەی درۆی بەكار دەهێنا دەربارەی محمد بن يونس، وە موسى بن هارون نەهی لە خەڵک دەكرد گوێ بيستی فەرمووده بن لە الكديمي، موسى خۆی بە پەردەی كەعبەوە هەڵواسی بوو دەيووت: يا الله من شايەتی دەدەم كە الكديمي درۆزنە فەرمووده هەڵدەبەستێ بە درۆ.

القاسم بن زكريا المطرز دەڵێ: من ئەژنۆم بە ئەژنۆی الكديمي دەنێم لە بەردەم الله، وە دەڵێم: الكديمي درۆی دەكرد بە دەم پێغەمبەرەكەت و زانايانەوە.

جا سەرەڕای درۆزنی الكديمي وەک زانايانی جەرح و تەعديل باسيان كرد، ئەم ڕیوایەتەش درۆزنی ئەو دەردەخات چونكە بە صەحيحی لە سفيان الثوري والحسن بن صالح هێنامان لە بەشی يەكەمدا كە قسەيان بە أبو حنيفة ووتوە، وە سفيان باسی دوو جار استتابە كردنی كردووە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا حكم بن منذر بن سعيد رحمه الله قال حدثنا يوسف بن أحمد قال حدثنا أحمد بن الحسن الحافظ قال حدثنا القاسم بن عباد قال حدثني محمد بن عبدالله الفقيه قال حدثنا الحسن بن زياد اللؤلؤي ووتی: **ئافرەتێكی شێتمان لەلابوو پێی دەووترا أم عمران، كەسێک بەلايدا تێپەڕی شتێكی بە ئافرەتەكە ووت، ئەويش پێی ووت: ئەی كوڕی دوو زيناكەرەكە، ابن أبي ليلى وەستابوو دەيبيست، فرمانی كرد ئافرەتەكە بهێنن، جا بردی بۆ ناو مزگەوت دوو حەددی لەسەر جێبەجێ كرد، حەددێک بۆ باوكی حەددێک بۆ دايكی، ئەم باسە گەيشتەوە بە أبو حنيفة، ووتی: هەڵەی كردووە ابن أبي ليلى لەم كارەدا لە شەش شوێندا، شێت حەددی لەسەر نيە، حەددی لە مزگەوت جێبەجێ كردووە لەسەری حەدديش لە مزگەوت جێبەجێ ناكرێ، بە وەستاوی لێيداوە ئافرەتان بە دانيشتن لێيان دەدرێ، دوو حەددی لەسەر جێبەجێ كردووە گەر كەسێک بوهتانی زينا بداتە پاڵ قەومێک تەنها يەک حەددی لەسەرە، وە لێيداوە لە كاتێكدا دايک و باوكی كەسەكە ئامادە نەبوونە ئەمەش ناكرێ ئيللا بە ئامادەبوونی ئەوان نەبێ چونكە حەد تەنها بۆ ئەوانەيە كە داوای دەكەن، وە هەردوو حەددەكەی بەيەكەوە كۆكردۆتەوە لەيەک شوێندا هەر كەسێكيش دوو حەددی لەسەر واجب بێ ئەوەی دووەمی لێ نادرێ تا ئەوەی يەكەم ووشک**

**دەبێتەوە پاشان هی دووەمی لێدەدرێ، ئەم ووتەیەی أبو حنیفة گەیشتەوە بە ابن أبي لیلی، چوو بۆلای ئەمیر سكاڵای كرد لە أبو حنیفة، ئەمیریش أبو حنیفة-ی قەدەغە كرد لە فەتوادان، جا ئەمە بەسەرهاتی قەدەغەكردنی أبو حنیفة-یە لە فەتوادان لەلایەن ئەمیر-ەوە، پاشان هەندێك بابەت هاتن بۆلای عیسی بن موسی ئەویش پرسیاری لە أبو حنیفة كرد لە بارەیانەوە، أبو حنیفة وەڵامی دایەوە، عیسی هەموو وەڵامەكانی بە چاك زانی جا ئیزنیدا لە مەجلیسەكەی دانیشت.**

**[الانتقاء : 152]**

ووتم: الحسن بن زیاد بن اللؤلؤي حەنەفی مەزهەبە یەكێكە لە هاوەڵانی أبو حنیفة، تۆمەتبارە بە درۆ بەڵكو زۆرێك بە درۆزن ناویان بردووە، ئەخلاقیشی ناشرین بووە.

أبو ثور بن إبراهیم الكلبي دەڵێ: نەمدیوە لە اللؤلؤي درۆزنتر.

ابن عدي دەڵێ: فەرموودەی هەیە بەڵام فەرموودە پیشەی ئەو نیە، زەعیفە.

أبو حاتم الرازي دەڵێ: ضعیف الحدیث، سیقە نیە و جێگای متمانە نیە.

أبو داود دەڵێ: درۆزنە، سیقە نیە و جێگای متمانە نیە.

أحمد بن حنبل دەڵێ : ضعیف الحدیث.

النسائي دەڵێ: سیقە نیە و جێگای متمانە نیە.

الحسین بن محمد الجریري دەڵێ: بینیم الحسن بن زیاد یاری بە ئەندامی نێرینەی منداڵێك دەكرد.

أبو الحسین الرهاوي دەڵێ: كتێبەكانی الحسن بن زیاد-م نوسیەوە لێی و بەردەوام لەگەڵی بووم، ڕۆژێك بینیم نوێژی دەكرد منداڵێكی موو لێ نەهاتوو لە تەنیشتیەوە بوو لە ڕیزی نوێژدا، كاتێك سوجدەیان برد دەستی درێژ كرد بۆ ڕومەتی منداڵەكە و ڕوومەتی گوشی لەكاتێكدا لە سوجدەدا بوو، جا لەو كاتەوە لێی جیابوومەوە و لەسەر خۆم كردە مەرج كە هیچ شتێكی لێوە نەگێڕمەوە.

الدارقطني دەڵێ : زەعیفە، مەتروكە.

علي بن المدیني دەڵێ: فەرموودەكانی نانوسرێتەوە.

ابن نمیر دەڵێ: درۆ دەكات بە دەمی ابن جریج.

بە وكیع ووترا: ساڵێكی ووشكە، ووتی: چۆن نابێتە ووشكە ساڵێ كە حسن اللؤلؤي و حماد بن أبي

حنيفة قازين ؟!

يحيى بن معين دەڵێ: زۆر درۆزنە هيچ نيە، جارێكی تر دەڵێ: درۆزنێكی پيسە.

پرسيار لە يزيد بن هارون الأيلي كرا دەربارەی حسن، يزيد ووتی: ئايا ئەو موسڵمانە ؟!

يعقوب بن سفيان الفسوي دەڵێ: درۆزنە.

يوسف بن عمر القواس دەڵێ: خۆت بپارێزە لە اللؤلؤي.

جگە لە هەموو ئەمانەش، عيسى بن موسى كە ناوی هاتووە لە كۆتايی بەسەرهاتەكە، لەبەشی يەكەمدا هێنامان كە خۆی استتابەی بە أبو حنيفة كردووە كاتێك والی كوفە بووە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا عبدالوارث بن سفيان قال حدثنا قاسم بن أصبغ قال حدثنا أحمد بن زهير قال حدثنا سليمان بن أبي شيخ قال حدثنا أبو سفيان الحميري قال: **قال ابن شبرمة: من بە توندی أبو حنيفة-م عەيبدار دەكرد و بەكەم سەيرم دەكرد، جا كاتی حەج هات منيش حاجی بووم لەو كاتەدا، خەڵكی لە دەوری كۆبوونەوە پرسياريان لێی دەكرد، شتی ئاوام لێی بينی بە شێوەيەك نەمدەزانی من كێم، پياوێك هاتە لای ووتی: ئەی أبو حنيفة بۆلای تۆ هاتووم بۆ كارێك كە گرنگە بۆم و بێ توانای كردووم، أبو حنيفة ووتی: كارەكە چيە ؟ پياوەكە ووتی: كوڕێكم هەيە جگە لەو هيترم نيە، گەر ژنی بۆ بهێنم تەڵاقی دەدات گەر كەنيزەكی بۆ بكڕم ئازادی دەكات بێ توانا بوومە بەرامبەرە ئەمە، هيچ چارێك هەيە ؟ أبو حنيفة دەست بەجێ پێی ووت: كەنيزەكێك بكڕە بۆ خۆت كە كوڕەكەت پێی ڕازی بێت، پاشان لە كوڕەكەتی مارە بكە، جا گەر تەڵاقيدا ئەوا بۆ خۆت دەگێڕێتەوە كەنيزەكەكە، وە گەر ئازاديشی بكات ئەوا شتێكی ئازادكردووە كە موڵكی خۆی نيە، ابن شبرمة دەڵێ: جا زانيم كە أبو حنيفة فەقيهە، جا لەم ڕۆژەوە دەستم هەڵگرت لە باسكردنی تەنها بە چاكە نەبێت.** [الانتقاء : 153]

ووتم: هەموو ڕاويەكان سيقەن تەنها أبو سفيان الحميري صدوق-ە، بەڵام سەنەدەكە پچڕانی تێدايە لەنێوان أبو سفيان الحميري و ابن شبرمة، أبو سفيان شێخێكی هەيە بەناوی هشيم بن بشير كە قوتابی ابن شبرمة-يە، جا سەيری ئەو ڕيوايەتانەم كرد كە أبو سفيان لە ابن شبرمة-ەوە

ڕیوایەتی كردووە بینیم لە هەموو ڕیوایەتەكان هشیم لەنێوانیاندا هەیە واتا بەم شێوەیە: (أبو سفيان الحميري عن هشيم عن ابن شبرمة) هیچ ڕیوایەتێكم نەدۆزییەوە كە أبو سفيان ڕاستەخۆ لە ابن شبرمة ڕیوایەت بكات بە صیغەی سماع، لەم ڕیوایەتەش وەك دەبینن بە صیغەی محتمل ڕیوایەتی كردووە وتوویەتی (قال ابن شبرمة) نەی ووتوە (سمعت یان حدثنا یان أخبرنا) جا گەر أبو سفيان سەماعی هەبوایە لە ابن شبرمة ئەوا دەمانتوانی ئەم ڕیوایەتەی بە متصل هەژمار بكەین گەر بزانین ناسراو نیە بە تەدلیس بەڵام وەك باسم كرد هیچ ڕیوایەتێكی نیە لە ابن شبرمة تصريح بدات بە سماع، جا بۆی هەیە بڵێن: لەوانەیە لێرەشدا هشیم لەنێوانیاندا هەبێ بەڵام ناوی نەهێنابێ، دەڵێین: ئەم ئەگەرەش دەبێ كە بۆ علوی سەنەد وایكردبێ چونكە لەهەمان كاتدا لەگەڵ ابن شبرمة ژیاوە، ابن شبرمة ساڵی 144 مردووە، أبو سفيان ساڵی 112 لە دایكبووە، كەواتە 32 ساڵ هاوسەردەم بوونە، هەردووكیشیان عیراقین أبو سفيان خەڵكی شاری واسط-ە، ابن شبرمة خەڵكی شاری كوفەیە بەڵام چۆتە واسط-یش، بۆیە ئەگەری (اللقيا) یەكتر بینین هەیە، وە بەپێی شەرطی مسلم بە متصل هەژمارە گەر هاوسەردەم (معاصر) بن و ئەگەری بینینیش هەبێ، وە دواتر نازانین ابن شبرمة چ ماوەیەك لە واسط بووە بە دیاریكراوی، ئەوە چەسپاوە كە ابن سیرین-ی دیوە لە واسط، ابن سیرین ساڵی 110 مردووە بێگومان پێش ئەوكاتە بینیویەتی چونكە ابن سیرین لە بەصرە مردووە و خەڵكی بەصرەش بووە، هەروەها كاتێك إياس بن معاوية المزني كە خەڵكی بەصرەیە دەچێتە واسط ابن شبرمة پرسیاری لێدەكات لە واسط، إياس-یش لە واسط دەمێنێتەوە تا ساڵی 122 هەر لەوێ دەمرێ، وە نازانین إياس ئەو كاتەی چۆتە واسط و ابن شبرمة پرسیاری لێكردووە ساڵی چەند بووە تا تەمەنی ئەوكاتی أبو سفيان بخەمڵێنین بزانین ئەوكاتەی ابن شبرمة لە واسط بووە ئەو لە دایكبووە یان نا، بۆیەش ئەم تەئكید كردنەوەیە دەكەم لەسەر بەیەك گەیشتنی ئەم دووانە چونكە هەرچی ڕیوایەتی أبو سفيان هەیە لەڕێگای هشیم-ەوە لە ابن شبرمة ڕیوایەتی كردووە هیچ ڕیوایەتێكی ڕاستەوخۆی نیە لە ابن شبرمة بۆیە گومانم زۆرە كە لە ابن شبرمة-ی نەبیستبێ كەسێكی تر لەنێوانیان هەبێ، گەر بڵێین لەوانەیە هشیم لە نێوانیان بێت ئەوا قورەكە خەستر دەكاتەوە چونكە سەرەڕای ئەوەی كە هشیم ئیمامێكە هیچ قسەی لەسەر نیە

بەڵام زۆر بەناوبانگە بە تەدلیس و یەكجار تەدلیسی زۆرە، جا گریمان سەنەدەكە بەم شێوەیەی لێبێت (أبو سفيان عن هشيم عن ابن شبرمة) فەرمووودەناسان لێی دەكۆڵنەوە بزانن تەدلیسی كردووە یان نا چونكە هشیم زۆر بەناوبانگە بە تەدلیس، بگرە هەندێكیان بە ڕەهایی بە زەعیفی دەزانن سەنەدەكە تا ئەوكاتەی هشیم تصریح دەدات بە سەماع واتا دەڵێ: سمعت یان حدثنا یان أخبرنا یان أنبأنا ابن شبرمة، وە لە سنن النسائي ڕیوایەتێك هەیە لە هشيم عن ابن شبرمة، النسائي بە زەعیفی داناوە دەڵێ: هشیم مدلس-ە تەصریحی نەداوە بە سەماع لە ابن شبرمة-ەوە، بڕوانە [سنن الصغرى : 477/8] ئەمەش تەنها وەڵامی گریمانەیەك بوو كە دەكرێ باسكرێ، ئەگینا هشیم بوونی نیە لە سەنەدەكەدا، سەبارەت بە مەتنەكەش مونكەڕی پێوە دیارە، ابن شبرمة كە تۆ بە توندی أبو حنيفة عەیبدار دەكەیت و بەكەم سەیری دەكەیت هۆكارەكەی چیە ؟ لەبەرئەوەی وتوویەتی: قوڕئان مەخلوقە ؟ یان وتوویەتی: خروج بكەن ؟ یان مورجیئە بووە و بانگەوازی بۆ ئیرجاء كردووە؟ یان جەهمی بووە ؟ یان گاڵتەی بە فەرموودە كردووە و ڕەتی كردۆتەوە ؟ یان فەتوای داوە بە فێڵ و بە ڕەئی؟ لەبەر كام لەم هۆكارانە بە كەم سەیرت كردووە ؟ گەر هەر كام لەم هۆكارانە بێت دەچێتە عەقڵتانەوە كە تەنها لەبەر ئەوەی أبو حنيفة وەڵامی پرسیاری كەسێكی داوەتەوە و ابن شبرمة سەرسام بووە بە وەڵامەكەی ئیتر تەواو ڕەئی بگۆڕێت دەربارەی أبو حنيفة؟ خۆ سەدان زانای كافر و بیدعەچی هەن كاتێك كتێبەكانیان دەخوێنینەوە سەرسام دەبین بە زانستەكەیان دەكرێ وەك ابن شبرمة بە وەڵامی پرسیارێك ڕەئیمان بگۆڕین دەربارەی كەسەكان ؟!

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا حكم بن منذر قال حدثنا أبو يعقوب يوسف بن أحمد قال حدثنا أبو علي أحمد بن عثمان الحافظ الأصبهاني قال حدثنا محمد بن العباس قال حدثنا يحيى بن عبدالله بن بكير ووتی: **بيستم الليث بن سعد دەیووت: من گوێ بیستنی باسكردنی أبو حنيفة دەبووم هیوام دەخواست ڕۆژێك ببیبینم، ڕۆژێك لە مسجد الحرام بینیم بازنەیەك خەڵكی لە دەوری بوون یەكتریان پاڵ دەنا، منیش چووم بۆلای بینیم پیاوێكی خەڵكی خوراسان هاتە لای أبو حنيفة، ووتی: من پیاوێكم خەڵكی خوراسانم سامانم زۆرە و كوڕێكم هەیە باش نیە، وە جگە لەئەو منداڵی ترم**

**نیە، جا الليث بن سعد هەمان بەسەرهاتەکەی ابن شبرمة-ی گێڕایەوە، بەڵام الليث ئەمەندەی زیاد کرد، ووتی: والله وەڵامەکەی سەرسامی نەکردم بەقەدەر سەرسام بوونم بە خێرایی وەڵامدانەوەکەی.** [الانتقاء : 154]

ووتم: هەمان چیرۆکی ابن شبرمة-یە، أبو علي أحمد بن عثمان نەمدۆزییەوە، محمد بن العباس زۆر ڕاوی هەن بەم ناوە نەمزانی کامەیانە.

***ابن عبدالبر*** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا أبو محمد جعفر بن محمد الطوسي قال سمعت محمد بن إسماعيل الصائغ يقول حدثنا سويد بن سعيد الحدثاني قال حدثنا علي بن مسهر ووتی: **ئێمە لەلای أبو حنيفة بووین ابن المبارك هاتە لای پێی ووت: چی دەڵێی دەربارەی ئەوەی کەسێک مەنجەڵێک چێشت لێدەنێت پاشان باڵندەیەک دەکەوێتە ناویەوە و دەمرێت ؟ أبو حنيفة بە هاوەڵەکانی ووت: ئێوە چی دەڵێن ؟ ئەوانیش لە ابن عباس-ەوە بۆیان ڕیوایەت کرد کە دەڵێ: ئاوەکە دەڕێژرێ گۆشتەکەش دوای شۆردنی دەخورێ، أبو حنيفة ووتی: ئێمەش ئاوا دەڵێین، تەنها ئەوە نەبێت کە مەرجێکی تێدایە، گەر باڵندەکە بکەوێتە ناویەوە لەکاتی کوڵانیدا گۆشتەکە فڕێ دەدرێت و ئاوەکەش دەڕێژرێ، وە گەر بکەوێتە ناویەوە لەکاتی سەرەتادا گۆشتەکە دەشۆردرێ و دەخورێ، وە ئاوەکەی ناخورێ، ابن المبارك ووتی: ئەمەت لەکوێ هێنا ؟ أبو حنيفة ووتی: گەر لەکاتی کوڵانیدا باڵندەکە بکەوێتە ناوی ئەوا دەگات بە گۆشتەکە هەروەک چۆن خەل و ئاوەکە دەگاتە ناو گۆشتەکە، وە گەر لە سەرەتادا بکەوێتە ناوی و نەمێنێتەوە تێیدا ئەوا ناچێتە ناو گۆشتەکە، کە گۆشتەکەش پێگەیی هیچی نەچۆتە ناو، ابن المبارك ووتی: (زرين) بە فارسی واتا زێڕینە، وە بە دەستەکانی ژمارە 30 دروستکرد، وەک بڵێی ووتەکەی أبو حنيفة-ی دایە پاڵ زێڕ.** [الانتقاء : 155]

ووتم: سويد بن سعيد لە بەشی یەکەمدا باسمان کرد کە حاڵی چۆنە، بەڵام ڕیوایەتی سويد لە علي بن مسهر صەحیحە، مسلم هێناویەتی لە صەحیحەکەیدا وەک احتجاج پێکردن.

أبو محمد جعفر بن محمد الطوسي مەجهولە، هەرچەندە پێم وایە کونیەکەی هەڵەیە أبو عبدالله

دروستە نەک أبو محمد، چونکە أبو عبدالله جعفر بن محمد الطوسي خەزورانی محمد بن إسماعيل الصائغ-ە ڕیوایەتی لێوەی هەیە، بەڵام ئەویش حاڵی دیار نیە، گریمان صەحیحیش بوایە ابن المبارك لەکۆتایی تەمەنیدا لەم شتانە پەشیمان بۆتەوە وەک لە بەشی یەکەمدا هێنامان.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا محمد بن موسى العطار قال حدثنا موسى بن هارون الحمال ووتی: **پێم گەیشت کە قتادة هاتە کوفە لە مەجلیسێکی خۆی دانیشت، ووتی: پرسیارم لێ بکەن دەربارەی فەرموودەکانی پێغەمبەری الله ﷺ تاکو وەڵامتان بدەمەوە، کۆمەڵێک بە أبو حنيفة-یان ووت: هەڵسەوە بۆی، ئەویش هەڵسایەوە بۆی ووتی: ئەی باوکی الخطاب چی دەڵێی دەربارەی پیاوێک لە خێزانەکەی دابڕاوە ژنەکەی شووی کردۆتەوە، پاشان مێردی یەکەمی گەڕایەوە و هاتە ژوورەوە لێی ووتی: ئەی ئافرەتی زیناکەر شووت کردۆتەوە لەکاتێکدا من زیندووم ؟ پاشان مێردی دووەمی هاتۆتە ژوورەوە پێی ووتوە: ئەی ئافرەتی زیناکەر شووت کردووە لەکاتێکدا مێردت هەیە، (اللعان) چۆن دەکرێ لەم حاڵەتەدا ؟ قتادة ووتی: ئەم شتە ڕوویداوە ؟ أبو حنيفة پێی ووت: گەر ڕووشی نەدابێت خۆمان بۆی ئامادە دەکەین، قتادة ووتی: وەڵامتان نادەمەوە لە هیچ شتێکی ئاوادا، پرسیارم لێ بکەن دەربارەی قورئان، أبو حنيفة پێی ووت: چی دەڵێی دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل:** ﴿قَالَ ٱلَّذِي عِندَهُۥ عِلۡمٞ مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ﴾ **ئەم کەسە کێیە ؟ قتادة ووتی: ئەمە پیاوێک بوو لە کوڕە مامەکانی سليمان بن داود، اسم الله الأعظم-ی دەزانی، أبو حنيفة ووتی: سليمان اسم الله الأعظم-ی دەزانی ؟ قتادة ووتی: نەخێر، أبو حنيفة ووتی: سبحان الله ! یەکێک لە بەردەم پێغەمبەرێک لە پێغەمبەرەکان ئامادەیە کە لەو زاناترە ؟! قتادة ووتی: وەڵامی هیچ شتێکتان نادەمەوە دەربارەی تەفسیر، پرسیارم لێ بکەن دەربارەی ئەو شتانەی کە خەڵکی خیلافیان لێی هەیە، أبو حنيفة پێی ووت: تۆ ئیمانداری ؟ قتادة ووتی: هیوام وایە، أبو حنيفة پێی ووت: بۆچی واناڵێی وەک ئەوەی إبراهيم ووتی کە الله گێڕاویەتیەوە لێی، کاتێک الله پێی فەرموو:** ﴿قَالَ أَوَلَمۡ تُؤۡمِنۖ قَالَ بَلَىٰ﴾ **قتادة ووتی: دەستم بگرن، والله هەرگیز نایەمە ئەم شارەوە.**
**[الانتقاء : 156]**

ووتم: موسى بن هارون الحمال دەڵێ: (بلغني) واتا: پێم گەیشت، ئەم جۆرە صیغەیەش زەعیفە چونکە نازانین کێ پێی ووتوە، مەتنەکەشی زۆربە ڕوونی دیارە کە مونکەرە، بگرە بۆنی درۆی لێدێت، تەنانەت محقق-ی تاريخ بغداد(١) دەربارەی ئەم بەسەرهاتە کە لە تاريخ بغداد بە سەنەدێکی تر هاتووە دەڵێ: ئاسەواری هەڵبەستنی پێوە دیارە، شێوازی پرسیارەکانیش هی کەسێکە کە ئەدەبی نیە تەنها مەبەستی ئیحراج کردنی کەسی بەرامبەرە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا القاضي محمد بن علي السمناني قال حدثنا أحمد بن حماد بن العباس قال حدثنا القاسم بن عباد قال حدثنا بشر بن الوليد ووتی: **بیستم أبو یوسف دەیووت: قتادة هاتە کوفە، جا هەمان بەسەرهاتی پێشووی گێڕایەوە، تەنها لە کۆتاییەکەیدا ووتی: ئیماندارم إن شاء الله.** [الانتقاء : 156]

ووتم: محمد بن علي السمناني و أحمد بن حماد العباس پێشتر باسمان کردوون کە مەجهولن، هەروەها بشر بن الوليد خیلافی لەسەرە زەعیفە یان سیقەیە، ئەهلی ڕەئیە هاوەڵی أبو یوسف-ە، دوای ئەوەی توقف-ی کرد لە قورئان تەرک کرا لەلای ئەهلی حەدیث.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا أبو عبدالله محمد بن حزام الفقيه قال حدثنا عبدالصمد بن الفضل قال حدثنا شداد بن حكيم قال حدثنا زفر بن الهذيل ووتی: **أبو حنيفة و ابن أبي ليلى و ژمارەیەک لە زانایان کۆبوونەوە لە وەلیمەی کەسانێکدا، بۆن گوڵاویان بۆ هێنان لەناو جامێکی زیو، بەکاریان نەهێنا لەبەر زیوەکە، أبو حنيفة وەری گرت و بە پەنجە دەری هێنا ئینجا خستیە ناو دەستی و خۆی پێ بۆن خۆشکرد، وە بە زاناکانی ووت: ئایا نازانن أنس بن مالك شیرینیان بۆی هێنا لە جامێکی زیودا، ئەویش شیرینیەکەی خستە سەر پارچە نانێک پاشان خواردی ؟ ئەوانیش سەیریان بە زیرەکی و عەقڵی أبو حنيفة هات.** [الانتقاء : 158]

ووتم: محمد بن حزام مەجهولە پێشتر باسمان کرد.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا العباس بن أحمد البزار قال حدثنا الحارث بن أبي أسامة

ووتى: **بيستم علي بن عاصم دەيووت:** (... دواى هێنانى پرسيارێک كە لە أبو حنيفة-ى كردووە ئەويش وەڵامى داوەتەوە) **ئينجا علي بن عاصم لە وەسفى أبو حنيفة-دا دەڵێ: والله گەر عەقڵى أبو حنيفة بكێشرێ بە عەقڵى نيوەى خەڵكى شارى كوفە، ئەوا عەقڵى ئەو قورسترە.** [الانتقاء : 160]
ووتم: العباس بن أحمد البزار نەمدۆزييەوە، پێشتريش ڕيوايەتى هەمان شێخمان هێنا كەچى لەوێدا ناوى بە العباس بن محمد البزار هاتبوو، لێرە محمد بۆتە أحمد، هەردووک ناوەكەش نەمدۆزينەوە، علي بن عاصم يەكێک بووە لەوانەى زۆر دژى أبو حنيفة بووە وەک لە بەشى يەكەمدا چەند ڕيوايەتێكى ئەومان هێنا، مەحاڵە شتێكى ئاوا بڵێ لەكاتێكدا هەر ئەو يەكێک لە كوفرەكانى أبو حنيفة نەقل دەكات بۆمان، هەر ئەويش بوو ووتى أبو حنيفة موخالەفەى 400 فەرموودەى كرد.

***ابن عبدالبر*** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا حدثني جدي رحمه الله تعالى قال حدثنا محمد بن حماد قال حدثنا محمد بن مليح بن وكيع قال حدثني أبي قال حدثنا يزيد بن كميت ووتى: **شريك پێی ووتم: ئێمە لە جەنازەى منداڵێكى بني هاشم بووين، خەڵگى گەورە و پايەدار بەدواى جەنازەكەوە بوون، منيش لە تەنيشتى ابن شبرمة بووم جەنازەكەم بەڕێ دەكرد، كاتێک جەنازەكە وەستا، ووترا: بۆچى جەنازەكە ناڕوات ؟ ووترا: دايكى منداڵەكە هاتۆتە دەرەوە لە ماڵ لە سۆزى بۆ منداڵەكەى ڕووى دەرخستووە بە قەميسێكەوە، باوكى منداڵەكەش سوێندى خواردووە بە تەلاق گەر نەگەڕێتەوە ماڵەوە، دايكى منداڵەكەش سوێندى خواردووە بە بەخشينى هەموو ئەو شتانەى كە هەيەتى ناگەڕێتەوە تا نوێژى لەسەر نەكرێت، لەم ڕۆژەدا ابن شبرمة و هاوشانەكانى ئامادەى جەنازەكە بوون، كۆبوونەوە و پرسيارى ئەم شتەيان لێكرا، وەڵامێكى ئامادەيان لانەبوو، ووتى: ڕۆيشتن أبو حنيفة-يان بانگ كرد كە لەلايەكى خەڵكەكەوە بوو، هات سەرى داپۆشتبوو ژنەكە و پياوەكە و خەڵكيش وەستابوون، أبو حنيفة بە ژنەكەى ووت: لەسەرچى سوێندت خوارد ؟ ئەويش ووتى: لەسەر ئەوە و ئەوە، بە پياوەكەى ووت: بەچى سوێندت خوارد ؟ ووتى: بەوە، أبو حنيفة ووتى: بەرماڵ ڕاخەن، بەرماڵ ڕاخرا، بە پياوەكەى ووت: وەرە پێش نوێژ بكە لەسەر كوڕەكەت، كاتێک نوێژى كرد أبو حنيفة بە ژنەكەى ووت: بگەڕێوە ماڵەوە هەردووكتان لە سوێندەكەتان دەربازتان**

**بوو، مردووەکەتان هەڵگرن، خەڵکی ئەم وەڵامەیان بە شتێکی چاک زانی، جا شریك دەگێڕێتەوە کە ابن شبرمة ووتی: ئافرەتان نەیانتوانی منداڵێکیان ببێت وەک النعمان (واتا أبو حنيفة).**
[الانتقاء : 161]

ووتم: پێشتر بەهەمان ئەم سەنەدە برگەی کۆتایی ووتەکەی ابن شبرمة هاتووە، باپیری أبو يعقوب مەجهولە، محمد بن مليح بن وكيع نەمدۆزییەوە، يزيد بن كميت تۆمەتبارە بە درۆ.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا أبو علي أحمد بن عثمان الأصبهاني قال حدثنا أبو محمد بن أبي عبدالله قال حدثنا داود بن أبي العوام ووتی: **باوکم منی برد بۆ مەجلیسی يحيى بن نصر منیش بچووک بووم، جا باوکم بۆمی گێڕایەوە لە يحيى بن نصر ووتی: أبو حنيفة أبو بكر و عمر-ی لە علي بە باشتر دەزانی، وە علي و عثمان-ی خۆشدەویست، وە بڕوای بە قەدەر هەبوو خێر و شەڕی، وە قسەی نەدەکرد دەربارەی الله عز وجل، وە مەسحی دەکرد بەسەر الخفين، وە لە فەقیهترین و بە تەقواترین کەسی سەردەمی خۆی بوو.** [الانتقاء : 163]

ووتم: لە أبو يعقوب بەدواوە هەموو ڕاوییەکانی سەنەدەکە نەناسراون، تەنها يحيى بن نصر نەبێ حاڵی دیارە ئەویش کەسێکی جەهمیە و زەعیفە، ئەو ووتەیەشی کە دەڵێ: (قسەی نەدەکرد دەربارەی الله عز وجل) ئەمە عەقیدەی جەهمیەکانە واتا پەکخستنی صیفەتەکانی الله باسی هیچ کامیان نەکەیت.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا محمد بن الحزام الفقيه قال حدثنا أبي قال حدثنا محمد بن شجاع قال سمعت الحسن بن أبي مالك دەیووت: بیستم أبو يوسف دەیووت: **پیاوێک هاتە مزگەوتی کوفە ڕۆژی هەینی، لەسەر بازنەکان دەسوڕایەوە پرسیاری لێدەکردن دەربارەی قورئان، أبو حنيفة-ش ئامادە نەبوو لە مەککە بوو، خەڵکیش خیلافیان تێکەوت لەم بارەیەوە، والله وایدەبینم شەیتان بێ خۆی خستبێتە سەر شێوەی مرۆڤ، تا گەیشت بە بازنەکەی ئێمە پرسیاری لێکردین ئێمەش پرسیارمان لەیەکتر کرد لەناو خۆماندا، وەڵاممان نەدایەوە، ووتمان: شێخەکەمان لێرە نیە، وە حەز ناکەین دەست پێشخەری بکەین لە قسەکردن لەم بابەتە تا ئەو دەبێتە یەکەم کەس**

**قسەی تێدا دەكات، جا كاتێک أبو حنيفة هاتەوە لە القادسية پێی گەیشتین، پرسیاری خێزانەكەی و شاری لێكردین ئێمەش وەڵاممان دایەوە، پاشان پێمان ووت: الله لێت ڕازی بێت بابەتێک ڕوویداوە تۆ چی دەڵێی دەربارەی ؟ وەک بڵێی لەناو دڵمان بوو هەستمان بەڕووی كرد كە پێی ناخۆشە واگومانی برد شتێكی زەحمەت ڕوویداوە ئێمەش قسەمان تێیدا كردووە. ووتی: بابەتەكە چیە ؟ ووتمان: ئەمە و ئەوەیە، ماوەیەک بێدەنگ بوو، پاشان ووتی: وەڵامی ئێوە چی بوو ؟ ووتمان: هیچ قسەمان تێیدا نەكردووە، وە ترسان قسەی تێدا بكەین كە پێت خۆش نەبێ، ئینجا دڵی خۆش بوو، ووتی: جزاكم الله خيرا، وەسیەتی من لەبەر بكەن قسەی تێدا مەكەن و پرسیاریش لەكەس مەكەن دەربارەی هەرگیز، تەنها بڵێن قورئانی كەلامی الله عز وجل-ە بەبێ ئەوەی هیچ پیتێكی تر زیاد بكەن، بڕوا ناكەم ئەم بابەتە بە كۆتا بێت تا ئەهلی ئیسلام دەكەوێتە بارودۆخێكەوە نە دەتوانن پێی هەڵسن نە دەتوانن لێی دەرچن، الله ئێمە و ئێوەش پەنا بدات لە شەیتانی ڕەجیم.**
**[الانتقاء : 165]**

ووتم: عبدالفتاح أبو غدة محقق-ی كتێب دڵی زۆر خۆشكردووە بەم ڕیوایەتە، دەڵێ: دەڵێن أبو حنيفة ڕەددی جەهمیەكانی نەداوەتەوە، لە هیچ كتێبێكی ئەهلی سوننە ووتەی أبو حنيفة-ی تێدا نیە ڕەددی جەهمیەكانی دابێتەوە، ئەوەتا لێرەدا ڕەددی داونەتەوە !

نازانم زانستەكەی هەر ئەوەندەیە یان دەیەوێ خۆڵ بخاتە چاوی خەڵكەوە ؟ محمد بن شجاع الثلجي ئەمەی ڕیوایەتە كردووە كە درۆزنێكی پیسە وەک باسمان كرد، جگە لەوەی كە محمد بن الحزام و باوكی هەردووكیان مەجهولن، پاشان وەڵامەكەی وەڵامی ئەهلی سوننە نیە، وەڵامی (الواقفة)یە كە دەڵێن: قورئان كەلامی الله یە، ئیتر دەوەستن نە دەڵێن مەخلوقە نە دەڵێن مەخلوق نیە، ئەم جۆرە كەسانەش لەلای سەلەف تەكفیر كراون.

هەروەها ابن عبدالبر ڕیوایەتێكی تری هێناوە كە أبو حنيفة مونازەرە لەگەڵ 70 كەسی قەدەری دەكات لە كوفە هەموویان دەبەزێنێت، مونازەرەكە درێژە بۆیە نەمهێنا، السري بن عاصم لە حامد بن آدم ئەویش لە بشار بن قيراط ڕیوایەت دەكات، السري بن عاصم تۆمەتبارە بە درۆ، حامد بن آدم درۆزنە، بشار بن قيراط زەعیفە. بڕوانە [الانتقاء : 164]

(السري بن عاصم) لە چاپی مكتبة القدسي بۆتە (السدي بن عاصم).
هەروەها ڕیوایەتێکی تر دەهێنێت کە أبو حنيفة مونازەرەی لەگەڵ الضحاك الشاري خەواریج کردووە بەزاندوویەتی، ئەویش محمد بن شجاع الثلجي درۆزن ڕیوایەتی کردووە.
بڕوانە [الانتقاء : 158]
وە ڕیوایەتێکی تر دەهێنێت کە أبو حنيفة ڕەددی خەواریجی داوەتەوە بە ئایەتێک کە نەیانتوانیوە بیکوژن، يحيى بن معين دەیگێڕێتەوە ڕاوییەکانی هەموو سیقەن بەڵام سەنەدەکە متصل نیە واتا زەعیفە، چونکە يحيى بن معين 8 ساڵ دوای مردنی أبو حنيفة لە دایکبووە بەیەکتر نەگەیشتوون تا ڕاستەوخۆ لێوەی ڕیوایەت بکات. بڕوانە [الانتقاء : 161]

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا أبو حامد أحمد بن إبراهيم قال حدثنا سهل بن عامر ووتی: **بیستم بشر بن الوليد دەیووت: ئێمە لەلای ئەمیری ئیمانداران المأمون بووین، إسماعيل بن حماد بن أبي حنيفة ووتی: قوڕئان مەخلوقە، ئەمە ڕەئی من و ڕەئی باب وباپیرانمە، بشر بن الوليد ووتی: بەڵێ ڕەئی تۆیە، بەڵام ڕەئی باب و باپیرانت نیە. [الانتقاء : 166]**
ووتم: لە بەشی یەکەمدا ڕیواتێکی لەم شێوەیەمان هێنا کە نەوەکەی أبو حنيفة دەڵێ ئەمە دینی من و باب و باپیرانمە، کەواتە ئەم ڕیوایەتەی ابن عبدالبر دەبێتە ڕەد بۆی، بەڵام أبو حامد شیعەیە شێخی الكليني-ە خاوەنی کتێبی (الكافي) کە ئەم کتێبە لەلای شیعە وەک صحيح البخاري لای خۆمان وایە، جگە لەوەش شێخەکەی أبو حامد کە سهل بن عامر-ە تۆمەتبارە بە درۆ، جا پێم خۆشبوو هەموو ڕیوایەتەکان لەم شێوەیە بن ڕەددی ڕیوایەتەکانی بەشی یەکەم بدەنەوە بەڵام تا ئێستا هەمووی یان درۆ بووە یان زۆر زەعیف بووە.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا أبو حامد قال حدثنا صالح بن أحمد بن يعقوب ووتی: بیستم باوکم دەیووت: **پرسیار کرا لە أبو مقاتل حفص بن سلم دەربارەی قوڕئان منیش ئامادە بووم، ووتی: قوڕئان کەلامی الله-یە مەخلوق نیە، کوڕەکەی بە ناوی سلم پێی ووت: ئەی باوکە هیچ شتێک لەم بارەیەوە لە أبو حنيفة-وە پێم ڕادەگەیەنی ؟ ووتی: بەڵێ، أبو حنيفة-م لەسەر ئەوە**

**دیوه جگه لەوه شتێکی ترم لێی نەدیوه، گەر زانیبوام جگه لەوه شتێکی تر دەڵێ هاوڕێیەتیم نەدەکرد، ووتی: أبو حنيفة ئیمامی دونیا بوو لە سەردەمی خۆیدا لە فیقهـ و عیلم و وەرعدا، ووتی: أبو حنيفة ئامرازی تاقیکردنەوە بوو ئەهلی بیدعەی پێ جیادەکرایەوە لە ئەهلی سوننە، وە بە قامچی لێیدرا تا بێتە ناو خۆشی دونیا بۆیان، ڕازی نەبوو.** [الانتقاء : 166]

ووتم: أبو حامد پێش ئێستا باسمان کرد کە چۆنە، (صالح) کە لە چاپی مكتبة القدسي بۆتە (صلح) نەناسراوە، أحمد بن يعقوب البلخي باوکی صالح زەعیفە، أبو مقاتل حفص بن سلم تۆمەتبارە بە درۆ.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا حكم بن منذر رحمه الله قال حدثنا أبو يعقوب يوسف بن أحمد المكي بمكة في المسجد الحرام قال حدثنا محمد بن حفص بن عمرويه كان قدم علينا حاجا قال سمعت أبا بكر محمد بن عمرويه قال سمعت إبراهيم بن عبدالله الخلال دەیووت: **لەلای ابن المبارك باسی أبو حنيفة کرا، بیستم ابن المبارك ووتی: باسی پیاوێک دەکەن کە تەواوی دونیای پێشکەشکرا ئەویش ڕایکرد لێی ؟!** [الانتقاء : 168]

ووتم: محمد بن حفص بن عمرويه پێشتر باسمان کرد مەجهولە، إبراهيم بن عبدالله الخلال نەمبینی کەس باسی بکات تەنها ابن حبان نەبێ لە کتێبی (الثقات) هێناویەتی بەبێ ووتنی هیچ لەفزێکی جەرح و تەعدیل، پێشتریش پلەی ڕاوییەکانی کتێبی (الثقات)ی ابن حبان-مان باسکرد.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا القاضي أبو عبدالله محمد بن نافع إملاء قال حدثنا عمر بن علي السرخسي قال حدثنا محمد بن شجاع عن بعض أصحابه ووتیان: **بە أبو حنيفة ووترا أبو جعفر ئەمیری ئیمانداران 10 هەزار درهەمی پێ بەخشیوی، أبو حنيفة-ش ڕازی نەبوو** (... دوای باسکردنی ئەوەی کە پارەکەیان بۆی هێناوە و پاشان أبو حنيفة پارەکەی لەناو شتێک داناوە بە کوڕەکەی ووتوە: کە من مردم ئەم پارەیە بگەڕێنەوە بۆ الحسن بن قحطبة -ئەمیری ئەوکات- پێی بڵێ ئەمە ڕاسپاردەکەت بوو لەلای باوکم، ئینجا الحسن بە کوڕەکەی أبو حنيفة-ی ووت) **ڕەحمەتی الله لە باوکت بێ، بەڕاستی ڕەزیل بوو**

**لە دینەکەیدا. (واتا ئەوەندە خەمی دینەکەی بووە ڕێگای نەداوە دینەکەی هیچی لێ بەسەر بێت، هەروەک چۆن کەسی ڕەزیل دڵی بە ماڵ و سامانەکەیەتی حەز ناکات هیچی لێ بەسەربێت).**
[الانتقاء : 169]

ووتم: (محمد بن نافع) لە تحقيقى أبو غدة بۆتە (محمد بن قانع) هەرکامیان بێت نەمدۆزییەوە، عمر بن علي السرخسي نەمدۆزییەوە، بەڵام درۆیی ڕیوایەتەکە یەکلایی بۆتەوە چونکە محمد بن شجاع-ی درۆزن ڕیوایەتی کردووە لە هەندێک لە هاوەڵەکانی، هەم خۆی درۆزنە هەم هاوەڵەکانی دیار نیە کە کێن.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: قال أبو يعقوب حدثنا أبو القاسم أحمد بن عبدالله الزعفراني قال حدثنا إبراهيم بن مروان قال سمعت عبدالله بن صالح الكوفي دەیووت: **پیاوێک لە شام بە الحكم بن هشام-ی ووت: هەواڵم پێ بدە دەربارەی أبو حنيفة، الحكم ووتی: پرسیارت لە کەسێکی شارەزا کرد، أبو حنيفة فەرموودەیەکی ڕەت نەدەکردەوە کە لەلای بە صەحیحی چەسپا بێ لە پێغەمبەری الله ﷺ ڕیوایەت کراوە، وە لە هەموو خەڵکی ئەمانەت پارێزتر بوو، دەسەڵاتدار ویستی کلیلەکانی خەزێنەی خۆی پێ بدات أبو حنيفة ڕازی نەبوو، لێدان و بەندکردنی ئەوانی هەڵبژارد بەسەر سزای الله دا، پیاوەکەش پێی ووت: والله کەسم نەدیوە أبو حنيفة وەسف بکات وەک ئەوەی تۆ وەسفت کرد، الحكم ووتی: والله ئەو ئاوایە کە پێم ووتی.** [الانتقاء : 169]

ووتم: أحمد بن عبدالله الزعفراني مەجهولە، هەروەها الحكم بن هشام الثقفي وەک العجلي لە کتێبی (الثقات) باسیکردووە دەڵێ: برایەتی هەبوو لەگەڵ أبو حنيفة-دا، کەواتە مەیل هەبوونی دیارە بۆ أبو حنيفة.

**ابن عبدالبر** دەڵێ: حدثنا عبدالله بن محمد بن عبدالمؤمن بن يحيى رحمه الله قال أخبرنا أبو بكر محمد بن بكر بن عبدالرزاق التمار المعروف بابن داسة ووتی: **بیستم أبو داود سليمان بن الأشعث بن إسحاق السجستاني رحمه الله دەیووت: ڕەحمەتی الله لە مالك بێ پێشەوا بوو، ڕەحمەتی الله لە الشافعي بێ پێشەوا بوو، ڕەحمەتی الله لە أبو حنيفة بێ پێشەوا بوو.** [الانتقاء : 32]

ووتم: ابن داسة ڕاوی سنن أبي داود-ە سیقەیە، عبدالله بن محمد صدوق-ە بەڵام زەبت كردنی باش نیە وەک أبو الولید بن الفرضي و الذهبي باسیان كردووە، ئەمەش ڕەنگە یەكێک بێت لە هەڵەكانی كە زەبتی مەتنەكەی نەكردبێ چونكە أبو داود قوتابی ئیمام أحمد بووە كتێبی مسائلی ئیمام أحمد-ی هەیە وەک باقی هاوەڵانی أحمد، بۆیە ناگونجێ ناوی ئەمانە بهێنێ ناوی أحمد نەهێنێ لەكاتێكدا دەزانێ ئیمام أحمد هەڵوێستی چۆن بووە بەرامبەر أبو حنیفة.

# ڕیوایەتەکانی کتێبی (تاریخ بغداد)

**الخطیب** دەڵێ: قال النخعي حدثنا إبراهيم بن مخلد البلخي حدثنا محمد بن سهل بن أبي منصور المروزي حدثني محمد بن النضر قال سمعت إسماعيل بن سالم البغدادي دەیووت: **أبو حنيفة لێیدرا تا ببێتە قازی، قبوڵی نەکرد ببێتە قازی، وە أحمد بن حنبل گەر باسی ئەمەی کردبوایە دەگریا و ڕەحمەتی بۆ أبو حنيفة دەنارد، ئەمەش دوای ئەوە بوو کە أحمد لێیدرا.** [تاريخ بغداد : 449/15]
ووتم: إبراهيم بن مخلد و محمد بن سهل مەجهولن.

**الخطیب** دەڵێ: أخبرنا التنوخي حدثني أبي حدثنا أبو بكر محمد بن حمدان بن الصباح النيسابوري بالبصرة حدثنا أحمد بن الصلت بن المغلس الخماني ووتی: **بیستم أبو نعيم ووتی: أبو حنيفة دەم و چاوی جوان بوو، جل و بەرگی جوان بوو، بۆنی خۆش بوو، مەجلیسی خۆش بوو، زۆر بەڕێز بوو، خەم لابەرێکی باشبوو بۆ براکانی.** [تاريخ بغداد : 453/15]
ووتم: أحمد بن الصلت درۆزنە پێشتر باسمان کرد.

**الخطیب** دەڵێ: أخبرنا عمر بن إبراهيم المقرئ حدثنا مكرم بن أحمد حدثنا ابن مغلس حدثنا هناد بن السري قال سمعت يونس بن بكير دەیووت: **بیستم إسماعيل بن حماد بن أبي سليمان دەیووت: باوکم ماوەیەک لێمان دابڕا پاشان هاتەوە، پێم ووت: ئەی باوکە تۆ موشتاقی چ شتێک بووی لەم ماوەیەدا ؟ پێم وابوو دەڵێ کوڕەکەم، ووتی: موشتاقی أبو حنيفة بووم، گەر توانام هەبوایە چاوی لەسەر هەڵنەگرم ئەوا وام دەکرد.** [تاريخ بغداد : 457/15]
ووتم: (ابن مغلس) أحمد بن الصلت-ە درۆزنە، دواتر حماد بن أبي سليمان شێخی أبو حنيفة بووە، مورجیئە بووە أبو حنيفة ئیرجائی لەو وەرگرتووە گەر مەدحیشی بکات هیچ نرخێکی نیە لامان.

**الخطیب** دەڵێ: أخبرني أبو بشر محمد بن عمر الوكيل و أبو الفتح عبدالكريم بن محمد الضبي قالا حدثنا عمر بن أحمد الواعظ حدثنا مكرم بن أحمد القاضي حدثنا أحمد بن عطية الكوفي حدثنا ابن أبي

أويس ووتى: **بيستم الربيع بن يونس دەيووت: أبو حنيفة چووە لاى المنصور -خەليفەى عەباسى- عيسى بن موسى-ش لەلاى بوو، عيسى بە منصور-ى ووت: ئەمە زاناى دونيايە لەمڕۆدا، منصور پێى ووت: ئەى نعمان لەكێ زانستت وەرگرتووە ؟ أبو حنيفة ووتى: لە هاوەڵانى عمر ئەوانيش لە عمر، وە لە هاوەڵانى علي ئەوانيش لە علي، وە لە هاوەڵانى عبدالله ئەوانيش لە عبدالله، وە لەكاتى ابن عباس دا هيچ كەسێك لەسەر زەوى نەبوو لەو زاناتر بێ، منصور ووتى: خۆت توند و تۆڵ كرد.** [تاريخ بغداد : 458/15]

ووتم: (أحمد بن عطية الكوفي) أحمد بن الصلت-ە درۆزنە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني القاضي أبو العلاء محمد بن علي الواسطي و أبو عبدالله أحمد بن أحمد بن علي القصري قالا أخبرنا أبو زيد الحسين بن الحسن بن علي بن عامر الكندي بالكوفة أخبرنا أبو عبدالله محمد بن سعيد البورقي المروزي حدثنا سليمان بن جابر بن سليمان بن ياسر بن جابر حدثنا بشر بن يحي قال أخبرنا الفضل بن موسى السيناني عن محمد بن عمرو عن أبي سلمة عن أبي هريرة عن **رسول الله** ﷺ **فەرمووى: لە ئوممەتى مندا پياوێک هەيە -لە ڕيوايەتى القصري دەفەرمووێ- لە ئوممەتى مندا پياوێک پەيدا دەبێت ناوى النعمان-ە كونيەكەى أبو حنيفة-يە، ئەو چراى ئوممەتەكەمە چراى ئوممەتەكەمە چراى ئوممەتەكەمە.**

**الخطيب دەڵێ: ئەمە فەرموودەيەكى هەڵبەستراوە تەنها البورقي ڕيوايەتى كردووە، وە لە پێشوودا ڕوونمان كردەوە كە حاڵى چۆنە.** [تاريخ بغداد : 459/15]

ووتم: البورقي درۆزنێكى زۆر پيسە ئەوەى لە زانستى فەرموودەش نەزانێت هيچ گومانى لە درۆيى ئەم فەرموودەيە نيە، كەچى هەندێک لە متأخرين-ى حەنەفيەكان بە زۆر ويستويانە خۆيان هەڵخەڵەتێنن ڕێگاكانى ئەم فەرموودەيە كۆ بكەنەوە لە درۆوە بيكەن بە فەرموودەيەكى صەحيح نموونەى بدر الدين العيني و الكوثري، والله المستعان دەمارگيرى چى لە مرۆڤ دەكات، سوێند بە الله ئەم فەرموودەيە درۆيە تەواوى ڕێگاكانيشى درۆيە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الخلال أخبرنا الحريري أن النخعي حدثهم أخبرنا سليمان بن الربيع الخزاز حدثنا

محمد بن حفص عن **الحسن بن سليمان دەربارەی مانای ئەم فەرموودەیە (لا تقوم الساعة حتى يظهر العلم) -واتا: قیامەت هەڵناستێ تا عیلم دەردەکەوێ- ووتی: ئەمە عیلمی أبو حنيفة-یە، وە لێکدانەوەکانیەتی بۆ مانای ئاثارەکان.** [تاريخ بغداد : 460/15]

ووتم: سليمان بن الربيع الخزاز زەعیفە، محمد بن حفص و الحسن بن سليمان بۆم دەرنەکەوت کە کێن.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الحسن بن أبي بكر أخبرنا القاضي أبو نصر أحمد بن نصر بن محمد بن إشكاب البخاري قال سمعت محمد بن خلف بن رجاء يقول سمعت محمد بن سلمة دەیووت: **خلف بن أيوب ووتی: عیلم لە الله تعالى هات بۆ محمد ﷺ پاشان هات بۆ هاوەڵانی پاشان هات بۆ تابعين پاشان هات بۆ أبو حنيفة و هاوەڵانی، جا ئەوەی دەیەوێ با ڕازی بێت ئەوەشی دەیەوێ با تووڕە بێت.**
[تاريخ بغداد : 460/15]

ووتم: محمد بن خلف بن رجاء مەجهولە، هەروەها محمد بن سلمة تەمەنی 13 ساڵ بووە کاتێک خلف بن أيوب مردووە نازانم پێی گەیشتووە یان نا، ڕیوایەتەکەش بە صیغەی سماع نەهاتووە دەڵێ (قال خلف بن أيوب) جگە لەمانەش خلف بن أيوب قوتابی أبو يوسف-ە حەنەفی مەزهەبە و سەرکردە و بانگخواز بووە بۆ ئیرجاء بۆیە قسەکەی هیچ نرخێکی نیە لەلای ئەهلی سوننە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا محمد بن أحمد بن رزق حدثنا محمد بن عمر الجعابي حدثني أبو بكر إبراهيم بن محمد بن داود بن سليمان القطان حدثنا إسحاق بن البهلول ووتی: **بیستم ابن عيينة دەیووت: چاوەکانم کەسی نەدیوە وەک أبو حنيفة.** [تاريخ بغداد : 460/15]

ووتم: أبو بكر إبراهيم بن محمد بن داود بن سليمان القطان مەجهولە، نازانم محقق چۆن ئەم ڕیوایەتەی بە صەحیح داناوە ؟! بەڵام هەر خۆشی هەستی بە مونکەری مەتنەکە کردووە، لە حاشیەدا دەڵێ: ئەوەی صەوابە و چەسپاوە لە سفيان بن عيينة ئەوەیە کە قسەی خراپی بە أبو حنيفة ووتوە، الخطيب-یش هەمان شت دەڵێ وەک پێشتر هێنامان.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني محمد بن أحمد بن يعقوب حدثنا محمد بن نعيم الضبي قال سمعت أبا الفضل محمد بن الحسين قاضي نيسابور سمعت حماد بن أحمد القاضي المروزي يقول سمعت إبراهيم بن عبدالله الخلال دەيووت: **بيستم ابن المبارك دەيووت: أبو حنيفة ئايەتێك بوو، كەسێک پێی ووت: ئايەت بوو لە شەڕ يان لە خێر ئەی باوكی عبدالرحمن ؟ ابن المبارك ووتی: بێدەنگ بە، غايەت بۆ شەڕ بەكاردێ، ئايەت بۆ خێر بەكاردێ، پاشان ئەم ئايەتەی خوێندەوە: ﴿وَجَعَلْنَا ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةً﴾.** [تاريخ بغداد : 461/15]

ووتم: حماد بن أحمد بن حماد القاضي المروزي مەجهولە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الصيمري أخبرنا عمر بن إبراهيم المقرئ حدثنا مكرم بن أحمد حدثنا أحمد بن محمد بن مغلس قال حدثنا الحماني ووتی: **بيستم ابن المبارك دەيووت: مەجليسی أبو حنيفة چەندە سەنگين بوو، بە فەقیهەكان دەچوو، ڕەووشتنی جوان بوو، دەم و چاوی جوان بوو، جل و بەرگی جوان بوو، ڕۆژێک ئێمە لە مزگەتی الجامع بووين مارێک كەوتە خوار كەوتە ناو كۆشی أبو حنيفة خەڵكی ڕايانكرد، بەڵام أبو حنيفة هيچی نەكرد جگە لەوەی مارەكەی لەسەرخۆی لابرد ولەشوێنی خۆی دانيشت.** [تاريخ بغداد : 461/15]

ووتم: (أحمد بن محمد بن مغلس) أحمد بن الصلت-ە درۆزنە، شێخەكەی (جبارة بن مغلس الحماني)ە ماميەتی تۆمەتبارە بە درۆ.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الحسن بن أبي بكر حدثنا محمد بن أحمد بن الحسن الصواف أخبرنا محمود بن محمد المروزي حدثنا حامد بن آدم حدثنا أبو وهب محمد بن مزاحم ووتی: **بيستم عبدالله بن المبارك دەيووت: گەر الله بە هانامەوە نەهاتبوايە بە أبو حنيفة و سفيان ئەوا وەک باقی خەڵكی دەبووم.** [تاريخ بغداد : 461/15]

ووتم: حامد بن آدم درۆزنە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا أبو نعيم الحافظ أخبرنا علي بن أحمد بن أبي غسان الدقيقي البصري حدثنا

جعفر بن محمد بن موسى النيسابوري الحافظ قال سمعت علي بن سالم العامري دەیووت: **بيستم أبو يحيى الحماني دەیووت: کەسم نەدیوە هەرگیز لە أبو حنيفة چاکتر بێ.** [تاريخ بغداد : 461/15]
ووتم: علي بن سالم العامري مەجهولە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني أبو بشر الوكيل و أبو الفتح الضبي قالا أخبرنا عمر بن أحمد الواعظ حدثنا مكرم بن أحمد حدثنا أحمد بن عطية العوفي حدثنا منجاب ووتی: **بيستم أبو بكر بن عياش دەیووت: أبو حنيفة باشترین کەسی سەردەمی خۆیەتی.** [تاريخ بغداد : 462/15]
ووتم: (أحمد بن عطية العوفي) أحمد بن الصلت-ە درۆزنە، لە بەشی یەکەم هێنامان کە أبو بكر بن عياش لەعنەتی لە أبو حنيفة کرد.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني الصيمري قال قرأنا على الحسين بن هارون عن أبي العباس بن سعيد قال حدثنا محمد بن عبدالله بن أبي حاتم حدثنا إبراهيم بن أحمد الخزاعي قال سمعت أبي دەیووت: **بيستم سهل بن مزاحم دەیووت: دونیا سەرف کرا بۆ أبو حنيفة نەیویست، بە قامچی لێیدرا لەپێناوی دونیا قبوڵی نەکرد.** [تاريخ بغداد : 462/15]
ووتم: إبراهيم بن أحمد الخزاعي زەعیفە.

**الخطيب** دەڵێ: حدثني الصوري أخبرنا الخصيب بن عبدالله القاضي بمصر حدثنا أحمد بن جعفر بن حمدان الطرسوسي حدثنا عبدالله بن جابر البزاز قال سمعت جعفر بن محمد بن عيسى بن نوح يقول سمعت محمد بن عيسى بن الطباع دەیووت: بيستم روح بن عبادة دەیووت: **من لەلای ابن جريج بووم ساڵی 150 هەواڵی مردنی أبو حنيفة-ی بۆهات، ووتی: إنا لله وإنا إليه راجعون، وە ئازاری چێشت ووتی: چ علمێک ڕۆیی، روح بن عبادة دەڵێ: هەر لەهەمان ساڵدا ابن جريج مرد.**
[تاريخ بغداد : 463/15]
ووتم: أحمد بن جعفر بن حمدان الطرسوسي جەرح و تەعدیلی بۆ نەکراوە، هەروەها عبدالله بن جابر بن عبدالله البزاز الطرسوسي زەعیفە، پێم سەیرە محقق بە صەحیحی داناوە !

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني أبو بشر الوكيل و أبو الفتح الضبي قالا حدثنا عمر بن أحمد الواعظ حدثنا أحمد بن محمد بن عصمة الخراساني حدثنا أحمد بن بسطام حدثنا الفضل بن عبدالجبار قال سمعت أبا عثمان حمدون بن أبي الطوسي دەيووت: **بيستم عبدالله بن المبارك دەيووت: چوومە شام بۆلاى الأوزاعي لە بەيروت بينيم، پێى ووتم: ئەى خوراسانى ئەو بيدعەچيە كێيە كە لە كوفە دەركەوتووە كونيەى أبو حنيفة-يە ؟ منيش گەڕامەوە بۆ ماڵەوە سەيرى كتێبەكانى أبو حنيفة-م كرد چەند بابەتێكى باشم لێى دەرهێنا، سێ ڕۆژ خەريكى ئەوە بووم، جا ڕۆژى سێيەم هاتم بۆلاى الأوزاعي ئەو بانگدەر وئيمامى مزگەوتەكەى خۆيان بوو، كتێبەكەم لە دەستدا بوو، پێى ووتم: ئەم كتێبە چيە؟ منيش پێم دا، سەيرى بابەتێكى كتێبەكەى كرد كەوتە بەرچاوى نوسرابوو (قال النعمان بن ثابت) هەر بە پێوە وەستابوو دواى ئەوەى كە بانگيدا تا بەشى سەرەتاى كتێبەكەى خوێندەوە، پاشان كتێبەكەى خستە ناو گيرفانى، پاشان قامەتى كرد و نوێژى كرد، پاشان كتێبەكەى دەرهێنايەوە تا هەمووى خوێندەوە، جا پێى ووتم: ئەى خوراسانى ئەم النعمان بن ثابت-ە كێيە ؟ ووتم: شێخێكە لە عيراق بينيم، ووتى: ئەمە يەكێكە لە شێخە گەورە و بەڕێزەكان، بڕۆ عيلمى زياترى لێوەر بگرە، ووتم: ئەمە أبو حنيفة-يە كە نەهيت لێكردم.** [تاريخ بغداد : 463/15]

ووتم: أحمد بن محمد بن عصمة الخراساني و أحمد بن بسطام و حمدون بن أبي الطوسي هەر سێكيان مەجهولن.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الخلال أخبرنا الحريري أن النخعي حدثهم قال حدثنا سليمان بن الربيع حدثنا همام بن مسلم ووتى: **بيستم مسعر بن كدام دەيووت: لە كوفە كەس حەسودى پێ نەبراوە تەنها دوو كەس نەبێ: أبو حنيفة لە فيقهەكەيدا، وە الحسن بن صالح لە زوهدەكەيدا.**

[تاريخ بغداد : 464/15]

ووتم: سليمان بن الربيع الخزاز زەعيفە، همام بن مسلم مەتروكە، ووتەكەش درۆيەكى شاخدارە الحسن بن صالح خەواريجێكى پيس بووە، دواتر مسعر كێيە تا ووتەى دەربارەى أبو حنيفة وەربگيرێ ؟ كەسێكى مورجيئەيە وەك أبو حنيفة، كاتێك مرد سفيان الثوري نوێژى لەسەر نەكرد.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني الصيمري قال قرأنا على الحسين بن هارون عن أبي العباس بن سعيد قال حدثنا عبدالله بن أحمد بن مسرور حدثنا علي بن مكنف حدثني أبي عن إبراهيم بن الزبرقان ووتی: **ڕۆژێک لەلای مسعر بووم، أبو حنيفة بەلاماندا تێپەڕی سەلامی کرد و وەستا لەلای پاشان ڕۆیشت، هەندێک بە مسعر-یان ووت: دوژمنانی أبو حنيفة چەندە زۆرن، مسعر ووتی: نەمبینی أبو حنيفة دژی کەسێک بوەستێ ئیللا بەسەریدا سەرکەوتووە.** [تاريخ بغداد : 464/15]

ووتم: علي بن مكنف و باوکی مەجهولن.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الصيمري أخبرنا عمر بن إبراهيم المقرئ حدثنا مكرم بن أحمد حدثنا أحمد بن محمد بن مغلس أخبرنا أبو غسان ووتی: **بیستم إسرائيل دەیووت: باشترین پیاو النعمان بوو، چەندە بەباشی ئەو فەرموودانەی لەبەر بوو کە فیقهیان تێدایە، زۆر بە توندی لە حاڵی فەرموودەکانی دەکۆڵیەوە، وە لە هەمووان زاناتر بوو کە چ فیقهێکی تێدایە، وە ووتەکانی حماد-ی بەباشی زەبت کرد بوو، خەلیفەکان و ئەمیرەکان و وەزیرەکان ڕێزیان لێینا، وە مسعر دەیووت: هەر کەسێک أبو حنيفة بخاتە نێوان خۆیی و الله ئەوا هیوام وایە کە نەترسێ، وە کەمتەرخەمیشی نەکردووە لە یەدەگ وەرگرتن بۆ نەفسی خۆی.** [تاريخ بغداد : 464/15]

ووتم: (أحمد بن محمد بن مغلس) أحمد بن الصلت-ە درۆزنە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا التنوخي حدثني أبي حدثنا محمد بن حمدان بن الصباح النيسابوري حدثنا أحمد بن الصلت الحماني حدثنا علي بن المديني ووتی: بیستم عبدالرزاق دەیووت: **من لەلای معمر بووم، ابن المبارك هاتە لای، بیستمان معمر دەیووت: کەسێک ناناسم بە چاکی بزانێ قسە لە فیقهدا بکات یان بتوانێ قیاس بکات و فیقهـ بۆ خەڵکی شەرح بکات لە أبو حنيفة شارەزاتر بێ، وە هیچ کەس ناناسم لە أبو حنيفة زیاتر بترسێ لە نەفسی خۆی لەوەی کە شتێکی گوماناوی بخاتە ناو دینی الله.** [تاريخ بغداد : 465/15]

ووتم: أحمد بن الصلت الحماني درۆزنە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الصيمري قال قرأنا على الحسين بن هارون عن ابن سعيد قال حدثنا أحمد بن تميم بن عباد المروزي حدثنا حامد بن آدم حدثنا عبدالله بن أبي جعفر الرازي ووتی: **بیستم باوكم دەیووت: كەسم نەدیوە لە أبو حنيفة فەقیهتر بێ، كەسم نەدیوە لە أبو حنيفة وەرعی زیاتر بێ.**
[تاريخ بغداد : 465/15]
ووتم: (ابن سعيد) ابن عقدة-یە كە لە تحقيقی عطا بۆتە (أبي سعيد) تۆمەتبارە بە درۆ، هەروەها حامد بن آدم درۆزنە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني أبو بشر الوكيل و أبو الفتح الضبي قالا حدثنا عمر بن أحمد حدثنا مكرم بن أحمد حدثنا أحمد بن عطية حدثنا سعيد بن منصور، وأخبرني التنوخي حدثني أبي حدثنا محمد بن حمدان بن الصباح حدثنا أحمد بن الصلت قال حدثنا سعيد بن منصور ووتی: **بیستم الفضيل بن عياض دەیووت: أبو حنيفة پیاوێكی فەقیه بوو ناسراو بوو بە فیقه، بەناوبانگ بوو بە وەرع، پارەی زۆر بوو، ناسراو بوو بە چاكە كردن لەگەڵ هەموو كەسانی دەوروبەری، ئارامگر بوو لەسەر فێركردنی زانست بە شەو و بە ڕۆژ، شەوی بە چاكی بەسەر دەبرد، زۆربەی كات بێدەنگ بوو، كەم قسەی دەكرد تا ئەو كاتەی وەڵامی بابەتێكی دەدایەوە لە حەلال یان حەڕام، بە چاكی دەیزانی حەق نیشانی خەڵك بدات، ڕایدەكرد لە ماڵ و سامانی دەسەڵاتدار -ڕیوایەتی مكرم بن أحمد تا ئێرە هاتووە، ڕیوایەتی ابن الصباح ئەمەشی زیادكردووە- گەر بابەتێكی هاتبوایە پێش فەرموودەی صەحیحی تێدا هەبوایە شوێنی دەكەوت، ئەگەرنا شوێنی ئەثەری صەحابە و تابعين دەكەوتن، ئەگەرنا قیاسی دەكرد باشترین قیاس.** [تاريخ بغداد : 465/15]
ووتم: الخطيب بە دوو سەنەد ئەم ڕیوایەتەی هێناوە، لەڕێگای أحمد بن عطية و لەڕێگای أحمد بن الصلت كە هەردووكیان یەک كەسن كە كەسێكی درۆزنە، پێشتر باسمان كرد مكرم بن أحمد وەک تەدلیس ناوی جیاواز بۆ أحمد بن الصلت بەكار دەهێنێت بۆ ئەوەی بیشارێتەوە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني التنوخي حدثني أبي حدثنا محمد بن حمدان قال حدثنا أحمد بن الصلت حدثنا بشر بن الوليد ووتی: **بیستم أبو يوسف دەیووت: كەسم نەدیوە زاناتر بێ لە أبو حنيفة لە**

**لێكدانەوەی مانای فەرمووده و دەرهێنانی حوكمی فیقهی شاراوە تێیدا.** [تاريخ بغداد : 466/15]
ووتم: أحمد بن الصلت درۆزنە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الصيمري أخبرنا عمر بن إبراهيم حدثنا مكرم بن أحمد حدثنا أحمد بن محمد بن مغلس قال سمعت محمد بن سماعة دەیووت: **بیستم أبو يوسف دەیووت: موخالەفەی أبو حنيفة-م نەكردووە لە هیچ شتێكدا ئیللا بینیومە ووتەكەی ئەو سەلامەتترە بۆ قیامەت لەهی من، وە من مەیلم هەبوو بۆ حەدیث، وە ئەو لە من شارەزاتر بوو لە ناسینەوەی فەرموودەی صەحیح.**
[تاريخ بغداد : 466/15]
ووتم: (أحمد بن محمد بن مغلس) أحمد بن الصلت-ە درۆزنە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا القاضي أبو جعفر محمد بن أحمد بن محمد السمناني أخبرنا إسماعيل بن الحسين بن علي البخاري الزاهد حدثنا أبو بكر أحمد بن سعد بن نصر حدثنا علي بن موسى القمي حدثني محمد بن سعدان قال سمعت أبا سليمان الجوزجاني دەیووت: بیستم حماد بن زيد دەیووت: **دەمویست حەج بكەم چومە لای أيوب تا ماڵئاوایی لێ بكەم، أيوب ووتی: پێم گەیشتووە پیاوە چاكەكە فەقیهی ئەهلی كوفە -واتا أبو حنيفة- ئەمساڵ حەج دەكات، جا گەر پێی گەیشتی لە منەوە سەلامی لێ بكە.** [تاريخ بغداد : 467/15]
ووتم: پێشتر ئەم ڕیوایەتەمان هێنا لە كتێبی (الانتقاء) بەڵام بە سەنەدێكی تر كە زەعیف بوو، محقق-ی تاريخ بغداد(١) ئەم ڕیوایەتەی بە حەسەن داناوە گوایە أبو سليمان الجوزجاني صدوق-ە كەواتە دەبێتە حەسەن !
إسماعيل بن الحسين بن علي و أحمد بن سعد بن نصر و علي بن موسى القمي شێخی حەنەفیەكانی خوراسانە هەرسێكیان حاڵیان دیارنیە، ئەوەی یەكەم و دووەم الخطيب لە تاريخ بغداد ژیاننامەی هێناون بەبێ هیچ جەرح و تەعدیلێك، وە ئەوەی سێیەمیان ئەگەرچی الذهبي دەڵێ: الحاكم زۆر بە گەورە وەسفی كردووە بەڵام نازانین لەچیدا وەسفی كردووە چونكە زۆر زانای گەورە هەن زەعیفن لە ڕیوایەتدا، وە هەر سێكیان فەقیهی حەنەفین، هەروەها أبو سليمان الجوزجاني حەنەفی

مەزهەبە و قوتابى أبو يوسف و محمد بن الحسن بووە، بۆيە ناكرێ سەنەدێكى ئاوا كە سێ ڕاوى حاڵ نادیارى تێدايە و ڕاوییەكانى حەنەفى بن و نزیک بن لە أبو حنيفة قبوڵ بكەين لەكاتێكدا ئەوەى لە أيوب السختياني ڕيوايەت كراوە پێچەوانەى ئەمەيە.

**عبدالله** دەڵێ: حدثني محمد بن عبدالله المخرمي حدثنا سعيد بن عامر ووتى: بيستم سلام بن أبي مطيع دەيووت: **من لەگەڵ أيوب بووم لە مسجد الحرام، أبو حنيفة أيوب-ى بينى بەرەو لاى هات، كاتێک أيوب أبو حنيفة-ى بينى بە هاوەڵەكانى ووت: هەڵسن با نەخۆشيەكەى بۆمان نەگوازێتەوە، هەڵسن با نەخۆشيەكەى بۆمان نەگوازێتەوە.** [السنة : 239] (سەنەدەكەى صەحيحە).

ووتم: أبو حنيفة پێستى بەڵەكى پێوە بوو، أيوب مەبەستى ئەوە نەبووە لەترسى نەخۆشيەكەى دوور كەونەوە لێى ئەگەرچى باسى نەخۆشى پێستى كردووە لە ڕيوايەتەكەدا كە بە (جرب) ناسراوە بەڵكو لەبەر عەقيدەكەى واى ووتوە، بەڵگەش بۆ ئەمە لە هيچ كەسێک نەهاتووە بە صەحيحى يان بە زەعيفى بڵێ من خۆم لە نزيک بوونەوەى أبو حنيفة دەپارێزم چونكە ئەم نەخۆشيەى هەيە.

ئەم ڕيوايەتە لە [تاريخ بغداد : 547/15] هاتووە هەر لە ڕێگاى سعيد بن عامر ئەويش لە سلام بن أبي مطيع، الكوثري بەهۆى سعيد و سلام تەزعيفى كردووە، لێرەدا من وەڵامى نادەمەوە تەنها ووتەى محقق-ى تاريخ بغداد(١) نەقل دەكەم كە دەڵێ: الكوثري تەزعيفى ئەم ڕيوايەتەى كردووە بەهۆى سعيد و سلام ئەمەش سەركەشيەكى زۆر ئاشكرايە لەلايەن الكوثري-ە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الصيمري قال قرأنا على الحسين بن هارون عن ابن سعيد قال حدثنا عبدالله بن إبراهيم بن قتيبة حدثنا ابن نمير حدثني إبراهيم بن البصير عن إسماعيل بن حماد عن أبي بكر بن عياش ووتى: **عمر بن سعيد مرد براى سفيان (الثوري) ئێمەش چووينە لاى سفيان بۆ سەرەخۆشى، مەجليسەكە پڕ بوو لە خەڵک، عبدالله بن إدريس-ى تێدابوو، أبو حنيفة-ش لەگەڵ كۆمەڵێک كەس هات، كاتێک سفيان ئەوى بينى لەشوێنى خۆى جوڵا و هەڵسايە سەرپێ و باوەشى پێداكرد، وە أبو حنيفة-ى لەشوێنى خۆى دانيشاند و خۆشى لەبەردەمى دانيشت. أبو بكر دەڵێ: منيش لێى تووڕە بووم، عبدالله بن إدريس ووتى كاتى ئەوە نيە، ئێمەش دانيشتين تا خەڵكى ڕۆيشتن، بە عبدالله**

**بن إدريس-م ووت: هەڵمەستە تا دەزانین سفیان بۆ وایکرد، منیش ووتم: ئەی باوکی عبدالله ئەمڕۆ بینیم شتێکت کرد کە سەرزەنشتیم کرد و هاوەڵانیشمان سەرزەنشتی ئەو شتەیان کرد لێت. ووتی: ئەم شتە چیە ؟ ووتم: أبوحنیفة هاتە لات تۆش بۆی هەڵسایەوە ولەشوێنی خۆت داتنیشاند و زیادەڕەویت کرد لە مامەڵەکردن لەگەڵی ئەم کارەش لەلای هاوەڵەکانمان سەرزەنشتکراوە. ووتی: سەرزەنشتی چی دەکەی لەم کارەم ؟ ئەم پیاوە پلەی هەیە لە زانستدا، گەر لەبەر زانستەکەی هەڵنەستمەوە لەبەر تەمەنەکەی هەڵدەستمەوە، گەر لەبەر تەمەنەکەی هەڵنەستمەوە لەبەر فیقهەکەی هەڵدەستمەوە، گەر لەبەر فیقهەکەی هەڵنەستمەوە لەبەر وەرعەکەی هەڵدەستمەوە، أبو بکر دەڵێ: منی گرت هیچ وەڵامێکم پێ نەبوو.** [تاريخ بغداد : 467/15]

ووتم: (ابن سعيد) ابن عقدة-یە کە تۆمەتبارە بە درۆ، هەروەها إسماعيل بن حماد زەعیفە نەوەی أبو حنيفة-یە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني أبو بشر الوكيل وأبو الفتح الضبي قالا حدثنا عمر بن أحمد قال سمعت محمد بن أحمد بن القاسم النيسابوري قدم علينا قال سمعت أحمد بن حام العفيفي يقول سمعت محمد بن الفضل الزاهد البلخي دەیووت: **بیستم أبو مطيع الحكم بن عبدالله دەیووت: هیچ کەسێکی ئەهلی حەدیثم نەدیوە لە سفیان الثوري فەقیهتر بێ، وە أبو حنيفة لەویش فەقیهتر بوو.**

[تاريخ بغداد : 468/15]

ووتم: أحمد بن حام العفيفي مەجهولە، هەروەها أبو مطيع قوتابی أبو حنيفة بووە مەتروکە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني عبدالباقي بن عبدالكريم المؤدب أخبرنا عبدالرحمن بن عمر الخلال حدثنا محمد بن أحمد بن يعقوب بن شيبة حدثنا جدي حدثني يعقوب بن أحمد ووتی: بیستم الحسن بن علي ووتی: **بیستم کەسێک پرسیاری لە يزيد بن هارون کرد، ووتی: ئەی باوکی خالد فەقیهترین کەس کە تۆ بینیبێتت کێیە ؟ ووتی: أبو حنيفة.**

**الحسن بن علي دەڵێ: بە أبو عاصم النبيل-م ووت: أبو حنيفة فەقیهترە یان سفیان ؟ ووتی: لەلای من أبو حنيفة لە سفیان فەقیهترە.** [تاريخ بغداد : 468/15]

ووتم: عبدالباقي بن عبدالكريم نەمبینی کەس جەرح و تەعدیلی بۆ بکات جگە لە الخطيب کە دەربارەی دەڵێ: لا بأس به، لە بەشی یەکەم ئاماژەمان پێدا کە الخطيب لە تەوسیق کردندا تۆزێک شلە بۆیە ابن حجر ئەوڕاوییانەی الخطيب بە سیقەی داناون دەیانکات بە صدوق، چ جای ئەوەی بڵێ: (لا بأس به) کە پلەکەی نزمترە، گەر حوکمەکەی الخطيب وەر بگرین ئەوا یعقوب بن أحمد دەمێنێتەوە کە دیار نیە کێیە، ئایا یعقوب بن أحمد بن أسد-ە یان کەسێکی ترە ؟ گەر ئەویش بێت نەمبینی هیچ کەسێک جەرح و تەعدیلی بۆ کردبێ، وە ووتەکەی أبو عاصم سەیر نیە چونکە لە بەشی یەکەم ووتمان أبو عاصم لەگەڵ ئەهلی ڕەئی دادەنیشت مەیلی هەبوو بۆ أبو حنيفة.

**الخطیب** دەڵێ: أخبرنا الخلال أخبرنا الحريري أن النخعي حدثهم قال حدثنا محمد بن علي بن عفان حدثنا ضرار بن صرد ووتی: **پرسیار لە یزید بن هارون کرا، کامەیان فەقیهترن أبو حنيفة یان سفيان؟ ووتی: سفيان فەرموودەی باشتر لەبەرە، وە أبو حنيفة فەقیهترە، ضرار بن صرد دەڵێ: پرسیارم لە أبو عاصم النبيل کرد، ووتم: کامەیان فەقیهترن سفيان یان أبو حنيفة ؟ ووتی: نۆکەرێک لە نۆکەرەکانی أبو حنيفة فەقیهترە لە سفيان.** [تاريخ بغداد : 469/15]

ووتم: ضرار بن صرد مەتروکە.

**الخطیب** دەڵێ: أخبرنا الحسين بن علي الحنيفي أخبرنا عبدالله بن محمد الحلواني حدثنا مكرم بن أحمد حدثنا أحمد بن محمد يعني الحماني ووتی: بیستم سجادة دەیووت: **من و أبو مسلم المستملي چووینە لای یزید بن هارون کە هاتبوو بۆ بەغداد بۆلای منصور بن المهدي، ئێمەش سەرکەوتین بۆ ئەو ژوورەی کە ئەوی تێدابوو، أبو مسلم پێی ووت: ئەی باوکی خالد چی دەڵێی دەربارەی أبو حنيفة و سەیرکردنی کتێبەکانی ؟ ووتی: سەیری کتێبەکانی بکەن گەر دەتانەوێ فێری فیقه بن، من کەسم نەدیوە لە فەقیهەکان پێیان ناخۆش بێ سەیری ووتەکانی أبو حنيفة بکرێ، وە سفيان الثوري فێڵی کرد لە کتێبی (الرهن) تا لەسەر هی ئەو کۆپی کرد.** [تاريخ بغداد : 469/15]

ووتم: (أحمد بن محمد الحماني) أحمد بن الصلت-ە درۆزنە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الخلال أخبرنا الحريري أن النخعي حدثهم قال حدثنا محمد بن علي بن عفان حدثنا أبو كريب ووتی: **بيستم عبدالله بن المبارك دەيووت: عابدترين كەسم بينی، خاوەن وەرعترين كەسم بينی، زاناترين كەسم بينی، فەقيهترين كەسم بينی، عابدترين كەس عبدالعزيز بن أبي رواد بوو، خاوەن وەرعترين كەس الفضيل بن عياض بوو، زاناترين كەس سفيان الثوري بوو، فەقيهترين كەس أبو حنيفة بوو، پاشان ووتی: لە فيقهدا كەسم نەديوە وەك ئەو.**
[تاريخ بغداد : 469/15]

ووتم: بێگومان ئەم ووتەيە كاتی سەرەتايە كە ابن المبارك بە أبو حنيفة موبتەلا بوو، دواتر حاڵی بۆی دەركەوت و وازی لێ هێنا وەك خۆی باسی كرد كە لە بەشی يەكەمدا هێنامان، پاشان ئايا ئەم ووتانەی كە دەربارەی أبو حنيفة ووتراوە ئەم مەدحەی ابن المبارك دەتوانێ لايان بدات ؟ ئەمڕۆ چەندان زانای كافر هەن لە فيقه يان لە فەرموودە يان لە تەفسير بليمەتن.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الصيمري أخبرنا عمر بن إبراهيم حدثنا مكرم بن أحمد حدثنا أحمد بن محمد بن مغلس حدثنا محمد بن مقاتل ووتی: **بيستم ابن المبارك دەيووت: گەر ئەثەر پێويستی بە ڕەئی بوو (واتا: بۆ لێكدانەوەی ماناكەی) ئەوا ڕەئی مالك و سفيان و أبو حنيفة هەيە، وە أبو حنيفة باشترينيان ولێزانترينيانە، وە لەوان زياتر ڕۆچووە لە فيقهدا، وە ئەو فەقيهترينە لەم سێ كەسەدا. أحمد بن محمد دەڵێ: حدثنا نصر بن علي ووتی: بيستم أبو عاصم النبيل پرسياری لێكرا ، كامەيان فەقيهترن سفيان يان أبو حنيفة ؟ ووتی: هەموو شتێك لەگەڵ هاوشێوەكەی خۆی قياس دەكرێ، أبو حنيفة فەقيهێكی تەواوە، سفيان پياوێكە خۆی فێری فيقه دەكات.** [تاريخ بغداد : 470/15]

ووتم: (أحمد بن محمد بن مغلس) أحمد بن الصلت-ە درۆزنە، أحمد بن محمد لە سەنەدی دووەم هەر خۆيەتی.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا التنوخي حدثني أبي حدثنا أبو بكر محمد بن حمدان بن الصباح حدثنا أحمد بن الصلت بن المغلس حدثنا الحماني حدثنا ابن المبارك ووتی: **بينيم مسعر لە بازنەی أبو حنيفة لەبەردەمی دانيشتبوو پرسياری لێدەكرد و سوودی لێی دەبينی، وە كەسەم نەديوە قسەی كردبێ**

**لە فیقهدا باشتر لە أبو حنیفة.** [تاريخ بغداد : 470/15]
ووتم: أحمد بن الصلت درۆزنە.

**الخطیب** دەڵێ: أخبرنا أبو نعيم الحافظ حدثنا محمد بن إبراهيم بن علي حدثنا أبو عروبة الحراني قال سمعت سلمة بن شبيب يقول سمعت عبدالرزاق دەیووت: **بیستم ابن المبارك دەیووت: گەر كەسێک بۆی هەبێ فەتوا بدات بە ڕەئی خۆی، ئەوا أبو حنیفة بۆی هەیە فەتوا بدات بە ڕەئی خۆی.** [تاريخ بغداد : 471/15]
ووتم: ئەمەش هاوشێوەی ئەوانی ترە كە سەرەتا ابن المبارك وەک باقی خەڵکی خوراسان سەرسام بووە بە أبو حنیفة.

**الخطیب** دەڵێ: أخبرني عبدالباقي بن عبدالكريم أخبرنا عبدالرحمن بن عمر الخلال حدثنا محمد بن أحمد بن يعقوب حدثنا جدي قال حدثني علي بن أبي الربيع ووتی: بیستم بشر بن الحارث دەیووت: **بیستم عبدالله بن داود ووتی: گەر ئاثارت ویست یان ووتی فەرمووده، وابزانم ووتی وەرعیش، ئەوا سفیان هەیە، وە ئەگەر ئەم بابەتە ووردانەت ویست ئەوا أبو حنیفة هەیە.** [تاريخ بغداد : 471/15]
ووتم: علي بن أبي الربيع و محمد بن إبراهيم بن مشكان هەردووكیان ئەمەیان ڕیوایەت كردووە لە بشر ئەویش لە عبدالله بن داود الخريبي، حاڵی دوو قوتابیەكەی بشر بۆم دەرنەكەوت، گەر صەحیحیش بێت ئەوا عبدالله بن داود الخريبي مەیلی هەیە بەلای ئەهلی ڕەئیدا بۆیە قسەكەی سەنگی نیە.

**أبو داود** دەڵێ: **بیستم أحمد ووتی: عبدالله بن داود-م بینی فەرموودەم لێیەوە نەنوسی، حەزی بە ڕەئی بوو.** [مسائل أبي داود للإمام أحمد : 537] ت: زياد محمد منصور

**الخطیب** دەڵێ: أخبرنا الخلال أخبرنا الحريري أن النخعي حدثهم قال حدثنا عمر بن شهاب العبدي حدثنا جندل بن والق حدثني محمد بن بشر ووتی: **من دەچوومە لای أبو حنیفة و سفیان، دەچوومە لای أبو حنیفة پێی دەووتم: لەكوێوە هاتووی ؟ دەمووت: لەلای سفیان، دەیووت: لەلای پیاوێک**

**هاتووى گەر علقمة و الأسود ئێستا لەژياندابوان ئەوا پێويستيان بە كەسێكى وەك ئەو دەبوو، دەچوومە لاى سفيان پێى دەووتم: لەكوێوە هاتووى ؟ دەمووت: لەلاى أبو حنيفة، دەيووت: لەلاى فەقيهترين كەسى سەر زەوى هاتووى.** [تاريخ بغداد : 471/15]

ووتم: جندل بن والق زەعيفە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الجوهري أخبرنا محمد بن عمران المرزباني حدثنا عبدالواحد بن محمد الخصيبي قال حدثني أبو مسلم الكجي إبراهيم بن عبدالله قال حدثني محمد بن سعيد أبو عبدالله الكاتب ووتى: **بيستم عبدالله بن داود الخريبي دەيووت: پێويستە لەسەر ئەهلى ئيسلام كە دوعا بكەن بۆ أبو حنيفة لە نوێژەكانيان، وە باسى پاراستنى فەرموودەكان و فيقهى كرد لەلايەن أبو حنيفة-ەوە بۆ ئەهلى ئيسلام.** [تاريخ بغداد : 472/15]

ووتم: محمد بن عمران المرزباني موعتەزيلەيە سەرەڕاى ئەمەش خيلافى لەسەرە سيقەيە يان نا، هەروەها محمد بن سعيد أبو عبدالله الكاتب حاڵى ديار نيە، باسيشمان كرد كە عبدالله بن داود حاڵى چۆن بووە بۆيە قسەى ئەم جۆرە كەسانە سەنگى نيە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا علي بن أبي علي حدثنا أبو علي أحمد بن محمد بن محمد بن إسحاق المعدل النيسابوري حدثنا أبو حامد أحمد بن محمد بن بلال قال سمعت محمد بن يزيد دەيووت: **بيستم عبدالله بن يزيد المقرئ دەيووت: هيچ سەر ڕەشێكم نەديوە لە أبو حنيفة فەقيهتر بێ.** [تاريخ بغداد : 472/15]

ووتم: شێخەكەى الخطيب نەمزانى كێيە نەمدۆزييەوە باسكرابێ، ڕاوييەكانى تريش هەموويان سيقەن، محقق بێدەنگ بووە لەسەر ئەم ڕيوايەتە دڵنيام گەر شێخەكەى الخطيب-ى ناسيبوايە بێدەنگى هەڵنەدەبژارد و دەيووت صەحيحە، هەروەها عبدالله بن يزيد كە خاوەنى ووتەكەيە هەر أبو عبدالرحمن المقرئ-ە كە لە بەشى يەكەمدا هێنامان دەيووت: أبو حنيفة بانگى كردم بۆ ئيرجاء ڕەتم كردەوە، لەكاتى ڕيوايەت كردندا كە ناوى دەهێنا هاوارى دەكرد كە أبو حنيفة مورجيئەيە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني أبو بشر الوكيل و أبو الفتح الضبي حدثنا عمر بن أحمد الواعظ حدثنا محمد

بن مخزوم حدثنا بشر بن موسى حدثنا **أبو عبدالرحمن المقرئ: وە گەر فەرموودەی بۆ ڕیوایەت کردبواین لە أبو حنیفة-ەوە، دەیووت: حدثنا شاهانشاه.** [تاريخ بغداد : 473/15]

ووتم: محمد بن مخزوم تۆمەتبارە بە درۆ، ڕیوایەتەکەش تەواو پێچەوانەی ڕیوایەتە صەحیحەکەیە کە لە بەشی یەکەمدا هێنامان، دواتر بەکارهێنانی ووشەی (شاهانشاه) جائیز نیە واتا پاشای پاشاکان ئەمە تەنها بۆ الله بەکاردێ.

**الخطیب** دەڵێ: أخبرنا الخلال أخبرنا الحريري أن النخعي حدثهم قال حدثنا إبراهيم بن مخلد البلخي حدثنا أحمد بن محمد البلخي ووتی: **بیستم شداد بن حکیم دەیووت: کەسم نەدیوە لە أبو حنیفة زاناتر بێ.** [تاريخ بغداد : 473/15]

ووتم: إبراهيم بن مخلد البلخي مەجهولە، أحمد بن محمد البلخي نەمزانی کامەیە، هەروەها شداد بن حکیم کە خاوەنی ووتەکەیە ابن حبان دەربارەی دەڵێ: حەزم لەخۆپاراستنە لە فەرموودەکانی شداد بن حکیم چونکە دەمارگیری هەیە لە ئیرجائدا، وە ڕقی لەو کەسانە دەبێتەوە کە ئەهلی سوننەن یان بەدوای فەرموودەدا دەگەڕێن.

**الخطیب** دەڵێ: قال النخعي حدثنا إسماعيل بن محمد الفارسي ووتی: **بیستم مكي بن إبراهيم باسی أبو حنیفة-ی کرد، ووتی: زاناترین کەسی سەردەمی خۆی بوو.** [تاريخ بغداد : 473/15]

ووتم: زاهیری سەنەدەکە صەحیحە گەر مەتنەکەشی صەحیح بێت ئەوا غەریب نیە چونکە مكي بن إبراهيم یەکێکە لە شێخە خوراسانیەکان، لە بەشی یەکەم باسمان کرد کە ئەهلی خوراسان بە أبو حنیفة موبتەلا بوون، ووتەی أبو زرعة الرازي-مان هێنا کە دەڵێ ئێمە گەنج بووین وەکو باقی ئەو خەڵکەی خوراسان سەرسام بووین بە أبو حنیفة، ووتەی إسحاق بن راهويه-مان هێنا کە دەڵێ: لە خوراسان هاتمە دەرەوە پێم وابوو کەس جورئەت ناکات موخالەفەی أبو حنیفة بکات کەچی بینیم لە دەرەوەی خوراسان خەڵکی پێچەوانەی ئێمەن دەربارەی أبو حنیفة ! هەروەها باسی ابن المبارك-مان کرد، تەنانەت البخاري-ش کە خوراسانیە و زۆر دژی ئەهلی ڕەئیە و ڕەددیان دەداتەوە، کە باسی منداڵی خۆی دەکات دەڵێ: کتێبەکانی ئەهلی ڕەئیم خوێندەوە ئینجا لە مەجلیسی

فەرمووده ووتنەوه دانیشتم.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا التنوخي حدثني أبي حدثنا محمد بن حمدان بن الصباح حدثنا أحمد بن الصلت قال سمعت مليح بن وكيع دەیووت: **بیستم باوكم دەیووت: بە كەس نەگەیشتووم لە أبو حنيفة فەقیهتر بێ، وە لەو جوانتر نوێژ بكات.** [تاريخ بغداد : 473/15]
ووتم: أحمد بن الصلت درۆزنە، درۆكەش ڕوونە چونكە هێنامان وكيع ڕیوایەتى هەیە دژى أبو حنيفة تەنانەت ڕیوایەتى هەیە دەربارەى نوێژكردنى أبو حنيفة لەگەڵ ابن المبارك، بگرە نوێژكردن لەلاى أبو حنيفة بەجۆرێک جائیزە كە ئەم جۆرە نوێژكردنە لەلاى زانایانى تر بەتاڵە.

**الخطيب** دەڵێ: قال ابن الصلت سمعت الحسين بن حريث دەیووت: **بیستم النضر بن شميل دەیووت: خەڵكى نوستبوون دەربارەى فیقهـ تا أبو حنيفة بە خەبەرى هێنانەوە بەو شتانەى كە هەڵى تەقاند و ڕوونى كردەوە و پوختى كردەوە.** [تاريخ بغداد : 473/15]
ووتم: أحمد بن الصلت درۆزنە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الجوهري أخبرنا عبدالعزيز بن جعفر الخرقي حدثنا هيثم بن خلف الدوري حدثنا أحمد بن منصور بن سيار ووتى: بیستم يحيى بن معين دەیووت: **بیستم يحيى بن سعيد (القطان) دەیووت: چەندەها قسەى چاك هەبووە أبو حنيفة كردوویەتى.** [تاريخ بغداد : 473/15]
ووتم: سەنەدەكەى صەحیحە، پێشتر باسى ئەم ووتانەى يحيى بن سعيد القطان-مان كرد.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا علي بن القاسم الشاهد حدثنا علي بن إسحاق المادرائي قال سمعت أبا جعفر بن أشرس دەیووت: بیستم يحيى بن معين دەیووت: **بیستم يحيى القطان دەیووت: درۆ لەگەڵ الله ناكەین لەوانەیە شتێكم لە ڕەئى أبو حنيفة وەرگرتبێ.** [تاريخ بغداد : 473/15]
ووتم: أبو جعفر بن أشرس نەمدۆزییەوە، گەر صەحیحیش بێ ووتەكەى بەڵگەیە لەسەر ئەوەى كە شتێكى كەمى لە أبو حنيفة وەرگرتووە، ئەصلەن خودى ئەم جۆرە ووتانە بەڵگەیە لەسەر ئەوەى كە أبو حنيفة قسەى لەسەر بووە، ئەگینا بۆ كەس باسى مالك والشافعي وأحمد ناكات بڵێ

والله درۆ ناكەم هەندێک شتم لێیان وەرگرتووە ؟ چونكە أبو حنيفة قسەی لەسەرە بۆیە یحیی القطان وادەڵێ، ئەگینا گەر زانایەكی گەورە بێت ئەوا زۆرینەی خەڵک فەتواكانی وەردەگرن كەس باسیشی ناكات بڵێ درۆ ناكەم هەندێک فەتوام لە فلان زانا وەرگرتووە.

لە بەشی یەكەمدا هێنامان بە صەحیحی كە عبدالرحمن بن مهدي پرسیاری لێدەكرێت ئایا ئەو شتانەی كە أبو حنيفة تێیدا پێكاویەتی و موافقی حەقە بینوسینەوە ؟ عبدالرحمن دەڵێ: نەخێر مەینوسنەوە هیچ كەرامەتی نیە.

عبدالرحمن بن مهدي و یحیی القطان دوو هاوڕێن كە وەک ئەستێرە وان لە زانستی فەرموودەدا بگرە هەر خۆیان قوتابخانەن لەم بوارەدا، يزيد بن هارون دەربارەیان دەڵێ: كەوتمە نێوان شێر، ئیمام أحمد دەربارەیان دەڵێ: عبدالرحمن فەقیهترە، جا ڕەنگە ئەمەش یەكێک بێت لە نیشانەكانی فیقهەكەی كە ئامادە نیە هیچ شتێک لە أبو حنيفة بنوسرێتەوە، بەڵام دیارە یحیی هەندێكی لێوەر گرتووە بەپێی ئەم ڕیوایەتانەی بەشی دووەم ئەگەرچی ڕیوایەتی صەحیحیش هەن پێچەوانەی ئەمەن وەک لە بەشی یەكەم هێنامان.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا العتيقي حدثنا عبد الرحمن بن عمر بن نصر بن محمد الدمشقي بها حدثني أبي حدثنا أحمد بن علي بن سعيد القاضي ووتی: بیستم يحيى بن معين دەیووت: **بیستم يحيى بن سعيد القطان دەیووت: درۆ لەگەڵ الله ناكەین لە ڕەئی أبو حنيفة باشترمان نەبیستووە، وە زۆرێک لە ووتەكانیمان وەرگرتووە.**

**يحيى بن معين دەڵێ: يحيى بن سعيد لە فەتوادا لەسەر مەزهەبی كوفییەكان بوو، وە ووتەی أبو حنيفة-ی هەڵدەبژارد لەناو ووتەكانیاندا، وە شوێنی ڕەئی ئەو دەكەوت لەنێوان هاوەڵەكانیدا.**

**[تاريخ بغداد : 473/15]**

ووتم: عبدالرحمن الدمشقي حاڵی دیار نیە و تۆمەتباریشە بە ئیعتیزال هەروەها ڕیوایەتی كردووە لە أبي إسحاق بن أبي ثابت تۆمەتبار كراوە بەوەی كە أبي إسحاق-ی بینیبێ، هەروەها باوكیشی نەمدۆزیە كێیە وچۆنە، بۆیە مەحاڵە قسەیەكی لەم شێوەیە بكات گەر بیكات بەسەر خۆیدا

دەشکێتەوە چ جای ئەوەی ببێتە فریادڕەسی أبو حنیفة، وە هیچ کام لەم سەنەدانە لە بەهێزیدا ناگەن بە سەنەدەکەی بەشی یەکەم کە ابن أبي حاتم لە صالح-ی کوڕی ئیمام أحمد ئەویش لە علي بن المديني ئەویش لە يحيى القطان ڕیوایەتی دەکات.

دەووترێ الشافعي ووتویەتی: (الناس عيال على أبي حنيفة في الفقه) واتا: خەڵکی لەسەر أبو حنیفة حیسابن لە فیقهدا، (عيال) بەو کەسانە دەووترێ کە نەفەقەیان لەسەریەتی، بۆ نموونە: ژن و منداڵ پێیان دەووترێ (عيال) چونکە مەسروفیان لەسەر پیاوی ماڵە، بەپێی ئەم قسەیەی الشافعي بێت خەڵکی لە فیقهدا لەسەر أبو حنیفة پەکیان کەوتووە، وە هاوشێوەی ئەم جۆرە ووتانە لە الشافعي-ەوە نەقل دەکرێ گوایە مەدحی أبو حنیفة-ی کردووە لە فیقهدا.

هەموو ئەو ڕیوایەتانەی مەدحی أبو حنیفة-ی تێدایە لەلایەن الشافعي-ەوە لە کتێبەکانی دوای سەدەی سێیەم هاتوون، کتێبەکانی سەدەی دووەم و سێیەم نەک هەر مەدحی الشافعي تێدا نیە بۆ أبو حنیفة بەڵکو زەمکردنی تێدایە بۆی، لەوانەیە بڵێن دەکرێ لە هەندێک بابەت زەمی کردبێ بەڵام لە فیقهدا مەدحی کردبێ، دەڵێین نەخێر زەمکردنی الشافعي بۆ أبو حنیفة لە ڕووی فیقهەوە بووە نەوەک شتی تر هەروەک لە بەشی یەکەمدا هێنامان، وە ئەگەر لەڕووی سەنەدیشەوە لێی بڕوانین ڕیوایەتەکانی زەمکردنی بۆ أبو حنیفة سەنەدەکانیان عالین و زۆر پاکن، بە پێچەوانەی ئەو ڕیوایەتانەی کە مەدحی أبو حنیفة-ی کردووە زۆربەی سەنەدەکانی نازل و زەعیفن، سەرەتا ڕیوایەتەکانی بەشی یەکەم دەهێنمەوە دووبارە بۆ یاد خستنەوە ئینجا دەچینە سەر ڕیوایەتەکانی مەدحکردنی، بۆیە ڕیوایەتەکانیش دووبارە دەکەمەوە چونکە پلەی الشافعي لەلای هەموومان زۆر بەرزە، بۆیە بە دووری نازانم دەمارگیران بۆ أبو حنیفة دەست بگرن بە ڕیوایەتەکانی مەدحکردنی بۆ أبو حنیفة و ڕیوایەتەکانی زەمکردنی لەیاد خۆیان ببەنەوە.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: حدثنا أبي حدثنا يونس بن عبدالأعلى ووتی: **بيستم الشافعي دەیووت: ڕۆژێک بە محمد بن الحسن-م ووت کە باسی مالك و أبو حنيفة کرا، محمد بن الحسن پێی ووتم:**

**هاوەڵەکەمان نەدەکرا بێدەنگ بێت واتا أبو حنیفة، وە نەدەکرا هاوەڵەکەی ئێوە فەتوا بدات واتا مالك، منیش پێم ووت: سوێندت دەدەم بە الله، ئایا دەزانی هاوەڵەکەمان واتا مالك زانا بوو بە کتێبی الله ؟ ووتی: بەڵێ، ووتم: سوێندت دەدەم بە الله، ئایا دەزانی هاوەڵەکەمان زانا بوو بە فەرموودەی پێغەمبەری الله ﷺ ؟ووتی: بەڵێ، ووتم: وە زانا بوو بە خیلافی نێوان هاوەڵانی پێغەمبەری الله ﷺ ؟ ووتی: بەڵێ، ووتم: ئایا عاقڵ بوو ؟ ووتی: نەخێر، ووتم: سوێندت دەدەم بە الله، ئایا دەزانی هاوەڵەکەت واتا أبو حنیفة جاهیل بوو بە کتێبی الله عز وجل ؟ ووتی: بەڵێ، ووتم: وە جاهیل بوو بە فەرموودەی پێغەمبەری الله ﷺ وە جاهیلیش بوو بە خیلافی نێوان هاوەڵانی پێغەمبەری الله ﷺ ؟ ووتی: بەڵێ، ووتم: ئایا عاقڵ بوو ؟ ووتی: بەڵێ، ووتم: لە هاوەڵەکەی ئێمەدا سێ شت کۆ دەبێتەوە کە فەتوا نابێ بدرێ بەبێ ئەم سێ شتە، وە شتێکی تێدا نیە، بەڵام هاوەڵەکەی ئێوە سێ شتی تێدایە نیە و یەک شتی تێدایە، ئینجا دەڵێی: ناکرێ هاوەڵەکەی ئێمە قسە بکات و ناکرێ هاوەڵەکەی ئێوە بێدەنگ بێ ؟!**

**[آداب الشافعي ومناقبه : 154] (سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: سەیری سەنەدەکە بکەن، ابن أبي حاتم ئیمامە قسەی لەسەر ناکرێ، لە أبو حاتم-ی باوکی ڕیوایەت دەکات أبو حاتم الرازي ئەویش ئیمامە و قسەی لەسەر ناکرێ، ئەویش لە یونس بن عبدالأعلى ڕیوایەت دەکات کە قوتابی الشافعي-ە ئیمامە و قسەی لەسەر ناکرێ، ئەویش لە الشافعي ڕیوایەتی دەکات.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: حدثنا محمد بن عبدالله بن عبدالحكم ووتی: **بیستم الشافعي دەیووت: محمد بن الحسن پێی ووتم: کامەیان زاناترن هاوەڵەکەی ئێمە یان هاوەڵەکەی ئێوە ؟ (واتا: أبو حنیفة و مالك) الشافعي دەڵێ ووتم: بە ئینصافەوە ؟ محمد ووتی: بەڵێ، ووتم: سوێندت دەدەم بە الله کامەیان زاناترن بە قوڕئان هاوەڵەکەی ئێمە یان هاوەڵەکەی ئێوە ؟ ووتی: هاوەڵەکەی ئێوە (واتا: مالك) ووتم: کامەیان زاناترن بە سوننەت هاوەڵەکەی ئێمە یان هاوەڵەکەی ئێوە ؟ ووتی: هاوەڵەکەی ئێوە، ووتم: سوێندت دەدەم بە الله کامەیان زاناترن بە ووتەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ**

**وپێشینان هاوەڵەكەى ئێمە یان هاوەڵەكەى ئێوە ؟ ووتى: هاوەڵەكەى ئێوە، ووتم: هیچ نەماوەتەوە تەنها قیاس نەبێ، قیاسیش ناكرێ تەنها لەسەر ئەم شتانە نەبێ، جا ئەوەى ئەصلەكەى نەزانى لەسەر چ شتێك قیاس دەكات ؟** [آداب الشافعي ومناقبە : 119] **(سەنەدەكەى صەحیحە).**

ووتم: ابن أبي حاتم لە محمد بن عبدالله بن عبدالحكم ڕیوایەت دەكات كە ئیمامێكى فەقیهە و مالكى مەزهەبە و سیقەیە، ئەویش لە الشافعي ڕیوایەت دەكات، سەیرى ئەم سەنەدە عالى و پاكە بكە.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: الربیع بن سلیمان المرادي ووتى: **بیستم الشافعي دەیووت: أبو حنیفة یەكەم بابەت بە هەڵە دادەنێت، پاشان هەموو كتێبەكە لەسەر ئەو بابەتە قیاس دەكات.**
[آداب الشافعي ومناقبە : 129] **(سەنەدەكەى صەحیحە).**

ووتم: ابن أبي حاتم لە الربیع بن سلیمان المرادي ڕیوایەتى دەكات كە یەكێكە لە قوتابییە هەرە دیارەكانى الشافعي سیقەیە، زۆرینەى عیلمەكەى الشافعي لە ڕێگاى الربیع و البویطي نەقل كراوە.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: حدثنا محمد بن عبدالله بن عبدالحكم ووتى: **محمد بن إدریس الشافعي پێی ووتم: سەیرى چەند كتێبێكى هاوەڵانى أبو حنیفة-م كرد، 130 پەڕ بوو 80 پەڕم تێیدا ژمارد كە پێچەوانەى قورئان و سوننەت بوو. ابن أبي حاتم دەڵێ: چونكە ئەصلەكە هەڵە بووە جا فەرعەكانیش لەسەر هەڵە ڕۆیشتوون.** [آداب الشافعي ومناقبە : 129] **(سەنەدەكەى صەحیحە).**

ووتم: باسى ئەم سەنەدەمان كرد.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: قال أبي حدثنا هارون بن سعید الأیلي ووتى: **بیستم الشافعي دەیووت: كەس ناناسم كتێبى نوسى بێت كتێبەكانى بێن بە بەڵگە لەسەر عەیب و عارى ووتەكانى وەك أبو حنیفة.** [آداب الشافعي ومناقبە : 130] **(سەنەدەكەى صەحیحە).**

ووتم: ابن أبي حاتم و باوكى باسمان كردن، هارون بن سعید الأیلي ئیمامێكى فەقیهە و سیقەیە.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: حدثنا أحمد بن سنان الواسطي ووتى: **بیستم محمد بن إدریس الشافعي**

**دەیووت: ڕەئی أبو حنيفة-م بەهیچ شتێک نە شوبهاندووە تەنها بە داوە دەزووی ساحیران نەبێ، ئاوا درێژی دەکەیتەوە دەبێتە زەرد ، ئاوا درێژی دەکەیتەوە دەبێتە سەوز.**

**[آداب الشافعي ومناقبه : 130] (سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: ابن أبي حاتم لە أحمد بن سنان الواسطي ڕیوایەت دەکات، کە ئیمامە فەقیهە سیقەیە حافزە.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: حدثنا أبي حدثنا أحمد بن أبي سريج ووتی: **بيستم الشافعي دەیووت: 60 دینارم سەرف کرد بۆ بە دەست هێنانی کتێبەکانی محمد بن الحسن، پاشان لێی وورد بوومەوە لەپاڵ هەر بابەتێکدا فەرموودەیەکم دانا. واتا: بۆ ڕەددانەوەی.**

**[آداب الشافعي ومناقبه : 27] (سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: ابن أبي حاتم لە باوکی ڕیوایەت دەکات ئەویش لە أحمد بن أبي سريج ڕیوایەت دەکات کە سیقەیە و حافزە.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: حدثنا أبي حدثنا ابن أبي سريج ووتی: بيستم الشافعي دەیووت: **بيستم بە مالك ووترا: أبو حنيفة دەناسیت ؟ ووتی: بەڵێ، گومانتان چیە بەرامبەر پیاوێک گەر بڵێ ئەم دینگەیە لە زێڕ دروستکراوە ئەوا هەر لەسەری بەردەوام دەبێت تاکو دەیکات بە زێڕ کەچی لە دار یان بەرد دروستکراوە ؟**

**ابن أبي حاتم دەڵێ: واتا أبو حنيفة لەسەر هەڵە دەمایەوە و بەڵگەی بۆ هەڵەکەی دەهێنایەوە، وە نەدەگەڕایەوە بۆ صەواب کاتێک بۆی دەردەکەوت.**

**[آداب الشافعي ومناقبه : 162] (سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: ئەمەش هەمان سەنەدی پێشووە بەڵام ئەمجارە الشافعي لە مالك-ەوە ڕیوایەتی دەکات، جا بیر لەم ووتانە بکەنەوە و سەیری سەنەدەکانی بکەن کە چەندە عالی و پاکن لەنێوان ابن أبي حاتم و الشافعي یەک کەس یان دووان هەیە کە هەموویان سیقە و ئیمامن، ئینجا بەراووردی ئەم سەنەدانە بکە لەگەڵ سەنەدی ئەو ڕیوایەتانەی کە تێیدا الشافعي مەدحی أبو حنيفة-ی کردووە

كە ئێستا دەیان هێنین.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا أبو نعيم الحافظ حدثنا محمد بن إبراهيم بن علي قال سمعت حمزة بن علي البصري يقول سمعت الربيع دەیووت: **بیستم الشافعي دەیووت: خەڵكی لەسەر أبو حنيفة حیسابن لە فیقهدا.** [تاريخ بغداد : 474/15]

ووتم: حمزة بن علي البصري نەمدۆزییەوە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا علي بن القاسم حدثنا علي بن إسحاق المادرائي حدثنا زكريا بن عبدالرحمن حدثني عبدالله بن أحمد قال: قال هارون بن سعيد: **بیستم الشافعي دەیووت: كەسم نەدیوە فەقیهتر بێ لە أبو حنيفة.**

**الخطيب دەڵێ: الشافعي كە دەڵێ كەسم نەدیوە مەبەستی ئەوەیە كەسم نەناسیوە.**

[تاريخ بغداد : 474/15]

ووتم: الخطيب بۆیە وادەڵێ چونكە الشافعي لە ساڵی 150 لە دایكبووە لەو ساڵەدا أبو حنيفة مردووە كەواتە نەیدیوە.

(زكريا بن عبدالرحمن) گەر زكريا بن عبدالرحمن البرجمي بێت ئەوا كەس جەرح و تەعدیلی بۆ نەكردووە جگە لە أبو الفتح الأزدي كە ئەویش بە زەعیفی داناوە، وە ئەگەر زكريا بن يحيى بن عبدالرحمن الساجي بێت ئەوا ئیمامە، بەڵام نەمدیوە كەس بەم شێوەیە ناوی بهێنێ ئەوەی باوە دەووترێ زكريا بن يحيى الساجي یان زكريا الساجي یان الساجي بە تەنها، وە نەشم دیوە ڕیوایەتی هەبێ لە عبدالله، پاشان الساجي ڕیوایەتەكانی هەمووی لە دژی أبو حنيفة-ن، جگە لەوەش عبدالله لێرەدا تەصریحی نەداوە بە سماع وتوویەتی (قال هارون بن سعيد) نەمدۆزییەوە كە عبدالله ڕیوایەتی هەبێ لە هارون، وە هەروەها هەڵوێستی عبدالله ڕوونە بەرامبەر أبو حنيفة.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا أبو طاهر محمد بن علي بن محمد بن يوسف الواعظ أخبرنا عبيدالله بن عثمان بن يحيى الدقاق حدثنا إبراهيم بن محمد بن أحمد أبو إسحاق البخاري حدثنا عباس بن عزيز أبو الفضل

القطان حدثنا حرملة بن يحيى ووتى: **بيستم محمد بن إدريس الشافعي دەيووت: خەڵكی لەسەر ئەم پێنج كەسە حيسابن، ئەوەی دەيەوێ وەک دەريا زانستی هەبێ لە فيقهـ ئەوا لەسەر أبو حنيفة حيسابە، وە بيستم الشافعي دەيووت: أبو حنيفة لەو كەسانەيە كە تەوفيقی پێدراوە لە فيقهـ، وە ئەوەی دەيەوێ وەک دەريا زانستی هەبێ لە شيعر ئەوا لەسەر زهير بن أبي سلمى حيسابە، وە ئەوەی دەيەوێ وەک دەريا زانستی هەبێ لە غەزاكان ئەوا لەسەر محمد بن إسحاق حيسابە، وە ئەوەی دەيەوێ وەک دەريا زانستی هەبێ لە النحو ئەوا لەسەر الكسائي حيسابە، وە ئەوەی دەيەوێ وەک دەريا زانستی هەبێ لە تەفسيری قورئان ئەوا لەسەر مقاتل بن سليمان حيسابە.**

**[تاريخ بغداد : 474/15]**

ووتم: أبو إسحاق البخاري حاڵی دەرنەكەوت بۆم، (عباس بن عزيز) لە هەردوو چاپەكە بۆتە (عباس بن عزير) مەجهولە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا التنوخي حدثني أبي حدثنا محمد بن حمدان حدثنا أحمد بن الصلت الحماني قال سمعت أبا عبيدالله دەيووت: **بيستم الشافعي دەيووت: ئەوەی دەيەوێ فيقهـ بزانێ با دەست بگرێ بە أبو حنيفة و هاوەڵەكانی، چونكە هەموو خەڵكی لەسەر أبو حنيفة حيسابن لە فيقهدا.**

**[تاريخ بغداد : 475/15]**

ووتم: أحمد بن الصلت درۆزنە، هيچ بە دووری نازانم تەواوی ئەو ڕيوايەتانەی الشافعي كە مەدحی أبو حنيفة دەكات ئەم درۆزنە دروستی كردبێ چونكە ئەوەی لە الشافعي ڕيوايەت كراوە بە سەنەدی عالی و صەحيح تەواو پێچەوانەی ئەمەيە وەک لە كتێبی (آداب الشافعي ومناقبه) هاتووە كە لە بەشی يەكەم هێنامان، يان ڕەنگە ئەو ڕيوايەتە بێ كە الشافعي دەڵێ: خەڵک لە فيقهدا لەسەر ئەهلی عيراق حيسابن، جا ئەم عيراقەيان كردبێ بە أبو حنيفة، ئاخر الشافعي ووتی أبو حنيفة جاهيلە بە قورئان و سوننەت و خيلافی فيقهی نێوان هاوەڵان، بە سەنەدێک هێنامان كە وەک خۆر وابوو، ئيتر چۆن دەڵێ: ئەوەی دەيەوێ لە فيقهدا وەک دەريا زانستی هەبێ ئەوا لەسەر أبو حنيفة حيسابە ؟! ووتەكەی پێشووی هيچ بوارێک بۆ جەمع كردنيش ناهێڵێت.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: حدثنا الربيع بن سليمان المرادي ووتى: **بيستم الشافعي دەيووت: خەڵکی لەسەر ئەهلی عیراق حیسابن لە فیقهدا.** [آداب الشافعي ومناقبه : 161] **(سەنەدەکەی صەحیحە).**

ووتم: جا ئەم ئەهلی عیراقە کراوە بە أبو حنيفة لەلای دەمارگیران بۆ أبو حنيفة يان لەلای ڕاوییە درۆزنەکان، سەرەڕای ئەوە گەر بە صەحیحیشی دابنێین هێشتا کێشەی تێدایە چونکە الشافعي فیقهی ئەهلی عیراقی عەیبدار کردووە، فیقهی ئەهلی مەدینەی سەر خستووە بەسەریاندا کە بریتیە لە فیقهی ئەهلی حەدیث، هەر بۆیە ابن تيمية دەڵێ: الشافعي کە دەڵێ: خەڵکی لە فیقهدا لەسەر أبو حنيفة حیسابن مەبەستی لە تەفریعی بابەتەکانە نەک زانینی بەڵگەکان، واتا دابەشکردنی بەڵگەکان بەسەر بابەتەکاندا، وەک: كتاب الطهارة ، كتاب الزكاة ، كتاب الجهاد ...هتد.

بڕوانە [فضائل الأئمة الأربعة وما امتاز به كل إمام من الفضيلة : 12]

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني أبو الوليد الحسن بن محمد الدربندي أخبرني محمد بن أحمد بن سليمان الحافظ ببخارى قال سمعت علي بن الحسن بن عبدالرحيم الكندي يقول سمعت أبا محمد عبدالله بن محمد بن عمر الأديب يقول سمعت يعقوب بن إبراهيم بن أبي خيران دەيووت: **بيستم الحسن بن عثمان القاضي دەيووت: بينيم عيلم لە عيراق و حيجاز سيانە: عيلمی أبو حنيفة و تەفسيری الكلبي و مەغازی محمد بن إسحاق.** [تاريخ بغداد : 475/15]

ووتم: الحسن بن محمد الدربندي زەعيفە، علي بن الحسن بن عبدالرحيم الكندي مەجهولە، عبدالله بن محمد بن عمر الأديب و يعقوب بن إبراهيم بن أبي خيران حاڵيانم بۆ دەرنەکەوت.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الصيمري أخبرنا عمر بن إبراهيم حدثنا مكرم بن أحمد حدثنا أحمد بن عطية ووتى: **بيستم يحيى بن معين دەيووت: قيرائەت لەلای من قيرائەتی حمزة-يە، فيقهيش فيقهی أبو حنيفة-يە، بە خەڵکی گەيشتووم لەسەر ئەوە بوونە.** [تاريخ بغداد : 475/15]

ووتم: (أحمد بن عطية) أحمد بن الصلت-ە درۆزنە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الخلال أخبرنا الحريري أن النخعي حدثهم حدثنا إبراهيم بن مخلد حدثنا محمد

بن سهل قال حدثني محمد بن هانئ ووتی: **بیستم جعفر بن الربيع دەیووت: لای أبو حنيفة مامەوە پێنج ساڵ، کەسم نەدیوە بێدەنگی درێژتربێ لەو، کاتێک پرسیاری شتێکی فیقهی لێدەکرا دەکرایەوە عیلمی لەبەر دەڕۆیشت وەک دۆڵ.** [تاريخ بغداد : 476/15]

ووتم: إبراهيم بن مخلد البلخي پێشتر باسمان کرد مەجهولە، محمد بن سهل و محمد بن هانئ بۆم دەرنەکەوتن کێن.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الصيمري قال قرأنا على الحسين بن هارون عن ابن سعيد قال حدثنا عبدالله بن أحمد بن بهلول قال هذا كتاب جدي إسماعيل بن حماد فقرأت فيه حدثني سعيد بن سويد القرشي ووتی: **بیستم إبراهيم بن عكرمة المخزومي دەیووت: کەسم نەبینیوە بە وەرعتر و فەقیهتر بێ لە أبو حنيفة.** [تاريخ بغداد : 476/15]

ووتم: (ابن سعيد) ابن عقدة-یە تۆمەتبارە بە درۆ، عبدالله بن أحمد بن بهلول نەمدۆزیيەوە گەر عبدالله بن محمد بن بهلول بێت ئەوا درۆزنە، إسماعيل بن حماد نەوەی أبو حنيفة زەعیفە، سعيد بن سويد القرشي حاڵی دیار نیە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني أبو القاسم الأزهري حدثنا عبدالرحمن بن عمر الخلال حدثنا محمد بن أحمد بن يعقوب حدثنا جدي ووتی: **هەندێک لە هاوەڵانمان چەند دێرە شیعرێکی ابن المبارك-یان بۆ خوێندمەوە کە مەدحی أبو حنيفة-ی پێدەکات:**

**رأيت أبا حنيفة كل يـــــوم *** يزيد نبالة ويزيد خيــــــرا**

**وينطق بالصواب ويصطفيه *** إذا ما قال أهل الجور جورا**

**يقايس من يقايسه بلـــــب *** فمن ذا يجعلون له نظيـــرا**

**كفانا فقد حماد وكـــانت *** مصيبتنا به أمرا كبيـــــرا**

**فرد شماتة الأعداء عنـــــا *** وأبدى بعده علما كثيـــــرا**

**رأيت أبا حنيفة حين يؤتــى *** ويطلب علمه بحرا غزيــــرا**

**إذا ما المشكلات تدافعتهـــا *** رجال العلم كان بها بصيـــرا**

[تاريخ بغداد : 479/15]

ووتم: يعقوب بن شيبة السدوسي دەڵێ: هەندێک لە هاوەڵانمان ئەم دێڕە شيعرەيان پێ ووتووم، ديار نيە ئەم هاوەڵانەی كێن و حاڵيان چۆنە، وە ئايا بە ابن المبارك گەيشتوون ئەم هاوەڵانەی ؟ لە دەمی ابن المبارك ئەم شيعرەيان بيستووە ؟ بۆيە ڕيوايەتەكە زەعيفە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الجوهري أخبرنا محمد بن عمران المرزباني حدثنا عبدالواحد بن محمد الخصيبي حدثني أبو خازم القاضي قال حدثني شعيب بن أيوب الصريفيني ووتی: **بيستم الحسن بن زياد اللؤلؤي دەيووت: بيستم أبو حنيفة دەيووت: ئەم ووتانەی ئێمە ڕەئيە، وە ئەمە باشترين شتە كە بەپێی توانا پێی گەيشتووين، هەركەسێک لە ووتەكەی ئێمە باشترمان بۆ بهێنێ ئەوا ووتەكەی ئەو نزيكترە لە صەواب.** [تاريخ بغداد : 481/15]

ووتم: الحسن بن زياد اللؤلؤي پێشتر باسمان كرد تۆمەتبارە بە درۆ.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا محمد بن أحمد بن رزق حدثنا أحمد بن علي بن عمر بن حبيش الرازي قال سمعت محمد بن أحمد بن عصام يقول سمعت محمد بن سعد العوفي يقول سمعت يحيى بن معين دەيووت: **بيستم يحيى القطان دەيووت: والله لەگەڵ أبو حنيفة دانيشتين و فەرموودەمان لێ بيست، والله من كە سەيرم دەكرد لە دەم و چاوی دەمزانی كە تەقوای الله عز وجل-ی هەيە.**

[تاريخ بغداد : 482/15]

ووتم: محمد بن أحمد بن عصام نەمدۆزييە كەس بەم ناوە بوونی هەبێ لەوانەيە هەڵە كرابێ لە ناوەكەی أحمد بن محمد بن عصام بێ والله أعلم، گەر ئەويش بێت ئەوا جەرح و تەعديلی بۆ نەكراوە، هەروەها محمد بن سعد الكوفي الخطيب سەرەڕای تۆزێک شليەتی لە تەوسيق كردندا بە زەعيفی داناوە، بەڵام الدارقطني دەڵێ: (لا بأس به) ئەگەرچی الدارقطني ئيمامە لە عيلمی العلل بەڵام شاراوە نيە لەلای ئەهلی عيلم كە تۆزێک شليەتی هەيە لە تەوسيق كردندا، ئەمەش مانای ئەوە نيە تەوسيق كردنی سەنگی نەبێ بەڵام لە حاڵێكی ئاوادا كە تەنها خۆی كەسێک تەوسيق دەكات يان زانای تر موخالفی ئەويان كردووە پێويستە زياتر بە ووردی سەيری حاڵی ڕاوييەكە بكرێ،

با بڵێین محمد بن أحمد بن عصام و محمد بن سعد هەردووکیان سیقەن، ئایا ئەم ووتەیەی یحیی القطان ووتەی زاناکانی بەشی یەکەم دەسڕێتەوە ؟!

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الصيرمي قال قرأنا على الحسين بن هارون عن أبي العباس ابن سعيد قال حدثنا إبراهيم بن الوليد حدثنا محمد بن إسحاق البلخي ووتی: **بیستم الحسن بن محمد الليثي دەیووت: چووم بۆ کوفە پرسیاری عابدترین کەسی شارەکەم کرد، منیان برد بۆلای أبو حنیفة، پاشان بە پیری چووم بۆ کوفە پرسیاری فەقیهترین کەسی شارەکەم کرد، منیان برد بۆلای أبو حنیفة.**
**[تاريخ بغداد : 482/15]**
ووتم: (أبو العباس ابن سعيد) ابن عقدة-یە ئەگەرچی حافزە بەڵام تۆمەتبارە بە درۆ.
محمد بن إسحاق البلخي زەعیفە.

الخطيب 21 ڕیوایەتی هێناوە دەربارەی زۆری شەونوێژی أبو حنیفة کە تەنها 5 دانەیان صەحیحن ئەوانی تر زەعیفن، گەر هەمووشی صەحیح بێت کارمان بەم جۆرە ڕیوایەتانە نیە، چونکە ئەوەی عەقیدەی پاک بێت بەرزی دەکەینەوە و کارمان بەوە نیە شەونوێژی هەبووە یان نا، ئەوەشی عەقیدەی پاک نەبێ نزمی دەکەینەوە و کارمان بەوە نیە شەونوێژی هەبووە یان نا، بەڵام پێم خۆشە بە کورتی ئاماژە بەوە بدەم کە ڕیوایەتەکانی 40 ساڵ بەردەوام شەونوێژ کردن و هیچ نەخەوتن لە شەودا و خەتم کردنی قورئان لە یەک ڕکعەتدا ئەمانە هەمووی درۆ و زەعیفن.
بڕوانە [تاريخ بغداد : 489-482/15]

**الخطيب** دەڵێ: قال النخعي حدثنا سليمان بن الربيع حدثنا حبان بن موسى ووتی: **بیستم عبدالله بن المبارك دەیووت: چووم بۆ کوفە، پرسیاری بە وەرعترین کەسی شارەکەم کرد، ووتیان: أبو حنیفة-یە. النخعي دەڵێ: سليمان ووتی: بیستم مكي بن إبراهيم دەیووت: لەگەڵ کوفییەکان دانیشتم کەسم نەدی لەوان لە أبو حنیفة بە وەرعتر بێ. [تاريخ بغداد : 489/15]**
ووتم: سليمان بن الربيع النهدي زەعیفە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني التنوخي حدثني أبي حدثنا محمد بن حمدان حدثنا أحمد بن الصلت الحماني قال سمعت مليح بن وكيع دەيووت: **بيستم باوكم دەيووت: والله أبو حنيفة زۆر ئەمانەت پارێز بوو، الله لە دڵی ئەودا زۆر گەورە بوو، وە ڕەزامەندی الله-ی پێشی هەموو شتێک دەخست، گەر شمشێری بەرکەوتبوایە لەپێناوی الله ئەوا بەرگەی دەگرت، ڕەحمەت و ڕەزای الله-ی لێبێت وەک ڕازی بوون لە چاکەکاران، بەڕاستی ئەو یەکێک بوو لەوان.** [تاريخ بغداد : 490/15]

ووتم: أحمد بن الصلت درۆزنە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الحسن بن أبي بكر أخبرنا محمد بن أحمد بن الحسن الصواف حدثنا محمود بن محمد المروزي قال سمعت إبراهيم بن عبدالله الخلال ذكروا له عن حامد بن آدم ووتی: **بيستم عبدالله بن المبارك دەيووت: کەسم نەدیوە بە وەرعتر بێ لە أبو حنيفة. إبراهيم بن عبدالله الخلال دەڵێ: پێم باشە بچم بۆلای حامد تا ئەم ڕیوایەتەی لێوە ببیستم.** [تاريخ بغداد : 491/15]

ووتم: ڕاوییەکەی نێوان إبراهيم و حامد نادیارە، وە حامد بن آدم درۆزنە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الحسن أخبرنا ابن الصواف حدثنا محمود بن محمد المروزي قال سمعت حامد بن آدم دەيووت: **بيستم عبدالله بن المبارك دەيووت: کەسم نەدیوە بە وەرعتر بێ لە أبو حنيفة، بە قامچی و پارە تاقی کرایەوە.** [تاريخ بغداد : 491/15]

ووتم: حامد بن آدم درۆزنە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني أبو بشر الوكيل وأبو الفتح الضبي قالا حدثنا عمر بن أحمد الواعظ حدثنا مكرم بن أحمد حدثنا أحمد بن محمد الحماني حدثنا عاصم بن علي ووتی: **بيستم قيس بن الربيع دەيووت: أبو حنيفة پیاوێکی خاوەن وەرع بوو فەقیهـ بوو حەسودی پێ دەبردرا، زۆر چاکەکار بوو بۆ ئەو کەسانەی کە پەنایان بۆی دەبرد، زۆر چاکەی هەبوو بەسەر براکانیدا.**

**وە بيستم قيس دەيووت: النعمان بن ثابت یەکێک بوو لە پیاوە عاقڵەکان.** [تاريخ بغداد : 492/15]

ووتم: (أحمد بن محمد الحماني) أحمد بن الصلت-ە درۆزنە.

**الخطيب** دەڵێ: قال مكرم حدثنا أحمد بن عطية حدثنا الحسن بن الربيع ووتی: **قيس بن الربيع له أبو حنيفة-ەوە بۆی دەگێڕامەوە كە كاڵای دەنارد بۆ بەغداد كەل و پەلی پێ دەكڕی و دەیگەڕاندەوە بۆ كوفە، قازانجی ساڵێكی لەلای خۆی كۆدەكردەوە، پێداویستی وقوت وجل و بەرگ وهەموو پێداویستی زانا فەرموودەناسەكانی دەكڕی، پاشان ئەو پارەیەی كە دەمایەوە لە قازانجەكە بەوانی دەدا و دەیووت: لە پێداویستیەكانی خۆتانی سەرف بكەن و سوپاس هیچ كەسێكیش مەكەن جگە لە الله، من لە ماڵی خۆمم پێنەداون بەڵكو فەزڵی الله-یە بەسەرمەوە كە دەیدەم بە ئێوە، ئەمەش قازانجی كاڵاكانتانە والله ئەمە ڕزقی ئێوە الله لەسەر دەستی من پێتانی دەدات، لە ڕزقی الله دا كەس تونای نیە جگە لەخۆی.** [تاريخ بغداد : 493/15]

ووتم: (أحمد بن عطية) أحمد بن الصلت-ە درۆزنە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني أبو بشر الوكيل وأبو الفتح الضبي قالا حدثنا عمر بن أحمد الواعظ حدثنا مكرم بن أحمد حدثنا أحمد بن عطية قال حدثنا يحيى الحماني ووتی: **بيستم ابن المبارك دەیووت: بە سفيان الثوري-م ووت: ئەی باوكی عبدالله أبو حنيفة چەندە دوورە لە غەیبەت، نەمبیستووە غەیبەتی هیچ دوژمنێكی بكات، سفيان ووتی: أبو حنيفة والله لەوە عاقڵترە شتێك باڵادەست بكات بەسەر چاكەكانیدا و چاكەی لێ ببات.** [تاريخ بغداد : 497/15]

ووتم: (أحمد بن عطية) أحمد بن الصلت-ە درۆزنە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني أبو الوليد الحسن بن محمد الدربندي أخبرنا محمد بن أحمد بن محمد بن سليمان الحافظ ببخاري حدثنا أبو حفص أحمد بن أحيد بن حمدان حدثنا علي بن موسى القمي قال سمعت محمد بن شجاع دەیووت: **بيستم علي بن عاصم دەیووت: گەر عەقڵی أبو حنيفة بكێشرێ بەرامبەر بە عەقڵی نیوەی خەڵكی سەر زەوی ئەوا عەقڵی ئەو قورسترە.** [تاريخ بغداد : 497/15]

ووتم: محمد بن شجاع الثلجي درۆزنە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني محمد بن أحمد بن يعقوب أخبرنا محمد بن نعيم الضبي قال سمعت أبا العباس

أحمد بن هارون الفقيه يقول حدثني محمد بن إبراهيم السرخسي قال حدثنا سليمان بن الربيع النهدي الكوفي قال سمعت همام بن مسلم دەیووت: **بیستم لەلای خارجة بن مصعب باسی أبو حنيفة كرا، خارجة ووتی: بە هەزار زانا گەیشتم بینیم سیانیان یان چواریان عاقڵن، جا أبو حنيفة-ی لەم سیان و چوارە ناوبرد، وە خارجة بن مصعب ووتی: هەرکەسێک بڕوای بە مسح على الخفين نەبێ یان قسە بە أبو حنيفة بڵێ ئەوا عەقڵی ناتەواوە.** [تاريخ بغداد : 497/15]

ووتم: سليمان بن الربيع النهدي زەعیفە، همام بن مسلم مەتروکە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الخلال أخبرنا الحريري أن النخعي حدثهم قال حدثنا محمد بن علي بن عفان حدثنا محمد بن عبدالملك الدقيقي ووتی: **بیستم يزيد بن هارون دەیووت: بە خەڵکی گەیشتم کەسم نەبینی عاقڵتر و چاکتر و بە وەرعتر بێ لە أبو حنيفة.** [تاريخ بغداد : 497/15]

ووتم: ڕواڵەتی سەنەدەکەی صەحیحە، النخعي کەسێکی حەنەفی مەزهەبە لە بەشی یەکەمدا باسی ڕیوایەتە شازەکانیمان کرد.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الخلال أخبرنا الحريري أن النخعي حدثهم قال حدثنا أبو صالح البختري بن محمد حدثنا يعقوب بن شيبة قال حدثني سليمان بن منصور قال حدثني **حجر بن عبدالجبار الحضرمي ووتی: لە مزگەوتەکەی ئێمەدا چیرۆک خوان هەبوو پێیان دەووت (زرعة) جا ناوی مزگەوتەکە درابووە پاڵی لەکاتێکدا مزگەوتی الحضرمي-ەکان بوو، جا دایکی أبو حنيفة ویستی فەتوا وەرگرێ لە شتێکدا أبو حنيفة-ش فەتوای بۆدا قبوڵی نەکرد، ووتی: قبوڵی ناکەم تەنها فەتوای زرعة-ی چیرۆک خوان نەبێ، أبو حنيفة-ش دایکی هێنا بۆلای زرعة، ووتی: ئەمە دایکمە پرسیاری لێت هەیە لەم بابەتەدا، ئەویش ووتی: تۆ لە من زاناتر و فەقیهتری تۆ فەتوای بۆ بدە، أبو حنيفة ووتی: فەتوام بۆداوە بەم شێوەیە، زرعة ووتی: فەتواکە بەم شێوەیە کە أبو حنيفة ووتی، ئینجا دایکی ڕازی بوو ڕۆیشت.** [تاريخ بغداد : 501/15]

ووتم: سليمان بن مصور بۆم دەرنەکەوت کێیە، حجر بن عبدالجبار تەنها ابن حبان تەوسیقی کردووە، ابن حبان-یش بەناوبانگە بە تەوسیق کردنی مەجهولەکان وەک پێشتر باسمان کرد.

**الخطيب** دەڵێ: قال النخعي حدثنا محمد بن محمود الصيدناني قال حدثني محمد بن شجاع ووتی: **بیستم الحسن بن زياد دەیووت: دایکی أبو حنيفة سوێندی خوارد پاشان شکاندی، جا داوای فەتوای لە أبو حنيفة کرد ئەویش فەتوای بۆدا، پێی ڕازی نەبوو، ووتی: ڕازی نابم تەنها بە فەتوای زرعة-ی چیرۆک خوان نەبێ، أبو حنيفة-ش دایکی هێنا بۆلای زرعة، دایکیشی پرسیاری لێکرد، زرعة ووتی: من فەتوات بۆ بدەم لە کاتێکدا فەقیهی کوفە لەگەڵت دایە ؟! أبو حنيفة ووتی: بەم شێوەیە فەتوای بۆ بدە، ئەویش فەتوای بۆدا، ئینجا دایکی ڕازی بوو.** [تاريخ بغداد : 501/15]
ووتم: محمد بن شجاع درۆزنە، الحسن بن زياد تۆمەتبارە بە درۆ.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرني أبو بشر محمد بن عمر الوكيل و أبو الفتح عبدالكريم بن محمد الضبي قالا حدثنا عمر بن أحمد الواعظ حدثنا مكرم بن أحمد حدثنا أحمد بن عطية حدثنا الحماني ووتی: **بیستم ابن المبارك دەیووت: بینیم الحسن بن عمارة ڕێشمەی ئەو ئاژەڵەی گرتبوو کە أبو حنيفة لەسەری بوو، وە دەیووت: والله بە کەس نەگەیشتوون قسەی کردبێ لە فیقهدا بەلیغتر و ئارامگرتر و وەڵام خێراتر بێ لە تۆ، تۆ گەورەی ئەو کەسانەی کە لە فیقهدا قسەیان کردووە لەسەردەمی خۆتدا بەبێ ڕکابەر، وە قسەشت پێ ناڵێن تەنها لەحەسودی نەبێ.** [تاريخ بغداد : 501/15]
ووتم: (أحمد بن عطية) أحمد بن الصلت-ە درۆزنە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا علي بن القاسم البصري الشاهد حدثنا علي بن إسحاق المادرائي قال ذكر أبو داود يعني السجستاني ولم أسمعه منه عن نصر بن علي ووتی: **بیستم ابن داود دەیووت: خەڵکی دەربارەی أبو حنيفة حەسود و جاهیلن، وە باشترین حاڵیان لەلای من جاهیلەکەیە.** [تاريخ بغداد : 502/15]
ووتم: علي بن إسحاق المادرائي خۆی دانی پێدانا کە لە أبو داود-ی نەبیستووە، واتا پچڕان هەیە لە سەنەدەکەدا، ابن داود کە خاوەنی ووتەکەیە عبدالله بن داود الخريبي-ە پێشتر باسمان کرد.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا محمد بن الحسن بن أحمد الأهوازي حدثنا أبو بكر محمد بن إسحاق بن إبراهيم القاضي بالأهواز قال حدثني محمد بن محمد بن عزرة حدثنا أبو الربيع الحارثي ووتی: **بیستم عبدالله**

**بن داود دەیووت: خەڵکی دەربارەی أبو حنیفة دوو جۆرن: کەسێک جاهیلە بە حاڵی و کەسێکیش حەسودی پێ دەبات.** [تاریخ بغداد : 502/15]

ووتم: الأهوازي شێخەکەی الخطیب تۆمەتبارە بە درۆ.

***الخطیب*** دەڵێ: أخبرنا الأهوازي حدثنا محمد بن إسحاق القاضي حدثنا محمود بن محمد الواسطي قال حدثنا سفیان بن وکیع ووتی: **بیستم باوکم دەیووت: چوومە لای أبو حنیفة بینیم سەری نزم کردووە بیر دەکاتەوە، پێی ووتم: لەکوێوە دێی ؟ ووتم: لەلای شریك، سەری بەرز کردەوە ئەم شیعرەی ووت:**

**إن یحسدوني فإني غیر لائمهم *** قبلي من الناس أهل الفضل قد حسدوا**

**فدام لي ولهم ما بي وما بهـــم *** ومات أکثرنا غیظا بما یجـــــــــــــد**

**واتا: گەر حەسودیم پێ دەبەن ئەوا من لۆمەیان ناکەم، لە پێش منیش خەڵکی لە ئەهلی فەزل حەسودیان پێ براوە، جا بۆ منیش و بۆ ئەوانیش بەردەوام بوو من چیم تێدایە و ئەوان چیان تێدایە، وە زۆربەمان مردین لە داخی ئەو حەسودیەی هەمانە لە دڵدا.**

**وکیع دەڵێ: وابزانم قسەیەکی پێگەیشتبوو لە شریك.** [تاریخ بغداد : 502/15]

ووتم: الأهوازي تۆمەتبارە بە درۆ، سفیان بن وکیع زەعیفە.

***الخطیب*** دەڵێ: أخبرنا أحمد بن علي بن الحسین التوزي قال حدثنا الحسن بن الحسین بن حمکان الفقیه الشافعي قال سمعت أبا نصر أحمد بن نصر البخاري یقول سمعت أبا عبدالله الزعفراني دەیووت: **لەلای محمد بن الحسن باسی حەسودی بردنی خەڵک کرا بە أبو حنیفة، ئەویش ووتی:**

**محسدون وشر الناس منزلة *** من عاش في الناس یوما غیر محسود**

**واتا: حەسودی پێ براوان ! وە خراپترین پلەی خەڵکیش ئەوکەسەیە کە لەناو خەڵکیدا ڕۆژێک بژی وکەسیش حەسودی پێ نەبات.** [تاریخ بغداد : 503/15]

ووتم: الحسن بن الحسین بن حمکان زەعیفە، وە پچڕانیش هەیە لەنێوان أبو عبدالله الزعفراني و محمد بن الحسن، وە محمد قوتابی أبو حنیفة بووە چاوەڕوانکراوە زۆر لەوەش زیاتر مەدحی بکات.

**الخطيب** دەڵێ: حدثنا أحمد بن علي البادا أخبرنا أحمد بن إبراهيم بن شاذان حدثنا محمد بن الحسين بن حميد بن الربيع حدثنا سليمان بن الربيع بن هشام النهدي قال سمعت الحارث بن إدريس دەیووت: **أبو وهب العابد ووتی: کەم کەس هەیە باوەڕی بە مسح على الخفين نەبێ یان قسە بە أبو حنيفة بڵێ ئیللا عەقڵی ناتەواوە.** [تاريخ بغداد : 503/15]

ووتم: سليمان بن الربيع النهدي زەعیفە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا التنوخي قال حدثني أبي قال حدثنا محمد بن حمدان بن الصباح قال حدثنا أحمد بن الصلت الحماني ووتی: **بیستم پرسیارلە يحيى بن معين کرا دەربارەی أبو حنيفة ئایا سیقەیە لە فەرمووددا ؟ ووتی: بەڵێ سیقەیە سیقەیە، والله لەوە بە وەرعترە کە درۆ بکات، وە قەدری لەوە گەورەترە کە درۆ بکات.** [تاريخ بغداد : 581/15]

ووتم: أحمد بن الصلت درۆزنە.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا الصيمري قال أخبرنا عمر بن إبراهيم المقرئ قال حدثنا مكرم بن أحمد قال حدثنا أحمد بن عطية ووتی: **پرسیارکرا لە يحيى بن معين ئایا سفيان ڕیوایەتی کردووە لە أبو حنيفة؟ ووتی: بەڵێ، أبو حنيفة سیقە و صدوق بوو لە فەرموودە و فیقهدا، ئەمین بوو لەسەر دینی الله.** [تاريخ بغداد : 581/15]

ووتم: أحمد بن عطية (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الخطيب** دوای هێنانی ڕیوایەتەكانی مەدحکردنی أبو حنيفة لە کۆتاییدا دەڵێ: **ڕیوایەتمان هێنا لە أيوب السختياني و سفيان الثوري و سفيان بن عيينة و أبو بكر بن عياش و جگە لەوانیش لە پێشەوایان ڕیوایەتێکی زۆر کە مەدح و ستایشی أبو حنيفة لەخۆ دەگرێت، وە ئەوەی صەوابە لەلایەن نەقلکەرانی فەرموودە لە پێشەوایانی المتقدمين و ئەوانەشی کە ناومان هێنان دەربارەی أبو حنيفة پێچەوانەی ئەم ووتانەیە، وە ووتەكانیان دەربارەی أبو حنيفة زۆرە بەهۆی شتی ناشرینەوە کە لێیەوە گێڕدراوتەوە هەندێکیان پەیوەستە بە أصولی دین و هەندێکیشی بە فروع.**

وە ئێمەش باسیان دەکەین بە ویستی اللە. [تاريخ بغداد : 504/15]

# ڕیوایەتەکانی کتێبی (فضائل أبي حنيفة)

لە سەرەتای بەشی دووەم باسی ئەم کتێبە و حاڵی نەوە و باوک و باپیرەکەمان کرد کە هەر سێکیان حاڵیان نادیارە بەڵکو نەوەکە لەسەر مەزهەبی ڕافیزە زندیقەکان حوکمی کردووە کاتێک بۆتە قازی، لەوانەیە کەسێک بپرسێ مادام سێ ڕاوی مەجهول لە سەنەدی ڕیوایەتەکانی ئەم کتێبە هەیە بۆچی ڕیوایەتەکان نەقل دەکەیت لەکاتێکدا هەر لە سەرەتاوە زانیمان ئەم کتێبە پشتی پێ نابەسترێ ؟ لەبەر ئەوە ڕیوایەتەکانی ئەم کتێبە دەهێنم چونکە خەڵکی بە گشتی تەنها مەتنی ڕیوایەتەکان دەبینێت و بەڵگەی پێ دەهێنێتەوە ئاگاداری ئەوە نیە کە حاڵی سەنەدەکە چۆنە، جا بۆیە ڕیوایەتەکانی ئەم کتێبە دەهێنم تا بزانن ئەوانەی لەم کتێبەدا هاتوون یان درۆن یان زەعیفن، ئینجا وانەبێ کە ڕاوییەکانی تر هەمووی سیقە بن تەنها کێشە لەم نەوە و باوک و باپیرەیە بێت بەڵکو زۆربەی سەنەدەکان درۆن یان زەعیفن بەهۆی ڕاوی ترەوە جگە لەم سیانە، مەگەر تەنها لە دوو بۆ سێ سەنەد هەموو ڕاوییەکانی سیقە بن ئەوکات بەم سیانە تەزعیفی دەکەین، جا بۆیە هەر ڕیوایەتێکی ئەم کتێبە کە دەخوێنیتەوە پێشەکی ئەم شتە بخەرە مێشکتەوە کە ئەم سەنەدە سێ ڕاوی مەجهولی تێدایە، چونکە من باسی حاڵی ئەم سیانە ناکەم تەنها باسی ڕاوییەکانی تر دەکەم، وە لەم کتێبەدا کە 505 ڕیوایەت هاتووە دەربارەی أبو حنیفة، 256 ڕیوایەتی تەنها تایبەتە بەو کەسانەی کە فەرموودەیان لە أبو حنیفة ڕیوایەت کردووە یان پرسیاری فیقهیان لێی کردووە بەو مەبەستە هێناویەتی کە أبو حنیفة قوتابی زۆر بووە، وە ژمارەیەکی زۆری باسی ساڵی لەدایکبوون و مردنی دەکات، هەروەها ساڵی وەفاتکردنی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ تا ئەوەی پێ بسەلمێنێت کە أبو حنیفة تابعی بووە کە ئەمەش نەچەسپاوە خیلاف هەیە أنس-ی دیوە یان نا ئەگینا بۆ فەرموودە بیستن لە هیچ هاوەڵێک فەرموودەی نەبیستووە، الدارقطني دەڵێ: نە هیچ هاوەڵێکی بینیوە و نە لە هیچ هاوەڵێک فەرموودەی بیستووە، لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کە أبو حنیفة دەڵێ بە منداڵی أنس-م دیوە بەڵام خیلاف لەسەر ڕاوییەکی سەنەدەکە هەیە کە حاڵی دیار نیە. بەهەرحاڵ تابعیش بێت گرنگ نیە گەرکۆنی سەردەم پێوەربێ ئەوا جەعد و جەهم لەو کۆنترن، هەروەها ژمارەیەک ڕیوایەتی

زۆر دەربارەی شێوە و جل و بەرگ و خۆڕەوشت و ئەمانەت پارێزی و چاكەكردنی لەگەڵ دایكی و خێر و چاكەكاری و هاوشێوەی ئەمانە هاتووە كە هیچ كام لەمانەم نەقل نەكردووە چونكە هیچ لە بابەتەكە ناگۆڕێ، وە ژمارەیەك ڕیوایەتیش هاتووە كە لە بەرژەوەندی أبو حنيفة-یە بەڵام لە كتێبەكەی الخطيب یان ابن عبدالبر هاتووە بۆیە دووبارەم نەكردۆتەوە، چونكە گەر لەم دوو كتێبە بە صەحیحی هاتبێ پێویست ناكات دووبارەی بكەمەوە، گەر لەم دوو كتێبەش بە زەعیفی هاتبێ ئەوا لەم كتێبەش هەر بە زەعیفی هاتووە بۆیە دووبارەم نەكردۆتەوە.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد أبو بشر قال حدثني محمد بن حماد بن المبارك قال حدثني محمد بن سليمان قال حدثنا **خالد بن يزيد الزيات ووتی: أبو حنيفة گەر قسەكەی ڕاستیش بوایە ئەوا هەرگیز سوێندی نەدەخوارد بە الله عز وجل ئەگەرچی لەت كرابوایە، جا بردیان بۆلای هەندێك كار بەدەستی كوفە ووتیان أبو حنيفة دەڵێ قوڕئان مەخلوقە، گەر ئینكاری لێكرد سوێندی بدە، چونكە دەیانزانی ئەو سوێند ناخوات گەر سوێندیش بخوات ئەوا ڕاستگۆیە، جا والی أبو حنيفة-ی هێنا و خەڵكی بۆ كۆكردەوە و پێی ووت: ئەمانە چی دەڵێن دەربارەی تۆ ؟ أبو حنيفة ووتی: چی دەڵێن ؟ ووتی: دەڵێن تۆ دەڵێی قوڕئان مەخلوقە ! أبو حنيفة ووتی: إن شاء الله ڕاستی دەڵێم، كەسم نەدیوە وابڵێ و مشتومڕ بكات لەبارەیەوە، ئەمە ووتەیەكە دڵ پێی تەنگ دەبێ، والی ووتی: سوێند دەخۆی كە وات نەووتوە ؟ أبو حنيفة ووتی: الله تبارك وتعالى دەزانێت كە من پێچەوانەی ئەوەم كە ئەوان باسی دەكەن، والی ووتی: سوێند دەخۆی كە وات نەووتوە ؟ أبو حنيفة ووتی: الله لەلای من گەورەترە لەوەی كە سوێندی پێ بخۆم بە ڕاستگۆیی یان بە درۆ، والی پێی ووت: سزات دەدەم گەر سوێند نەخۆی، أبو حنيفة ووتی: بیكە، والی فەرمانی كرد جلەكانی لەبەر داكەنن، جا كاتێك لاوازی جەستە و پیری أبو حنيفة-ی بینی پێی ووت: ئایا تەوبە دەكەیت ؟ أبو حنيفة ووتی: ئەو شتەی بانگەشەی دەكەن دەربارەی من هەرگیز نەم ووتوە و عەقیدەم وانەبووە، پێی ووت: تەوبە بكە، أبو حنيفة ووتی: یا الله تەوبەمان لێ قبوڵ بكە. خالد بن يزيد الزيات دەڵێ: ئینجا ووترا: أبو حنيفة استتابە كرا، أبو**

**حنيفة استتابە كرا.** [فضائل أبي حنيفة : 80]

ووتم: محمد بن حماد بن المبارك الهاشمي مەجهولە.

مەبەست لەهێنانی ئەم ڕیوایەتە ئەوەیە گوایە درۆیە أبو حنيفة استتابە نەكراوە بەسەر هاتەكە بەم شێوەیە بووە نەیارانی أبو حنيفة كردوویانە بە استتابە، بەڵام لە بەشی یەكەمدا بە چەندەها ڕیوایەت و ووتە ئەم ڕاستیەمان سەلماند، پاشان ئەم ڕیوایەتە گەر بڵێم بۆنی درۆی لێدێت ئەوا وانازانم زیادەڕەویم كرد بێت، چونكە پێغەمبەرﷺ سوێندی خواردووە خۆ أبو حنيفة لە پێغەمبەر بە تەقواتر و خاوەن وەرعتر نیە تا بڵێ سوێند ناخۆم هەرگیز، ابن القيم دەڵێ: پێغەمبەرﷺ لە 80 فەرموودەدا سوێندی خواردووە، پاشان ئەم كارەی تەواو پێچەوانەی فەرموودەیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (البينة على المدعي واليمين على من أنكر) واتا: ئەو كەسەی بانگەشەی شتێك دەكات دەبێ بەڵگەی هەبێت ئەو كەسەش كە ئینكاری لێ دەكات دەبێ سوێند بخوات، لێرەدا أبو حنيفة شایەتی لەسەر دراوە كە وتوویەتی قوڕئان مەخلوقە ئەویش ئینكاری لەوە دەكات كەواتە بە دەقی فەرموودە لەسەریەتی سوێند بخوات.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثني محمد بن حماد قال حدثنا علي بن الحسن بن شقيق ووتی: بیستم باوكم دەیووت: **پرسیارم لە عبدالله بن المبارك كرد، ووتم: ئەی باوكی عبدالرحمن ئایا أبو حنيفة استتابە كراوە ؟ بێدەنگ بوو، پاشان دوای مانگێك گەڕامەوە بۆ پرسیارلێكردنی، ابن المبارك پێی ووتم: پەنا دەگرم بە الله لە دژایەتی زاناكان، پەنا دەگرم بە الله لە دژایەتی ئەو كەسانەی دراونەتە پاڵ سیرە.**

[فضائل أبي حنيفة : 81]

ووتم: محمد بن حماد بن المبارك باسمان كرد مەجهولە، باوكی علي واتا الحسن بن شقيق نەمبینی جەرح و تەعدیلی بۆ كرابێ جگە لەوەی ابن حبان لە كتێبی (الثقات) ناوی هێناوە، پێشتر باسی ئەم جۆرە ڕاویانەمان كرد كە ابن حبان هیچ قسەی لەسەر نەكردوون.

مەبەست لەهێنانی ئەم ڕیوایەتەش واتا زاناكان بە گشتی و زاناكانی سیرە بە تایبەتی دژایەتیكەری

خەڵک بوونە أبو حنيفة-ش یەکێکە لەوانەی کە دژایەتی کراوە بە ناحەق، بۆیە ابن المبارك پەنا دەگرێت بە الله لێیان، وا گومان دەبەم لە زانایانی سیرەش مەبەستی الأوزاعي و قوتابیەکەی بێت الفزاري، سەرەڕای زەعیفی ڕیوایەتەکە باسمان کرد کە ابن المبارك لەکۆتایی تەمەنیدا پەشیمان بۆتەوە لە نزیکبوونەوە و مەدحکردنی أبو حنيفة.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثني محمد بن المبارك قال حدثنا محمد بن سليمان قال حدثني محمد بن الحسن الهمداني ووتی: **پرسیارکرا لە عبدالسلام بن حرب الملائي دەربارەی أبو حنيفة، ئایا استتابە کرا ؟ ووتی: الله لێت خۆشبێ براکەم، داوای لێخۆشبوون بکە لە الله لەم ووتەیە، ئەم شتەیان بڵاو کردەوە تا أبو حنيفة-ی پێ ناشرین بکەن.** [فضائل أبي حنيفة : 82]

ووتم: محمد بن حماد بن المبارك مەجهولە، محمد بن الحسن الهمداني زەعیفە بەڵکو تۆمەتباریش کراوە بە درۆ لای هەندێک لە زانایان.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال سمعت محمد بن حماد يقول سمعت الحسن بن إسماعيل بن مجالد قال سمعت وكيع بن الجراح دەیووت: **بیستم مسعر بن كدام دەیووت: زانایانی سیرە حەسودیان بە النعمان بن ثابت برد بەهۆی تێگەیشتن و عیلمەکەی، جا ناشرینیان کرد.** [فضائل أبي حنيفة : 83]

ووتم: محمد بن حماد بن المبارك مەجهولە، هەروەها باسمان کرد کە مسعر بن كدام مورجیئە بووە مەیلی هەبووە بەلای أبو حنيفة.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال وجدت في كتابي من حديث الحسن بن حماد سجادة وقد حدثت به عنه قال حدثنا أبو قطن عمرو بن الهيثم ووتی: **ویستم بچم بۆ کوفە بە شعبة-م ووت: نامە بۆ کێ دەنێریت لە کوفە ؟ ووتی: أبو حنيفة و سفيان الثوري، ووتم: بنوسە من بۆیان دەبەم، ئەویش نوسی، منیش گەیشتم بە کوفە پرسیم کامەیان بە تەمەنترن لە أبو حنيفة و**

**سفیان ؟ ووتیان: أبو حنیفة، منیش نامەکەم پێیدا، أبو حنیفة ووتی: براکەم چۆنە أبو بسطام ؟ ووتم: باشە، جا کاتێک نامەکەی خوێندەوە ووتی: ئەوەی لەلای ئێمە بێ بۆ تۆی دەبەخشین، وە ئەوەی لەلای کەسانی تر بێ داوای یارمەتیمان لێبکە یارمەتیت دەدەین، وە چووم بۆلای الثوري نامەکەم پێیدا، هەمان قسەی أبو حنیفة-ی پێ ووتم، پێم ووت: شتێک لە تۆوە ڕیوایەت دەکەن کە دەڵێی أبو حنیفة دوو جار استتابە کراوە لە کوفر، ئایا ئەو کوفرەیە کە دژی ئیمانە ؟ ووتی: کەس پرسیاری لێنەکردووم دەربارەی ئەم بابەتە لەو ڕۆژەوەی باسم کردووە جگە لە تۆ، سەری هێنایە خوارەوە پاشان ووتی: نەخێر ئەو کوفرە نیە کە دژی ئیمانە، بەڵام واصل الشاري (کەسێکە لە خەواریج) هاتە ناوکوفە، ئینجا کۆمەڵێک چوونە لای پێیان ووت: کەسێک هەیە لێرەدا کەسانی خاوەن تاوان تەکفیر ناکات، مەبەستیان أبو حنیفة بوو، ئەویش ناردی بەدوایدا و ئامادە بوو لەبەردەمی، پێی ووت: ئەی پیرە پیاو بیستوومە تۆ خاوەنی تاوان تەکفیر ناکەیت ؟ أبو حنیفة ووتی: ئەمە مەزهەبی منە، ئەویش ووتی: ئەمە کوفرە، گەر تەوبە بکەی لێتی قبوڵ دەکەین، وە ئەگەر تەوبە نەکەی دەتکوژین، أبو حنیفة ووتی: لەچی تەوبە بکەم ؟ ووتی: لەمە، أبو حنیفة ووتی: من تەوبەم کرد لە کوفر، پاشان هاتە دەرەوە، ئینجا کۆمەڵێک لە هاوەڵانی المنصور (خەلیفەی عەباسی) واصل-یان دەرکرد لە کوفە، پاشان دوای ماوەیەک واصل هاتەوە کوفە، هەمان کۆمەڵ هاتنەوە لای ووتیان: ئەو پیاوەی کە تەوبەی کرد گەڕاوەتەوە سەر ووتەکەی خۆی، ئەویش ناردی بەدوایدا و لە بەردەمی ئامادە بوو، ووتی: ئەی پیرە پیاو پێم گەیشتووە کە تۆ گەڕایتەوە سەر ووتەکەی خۆت، أبو حنیفة ووتی: کامە ؟ ووتی: تۆ خاوەنی تاوان تەکفیر ناکەیت، أبو حنیفة ووتی: ئەمە مەزهەبی منە، ووتی: ئەمە لەلای ئێمە کوفرە، گەر تەوبەی لێ بکەی لێتی قبوڵ دەکەین گەر تەوبە نەکەی دەتکوژین، سفیان ووتی: خەواریجەکان کەس ناکوژن تا سێ جار استتابەی نەکەن، أبو حنیفة ووتی: لەچی تەوبە بکەم ؟ ووتی: لە کوفر، أبو حنیفة ووتی: من تەوبەم کرد لە کوفر، سفیان ووتی: ئەمە ئەو کوفرە بوو کە استتابەی پێکرا لەسەری.** [فضائل أبي حنیفة : 84]

ووتم: ابن أبي العوام-ی باپیرە نەگەیشتووە بە الحسن بن حماد سجادة پچڕان هەیە لەنێوانیان، هەروەک المعلمي لە التنكيل ئاماژەی پێداوە، ابن أبي العوام پێشتر باسمان ساڵی 344 ڕیوایەتی

کردووە واتا ئەوکات لە ژیاندا بووە، الله أعلم ساڵی چەند مردووە بۆیە مەحاڵە بەیەکتر بگەن چونکە الحسن بن حماد سجادة ساڵی 241 مردووە.

کاتێک ئەم ڕیوایەتەم وەڕدەگێڕا وا هەستم دەکرد کە سیناریۆیەکی دروستکراو وەردەگێڕم، واتای چی سفيان الثوري بزانێت خەواریج لەسەر شتێکی باطل استتابەیان بە أبو حنيفة کردووە کەچی سفیان ئەم هەلە بقۆزێتەوە لەناو خەڵکیدا بڵێ أبو حنيفة استتابەی پێکراوە لە کوفردا دوو جار! گەر ئەمە ڕاست بێت پەڵەیەکی ڕەشە بەنێوچەوانی سفیان چونکە ڕاستیەکانی گۆڕیوە و خۆڵی کردۆتە چاوی خەڵکەوە حاشا لە سفیان کە کاری ئاوا بکات، وەک ئەوە وایە بڵێم ئیمام علي تەکفیر کراوە ڕوون کردنەوەش نەدەم خەڵک وا تێبگەن ئیمام علي کوفری هەبووە، خۆ دەبێت بڵێم خەواریج تەکفیریان کرد تا خەڵکی بزانن تەکفیرەکە باطلە، پاشان ئەم استتابە کردنەی أبو حنيفة لە کوفر دوو جار هێندە باوە هەر چەند هەوڵی بۆ بدرێت ناتوانرێ ڕەت بکرێتەوە.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثني أحمد بن القاسم البرتي قال حدثني ابن أبي رزمة قال سمعت أبا وهب قال سمعت أبا يحيى ووتی: **بە النضر بن محمد-م ووت: أبو حنيفة بڕوای بە خروج هەبوو بە شمشێر ؟ ووتی: پەنا بە الله.**
[فضائل أبي حنيفة : 85]

ووتم: أبو يحيى نەمزانی کێیە، النضر بن محمد هاوەڵی أبو حنيفة بووە وەک ئەو مورجیئە بووە گەر ئەو نەفی ئەم شتە بکات کەسانی زۆر لەو زاناتر ئیثباتی دەکەن، تەنانەت شێتی أبو حنيفة الكوثري ئینکاری لێ ناکات کە ئەمە مەزهەبی أبو حنيفة بووە خروج کردن لە حاکمی زاڵم.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثني أحمد بن القاسم قال حدثني ابن أبي رزمة عن عبدان ووتی: **بیستم عبدالله بن المبارك دەیووت: کە دەبیستم باسی أبوحنيفة دەکەن بە خراپە دڵم پێی تەنگ دەبێ، وە دەترسم لە توڕەیی الله عز وجل بەسەریاندا.** [فضائل أبي حنيفة : 86]

ووتم: بەسەرهاتی نێوان ابن المبارك و أبو حنيفة زۆرمان باسکرد.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال أبو أحمد إبراهيم بن أحمد الترمذي قال سمعت أبا نصر محمد بن محمد بن سلام البلخي قال سمعت نصير بن يحيى البلخي دەيووت: **بە أحمد بن حنبل-م ووت: ئێوە سەرزەنشتی چ شتێكتان دەكرد لەو پیاوە مەبەستم أبو حنيفة-يە ؟ ووتی: ڕەئی، ووتم: ئەمە مالك بن أنس-ە ئایا بە ڕەئی فەتوا نادات ؟ ووتی: بەڵێ بەڵام ڕەئی أبو حنيفة لە كتێبدا مایەوە، ووتم: ڕەئی مالك بن أنس-یش لە كتێبدا مایەوە، ووتی: أبو حنيفة ڕەئی لە مالك زیاتر بوو، ووتم: ئەی بۆچی قسەتان دەربارەی ئەو نەكرد بە قەدەر خۆی، قسەشتان دەربارەی ئەوی تر نەكرد بە قەدەر خۆی ؟ ئینجا أحمد بێدەنگ بوو.** [فضائل أبي حنيفة : 90]

ووتم: إبراهيم بن أحمد الترمذي نەمدۆزییەوە، محمد بن سلام البلخي و نصير بن يحيى البلخي جەرح و تەعدیلیان بۆ نەكراوە، دوو فەقیهی حەنەفین.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال سمعت أبا محمد القاسم بن جعفر بن محمد البصري المعروف بابن شدويه يحكي عن بعض أصحابه عن **أبي يوسف ووتی: چوومە لای أبو حنيفة پرسیاری بابەتێكم لێكرد ئەویش وەڵامی دامەوە، پێم ووت: بەڵگەت چیە لەم وەڵامەدا ؟ ووتی: ئەمە و ئەوەیە، منیش هەڵسام لەلای، بەلای ابن أبي ليلي و ابن شبرمة تێپەڕیم پرسیاری بابەتەكەم لێكردن، وەڵامێكی تریان دامەوە جیا لە وەڵامەكەی أبو حنيفة، پێم ووتن: بەڵگەتان چیە لەم وەڵامەتاندا ؟ ئەوانیش باسی بەڵگەكانیان كرد، منیش ووتم: كەسێكی تر هەیە وەڵامی بەم شێوەیە و بەڵگەكەشی ئەمە و ئەوەیە، ئەوانیش وەڵامەكە و بەڵگەكەیان بەلاوە جوان بوو ووتیان ئێمەش هەمان شت دەڵێین، ووتم: ئەمە وەڵامی أبو حنيفة بوو، جا وازیان لەو وەڵامە هێنا كە بەلایانەوە جوان بوو، وە دەستیان كرد بە زەمكردنی.** [فضائل أبي حنيفة : 91]

ووتم: ابن شدويه نەمدۆزییەوە، هەروەها ڕاوی نێوان ئەو و أبو يوسف دیار نیە كێیە.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال سمعت يموت بن المزرع بن يموت العبدي دەيووت: **بیستم عمرو بن بحر الجاحظ دەيووت: خەڵكی دەربارەی أبو حنيفة دوو جۆرن: حەسود**

**و جاهیل، حەسودەكە ناتوانێ ئەوە بكات كە أبو حنيفة كردوویەتی، وە جاهیلەكەش نازانێ أبو حنيفة چی دەڵێ.** [فضائل أبي حنيفة : 94]

ووتم: كەسانێک هەن كە مەدحی كەسێک دەكەن خودی مەدحەكە زەمە، كەسێكی وەک الجاحظ كە موعتەزیلەیەكی كافرە قوتابی إبراهيم بن سيار النظام بووە كە ئێستا نەززامیە زندیقەكان دراونەتە پاڵ ناوی ئەم كەسە، هەروەها تۆمەتبارە بە زندیق بوون و نوێژ نەكردن و ڕۆژوو نەگرتن، هەروەها تۆمەتبارە بە درۆ لە فەرموودەدا، وە بێ ئەدەب و زمان پیس و گاڵتەجارە، كەسێكی لەم شێوەیە مەدحت بكات و لێت ڕازی بێت دەبێ تۆ چ جۆرە كەسێک بیت، دواتر كوا نرخی ووتەی الجاحظ ؟

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني أبو بشر الدولابي قال حدثنا محمد بن شجاع قال سمعت محمد بن عبيد الطنافسي دەیووت: **بيستم أبو معاوية الضرير دەیووت: بەردەوام سفيان الثوري پێش دەخرا لەلای ئێمە تا ئەو كاتەی قسەی بە أبو حنيفة ووت، رحمهما الله.**
[فضائل أبي حنيفة : 98]

ووتم: محمد بن شجاع الثلجي درۆزنێكی ناودارە پێشتر باسمان كرد، أبو معاوية مورجیئە بوو گەر ڕاستیش بوایە گرنگ نیە بەلامانەوە ووتەكەی.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد قال حدثني محمد بن حماد قال حدثنا إبراهيم بن سعيد ووتی: بیستم أبا نعيم دەیووت: **كاتێک أبو حنيفة مرد بيستم علي بن صالح بن حي دەیووت: موفتی عیراق ڕۆیشت، فەقیهی ئەهلی عیراق ڕۆیشت.**
[فضائل أبي حنيفة : 104]

ووتم: محمد بن حماد بن المبارك مەجهولە.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثني أحمد بن القاسم البرتي قال حدثني أبو حفص المروزي قال سمعت علي بن الحسن بن شقيق دەیووت: **ابن**

**المبارك ووتی: ووتەی أبو حنيفة لەلای ئێمە وەک ئەثەر وایە گەر ئەثەر نەبێت لە بابەتەکەدا.**
[فضائل أبي حنيفة : 113]

ووتم: أبو حفص المروزي نەمدۆزییەوە، کەسێکی تر هەیە بەناوی أبو حفص المروزي ناسراو بە ابن علك بەڵام لە چینی علي بن الحسن بن شقيق نیە تا بڵێین خۆیەتی چونکە علي 225 مردووە، ابن علك 325 مردووە، واتا 100 دوای مردنی علي ژیاوە ئەی کاتێک ئەم ڕیوایەتەی لە علي بیستووە تەمەنی چەند بووە ؟! بۆیە دوورە کە ئەمە ابن علك بێت.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثني أحمد بن القاسم البرتي قال حدثنا محمد بن عبدالعزيز بن أبي رزمة قال حدثني نعيم بن بكار الفرغاني ووتی: **بیستم أحمد بن حرب النيسابوري دەیووت: أبو حنيفة لەنێو زانایاندا وەک خەلیفە وابوو لەنێو ئەمیرەکاندا.** [فضائل أبي حنيفة : 115]

ووتم: نعيم بن بكار الفرغاني نەمدۆزییەوە، دواتر أحمد بن حرب النيسابوري کەسێکی مورجیئەیە بانگەوازی بۆ ئیرجاء دەکرد وەک ابن حبان باسیکردووە، هەروەها الخطيب دەڵێ: أحمد بن حرب لەلای کەڕرامیەکان زۆر گەورە بوو، کەڕرامیەکان یەکێکن لە گروپەکانی مورجیئە کە ئێستا بوونیان نەماوە، بۆیە ئاساییە مەدحی مورجیئەیەکی وەک خۆی بکات.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني أحمد بن محمد بن سلامة قال حدثني أبو خازم القاضي عبدالحميد بن عبدالعزيز قال حدثنا سعيد بن روح عن **عبدالله بن داود الخريبي: پیاوێک پرسیاری لێکرد ووتی: خەڵکی لە چ شتێک ڕەخنەیان لە أبو حنيفة گرت ؟ ووتی: والله نازانم ڕەخنەیان لێ گرتبێ لە شتێک تەنها ئەوە نەبێ ئەو دەیووت و دەیپێکا، ئەوان دەیانووت و هەڵەیان دەکرد.** [فضائل أبي حنيفة : 120]

ووتم: سعيد بن روح نەمدۆزیەوە.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال سمعت أحمد بن علي بن الحسن بن شعيب

المدائني يقول سمعت إسماعيل بن يحيى المزني دەيووت: **بيستم الشافعي محمد بن إدريس دەيووت: خەڵكی لەسەر أبو حنيفة حيسابن لە فيقهدا.** [فضائل أبي حنيفة : 122]
ووتم: أحمد بن علي بن الحسن لە هەندێک کتێب بە الحسن هاتووە لە هەندێکی بە الحسين.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال وسمعت محمد بن محمد بن الأشعث الكوفي يقول سمعت يونس بن عبدالأعلى دەيووت: **بيستم الشافعي دەيووت: هيچ کەسێک نيە داوای فێربوونی فيقه بکات ئيللا لەسەر أبو حنيفة حيسابە.** [فضائل أبي حنيفة : 123]
ووتم: محمد بن محمد بن الأشعث الكوفي تۆمەتبارە بە درۆ.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثني محمد بن حماد قال حدثنا علي بن الحسن بن شقيق قال سمعت أبي يذكر عن **عبدالله بن المبارك ووتی: پرسيارم لە أبو عبدالله سفيان بن سعيد الثوري کرد ئايا بانگەواز کردنی دوژمن لە ئەمڕۆدا واجبە؟ ووتی: دەزانن لەسەرچی کوشتاريان لەگەڵ دەکرێت، ابن المبارك ووتی: پێم ووت: أبو حنيفة دەربارەی بانگەواز پێت گەيشتووە کەچی دەڵێ، سفيان چاوی لارکردەوە ووتی: شتەکانی ئەوت نوسيوەتەوە ؟ ووتم: بەڵێ، جا سفيان سەری لارکردەوە ئينجا ئاوڕی دايەوە بەلای ڕاست و چەپدا پاشان ووتی: أبو حنيفة زۆر بە توندی زانستی وەردەگرت، بەرگری لە حەرامی الله عز وجل دەکرد کە نابێت حەلال بکرێت، ئەو فەرموودانەی وەردەگرت کە صەحيح بوون بەلايەوە و کەسانی سيقە نەقليان دەکرد، وە دوا کاری پێغەمبەر ﷺ وەردەگرت، وە ئەو شتانەش کە زانايانی کوفە لەسەری بوون، پاشان کەسانێک ناشرينيان کرد، نستغفر الله، نستغفر الله.**
[فضائل أبي حنيفة : 144]

ووتم: محمد بن حماد بن المبارك مەجهولە، هەروەها باوکی علي باسمان کرد، پاشان باوکی علي لەنێوان خۆيی و ابن المبارك پچڕان هەيە لێرەدا هەروەک لە صيغەی ئەداکردنی ديارە دەڵێ: يذكر عن عبدالله بن المبارك، صيغەی تەمريض-ە کە صيغەيەکی زەعيفە.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال وحدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثني محمد بن إبراهيم بن هاشم قال سمعت أبي يقول سمعت وكيع بن الجراح دەیووت: **بيستم أبو حنيفة دەیووت: میز كردن لەناو مزگەوتدا باشترە لە هەندێک قیاس.** [فضائل أبي حنيفة : 147]

ووتم: محمد بن إبراهيم بن هاشم بن مشكان خۆیی و باوكی جەرح و تەعدیلیان بۆ نەكراوە.

مەبەست لەهێنانی ئەم ڕیوایەتەش ئەوەیە كە گوایە خەڵكی دەڵێن أبو حنيفة زیادەڕەوە لە بەكارهێنانی قیاس، ئەوەتا ئەو بەم شێوەیە باسی قیاس دەكات.

ئەم ڕیوایەتە یان دەستكاری كراوە یان بە ماناوە نەقل كراوە وماناكەی گۆڕدراوە، ئەگینا ڕیوایەتەكە لەدژی أبو حنيفة-یە، وە پاشان أصولی أبو حنيفة ڕوونە كە زیادەڕەوی كردووە لە بەكارهێنانی قیاس ئەمە شتێک نیە شاراوە بێت.

**عبدالله** دەڵێ: حدثت عن يزيد بن عبد ربه ووتی: **بيستم وكيع بن الجراح كاتێک هات بۆ لامان لە حمص لەساڵی 193 دەیووت: خۆتان بپارێزن لە ڕەئی أبو حنيفة. من بيستم پێش ئەوەی دەست بداتە قیاس دەیووت: میزكردن لەناو مزگەوتدا باشترە لە هەندێک قیاس.** [السنة : 385]

ووتم: وەک دەبینن ڕیوایەتەكە چۆنە واتا پێش ئەوەی دەست بداتە قیاس وای ووتوە، بەڵام بۆیە ئەم ڕیوایەتەم نەهێنا لە بەشی یەكەم چونكە شێخی عبدالله دیار نیە كێیە، بەڵام بەهەر جۆرێک بێت ئەم سەنەدە پاكترە لەوەی ابن أبي العوام، وە هەروەها الخطيب بە دوو سەنەدی تر هێناویەتی كە صەحیحن.

**الخطيب** دەڵێ: أخبرنا أبو الحسن بن رزقويه حدثنا أحمد بن جعفر بن محمد بن سلم حدثنا أحمد بن علي الأبار، وأخبرنا محمد بن الحسين بن الفضل أخبرنا دعلج أخبرنا الأبار أخبرنا أبو عمار المروزي عن وكيع قال: قال أبو حنيفة، وفي حديث ابن الفضل حدثنا أبو عمار ووتی: بيستم وكيع دەیووت: **بيستم أبو حنيفة دەیووت: میزكردن لەناو مزگەوتدا باشترە لە هەندێک قیاس. وكيع ووتی: ئەمە لەدژیەتی. الخطيب دەڵێ: لە ڕیوایەتی ابن رزقويه ئەمەی زیادكردووە: نەک لە بەرژەوەندی ئەو بێت.**

[الفقيه والمتفقه : 509/1]

ووتم: أبو الحسن بن رزقويه لەم چاپەدا بۆتە أبو الحسين بن رزقويه كە هەڵەيە.
الخطيب بە دوو سەنەد لەڕێگای الأبار-ەوە ئەم ڕیوایەتەی هێناوە كە هەردووكيان صەحيحن، وە سەنەدی دووەم بيستنی تێدايە لەنێوان هەر يەک لە أبو عمار و وكيع و أبو حنيفة، گومان لەسەر سەنەدی يەكەم لا دەبات كە تەصريحدان بە سماعی تێدا نيە لەنێوان ئەم سيانە، مانای ووتەكەی وكيع ئەوەيە كە ئەم ووتەيە لەدژی أبو حنيفة حيسابە نەک لە بەرژەوەندی ئەو حيساب بێت، وەک لە عەرەبی دەووترێ: عليه لا له.

**الخطيب** دەڵێ: كتب إلي عبدالرحمن بن عثمان الدمشقي وحدثني عبدالعزيز بن أبي طاهر عنه قال أخبرنا أبو الميمون عبدالرحمن بن عبدالله بن عمر بن راشد البجلي أخبرنا أبو زرعة قال حدثني يزيد بن عبد ربه ووتی: **بيستم وكيع بن الجراح بە يحيى بن صالح الوحاظي دەووت: ئەی باوكی زكريا خۆت بپارێزە لە ڕەئی، من بيستم أبو حنيفة دەيووت: ميز كردن لەناو مزگەوتدا باشترە لە هەندێک لە قياسەكانيان.** [الفقيه والمتفقه : 1/509-510]
ووتم: سەنەدەكەی صەحيحە لە ڕێگای يزيد بن عبد ربه ڕیوایەت كراوە پشتڕاستی ڕیوایەتەكەی عبدالله دەكاتەوە كە ئەويش لە يزيد بن عبد ربه ڕیوایەتی كردبوو.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثني أحمد بن القاسم البرتي قال حدثنا محمد بن قراد حدثنا يوسف السمتي عن **أبي حنيفة ووتی: چوومە لای أبو جعفر المنصور عيسى بن موسى لەلای بوو، عيسى ئاوڕی لێم دايەوە ووتی: ئەمە زانای دونيايە، پاشان ئاوڕی لێم دايەوە ووتی: ئەی نعمان زانستت لە كێ وەرگرتووە ؟ ووتم: لە عمر بن الخطاب وعلي بن أبي طالب وعبدالله بن مسعود، ووتی: لەوێدا زانست هەيە لەوێدا زانست هەيە.** [فضائل أبي حنيفة : 147]
ووتم: محمد بن قراد و يوسف السمتي هەردووكيان درۆزنن.
مەبەست لەناو هێنانی ئەم هاوەڵانەش واتا لە ڕێگای قوتابيەكانی ئەوان يان قوتابی قوتابيەكانيان، ئەگينا أبو حنيفة هيچ هاوەڵێكی نەديوە و زانستی لێوەر نەگرتووە.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثني محمد بن شجاع ووتی: **ئێمە لەلای عبدالله بن داود الخريبي بووین گوێمان لێ گرتبوو، پیاوێکمان لەگەڵ بوو کۆنتربوو لە ئێمە لە فەرموودەدا، جا پرسیاری هەندێک شتی کرد دەربارەی شۆردنی مردوو، عبدالله-ش وەڵامی دەدایەوە تا گەیشتە بەوەی عبدالله بن داود ووتی: ئەمە ووتەی أبو حنیفة-یە، پیاوەکە قسەیەکی کرد وەک بڵێی تانە بدات لە أبو حنیفة، جا عبدالله پشتی تێکرد و زۆر سوکی کرد، وە عبدالله بەردەوام بوو لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی، وە دەیووت: ئەمە ووتەی أبو حنیفة-یە پاشان بەو پیاوەی ووت کە پرسیاری لێکرد دەزانی کێ لەگەڵ أبو حنیفة دادەنیشت؟ فلان و فلان و داود الطائي و تا 10 کەسی ژمارد، والله گەر یەکێک لەمانە بکێشرێن بە هەموو خەڵکی سەر زەوی ئەوا گومانم وایە کە ئەو قورستر بێت.** [فضائل أبي حنيفة : 160]

ووتم: محمد بن شجاع الثلجي درۆزنە.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثني محمد بن حماد بن المبارك قال حدثنا محمد بن سليمان بن لوين قال حدثنا **يحيى بن زكريا بن أبي زائدة ووتی: ئەو کەسە گەورەیی أبو حنیفة دەزانێت کە بینیبێتی و گوێ بیستی ووتەکانی بوو بێت.**

[فضائل أبي حنيفة : 163]

ووتم: محمد بن حماد بن المبارك مەجهولە.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني أحمد بن محمد بن سلامة قال كتب إلي محمد بن عبدالله بن أبي ثور الرعيني يحدثني عن سليمان بن عمران قال: **قال عبدالله بن المغيرة: سێ شت هەیە حەزت بۆی دەچێت لە کوفە، ڕەئی أبو حنیفة و تواناى لەبەرکردنی سفيان الثوري و وەرعی مسعر بن کدام.** [فضائل أبي حنيفة : 172]

ووتم: محمد بن عبدالله بن عبدون الرعيني و سليمان بن عمران دوو قازی حەنەفی مەزهەبن، نەمبینی باسی محمد بن عبدالله کرابێ، بەڵام دەربارەی سليمان بن عمران أبو حاتم الرازي دەڵێ:

فەرموودەكانى بەڵگەن لەسەر ئەوەى كە صدوق نيە، هەروەها الدارقطني دەڵێ مەجهولە، عبدالله بن المغيرة نازانم كێيە تەنها ئەوە نەبێ ابن حبان دەڵێ: مصريە ڕیوايەتى لە سفيان الثوري هەيە تفرد دەكات وشتى غەريب دەگێڕێتەوە، گەر ئەويش حەنەفى بێت ئەوا تەواوى ڕاويەكانى سەنەدەكە مصرين و حەنەفين، وە سليمان دەڵێ: قال عبدالله نازانم بەيەك گەيشتوون يان نا.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال: قال محمد بن شجاع: **بيستم پياوێك باسى بابەتێكى كرد دەربارەى زفر و أبو يوسف ووتى: ئايا زفر عيلمى كەلامى دەخوێند ؟ الحسن بن زياد پێى ووت: چەندە سەخيفى، دەڵێ: هاوەڵەكانمان و شێخەكانمان عيلمى كەلاميان خوێندووە ؟ ئەمانە ماڵى زانست و فيقه بوون، بەڵكو دەووترێ: ئەو كەسە عيلمى كەلام دەخوێنێ كە عەقڵى نيە، ئەمانە زاناتربوون بە الله عز وجل و سنوورەكانى لەوەى كە بچنە ناو ئەو عيلمى كەلامەى كە مەبەستە، بە شێخەكانمان گەيشتم أبو حنيفة و پێش ئەويش و زفر و أبو يوسف گرنگيان بە هيچ نەدەدا جگە لە فيقه و شوێنكەوتنى كەسانى پێش خۆيان، پياوەكە ووتى: فلان كەس -واتا بشر المريسي- دەڵێ: ووتەى ئەو دەربارەى قورئان هەمان ووتەى أبو حنيفة و زفر و أبو يوسف-ە، الحسن بن زياد پێى ووت: والله درۆ دەكات، نەم بيست كەسيان باسى شتێكى ئاوا بكەن، وە پێشم نەگەيشتووە ئەم شتە لە ئەوەوە، ئەى تۆ بۆ پێت نەووت: تۆ هاوەڵايەتى أبو حنيفة و زفر -ت نەكردووە بەڵام هاوەڵايەتى أبو يوسف-ت كرد ئەى بۆچى أبو يوسف دەرى كرديت ؟ كێ درۆكەى ڕوونترە لەم كەسە ؟** [فضائل أبي حنيفة : 187]

ووتم: محمد بن شجاع الثلجي درۆزنە، الحسن بن زياد تۆمەتبارە بە درۆ، كەسانێك بۆ سەرخستنى مەزهەبەكەيان درۆ بە دەمى پێغەمبەر ﷺ هەڵبەستن، ئامادەشن درۆ بكەن بۆ جوانكردنى ئيمامەكەيان.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال سمعت أبا عبدالله محمد بن شجاع الثلجي يقول سمعت الحسن بن أبي مالك يقول سمعت أبا يوسف دەيووت: **بيستم أبو حنيفة دەيووت: لەم ڕووە دوو پۆل كافرمان بۆ دێت الجهمية و المشبهة، واتا خوراسان.**

[فضائل أبي حنيفة : 200]

ووتم: محمد بن شجاع الثلجي درۆزنە.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال وحدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثني أحمد بن القاسم البرتي حدثنا أبو حفص المروزي حدثنا بشر بن يحي عن النضر بن محمد قال: **قال أبو حنيفة: جەهم و مقاتل دوو فاسق بوون، ئەویان زیادەڕەوی کرد لە تەشبیه، ئەویشیان زیادەڕەوی کرد لە نەفی.** [فضائل أبي حنيفة : 201]

ووتم: أبو حفص المروزي باسمان کرد، بشر بن يحيى المروزي زەعیفە.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني أبو بكر محمد بن جعفر بن الإمام قال حدثنا هارون بن عبدالله بن مروان الحمال قال حدثنا سليمان بن حرب عن حماد بن زيد ووتی: **لەلای أبو حنيفة دانیشتم لە مەککە، پێم ووت: أيوب پێی ڕاگەیاندین ووتی: سعيد بن جبير منی بینی دانیشتبووم لەگەڵ طلق بن حبيب، پێی ووتم: بۆچی دەتبینم لەگەڵ طلق دادەنیشیت ؟ لەگەڵی دامەنیشە، أبو حنيفة ووتی: طلق قەدەری بوو.** [فضائل أبي حنيفة : 202]

ووتم: لە بەشی یەکەم ئەم ڕیوایەتەمان هێنا لە تاريخ بغداد بە سەنەد و مەتنێکی تر نزیک لەم مەتنە، مەبەست لەهێنانی ئەم ڕیوایەتەش ئەوەیە کە طلق قەدەری بووە بۆیە سعيد سەرزەنشتی أيوب-ی کردووە کە چۆن لەگەڵ کەسێکی قەدەری دادەنیشیت، بەڵام ڕاستیەکە بەم شێوەیە نیە بەڵکو طلق مورجیئە بوو زانایان هەر باسی مورجیئە بوونیان کردووە باسی ئەوەیان نەکردووە کە قەدەری بێت، مەتنەکە بەم شێوەیە کە دوای تەواو بوونی قسەکانی حماد کەسێک لە أبو حنيفة دەپرسێ طلق عەقیدەی چۆن بوو، سەرەتا وەڵامی ناداتەوە کە پرسیارکەرەکە زۆری لێدەکات أبو حنيفة دەڵێ: بڕوای بە عەدل هەبوو واتا ئیرجاء وەک لە بەشی یەکەمدا باسمان کرد، جا لێرەدا عەدل کراوە بە قەدەر چونکە قەدەرییەکان نەفیکردنی قەدەر بە عەدل ناو دەبەن ئینجا بەهۆی ئەم تێگەیشتنەوە ووشەی عەدلیان بە قەدەر لێک داوەتەوە و ئەصلی ووشەکەیان گۆڕیوە بۆ قەدەر، لەکاتێکدا گەر سەیری ڕیوایەتەکە بکەین لە تاريخ بغداد ڕووداوەکە باسی ئیرجاء دەکات.

حماد ئەم ڕووداوە دەگێڕێتەوە وەک بەڵگەیەک لەدژی أبو حنیفة، گەر هۆکاری هەجر کردنی طلق قەدەر بوایە ئەوا أبو حنیفة ڕەددی حماد-ی دەدایەوە دەیووت بەم شێوەیە نیە کە تۆ باسی دەکەی، پاشان أبو حنیفة سعید بن جبیر دەداتە پاڵ ئیرجاء هەر لەو ڕیوایەتەی تاریخ بغداد بە بیانووی ئەوەی کە سالم الأفطس پێی ووتوە سعید مورجیئە بوو، الکوثري دەڵێ: لەهەر سێ چاپەکەی تاریخ بغداد ووشەی عەدل هاتووە، بەڵام ئەمە تەصحیفە ڕاستەکەی ووشەی قەدەرە لەسەر کتێبی (الجواهر المضیئة) چاکم کردۆتەوە، ئینجا پاشان ئەم ڕیوایەتەی ابن أبي العوام دەهێنێت کە ووشەی قەدەر هاتووە، المعلمي لێرەدا تەرکیزێکی زۆر ووردی کردووە لەسەر وەڵامەکەی الکوثري، کە ماناکەی بەم شێوەیە: الخطیب لە سەدەی 5 مردووە، ابن أبي العوام لە سەدەی 4 مردووە، عبدالقادر القرشي خاوەنی کتێبی (الجواهر المضیئة) لە سەدەی 8 مردووە، جا کاتێک الخطیب بە ووشەی عەدل دەیهێنێت، ابن أبي العوام و عبدالقادر بە ووشەی قەدەر دەیهێنن، لە پێشترە الکوثري بە ڕیوایەتەکەی ابن أبي العوام ڕەددی ڕیوایەتەکەی الخطیب بداتەوە نەک بە کتێبەکەی عبدالقادر کە تەنها نەقلی کردووە وەک جەرح و تەعدیلێک بۆ طلق لەلایەن أبو حنیفة-ەوە بەبێ هێنانی ڕیوایەتەکە، ئەمەش وادەکات زیاتر گومان لەسەر ئەصلی کتێبەکەی ابن أبي العوام دروست بکەین، بڕوانە [التنکیل : 469/1]

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثني إبراهیم بن الجنید قال حدثني داود بن أمیة المروزي ووتی: بیستم عبدالمجید بن عبدالعزیز بن أبي رواد دەیووت: **پیاوێکی سەرخۆش هاتە لای أبو حنیفة، پێی ووت: ئەی مورجیئە، أبو حنیفة-ش پێی ووت: گەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە من ئیمان بۆ کەسانی وەک تۆ ئیثبات دەکەم ئەوا منت نەدەدایە پاڵ ئیرجاء، وە گەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە ئیرجاء بیدعەیە ئەوا گوێم بەوە نەدەدا کە بدرێتە پاڵم.** [فضائل أبي حنیفة : 222]

ووتم: داود بن أمیة المروزي نەمدۆزییەوە، عبدالمجید بن عبدالعزیز بانگەوازکەرە بۆ ئیرجاء لە ڕیوایەتیش پتەو نیە تەزعیف کراوە لای هەندێکیان، بەڵام ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە عەقیدەیەتی

نەک ڕیوایەتی چونکە خۆی ئامادەی ڕووداوەکە بووە، أحمد بن حنبل دەڵێ زیادەڕەو بووە لە ئیرجاء، الفسوي دەڵێ بیدعەچیەکی عینادی بانگەوازکەر بوو، أبو داود دەڵێ بانگەوازکەر بوو بۆ ئیرجاء، ابن سعد دەڵێ مورجیئەیە، البخاري دەڵێ عەقیدەی ئیرجائی هەبوو، جا کەسێک بانگەوازکەر بێت بۆ ئیرجاء چۆن ڕیوایەتێکی لەم شێوەیە دەگێڕێتەوە کە بڵێ ئیرجاء بیدعەیە ؟! خودی ڕیوایەتەکەش بەڵگەیە لەسەر مورجیئە بوونی أبو حنیفة ئەگینا ئەهلی سوننە بە کەسانی زۆر پاکتر لەم عەرەق خۆرە ناتوانن بڵێن ئیماندارە بەو شێوەیەی کە أبو حنیفة مەبەستیەتی، کەچی ئەو ئیثباتی ئیمان دەکات بۆ عەرەق خۆر، ئەمەش خودی ئیرجائە، مورجیئە بوونی أبو حنیفة-ش هێندە ناودارە کە بە ڕیوایەتێکی لەم شێوەیە ڕەت ناکرێتەوە.

وە هەروەها ابن أبي العوام سێ ڕیوایەتی تری هێناوە بۆ نەفی کردنی مورجیئە بوونی أبو حنیفة، کەچی هەر سێک ڕیوایەتەکە بەڵگەن لەسەر مورجیئە بوونی أبو حنیفة، تەنانەت دانەیەکیان لە بەشی یەکەم هێناومانە لە بڕگەی ئیرجائدا، سبحان الله ! نازانم ابن أبي العوام چۆن لە ئیرجاء تێگەیشتووە ؟

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثني يعقوب بن إسحاق بن أبي إسرائيل قال حدثني غسان بن محمد المروزي قاضي الكوفة قال سمعت بشر بن يحيى المروزي دەیووت: **من لەلای جرير بن عبدالحميد الضبي بووم لە الري، بیستم دەیووت: من بیستم المغيرة کاتێک پرسیاری لێکرابوایە دەربارەی بابەتێک دەیووت: أبو حنیفة دەربارەی ئەم بابەتە ئاوا و ئاوای ووت، جا کوڕی برای جرير بە جرير-ی ووت: ئەی باوکی عبدالله خەڵکی توشی فیتنە مەکە بە أبو حنیفة، جرير پێی ووت: بێدەنگ بە، من بینیم مغيرة وەڵامی پرسیارێکی دەدایەوە خەڵکی موخالەفەیان دەکرد ئەویش دەیووت: چی بکەم ئەمە ووتەی أبو حنیفة-یە.**

[فضائل أبي حنيفة : 253]

ووتم: مغيرة واتا مغيرة بن مقسم الضبي، غسان بن محمد المروزي قازی کوفە بوو جەهمی بوو وەک عبدالله بن أحمد باسی دەکات، هەروەها لە سەردەمی فیتنەی خلق القرآن خەڵکی تاقی

دەکردەوە، عثمان بن أبي شيبة لەعنەتی لێکردووە، وە بشر بن يحيى المروزي زەعيفە بەڵام لێرەدا خۆی ئامادەی ڕووداوەکە بووە بەهۆی ئەوەوە تەزعيفی ناکەین.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد قال حدثني محمد بن المبارك قال حدثنا محمد بن سليمان لوين عن يحيى بن زكريا زائدة ووتی: **باوکم پێی ووتم: ئەی کوڕم دەست بگرە بە أبو حنيفة و عيلمی لێوەر بگرە پێش ئەوەی لە دەستت دەرچێ، يحيى دەڵێ: هەندێکجار فەتوای أبو حنيفة-م نيشانی باوکم دەدا پێی سەرسام دەبوو، يحيى دەڵێ: کەسمان نەبينی واز لە عيلمی أبو حنيفة بهێنێ وەک خۆپاراستن.** [فضائل أبي حنيفة : 254]

ووتم: محمد بن المبارك مەجهولە.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثني يعقوب بن إسحاق قال حدثنا أحمد بن حميد قال سمعت يحيى بن هلال يقول زعم لنا **يوسف بن خالد ووتی: کتێبەکانی أبو حنيفة نيشانی سفيان الثوري دەدرا سفيان دەيووت ئەمە ووتەی منە، کتێبی الرهن نيشانی درا کە بابەتی ووردی تێدا بوو، ووتی: ئەمە ووتەی منە، گەر پرسياری لێکرابوايە کە بابەتەکە شەرح بکات نەيدەتوانی.** [فضائل أبي حنيفة : 257]

ووتم: واتا سفيان کتێبی أبو حنيفة-ی دەدايە پاڵ خۆی کەچی سەری لە بابەتەکەش دەرنەدەچوو! يوسف بن خالد السمتي درۆزنە وەک پێشتر باسمان کرد.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال سمعت محمد بن شجاع ووتی: بيستم الواقدي دەيووت: **سفيان الثوري داوای لێدەکردم کتێبەکانی أبو حنيفة-ی بۆ بهێنم تا سەيری بکات.** [فضائل أبي حنيفة : 258]

ووتم: محمد بن شجاع الثلجي درۆزنە، الواقدي هەندێک بە درۆزنيان داناوە هەندێکيش تۆمەتباريان کردووە بە درۆ، لە باشترين حاڵيدا مەتروکە.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد قال حدثني محمد

بن المبارك قال حدثنا إبراهيم بن سعيد الجوهري قال حدثنا المثنى بن رجاء ووتی: **بیستم مالك بن مغول دەیووت: أبو حنیفة بەرچاو ڕۆشن بوو بە فیقهـ.** [فضائل أبي حنيفة : 262]

ووتم: محمد بن المبارك مەجهولە، المثنى بن رجاء نەمدۆزییەوە.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثني محمد بن حماد قال حدثنا إبراهيم بن سعيد قال سمعت أبا نعيم دەیووت: **بیستم علي بن صالح كاتێك أبو حنیفة مرد دەیووت: موفتی عیراق ڕۆیشت.** [فضائل أبي حنيفة : 264]

ووتم: محمد بن حماد بن المبارك مەجهولە.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثني محمد بن المبارك قال حدثنا الحسين بن إبراهيم ووتی: **بیستم أبو بكر بن عیاش دەیووت: أبو حنیفة تێگەیشتوو بوو.** [فضائل أبي حنيفة : 264]

ووتم: محمد بن حماد بن المبارك مەجهولە.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد قال حدثني محمد بن حماد قال حدثنا الحسين بن إبراهيم قال حدثنا عیسى بن یونس ووتی: **بیستم باوكم دەیووت: النعمان بن ثابت زۆر بە توندی شوێنی فەرموودە صەحیحەكانی پێغەمبەری الله ﷺ دەكەوت، گەر زەحمەت بوایە بۆی كە بەڵگە بهێنێتەوە بە فەرموودەی پێغەمبەری الله ﷺ ئەوا ڕیوایەتە صەحیحەكانی هاوەڵانی شاری كوفەی وەردەگرت، گەر موخالەفەی كرابوایە لە شارەكانی تردا، لەوە دەرنەدەچوو كە ئەهلی كوفە لەسەری بوون و لە زانایانی ئەهلی كوفەیان وەرگرتبوو.** [فضائل أبي حنيفة : 267]

ووتم: محمد بن حماد بن المبارك مەجهولە.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد قال حدثني محمد بن حماد قال حدثنا إبراهيم بن سعيد قال حدثنا المثنى بن رجاء ووتی: **بیستم إسرائیل دەیووت: باشترین**

**پیاو النعمان بن ثابت-ە سەرەڕای کەمی ڕیوایەت کردنی بۆ فەرمووده، لە حماد فیقهی وەرگرتووه ئەوەندە بەسە بۆت.** [فضائل أبي حنيفة : 268]

ووتم: محمد بن حماد بن المبارك مەجهولە، المثنى بن رجاء نەمدۆزییەوە.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثني محمد بن حماد قال حدثنا جبارة بن المغلس ووتی: **بیستم الربيع بن قيس دەیووت: أبو حنيفة بە یەکێك لە پیاوە عاقڵەکان دەژمێردرێت.** [فضائل أبي حنيفة : 332]

ووتم: جبارة بن المغلس تۆمەتبارە بە درۆ.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثنا عبدالله بن أحمد الربعي قال حدثني أحمد بن محمد بن حجاج المروزي ووتی: **پرسیارم لە باوکی عبدالله کرد دەربارەی قطبة، ووتی: لە مەجلیسی سفیان دادەنیشت، وە دەڵێن لە مەجلیسی أبو حنيفة دادەنیشت، هەر ئەو بوو ووتەکانی أبو حنيفة-ی بە سفیان دەگەیاند، وە دەڵێن سفیان بەهۆی ئەو مەزهەبی أبو حنيفة-ی زانی، پاشان ووتی: قطبة مستقيم الحديث-ە.** [فضائل أبي حنيفة : 340]

ووتم: عبدالله بن أحمد الربعي زەعیفە، أحمد بن محمد بن حجاج المروزي بۆتە المروروزي ئەمەش هەڵەیە، مەبەست لەهێنانی ئەم ڕیوایەتەش ئەوەیە کە سفیان لە ڕێگای قطبة خۆی فێری مەزهەبی أبو حنيفة دەکرد و شتی لێوە فێر دەبوو.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثني أحمد بن القاسم قال حدثني ابن أبي رزمة قال حدثني نعيم بن عمر القديدي ووتی: **بیستم أبو حنيفة دەیووت: خەڵکی سەیرن دەڵێن من بە ڕەئی فەتوا دەدەم ! فەتوا نادەم تەنها بە ئەثەر نەبێ.**

[فضائل أبي حنيفة : 356]

ووتم: نعيم بن عمر القديدي مەجهولە، لەم کتێبەدا بۆتە نعيم بن عمرو القديدي ئەمەش هەڵەیە.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثنا

عقبة بن مكرم قال حدثنا عبدالصمد بن عبدالوارث ووتی: **ئێمە لەلای شعبة بووین، پێی ووترا: أبو حنیفة مرد، شعبة ووتی: زانینی فیقهی خەڵكی كوفە لەگەڵ ئەودا ڕۆیشت، الله فەزل بەسەر ئێمە و ئەویش بكات.** [فضائل أبي حنيفة : 376]

ووتم: لەبەشی یەكەم بە صەحیحی هێنامان كە شعبة لەعنەت لە أبو حنیفة دەكات.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثني محمد بن حماد قال حدثنا إبراهيم بن سعيد قال حدثني المثنى بن رجاء ووتی: **بیستم سعيد بن أبي عروبة دەیووت: أبو حنیفة زانای كوفە بوو.** [فضائل أبي حنيفة : 383]

ووتم: محمد بن حماد بن المبارك مەجهولە، المثنى بن رجاء نەمدۆزییەوە.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثنا محمد بن حماد قال حدثنا لوين محمد بن سليمان ووتی: **بیستم محمد بن جابر دەیووت: أبو حنیفة زاناترین كەسی شارەكەی بوو لە سەردەمی خۆی لە فەتوادان، وە عەوامی خەڵك مەیلیان بۆلای ئەو دەچوو لە بابەتەكاندا.** [فضائل أبي حنيفة : 404]

ووتم: محمد بن حماد مەجهولە.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال أخبرني عبدالله بن أحمد بن حنبل ووتی: **پرسیارم لە باوكم كرد دەربارەی شعيب بن إسحاق الدمشقي، ووتی: نابینم هیچ كێشە هەبێ بەڵام لەگەڵ ئەهلی ڕەئی دادەنیشت، لەگەڵ أبو حنیفة دادەنیشت.**
[فضائل أبي حنيفة : 420]

ووتم: خودی ئەم ڕیوایەتە تانەدانە لە أبو حنیفة، ئیمام أحمد دەڵێ شعیب هیچ كێشەی نیە تەنها ئەوە نەبێ كە لەگەڵ أبو حنیفة دادەنیشت، واتا ئەوە بە كێشە دەزانێت، كەچی ابن أبي العوام هێناویەتی وەك مەدحێك بۆ أبو حنیفة بەو مەبەستەی كە شعیب قوتابی أبو حنیفة بووە و خەڵكانێكی زۆر زانستیان لە أبو حنیفة وەرگرتووە و لە مەجلیسی دانیشتوون.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثني أحمد بن القاسم قال حدثني ابن أبي رزمة قال حدثني عمرو بن النضر بن قديد ووتى: **بيستم عبدالله بن المبارك دەيووت: أنبأنا النعمان، پێی ووترا: النعمان كێيە ؟ ووتى: النعمان بن ثابت ئەو كەسەی كە پێی دەڵێن أبو حنيفة، جا كێ هەيە وەک أبو حنيفة ؟** [فضائل أبي حنيفة : 429]

ووتم: عمرو بن النضر بن قديد نەمدۆزيەوە.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني أبي قال حدثني أبي قال حدثني محمد بن أحمد بن حماد قال حدثني أحمد بن القاسم قال حدثنا ابن أبي رزمة قال حدثني أبو وهب ووتى: **بيستم النضر بن محمد دەيووت: أبو حنيفة گەر حەقی پێگەيشتبوايە زمانی نەدەكردەوە، واتا قبوڵی دەكرد.** [فضائل أبي حنيفة : 442]

ووتم:النضر بن محمد المروزي باسمان كرد مورجيئەيە و هاوەڵی أبو حنيفة بووە، بۆيە ئاساييە مەدحی ئيمامەكەی بكات.

**ابن أبي العوام** دەڵێ: حدثني يوسف بن أحمد المكي قال حدثنا محمد بن حزام الفقيه قال حدثنا محمد بن علي الصائغ بمكة قال حدثنا إبراهيم بن محمد الشافعي أنه قال أخبرني عبدالعزيز بن محمد الدراوردي ووتى: **مالك بن أنس سەيری كتێبەكانی أبو حنيفة-ی دەكرد و سودی لێ دەبينی.**

[فضائل أبي حنيفة : 495]

ووتم: لێرەدا ابن أبي العوام-ی نەوە ڕاستەوخۆ ڕيوايەت دەكات لە يوسف الصيدلاني، ئەمەش ئەو بەشە زيادەيە كە خۆی خستويەتيە ناو كتێبەكەی باپيری، بۆيە لەم ڕيوايەتەدا (حدثني أبي قال حدثني أبي قال) تێدا نەبوو.

يوسف بن أحمد المكي ئەو كەسە بوو كە ابن عبدالبر زۆربەی ڕيوايەتەكانی لەو نەقل كردبوو لە كتێبی (الانتقاء) لە سەرەتای بەشی دووەم باسی حاڵيمان كرد، محمد بن حزام الفقيه بۆتە محمد بن حازم الفقيه ئەمەش هەڵەيە، وە پێشتر لە نەقل كردنی ڕيوايەتەكانی ابن عبدالبر باسمان كرد كە مەجهولە، وە ئەوەی ئاگاداری حاڵی مالك و هەڵوێستی مالك بێت بەرامبەر أبو حنيفة ئەوا دەزانێت كە شتی ئاوا دوورە لە ڕاستيەوە.

# ڕیوایەتەكانی كتێبی (أخبار أبي حنيفة وأصحابه)

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا أبو حفص عمر بن إبراهيم المقرىء قال حدثنا مكرم بن أحمد قال حدثنا ابن مغلس قال حدثنا ابن عابس ووتی: **بیستم حماد بن سلمة دەیووت: موفقی كوفه و ئەو كەسەی كە چاوی لەسەر بوو لە فیقهدا دوای مردنی إبراهيم النخعي حماد بن أبي سليمان بوو، خەڵكی بەهۆی ئەوەوە بێ پێویست بوون، كاتێك مرد پێویستیان بەوە بوو كەسێك مەجلیسیان بۆ ساز بكات، وە هاوەڵەكانی ترسان لەوەی كە ناوی نەمێنێت و عیلم لەناوبچێت، وە حماد كوڕێكی هەبوو زانست و زانینی چاك بوو لە دەوری كۆبوونەوە، جا هاوەڵەكانی باوكی هاتن أبو بكر النهشلي و أبو بردة التعبي و محمد بن جابر الجعفي و جگە لەوانیش، جا ئەمانە دەهاتن بۆلای كوڕەكەی ئەویش زیاتر لە النحو و ووتەكانی عەرەب شارەزا بوو، جا ئارامی نەگرت لەوەی كە مەجلیسیان بۆ ساز بكات و دانیشێت بۆیان، ئەوانیش ڕەئیەكانیان یەكی گرت كە أبو بكر النهشلي ئەم كارە بكات، جا داوایان لێكرد ڕازی نەبوو، داوایان لە أبو بردة كرد ڕازی نەبوو، جا بە أبو حنيفة-یان ووت، ئەویش ووتی: حەزناكەم عیلم بمرێت، جا یارمەتیدان و مەجلیسی بۆسازكردن ئەوانیش دەهاتن بۆلای، دوای ئەوان أبو يوسف و أسد بن عمرو و القاسم بن معن وزفر بن الهذيل والوليد و پیاوانی تر لە ئەهلی كوفه دەهاتن بۆلای، أبو حنيفة شارەزای دەكردن لە دین و زۆر چاكەكار بوو لەگەڵیان، وە ابن أبي ليلى وابن شبرمة وشريك وسفيان موخالەفەی أبو حنيفة-یان دەكرد و دەیانویست ناشرینی بكەن، جا هەروا مایەوە تا ناوی دەركرد و ئەمیرەكان پێویستیان پێی بوو، وە خەلیفەكانیش باسیان كرد.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 21]

ووتم: ابن مغلس (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا أبو القاسم عبدالله بن محمد الحلواني قال حدثنا مكرم بن أحمد قال حدثنا أحمد ابن عطية قال حدثنا الحسن بن الربيع قال حدثنا ابن المبارك ووتی: **بیستم داود الطائي دەیووت: موفقی خەڵكی لە كوفه حماد بن أبي سليمان بوو، حماد كوڕێكی هەبوو پێیان دەووت إسماعيل**

**بن حماد بن أبي سليمان، كە كاتی مردنی حماد هات كۆک بوون لەسەر ئەوەی كە إسماعيل مەجليسيان بۆسازبكات وئارام بگرێت لەسەريان، جا سەيريان كرد بينيان زياترلە شيعروشەو چەرە وبەسەرهاتی خەڵكی شارەزايە، أبوبكرالنهشلي كە لە هاوەڵانی حماد بوو وە أبوبردة ومحمد بن جابر الحنفي و كۆمەڵێک لە هاوەڵانی حماد أبو حصين و حبيب بن أبي ثابت ووتيان: ئەم قوماش فرۆشە زانست وزانينی چاكی هەيە ئەگەرچی تەمەنيشی بچووكە ئەو لە مەجليس دابنێن، جا ئەوانيش ئەمەيان كرد، أبو حنيفة پياوێكی دەوڵەمەند و سەخی وزيرەک بوو، جا لە مەجليس دانيشت و ئارامی لەسەر گرتن و چاک بوو لەگەڵيان و پێيانی دەبەخشين، وە حاكمەكان و ئەميرەكان ڕێزيان لێينا جا ناوی بەرز بوويەوە، چينە بەرزەكان دەچوون بۆلای لەدوای ئەوان أبو يوسف وأسد بن عمرو والقاسم بن معن وأبوبكر الهذلي والوليد بن أبان دەهاتن بۆلای، ئەوانەی دژايەتيان دەكرد وقسەيان دەربارەی دەكرد ابن أبي ليلى وابن شبرمة والثوري وشريك وكۆمەڵێک بوون موخالەفەيان دەكرد ودەيانويست ناشرينی بكەن، جا ناوبانگی هەر زياتر دەبوو هاوەڵی زياتر بوو تا بازنەكەی بوو بە گەورەترين بازنە لەناو مزگەوتدا، وە فراوانترينيان بوو لە وەڵامدانەوەی پرسيار و ئارامی گرت لەسەريان، بە هەموو نەدارێكی دەبەخشی و دياری دەدا بە هەموو دەوڵەمەندێک جا خەڵكيان ڕوويان تێيكرد تا ئەميرەكان و حاكمەكان وگەورەكان ڕێزيان لێينا و هەمووان سوپاسيان كرد** ... هتد. [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 22]

ووتم: أحمد بن عطية (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا أحمد بن محمد قال حدثنا أبو بكر المسكي قال حدثنا القاضي النخعي قال حدثنا يحيى بن أبي طالب ووتی: **بيستم علي بن عاصم دەيووت: گەر عيلمی أبو حنيفة بكێشرێ بە عيلمی خەڵكی سەردەمەكەی ئەوا هی ئەو قورسترە.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 23]

ووتم: أبو بكر المسكي مەجهولە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا أبو القاسم عبدالله بن محمد البزاز قال ثنا مكرم قال ثنا أحمد بن عطية قال حدثنا ابن سماعة عن أبي يوسف ووتی: **بيستم أبو حنيفة دەيووت: گەر فەرمووده هات لە**

**پێغەمبەرەوە ﷺ لە کەسانی سیقەوە ئەوا وەری دەگرین، گەر لە هاوەڵانەوە هات لە ووتەی ئەوان دەرناچین، گەر لە تابعینەوە هات ململانێیان لەگەڵ دەکەین.** **[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 24]**

ووتم: أحمد بن عطية (أحمد بن الصلت)ه درۆزنە.

مەبەست لە هێنانی ئەم ڕیوایەتە ئەوەیە کە أبو حنيفة هەر کاتێک فەرموودەی صەحیحی بۆ هاتبوایە تەسلیمی دەبوو هەرگیز پێچەوانەی فەرموودەی صەحیحی نەکرد گەر پێی گەیشتبوایە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عبدالله بن محمد قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد قال حدثنا أحمد بن عبدالله ابن يونس قال حدثنا **الحسن بن صالح ووتی: أبو حنيفة زۆر بە توندی لە ناسخ و مەنسوخی فەرموودەی دەکۆڵیەوە، کاری بەو فەرموودەیە دەکرد کە بە صەحیحی لەلای چەسپابوو لە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانیەوە، وە زانا بوو بە فەرموودەی ئەهلی کوفە و فیقهی ئەهلی کوفە، زۆر بە توندی شوێنی ئەوە دەکەوت کە خەڵکی شارەکەی لەسەری بوون.**

**وە الحسن بن صالح ووتی: أبو حنيفة دەیووت: قورئان ئایەتی ناسخ و مەنسوخی تێدایە، وە فەرموودەش ئایەتی ناسخ و مەنسوخی هەیە، وە دواکاری پێغەمبەری الله ﷺ لەبەرکردبوو کە لەسەری وەفاتی کردبوو کە بە خەڵکی شارەکەی گەیشتبوو.** **[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 25]**

ووتم: أحمد شێخی مكرم (أحمد بن الصلت)ه درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عبدالله بن محمد قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد قال حدثنا محمد بن مقاتل ووتی: **بیستم پرسیار لە ابن المبارك کرا کەی پیاو دەتوانێ فەتوا بدات یان ببێتە قازی یان حاکم ؟ ابن المبارك ووتی: گەر زانا بوو بە فەرموودە، بەرچاوڕۆشن بوو بە ڕەئی، زانا بوو بە ووتەی أبو حنيفة و لەبەری کردبوو.** **[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 26]**

ووتم: أحمد بن الصلت درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر بن إبراهيم قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد قال سمعت المزني دەیووت: **بیستم الشافعي دەیووت: خەڵکی لەسەر أبو حنيفة حیسابن لە قیاس و استحسان.**

[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 26]

ووتم: أحمد بن الصلت درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد قال حدثنا محمد بن مقاتل ووتی: **بيستم ابن المبارك دەيووت: محمد بن واسع هاتە خوراسان، قبيصة ووتی: ئەو كەسە هات بۆ لاتان كە دوعای قبوڵە، جا خەڵكی لە دەوری كۆبوونەوە پرسياريان لێيكرد دەبارەی چەند شتێک لە فيقهدا، ووتی: فيقهـ پيشەی گەنجێكە لە كوفەيە كونيەكەی أبو حنيفة-يە، خەڵكی بە ابن المبارك-يان ووت: أبو حنيفة لە فەرموودە نازانێت، ابن المبارك ووتی: چۆن دەڵێن أبو حنيفة لە فەرموودە نازانێت ؟! پرسياری لێكرا دەربارەی گۆڕينەوەی (الرطب) بە (التمر) ووتی ئاساييە، ووتيان ئەی فەرموودەكەی سعد ؟ ووتی: ئەم فەرموودەيە شازە ڕيوايەتی زيد بن أبي عياش وەرناگيرێت، جا كەسێک قسەيەكی ئاوا بكات لە فەرموودە نازانێت ؟!**

[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 26]

ووتم: أحمد بن الصلت درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عبدالله بن محمد قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد بن عطية قال حدثنا علي بن معبد قال حدثنا عبيدالله بن عمر ووتی: **ئێمە لەلای الأعمش بووين ئەويش پرسياری لە أبو حنيفة دەكرد دەربارەی چەند شتێک أبوحنيفة-ش وەڵامی دەدايەوە، جا الأعمش پێی دەووت: ئەم وەڵامەت لەكوێ هێنا ؟ أبو حنيفة دەيووت: تۆ بۆت گێڕاينەوە لە إبراهيم-ەوە ئەمە، وە بۆت گێڕاينەوە لە الشعبي-ەوە ئەمە، جا الأعمش لەم كاتەدا دەيووت: ئەی گرۆی فەقيهەكان ئێوە پزيشكن و ئێمەش دەرمانسازين.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 26]

ووتم: أحمد بن عطية (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عبدالله بن محمد الحلواني قال حدثنا مكرم حدثنا أحمد قال حدثنا أحمد بن يونس ووتی: **بيستم وكيع دەيووت: بينيم أبو حنيفة و سفيان و مسعر و مالك بن مغول و جعفر**

ابن زياد الأحمر والحسن بن صالح كۆببونەوە لە وەليمەيەک لە كوفە، پياوێک دوو كچى خۆی دابوو بە دوو كوڕی پياوێكی تر جا كاتێک خەڵكی كۆبوونەوە بۆ وەليمەكە وەلی ئەمری كچەكە هاتە دەر ووتی: توشی كارەساتێكی گەورە بووين، ووترا: چيە ؟ ووتی: حەز دەكەين بيشارينەوە، أبو حنيفة ووتی: كارەساتەكە چيە ؟ ووتی: بەهەڵە هەر زاوايەک بووكەكەی ترمان بۆی بردووە، أبو حنيفة ووتی: جووت بوونە لەگەڵيان ؟ ووتی: بەڵێ، سفيان ووتی: ئەمە هيچی تێدا نيە ئەميری ئيمانداران علي بن أبي طالب حوكمی داوە لە خودی ئەم بابەتەدا معاوية بەنامە بۆی نارد، علي ﵁ بەو كەسەی ووت كە پرسيارەكەی لێكرد تۆ پەيامبەری معاوية-ی ؟ ئەم ڕووداوە لە ناوچەكەی ئێمە ڕووی نەداوە وايدەبينم هەريەكێک لە دوو پياوەكە لەسەريانە ئاژەڵێک سەربڕن بەهۆی جووت بوونيان لەگەڵ ئافرەتەكان، وە هەر يەكێک لە دوو ئافرەتەكە دەگەڕێنەوە بۆلای مێردەكانيان و هيچيان لەسەر نيە، خەڵكيش بێدەنگ ببوون گوێيان لە سفيان گرتبوو ووتەكەيان بە چاک دەزانی، أبو حنيفة-ش لەناو خەڵكەكە بوو بێدەنگ بوو، مسعر ئاوڕی لە أبو حنيفة دايەوە پێی ووت: شتێک بڵێ تێيدا ئەی أبو حنيفة، سفيان ووتی: چيتر دەڵێ جگە لەوەی كە من ووتم، أبو حنيفة ووتی: دوو كوڕەكە بهێنن، جا هاتن، بەهەر يەكێک لە دوو كوڕەكەی ووت: حەز دەكەی ئەو ئافرەتەت لەلا بێت كە جووت بووی لەگەڵی ؟ ووتی: بەڵێ، أبو حنيفة ووتی: ناوی ژنەكەت چيە كە لەلای براكەتە ؟ ووتی: فلانة كچی فلان، أبو حنيفة ووتی: بڵێ تەڵاقم دراوە لە منەوە، پاشان أبو حنيفة ووتاری مارە بڕينی دا هەر يەكێک لە دوو كچەكەی لەو دوو كوڕە مارە كرد كە جووت ببوون لەگەڵيان، پاشان أبو حنيفة ووتی: بوكێكی ترمان بۆ ئامادە بكەن، خەڵكی سەيريان هات بە فەتواكەی أبو حنيفة، وە لەم ڕۆژەدا مسعر هەڵسايەوە دەمی أبو حنيفة-ی ماچ كرد، وە ووتی: لۆمەم دەكەن لەسەر خۆشويستنم بۆ أبو حنيفة ؟ وە سفيان بێدەنگ بوو هيچی نەدەووت. [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 30]

ووتم: أحمد بن الصلت درۆزنە، زۆر داماويشە لە درۆ كردن درۆكانی ئاشكران.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا أبو حفص عمر بن إبراهيم المقرىء قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد بن

عطية قال حدثنا بشر بن الوليد عن **أبي يوسف ووتی: هاوەڵایەتی کەسم نەکردووە لە خەڵکی کە بتوانێ بڵێ: کەسێکم دیوە عەقڵی کاملترو مروئەتی زیاتر بووە لە أبو حنيفة.**
**[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 41]**
ووتم: أحمد بن عطية (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد بن عطية الكوفي ووتی: **بیستم يحيى بن معين دەیووت: أبو حنيفة لەوە عاقڵتر بوو کە درۆ بکات، نەمبیستووە کەس وەسفی بکات و باسی بکات وەک ابن المبارك، وەسفی دەکرد و باسی دەکرد بە چاکە.**
**[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 41]**
ووتم: أحمد بن عطية (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر بن إبراهيم قال حدثنا مكرم قال حدثنا ابن مغلس قال حدثنا ابن مقاتل ووتی: **بیستم ابن المبارك دەیووت: گەر ببیستم کەسێک قسە بە أبو حنيفة دەڵێ حەز ناکەم ببینم و لەگەڵی دانیشم لەترسی ئەوەی کە سزایەک لە سزاکانی الله بەسەری دابەزێ منیشی لەگەڵ بگرێتەوە، الله دەزانێت کە من ڕازی نیم بەوەی کە باس دەکرێت دەربارەی أبو حنيفة، وە هیچ کەسێک باسی ناکات ئیللا أبو حنيفة باشترە لەو، والله خاوەن وەرع بوو زمانی خۆی دەپاراست خواردنی حەلال بوو لەگەڵ عیلمێکی زۆر و فراوان والله. [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 44]**
ووتم: ابن مغلس (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا أبو القاسم عبدالله بن محمد الشاهد قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد قال حدثنا ابن كاسب قال سمعت ابن عيينة دەیووت: **ابن جريج ووتی: پێم گەیشتووە لە النعمان فەقیهی ئەهلی کوفە کە زۆر بە وەرعە دین و عیلمی دەپارێزێ، ئەهلی دونیا پێش ناخات بەسەر ئەهلی ئاخیرەت، وە وایدەبینم کە لە زانست پلەوپایەکی سەیری هەبێت لە داهاتوودا.**
**[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 44]**

ووتم: أحمد بن الصلت درۆزنە.

ئەهلی دونیا پێش ناخات بەسەر ئەهلی ئاخیرەت نازانم مەبەستی چیە، ڕەنگە بەم شێوەیە بێت (دونیا پێش ناخات بەسەر ئاخیرەت) هەڵە لەم چاپەدا زۆرە چاپی ترم نەدۆزییەوە بڕوا ناکەم چاپی تری هەبێت بەپێی زانیاریم، والله أعلم.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عبدالله بن محمد قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد بن عطية قال حدثنا الحلواني ووتی: **بیستم عبدالوهاب بن همام برای عبدالرزاق بن همام دەیووت: نەمدیوە شێخەکانی شاری عەدەن ئەوانەی کە چوونەتە کوفە بۆ طەلەبی عیلم ئیللا هەموویان دەیانووت: نەمان بینی لە کوفە لە سەردەمی أبو حنیفة کەسێک فەقیهتر و بە وەرعتر بێ لەو.**

[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 44]

ووتم: أحمد بن عطية (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عبدالله بن محمد البزاز قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد قال ثنا عمرو بن عون ووتی: **يزيد بن هارون پێی ووتم: فەرموودەم لە هەزار شێخەوە نوسیوەتەوە و زانستم لێوەرگرتوون، والله نەمبینی کەسێک لەوان لە أبو حنیفة بە وەرعتر بێ و زمانی پارێزراوتر بێ.**

[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 45]

ووتم: أحمد بن الصلت درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر بن إبراهيم قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد بن عطية قال حدثنا تميم بن المنتصر ووتی: **من لەلای یزید بن هارون بووم باسی أبو حنیفة-ی کرد جا کەسێک قسەی بە أبو حنیفة ووت، یزید ماوەیەکی درێژ سەری نزم کرد، پێیان ووت: ڕەحمەتی الله-ت لێبێ قسەمان بۆ بکە، ووتی: أبو حنیفة بە تەقوا و پاک وزاهید و زانا و ڕاستگۆ بوو، حافزترین کەسی سەردەمی خۆی بوو، هەرکەسێک پێی گەیشتبێ لە سەردەمی خۆی بیستوومە دەڵێ: کەسم نەدیوە لە أبو حنیفة فەقیهتر بێ.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 48]

ووتم: أحمد بن عطية (أحمد بن الصلت)ه درۆزنە، درۆیەكەش شاخدارە چۆن أبو حنيفة حافزترین كەسی سەردەمی خۆی بووە ! حاڵیمان بینی لە ڕیوایەت كردن چۆنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عبدالله بن محمد المعدل قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد بن عطية قال ثنا ضرار بن صرد قال سمعت يزيد بن الكميت دەیووت: **پیاوێك مونازەرەی لەگەڵ أبو حنيفة كرد لە بابەتێكدا، پیاوەكە پێی ووت: ئەی بیدعەچی ئەی زنديق، أبو حنيفة ووتی: الله لێت خۆشبێ، الله دەزانێ كە من پێچەوانەوەی ئەو شتەم كە تۆ ووتت، وە دەزانێ من هیچ كەسێكم نەكردۆتە هاوبەشی لەوەتەی ناسیومە، هیوام بە هیچ شتێك نەبووە ئیللا عەفوی ئەو نەبێ، لە هیچ شتێك نەترساوم تەنها سزای ئەو نەبێ پاشان گریا لەكاتی باسكردنی سزا جا لەهۆش خۆی چوو كەوتە سەر زەوی پاشان بەهۆش خۆی هاتەوە، پیاوەكە پێی ووت: گەردنم ئازاد بكە، أبو حنيفة ووتی: هەر كەسێك لە جاهیلەكان شتێكیان ووتبێ دەربارەی من كە لە مندا نەبێ ئەوا گەردنیم ئازاد كردووە، وە هەر كەسێك لە زاناكان شتێكیان ووتبێ دەربارەی من كە لە مندا نەبێ ئەوا گەردنیم ئازاد نەكردووە، چونكە غەیبەتی زانایان دەمێنێتەوە دوای خۆیان.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 48]
ووتم: أحمد بن عطية (أحمد بن الصلت)ه درۆزنە، ضرار بن صرد و يزيد بن الكميت هەردووكیان مەتروكن، لە ڕیوایەتەكانی تر تەنها ئاماژەم بە أحمد بن الصلت دەدا ئەگەرچی ڕاوی تریش هەبوان زەعیف یان مەجهول یان درۆزن بەڵام لەمەیان ئاماژەم بە دوو ڕاوی تریشدا تا هەست و سۆزی كەس ڕانەكێشێت ئەم ووتە درۆیانە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر بن إبراهيم قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد قال حدثنا إبراهيم بن هاشم قال سمعت بشر بن الحارث دەیووت: **لەلای عيسى بن يونس بووم، جا باسی أبو حنيفة-ی كرد دوعای بۆكرد، وە ووتی: چەندە زۆر خۆی ماندوو دەكرد كە سەرپێچی الله نەكات و حەرامكراوەكانی الله بە گەورە سەیر بكات.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 49]
ووتم: أحمد بن الصلت درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا أبو القاسم عبدالله بن محمد المعدل قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد قال سمعت أبا نصر بشر بن الحارث دەيووت: **بيستم عبدالله بن داود دەيووت: قسە بە أبو حنيفة ناڵێ تەنها يەكێك لەم دووانە نەبێت: يان حەسودى بە عيلمەكەى دەبات، وە يان جاهيلە بە عيلم.**
[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 64]
ووتم: أحمد بن الصلت درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا أبو القاسم عبدالله بن محمد الحلواني قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد بن محمد ابن مغلس قال حدثنا أبو نعيم ووتى: **بيستم سفيان دەيووت: أبو حنيفة لە عيلمدا حەسودى پێ براو بوو.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 64]
ووتم: أحمد بن محمد بن مغلس (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر بن إبراهيم قال حدثنا مكرم قال حدثنا ابن مغلس قال حدثنا ثابت الزاهد ووتى: **الثوري گەر پرسيارى بابەتێكىووردى لێكرابوايە دەيووت: كەس نازانێت قسە لەم كارەدا بكات تەنها پياوێك نەبێت كە حەسوديمان پێى برد، پاشان پرسيارى لە هاوەڵانى أبو حنيفة دەكرد هاوەڵەكەتان چى دەڵێ ؟ جا وەڵامەكەى لەبەر دەكرد پاشان فەتواى پێ دەدا.**
[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 64]
ووتم: ابن مغلس (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا أبو القاسم عبدالله بن محمد الشاهد قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد قال حدثنا يحيى بن عبدالحميد الحماني قال سمعت ابن المبارك دەيووت: **بينيم الحسن بن عمارة ڕێشمەى ئاژەڵەكەى أبو حنيفة-ى گرتبوو، وە دەيووت: والله بە كەس نەگەيشتووين قسەى لە فيقهدا كردبێ بەليغترو ئارامگرتر ووەڵام ئامادەترلە تۆ، بەڕاستى تۆ گەورەى ئەوكەسانەى كە لە فيقهدا قسەيان كردووە لە سەردەمى خۆت بەبێ ڕكابەرى، وە قسەشت پێ ناڵێن تەنها بە حەسودى نەبێ.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 65]

ووتم: أحمد بن الصلت درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر بن إبراهيم قال حدثنا مكرم بن أحمد قال حدثنا أحمد بن عطية قال حدثنا نصر بن علي ووتی: **بیستم ڕۆژێک أبو عاصم النبيل فەرموودەیەکی ڕیوایەت کرد لە أبو حنيفة، خەڵکی کردیان بە دەنگە دەنگ، ووتی: ئەمە چیانە ؟ ووتیان: حەزناکەن ناوی أبو حنيفة بهێنرێ، ووتی: فەقیهی دین حەسودی پێ براو بوو، ئەم خەڵکە نابینم تەنها وەک ئەوە نەبێ کە عبدالله بن قيس الرقيات ووتی: حسدا إن رأوك فضلك الله بما فضلت به النجباء.**

**واتا: حەسودیت پێ دەبەن گەر بتبینن الله فەزلی بەسەرتدا کردووە بەو شتەی کە کەسە نەجیبەکانی پێ تەفزیل کردووە.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 65]

ووتم: أحمد بن عطية (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عبدالله بن محمد قال حدثنا أبو بكر مكرم بن أحمد البزاز قال حدثني علي ابن الحسين بن حبان عن أبيه ووتی: **يحيى بن معين گەر بۆی باس کرابوایە کەسێک قسە بە أبو حنيفة دەڵێ، دەیووت:**

**حسدوا الفتى إذ لم ينالوا سعيه    ***    فالقوم أضداد له وخصوم**

**كضرائر الحسناء قلن لوجهها    ***    حسدا وبغيا إنه لدميم**

**واتا: حەسودیان بە گەنجەکە برد کاتێک نەیانتوانی پێی بگەن، خەڵکی دژ و ڕکابەرن بۆی، هەروەک چۆن هەوێیەکانی ئافرەتە جوانەکە دەربارەی ڕوخساری لە حەسودی و زوڵمەوە ووتیان: ناشرینە.**

[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 65]

ووتم: الصيمري سێ شێخی هەیە بەناوی عبدالله بن محمد، عبدالله بن محمد البزاز سیقەیە کردووە، عبدالله بن محمد الحلواني مەجهولە، عبدالله بن محمد المعدل نەمدۆزییەوە، جا نازانم ئەمە کامەیانە هەر سێکیان ڕیوایەتیان هەیە لە مكرم بن أحمد.

علي بن الحسين بن حبان سیقەیە بەڵام باوکی جەرح و تەعدیلی بۆ نەکراوە، گریمان صەحیحیش بێت ڕەنگە يحيى بن معين لە سەرەتای تەمەنی ئەم قسەیەی کردبێ چونکە سەرەتا کتێبەکانی أبو

حنيفة-ی دەخوێند لەلای محمد بن الحسن الشيباني.

**الصيمري** دەڵێ: وجدت في كتاب أبي جعفر الطحاوي الذي جمع فيه أخبار أصحابنا الذي أنبأنا القاضي أبو محمد عبدالله بن محمد الأكفاني إجازة أن أبا بكر الدامغاني حدثهم عن أبي جعفر الطحاوي قال أبو جعفر حدثني عبدالله بن محمد الهمداني ووتی: **پیاوێک کێشەی هێنایەوە بۆلای ابن شبرمة لە بابەتێکدا ئەویش حوکمیدا لەدژی پیاوەکە، پیاوەکەش هاتە لای أبو حنيفة ئەم شتەی پێ ووت، أبو حنيفة بە پیاوەکەی ووت: ئەم حوکمە هەڵەیە، وە نوسراوێکی بۆ نوسی ئەو شتەی تێدا باسکرد کە دەبوو ابن شبرمة لە بەرژەوەندی پیاوەکە حوکمی دابوایە، جا پیاوەکە بەم نوسراوە هاتە لای ابن شبرمة بۆی خوێندەوە بە ئامادە بوونی ابن أبي ليلى، وە هیچ کام لەوان نەیانزانی خاوەنی ئەم نوسراوە کێیە، جا بە شتێکی چاکیان زانی ووتیان: کێ ئەمەی نوسیوە ؟ پیاوەکە پێی ووتن: أبو حنيفة، جا ئەمە وایکرد قسە بە أبو حنيفة بڵێن.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 66]

ووتم: شێخەکەی الطحاوي (عبدالله بن محمد الهمداني) نازانم کێیە نەمدۆزییەوە، لەوە ناچێ خۆی ئەم بەسەرهاتەی بینیبێ چونکە الطحاوي ساڵی 239 لەدایکبووە گریمان بەلانی کەم لە تەمەنی 15 ساڵی ئەم بەسەرهاتەی بیستبێ لە شێخەکەی کەواتە تا ساڵی 254 ئەم شێخە لە ژیاندابووە الله أعلم ساڵی چەند مردووە، أبو حنيفة ساڵی 150 مردووە کەواتە بەلانی کەم ئەم شێخە 104 ساڵ دوای مردنی أبو حنيفة ژیاوە، ئەی کەی ئەم بەسەرهاتەی بینیوە یان أبو حنيفة بۆی گێڕاوەتەوە؟ با بڵێین بەلانی کەم تەمەنی 16 ساڵ بووە کەواتە 120 ساڵ ژیاوە بەلانی کەم.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا أحمد بن محمد الصراف قال حدثنا أحمد بن محمد المنصوري قال حدثنا علي بن محمد النخعي قال حدثنا سليمان بن الربيع قال حدثنا حامد بن آدم قال حدثنا **بشار بن قيراط کە هاوبەشی أبو حنيفة بوو، ووتی: حەجم کرد لەگەڵ أبو حنيفة و سفيان جا گەر لە شوێنێک یان شارۆچکەیەک مابوانەوە خەڵکی لە دەوریان کۆدەبوونەوە دەیانووت دوو فەقیهەکەی عیراق، جا سفيان أبو حنيفة-ی پێش دەخست و لەدوای دەرۆیشت گەر پرسیاری لێکرابوایە دەربارەی بابەتێک أبو حنيفة-ش ئامادە بوایە وەڵامی نەدەدایەوە تا أبو حنيفة وەڵامی دەدایەوە، جا پرسیار**

**لە أبو حنيفة کرا دەربارەی (النبيذ) ویستی روخسەت بدات بە خواردنەوەی سفيان دەستی خستە سەر دەمی أبو حنيفة پاشان پێی ووت: گەر لە کوفە روخسەتت پێداین ئەوا لە مەدینە قبوڵ ناکرێ.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 73]

ووتم: أحمد بن محمد المنصوري تۆمەتبارە بە درۆ، سليمان بن الربيع النهدي الخزاز زەعيفە، حامد بن آدم درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا أحمد بن محمد الصيرفي قال حدثنا علي بن عمرو الحريري قال حدثنا النخعي القاضي قال حدثنا محمد بن علي بن عفان قال حدثنا يحيى بن عبدالحميد عن أبيه ووتی: **بە أبو حنيفة گەیشتەوە کە سفيان خۆی حەشاردەدا بە جل و بەرگ و لە پشت دینگەکەی دەخەوێ و گوێ لە بابەتەکانی دەگرێ، أبو حنيفة ووتی: گەر سفيان هات پێم بڵێن، جا پێیان ووت سفيان هات، أبو حنيفة ووتی: حدثني سعيد بن مسروق باوکی ئەم داپۆشراوە عن عباية بن رفاعة عن رافع بن خديج حوشترێک لە حوشترەکانی زەکات ڕایکرد پیاوێک تیرێکی تێگرت، جا پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەمە، فەرمووی: بیخۆن، ئەم حوشترانە کێوی بوونیان هەیە وەک کێوی بوونی ئاژەڵی درندە، جا هەر یەکێکیان ئاوای بەسەرهات ئاوای لێ بکەن، سفيان نەگەڕایەوە دوای ئەمە.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 73]

ووتم: أحمد بن محمد بن علي أبو عبدالله الصيرفي ناسراو بە (ابن الآبنوسي) کەس تەوسیقی نەکردووە، الخطيب دەربارەی دەڵێ: أبو بكر البرقاني پێی ووتم: ابن الآبنوسي داوای کتێبی (جامع الترمذي) لێم کرد، ووتم: کتێبەکەم بیستووە بەڵام نوسخەی کتێبەکەم لا نیە، جا دوای مردنی ابن الآبنوسي لەناو کتێبەکانی کتێبێکم بینی نوسخەیەک لە کتێبی (جامع الترمذي) تێدا بوو لەسەر کتێبەکە ناوی من و خۆی نوسی بوو ! جا ئەم شتەم بۆ حمزة الدقاق گێڕایەوە ووتی: ابن الآبنوسي بە ئەنقەست درۆ ناکات بەڵام حەزی لێبوو کتێب کۆ بکاتەوە.

يحيى الحماني خیلاف زۆرە دەربارەی زەعیفە یان نا ناتوانم تەرجیح بکەم.

عبدالحميد الحماني باوکی يحيى گێڕانەوەکەی لەوە دەچێ کە خۆی ئامادەی ڕووداوەکە نەبووە.

سعيد بن مسروق باوكی سفيان الثوري-ە بۆيە أبو حنيفة دەڵێ: حدثني سعيد بن مسروق باوكی ئەم داپۆشراوە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر بن إبراهيم المقرىء قال حدثنا مكرم بن أحمد قال حدثنا أحمد بن محمد قال حدثنا ابن سماعة ووتی: **بيستم أبو يوسف ووتی: أبو حنيفة دادەنيشت سفيان بە داپۆشراوی دەهات گوێی لە ووتەكانی أبو حنيفة دەگرت كەسيش نەيدەزانی لەوێيە، جا أبو حنيفة ڕۆيشت پياوێكی خەوتووی داپۆشراو بە جلەكانی بينی، أبو حنيفة ووتی: حدثني باوكی ئەم خەوتووە سعيد بن مسروق.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 73]

ووتم: أحمد بن محمد (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عبدالله بن محمد الحلواني قال حدثنا مكرم بن أحمد قال حدثنا أحمد يعني ابن محمد بن مغلس قال حدثنا الحسن بن بشر قال حدثني زائدة ووتی: **لەژێر سەری سفيان كتێبێكم بينی كە سەيری دەكرد، منيش ئيزنم لێی وەرگرت كە سەيری بكەم، جا كتێبەكەی پێدام بينيم كتێبی (الرهن) بوو هی أبو حنيفة، پێم ووت: سەيری كتێبەكانی دەكەيت ؟ ووتی: حەزم دەكرد هەموو كتێبەكانی لەلام بوايە كۆم كردبوايەوە سەيرم كردبوايە، لە شەرح كردنی عيلمدا هيچ ئامانجێك نەماوە بەڵام ئێمە ئينصافمان نەبوو بەرامبەری.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 74]

ووتم: أحمد بن محمد بن مغلس (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: حدثنا عبدالله بن محمد البزاز قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد قال حدثنا **الحسين بن حماد ووتی: هاوەڵانی أبو حنيفة ئەوانەی كە بەردەوام لە بازنەی دەرس ووتنەوەی بوون دە كەس بوون، ئەوانەی فيقهيان لەبەر بوو وەك لەبەركردنی قورئان چواركەس بوون، زفر بن الهذيل ويعقوب بن إبراهيم و أسد بن عمرو وعلي بن مسهر، وە پێيان وايە سفيان فيقهی لە علي بن مسهر وەردەگرت لە ووتەكانی أبو حنيفة، وە سفيان پشتی بە علي بن مسهر و موزاكەرەی ئەو بەست بۆ نوسينی كتێبەكەی كە ناوی نا (الجامع).**

[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 74]

ووتم: أحمد بن الصلت درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر بن إبرهيم قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد قال حدثنا يحيى الحماني ووتى: **بيستم علي بن مسهر ووتى: من دەچوومە لای سفيان عيلمى أبو حنيفة-م بۆی دەبرد، جا ئەمە گەيشتەوە بە أبو حنيفة، ووتى: بۆچى عيلمەكەت دەدەيت بە كەسێک كە سوپاست ناكات لەسەری ؟** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 74]

ووتم: أحمد بن الصلت درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر بن إبراهيم قال حدثنا مكرم قال حدثنا عبدالوهاب بن أبي حية قال حدثني عبدالملك بن أحمد قال سمعت محمد بن شجاع يقول سمعت محمد بن عبيد الطنافسي دەيووت: **بيستم أبو معاوية دەيووت: بەردەوام سفيان لەلامان گەورە بوو تا ئەوكاتەی قسەی بە أبو حنيفة ووت، ئێمەش هەجرمان كرد و ڕەفزمان كردەوە.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 76]

ووتم: محمد بن شجاع الثلجي درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: حدثنا عمر بن إبراهيم قال حدثنا مكرم قال حدثنا قال أحمد بن محمد بن مغلس قال حدثنا ابن نمير قال حدثني أبي ووتى: **الأعمش گەڕپرسياری دەربارەی بابەتێک لێكرابوايە دەيووت: بڕۆن بۆ ئەم بازنەيە، واتا بازنەی دەرس ووتنەوەی أبو حنيفة.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 78]

ووتم: أحمد بن محمد بن مغلس (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا أبو حفص عمر بن إبراهيم المصري قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد بن محمد ابن مغلس قال حدثنا يحيى بن أكثم ووتى: بيستم جرير ووتى: **المغيرة بن مقسم الضبي پێی ووتم: لەگەڵ أبو حنيفة دانيشە گەر إبراهيم (النخعي) زيندوو بوايە ئەوا پێويستى بە دانيشتن لەگەڵ أبو حنيفة هەبوو، والله أبو حنيفة بە چاكى دەزانێ قسە لە حەلال و حەڕامدا بكات.**

[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 79]

ووتم: أحمد بن محمد بن مغلس (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا أحمد بن محمد الصيرفي قال حدثنا محمد بن أحمد المسكي قال حدثنا علي بن محمد النخعي قال حدثنا محمد بن سعدان قال حدثنا أبو سليمان الجوزجاني قال حدثنا خارجة بن مصعب ووتی: **بیستم عبدالله بن عون باسی أبو حنيفة-ی كرد ووتی: ئەو خاوەنی شەو نوێژ و عیبادەت بوو، هەندێك لەوانەی مەجلیسەكەی ووتیان: ئەو ئەمڕۆ قسەیەك دەكات پاشان بەیانی لێی پەشیمان دەبێتەوە، ابن عون ووتی: ئەمە بەڵگەیە لەسەر وەرع، هیچ كەسێك لە ووتەیەك پەشیمان نابێتەوە بۆ ووتەیەكی تر تەنها خاوەنی دین نەبێ، گەر ئەمە نەبوایە ئەوا هەڵەكەی خۆی سەردەخست و بەرگری لێ دەكرد.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 79]

ووتم: دوو خارجة بن مصعب، یەكێكیان باپیرە ئەوی تریان نەوەیە، خارجة بن مصعب بن خارجة بن مصعب، خارجة-ی یەكەم نەوەیە، خارجة-ی دووەم باپیرەیە، باپیرەكە مەتروكە، نەوەكە صدوق-ە، ئەمەی سەنەدەكە باپیرەكەیە چونكە لە عبدالله بن عون ڕیوایەت دەكات عبدالله ساڵی 151 مردووە ئەویش ساڵی 168 مردووە بەڵام نەوەكەی ساڵی 264 مردووە بە عبدالله بن عون نەگەیشتووە.

بەهۆی ئەم سەنەدەوە گەیشتم بە دڵنیایی ئەو محمد بن سعدان-ەی كە لە ڕیوایەتەكانی پێشوو باسمان كرد دوو محمد بن سعدان هەیە یەكێكیان مەجهولە و ڕیوایەتی مونكەری هەیە ئەوی تریان سیقەیە، جا ئەوەی أبو بشر الدولابي ڕیوایەتی لێوە دەكرد ئەوەیانە كە مەجهولە و ڕیوایەتی مونكەری هەیە چونكە ئەوی تریان كە سیقەیە ساڵی 231 مردووە وەك باسمان كرد، لەم سەنەدەدا علي بن محمد النخعي ڕیوایەت لە محمد بن سعدان دەكات، النخعي ساڵی 324 مردووە ئەو محمد بن سعدان-ەی كە سیقەیە ووتمان ساڵی 231 مردووە ئەی باشە النخعي چ ساڵێك ئەمەی بیستووە لە محمد ؟ ئەی ئەوكات تەمەنی خۆی چەند بووە ؟ گەر بڵێین بەلانی كەم تەمەنی 16 ساڵ بووە واتا ساڵی 215 لەدایكبووە ئەمە گەورەترین ئەگەرە كە هەمیشە ئەگەرە گەورەكان وەردەگرین بۆ ئەو ڕاویانەی كە ساڵی مردنیان یان لە دایكبوونیان نازانین ئەگینا ئەستەمە ساڵی 231 ئەمەی بیستبێ چونكە دەكرێ چەند ساڵێك بەر لە مردنی محمد ئەمەی بیستبێ بەڵام ئێمە هەمیشە ساڵی وەفاتی ڕاوییەكە هەژمار دەكەین وەك یەدەگ تا بیانوومان پێ نەگرن، وە تەمەنی

ئەوەی ڕیوایەتی لێوە دەكات زۆر بە گەنجی هەژمار دەكەین لەنێوان 15 بۆ 20 ساڵ لەكاتێكدا زۆربەی بیستنەكان لەسەرووی ئەم تەمەنەیە، جا ئایا دەكرێ النخعي 109 ساڵ ژیا بێت لەكاتێكدا زۆرینەی ئەو شێخانەی النخعي ڕیوایەتی لێوە كردوون لە ماوەی نێوان ساڵانی 270 بۆ 280 مردوون، گەر النخعي لە ساڵی 231 بە محمد بن سعدان بگات ئەی بۆ هیچ ڕیوایەتێكی نیە لەو شێخانەی كە لە نێوان ساڵانی 230 و 240 و 250 مردوون ؟

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر بن إبراهيم المقرىء قال حدثنا مكرم بن أحمد قال حدثنا أحمد بن محمد قال حدثنا أبو الوليد ووتی: **شعبة بە چاكە باسی أبو حنيفة-ی دەكرد، زۆر دوعای بۆ دەكرد، نەم بیستووە هەرگیز لە بەردەم شعبة باسی أبو حنيفة بكرێ ئیللا دوعای بۆ كردووە.**
**[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 80]**
ووتم: أحمد بن محمد (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر بن إبراهيم قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد قال حدثنا نصر بن علي ووتی: **ئێمە لەلای شعبة بووین جا بە شعبة ووترا أبو حنيفة مرد، شعبة دوای إنا لله وإنا إليه راجعون ووتی: ڕووناكی نوری عیلم كوژایەوە لەسەرئەهلی كوفە، ئەوان هەرگیزكەسێكی تر نابینن وەك ئەو.** **[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 80]**
ووتم: أحمد بن الصلت درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عبدالله بن محمد الحلواني قال حدثنا مكرم بن أحمد قال حدثنا أبو جعفر أحمد ابن محمد بن سلامة الطحاوي فيما كتب به إلي قال حدثنا جبرون بن عيسى بن يزيد قال حدثنا أيوب العراقي أبو هشام قال حدثني محمد بن رشيد صاحب عبدالرحمن بن القاسم عن يوسف بن عمرو عن ابن الدراوردي ووتی: **مالك و أبو حنيفة-م بینی لە مزگەوتی پێغەمبەری الله ﷺ دوای نوێژی عیشا، ئەو شتانەی لەبەریان كردبوو بۆ یەكتریان دەووتەوە و دیراسەیان دەكرد تا ئەوكاتەی یەكێكیان ووتەی بەرامبەرەكەی دەبینی كە فەتوای پێ داوە و كاری پێكردووە دەستیان لەیەكتر هەڵدەگرت بەبێ زۆر**

**كردن و بە هەڵە دانانى يەكێكيان بۆ ئەوى تر، تا نوێژى بەيانيان دەكرد لەو مەجليسەياندا.**
[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 81]

ووتم: جبرون بن عيسى بن يزيد زەعيفە، أيوب العراقي و محمد بن رشيد نەمدۆزينەوە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر بن ابراهيم المقرىء قال حدثنا مكرم قال حدثنا جعفر بن سهل بن فروخ قال حدثنا أحمد بن محمد قال حدثنا سليمان بن الربيع قال حدثنا **كادح بن زحمة ووتى: پياوێك پرسيارى لە مالك بن أنس كرد دەربارەى كەسێك كە دوو جلى هەيە يەكێكيان پيسە ئەوى تريان پاكە جا كاتى نوێژ هاتووە، مالك ووتى: پاكەكە لەبەر دەكات. كادح دەڵێ: ووتەى أبو حنيفة-م بە مالك ووت كە دەڵێ: هەرجارە و بە جلێكيان نوێژدەكات، جا مالك فەرمانى كرد پياوەكە بگەڕێننەوە، ئينجا فەتواى بۆدا بە ووتەكەى أبو حنيفة.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 81]

ووتم: أحمد بن محمد (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە، سليمان بن الربيع زەعيفە، كادح بن زحمة الله أعلم چ كەسێكە جگە لەم ڕيوايەتە لە هيچ شوێنێكى تر ناويم نەدۆزييەوە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر بن إبراهيم قال حدثنا مكرم قال حدثنا ابن مغلس قال حدثنا الحماني قال حدثنا **ابن المبارك ووتى: من لەلاى مالك بن أنس بووم پياوێك هاتە لاى مالك بەرزى كردەوە، پاشان ووتى: دەزانن ئەمە كێيە ؟ كاتێك چووە دەرەوە، ووتيان: نەخێر، منيش ناسيم، مالك ووتى: ئەمە أبو حنيفة-ى عيراقى بوو، گەر بڵێ ئەم دينگەيە لە زێڕە ئەوا ووتەكەى ڕاست دەردەچێ، فيقهـ بۆى گونجێنراوە ماندوو بوونى گەورەى پێ ناوێ بۆ ئەو، ابن المبارك دەڵێ: وە سفيان الثوري هاتە لاى مالك لەشوێنێكى نزمتر لە شوێنەكەى أبو حنيفة-ى دانيشاند، كاتێك چووە دەرەوە، ووتى: ئەمە سفيان بوو، جا باسى فيقهـ و وەرعى سفيان-ى كرد.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 81]

ووتم: ابن مغلس (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر بن إبراهيم قال ثنا مكرم قال ثنا أحمد بن عطية قال سمعت ابن أبي إسرائيل قال سمعت ابن عيينة ووتى: **چووم بۆ لاى سعيد بن أبي عروبة، پێى ووتم: ئەى باوكى محمد**

**هیچ دیارییەکم نەدیوە وەک ئەوانەی کە لە شارەکەی تۆوە بۆمان دێت لەلایەن أبو حنیفة-ەوە، حەز دەکەم الله ئەو عیلمە بهێنێتە دەرەوە کە أبو حنیفة هەیەتی بۆ ناو دڵی ئیمانداران، الله بە جۆرێک فیقهی داوە بەم پیاوە وەک بڵێی بۆ فیقهـ دروست بووە.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 82]

ووتم: أحمد بن عطية (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر بن إبراهيم قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد قال حدثنا ابن كاسب ووتی: **بیستم سفیان بن عیینة دەیووت: ئەوەی المغازي دەوێ با بچێتە مەدینە، ئەوەی مەناسکی دەوێ با بچێتە مەککە، ئەوەی فیقهی دەوێ با بچێتە کوفە و پابەند بێ بە هاوەڵانی أبو حنیفة.**
[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 82]

ووتم: (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عبدالله بن محمد الحلواني قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد قال حدثنا محمد بن المثنى صاحب بشر بن الحارث ووتی: **بیستم ابن عیینة ووتی: زاناکان چوارن: ابن عباس لە سەردەمی خۆی، الشعبي لە سەردەمی خۆی، أبو حنیفة لە سەردەمی خۆی، الثوري لە سەردەمی خۆی.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 83]

ووتم: (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە، پێشتریش ئەم ڕیوایەتەمان هێنا لە تاريخ بغداد هەر لە ڕێگای الصيمري.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا أبو القاسم عبدالله بن محمد البزاز قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد بن محمد قال حدثنا الحماني قال حدثنا ابن المبارك ووتی: **باسی أبو حنیفة کرا لە بەردەم داود الطائي، جا ووتی: ئەوە ئەستێرەیەکە کەسی ڕۆیشتوو لە شەودا ڕێگای پێ دەدۆزێتەوە، وە عیلمێکە دڵی ئیمانداران قبوڵیان کردووە، هەر عیلمێک لە عیلمی ئەو نەبێت ئەوا بەڵایە بۆ سەر خاوەنەکەی، والله ئەو عیلمی حەرام و حەلال و ڕزگار بوون لە سزای الجبار-ی لایە، لەگەڵ وەرع و خزمەتێکی بەردەوام.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 83]

ووتم: أحمد بن محمد (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە، الحماني مامیەتی ناوی (جبارة بن مغلس)ە مەتروکە، داود الطائي قوتابی أبو حنيفة بووە ووتەکەی نرخی نیە گەر صەحیحیش بێت.

**الصيمري** دەڵێ: حدثنا القاضي أبو نصر محمد بن محمد بن سهل النيسابوري الفقيه قال حدثنا أحمد ابن هارون قال حدثني محمد بن المنذر بن سعيد الهروي قال حدثنا محمد بن سهل بن منصور الرازي قال حدثني أحمد بن إبراهيم قال سمعت منصور بن هاشم دەیووت: **ئێمە لەگەڵ عبدالله بن المبارك بووین لە القادسية کاتێک پیاوێک هاتە لای کە خەڵکی کوفە بوو جا کەوتە قسە ووتن بە أبو حنيفة، عبدالله پێی ووت: قسە بە پیاوێک دەڵێی کە 45 ساڵ پێنج نوێژە فەرزەکەی کردووە بە یەک دەست نوێژ، هەموو قورئانی دەخوێند لە دوو رکعەتی شەو نوێژدا، ئەو فیقهەی کە هەمە لە أبو حنيفة فێری بووم.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 84]

ووتم: محمد بن سهل بن منصور الرازي و منصور بن هاشم نەمدۆزینەوە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عبدالله بن إبراهيم البزاز قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد قال حدثنا الحماني ووتی: **بیستم ابن المبارك دەیووت: گەر سفيان و أبو حنيفة کۆک بن لەسەر شتێک ئەوا دەیکەم بە حوججە لە نێوان خۆم و الله دا لەو شتانەی کە فەتوای پێ دەدرێت لە دینی الله دا.**

[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 84]

ووتم: أحمد بن الصلت درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر بن إبراهيم قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد بن عطية قال حدثنا نصر بن علي قال حدثنا **عبدالله بن داود ووتی: هەرکەسێک دەیەوێ دەرچێ لە زەلیلی کوێرایەتی و جەهل، وە چێژی فیقهـ هەست پێ بکات ئەوا با سەیری کتێبەکانی أبو حنيفة بکات.**

[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 85]

ووتم: أحمد بن عطية (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا أحمد بن محمد الصيرفي قال حدثنا محمد بن أحمد المسكي قال حدثنا

علي بن محمد بن كأس قال حدثنا محمد بن محمود الصيدلاني قال حدثنا محمد بن شجاع ووتی: **عبدالله ابن داود ووتی: أبو حنيفة عەیبدار ناکات تەنها دوو کەس نەبێت، جاهیلێک فەزلی ووتەی أبو حنيفة نازانێ، یان حەسودێک بە عیلم نەگەیشتووە جا حەسودی پێ دەبات.**

[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 85]

ووتم: محمد بن شجاع الثلجي درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عبدالله بن محمد البزاز قال حدثنا مكرم قال حدثنا عبدالوهاب بن محمد قال حدثنا علي بن الحسين الدرهمي بالبصرة ووتی: **الخريبي پێی ووتین: والله أبو حنيفة بە سودتر بوو بۆ موسڵمانان لەم دووانە، واتا حماد بن سلمة و حماد بن زيد.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 85]

ووتم: عبدالوهاب بن محمد المروزي نەمدۆزیەوە، الخريبي عبدالله بن داود-ە پێشتر باسمان کرد کە ئیمام أحمد دەڵێ بینیم فەرموودەم لێی نەنوسیەوە حەزی لە ڕەئی بوو، بۆیە ووتەی کەسێکی ئاوا سەنگی نیە گەر صەحیحیش بێت، پاشان ووتەکەی بە هیچ شێوەیەک ڕاست نیە دوو حەممادەکە لەکوێ أبو حنيفة لەکوێ ! تانەدانە لەم دووانە گەر بەراوورد بکرێن بە أبو حنيفة.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عبدالله بن محمد قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد بن محمد قال حدثنا نصر بن علي ووتی: **بە أبو عاصم-م ووت: لەلای تۆ أبو حنيفة فەقیهترە یان سفيان ؟ ووتی: والله لەلای من أبو حنيفة لە ابن جريج فەقیهترە، چاوم کەسی نەدیوە لەو بە تواناتر بێ لە فیقهـ.**

[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 86]

ووتم: أحمد بن محمد (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر بن إبراهيم قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد بن عطية قال سمعت تميم بن المنتصر دەیووت: **پیاوێک بە يزيد بن هارون-ی ووت: ئەی باوکی خالد ڕەئی مالك لەلات خۆشەویسترە لە ڕەئی أبو حنيفة ؟ ووتی: فەرموودەی مالك بنوسەوە ئەو پیاوە سیقەکانی هەڵدەبژارد، وە فیقهیش پیشەی أبو حنيفة-یە. نەمدیوە کەسێک مونازەرەی لەگەڵ بکات لە**

**شتێک لە فیقهدا ئیللا سەرکەوتووە بەسەریدا، فیقهـ پیشەی أبو حنیفة و هاوەڵانیەتی، وە میراتیش وەک بڵێی ئەوان بۆ میرات دروستکراون.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 86]

ووتم: أحمد بن عطية (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: حدثنا العباس بن أحمد الهاشمي قال حدثنا علي بن عمرو الحريري قال حدثنا علي بن محمد النخعي قال حدثنا إبراهيم بن مخلد قال حدثنا أبو سعيد البلخي قال سمعت أبا عبدالرحمن المقرئ ووتی: **عبدالعزيز بن أبي رواد ووتی: أبو حنيفة ئامرازی تاقی کردنەوەیە، هەرکەسێک أبو حنيفة-ی خۆشبوێ سوننیە، وە هەرکەسێک ڕقی لێی بێت بیدعەچیە.**

[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 86]

ووتم: إبراهيم بن مخلد البلخي مەجهولە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا أبو القاسم عبدالله بن محمد الحلواني قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد بن محمد قال حدثنا إبراهيم بن سعيد الجوهري قال حدثنا شبابة بن سوار قال أخبرني أبي ووتی: **الحسن بن عمارة-م بینی لە گۆڕستانی الخيزران لەلای گۆڕی أبو حنيفة دەگریا و دەیووت: ڕەحمەتی الله-ت لێبی، تۆ جێگرەوەی ئەوانەی پێشین بووی، وە لەدوای خۆت جێگرەوەت جێ نەهێشت، گەر جێگاشت بگرنەوە لەو عیلمەی کە فێرت کردوون ئەوا ناتوانن جێگات بگرنەوە لە وەرع تەنها بە تەوفیقی الله نەبێ، ووتم: ئەمە کێیە ؟ ووتیان: گۆڕی أبو حنيفة-یە.**

[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 86]

ووتم: أحمد بن محمد (أحمد بن الصلت)ە درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عبدالله بن محمد قال حدثنا القاضي أبو بكر مكرم بن أحمد قال حدثنا الحسين بن علي بن حبان عن أبيه ووتی: **بە أبو زكريا يحيى بن معين ووترا: کامەیان خۆشەویسترە لەلات الشافعي یان أبو حنيفة یان أبو يوسف ؟ ووتی: الشافعي حەزم بە فەرموودەکانی نیە، وە أبو حنيفة کەسانی چاک ڕیوایەتیان لێوەی کردووە، وە أبو يوسف ئەهلی درۆ کردن بوو ڕاستگۆ**

**بوو، پێی ووترا: أبو حنيفة ڕاستگۆ بوو لە فەرموودە ؟ ووتی: بەڵێ صدوق بوو.**
[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 86]
ووتم: شێخەکەی الصيمري پێشتر باسمان کرد کە ڕوون نیە کامەیانە.
علي بن حبان پێشتر باسمان کرد جەرح و تەعدیلی بۆ نەکراوە، وە کەسیش ئاوڕی لەم ووتەیەی يحيى بن معين نەداوەتەوە کە لەڕووی فەرموودەوە الشافعي عەیبدار دەکات و أبو حنيفة و أبو يوسف مەدح دەکات أبو حنيفة و أبو يوسف نە لە حفز نە لە ڕاستگۆیی ناگەن بە الشافعي، هەندێک ئەم کارەی بە دەمارگیری مەزهەبی ناو دەبەن چونکە وەک ووتمان سەرەتای تەمەنی کتێبەکانی أبو حنيفة-ی خوێندووە لەلای محمد بن الحسن الشيباني بۆیە هەندێک بە حەنەفی مەزهەب هەژماری دەکەن، ئەوەشمان بیر نەچێ کە يحيى بن معين أبو حنيفة-ی بە جەهمی ناو بردووە، وە وتوویەتی فەرموودەکانی نانوسرێنەوە، ڕەنگە سەرەتا تەوسیقی کردبێ دواتر حاڵی بۆ دەرکەوتبێ.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر بن إبراهيم المقرئ قال حدثنا مكرم قال حدثنا محمد بن علي بن العباس البزاز قال حدثني القاسم المعشري والحسين بن فهم وجگە لەوانیش ووتیان: **بیستمان يحيى بن معين دەیووت: فەقیهەکان چوارن: أبو حنيفة و سفيان و مالك و الأوزاعي.**
[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 87]
ووتم: محمد بن علي بن العباس البزاز نەمدۆزیەوە.

**الصيمري** دەڵێ: حدثنا الشريف أبو الحسن العباس بن أحمد بن الفضل الهاشمي قال حدثنا أحمد بن محمد بن المنصوري قال حدثنا علي بن محمد بن كأس النخعي قال حدثنا أحمد بن أبي خيثمة قال حدثنا سلمة النحوي ووتی: سليمان بن داود الهاشمي ووتی: **الشافعي پێی ووتم: ووتەی أبو حنيفة گەورەترە لەوەی کە بە ئاسانی ڕەت بکرێتەوە.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 87]
ووتم: أحمد بن محمد بن المنصوري هەڵەیە المنصوري نازناویەتی نەک ناوی باپیری بێت لە لاپەڕە 73 و 90 ناوەکەی ڕاست کراوەتەوە، أحمد بن محمد بن صالح بن عبد ربه المنصوري تۆمەتبارە

به درۆ، الذهبي له ميزان الاعتدال فەرموودەيەكی درۆ دەهێنێ كه المنصوري ڕیوایەتی كردووه، الذهبي دەڵێ هۆكارەكەی المنصوري-ە.

**الصيمري** دەڵێ: حدثنا العباس بن أحمد قال حدثنا أحمد بن محمد بن المنصوري قال حدثنا علي بن محمد النخعي قال حدثنا الحسن بن قتيبة قال حدثنا حرملة بن يحيى ووتی: **بيستم الشافعي دەيووت: هەركەسێک سەيری كتێبەكانی أبو حنيفة نەكات ڕۆنەچووه له فيقهدا.**
[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 87]
ووتم: أحمد بن محمد المنصوري تۆمەتباره به درۆ، حسن بن قتيبة مەتروكه.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عبدالله بن محمد قال حدثنا مكرم قال حدثنا عبدالصمد بن عبيدالله عن عبدالله بن محمد بن نوح قال حدثنا حفص بن يحيى قال حدثنا محمد بن أبان عن الحارث ابن عبد الرحمن ووتی: **ئێمه لەلای عطاء بووين هەندێكمان لەدوای هەندێكی ترمان، جا كاتێک أبو حنيفة هات عطاء شوێنەكەی بۆ فراوان كرد و نزيكی كردەوه لەخۆی.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 89]
ووتم: عبدالصمد بن عبيدالله نەمدۆزيەوه مەگەر عبيدالله بن عبدالصمد بێ، عبدالله بن محمد بن نوح نەمدۆزيەوه، حفص بن يحيى گەر التيمي بێت تەنها ابن حبان له الثقات هێناويەتی بەبێ بەكارهێنانی هيچ لەفزێكی جەرح و تەعديل، گەر يەكێكی تر بێت نازانم، محمد بن أبان زۆره نازانم كامەيانه، الحارث بن عبدالرحمن نەمدۆزيەوه.

**الصيمري** دەڵێ: أنشدنا أبو الحسن العباس بن أحمد بن الفضل الهاشمي قال أنشدنا أحمد بن محمد المنصوري قال أنشدنا علي بن محمد النخعي قال أنشدنا إسحاق بن إبراهيم بن مقراض قال أنشدنا سويد بن سعيد المروزي ووتی: **بيستم ابن المبارك دەيووت:**

**لقد زان البلاد ومن عليها *** إمام المسلمين أبو حنيفــة**
**بآثار وفقه في حديــــث *** كآثار الزبور على الصحيفة**

**فما في المشرقين له نظير *** ولا بالمغربين ولا بالكوفـــــــــة**

**رأيت العائبين له سفاها *** خلاف الحق مع حجج ضعيفة**

**واتا: وولات و دانيشتوانى وولاتى جوان كرد ئيمامى موسڵمانان أبو حنيفة، به ئاثارو فيقهـ له فەرموودەدا، وەک ئاسەوارى نوسين لەسەر پەڕاودا، نه له دوو خۆرهەڵاتەكه و نه له دوو خۆرئاوابوونەكه ونه له كوفەش هاوشێوەى نيه، بينيم ئەوانەى عەيبداريان دەكرد عەقڵيان پوچ بوو خيلافى حەقيان دەكرد به بەڵگەى لاواز.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 90]

ووتم: أحمد بن محمد المنصوري تۆمەتباره به درۆ، إسحاق بن إبراهيم بن مقراض نەمدۆزيەوه، سويد بن سعيد المروزي نەمدۆزيەوه.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا أبو القاسم عبدالله بن محمد الحلواني قال حدثنا مكرم قال حدثنا عبدالوهاب ابن محمد قال حدثنا يعقوب بن شيبة قال أخبرني عبدالله بن الحسن عن بشر بن الوليد ووتى:

**أبو حنيفة له بەنديخانه مرد و له گۆڕستانى الخيزران نێژرا.**

**يعقوب بن شيبة دەڵێ: پێم ڕاگەيەندرا أبو حنيفة له سوجدەدا مرد.**

[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 93]

ووتم: مەبەستم بڕگەى دووەمى ڕيوايەتەكەيه كه يعقوب بن شيبة دەڵێ: پێم ڕاگەيندرا (خُبرت) ئەمه صيغەى تمريض-ه زەعيفه نازانين كێ پێى ڕاگەياندووه يعقوب 32 ساڵ دواى مردنى أبو حنيفة له دايكبووه، ئەم ڕيوايەتەشم بۆ دڵ نەخۆشەكان هێنا ڕەنگه بەهۆى ئەم ڕووداوه كوفر و بيدعەكانيان بير چێتەوه بڵێن مادام له سوجدەدا مردووه كەواته موسڵمان بووه ئەم فەزله الله به هەموو كەسێكى نادات ...هتد، ڕيوايەتەكه زەعيفه وەک باسمان كرد.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر بن إبراهيم قال حدثنا مكرم قال حدثنا أحمد بن عطية قال حدثنا عبدالله ابن مطيع ووتى: **بيستم باوكم دەيووت: تەرمى پياوێكم بينى له سەردەمى أبو جعفر** ... (دواى باسكردنى ڕێوڕەسمى ناشتنى و نوێژ لەسەر كردنى ئينجا دەڵێ) **خەڵكى بۆ ماوەى بيست ڕۆژ زياتر نوێژيان لەسەر گۆڕەكەى دەكرد.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 93]

ووتم: أحمد بن عطية (أحمد بن الصلت)ه درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر بن إبراهيم قال حدثنا مكرم قال حدثنا ابن مغلس قال حدثني خلف بن سالم ووتى: **بيستم صدقة المقابري -دوعاى قبوڵ بوو- دەيووت: كاتێک أبو حنيفة نێژرا لە گۆڕستانى الخيزران دەنگێكم بيست لە شەودا بۆ ماوەى سێ شەو:**

**ذهب الفقه فلا فقه لكـــم *** فاتقوا الله وكونوا خلفـا**

**مات نعمان فمن هذا الذي *** يحيى الليل إذا ما سجفا**

**واتا: فيقهـ ڕۆيشت فيقهتان نيە، تەقواى الله-تان هەبێ ببن بە جێگرەوە، النعمان مرد، كێيە ئەو كەسەى كە شەو زيندوو دەكاتەوە كە تاريک بوو.** [أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 94]

ووتم: ابن مغلس (أحمد بن الصلت)ه درۆزنە.

**الصيمري** دەڵێ: أخبرنا عمر بن إبراهيم قال حدثنا مكرم قال حدثنا عمر بن إسحاق بن إبراهيم قال حدثنا علي بن ميمون ووتى: **بيستم الشافعي دەيووت: من تەبەروک دەكەم بە أبو حنيفة و دەچمە لاى گۆڕەكەى لە هەموو ڕۆژێكدا سەردانى دەكەم، جا گەر شتێكم پێويست بوايە دوو ركعەت نوێژم دەكرد و دەهاتم بۆلاى گۆڕەكەى و داواى پێداويستيم لە الله دەكرد.**

[أخبار أبي حنيفة وأصحابه : 94]

ووتم: عمر بن إسحاق بن إبراهيم تەنها لێرەدا ناوى هەيە لە هيچ شوێنێكى تر ناوى نيە كەس نازانێ كێيە، ابن تيمية دەڵێ: ئەم ڕيوايەتە درۆيە، زۆر زاناى تر قسەيان لەسەر كردووە بە درۆيان زانيوە.

وە دەووترێ: أبو معاوية الضرير وتوویەتی: خۆشویستنی أبو حنيفة لە سوننەتدایە، وە حفص بن غياث وتوویەتی: ووتەی أبو حنيفة لە فیقهدا لە موو باریکتر بوو، کەس عەیبداری ناکات تەنها جاهیل نەبێ، ئەم ووتانە الذهبي هێناویەتی بەبێ سەنەد بۆیە باسم نەکردووە لە کتێبەکەدا چونکە نازانین حاڵی سەنەدەکان چۆنە، گەر صەحیحیش بێت أبو معاوية الضرير مورجیئەیەکی پیس بووە وەک ابن حبان باسی دەکات، وە أبو داود دەڵێ: سەرکردەی مورجیئە بوو لە کوفە، وە دەووترێ وکیع ئامادەی جەنازەکەی نەبووە بەهۆی ئیرجاء، جا ئاساییە کەسێکی ئاوا مەدحی أبو حنيفة بکات چونکە أبو حنيفة پێشەنگی بووە لەم کارەدا، سەبارەت بە حفص بن غياث هێنامان لە بەشی یەکەم کە لە دژی أبو حنيفة قسەی کردووە نەک مەدحی بکات، سەبارەت بە ووتەکەی زانایانی المتأخرين و زانایانی سەردەم شایستەی باسکردن و ئاوڕ لێدانەوە نیە چونکە زانراوە لای ئەوان أبو حنيفة ئیمامە، بگرە بە هیچ جۆرێک قبوڵی ناکەن ئەم ووتانەی سەلەف دەربارەی باس بکرێ و بڵاو بکرێتەوە، جا کاتێک ووتەی ئەم هەموو زانایەی سەلەف بەر دەست بوو دەربارەی کەسێک کە خۆیان لەگەڵی ژیاون یان لە سەردەمەکەی ئەو نزیک بوونە ئەوا هیچ پێویست ناکات بگەڕێینەوە سەر ووتەکەی کەسانێک کە سەدان ساڵ دوای ئەم کەسە هاتوون کردوویانە بە ئیمام و نەیارانی بە خەواریج و تێکدەر و فیتنەچی و غولات و ئەم جۆرە ناوانە وەسف دەکەن، بەڵام سەیرم پێدێت بۆ جورئەت ناکەن کە سەلەف بەم ناوانە وەسف بکەن لەکاتێکدا دەزانن ئەم خەڵکە هەر قسەیەک بکات لەدژی أبو حنيفة بەهۆی ووتەکانی سەلەف وای لێهاتووە کە ئەم قسەیە بکات، ئیتر بۆ دەبێ هەموو تاوانەکە لە ملی تابع بێ متبوع-یش هیچی نەیەتە سەر ؟! خۆ بە هەموو پێوەرێک لەپێشترە تاوانەکە بخرێتە ئەستۆی متبوع نەک تابع.

نزیکەی 260 ڕیوایەتمان هێنا دەربارەی مەدحکردنی أبو حنيفة لە هەر چوار کتێبی (الانتقاء)ی ابن عبدالبر و (تارخ بغداد)ی الخطيب و (فضائل أبي حنيفة)ی ابن أبي العوام و (أخبار أبي حنيفة وأصحابه)ی الصيمري، کە خاوەنی ئەم چوار کتێبە جگە لە ڕیوایەتە تایبەتەکانی خۆیان زۆرێک لە ڕیوایەتی کتێبەکانی پێش خۆیان نەقل کردووە وەک کتێبی يوسف بن أحمد لەلایەن ابن عبدالبر

و كتێبی مكرم بن أحمد لەلایەن الصیمري، وە ابن أبي العوام زۆربەی ڕیوایەتەكانی كتێبەكەی أبو بشر الدولابي كۆكردۆتەوە، هەروەها كتێبەكەی علي بن محمد بن كاس النخعي كە بوونی نەماوە الخطیب بەشێكی لێ نەقل كردووە الصیمري بەشێكی زیاتری نەقل كردووە، ئەوانەشی تەنها ناویان ماوە و بەردەست نین یان بوونیان نەماوە گەر هەندێك ڕیوایەتی لە كتێبەكانی دوای خۆی نەقل كرابێ بە سەنەدەوە هێناومە، ئەوانەشی دوای سەدەی پێنجەم نوسراون بەبێ سەنەد و دووبارەكەرەوەی كتێبەكانی پێشوون نەمهێناون چونكە پێویست بە هێنانی ناكات، وە گرنگیم بەم ووتانەش نەداوە كە لەلای زانایانی خەلەف و معاصرین دەربارەی أبو حنیفة ووتراوە لە مەدح و پێداهەڵدان چونكە لای هەمووومان زانراوە كە دوای سەردەمی سەلەف أبو حنیفة لە پڕێك بۆتە كوڕێك دونیای بۆ سەراو ژوور كراوە بە جۆرێك كە هیچ كام لەم زانایانەی سەلەف گەر لە سەردەمی دوای خۆیان ژیابوان بۆیان نەبوو قسەی پێ بڵێن، جا بۆیە كە لێرەدا ئێمە ووتەی سەلەفی صالحمان بەر دەستە دەربارەی كەسێك كە خۆیان لەگەڵی ژیاون یان سەردەمیان لێی نزیك بووە ناچارنین بزانین كەسێك دوای سەدان ساڵ هاتووە یان هەزار ساڵ چۆن لە أبو حنیفة دەڕوانێت، وە پێم وایە ئەم هەموو لاف و گەزافەی كە لێدەدرێ بەناوی شوێنكەوتنی سەلەفی صالح تا ڕاددەیەك دەبێ شەرمەزارتان بكات و واتان لێبكات كە نەتوانن پشت لە ووتەكانی سەلەف بكەن و بگەڕێنەوە بۆ ووتەكانی خەلەف و معاصرین، ئەگینا ووتنی دروشمی (شوێنكەوتنی سەلەفی صالح) جگە لە دروشمێكی درۆ هیچی تر نیە، جا گەر بڕیار وابێ بە تێگەیشتنی خەلەف لە ووتەكانی سەلەف تێبگەین كەواتە خەلەفمان كردۆتە حاكم بەسەر سەلەف هەرچی خەلەف بیەوێ و لەسەری بڕوات هەر ئەوەیە، قسەی سەرەتا و كۆتایی هەر هی خۆیانە، قسەی سەلەف هیچ نرخێكی نیە ئیللا مەگەر خەلەف پێی ڕازی بن و لەسەری بڕۆن ئەوكات نرخی هەیە و جێگای قبوڵە! خۆ ئەگەر بەڕوونیش بزانین لە بابەتێك خەلەف پێچەوانەی سەلەفن دەبێ بڵێین سەلەف هەر ئەوەیان مەبەست بووە كە خەلەف لەسەرینە بەڵام ئێمە لێیان تێناگەین هەر چەندە بابەتە ڕوونیش بێت !

وەک بینیتان ئەو ڕیوایەتانەی باسی حەسودی بردنی سەلەف دەکات بە أبو حنیفة گوایە لە ڕق و حەسودی دژایەتیان کردووە و قسەیان پێی ووتوە هەمووی درۆ بوو، زۆرێک لەو ڕیوایەتانەی کە باسی فیقهـ و وەرع و زوهد و سەخی بوونی دەکرد درۆ بوون یان زەعیف بوون، گەر گریمان صەحیحیش بوایە ئایا ڕیوایەتەکانی بەشی یەکەمی پوچوڵ دەکردەوە ؟ خێرکردنی و شەو نوێژ کردنی و چاکەکردنی لەگەڵ دایکی و زیرەکی لە فیقهدا و زوهد و وەرعەکەی هەموو ئەمانە دەتوانن بابەتەکانی بەشی یەکەم لابەرن لەسەری ؟ بێگومان نەخێر.

## گومانی یەکەم:
## بەڵگە هێنانەوە بە نامیلکەی (الفقه الأکبر)

گوایە أبو حنیفة ئەم نامیلکەیەی نوسیوە کە تێیدا عەقیدەکەی ڕوونکردۆتەوە کە هەمان عەقیدەی ئەهلی سوننەیە، بەڵام بێئاگان لەوەی کە ئەم نامیلکەیە دوورە لە عەقیدەی ئەهلی سوننە، وە گەر هی أبو حنیفة بێت ئەوا کوفر و بیدعەی تری بۆ زیاد دەبێت جگە لەوانەی بەشی یەکەم، بەڵام ئەم نامیلکەیە هی أبو حنیفة نیە، دوای مردنی ماتوریدی و ئەشعەرییەکان نوسیویانە داویانەتە پاڵی، وە نایشارمەوە حەزم دەکرد نامیلکەکە هی ئەو بووایە تا ڕاستەوخۆ لە کتێبی خۆی کوفر و بیدعەکانیم نەقل کردبوایە بەڵام ئینصاف واجبە، ئێمەش لێرەدا لە دوو لایەن قسە لەسەر نامیلکەکە دەکەین، لە لایەنی سەنەدەوە کە بە صەحیحی ناگەڕێتەوە بۆ أبو حنیفة، وە لە لایەنەی ناوەڕۆکی نامیلکەکە کە پێچەوانەی عەقیدەی ئەهلی سوننەیە هەندێک شتی تێدایە لەسەردەمی ئەو بوونی نەبووە، گەر هی ئەو بێت ئەوا کۆمەڵێک پەڵەی تری ڕەشە بەسەر نێوچەوانی نەوەک ببێتە هۆی جوانکردنی أبو حنیفة.

دوو نوسراو هەن بەناوی (الفقه الأکبر) کە دراونەتە پاڵ أبو حنیفة، یەکێکیان بەڕیوایەتی حماد-ی کوڕی، ئەوی تریان بە ڕیوایەتی أبو مطیع کە قوتابی أبو حنیفة-یە، ئێستا هەردووکیان چاپکراون و بەردەستن بەناوی (الفقه الأکبر) بۆ جیاکردنەوەیان حەنەفیەکان نامیلکەی دووەم بە (الفقه الأبسط) ناو دەبەن.

# ناميلكەى (الفقه الأكبر) بەڕیوایەتى حماد بن أبي حنيفة:

## سەنەدى ناميلكەكە:

**محمد بن مقاتل الرازي عن عصام بن يوسف عن حماد بن أبي حنيفة عن أبي حنيفة.**

## حاڵى ڕاوييەكان:

**محمد بن مقاتل الرازي:**

البخاري دەڵێ: گەر لە ئاسمان بكەومە خوارەوە بۆ سەر زەوى خۆشترە لەلام لەوەى كە ڕیوایەت بكەم لە محمد بن مقاتل.

الذهبي دەڵێ: زەعيفە.

ابن حجر دەڵێ: زەعيفە.

**عصام بن يوسف:**

خيلاف هەيە دەربارەى، ابن سعد و ابن عدي بە زەعيفيان داناوە، ابن حبان تەوسيقى كردووە، الخليلي بە صدوق-ى داناوە.

**حماد بن أبي حنيفة:**

پێشتر باسمان كرد كە زەعيفە.

ئەمە حاڵى سەنەدى ناميلكەكە بوو كە هيچ كام لە ڕاوييەكان سەلامەت دەرنەچوون.

## ناوەڕۆكى ناميلكەكە:

ناميلكەيەكى عەقيدەييە باسى تەوحيد و عەقيدە دەكات.

**ئەو خاڵانەی كە دژی عەقیدەی ئەهلی سوننەیە لە نامیلكەكەدا هاتوون:**

**یەكەم:** تێیدا هاتووە **(والله تعالى واحد لا من طريق العدد، ولكن من طريق أنه لا شريك له).**
واتا: الله تعالى یەكە بەڵام لەڕووی ژمارەوە نا، بەڵكو لەو ڕووەدا كە هیچ شەریكێكی نیە !
ووتم: ئەمەش شتێك نیە پێویست بە ڕوونكردنەوە بكات كە پێچەوانەی ئایەت و فەرموودە و فیطرەتی مرۆڤە كە الله تعالى هەم بە ژمارە یەكە و هەم بێ شەریكە، ووتەكە زۆر ترسناكە.

**دووەم:** تێیدا هاتووە **(لم يزل ولا يزال بأسمائه وصفاته الذاتية والفعلية، وأما الذاتية: فالحياة والقدرة والعلم والكلام والسمع والبصر والإرادة، وأما الفعلية: فالتخليق والترزيق والإنشاء والإبداع والصنع ومن غير ذلك من صفات الفعل).**
واتا: بەردەوام ناو وصیفەتە زاتی و فعلیەكانی هەیە و لێ دانابڕێ، صیفەتە زاتیەكان وەك: ژیان و قودرەت وعیلم وكەلام وبیستن وبینین وویستن، وە صیفەتە فعلیەكان وەك: خەلق و رزق و ئینشاء و ئیبداع و صونع و جگە لەمانەش كە صیفاتی فعلین).
ووتم: بەكارهێنانی ووشەی (زاتی و فعلی) بۆ صیفەتەكانی الله لەلای سەلەفدا بوونی نەبووە بەڵكو دواتر ئەم دابەشكردنەی صیفات بۆ زاتی و فعلی دروست بووە، ئەگەرچی كێشە لە دابەشكردنەكە نیە و دروستە بەڵام ووشەكان نوێن و لە سەردەمی أبو حنيفة و دوای ئەویش ئەم ووشانە بوونیان نەبووە، ئەمەش نیشانەیەكە كە دوای خۆی نوسراوە و دراوەتە پاڵی، پاشان لە باسكردنی صیفەتە زاتیەكان تەنها 7 صیفەت باس دەكات كە هەمان ئەو 7 صیفەتەیە كە ئەشعەرییەكان ئیثباتی دەكەن، ئەمەش نیشانەیەكی ترە لەوەی كە دراوەتە پاڵی چونكە لەو سەردەمەدا ئەشعەرییەكان دروست نەببوون.

**سێیەم:** تێیدا هاتووە **(ولفظنا بالقرآن مخلوق).**
واتا: لەفزی ئێمە مەخلوقە لەكاتی دەربڕینی ئایەتەكانی قورئان.
ووتم: ئەم ووتەیە بیدعەی جەهمیەكانە دوای فیتنەی خلق القرآن سەری هەڵدا كە فیتنەی خلق

القرآن ساڵی 218 هـ بوو، دواتر ئەم بیدعە پیسەی بەدوا داهات کە ئامانج لێی هەر ئەوە بوو بووترێ قورئان مەخلوقە، ئەم بیدعەیەش یەکەمجار الحسین الکرابیسي دروستی کرد کە ساڵی 248 هـ مردووە، أبو حنیفة ساڵی 150 هـ مردووە جا چۆن باسی شتێک دەکات کە زیاتر لە 70 ساڵ دوای مردنی خۆی سەر هەڵدەدات ؟! بۆیە باسکردنی ئەوەی لەفزمان بە قورئان مەخلوقە یان مەخلوق نیە بەهیچ شێوەیەک لە سەردەمی أبو حنیفة-دا ووتەی لەم شێوەیە بوونی نەبووە بەڵکو دوای فیتنەی خەلقی قورئان ئەم بیدعەیە سەری هەڵدا، ئەمەش نیشانەیەکی زۆر ڕوونە کە ئەم نامیلکەیە هی أبو حنیفة نیە، ئەوەی بڵێ لەفزمان بە قورئان مەخلوقە بە جەهمی وەسف کراوە لەلای سەلەف، وە ئەوەی بڵێ لەفزمان مەخلوق نیە بە مبتدع وەسف کراوە، جا ئەوانەی سوورن لەسەر ئەوەی کە ئەم نامیلکەیە بدەن پاڵ أبو حنیفة مولزەم دەبن بەوەی کە بڵێن أبو حنیفة جەهمی بووە.

**چوارەم:** تێیدا هاتووە **(والقرآن کلام الله فهو قدیم).**

واتا: قورئان کەلامی اللە-یە و قەدیمە.

ووتم: ووتنی قورئان قەدیمە ووشەیەکی داهێنراوە، وە لە سەردەمی أبو حنیفة-دا بوونی نەبووە، ئەمەش هەمان ووتەی ئەشعەرییەکانە، ئەهلی سوننە دەڵێن: کەلامی اللە بەشێوەی گشتی ئەزەلیە بەڵام دانە بە دانەی ووتەکانی اللە (ئاحاد) کە هەرکات بیەوێ قسە دەکات ئەزەلی نیە، واتا ئەصلی صیفەتەکە ئەزەلیە بەڵام دانە بە دانەی ووتەکان ئەزەلی نین، هەرچی ئەشعەرییەکانن دەڵێن: صیفەتی کەلام قەدیمە (ئەزەلیە) هەم جۆرەکە هەم دانە بە دانەی ووتەکانی، واتا اللە هەرکات بیەوێ قسە نەکات، هەندێک لە زانایانی ئەهلی سوننە لە المتأخرین ووشەی قەدیم بەکار دێنن بۆ قورئان بەڵام بە مەبەستی ئەهلی سوننە نەک بە مەبەستی ئەشعەرییەکان، ئەولاترە ووشەی مەخلوق نیە بەکار بێت.

**ابن تیمیة** دەڵێ: **یەکەم کەس کە ووتی قورئان قەدیمە، عبدالله بن سعید بن کلاب بوو.**

[مجموع الفتاوى : 301/12]

ووتم: عبدالله بن سعيد بن كلاب ساڵی 241 هـ مردووە كە أبو الحسن الأشعري عەقیدەی كوللابی لێوەر گرتووە دواتر ناوی خۆی بەسەریدا زاڵ بوو بۆتە عەقیدەی ئەشعەری، هەروەک چۆن جەهم عەقیدەکەی لە جەعد وەرگرت دواتر ناوی خۆی بەسەریدا زاڵ بوو بۆتە عەقیدەی جەهمی.

**پێنجەم:** تێیدا هاتووە **(والله تعالى يتكلم بلا آلة ولا حروف، والحروف مخلوقة).**

واتا: الله تعالى قسە دەكات بەبێ ئامرازی قسەكردن و بەبێ پیت، وە پیتەكان مەخلوقن.

ووتم: نەفیكردنی حرف پێچەوانەی عەقیدەی ئەهلی سوننەیە، لەلای ئەهلی سوننە الله تعالى قسە دەكات بە حرف و صوت، واتا بە پیت و دەنگە قسەكانی، سەبارەت بەوەش كە دەڵێ پیتەكان مەخلوقن سەلەف تەكفیری ئەم كەسەیان كردووە كە وابڵێ چونكە ئەمە واتای ئەوەی كە كەلامی الله مەخلوقە.

**شەشەم:** تێیدا هاتووە **(والله تعالى يرى في الآخرة ويراه المؤمنون وهم في الجنة بأعين رؤوسهم بلا تشبيه ولا كيفية، ولا يكون بينه وبين خلقه مسافة).**

واتا: الله تعالى لە قیامەتدا دەبینرێ، وە ئیمانداران لە بەهەشتدا دەیبینن بە چاوی سەریان بەبێ لێكچواندن و چۆنیەتی، وە لەنێوان الله و ئەواندا ماوە نیە.

ووتم: ئەم بڕگەیەی كۆتایی كە دەڵێ لەنێوان الله تعالى و ئیمانداران هیچ ماوەیەک نیە نەفی كردنی صیفەتی علوە هەمان عەقیدەی ئەشعەری وماتوریدییەكانە، پێیان وایە كە بینینی الله لە بەهەشت بەبێ شوێنە، واتا كە ئیماندار الله دەبینێت نە لە سەرووی خۆی دەیبینێت نە لە خوارەوە نە لە تەنیشتەكانی نە لە پێشی نە لە دواوەی بەبێ شوێن دەیبینێت، هەموو ئەم قسانەش بۆ نەفی كردنی صیفەتی علوە، ئەمەش كوفرێكی بەواحە كە هیچ عوزرێک هەڵناگرێت.

وە ژمارەیەک هەڵەی عەقیدەیی تری تێدایە، بێدەنگی زانایانی سەردەمی أبو حنيفة لەم هەڵانەی أبو حنيفة نیشانەیەكی ڕوونە كە ئەم نامیلكەیە هی ئەو نیە، ئەگینا چۆن باسی ئەم كوفر و بیدعانەی ناكەن ؟ هەروەها هەبوونی كۆمەڵێک بابەت لەم نامیلكەیەدا كە لە سەردەمی أبو حنيفة بوونی نەبووە نیشانەیەكی ترە كە ئەم نامیلكەیە هی ئەو نیە.

# نامیلکەی (الفقه الأکبر) بەڕیوایەتی أبو مطیع البلخي:

## سەنەدەی نامیلکەکە:

**الحسين بن علي الكاشغري عن أبي مالك نصران بن نصر الختلي عن أبي الحسن علي بن أحمد الفارس عن نصير بن يحيى البلخي عن أبي مطيع البلخي عن أبي حنيفة.**

## حاڵی ڕاوییەکان:

**الحسين بن علي الكاشغري:**

الذهبي دەڵێ: تۆمەتبارە بە درۆ.

**أبي مالك نصران بن نصر الختلي:**

جەرح و تەعدیلی بۆ نەکراوە.

**علي بن أحمد الفارسي:**

مەجهولە.

**نصير بن يحيى البلخي:**

جەرح و تەعدیلی بۆ نەکراوە.

**أبو مطيع البلخي:**

پێشتر باسمان کرد کە تۆمەتبارە بە درۆ، هەروەها لە سەرانی مورجیئەیە و تۆمەتباریشە بە جەهمی بوون، وە دژی ئەهلی سوننەیە.

ئەمەش وەک ئەوەی پێشوو هیچ کام لە ڕاوییەکانی سەلامەت دەرنەچوون.

## ناوەڕۆكى ناميلكەكە:

ئەم ناميلكەيەش وەک ئەوى تر دەربارەى تەوحيد وعەقيدەيە، شێوازى ناميلكەكە بريتيە لە پرسيار كردنى أبو مطيع لە أبو حنيفة، أبو حنيفة-ش وەڵامى دەداتەوە، بۆيە هەندێک زانا أبو مطيع بە خاوەنى ناميلكەكە دەزانن چونكە ئەو پرسيارو وەڵامەكانى نوسيوە، هەندێكيش دەيدەنە پاڵ أبو حنيفة، بەڵام لەلاى حەنەفيەكان كە زۆربەيان ماتوريدين ئەم ناميلكەيە بە عەقيدەى خۆيان دەزانن و دەيدەنە پاڵ أبو حنيفة، بێگومان هەرلەسەر أبو حنيفة-ش حيسابە چونكە ئەوەى تێيدا هاتووە وەڵامەكانى أبو حنيفة-يە، زۆرێک لە باسەكانى ئەم ناميلكەيە دووبارەن بەڵام ئەمەيان تۆزێک فراوانترە لە ئەوى پێشوو بۆيە لەلاى المتأخرين-ى حەنەفيەكان ئەم ناميلكەيە بە (الفقه الأبسط) ناسراوە بۆ جياكردنەوەى لە ئەوى تريان، ئەمەشيان لە بارەى ئيمان و استثناء كردن لە ئيماندا هەمان عەقيدەى مورجيئەيە، هەروەها لەم ناميلكەيەدا أبو حنيفة ئيثباتى صيفەتى علو دەكات و ئەوانەش تەكفير دەكات كە ئيثباتى ناكەن، تەنانەت دەڵێ ئەوەى ئيثباتيشى بكات و بڵێ الله لەسەر عەرشە بەڵام نازانم عەرش لەكوێيە هەر كافرە، بەڵام دواتر أبو مطيع پرسيارى لێدەكات گەر كەسێک بڵێ: الله لەكوێيە چى وەڵام بدەينەوە ؟ أبو حنيفة دەڵێ: الله هەبووە و هيچ شوێنێک نەبووە، دواتر كە شوێنى دروست كردووە هەر بێ شوێن بووە، ئەمەش نەفيكردنى صيفەتى علوە، هەرچەندە لە أبو حنيفة ڕيوايەت نەكراوە كە نەفى علو بكات ئەوەى لە صيفاتدا قسەى لەسەر كراوە تەنها بابەتى خلق القرآن بووە، بۆيە زۆرێک لە زانايانى ئەم سەردەمەى ئێستا ڕەتى دەكەنەوە كە ئەم دوو ناميلكەيە هيچيان هى أبو حنيفة بێت و دەڵێن دراوەتە پاڵى، لەم بارەيەوەش كتێب و نوسراوى زۆر هەيە، بۆ نموونە بڕوانە [براءة الأئمة الأربعة من مسائل المتكلمين المبتدعة : 46-71] هەر چەندە ئەو زانايانەى سەردەم كە ڕەتى دەكەنەوە ئەم دوو ناميلكەيە هى أبو حنيفة بێت بە مەبەستى بەرگرى كردن لێى وادەڵێن چونكە دەزانن هەردوو ناميلكەكە شتانێكى تێدايە دژى عەقيدەى ئەهلى سوننەيە، وە بۆ زانياريتان هيچ كام لەم دوو ناميلكەيە شتێكى تێدا نيە كە پێچەوانەى ووتەى زانايان بێت دەربارەى أبو حنيفة كە لە بەشى يەكەمى ئەم كتێبەكەدا هێنامان يان ڕەتى بكاتەوە، بەڵام لەبەرئەوەى ڕيوايەتى أبو مطيع كۆمەڵێک بابەتى عەقيدەيى تێدايە

کە موافقی ئەهلی سوننەیە ئەمە وایکردووە ابن تیمیة و ابن القیم لە کتێبەکانیان باسی بکەن و بەڵگەی پێ بهێننەوە، ئەو کەسەی دوای ڕوونکردنەوە هەر سوورە ئەم نامیلکەیە بە هی أبو حنیفة بزانێ ئەوا مولزەم دەبێت بەوەی کە بیدعەکانی ناو ئەم نامیلکەیەش بداتە پاڵ أبو حنیفة، هەر چەندە نامیلکەکە هی خۆی بێت یان بە درۆ درابێتە پاڵی هیچ لە کتێبەکەی ئێمە ناگۆڕێت چونکە ئێمە نەمان ووتوە أبو حنیفة لە هەموو شتێک دژی ئەهلی سوننە بووە تا ئەم نامیلکەیە بکرێتە بەڵگە لە دژمان، وە ئەم نامیلکەیە هیچ شتێکی تێدا نیە کە بابەتەکانی بەشی یەکەمی ئەم کتێبەی ئێمە پوچەڵ بکاتەوە بەڵام ویستم وەک لایەنی زانستی ئەم ڕاستیە ڕوون بێتەوە.

## گومانی دووەم:

# زۆربەی ڕیوایەتەکان زەعیفن ئەوانەشی کە صەحیحن أبو حنیفة لێی بەرییە

هەندێک لەوانەی کە بەرگری لە أبو حنیفة دەکەن هەڕەمەکی دەیانەوێت باسەکە دابخەن بەوەی کە زۆربەی ڕیوایەتەکان زەعیفن و شایەنی ئەوە نین ئاوڕیان لێ بدرێتەوە، بەڵام وەک بینیمان بە سەدان ڕیوایەتی صەحیح هەیە ئەگەرچی زەعیفیش زۆرە بەڵام ئێمە لەم کتێبەدا تەنها صەحیحمان هێناوە، جا نازانم ئەو کەسەی ئەم قسەیە دەکات سەیری ڕیوایەتەکانی هەموو ئەم کتێبانەی کردووە ئینجا گەیشتۆتە ئەم ئەنجامە دەیەوێ بە دەنگێکی دوو خولەکی باسەکە دابخات و بڵێ هەمووی زەعیفە یان دەمارگیری بۆ أبو حنیفة وای لێکردووە کەوا بڵێ ؟ گریمان من زۆر جاهیلم هیچ نازانم لە زانستی فەرموودە و صەحیح و زەعیف لەیەکتر جیاناکەمەوە، ئەی سلیمان العلوان چی لە المعلمي اليماني دەکەی کە عەللامەیە لەم بوارەدا و تۆ بە قوتابی ئەو دەشێی لەم زانستەدا کە بە مجدد-ی ئەم زانستە دادەنرێت لە سەدەی ڕابردوودا یەکێکە لەوانەی کە مەنهەجی المتقدمين-ی زیندوو کردۆتەوە لەناو ئوممەتدا تەنانەت هەیە بە (الذهبي سەردەم) ناوی دەبات لە زانستی فەرموودەدا، کە زانایەکی وەک ئەو زۆربەی ڕیوایەتەکانی تاريخ بغداد کە لە دژی أبو حنیفة هاتوون بە صەحیحی دەزانێت و ڕەددی الكوثري دەداتەوە، ئەی چی لە مقبل بن هادي الوادعي دەکەی کە کتێبێکی نوسیوە ووتەی 77 زانای هێناوە لە دژی أبو حنیفة هەمووی بە سەنەدی صەحیح تەنانەت ئەو سەنەدەشی بە صەحیح داناوە کە باسی پەرستنی نەعل دەکات کە تۆ بە عەقڵی خۆت پێت وایە مەحاڵە أبو حنیفة قسەی ئاوا بکات، تەنانەت محقق-ی تاريخ بغداد بشار عواد کە جەهمیە و بەرگری لە أبو حنیفة دەکات ئەویش سەنەدەکەی بە صەحیح داناوە، وە زۆرێک لە سەنەدەکانی تری بە صەحیح داناوە ئەگەرچی بە بیانووی بەتاڵ ژمارەیەکی تەزعیف کردووە وەک لە بەشی یەکەمدا باسمان کرد، ئەی چی لە محمد بن سعيد القحطاني محقق-ی السنة-ی عبدالله دەکەی کە سەرەرای بەرگری کردنێکی زۆر لە أبو حنیفة ژمارەیەکی بەرچاو لە

ڕیوایەتەکانی عبداللە-ی بە صەحیح داناوە ئەگەرچی ئەویش ژمارەیەکی تەزعیف کردووە بە بیانووی بەتاڵ وەک باسمان کرد، ئەی چی لە عادل آل حمدان دەکەیت کە زۆربەی هەرە زۆری ڕیوایەتەکانی السنة-ی عبداللە-ی بە صەحیح داناوە، هەموو ئەمانەی کە ناوم هێنان لە بابەتی تەکفیر و وەلاء بەراء زۆر شلترن لە سلیمان العلوان کەچی ئینکاری لەم ڕاستیانە ناکەن کە دەربارەی أبو حنیفة ووتراوە لەلایەن سەلەف، وە دڵنیاشم العلوان دیراسەی سەنەدی هەموو کتێبەکانی نەکردووە و کاریگەری سەردەم وای لێکردووە وەک زۆربەی زاناکانی تر بەم شێوەیە بەرگری لێ بکات، بەڵام ئەوەش بزانن لەم دەنگە دوو خولەکیەدا سلیمان العلوان تەنها باسی کتێبی السنة-ی عبداللە دەکات نەک هەموو کتێبەکان، بەڵام هیوادارم ڕۆژێک کە ئازادبوو لە زیندان تەخریجێکی کتێبەکەی عبداللە بکات تا بزانین چۆن بۆمانی دەسەلمێنێت زۆربەی سەنەدەکان زەعیفن؟ لەکاتێکدا ژمارەیەکی زۆر لە سەنەدەکان هەمووی ئیمامی بەڕێز و حافزی تێدایە ! وە هیوادارم ڕەددی ئەم هەموو زانایەی پێش خۆشی بداتەوە کە سەرەڕای بەرگری کردنیان لە أبو حنیفة نەیانتوانیوە ژمارەیەک ڕیوایەتی زۆر بە زەعیف بزانن، هەروەها سلیمان العلوان باسی ئەوەش دەکات کە ڕیوایەتەکانی عبداللە ئەوانەی کە صەحیحین تا خاوەنی ووتەکە صەحیحە بەڵام بە نسبەت أبو حنیفة صەحیح نیە، نموونەش بەو ڕیوایەتانە دەهێنێتەوە کە خاوەنی ووتەکە دەڵێ: أبو حنیفة ئاوای ووت، ئاوای کرد، ئاوا بوو، العلوان دەڵێ ئەم سەنەدانە صەحیحین بە نسبەت خاوەنی ووتەکە بەڵام بە نسبەت أبو حنیفة صەحیح نیە چونکە ئەو زانایەی کە ئەم قسەیە دەگێڕێتەوە لە أبو حنیفة-ی نەبیستووە وابڵێ یان نەیدیوە وابکات بۆیە ئەگەرچی سەنەدەکەش صەحیح بێت ناڵێین أبو حنیفة ئاوای کردووە یان ئاوای ووتوە !

چەند هەڵوەستەیەک لەسەر ئەم قسانەی العلوان:

ئەم قسانەی دەری دەخات کە العلوان یان بێ ئاگایانە لەم ڕیوایەتانە و بەخێرایی بەسەریاندا تێپەڕیوە یان ئاگادارە بەڵام دەمارگیری پاڵی پێوە ناوە کە ئەم قسانە بکات، کە من ئەگەری یەکەم بە بەهێزتر دەزانم.

العلوان دەڵێ: ئەو ڕیوایەتانەی کە صەحیحن تا خاوەنی ووتەکە صەحیحن بەڵام بە نسبەت أبو حنیفة صەحیح نین !
خۆی لەخۆیدا ئەم قسەیە تۆمەتێکی زۆر گەورە و قێزەونە دەیداتە پاڵ سەلەف بەبێ ئاگایی، وە من ئەمەم بەلاوە سەیر نیە هەر لەکۆنەوە ئەوەی بەرگری لە أبو حنیفة کردبێ ئیللا ناچار بووە کە بە ئاگایی یان بێ ئاگایی هێرش بکاتە سەر سەلەف و تۆمەتی ناشرینیان بداتە پاڵ، ئەمەش شتێکی ڕوونە تۆ ناتوانی تاوانبار بەبێ تاوان نیشان بدەیت ئیللا دەبێ حوکمی قازییەکە بە ناعەدالەت وەسف بکەیت چونکە ناکرێ لەیەک کاتدا هەردووکیان بەری بن، یان ئەمیان تاوانبارە یان قازییەکان درۆزن و بوهتان چی و ناعەدالەتیان کردووە و زوڵمیان لە تۆمەتبارەکە کردووە.
جا العلوان کە دەڵێ ئەوان نەیان بیستووە و نەیان بینیوە أبو حنیفة وابڵێ و وابکات تەنها دەڵێن: أبو حنیفة وای ووت، وایکرد، وابوو، بەبێ بیستن و بینین، خۆی ئەمە تاوانبارکردنی زانایانی سەلەفە بە بوهتان، کەواتە دەرەنجام: مالك و الثوري و ابن عيينة و الأوزاعي و الفزاري ابن زيد وابن سلمة و الشافعي وابن المبارك وأيوب والأعمش ويوسف بن أسباط وعلي بن عاصم وأبو عبدالرحمن المقرئ وسعيد بن عبدالعزيز وأبو بكر بن عياش وشعبة ووكيع وشريك وصالح بن حي والحجاج بن أرطاة و زۆرێکی تر کەسیان هیچیان لە أبو حنیفة نەدیوە و نەبیستووە لەخۆیانەوە بوهتانی بۆ هەڵدەبەستن دەڵێن ئاوای کرد و ئاوای ووت و عەقیدەی ئاوا بوو ! جا وەکیلەکانی أبو حنیفة سەیر بکەن کەیسی تۆمەتبارەکەتان گەلێک قورسە ناتوانن بێ تاوانی بسەلمێنن ئیللا بە تۆمەتبارکردنی کۆمەڵێک زانای گەورەتر و زیاتر نەبێ ! ئا ئەمەیە دەرئەنجامی بەرگری کردن لە أبو حنیفة دەبێ بەناچاری بڵێی أبو حنیفة وانەبووە هەموو ئەم زانایانە لەخۆیانەوە درۆ و بوهتانی بۆ هەڵدەبەستن أبو حنیفة نە ئاوای کردووە و نە ئاوای ووتوە، ئەمەش هەمان ڕێچکە و ڕێبازەکەی الكوثري جەهمیە کە لە کتێبی (تأنيب الخطيب) گرتوویەتیە بەر.
ئینجا لەڕووی واقعیش دووبارە ناڕاستی قسەکەی العلوان دەسەلمێنین کە دەڵێ نەیان بیستووە و نەیان دیوە أبو حنیفة وابڵێ و وابکات، ئێمە لە بەشی یەکەمدا هێنامان کە أبو إسحاق الفزاري دەڵێ: فەرموودەم بۆی هێنا گاڵتەی پێکرد و ڕەتی کردەوە ووتی ئەمە خورافەیە، هەروەها دەڵێ

پرسیاری براكەم لێی كرد ووتی من فەتوام بۆدا خروج بكات، وە دەڵێ خۆم بیستم لەسەر پەیژە وەستابوو بە دوو كەسی دەووت خروج بكەن، علي بن عاصم دەڵێ فەرموودەم لە پێغەمبەرﷺ گێڕایەوە بۆ أبو حنیفة ووتی وەری ناگرم، سفیان بن عیینة دەڵێ فەرموودەم بۆی گێڕایەوە ووتی میزی پێدا بكە، هەروەها جارێكی تر كە فەرموودەی بۆ دەگێڕنەوە دەڵێ بە كلكی بەراز بیسڕەوە، هەروەها كاتێك باسی سوجدەی سەهوی بۆ دەكەن كە پێغەمبەرﷺ لەنوێژێكدا بردوویەتی دەڵێ نوێژەكە هیچ نرخی نیە، هەروەها كۆمەڵێك فەتوادانی بە فێڵ و بە ڕەئی خۆی بە ئامادەبوونی زانایانی تر داوە كە هێنامان، ئیتر نازانم العلوان بە چ حەقێك دەڵێ هیچیان لێی نەبیستووە و هیچیان لێی نەدیوە ؟! مەگەر ئەم زانایانە خۆیان لەگەڵی نەبوون كاتێك وای ووتوە و وایكردووە ؟ جا ئێستا قوڕەكە خەستر بوویەوە لەسەرتان دەبێ بڵێن ئەم زانایانە هەر درۆزنن لەخۆیانەوە ئەم بەسەرهاتانەیان دروست كردووە كە دەڵێن لەلای بووین بیستمان ئاوای ووت و بینیمان ئاوای كرد هەموویان درۆیە هەڵیان بەستاوە ! لەم هەموو كوفر و بیدعەیەی كە لەسەری چەسپاوە تەنانەت قوتابیەكانی خۆی حاشای لێ ناكەن وتوویەتی قوڕئان مەخلوقە وعەقیدەی خروجی هەبووە و جاهیل بووە بە قوڕئان و سوننەت ئاثاری صەحابە و خیلافەكانیان وەك هێنامان لە أبو یوسف و محمد بن الحسن والقاضي البرتي، كەچی العلوان و هاوشێوەكانی خۆیان لە قوتابیەكانی أبو حنیفة بە دڵسۆزتر دەزانن بۆ أبو حنیفة دەڵێن هیچی لەسەر نەچەسپاوە تەنها ئیرجاء نەبێت، ئیرجائەكەش ئەوەندە باوە ناتوانن ئینكاری لێ بكەن بۆیە دانی پێدادەنێن هەرچەندە هەندێكیان ئیرجائەكەی ئەوەندە سووك كردووە وەك بڵێی گوناهێكی بچووك بێ وهیچی تر، باشە ئەوانەی كە وەك العلوان دان بەوە دەنێن كە مورجیئە بووە، ووتەی سەلەفیش دەزانن دەربارەی مورجیئە كە چەندە توند بوونە بەرامبەریان و چیان ووتوە دەربارەیان، ئایا ئامادەن بڵێن أبو حنیفة مورجیئەیە كەواتە بیدعەچیەكی گومڕایە چونكە ئیرجاء بیدعە و گومڕاییە، جا لەبەر ئەوە ئێمە ڕقمان لێیەتی و خۆشمان ناوێت و بە ئەهلی سوننەی نازانین بەڵكو بە ئەهلی بیدعەی دەزانین ؟ ئایا ئامادەن وابڵێن؟ یان هەر ئیمامی ئەهلی سوننەیە و ئەگەرچی پێشەوا و بانگەوازكەریش بێ بۆ ئیرجاء هەر نابێتە بیدعەچی و گومڕا ؟ تەنها و تەنها مورجیئە بوونی بەس نیە بۆ ئەوەی بە گومڕای بزانن و دژی بن و

ڕقتان لێی بێ ؟ خۆ ووتەی سەلەفتان بینی لە بەشی یەکەم دژی مورجیئە چەندە توند بوو زۆر توندتر لە خەواریج، چی ڕوویداوە بۆچی کە دێتە سەر باسی أبو حنیفة هەموو شتێک سەراو ژوور دەبێتەوە، هیچ شتێک ئەو ناگرێتەوە و هەمیشە بە سەربەرزی و سەلامەتی دەردەچێ ؟!
لە العلوان و هاوشێوەکانی دەپرسم: ئایا أبو زرعة الرازي و يحيى بن معين ئەوانیش نەیانزانیوە ڕیوایەتی صەحیح و زەعیف لە یەکتر جیا بکەنەوە، هەر لەسەر ئەو ڕیوایەتە زەعیفانە ڕۆیشتوون و بە أبو حنیفة-یان ووتوە جەهمی ؟ لەسەر بنەمای ڕیوایەتی زەعیف ئەم دوو زانایە گەورەی فەرموودە بە أبو حنیفة-یان ووتوە جەهمی ؟ یان أبو یوسف کە قوتابی أبو حنیفة بووە هەمیشە لەگەڵی بووە ئەویش حاڵی ئاگادار نەبوو لەسەر بنامەی ڕیوایەتی زەعیف وتوویەتی جەهمی بوو بە جەهمیەتی مرد ؟! دواتر ئێمەش دەزانین و دانی پێدەنێین کە ژمارەیەکی دیار لە ڕیوایەتەکان زەعیفن بەهەمان شێوەش ژمارەیەکی دیار صەحیحن، بۆ نموونە هەردووک کتێبی (السنة)ی عبدالله و (تاریخ بغداد)ی الخطيب کە زۆرترین ڕیوایەتیان تێدایە دژی أبو حنیفة کە دەگاتە نزیکەی 440 ڕیوایەت، ئێمە لەم 440 ڕیوایەتە تەنها نزیکەی 140 ڕیوایەتمان هێناوە لەم کتێبەدا واتا 300 ڕیوایەتمان نەهێناوە یان زەعیف بوونە یان دووبارە بوونە یان بابەتەکەم لا بەهێز نەبووە، نەک کوێرانە وەک (حاطب الليل) هەرچی ڕیوایەتێک هاتبێ لەدژی أبو حنیفة بیهێنین بەبێ ئەوەی بزانین صەحیحە یان زەعیف، وە ئەمە پیشەی زانایان بووە لە کۆن و نوێدا کە گروپێک یان کەسێک کوفرەکانی یان بیدعە و گومڕاییەکانی چەسپابێ ئەوا دەربارەی هەرچی ڕیوایەت هەیە دەیهێنن گرنگی بەوە نادەن تەنها ڕیوایەتی صەحیح بهێنن چونکە حاڵی ئەو گروپە یان ئەو کەسە یەکلا بۆتەوە لەلایان، هێنانی ڕیوایەتی زەعیفیش لەلای عبدالله و الخطيب هەر بەم شێوەیە نەک لە نەبوونی بەڵگەی صەحیح بە ناچاری پەنا ببەنە بەر ڕیوایەتی زەعیف.

یەکێکی تریش لەو زانایانەی کە بەهەمان شێوازی العلوان بەرگری لە أبو حنیفة دەکات قوتابیەکەی العوان-ە ئەویش شێخ تركي البنعلي کە قسەی ئەو زیاتر لە مامۆستاکەی کاریگەری هەبووە بەسەر موسڵمانانی ئەمڕۆ بە حوکمی ئەوەی لەبەرەی جیهاد دا بووە، بەڵام ئەویش لەم

بابەتەدا هەمان قسەی شێخە كۆنەكەی دووبارە دەكاتەوە دەڵێ زۆربەی ڕیوایەتەكان زەعیفن ئەوانەشی كە صەحیحین بە نسبەت خاوەنی ووتەكە صەحیحن نەک بە نسبەت أبو حنیفة، هەروەها دان بەوە دەنێت مورجیئە بووە و لە فەرموودەدا زەعیف بووە، وە بەڵگە بە ژمارەیەک ووتەی زانایان دەهێنێتەوە دەربارەی مەدحكردنی أبو حنیفة كە هەمووی درۆن یان زەعیفن وەک لە بەشی دووەمدا هێنامان، سەیرەكە لەوەدایە ڕیوایەتەكانی زەمكردنی زۆر بەهێزترن لە ڕیوایەتەكانی مەدحكردنی لەڕووی سەنەدەوە، كەچی باسی زەعیفی ڕیوایەتەكانی زەمكردنی دەكرێ لە هەمان كاتدا پشت بە ڕیوایەتە درۆ و زەعیفەكانی مەدحكردنی دەبەستن ! هۆكاری ئەمەش هەمووی كاریگەری سەردەم و دەوروبەرە كە أبو حنیفة كراوە بە ئیمام ئینجا خۆشیت بێ یان ترشیت بێ تۆش ناچاری بۆ پارێزگاری كردن لەو بارودۆخە هەموو ڕێگایەک بگریتە بەر.

## گومانی سێیەم:

# ئەو ووتانەی لە دژی أبو حنيفة ووتراوە (كلام الأقران)ە

ئەو زانایانەی لەیەک سەردەمدا ژیاون گەر ووتەیان هەبێ لە دژی یەکتر  بە (كلام الأقران) ناو دەبرێ، چونکە لەیەک سەردەمدا ژیاون جا بەهۆی حەسودی بێ یان ناكۆكیەک هەبێ لەنێوانیان یان خیلافی فیقهی یان ڕكابەری ئەمانە وادەكات كە ووتەكانیان لەدژی یەكتر قبوڵ نەكرێت، یەكێكیش لەوانەی كە زۆر لە ڕادەبەر ئەم ئامرازەی بەكارهێناوە بۆ ڕەتكردنەوەی ووتەی زانایان لە بەرامبەر یەكتر (الذهبي)ە دەبینی لە كتێبی (سير أعلام النبلاء) ئیمامێكی ئەهلی سوننە قسە بە زندیقێک بە ڕافیزەیەک بە جەهمیەک بە موعتەزیلەیەک دەڵێ كەچی الذهبي دەڵێ (كلام الأقران يطوى ولا يروى) كەلامی ئەقرانە دەپێچرێتەوە و نابێ بگێڕدرێتەوە، بەڵام دەبینین ئەهلی سوننە ئەم قاعیدەیە بە ڕێكخستنەوە بەكاری دەهێنن نەوەک ئاوا بە هەڕەمەكی و زیادەڕەوی، بۆ نموونە كەسێكی وەک سعيد بن المسيب و عكرمة كە دوو زانای تابعی گەورەن كە سعيد قسە بە عكرمة دەڵێ زانایان وەری ناگرن دەڵێن ئەمە (كلام الأقران)ە، یان كاتێک ابن إسحاق و مالك قسە بەیەكتر دەڵێن وەری ناگرن تەنانەت مالك ابن إسحاق بە بەچكە دەججال ناو دەبات كەچی كەس ئینكاری لەوەدا ناكات كە ئیمامە لە سیرە و كتێبەكەی تا ئێستاش عومدەیە لە سیرەدا تەنانەت شعبة بە ئەمیری ئیمانداران لە فەرموودە ناوی دەبات، یان هاوشێوەی ڕووداوی نێوان الذهلي و البخاري كە البخاري پێی وایە هۆكارەكەی حەسودیە بەڵام من وای نابینم حەسودی بێت چونكە البخاري رَحِمَهُ اللَّهُ لە بابەتی لەفز بە شێوەیەک قسەی كرد كە پەڵە و ناڕوونی لە بابەتەكە دروست كرد بۆ خەڵكی عەوام لەو سەردەمەشدا ئەم باسە فیتنەی سەردەم بوو، كاتێک پرسیاری ئەوەیان لێكرد لەفزمان بە قورئان مەخلوقە یان نا ؟ ووتی: قورئان كەلامی الله-یە مەخلوق نیە، وە كردەوەی بەندەكان مەخلوقە، ئەم وەڵامەی كۆتایی وایكرد پەڵە و ناڕوونی دروست بكات لە بابەتەكە بە جۆرێک كە خەڵكی ووتیان البخاري دەڵێ لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، ئەگەرچی البخاري بە ڕاشكاوی دەڵێ نەم ووتوە لەفزمان بە قورئان مەخلوقە هەر كەس وابڵێ بە دەمی من

ئەوا درۆی کردووە، بەڵێ ڕاست دەکات نەیووتوە لەفزمان مەخلوقە بەڵام وەڵامەکەی ئەو وەڵامە نەبوو کە زانایانی تر لەسەری بوون چونکە ئەهلی سوننە لەم بابەتە هەرگیز لەوە زیاتر ناڵێن کە قورئان کەلامی اللە-یە و مەخلوق نیە بە هەموو جۆرێک، ئیتر ڕۆچوون لەم بابەتەدا و ڕوونکردنەوە و قسەی زیاتر ئەگەر بە حەقیش بێت هەر دروست نیە و سەر بۆ فیتنە دەکێشێ، هەر ئەم تەفصیل پێدانەی البخاري بۆ بابەتەکە وایکرد کە توشی کێشەیەکی گەورە بێت کە هیوای دەخواست بە مردن، هەر چەندە البخاري بۆیە لەم بابەتە تەنها بەوەندە وازی نەدەهێنا کە بڵێ قورئان کەلامی اللە-یە و مەخلوق نیە هەمیشە ئەوەی بۆ زیاد دەکرد کە کردەوەی بەندەکان مەخلوقە، چونکە زانایانی ئەهلی سوننە دەیانووت نە دەڵێین لەفزمان مەخلوقە و نە دەڵێین لەفزمان مەخلوق نیە، ئەوەی بڵێ لەفزمان مەخلوقە جەهمیە، وە ئەوەی بڵێ لەفزمان مەخلوق نیە بیدعەچیە، جا البخاري ئەمە وای لێکرد کە ڕوونکردنەوەیەکی زیاتر بدات و بڵێ کردەوەی بەندەکان مەخلوقە تا خەڵکی وا تێنەگەن لەفزمان مەخلوق نیە، جا البخاري بە عیبارەتی ڕاشکاو نەیووت لەفزمان مەخلوق نیە بەڵام دەیووت کردەوەی بەندەکان مەخلوقە تا خەڵک لەوە تێبگەن کە لەفزی مرۆڤ کردەوەی مرۆڤە و مەخلوقە، ئەمەش وایکرد الذهلي و أبو زرعة و أبو حاتم و ژمارەیەکی تر لە زانایانی خوراسان هەجری بکەن و فەرموودەی لێ ڕیوایەت نەکەن، چونکە خودی تەفصیل پێدانەکە کێشە دروست دەکات ئەمە باسێکی داهێنراوی جەهمیەکانە ئەهلی سوننە کۆکن لەسەر ئەوەی باسی بابەتی لەفز نەکەن نە بڵێن مەخلوقە نە بڵێن مەخلوق نیە، چونکە ئەمە بابەتێکە تەنها لە مێشکدا یەکلایی دەکرێتەوە کە لفظ و ملفوظ لەیەک جیا بکرێتەوە کە بە زمان ووترا تێکەڵ بوون ڕوودەدات یان بەرەو بیدعەی لەفزمان مەخلوقە دەبات یان بەرەو بیدعەی لەفزمان مەخلوق نیە دەبات، بۆیە کاتێک الحسين الكرابيسي کە یەکەم کەس بوو ئەم بیدعە پیسەی داهێنا ووتی لەفزمان مەخلوقە ئیمام أحمد ڕەددی دایەوە، پاشان ووتی لەفزمان مەخلوق نیە هەر ڕەددی دایەوە تەنانەت تەکفیریشی کرد، چونکە گەر بڵێی لەفزمان مەخلوق نیە هەر چەندە مەبەستت ئەوە بێت کە قورئان مەخلوق نیە بەڵام گوێگر واتێدەگات کە وتووتە کردەوەکەم مەخلوق نیە کە تەلەفوز پێکردنی قورئانە، وە ئەگەر بڵێی لەفزمان مەخلوقە هەر چەندە مەبەستت

ئەوە بێت کە کردەوەی مرۆڤ مەخلوقە نەک قورئان بەڵام گوێگر واتێدەگات کە ئایەتەکان مەخلوقن کە لە دەمت دەردەچێت و تەلەفوزی پێ دەکەیت، بۆیە ئەمە حەقە و دوورە لە گومان و کێشە کە بووترێ قورئان کەلامی الله-یە مەخلوق نیە لە هیچ ڕوویێکەوە، لەوە زیاتر نەووترێ کە ووترا کێشە دروست دەبێ، جا لێرەدا الذهلي حەسودی بە البخاري برد بەهۆی چۆڵ بوونی مەجلیسەکەی و قەڵەباڵغی مەجلیسی البخاري، یان کەسانێک بە درۆ پێیان ڕاگەیاند کە البخاري دەڵێ لەفزمان مەخلوقە، یان خۆی وا لە ووتەکەی البخاري تێگەیشت کە سەر دەکێشێت بۆ فیتنەی لەفزمان مەخلوقە، هەموو ئەمانە الله خۆی دەیزانێت حەقمان بەوە دانیە کە لە نیەتی کەسەکان قسە بکەین البخاري و الذهلي دوو ئیمامی گەورە و بەڕێزن گرنگ ئەوەیە حەقەکە بەیان بکرێ بۆ خەڵکی کە بابەتە چۆنە لەڕووی عەقیدەییەوە، وە هەر کەسێک کتێبی (خلق أفعال العباد)ی البخاري بخوێنێتەوە لەوە تێدەگات کە البخاري لەم بابەتەدا بۆیە ئەم زیادەیەی دەووت (کردەوەی بەندەکان مەخلوقە) چونکە هەندێک خەڵک وا تێگەیشتبوون لفظ و ملفوظ هەمان شتە، بەڵام ڕەحمەت لە ئیمام أحمد بێ کە ئەم دەرگایەی داخست چونکە ئەم بابەتە تا زیاتر ڕوونتر بکرێتەوە ئاڵۆزتر دەبێ چونکە لفظ و ملفوظ وەک ووتمان لە مێشکدا دەتوانین جیای بکەینەوە بەڵام کە بە دەم باسکرا سەر دەکێشێت بۆ بیدعە، بۆیە الذهبي دەڵێ: البخاري نەیووت لەفزمان مەخلوقە ووتی کردەوەکانمان مەخلوقن بەڵام بێدەنگ بوون لە بەکار هێنانی ووشەی زیاتر سەلامەتترە بۆ مرۆڤ، الذهبي ڕاستیکرد گەر بێتو لەم بابەتەدا بەوەندە وازی هێنابوایە کە زانایانی تر لەسەری بوون توشی ئەم کێشە گەورەیەش نەدەبوو، جا لێرەدا مەبەستم نەبوو هێندە درێژەی پێ بدەم و لە بابەتەکە لا بدەم بەڵام بۆ دوو مەبەستی پێویست ئەم کارەم کرد، یەکەمیان: مادام باسی بابەتەکە کرا دەبێ وەک خۆی ڕوون بکرێتەوە بۆ خوێنەر تا کەس وانەزانێت البخاري وتوویەتی لەفزمان مەخلوقە، وە کەسیش وانەزانێت کە البخاري لەم بابەتەدا هیچ هەڵەیەکی نیە تەنها حەسادەت بابەتەکەی دروستکردووە، گریمان حەسودی پێ برا بێت یان زوڵمی لێ کرا بێت ئەوا خۆی دەرگای کردۆتەوە بۆ نەیارانی بە زیادکردنی ئەم ڕوونکردنەوەیە گەر وازی هێنابوایە بەوەندەی کە زانایانی تر لەسەری بوون سەلامەت دەبوو، دووەمیان: گریمان وای دابنێین البخاري

بەرییە لەم بابەتە و ئاگاداری هیچ شتێک نیە الذهلي بە درۆ بۆی هەڵبەستاوە -حاشا لە الذهلي- بەڵام کاتێک الذهلي نامە بۆ أبو زرعة و أبو حاتم دەنێرێ پێیان دەڵێ البخاري لەلای ئێمە ووتی لەفزمان مەخلوقە، أبو زرعة و أبو حاتم ڕێک واز لەو فەرموودانە دەهێنن کە لە البخاري-یان بیستبوو، ناڵێن البخاري ئیمامە پلەی بەرزە لە بابەتێکی ئاوادا پێویست ناکات توند بین بەرامبەری دەبێ هەروەک جاران پلەی بەرز ڕابگرین، سەیرکە تەنها بەیەک بابەت هەجری دەکەن و ڕیوایەتی تەرک دەکەن، هەر چەندە البخاري ئەمەی نەووتوە بەڵام کە بەم شێوەیە پێیان گەیشت ئیتر هەڵوێستیان گۆڕا، لێرەدا مەبەستم هەڵوێستی أبو زرعة و أبو حاتم-ە نەک ڕاستی و درۆیی بابەتەکە، جا ئەمە ببێتە پەندێک بۆ ئەوانەی کە بەرگری لە أبو حنيفة دەکەن بڕوانن ئیمامێکی وەک البخاري تەنها ڕوونکردنەوە دەدات بە بابەتێک لەترسی ئەوەی خەڵک بە هەڵە تێنەگات ئاوا مامەڵەی لەگەڵ دەکەن چونکە خودی ڕوونکردنەوەکەی دەبێتە هۆی هەڵە تێگەیشتن بۆ کەسانێکی تر، کەچی ئێوەش کوفری بەواحی أبو حنيفة و ئەم هەموو زانایانەی المتأخرين دەزانن لەگەڵ ئەوەشدا بە پێشەوایان دەزانن، ئەوەی باسی کوفرەکانیان بکات بە فیتنەی دەزانن ! والله المستعان سەیری هەڵوێست جوڵانی أبو زرعة و أبو حاتم بکەن بۆ دین، وە سەیری هەڵوێست جوڵانی خۆشتان بکەن بۆ کەسەکان لەسەر حیسابی دین.

دەبینین ئەوانەی کە قسەیان بە أبو حنيفة ووتوە یەک و دووان و سیان نین تا بڵێین (کلام الأقران)ە چونکە زۆربەی جار کلام الأقران لەنێوان دوو کەسدا ڕوودەدات نەک زیاتر لە 70 کەس کۆک بن لەسەر قسە ووتن بە کەسێک بووترێ ئەمە کلام الأقران-ە، پاشان ئەوانەی دوای أبو حنيفة-ش هاتوون قسەیان پێ ووتوە گەر بڵێین مالك و دوو سفیانەکە و دوو حەممادەکە و الأوزاعي والفزاري وابن المبارك ئەمانە لە سەردەمی أبو حنيفة ژیاون هۆکاری حەسودی و ڕکابەری مەزهەبی وایکردووە کە قسەی پێ بڵێن، ئەی چی لە ووتەی زانایانی تر دەکەن کە دوای ئەو ژیاون وەک الشافعي و أحمد و عبدالله-ی کوڕی و البخاري و مسلم و أبو زرعة و الفسوي و ابن حبان و ابن عدي والعقيلي وإسحاق بن راهويه و ژمارەیەکی تر، خۆ بەهیچ شێوەیەک ووتەی ئەمانە نابێتە

کلام الأقران، دواتر ئەم هەموو زانایە کە هەر یەکێکیان مەزهەبی خۆی هەبووە بۆ ئەم حەسودی و ڕکابەری و ناکۆکیە لەنێوانیان ڕووی نەدا هەمووی کۆک بوون تەنها حەسودی و دژایەتی أبو حنیفة بکەن ؟ دواتر حەسودی بە چ شتێکی ئەو دەبەن ؟ بیرێک لەم ووتەیە بکەرەوە چەندە ناشرینە ئەم هەموو زانا گەورەیە ڕێک بکەون بۆ دژایەتی کردنی زانایەکی تر و تۆمەت و درۆی بۆ هەڵبەستن کە لەودا بوونی نەبێت، ئەمە چ تۆمەتێکی ناشرین و قێزەونە دەدرێتە پاڵ زۆربەی زانایانی سەلەف بەبێ هەست کردن بەخۆتان !

**مقبل بن هادي الوادعي** پرسیاری لێدەکەن دەربارەی (کلام الأقران) ئایا بە ڕەهایی ڕەت دەکرێتەوە ؟ لە وەڵامدا دەڵێ: **کلام الأقران بەلیغتر وزاناترو ڕاسترە لە کەلامی کەسانی دواترکە دوای دوو سەدە دێن، ئەوکەسەی لەگەڵ کەسێکی تردا ژیاوە دەزانێ ڕاوییەکە ڕاستگۆیە یان درۆزنە، وە دەزانێ توانای لەبەرکردنی زەعیفە و خراپە، بەڵام ئەوەی دواتر دێت چی دەکات ؟ گەر سەنەدی دەست کەوێت لەسەر ڕاوییەکە ئەگینا دەبێ فەرموودەکانی ڕاوییەکە کۆبکاتەوە و بەراووردی بکات لەگەڵ فەرموودەی حافزەکان، گەر موافقی فەرموودەی ئەوان بوو قبوڵی دەکات و بە سیقەی دادەنێت، وە گەر موافقی فەرموودەی ئەوان نەبوو بە زەعیفی دادەنێت و ڕەتی دەکاتەوە، جا ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە جەرحی هاوسەردەمەکان دروسترە، ئەوەی ڕەت دەکرێتەوە لە جەرحی هاوسەردەمەکان شتێکی دەگمەنە، گەر زانرا ناکۆکی لەنێوانیان هەیە لەسەر ڕکابەرایەتی یان لەسەر دونیا و یان هەر ناکۆکیەکی تر ئەوکات لەوانەیە بووترێ ئەمە ڕیوایەتی الأقران-ە.**
[کاسێتی : الرد الوجیە علی أسئلة بیت الفقیە] لە سایتی فەرمی خۆیدا هەیە

**الألباني** پرسیاری لێدەکەن دەربارەی (کلام الأقران) چۆن ڕێک دەخرێ ؟ لە وەڵامدا دەڵێ: **بەوە ڕێک دەخرێ کە سەیری خاوەنی ووتەکە بکەین، دەکرێ تانە لە هاوسەردەمەکەی بدات بەهۆی ناکۆکی تایبەتەوە یان نا ؟ گەر ئەگەری یەکەم لە ئارادابوو ئەوا ووتەکەی قبوڵ ناکرێ، وە ئەگەر ئەگەری دووەم لە ئارادابوو ئەوا قبوڵ دەکرێ، وە هەردوو ئەگەرەکە پێویستە دیراسە بکرێ دیراسەیەکی تایبەت، واتا دەبێت یەکێک لەم دوو ئەگەرە تەرجیح بکرێ بەسەر ئەوی تردا بەبوونی بەڵگەیەکی**

**راجح، بۆ نموونە: دوو زانای هاوسەردەم خەڵکی یەک شارن لەوانەیە جۆرێک لە ڕکابەری لەنێوانیاندا هەبێ زیاتر بێ لە ڕکابەری نێوان دوو هاوسەردەم کە لە دوو شاری دوور لەیەکتر دەژین، ئەمەش سەرنج بۆئەوە ڕادەکێشێ کە بابەتەکە پێویستی بە ئیجتیهاد هەیە. بەهەمان شێوە گەر ئیمامێک هات دوای سەردەمی ئەو دوو کەسە ئەویش تانەی لەو کەسەدا کە تانەی لێدرابوو لەلایەن هاوسەردەمەکەی، ئەمە وادەکات تەرجیحی ئەوە بکەین کە تانەدانەکە بەهۆی هاوسەردەمی بوون ڕووی نەداوە بەڵکو کەسە تانە لێدراوەکە شایستەی تانە لێدانە. پاشان ئەم تانە لێدانە دڵنیاتر دەبێتەوە گەر زانایانی فەرموودە بەدوای یەکتردا پشتگیری لەم تانەدانە بکەن بە درێژایی سەردەمەکان جا ئەوکات دڵنیا دەبینەوە کە ئەم تانانەی لەو کەسە دراون بەهۆی هاوسەردمی بوون نیە چونکە ئەم هاوسەردەمی بوونە بۆ ئەو کەسانە نیە کە لەدوای کەسە هاوسەردەمەکان هاتوون، نموونەی ئەمەش زۆر ڕوونە لە یەکدەنگی زۆربەی زانایانی فەرموودە لەسەر زەعیف دانانی ئیمام أبو حنیفة ﵀ جا چ ئەوانەی هاوسەردەمی بووبن یان لەدوای ئەو هاتبن، جا یەکدەنگیان لەسەر زەعیف دانانی أبو حنیفة ئەمە دوور دەخاتەوە کە تانەدان لێی ڕەت بکرێتەوە بە بیانووی هاوسەردەمی بوون، چونکە تانەدان لێی نەچەسپاوە تەنها بە زەعیف دانانی لەلایەن کەسێکی هاوسەردەمی خۆی وەک سفیان الثوري یان هی تر.**

[سلسلة فتاوى جدة : کاسێتی ژمارە 20 دیوی یەکەمی کاسێتەکە] لە سایتی فەرمی خۆیدا هەیە

ووتم: بۆیە ووتەی ئەم جۆرە کەسانە دەهێنم چونکە بە حیساب ئێوە زۆر توندترن لەمانە لە عەقیدەدا کەچی ئەوان دان بەڕاستیەکان دەنێن ئێوەش یان پەردەپۆشی دەکەن یان بەرگری دەمارگیرانەی لێدەکەن، جا گەر جەرحکردنی أبو حنیفة لە فەرموودەدا کلام الأقران نەبێت بەهۆی زۆری کەسەکان و جیاوازی سەردەمەکانیان ئەوا بەهەمان شێوەش قسە ووتن پێی لە بابەتەکانی تریش نابێتە کلام الأقران، بڕوانە ئەو کەسەی پرسیاری لە الألباني کرد دوور و نزیک باسی أبو حنیفة ناکات کەچی الألباني دەڵێ نموونەی أبو حنیفة زۆر ڕوونە بۆ ئەم بابەتە، أبو حنیفة دەکات بە نموونە لەسەر ئەوەی کە جەرحکردنی ئەو کلام الأقران نیە.

دژبەیەک بوونێکی تری ئەو کەسانەی کە دەستیان بەم بیانووە بەتاڵە گرتووە گوایە ئەوانەی قسەیان بە أبو حنیفة ووتوە کلام الأقران-ە قبوڵ ناکرێ، باشە زانراوە وەک باسمان کرد کلام الأقران هۆکارەکەی ناکۆکی و حەسودی و ڕکابەرایەتیە، کەواتە بە قسەی ئێوە ئەم زانایانە ناکۆکی نێوان خۆیان و أبو حنیفة وایکردووە قسەی لە دژ بکەن، باشە ئێمەش وەک تەنازول دەڵێین گریمان قسەکەتان وایە -کەواش نیە- ئەی هەر ئێوە نین بەڵگە بە ووتەی ئەم زانایانە دەهێننەوە دەڵێن ئەمانە مەدحی أبو حنیفة-یان کردووە ؟ باشە خۆ ئێوە خۆتان دەڵێن ئەمانە بەهۆی ناکۆکی و حەسودی و ڕکابەرایەتی قسەیان بە أبو حنیفة ووتوە ئەی چۆن دەڵێن ئەمانە مەدحی أبو حنیفة-یان کردووە ؟! لەیەک کاتدا ناکۆکن لەگەڵی و قسە لە دژی دروست دەکەن و مەدحیشی دەکەن؟! خۆ هیچ نەبێت ئەو حەسودی و ناکۆکیەی هەیان بووە دەبێتە ڕێگر لەوەی کە مەدحی بکەن، هەست بەم دژ بەیەک بوونە دەکەن کە تێی کەوتوون ؟

## گومانی چوارەم:
# ابن تيمية تەکفير و تەبديعی أبو حنيفة ناکات

ئەمە یەکێکە لە گەورەترین گومانەکان دەڵێن زانایەکی وەک ابن تیمیة کە هەرگیز سڵی نەکردۆتەوە لە ووتنی حەق چۆن گەر شتێکی ئاوا هەبێت ئەو نایزانێت یان موخالەفەی دەکات ! بێگومان کە زانایەکی ئاوا تەکفیری أبو حنیفة نەکات و بە خراپە باسی نەکات بگرە بە ئیمامی ئەهلی سوننەی دەزانێت شان بەشانی سێ ئیمامەکەی تر، ئێمە لەو زیرەکترو حەق بێژتر نین بۆیە ئێمەش لەسەر ئەوە دەڕۆین کە ئەو لەسەریەتی.

بۆیە گەر گومانەکان دەربارەی ابن تیمیة وەڵام بدەینەوە بە بەڵگەی بەهێز ئەوا زۆرێک لە گومانەکانمان هەڵوەشاندۆتەوە، چونکە کە ووتت ابن تیمیة وادەڵێ، واتا ابن القیم وابن کثیر وابن رجب و محمد بن عبدالوهاب و تەواوی نەجدییەکان وادەڵێن، چونکە هەموو ئەمانە کاریگەرن بە ابن تیمیة، بۆیە قسەکردن لە بابەتێک بە پێچەوانەی ئەمانە قورسە، وە زۆربەی موسڵمانانی ئەمڕۆش پێی کاریگەرن و تەنانەت ئەگەرچی پێیان وایە دوای پێغەمبەر ﷺ هیچ کەسێک مەعصوم نیە بەڵام زۆر بەلایانەوە قورسە بڵێن ابن تیمیة لە فلان بابەتدا نەیپێکاوە، وەک بڵێی لەناخەوە هەستی مەعصوم بوونی ابن تیمیة بۆیان دروست بووە بەڵام ناتوانن بە دەم دەری ببڕن، دەبینی لە بابەتێکدا نەیپێکاوە زانایانی نەجدی ئاماژەیان پێداوە کە لەمەدا لەگەڵی نین کەچی یەکێک لەوانەی کە ئەم هەستە لەناخیەوە دروست بووە بە زۆر لەخۆ کردنێکی یەکجار لە ڕاددەبەدەر دەیەوێ بابەتەکە وانیشان بدات کە ابن تیمیة پێکاویەتی بەڵام ئێوە لێی تێناگەن، هەرچەندە عوزر هێنانەوە بۆ زانایان و هەڵگرتنی قسەکانیان لەسەر باشترین مانا شتێکی چاکە و زانایانی ئەهلی سوننە شایستەی ئەوەن گومانی چاکیان پێ ببرێ و بەرگریان لێ بکرێ، وە هەر قسەیەکی ناڕوونیان هەبوو تا توانا هەبوو دەبێ بە جوانترین شێوە لێکی بدەینەوە بەو مەرجەی بزانین ئەم زانایە بە هەڵەکردن لەم بابەتە ناسراو نیە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە نە بەدەم و نە لە عەقڵیشمان ئەو قەناعەتە دروست بکەین کە فلان زانا مەعصومە و بەهەڵەدانانی ئەو بێ ئەدەبی کردنە بەرامبەری،

چونکە ئەم کارە سەردەکێشێت بۆ فیتنەیەکی گەورە ئەویش شوێنکەوتنی پێهەڵخلیسکانی زانایە وەک زانراویشە هیچ زانایەک بە دوور نیە لە پێهەڵخلیسکان.

حەز دەکەم ئەوانەی دەستیان بە ووتەکانی ابن تیمیة گرتووە دەربارەی أبو حنیفة هەمان شێوازی ابن تیمیة ڕەچاو بکەن لە ڕەددانەوەی گومانەکان، ئایا ئەو هیچ کات لە ڕەددانەوەی کۆمەڵە و کەسە گومڕاکان هاتووە هەموو بەڵگەکانی لایەنی بەرامبەر بەلاوە بنێت و هیچ حیسابی بۆ نەکات لە بەرامبەردا بڵێ أحمد واناڵێت، تەواو باسەکە داخرا ! بێگومان نەخێر ، بۆیە ئێوەش نابێت ئەم هەموو بەڵگە صەحیحەی بەشی یەکەم بەلاوە بنێن و حیسابی بۆ نەکەن لە بەرامبەردا تەنها بڵێن ابن تیمیة واناڵێت، تەواو باسی أبو حنیفة داخرا ! کە سەیری ابن تیمیة دەکەین لە بابەتێکدا کە بە دەقی قورئان و سوننەت و ئیجماعی صەحابە بڕاوەتەوە کەچی کۆمەڵەیەک یان کەسێکی گومڕا یان کافر گومان دروست دەکات لەسەری بە تەئویل و بەڵگەی پڕوپوچ، نابینین ابن تیمیة بەو کەسە بڵێ فلان زانای گەورە وای ووت تەواو باسەکە داخە قسەکانت هیچ وەر ناگرم، بەڵکو سەرەڕای هەبوونی بەڵگەی بەهێز لەلای ابن تیمیة لە قورئان و سوننەت لەگەڵ ئەوەشدا دیراسەی گومانەکانی کەسی بەرامبەر دەکات کە ئەو وەک بەڵگە بەکاری دەهێنێت، زۆر بە ووردی ڕەددی بەڵگەکانی ئەویش دەداتەوە، تەنانەت ئەو تێگەیشتنە هەڵەیە یان چەواشەکارییەی کەسی بەرامبەر بۆ دەقەکانی قورئان و سوننەت دەیکات ئەویش بە ووردی وەڵام دەداتەوە، تەنانەت هەندێکجار بەڵگەکانی خۆیان لەدژی خۆیان بەکار دەهێنێتەوە و لەسەریان دەکات بە بەڵگە، نەک وەک ئێوە ئەم هەموو ووتەیەی سەلەف دەربارەی أبو حنیفة بە ڕستەیەکی سارد و سڕ بکەن بە پوشی با بردوو، ئەویش ڕستەی (ابن تیمیة واناڵێت).

***ابن تیمیة*** دەڵێ: **ڕەددانەوە تەنها بە جوێندان و شت گەورە کردن و ترساندن ئەوا هیچ کەسێک نیە نەتوانێ ئەنجامی بدات، گەر مرۆڤ مونازەرە لەگەڵ موشریکان و ئەهلی کیتاب بکات ئەوا لەسەریەتی ئەو بەڵگانە باس بکات کە ڕوونی دەکاتەوە حەقەکە لەلای ئەوە و باطلەکە لای ئەوانە.** [مجموع الفتاوى : 186/4]

ووتم: ئێوەش فەرموون بە بەڵگەوە ڕوونی بکەنەوە کە حەق بە ئێوەیە و ئێمەش لەسەر باطلین، بەڵام بەداخەوە ئەمە پیشەی زۆرینەی ئەوانەیە کە نازانن بە زانستیانە ڕەددی بابەتەکان بدەنەوە، دەڵێن: تۆ لە فلان شوێن بوای دەیانکوشتی یان بە قامچی تەمبێیان دەکردیت یان دەڵێن: ئەم کارەی تۆ شتێکی زۆر گەورەیە هەر تەنها بە أبو حنیفة ناوەستێ زانای تریشی بەدوا دادێت سەرەنجام هەموو زاناکانی تریش تەکفیر دەکەیت وەک نەززامیەکان یان دەڵێن تۆ چیت قسە بکەیت لەسەر زانایان کەسێکی دەمڕوتی قل و فل لەیەکتر جیاناکەیتەوە تۆ چیت زانایان تەکفیر بکەیت ؟! هەر وەک ابن تیمیة ووتی تەنها دەیانەوێ پشێوی و هەرا دروست بکەن و کەسی بەرامبەر قەناعەت پێ بکەن کە کارێکی یەکجار گەورە وترسناک ئەنجام دەدات ئینجا هەڕەشی لێدەکەن، لە وەڵامی هەموو ئەمانەدا دەڵێین: لێدان و بەندکردن و هەڕەشە کردن بە کوشتن لەپێناوی أبو حنیفة شتێکی نوێ نیە وەک پێشتر باسمان کرد لەساڵی 433 بەسەر عبدالعزیز النخشبي هاتووە، وە لە سەدەی 6 بەسەر عبدالغني المقدسي هاتووە، سەبارەت بەوەش کە ئەگەر تەکفیری أبو حنیفة بکەیت تەکفیری زانایانی تریشی بەدوا دادێت، دەڵێین: ئەوانەی أبو حنیفة-یان تەکفیر کردووە نەمان بینیون کەسانی تریش تەکفیر بکەن بەم هۆیەوە، سەبارەت بەوەش کە دەمڕوتین و هیچ نازانین دەڵێین: ئێمە تەنها تەقلیدی زانایانمان کردۆتەوە و شوێنی ووتەکانی ئەوان کەوتووین لەخۆمانەوە شتێکمان دانەهێناوە.

زۆرێک لەوانەی بەرگری لە أبو حنیفة دەکەن کاتێک کۆمەڵێک بەڵگەی نیشان دەدەیت لە سەلەفەوە کە تەکفیر و تەبدیعی أبو حنیفة-یان کردووە، دەڵێن: ئایا تۆ زیرەکتری لە ابن تیمیة ؟ ئەو ئەم کتێبانەی دیوە بۆ تەکفیر و تەبدیعی ناکات ؟ تۆ چیت تەکفیر و تەبدیعی بکەیت خۆ تۆ لەو زاناتر نیت !

ئەم گومانە هەر بە ووتەی ***ابن تیمیة*** وەڵام دەدەمەوە کە دەڵێ: **گەر بە کەسێکی هیدایەتدەر و ڕێنیشاندەر بڵێی ئایا تۆ زاناتری یان ئیمام فلان ؟ ئەوا ئەمە بەرەنگاربوونەوەیە بە قسەیەکی پوچ چونکە ئیمام فلان لەم بابەتەدا کەسانێک پێچەوانەی ئەویان کردووە کە لەئاستی ئەودان لە**

**ئیمامەکان، وە هەروەک چۆن هاوەڵان هەندێکیان هاوشانی یەکترن لە کاتی خیلافدا کە خیلافیان تێکەوت دەیگەڕێننەوە بۆ الله و پێغەمبەرەکەی ئەگەرچی هەندێکیان زاناتریش بن لە بابەتانی تردا، بابەتە خیلافیەکانی نێوان ئیمامەکانیش بەهەمان شێوەیە، خەڵکی وازیان هێنا لە فەتوای عمر وابن مسعود لە بابەتی تەیەمموم کردنی کەسێک غوسلی جەنابەتی لەسەربێ فەتوای ئەو کەسەیان وەرگرت کە لە خوارووی ئەوانە لە زانستدا وەک أبو موسی الأشعري و جگە لەویش کاتێک بەڵگەیان هێنایەوە بە قورئان و سوننەت، وە وازیان هێنا لە فەتوای عمر دەربارەی حەقی پەنجە قرتاندن وە فەتوای معاوية-یان وەرگرت چونکە فەرموودەی لەلا بوو کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەم پەنجە و ئەم پەنجەیە یەکسانن، وە هەندێک خەڵک مونازەرەیان لەگەڵ ابن عباس دەکرد دەربارەی موتعە پێی ووترا: أبو بكر و عمر وادەڵێن، ابن عباس ووتی: نزیکە بەردتان بەسەردا بباریێ لە ئاسماندا، ئەڵێم: پێغەمبەری الله ﷺ وایفەرموو ئێوەش دەڵێن: أبو بكر و عمر وایان ووت ؟!** [مجموع الفتاوى : 215/20]

ووتم: ئەوەتا ابن تيمية دەڵێ ئەمە قسەیەکی پڕو پوچە بڵێی ئایا تۆ لە فلان زانا شارەزاتری، چونکە ئەم زانایەش زانای تر هەیە کە پێچەوانەی ئەون لە بابەتەکەدا، گەر بڕیار بێ ئێوە ئەم پرسیارە بێ نرخ و بێ بەڵگەیە بکەن، ئەوا ئێمەش هەمان پرسیارتان لێ دەکەینەوە و دەڵێین: ئایا ابن تيمية لە سەلەف شارەزاترە ؟ بۆیە حەز دەکەم ئەم ووتەیەی ابن تيمية بدەم بەگوێی دانە بەدانەی ئەوانەی کە کاتێک پێیان دەڵێین فلان زانا ئەم کوفرە بەواحەی هەیە بە ئیجماعی سەلەف ئەم کارە کوفرە سەلەف تەکفیری ئەم جۆرە کەسانەیان کردووە، کەچی دەڵێن: ئێوە لە زانایانی خەلەف و معاصرین شارەزاترن ؟ ئەوان تەکفیریان نەکردووە چۆن ئێوە تەکفیری دەکەن ؟! ئێمەش دەڵێین: ئەی باشە ئەو زانایانەی کە ئێوە باسی دەکەن ئەوان شارەزاترن یان سەلەف ؟ گەر بڕیار بێ سەرزەنشتی ئێمە بکرێ چونکە موخالەفەی خەلەفمان کردووە، ئەوا خەلەف زۆر لەپێشترن کە سەرزەنشت بکرێن کە موخالەفەی سەلەفیان کردووە، (فأي الفريقين أحق بالأمن إن كنتم تعلمون) ؟ وە جیاوازی نێوان مەنهەجی سەلەف و خەلەف لەم بابەتەدا هێندە زۆرە هیچ بوارێکی بۆ جەمع کردن نەهێشتۆتەوە، ئەوەی لەلای سەلەف کافر بووە لای خەلەف کراوە بە پێشەوا !

*ابن تيمية* دەربارەی خیلافی هاوەڵان دەڵێ: **گەر خیلافیان تێکەوت دەیگەڕێننەوە بۆلای الله وپێغەمبەرەکەی، ووتەی هیچ کامیان نابێتە بەڵگە مادام هاوەڵانی تر موخالەفەیان کردووە، بە کۆدەنگی زانایان.** [مجموع الفتاوى : 14/20]

ووتم: جا گەر هاوەڵان کە زاناترین کەسی ئوممەتن کە خیلافیان تێکەوت ووتەی کەسیان نەبێتە بەڵگە بەسەر ئەوی تر، ئەی چۆن دەربارەی أبو حنيفة ووتەی ابن تيمية دەکەن بە بەڵگە بەسەر کەسانێک کە خۆیان لەگەڵ أبو حنيفة ژیاون و ئاگاداری حاڵی بوونە و لە یەکێک لە باشترین سێ قەرنەکە ژیاون و زۆر زاناترن لە ابن تيمية، بەڵکو ابن تيمية خۆی بە شوێنکەوتەی ئەوان دەزانێت.

*ابن تيمية* دەڵێ: **بابەتە ئیجتیهادییەکان جائیز نیە سەرزەنشتی بەرامبەری تێدا بکرێ تەنها بە ڕوونکردنەوە و بەڵگە نەبێت، نابێت سەرزەنشت و ئینکاری بکرێ بە پشت بەستن بە تەقلیدێکی تەواو، چونکە ئەمە کاری جاهیل و هەوەس بازانە.** [مجموع الفتاوى : 212/35]

ووتم: ئەمڕۆ چەندە زۆرن ئەوانەی کە ناوی خەواریج و غولاتی تەکفیر و منداڵ و جاهیل و رويبضة ...هتد بەکاردەهێنن لە دژت گەر موخالەفەی شێخەکانیان بکەیت، ئەمەش دەرهاوێشتەی تەقلیدی کوێرانەی شێخەکانیانە وادەزانن جگە لەوەی ئەوان ووتویانە مەحاڵە شتێکی تر صەواب بێ، بێ ئاگان لەوەی کە خۆشیان موخالەفەی باشترین سێ سەدەی ئوممەتیان کردووە، گەر ئێوە دەست بە ووتەی ابن تيمية دەگرن فەرموون دەست بەم ووتەیەی بگرن بە بەڵگەوە وەڵاممان بدەنەوە نەک تەنها بە هەرا نانەوە و تۆمەت بەخشینەوە چونکە ئەمە کاری جاهیل و هەوەس بازانە وەک ابن تيمية ووتی، بۆیە تەقلیدکردنی ئەم و ئەو یان ووتنی تۆ زاناتری یان فلان زانا ئەم جۆرە ووتانە لای ابن تيمية قبوڵ نیە و بە جەهلی دادەنێت.

*ابن تيمية* دەڵێ: **مەحاڵە ئوممەت لەسەر بەچاک دانانی شتێک کۆک بن گەر چاک بوایە پێشینان ئەنجامیان دەدا کەچی ئەنجامیان نەداوە، ئەمە جۆرێکە لە دژ بەیەک بوونی ئیجماعەکان، ئیجماعەکانیش دژبەیەکترنابن، وە گەر ئەوانەی دوای پێشینان خیلافیان تێکەوت**

**ئەوا جیاکەرەوە لەنێوانیان قورئان و سوننەت و ئیجماعی پێشینە.**

[اقتضاء الصراط المستقيم : 205/2]

ووتم: ئەمە ئەو شتە مەحاڵەیە کە ئەمڕۆ بە چاوی خۆمان دەیبینین، سەلەف لەسەر شتێک کۆک بوونە، کەچی سەردەمەکانی دواتر لەسەر پێچەوانەکەی کۆکن، وەک حاڵی زۆرێک لەو زانایانەی کەوتوونەتە کوفر یان بیدعەوە، لەلای سەلەف زانست و کتێبی بە سوود ڕێگر نەبووە لە تەکفیر کردن و تەبدیع کردن، بەڵام لە سەردەمەکانی دواتر خەریکە ئیجماع دروست بێت کە هەر زانایەک کتێبی بە سوودی هەبوو کوفریشی هەبێت هەر پێشەوایە ونابێ تەکفیر بکرێ، بیدعەکانیشی هەر شایستەی باس کردن نین چ جای ئەوەی حوکمی بیدعەچی لەسەر بدەین ! جا هەیانە بەم چاوەوە لە باسەکە دەڕوانێ و دەڵێ ئایا دەکرێ زۆربەی زانایانی خەلەف و معاصرین هەڵە بن کاتێک زانا خاوەن کوفرەکانیان کردۆتە پێشەوا بە چاکە نەبێت باسیان نەکەن ؟! ئینجا وەڵامی خۆی دەداتەوە و دەڵێ: مەحاڵە شتی ئاوا ڕوو بدات بۆیە هەر ئەوە حەقە کە ئەوان لەسەری ڕۆیشتوون، بێ ئاگایە لەوەی کە بەم ووتەیەی ئیجماعی سەلەفی پوچەڵ کردۆتە و ناڕاستەوخۆ هەڵە دەداتە پاڵیان، ئەی تۆ بڵێی سەلەف هەڵەبن کە ئیجماعیان هەبوو لەسەر شتێکی ئاوادا ؟ سەیرم بەوە دێت کە هەموویان خۆیان بە شوێنکەوتەی سەلەف دەزانن بەڵام کاتێک خیلاف هەیە لەنێوان سەلەف و خەلەف پێ بە پێ شوێنی خەلەف دەکەون و زۆر بە خراپەش باسی ئەوانەش دەکەن کە شوێنی سەلەف کەوتوون بەڵام جورئەت ناکەن هەڵەکە بدەنە پاڵ سەلەف دەیدەنە پاڵ ئەوانەی کە دوای ووتەی سەلەف کەوتوون، گەر بڕیار بێ بە فەهمی خەلەف لە مەنهەجی سەلەف تێبگەین ئەوا هیچ بایەخێک بۆ ووتەی سەلەف نامێنێتەوە چونکە خەلەف چۆن لە بابەتەکە تێبگەن و لەسەری بڕۆن هەر ئەوە صەوابە کەواتە ووتەی سەرەتا وکۆتا هەر ووتەی خۆیانە ئەوان چی بڵێن و چۆن تێبگەن هەرئەوە ڕاستە، ووتەی سەلەف هیچ نرخێکی نیە تەنها ئەو کاتە نەبێت کە خەلەف پێی ڕازی دەبن ئینجا نرخ پەیدا دەکات گەر خەلەف پێی ڕازی نەبوون ئەوا نرخی نیە هەروەک دەربارەی أبو حنيفة بینیمان، دەڵێی ئەم هەموو زانایەی سەلەف وای ووت، دەڵێ ابن تيمية واناڵێ، کەواتە کەی ابن تيمية بە ووتەی سەلەف ڕازی بوو لەسەری ڕۆیشت ئەوکات ووتەکە نرخ پەیدا

دەکات ئەگینا هیچ نرخێکی نیە ! ئێستا کەسانێک دەڵێن واتا تۆ لە ابن تیمیة زیاتر لە ووتەی سەلەف تێدەگەیت ؟ تۆ لەو زیاتر شوێنکەوتەی سەلەفی ؟ هەمان شێوازی پرسیاری یەکەم دووبارە دەکەنەوە، منیش هەمان وەڵامیان دەدەمەوە، قەناعەتیان بەخۆیان هێناوە گەر سەلەف تەکفیری أبو حنيفة-ش بکەن هەر پێشەوایە چونکە ابن تیمیة بە پێشەوای داناوە، ئەی باشە ووتەکانی سەلەف چی ؟ دەڵێن بێگومان نابێ بە ڕواڵەت وەری بگرین مادام ابن تیمیة وەری نەگرتووە کەواتە شتێک هەیە ئێمە نایزانین یان لەوانەیە بڵێن ئەمە باسێکە عەقڵی ئێمە بەرگەی ناگرێت قسەی ابن تیمیة وەربگرە و هیچ بیریش لە ووتەی سەلەف مەکەرەوە، جا بۆیە لەم بڕگەیەدا مەنهەجی ابن تیمیة نیشان دەدەین کە چەند نەرم بووە لە حوکمدان لەسەر گروپە کافر و بیدعەچیەکان، کاتێک حوکمی ابن تیمیة دەبینن دەربارەیان ئەوا زۆر بەلاتانەوە ئاسایی دەبێت کە بۆچی ابن تیمیة تەکفیر و تەبدیعی أبو حنيفة ناکات بگرە بە ئیمام وەسفی دەکات.

هەندێکی تر ووتەی سەلەف وەک کۆدی سەربازی و ئەم جۆرە شتانە سەیر دەکات کە هەموو کەس لێی تێناگات، پێی وایە گەر یەکێک لە سەلەف أبو حنيفة تەکفیر بکات یان تەبدیعی بکات ئەوا مانای ئەوە نادات کە تەکفیر و تەبدیعی کردبێ، چونکە ئێمە لەو ئاستە دانین لە ووتەی سەلەف تێبگەین، کە ابن الجارود دەڵێ: خیلاف هەبووە دەربارەی أبو حنيفة موسڵمانە یان نا ئێمە تێناگەین ئەم قسەیە مانای چیە، کە منصوربن أبي مزاحم دەڵێ: مالك أبو حنيفة-ی لە دین خستە دەرەوە تێناگەین مانای چیە، کە حماد بن سلمة دەڵێ: أبو حنيفة لە دین دەرچووە تێناگەین مانای چیە، کە شريك دەڵێ: هەموو ماڵێکی کوفە عەرەقی تێدا بێت باشترە لەوەی کەسێکی تێدابێت عەقیدەی وەک أبو حنيفة بێت تێناگەین مانای چیە، کە مالك دەڵێ: أبو حنيفة دژایەتی دینی کرد تێناگەین مانای چیە، کە شعبة لەعنەت لە أبو حنيفة دەکات تێناگەین مانای چیە، ووتەکانی سەلەف ئەوەندە ئاسان نین هەمووی کۆدن دەبێت محققین لە خەلەف بێن دیراسەی بکەن و لێی بکۆڵنەوە بزانن ئەم ووتانە مانای چین، سەرەنجامیش دەرکەوت ئەم ووتانە هەموو ئێکسپایەرن و أبو حنيفة ئیمامە بەکوێرایی چاوی دوژمنان ! ئەمەیە زمانحاڵی زۆربەی ئەو کەسانەی کە بەرگری

لە أبو حنيفة دەکەن جا زانا بن یان عەوام، بەڵام من لێرەدا تەنها ئەوە دەپرسم پێش ئەوەی ابن تيمية لە دایک بێت خەڵکی چۆن لە ووتەکانی سەلەف تێگەیشتوون ؟

سەرەڕای هەموو ئەمانەش ژمارەیەک ووتەی ابن تيمية-مان هێنا لە بەشی یەکەم کە دەری دەخات باش ئاگاداری ووتە و کتێبەکانی سەلەفە لەدژی أبو حنيفة بۆیە بە السبكي دەڵێ: کتێبەکانی سەلەف پڕن لە تانەدان لە أبو حنيفة تەنانەت وای لێهات کەس ڕیوایەتی لە أبو حنيفة و هاوەڵانی نەکرد کتێبە ناودارەکانی فەرمووودە ناوی ئەوانی تێدا نیە، یان دەڵێ: أبو حنيفة بە جائیزی دەزانی فێڵ بکرێت بۆ لابردنی زەکات لەسەر خاوەنەکەی، یان دەڵێ: ئەهلی کوفە دوورترین کەسن لەوەی کە بە بەڵگەوە وەڵامی فەتوا بدەنەوە لە هەموو کەسێکیش سوودیان کەمترە بۆ موسڵمانان، یان دەڵێ: مەزهەبی أبو حنيفة لە هەموو ئەهلی بیدعەکان پێکدێت چونکە مەزهەبەکەی نەفی بیدعە ناکات ئەگەرچی ئیثباتیشی نەکات، وە دان بەوە دەنێت کە مورجیئە بووە، دان بەوە دەنێت ئەهلی ڕەئی بووە، وەک باسمان کرد ئاگاداریشە کتێبەکانی سەلەف پڕن لە قسە ووتن پێی کەچی هەر بە ئیمامی ئەهلی سوننەی دەزانێت و مەدحی دەکات، ئەمەش بێگومان کاریگەری سەردەمەکە وایکردووە ئێستاش بەچاوی خۆمان دەبینین زانا هەیە کتێبی عبدالله یان الفسوي یان البخاري یان ابن عدي یان العقيلي یان ابن حبان یان الخطيب تەحقیق دەکات و ڕیوایەتەکان هەمووی دەبینێت و دانیش بەوە دەنێت ژمارەیەکی صەحیحن کەچی کاریگەری سەردەم و دەوروبەرەکەی وای لێدەکەن أبو حنيفة بە ئیمامی ئەهلی سوننە بزانێت بۆیە ناچار بیانوو بۆ ڕیوایەتەکانی سەلەف دەهێنێتەوە.

گەر هەر سووریشن لەسەر ئەوەی کە ابن تيمية ناکرێ لە باسێکی ئاوادا نەیپێکابێ، ئەوا مولزەم دەبن بەوەی کە بڵێن زۆربەی زانایانی سەلەف نەیان پێکاوە کاتێک وەک ابن تيمية مەدحی أبو حنيفة-یان نەکردووە، یان ئاسانتر بڵێم ئایا ئیمام أحمد زاناترە یان ابن تيمية ؟ ئایا کامەیان قەدر گەورەترن لەلای ئوممەت ؟ ئایا کامیان بە پێشەوای ئەهلی سوننە ناسراون ؟ مەگەر ابن تيمية خۆی حەنبەلی نیە ؟ ئەی بۆ بەلاتانەوە ئاساییە موخالەفەی ئیمامێکی وەک أحمد بکەن

بەڵام بەلاتانەوە قورسە موخالەفەی ابن تيمية بکەن ؟ بڕۆن ووتەی أحمد و ابن تيمية دەربارەی أبو حنيفة بەراوورد بکەن ئینجا بڕیار بدەن بزانە شوێنی ووتەی کامیان دەکەون.

ئێستا دەڵێن چۆن دەکرێ ابن تيمية ئەم شتانەی زانی بێت و لای چەسپا بێت کەچی پێچەوانەی ئەمانە بکات خۆ ئەو هەرگیز سڵی نەکردۆتەوە لە ووتنی حەق، دەڵێین: بەڵێ ڕاستە خاوەن خوێندەوەیەکی یەکجار فراوان بووە و ئاگاداری حاڵی زۆربەی زانایانی پێشە خۆی بووە و بە ووردی لە عەقیدەی ڕوانیون و هەڵەکانی باسکردوون هەروەک ئەوەی أبو حنيفة کە ژمارەیەک لایەنی خراپی باسکرد، بەڵام کێشەکە لەوە دایە کە ابن تيمية ئەگەرچی زۆر لێزان بووە لە حاڵی کەسەکان و گروپەکان بەڵام لە حوکمدان لەسەریان زۆرجار موخالەفەی سەلەفی کردووە، بۆیە من هیچ بەلامەوە سەیر نیە کە ابن تيمية أبو حنيفة بە پێشەوا بزانێت چونکە کەسانی زۆر لە أبو حنيفة خراپتری بە موسڵمان زانیوە کە کوفری بەواحیان هەبووە، دەزانم ئەم قسەیەش خوێنەر توشی شۆک دەکات بەڵام کام خوێنەر ؟ ئەو خوێنەرەی کە ئاگای لە کتێبەکانی ابن تيمية نیە و تەنها چەند ووتەیەکی ئەوی دیوە لە ئینتەرنێت، وە ڕاستی ئەم بانگەشەیە بە بەڵگە دەخەینەڕوو لەم کتێبەدا، وە دڵنیام ئێستا لەگەڵ خوێندنەوەی ئەمە دەڵێن هەر زوو زانیمان تەکفیر کردنی أبو حنيفة ئەمەی بەدوا دادێت تەنها بەو ناوەستێ زاناکانی تریشی بەدوا دادێت ئەوەتا ابن تيمية-ش تەکفیر کرا و هاوشێوەی ئەم قسانە، لە ئێستاوە ڕایدەگەیەنم نە ابن تيمية نە ابن القيم  نە ابن رجب نە ابن كثير نە نەجدییەکان بە کافر نازانم، بەڵام هەروەک لە سەرەتای بەشی دووەم ئاماژەم پێدا هەر زانایەک بەرگری لە أبو حنيفة کردبێت و خەڵکی بەهۆی تەقلیدکردنەوەی ئەو أبو حنيفة-یان لەلا گەورە بووبێ ئاوا ناچاردەبم هەڵەکانی باس بکەم تا خەڵکی ئاگادار بێتەوە کە ئەم زانایە چۆن بووە و لە ئاستی خۆیدا زیاتر بەرزی نەکەنەوە، وە لەبەر زۆری تەقلیدکردنەوەی ابن تيمية نەبێ دەربارەی أبو حنيفة و ئەشعەرییەکان ئەوا حەزم نەدەکرد لەسەر ابن تيمية قسە بکەم بەڵام کە زانا لە هەڵەدا خەڵک شوێنی کەوت واجبە هەڵەکانی ڕوون بکرێتەوە، ئێستاش دەڵێن جا تۆ چیت تا هەڵە لە ابن تيمية بگریت و باسی بکەیت، منیش دەڵێم با بچینە سەر بەڵگەکان ئەوکات

دەردەکەوێ یان من عەقڵم لە دەست داوە یان ئێوە بێ ئاگان لەم هەڵانەی ابن تيمية، وە وەڵامی ئەو وەڵامانەی ئێوەشم ئامادەکردووە چونکە دەزانم بۆ وەڵامدانەوەی من دەڵێن ابن تيمية کە ووتی بە معین تەکفیر ناکرێ هەمیشە مەبەستی تەکفیری معذب-ە نەک غیر معذب، یان دەڵێن لەشوێنی تر ووتەی تری هەیە پێچەوانەیە دەبێ هەموو کتێبەکانی سەیر بکرێ تا لە مەنهەجی ئەو تێبگەی لە تەکفیر و هاوشێوەی ئەم جۆرە قسانە، وەڵامی ئەمانەش دەدەینە بە یارمەتی الله تعالى.

یەکێک لە ناسراوترین کتێبەکان کە دەربارەی مەنهەجی ابن تيمية و محمد بن عبدالوهاب و زانایانی نەجدی لە تەکفیری معین نوسراوە کتێبەکەی أبي العلاء بن راشد-ە (ضوابط تكفير المعين عند شيخي الإسلام ابن تيمية و محمد بن عبدالوهاب وعلماء الدعوة الإصلاحية) تەنانەت مامۆستا کامەران ﷺ لە دەرسەکانیدا ئەم کتێبەی دەخوێندەوە و ڕەددی مەدخەلیەکانی پێ دەدایەوە، چونکە نوسەری کتێب لەگەڵ ئەوەدایە کە ابن تيمية و هەموو نەجدییەکان تەکفیری معین دەکەن هەرکاتێکیش باسی ئیقامە حوججە بکەن مەبەستیان تەنها پێگەیشتنی بەڵگە بووە نەک تێگەیشتن، واتا ئەوەی قورئان و سوننەتی پێگەیشتن ئیقامە حوججە کراوە تێگەیشت یان نا ئەمە پەیوەندی بە تەکفیر نیە، بۆیە مەدخەلیەکان تەنانەت ڕەخنەیان لە صالح الفوزان گرتووە کە پێشەکی و تقريظ-ی بۆ ئەم کتێبە نوسیوە، چونکە نوسەر بە پێچەوانەی عەقیدەی مەدخەلیەکان کتێبەکەی نوسیوە و ووتەکانی ابن تيمية-ی بەو ئاقارەدا بردووە کە مەدخەلیەکان بە ئاقاری تەکفیری بوون ناوی دەنێن، بەڵام گەر سەیری بڕگەکانی کتێبەکە بکەین دەبینین نوسەر هەر ووتەیەکی ابن تيمية-ی هێنا بێت دەربارەی ئیقامە حوججە و تەکفیری معین لە ژێریدا کۆمەڵێک ووتەی نەجدییەکانی هێناوە بۆ شەرحکردنی ووتەکەی ابن تيمية، واتا گەر کتێبەکە تەنها ووتەی ابن تيمية-ی تێدابوایە بەبێ شەرحی نەجدییەکان بۆ ووتەکانی، ئەوا خوێنەر زۆر بە ئاسودەیی دەیووت ابن تيمية تەکفیری معین ناکات تەنها دوای ئیقامە حوججە نەبێت، ئەوەی کتێبەکەی خوێندبێتەوە هەست بەمە دەکات بەڕوونی، بۆ ڕاستی ئەم قسەیەش دەتوانن کتێبی (منهج ابن تيمية في مسألة التكفير) بخوێننەوە کە تەنها ووتەی ابن تيمية-ی هێناوە بەبێ شەرحی

نەجدییەکان، کە لە خوێندنەوەی کتێبەکە تەواو دەبیت بە دڵنیاییەوە دەڵێی: ابن تیمیة یەکێکە لەو زانایانەی کە دژی تەکفیری معین-ە زۆر دەست گرتووە بە عوزر هێنانەوە و مەرجدارکردنی ئیقامە حوجەە، وە یەکێکە لەو زانایانەی کە بابەتی تەکفیری زۆر قورسکردووە، پێش ئەوەی بەم ووتانەم توڕە ببیت و بچیت لە ئینتەرنێت بەدوای هەندێک ووتەی بگەڕێی کە تەکفیری معین دەکات و بیهێنیت بۆ ئەوەی ڕەددی منی پێ بدەیتەوە، ئەوا برۆ ئەم دوو کتێبە بخوێنەوە کە ئاماژەم پێدا، بزانە هەمان ئەم حاڵەتەت بۆ دروست نابێت کە باسم کرد، جا من لێرەدا تەنها باسی کتێبەکەی أبي العلاء بن راشد دەکەم کە نوسەر لەسەر عەقیدەی ئەهلی سوننە نوسیویەتی و ووتەکانی ابن تیمیة-ی هەر بەپێی عەقیدەی ئەهلی سوننە لەیەک داوەتەوە دوور لە فکرەی مەدخەلیەت، بەڵام هێنانی ووتەی نەجدییەکان بۆ شەرحکردنی ووتەکانی ابن تیمیة لە زۆربەی بڕگەکانی کتێبەدا خۆی لەخۆیدا ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە کێشە هەیە لە ووتەکانی ابن تیمیة و پێویستە ڕوونکردنەوەی بۆ بکرێ ئەگینا بەبێ ڕوونکردنەوەی نەجدییەکان گومانت لەوە نیە کە ابن تیمیة بەبێ ئیقامە حوجە تەکفیری معین ناکات لە زۆربەی جۆرەکانی کوفردا بەتایبەتی ئەو کۆمەڵانەی بە ئیجماعی سەلەف تەکفیر کراون لای ئەو تەکفیری مطلق-ە نەک معین، دیسان دەیڵێمەوە توڕە مەبە برۆ کتێبەکە بخوێنەرەوە بزانە وایە یان نا، من بۆیەش دەتنێرم بۆلای کتێبەکەی أبي العلاء بن راشد ناتنێرم بۆلای کتێبەکانی ابن تیمیة چونکە ئەو بەرگرییەکی زۆر لە ابن تیمیة دەکات لەم بابەتەدا ووتەکانی بە شێوەیەک لەیەک دەداتەوە کە موافقی ئەهلی سوننە بێت لە زۆربەی بڕگەکاندا ئەگەرچی لە هەندێک شوێندا ئەویش و نەجدییەکانیش تێڕاماون نازانن ووتەکەی چۆن لەیەک بدەنەوە جا یان دانی پێدەنێن بە ناڕاستەوخۆ کە لەگەڵی دانین لەمەدا بەبێ ئاماژەدان بەوەی کە هەڵەی کردووە و نەیپێکاوە، یان بە زۆر لەخۆ کردن تەئویل بۆ ووتەکەی دەهێننەوە تا هیچ کێشەی تێدا نەمێنێت، پێش ئەوەی بچینە سەر نەقل کردنی ووتەکانی گەر ئەنجامی ئەم بڕگەیەت بە دڵ نەبوو تۆمەتبارم مەکە بە هیچ ناو و ناتۆرەیەک هەر هیچ نەبێ حەقی ئەوەم پێ بدە بڵێ ووتەکانی ابن تیمیة گوماناوین بۆیە بە هەڵە تێگەیشتووە، الله پاداشتی ئەوەش بداتەوە کە بە دروستی تێم دەگەیەنێت بەڵام بەبێ زۆر لەخۆکردن، وە لێرەدا ئەو ووتانە نەقل ناکەین کە گەلێک زۆرن

هەمیشە باسی مەرجدارکردنی ئیقامە حوججە دەکات بۆ تەکفیرکردن چونکە نەجدییەکان هەموویان ئیقامە حوججە بەوە لێک دەدەنەوە کە قورئان و سوننەت پێگەیشت ئیقامە حوججە کراوی ووتەکانی ابن تيمية-ش هەر بەم شێوەیە لێک دەدەنەوە، ئەو ووتانەشی ناهێنین کە باسی شروط و موانعی تەکفیر دەکات چونکە نەجدییەکان ئەوەش هەر بە شروط و موانعی شەرعی لێک دەدەنەوە، بۆ نموونە عاقڵ نەبێ و بالغ نەبێ و بە زۆر کوفری پێکرابێ ئەمانە مانعی تەکفیرن یان ئەو بابەتانەی کە بە بابەتی (خفي) دادەنرێن کە دوای ئیقامە حوججە کەسەکە تەکفیر دەکرێت، بەڵکو ئەو ووتانە دەهێنین کە باسی ڕووداوی زیندوو دەکات لەکاتی جێبەجێ کردنی حوکم لەسەر کەسەکان و کۆمەڵەکان، چونکە زانا هەرچەندە لە بابەتی تەکفیردا لەڕووی نەزەری موافقی ئەهلی سوننە بێت یان موخالیف سەنگی مەحەک لەکاتی ڕووداوە زیندووەکانە کە بابەتێکی دێتە پێش دەربارەی تەکفیر ئەوکات دەزانین لە بابەتی تەکفیردا لەسەر عەقیدەی ئەهلی سوننەیە یان شلڕەوی و زیادەڕەوی هەیە، بۆیە من گرنگی بە حوکمەکانی دەدەم کە دەربارەی کەسەکان و گروپەکان داویەتی، چونکە ووتەی نەزەری زۆر جار گوماناوییە و چەند ڕووێک و تەئویلێک هەڵدەگرێت هەر کەسێک بەپێی عەقیدەکەی خۆی ووتەکە بۆلای خۆی ڕادەکێشێت، لێرەدا ووتانێک نەقل دەکەین کە بوار بۆ هیچ تەئویلێک نەهێڵێتەوە.

**المعلمي** دەڵێ: **زانایان گەر هەڵەی زانایەکیان پێ بگات یان پیاو چاکێک وە بترسن لەوەی کە خەڵکی هەڵخەڵەتێن بە گەورەیی ئەم زانایە و شوێنی بکەون ئەوا لە پلەی زاناکە کەم دەکەنەوە و ناودارییەکەی تۆزاوی دەکەن سەرەڕای خۆشویستنیان بۆ ئەم زانایە و زانینی پلەکەی، بەڵام بچووکی دەکەنەوە تا خەڵکی بەهۆی ئەم زانایە توشی فیتنە نەبن.** [رفع الاشتباه : 1/294-295]

هەر خودی ابن تيمية ئەم شێوازەی بەکار هێناوە لە ڕەددانەوەی ڕافیزە کاتێک بەرگری لە سێ خەلیفەکەی تر دەکات بەرامبەر ڕافیزە دادەبەزێتە سەر ئیمام علي چونکە زانراوە کە ڕافیزە چەندە پێی کاریگەرن بگرە هەندێکیان کردوویانە بە خوا، ئەگەرچی لەم کارەشدا نەیپێکاوە ابن تيمية بەڵام وەک نموونەیەک بۆ ئەم شێوازە باسم کرد، چونکە لەلای ئەهلی سوننە هاوەڵان هێڵی سوورن بۆ

بەرگری کردن لە معاوية و بني أمية دانابەزنە سەر ئیمام علي، وە بۆ بەرگری کردن لە ئیمام علي دانابەزنە سەر معاوية و بني أمية، هەر لەکۆنەوە زانایان ڕەددی ڕافیزەیان داوەتەوە بەڵام کەسیان دانەبەزیونەتە سەر ئیمام علي مەگەر زاناکە ناصبي بوو بێت وابکات، جا گەر ابن تيمية بەلایەوە ئاسایی بێت بەم جۆرە باسی ئیمام علي بکات لەپێناوی ڕەددانەوەی ڕافیزە، ئەوا ئێمەش زۆر بەلامانەوە ئاساییە لەپێناوی ڕەددانەوەی گومانەکانی ئێوە دابەزینە سەر ابن تيمية، چونکە ئیمام علي و ابن تيمية بەراوورد ناکرێن لە هیچ ڕوویێکەوە، سەرەڕای ئەوەش دەزانین ابن تيمية ناصبي نەبووە و ئیمام علي خۆشویستووە و بە خەلیفەی ڕاشدی زانیوە و بە شەهیدی داناوە، بەڵام وەک ووتمان بۆ بێدەنگ کردنی ڕافیزە دەست بۆ ئیمام علي دەبات و هەڵەکانی باس دەکات لەکاتێکدا لای ئەهلی سوننە هاوەڵان بە چاکە نەبێت باس ناکرێن دواتر ئیمام علي گەر پڕ بە دونیا تاوانی هەبێت ئەوەندە بەسیەتی کە موژدەی بەهەشتی پێ دراوە، جا بۆیە چەند ووتەیەکی ابن تيمية دەهێنین دەربارەی ئیمام علي تا کاتێک ئێمەش قسەمان کرد لەسەر ابن تيمية پێش ئەوەی تۆمەتمان بەسەردا ببەخشنەوە ئەوا ووتەکانی ابن تيمية-تان بیر کەوێتەوە دەربارەی ئیمام علي.

**ابن تيمية دەڵێ: ئەوانەی کۆبوونەوە بۆ کوشتنی عثمان زۆربەیان کەسانی هیچ و پوچ بوون لە قەبیلەکان کە هیچ شتێکی چاکیان نیە لە ئیسلامدا باس بکرێ، گەر لەبەر فیتنەی کوشتنی عثمان نەبوایە هەر باس نەدەکران، بەڵام علي لەو کاتەی کە بوو بە خەلیفە نزیکەی نیوەی موسڵمانە سابقینە ئەوەلینەکان بەیعەتیان پێی نەدا لە موهاجیرین و ئەنصار و جگە لەوانیش، کە دانیشتن نە جەنگان لەگەڵیدا و نە جەنگان لەدژیدا، وەک أسامة بن زيد و ابن عمر و محمد بن مسلمة، وە هەندێکیان جەنگان لەدژیدا، پاشان زۆرێک لەوانەی کە بەیعەتیان پێیدا پاشگەز بوونەوە لە بەیعەتەکەیان، هەندێکیان تەکفیریان کرد و خوێنیان حەلال کرد، وە هەندێکیان چوونە بەرەی معاوية، وەک عقيل-ی برای و هاوشێوەکانی.** [منهاج السنة النبوية : 316/8]

**ابن تيمية دەڵێ: علي لەسەر مانەوەی لە دەسەڵات جەنگا، وە بەهۆی ئەمەوە کەسانێکی**

زۆر کوژران، لە خیلافەتەکەی ئەودا شەڕ لەگەڵ کافراندا نەکرا و وولاتانیان فەتح نەکرا و موسڵمانان خێری زیاتریان بەخۆیانەوە نەدی، وە کەسە نزیکەکانی خۆی دامەزراند، جا دامەزراندنی کەسە نزیکەکان لەنێوان علي وعثمان هاوبەشە. وە کارمەندەکانی عثمان گوێڕایەڵتر بوون لە کارمەندەکانی علي، وە دوورتریش بوون لە خراپە، وە دابەشکردنی پارەش بەسەرکەسە نزیکەکاندا کە عثمان تەئویلی خۆی هەبووە لەم کارەدا هەروەک چۆن علي تەئویلی خۆی هەبووە لە خوێن ڕژاندن، جا بابەتی خوێن ترسناکتر وگەورەترە. [منهاج السنة النبوية : 6/191-192]

ابن تيمية دەڵێ: ئەوانەی خروجیان کرد لە عثمان کۆمەڵێک کەسی هیچ و پوچ بوون، بەڵام علي زۆرێک لە سابقینە ئەوەلینەکان شوێنی نەکەوتن و بەیعەتیان پێی نەدا، وە زۆربەی هاوەڵان وتابعین جەنگان لەدژیدا، بەڵام لە خیلافەتی عثمان وولاتان فەتح کران و لەدژی کافران جەنگان، وە لە خیلافەتی علي کافر نەکوژرا و شارێکیش فەتح نەکرا. [منهاج السنة النبوية : 8/234]

ابن تيمية دەڵێ: زانراوە کە الله خۆشەویستی هاوەڵانی خستۆتە ناو دڵی هەموو موسڵمانێک بەتایبەتی خەلیفەکان ﭫ بەتایبەتی أبو بكرو عمر زۆربەی هاوەڵان وتابعین خۆشیان دەویستن، وە ئەوان باشترین قەڕن بوون، بەڵام علي وانەبوو زۆربەی هاوەڵان وتابعین ڕقیان لێی بوو جوێنیان پێی دەدا و دەجەنگان لە دژی. [منهاج السنة النبوية : 7/137-138]

ابن تيمية دەڵێ: علي ﭬ ئەهلی سوننە خۆشیان دەوێت ومووالاتیان بۆی هەیە و شایەتی دەدەن کە یەکێکە لە خولەفای راشدین و پێشەوایانی هیدایەتدراو، بەڵام نیوەی خەڵکەکەی ژێر دەستی تانەی لێدەدەن، خەواریج تەکفیری دەکەن، جگە لە خەواریجیش ئەوانەی ئەهلی بەیتی ئەون یان ئەهلی بەیتی ئەو نین دەڵێن علي ئینصافی نەبوو بەرامبەرمان، کۆمەڵەکەی عثمان دەڵێن علي لەوانە بوو کە زوڵمی لە عثمان کرد، جا بە شێوەیەکی گشتی عەدالەتی علي دەرنەکەوت سەرەڕای زۆری خەڵکەکەی ژێر دەستی و بەر بڵاوییان بە قەدەر عەدالەتی عمر، بگرە نزیکی عەدالەتی عمر نەکەوتەوە، عمر کەس لە خزمەکانی نەکرد بە کار بەدەست، علي خزمەکانی کرد

**بە کار بەدەست هەروەک چۆن عثمان کردی، عمر لەگەڵ ئەوەشدا دەترسا کە زوڵمی لە ژێر دەستەکەی کردبێ، علي سکاڵای لە ژێر دەستەکەی دەکرد کە زوڵمیان لێی کردووە، وە دوعای لێدەکردن و دەیووت: من ڕقم لێیانە و ئەوانیش ڕقیان لێمە، وە بێزارم لێیان و ئەوانیش لێم بێزارن، یا الله ئەوانم بۆ بگۆڕە بە چاکتر لەوان و منیش بگۆڕە بۆ ئەوان بە خراپتر لە من، فأي الفريقين أحق بالأمن إن كنتم تعلمون ؟** [منهاج السنة النبوية : 18/6]

**ابن تيمية** لە وەڵامدانەوەی ڕافیزەکان کە تانەیان لە ئیمام عثمان داوە بەوەی پۆست و پارەی داوە بە کەس و کارەکەی خۆی دەڵێ: **تایبەت کردنی هەندێک کەس بە پۆست پێدان و ماڵ پێدان لەکوێ، ئوممەت بکەوێتە گیانی یەکترو هەندێک خوێنی هەندێک بڕێژێ و بەیەکترەوە خەریک بن و ئاگایان لە بەرژەوەندی دین و دونیایان نەمێنێت تا وای لێبێت کافران چاویان ببڕنەووڵاتی موسڵمانان ئەمە لەکوێ ؟ کۆبوونەوەی موسڵمانان و فەتح کردنی ووڵاتی دوژمن لەکوێ ؟ دووبەرەکی و فیتنەی نێوان موسڵمانان لەکوێ ؟ تا وای لێبێت بێ توانا بن بەرامبەر دوژمن و دوژمن هەندێک لە ووڵاتیان داگیر بکات یان هەندێک لە ماڵیان بە زۆر یان بە صولح.** [منهاج السنة النبوية : 157/6]
ووتم: لێرەدا نموونە بە ئیمام عثمان و ئیمام علي دەهێنێتەوە، گەر ئێوە دەڵێن عثمان پۆست و ماڵی داوە بە خزمەکانی، ئەوەتا لە سەردەمی علي فیتنەی زۆر گەورەتر ڕوویداوە کە خوێن ڕشتنی موسڵمانان و نەمانی فتوحات بووە، بۆی هەیە خوێنەر بڵێ قسەکانی ڕاستن، بەڵام وەک سەرەتا باسمان کرد هاوەڵان هێڵی سوورن ناڵێین کەسیان بێ هەڵەن بەڵام باسکردنی هەڵە وکەم و کوڕیان ترسناکە لەڕووی عەقیدەوە ئەگەرچی ئەم هەڵە وکەم و کوڕیانەیان تێدا بێت بە ڕاستی، بۆیە نابینین هیچ کام لە سەلەف بە دابەزینە سەر ئیمام علي ڕەددی ڕافیزە بدەنەوە مەگەر ئیللا کەسێک ناصبي بێت وابکات.

**ابن تيمية** دەڵێ: **ئێمە ئینکاری لەوە ناکەین کە عثمان** رضي الله عنه **بني أمية-ی خۆشدەویست و موالاتی بۆیان هەبوو، وە پارەی زۆری پێ دەدان، وە لەم کارانەشی کە بە ئیجتیهاد کردوویەتی زانایان قسەیان تێدا کردووە ئەوانەی کە هیچ نیازێکی خراپیان نیە، وە بە هەمان شێوە ئینکاری**

لەوە ناكەین كە علي كەسە نزیكەكانی دەكرد بە خاوەن پۆست، وە جەنگا و كەسانێكی زۆری كوشت لەو موسڵمانانەی كە نوێژیان دەكرد و زەكاتیان دەدا و ڕۆژوویان دەگرت و نوێژیان ئەنجام دەدا. بەڵام كوشتاری هەندێك لەمانەی كرد بە بەڵگەی دەقی شەرعی و ئیجماع، وە كوشتاری هەندێكیانی كرد بە ئیجتیهاد كە زانایان قسەیان تێدا كردووە ئەوانەی كە هیچ نیازێكی خراپیان نیە، جا بابەتی خوێن ترسناكترە لە بابەتی ماڵ، وە ئەو خراپەیەی كە لەنێوان ئوممەت ڕوویدا لە خوێن چەندەها جاری ئەو خراپەیە زیاتر بوو كە ڕوویدا بە پێدانی ماڵ، جا ئێمە كە موالاتمان هەیە بۆ علي و خۆشمان دەوێت و گەورەییەكانی باس دەكەین كە لە قورئان و سوننەت ئاماژەی پێدراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی لە خیلافەتی ئەو ڕوویدا نزیكترە لە لۆمە كردن وەك لەوەی كە لە خیلافەتی عثمان ڕوویدا، وە لە خیلافەتی عثمان خێر ڕوویدا كە لە خیلافەتی علي هاوشێوەی ئەم خێرە نەبوو، جا موالات هەبوونمان بۆ عثمان وخۆشویستنی وباسكردنی گەورەییەكانی كە لە قورئان و سوننەتدا ئاماژەی پێدراوە لەپێشترە. [منهاج السنة النبوية : 356/6]

ابن تیمیة دەڵێ: ئەوەی ئاگاداری حاڵی هاوەڵان بێت گومانی لەوەدا نیە كە عمر لە علي زیاتر دژایەتی كافران و مونافیقانی دەكرد، وە كاریگەری عمر لە سەرخستنی ئیسلام و بەهێز كردنی و سەرشۆڕكردنی كافران و مونافیقان زیاتر بوو لە كاریگەری علي، وە كافران و مونافیقانی دوژمنانی پێغەمبەر ڕقیان لە عمر-ە زیاتر لە علي، هەر بۆیە ئەو كەسەی كە عمر-ی كوشت كافر بوو ڕقی لە دینی ئیسلام بوو، وە ڕقی لە پێغەمبەر وئوممەتەكەی بوو، جا كوشتنی عمر بەهۆی ڕق لێبوونەوەی پێغەمبەر و دینەكەی و ئوممەتەكەی بوو، بەڵام ئەو كەسەی كە علي كوشت نوێژی دەكرد و بە ڕۆژوو دەبوو و قورئانی دەخوێند، وە بڕوای وابوو كە الله و پێغەمبەرەكەی پێیان خۆشە علي بكوژرێ، وە ئەم كارەی ئەنجامدا بەهۆی خۆشویستنی بۆ الله و پێغەمبەرەكەی بە بڕوای خۆی ئەگەرچی لەم كارەیدا گومڕا و بیدعەچی بوو. [منهاج السنة النبوية : 7/152-153]

جا گەر بەم شێوەیە دروست بێت ابن تیمیة باسی ئیمام علي بكات بۆ وەڵامدانەوەی ڕافیزەكان ئەوا زۆر دروسترە كە ئێمەش باسی هەڵەكانی ابن تیمیة بكەین بۆ وەڵامدانەوەی گومانی

ئەو کەسانەی کە لە هەڵەشدا شوێنی ابن تیمیة دەکەون و ووتەکانی دەکەن بە بەڵگە.

تێبینی: پێش ئەوەی بچینە سەر هێنانی ووتەکان دەمەوێ ئاماژە بەوە بدەم کە (ناصر الفهد) الله ئازادی بکات کتێبێکی نوسیوە بەناونیشانی (صيانة مجموع الفتاوى من السقط والتصحيف) لەم کتێبەدا ئاماژەی بەو هەڵانە داوە کە لە کۆکردنەوە و چاپکردنی مجموع الفتاوى ڕوویداوە لە رووی تەصحیف واتا گۆڕینی ووشەیەک بۆ ووشەیەکی تر، یان کەوتنی پیتێک یان ووشەیەک یان چەند دێڕێک لە ووتەکانی ابن تیمیة کە هەندێک مانای ووتەکەی دەگۆڕێ یان ناڕوون دەبێت، ئەو ووتانەی کە من هێناومە لەم بڕگەیەدا هیچیان لە کتێبەکەی ناصر الفهد نەهاتووە واتا هیچ ووتەیەکی تێدا نیە کە بووترێ ئەمە گۆڕاوە یان قرتاوە یان بە هەڵە چاپکراوە، تەنها یەک ووتە نەبێت ئەویش نە تەصحیف نە کەوتن و نە گۆڕانکاری و قرتان تێیدا ڕووی نەداوە ئەویش بەرگی 4 لاپەڕە 15 ابن تیمیة باسی أبو محمد دەکات، ناصر الفهد ئەم ووتەیەی نەقل کردووە لە کتێبەکەی بە مەبەستی ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە ئەم أبو محمد-ە کێیە ؟ ئایا أبو محمد الجويني-ە باوکی أبو المعالي الجويني ؟ یان العز بن عبدالسلام-ە ؟ ناصر الفهد ئەوەی بە صەواب داناوە کە العز بن عبدالسلام بێ ڕوونیشی کردۆتەوە بە سێ خاڵ کە بۆچی ئەمەی بە صەواب داناوە، کەواتە هەرچی تەصحیف و کەوتن هەیە لەهەر 35 بەرگەکەی مجموع الفتاوى کە ناصر الفهد ئاماژەی پێداوە هیچیان لەم بڕگەیەدا نەهاتووە تەنها ئەو ووتەیە نەبێ کە باسمان کرد ئەویش تەنها ڕوونکردنەوەی داوە کە أبو محمد کێیە، بۆیە لە ئێستاوە دڵنیا بن هیچ ووتەیەکمان نەهێناوە کە قسەی لەسەر کرابێ گوایە قرتاوە یان گۆڕاوە یان بۆی زیاد کراوە.

# ووتەکانی ابن تیمیة دەربارەی تەکفیری مطلق و تەکفیری معین و عوزر هێنانەوە بە جەهل و بە تەئویل

ابن تیمیة دەڵێ: لە زۆربەی پێشەوایانی ئەهلی سوننە و حەدیث هاتووە کە دەڵێن: ئەوەی بڵێ قورئان مەخلوقە کافرە، ئەوەی بڵێ: الله نابینرێ لەڕۆژی دوایی کافرە، وە هاوشێوەی ئەم ووتانە، پاشان أبو نصر السجزي لەوانەوە دوو ووتە دەگێڕێتەوە، یەکەمیان: ئەمە کوفرێکە لە دین دەیباتە دەرەوە، السجزي دەڵێ: ئەمە ووتەی زۆرینەیانە، دووەمیان: ئەمە کوفرێکە لە دین نایباتە دەرەوە، بۆیە الخطابي دەڵێ: ئەم ووتانەیان ووتوە لەسەر شێوەی هەڕەشە و توندی نواندن لە بابەتەکە.

بەهەمان شێوە زانا موتەئەخیرینەکانی مەزهەبەکەمان خیلافیان تێکەوتووە دەربارەی مانەوەی تاهەتایی لە دۆزەخ بۆ ئەو کەسانەی کە توشی بیدعەی کوفری بوونە، جا زۆرینەیان وتوویانە تاهەتایی لە دۆزەخ دەمێننەوە هەروەک لە ژمارەیەک زانای موتەقەدیمینی ئەهلی حەدیث نەقل کراوە وەک أبو حاتم و أبو زرعة و جگە لەوانیش، وە هەندێکیان نەیان ووتوە تاهەتایی لە دۆزەخ دەمێننەوە، هۆکاری ئەم خیلافەش دژ بەیەک بوونی بەڵگەکانە، بەڵگانێک دەبینین پێیان وایە دەبێت حوکمی کوفریان بەسەردا بدەن، پاشان دەبینن کەسە معین-ەکان کە ئەم قسە کوفریانەیان کردووە ئیمانی تێدایە کە وادەکات ڕێگر بێت لەوەی تەکفیر بێت، جا بەڵگەکان دژ بەیەک دەوەستن لەلایان، لە ڕاستیشدا ئەوان ووتە عامەکان دەیانگرێتەوە لە ووتەی پێشەوایان هەروەک چۆن ووتە عامەکان لە دەقە شەرعیەکاندا پێشینانی گرتۆتەوە، هەر کاتێک بیانبینن دەڵێن: ئەوەی وابڵێت کافرە، جا گوێگر وادەزانێت ئەم ووتەیە گشتگیرە هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە وایان ووتوە، لەوە وورد نەبوونەتەوە کە تەکفیر مەرج و ڕێگری (شروط و موانع) هەیە کە وادەکات تەکفیر لەسەر کەسی معین لابەرێت، وە تەکفیری مطلق مەرج نیە تەکفیری معین بگرێتەوە، ئەم نموونەیەش ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە ئیمام أحمد و زۆرینەی پێشەواکان کە ئەم ووتە گشتگیرانەیان ووتوە تەکفیری زۆربەی ئەو کەسانەیان نەکردووە کە ئەم قسە کوفرییەیان

كردووە، ئیمام أحمد بە نموونە لەگەڵ جەهمیەكاندا ژیا و ئەوانی بینی كە بانگیان دەكرد بۆ ووتنی قورئان مەخلوقە و نەفیكردنی صیفاتەكان، وە تاقیان كردووە لەگەڵ باقی زاناكانی سەردەمی خۆی، وە ئیماندارانی پیاو و ژنیان توشی فیتنە كرد كە هاوڕایان نەبوون لەسەر جەهمی بوون بە لێدان و بەندكردن وكوشتن و دوورخستنەوە لە دەسەڵات و بڕینی بژێویان و ڕەتكردنەوەی شایەتیان و وازهێنان لێیان كە لەژێر دەستی دوژمن بمێننەوە بە دیلی، بەشێوەیەک زۆرێک لە وەلی ئەمرەكانی ئەو سەردەمە جەهمی بوون لە والیەكان و قازیەكان و جگە لەوانیش، تەكفیری هەموو ئەوانەیان دەكرد كە جەهمی نەبوون و هاوڕایان نەبوون لەسەر نەفیكردنی صیفات وەک ووتنی قورئان مەخلوقە، وە هەمان حوكمی كافری بەسەردا دەدەن نە هیچ ویلایەتێكی پێدەدەن ببێتە والی، نە ئازادیشی دەكەن لە دەستی دوژمن، نە هیچیشی پێ دەدەن لە بیت المال، نە شایەتی و فەتوا و ڕیوایەتی قبوڵ دەكەن، وە خەڵكی تاقیدەكەنەوە لەكاتی بوونیان بە والی یان شایەتی دان و ئازادكردنی دیل و جگە لەمانەش، جا ئەوەی دان بەوە بنێت قورئان مەخلوقە حوكمی بۆ دەدەن كە ئیماندارە، وە ئەوەی دان بەوە نەنێت قورئان مەخلوقە حوكمی ئەهلی ئیمانی بۆ نادەن، وە هەر كەسێک بانگەواز بكات بۆ جگە لە جەهمی بوون دەیكوژن یان لێی دەدەن و بەندی دەكەن، وە زانراویشە كە ئەم كارانە توندترین پلەی جەهمی بوونە، چونكە بانگەوازكردن بۆ شتێک تاوانەكەی گەورەترە لەوەی كە تەنها باوەڕت پێی هەبێ، وە پاداشت كردنی ئەوكەسەی كە باوەڕی پێی هەیە و سزادانی ئەوكەسەی كە باوەڕی پێی نیە تاوانەكەی گەورەترە لەوەی كە تەنها بانگەوازی بۆ بكەی، وە سزادانی بە كوشتن تاوانەكەی گەورەترە لەوەی كە سزای بدات بە لێدان، ئینجا ئیمام أحمد دوعای بۆ خەلیفە و جگە لەویش كرد لەوانەی كە لێیاندا و بەندییان كرد، وە داوای لێخۆشبوونی بۆكردن و لێیان خۆشبوو لەو كارانەی كە پێیان كرد لە زوڵم و بانگ كردنی بۆ ئەو ووتەیەی كە كوفرە، جا گەر ئەوانە لە ئیسلام هەڵگەڕابوانەوە ئەوا جائیز نەبوو داوای لێخۆشبوونیان بۆ بكرێ، چونكە داوای لێخۆشبوون بۆ كافر جائیز نیە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و ئیجماع، جا ئەم ووتانە و كارانەی ئیمام أحمد وپێشەوایانی تریش بەڵگەیەكی ڕاشكاوە كە ئەوان جەهمیەكانیان بە معین-ی تەكفیر نەكردووە ئەوانەی كە دەیانووت قورئان مەخلوقە و الله لە ڕۆژی دواییدا

**نابینرێ، وە لە ئیمام أحمد نەقل کراوە کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کەسانێکی بە معین-ی تەکفیر کردووە، بەڵام گەر لەم بابەتەدا دوو ووتەی لێوە ڕیوایەت بکرێ ئەوا جێگای تێڕامانە، یان ووتەکەی وا لێکدەدرێتەوە کە ڕوونکردنەوەی تێدایە، جا دەووترێ: ئەوانەی کە بە معین تەکفیری کردوون لەبەر ئەوە بووە کە مەرجەکانی تەکفیری تێدا هاتۆتەدی و ڕێگرییەکانی تەکفیری لەسەر نەماوە، وە ئەوەی کە بە معین تەکفیری نەکردووە لەبەر ئەوە بووە کە مەرجەکانی تەکفیری تێدا نەهاتۆتەدی، سەرەڕای ئەم ڕوونکردنەوەیەش کە بە ڕەهایی باسی تەکفیر دەکات مەبەستی تەکفیری مطلق-ە.** [مجموع الفتاوى : 12/487-489]

ووتم: لەم ووتەیەی بۆمان دەردەکەوێت کە ابن تیمیة پێی وایە:

١. خیلاف هەیە لە سەلەف کە ئەوەی بڵێ قورئان مەخلوقە لە دین دەردەچێت یان نا، وەک لە السجزي نەقلی کرد بۆمان بەبێ تەرجیح کردنی هیچ کام لە دوو ووتەکە، کە بێگومان ووتەی یەکەم صەوابە و خیلافی تێدا نیە.

٢. باسکردنی خیلاف دەربارەی مانەوەی تاهەتایی لە دۆزەخ بۆ ئەوانەی کە توشی بیدعەی کوفری بوونە بەتایبەت جەهمیەکان، ئەم خیلافەش هەر لە تەکفیر کردن سەرچاوە دەگرێ گەر پێت وابێ کافرە ئەوا هیچ گومانت نیە لەوەی کە تاهەتایی لە دۆزەخ دەمێننەوە، بەڵام کە سەنگت بۆ خیلافەکە دانا کەواتە لای تۆ یەکلایی نەبۆتەوە کە کافرن، هەروەک بە ڕوونی دواتر باسی دەکات کە کافر نین بە معین.

٣. بینینی کوفر لە کەسێکدا پاشان بینینی ئیمان تێیدا وادەکات ڕێگر بێت لەوەی کە تەکفیری بکەن بۆیە خیلاف دروست دەبێت و بەڵگەکان دژ بەیەک دەوەستن ! نازانم کە کوفرت لە کەسێک بینی دواتر چۆن دەبینی ئەم کەسە ئیمانی تێدایە ؟ ئینجا ئەم ئیمانەی ڕێگریت لێ دەکات کە تەکفیری بکەیت ! کە کوفرت لە کەسێک بینی کافرە تا تەوبە دەکات لە کوفرەکەی نازانم چۆن دوای ئەم کوفرە ئیمانی تێدا ماوە و بۆتە ڕێگر لە تەکفیر کردنی ؟!

٤. گوێگر هەر کاتێک بیستی کە سەلەف دەڵێن ئەوەی وابڵێ کافرە، وادەزانێت ئەم ووتەیە هەموو کەسێک دەگرێتەوە نازانێت کە تەکفیری مطلق و تەکفیری معین جیاوازە، تەنانەت ئیمام أحمد و

زۆربەی پێشەواکان کە وتوویانە ئەوەی وابڵێ کافرە، هەر خۆیان زۆرێک لەوانەیان تەکفیر نەکردووە کە وایان ووتوە ! ئەمە ناحاڵی بوونە لە مەزهەبی سەلەف دواتر گۆڕینی ڕاستیەکانە کەی هەبووە کەسێک بڵێ قورئان مەخلوقە و تەکفیری نەکەن چ جای ئەوەی بووترێ زۆربەیان تەکفیر نەکردوون ! بەڵکو سەلەف هێندە توند بوونە لەم بابەتەدا زۆرجار بە ڕەهایی وتوویانە ئەوەی بڵێ قورئان مەخلوقە کافرە ئەوەشی تەکفیری ناکات ئەویش کافرە، ئەم ڕەهاییە لە زۆر شوێندا دەبینین تەنانەت وایکردووە هەندێک کەس بە ڕەهایی کەسی دووەمیش تەکفیر بکەن، جا گەر کوفری کەسی یەکەم خیلافی بێت یان تەکفیری معین نەبێ سەلەف چۆن دەڵێن ئەوەی تەکفیریشی نەکات کافرە ؟ بێگومان کافر بوونی کەسی یەکەم بڕاوەتەوە بۆیە دەڵێن ئەوەی تەکفیری نەکات کافرە گەر خۆیان کەسی یەکەم تەکفیر نەکەن وەک ئەوەی ابن تیمیة باسی دەکات ئەی چۆن دەڵێن ئەوەی تەکفیری نەکات کافرە ! کەواتە خۆیان تەکفیر دەکەن.

٥. دوای باسکردنی دانە بەدانەی کوفری جەهمیەکان وەک المأمون و ئەوانەشی کە لە دەوری بوون لە والی و قازیەکان و زاناکان نموونەی بشر المريسي و ابن أبي دؤاد و موعتەزیلەکان، ابن تیمیة بۆمانی دەرخست کە چەندە ڕۆچوو بوون لە کوفردا و لە توندترین پلەی جەهمی بووندا بوون، کەچی دەڵێ مورتەد نین گەر مورتەد بوونایە ئیمام أحمد داوای لێخۆشبوونی بۆ نەدەکردن ! نازانم ئیمام أحمد داوای لێخۆشبوونی بۆ کامیان کردووە ؟! ئەم ووتەیەش پشت شکێنە بۆ ئەوانەی کە هەمیشە بیانوو بۆ ابن تیمیة دەهێننەوە هەر کاتێک ابن تیمیة ووتی کافر نیە دەڵێن مەبەستی کوفری معذب-ە نەک غیر معذب، هەر کاتێک باسی نەهیکردنی کرد لە تەکفیری معین هەر ئەم بیانووەی بۆ دەهێننەوە، دەی با بزانین چۆن لەم تەنگژەیە دەرباز دەبن کە بە ڕوونی دەڵێ: مورتەد نین، بۆ ئەمەش تەئویلێکی ترتان هەیە ؟ هەر ئەم جۆرە ووتانەش وایکردووە ئێستا مەدخەلیەکان پێمانی بفرۆشنەوە بڵێن ئیمام أحمد وەلی ئەمری تەکفیر نەکردووە ئێمەش نایکەین، دواتر ووتەکەی ابن تیمیة تایبەت نیە تەنها بە المأمون بەڵکو بە گشتی باس دەکات کە تەکفیری ئەوانەی نەکردووە کە وتوویانە قورئان مەخلوقە، لە شوێنی تریش ئەم جۆرە ووتانە دووبارە دەکاتەوە کە زیاتر ڕوونی دەکاتەوە کە جەهمیەکان بە معین تەکفیر ناکات.

٦. ئیمام أحمد گەر کەسانێکی تەکفیر کردبێ لە جەهمیەکان لەبەر ئەوە بووە کە مەرجی تەکفیری تێدا هاتۆتەدی، کەواتە ئەصل لەلای ابن تیمیة تەکفیری مطلق-ە نەک معین، بۆیە ڕوونکردنەوە دەدات بۆ ئەو حاڵەتانەی کە ئیمام أحمد تەکفیری معین-ی کردووە تا گومان دروست نەبێ و یەکلایی بکاتەوە کە ئیمام أحمد تەکفیری مطلق دەکات نەک معین، بە پێچەوانەی تۆی خوێنەر کە ئەصل لەلای تۆ تەکفیری معین-ە ڕوونکردنەوە بۆ ئەو ووتانە دەدەیت کە ابن تیمیة باسی تەکفیری مطلق دەکات تا گومان دروست نەبێ و یەکلایی بکەیتەوە کە ابن تیمیة تەکفیری معین دەکات نەک مطلق، پاشان دەڵێ: گەر بووتری دوو ڕیوایەت هەیە لە ئیمام أحمد دەربارەی تەکفیری مطلق و معین ئەمە جێگای تێڕامانە، واتا پێی سەیرە شتی ئاوا هەبێ چونکە یەکلا بۆتەوە لەلای کە ئیمام أحمد تەکفیری مطلق دەکات مەگەر هەموو مەرجەکان بهێنە دی و ڕێگرییەکان نەمێنن ئینجا تەکفیری معین دەکات، سەرەڕای ئەمەش لە کۆتایی یەکلایی کردۆتەوە کە هەر کاتێک ئیمام أحمد باسی تەکفیری کردبێ مەبەستی تەکفیری مطلق بووە !
دەی بزانین لەمەشدا شوێنی دەکەون بڵێن جەهمیەکانی سەردەمی ئیمام أحمد کە فیتنەی خلق القرآن-یان دروست کرد و خەڵکیان لەسەر کوشت وبەند کرد وسزادا وبانگەوازیان بۆ کرد مورتەد نین ؟ ئەوەتا ابن تیمیة دەڵێ مورتەد نین دەی ئێوەش بڵێ مورتەد نین هەروەک چۆن لە بابەتی أبو حنیفة ووتەی سەلەفتان پشت گوێ خستووە شوێنی ووتەکانی ابن تیمیة کەوتوون دەی لەمەشدا ووتەی سەلەف پشت گوێ بخەن و شوێنی ووتەکانی ابن تیمیة بکەون، جا کەسێک جەهمیەکانی ئەوکات بە موسڵمان بزانێ چۆن أبو حنیفة بە ئیمام نازانێ ؟ بێگومان بە ئیمامی دەزانێت.

**ابن تیمیة** دەڵێ: **ئەم ووتەیە ئامادەسازی بۆ دوو بنچینەی گەورەیە دەکات، یەکێکیان: عیلم وئیمان وهیدایەت ئەوەیە کە پێغەمبەر هێناویەتی، وە پێچەوانەی ئەویش کوفرە بە ڕەهایی، نەفیکردنی صیفات کوفرە، بە درۆ دانانی ئەوەی کە الله لە ڕۆژی دواییدا دەبینرێ، یان بە درۆ دانانی ئەوەی کە الله لە سەر عەرشە یان بە درۆ دانانی ئەوەی کە قورئان کەلامی الله یە، یان بە درۆ دانانی ئەوەی الله إبراهیمی کردۆتە خەلیلی خۆی ئەمانە کوفرن، وە هەر شتێک مانایەکی ئاوا**

**بدات كوفرە، ئەمەش واتای ووتەكانی پێشەوایانی سوننە و ئەهلی حەدیثە، بنچینەی دووەمیان: تەكفیری عام وەک هەڕەشەی عام وایە پێویستە بە مطلق-ی و گشتی باس بكرێ، بەڵام حوكمدان لەسەر كەسی معین كە كافر بێت یان حوكمی ئەوەی بەسەردا بدرێ كە دۆزەخیە، ئەمە وەستاوە لەسەر بەڵگەكانی كەسی معین، چونكە حوكمی تەكفیر وەستاوە لەسەر هاتنەدی مەرجەكانی و نەمانی ڕێگریيەكانی.** [مجموع الفتاوى : 12/497-498]

ووتم: تەكفیر كردنی معین لەلای ئەو تەنها دوای هاتنەدی شروط و نەمانی موانعە، ئەمەش بنچینەیەكی زۆر گەورەیە لەلای وەک خۆی باسیكرد، ووتەكەی یەكەمی بیانووی لێ بڕیون بۆیە ناتوانن ئەم ووتەیەش تەئویل بكەن.

*ابن تيمية* دەربارەی ئەوەی ئایا صیفەتەكانی الله بریتین لە زاتی الله یان بریتی نین لە زاتی الله، دەڵێ: **هیچ كام لەم دوو ووتەیە بە ڕەهایی ناووترێ ئیللا دەبێت مەبەستەكەی ڕوون بكرێتەوە لەگەڵیدا، تا كەسی بیدعەچی نەڵێ گەر صیفەتی الله غەیری الله بێت ئەوا هەموو شتێک جگە لە الله مەخلوقە، جا بەم ڕێگایە عیلم و قودرەت و كەلامی الله دەكات بە مەخلوق، صیفەتێک نیە كە لە الله دابێت بەڵكو دروستكراوە لە غەیری الله دا، جا ئەم كارە پەكخستنی صیفەتەكانی خالق و ئینكاركردنی كەمالی تێدایە كە گەورەترین ئیلحادە، ئەمەش ووتەی جەهمیەكانە كە سەلەف و پێشەوایان تەكفیریان كردن تەكفیرێكی مطلق ئەگەرچی كەسی معین تەكفیر ناكرێت تەنها دوای ئیقامە حوججە نەبێت.** [مجموع الفتاوى : 2/352]

ووتم: دان بەوە دەنێت كە كوفری جەهمیەكان گەورەترین ئیلحادە، بەڵام پێی وایە سەلەف بە مطلق-ی تەكفیری كردوون نەک بە معین، چونكە معین پێویستە دوای ئیقامە حوججە تەكفیر بكرێت، واتا كێشەكە تەنها سەردەمێک نیە كە جەهل تێیدا زۆر بێت بۆیە وابڵێ، بەڵكو پێی وایە لە سەردەمی سەلەفیش هەر بە مطلق تەكفیریان كردوون نەک معین.

*ابن تيمية* دەڵێ: **من بۆم ڕوون دەكردنەوە كە لە سەلەف و پێشەوایانەوە بۆیان نەقل كراوە كە بە مطلق ووتوویانە ئەوەی ئاوا و ئاوا بڵێ كافرە، ئەمەش شتێكی حەقە، بەڵام پێویستە جیاوازی**

**بكرێت لەنێوان مطلق و معين.** [مجموع الفتاوى : 230/3]

ووتم: ئەوەی من و تۆ ئەمڕۆ شەڕی لەسەر دەكەين لەگەڵ مەدخەليەكان ئەوەيە كە پێمان وايە سەلەف تەكفيری معين دەكەن نەک مطلق، كەچی ابن تيمية شەڕ لەسەر ئەوە دەكات كە ڕوونی بكاتەوە بۆ خەڵكی كە تەكفير لەلای سەلەف مطلق بووە نەک معين.

ابن تيمية دەڵێ: **تەكفير حەقی الله-يە كەس تەكفير ناكرێت تەنها ئەوە نەبێت كە الله و پێغەمبەرەكەی تەكفيريان كردووە، بە هەمان شێوە تەكفير كردنی كەسی معين و جائيز بوونی كوشتنی لەسەر ئەوە وەستاوە كە پەيامی پێغەمبەرايەتی پێ بگات كە بە موخالەفە كردنی ئەمە كافر دەبێت.** [الرد على البكري : 381]

ووتم: لێرەدا تەكفير وكوشتنی باسكرد كە دوای ئيقامە حوججە ئەم دووانە دەكرێن، ئەم بيانووەی هەڵوەشاندەوە كە دەڵێن هەركات ووتی تەكفير ناكرێ واتا سزا نادرێ بەڵام كافرە، خۆ لێرەدا هەردووكی باسكرد نە تەكفير دەكرێت و نە دەكوژرێت، گەر بووترێ مەبەستی لە ئيقامە حوججە ئەوەيە كە قورئانی پێ بگات ئيقامە حوججە كراوە، ئەوا لە ووتەكانی داهاتووی ئەم بيانووەش هەڵدەوەشێنينەوە كە دەربارەی كەسانێک باسی ئيقامە حوججە دەكات لەناو موسڵمانان‌دا ژياون و خۆيان داوەتە پاڵ دينی ئيسلام و شارەزاييان هەيە لە دين، كەواتە ئەم بيانووەش نامێنێت بڵێن مەبەستی لە ئيقامە حوججە پێگەيشتنی قورئانە بە كەسەكە، بۆ مەگەر ڕافيزی وجەهمی وموعتەزيلی وئەشعەری وگۆڕ پەرست قورئانيان پێ نەگەيشتووە ؟ ئەی بۆ دەربارەی ئەوانيش باسی ئيقامە حوججە دەكات لە تەكفيردا ؟

ابن تيمية دەڵێ: **هەركەسێک ئيمانی بە الله هەبێ ئەوا بەشێک لە ئيمانی هەيە بە گوێرەی ئيمانەكەی بە الله، پاشان ئەوەی ئيقامە حوججە نەكرا بێت و ئينكاری شتێک بكات ئەوا كافر نابێت، ئەمەش ڕوونی دەكاتەوە كە تەواوی نوێژكەران ئيمانيان بە الله و پێغەمبەرەكەی هەيە ئەگەرچی عەقيدەشيان جياوازی هەبێت دەربارەی الله و صيفاتەكانی، مەگەر تەنها مونافيق بێت بە زمانی ئيمان نيشان بدات و لە ناخيشەوە كافر بوونی بە پێغەمبەر شارد بێتەوە، ئەمەيان**

**ئیماندار نیە، جا هەرکەسێک ئیسلامەتی نیشان بدات و مونافیق نەبێت ئەوا ئیمانداره ئیمانی هەیە بە قەدەر ئەوەی کە پێی دراوە، وە لەوکەسانە دەبێت کە دێتە دەرەوە لە ئاگر ئەگەرچی بە قەد میسقالە زەررەیەک ئیمان لە دڵیدا هەبێت، ئەمەش هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە دەربارەی صیفاتەکانی الله وقەدەر خیلافیان هەیە سەرەڕای جیاوازی عەقیدەکانیان.**

[مجموع الفتاوى : 254/5]

ووتم: هەموو ئەوانەی دەربارەی صیفەتەکانی الله و قەدەر خیلافیان هەیە هەرجۆرە عەقیدەیەکیان هەبێت لەکۆتاییدا دێنە دەرەوە لە دۆزەخ بەبێ استثناء، جەهمی وموعتەزیلی وئەشعەری و ماتوریدی هەموویان سەرەنجام هەردەچنە بەهەشتەوە بەپێی قسەکەی ابن تیمیة، چونکە ئەوانە هەموویان ئیسلامەتی نیشان دەدەن و خۆیان بە موسڵمان دەزانن جا هیچ استثناء-ێکی نەکردووە بە ڕەهایی باسیکردووە هەر جۆرە عەقیدەکیان هەبێت و بەهەر جۆرێک لە صیفاتەکانی الله و بابەتی قەدەر بڕوانن گرنگ نیە مادام ئیسلامەتی نیشان دەدەن و باوەڕیان بە الله و پێغەمبەرەکەی هەیە و نوێژ دەکەن ئیتر موسڵمانن ! جا گەر بتەوێ تەئویل بۆ ئەمەش بهێنیتەوە ئەوا ووتەی دواتر لێتی هەڵدەوەشێنێتەوە.

**الذهبي دەڵێ: ووتەیەکی الأشعري (واتا: أبو الحسن الأشعري) بینی پێی سەرسام بووم، ئەم ووتەیەش بە صەحیحی چەسپاوە البيهقي ڕیوایەتی کردووە دەڵێ: بیستم أبو حازم العبدوي دەیووت: بیستم زاهر بن أحمد السرخسي دەیووت: کاتێک مەرگی أبو الحسن الأشعري نزیک بوویەوە لە ماڵەکەمدا لە بەغداد، بانگی کردم منیش چووم بۆلای، جا ووتی: شایەتی بدە لەسەرم کە من هیچ کەسێک لە ئەهلی قیبلە تەکفیر ناکەم، چونکە هەموویان ئاماژە بۆ یەک پەرستراو دەکەن، ئەو خیلافەش کە هەیە هەمووی خیلافی لەفزییە.**

**الذهبي دەڵێ: منیش بیروباوەڕم ئاوایە، وە بە هەمان شێوە شێخەکەمان ابن تیمیة لەکۆتایی ڕۆژەکانی ژیانیدا دەیووت: من هیچ کەسێک تەکفیر ناکەم لە ئوممەت، وە دەیووت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (پارێزگاری لە دەست نوێژ ناکات تەنها ئیماندار نەبێت) جا هەرکەسێک پابەندی**

**نوێژەكان بێت بە دەست نوێژەوە ئەوا ئیمانداره.** [سير أعلام النبلاء : 88/15]

ووتم: ئەم ووتەیە بە عەقڵیەتی تەكفیری عام وەرمەگرن وابزانن وتوویەتی ئەوەی نوێژ بكات بە موسڵمانی دەزانم تا ئەوكاتەی كوفری لێدەبینم، چونكە ئەوكات ئەم باسانە لە ئارادا نەبوونە تا قسەی لەسەر بكات ئەمڕۆ چەند منداڵێک زیندوویان كردۆتەوە، نە أبو الحسن نە ابن تيمية پێشتر تەكفیری عامیان كردووە تا ئاوا بڵێن نە لە سەردەمی ئەوانیش ئەم باسانە لە ئارادا بووە، خۆ گەر لەبەر ئەوە نەبێت كە ئێستا تەكفیری عام لە ئارادایە ئەوا ئەم ڕوونكردنەوەی نەدەویست چونكە ووتەكان دوور و نزیک پەیوەندی بەو باسەوە نیە، ئەم ووتەیەشی ڕوونكردنەوەیە بۆ ووتەی پێشووی كە ووتی هەر كەسێک لەم ئوممەتەدا نوێژ بكات وباوەڕی بە الله وپێغەمبەرەكەی هەبێت موسڵمانە ئەگەرچی عەقیدەشیان جیاواز بێت، گەر ووتەی تری هەبێ پێچەوانەی ئەمە ئەوا پێشتر وتوویەتی چونكە الذهبي دەڵێ لە دوا ڕۆژەكانی ژیانی ئەم قسەیەی كردووە، بەڕاستی ووتەكەش زۆر ترسناكە و دەرهێنانی تەكفیرە لەناو ئوممەت بە بیانووی ئەوەی نوێژ ئەنجام دەدەن، هەر بۆیە هەندێک كەس بیانوو بۆ ئەم ووتەیەی دەهێننەوە بەشێوەی جیاواز، هەندێک دەڵێن مەحاڵە شتی ئاوای ووتبێ چونكە لە هیچ كتێبێكدا شتی ئاوای نەووتوە و قوتابە هەرە نزیكەكەی كە ابن القيم-ە شتی ئاوای نەگێڕاوەتەوە لێی، كتێبەكانیشی پێچەوانەی ئەم ووتەیە بۆیە ڕەنگە الذهبي هەڵەی كردبێ، بەڵام الذهبي دەڵێ لە كۆتایی ڕۆژەكانی ژیانی ئەمەی ووتوە نەک هەر لە سەرەتاوە ئاوا بێت، وە هەندێكی تر دەڵێن گەر ووتەكە ڕاستیش بێت ئەوا مەبەستی ئەوەیە هیچ كەسێک لە ئوممەتی ئیسلام تەكفیر ناكەم لەوانەی كە لەسەر ئیسلامن و توشی كوفر و شیرك نەبوونە، ئەوانەی كە توشی شیرك و كوفر بوونە لە ئوممەتی ئیسلام دەرچوونە ئەم ووتەیە نایانگرێتەوە، منیش دەڵێم ئەم بیانووە یەكجار لاوازە چونكە هیچ كەسێک نیە بڵێ ئەوەی لەسەر ئیسلام بێت و هیچ كوفر و شیركی نەبێت هەر تەكفیری دەكەم، تەنانەت پیسترین خەواریجیش ئامادەیە بڵێ ئەوەی لەسەر ئیسلام بێت و هیچ كوفر و شیركی نەبێت تەكفیری ناكەم، ئەمە شتێک نیە كەس خیلافی تێدا دروست بكات، هەموومان ئەوە لەلامان براوەتەوە كە ئەوانەی لەسەر ئیسلامن و توشی كوفر نەبوونە نابێ تەكفیر بكرێن، ئەمە شتێكی زۆر سەرەتاییە كە شایستەی باسكردن نیە، وە ابن تيمية

لە ووتەکەی دیارە کە هۆکاری تەکفیر نەکردنەکە دەگەڕێنێتەوە بۆ نوێژ کردن و بەردەوام بوون لەسەر دەست نوێژ، بەڵگەش بە فەرموودەکە دەهێنێتەوە، وە الذهبي ووتەکەی ئەو دەبەستێتەوە بە ووتەکەی أبو الحسن الأشعري ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە هەردووکیان یەک مەبەستیان هەبووە بەلای الذهبي-ەوە ئەگینا گەر دوو مەبەستی جیاوازیان هەبوایە الذهبي ناڵێ ابن تيمية-ش بەهەمان شێوە وادەڵێ، جا بۆیە گەر بیانووی بۆ بهێنینەوە ئەوا بیانووی یەکەم زیاتر ڕێی تێدەچێ کە بڵێین الذهبي بە هەڵە حاڵی بووە لە ووتەکەی، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ بەڵگەیەکمان نیە بۆ ئەم ووتەیەمان کە بڵێین الذهبي بە هەڵە تێگەیشتووە تەنها گومان باش بردنە چونکە ووتەکەی زۆر ترسناکە واتای ئەوە دەدات خاوەنەکەی کەس تەکفیر ناکات مادام نوێژ بکات.
وە سەبارەت بە أبو الحسن ئەو عەقیدەی ڕوونە کە لە بابەتی ئیماندا جەهمیە سەیر نیە وابڵێ، الذهبي-ش کە پشتیوانی لە ووتەکەی دەکات ئەمەش شتێکی سەیر نیە چونکە الذهبي لە کتێبەکانی بە ئاشکرا ئەمەی نیشانداوە و جێبەجێی کردووە.

**الذهبي** دەربارەی ابن تيمية دەڵێ: **مەزهەبەکەی فراوانکردنی عوزر هێنانەوەیە بۆ خەڵک کەس تەکفیر ناکات ئیللا دوای ئیقامەکردنی حوججە لەسەری، وە دەڵێ: ئەم ووتەیە کوفر و گومڕاییە، وە خاوەنەکەی موجتەهیدێکی جاهیلە ئیقامە حوججە نەکراوە، وە لەوانەیە لێی پەشیمان بوو بێتەوە یان تەوبەی لێ کردبێت، وە دەڵێ: ئیمانەکەی جێگیر بووە جا لە ئیمان دەری ناکەینە دەرەوە تەنها بە یەقین نەبێ، بەڵام ئەو کەسەی حەق بناسێت و عینادی بەرامبەر بکات و لێی لابدات ئەوا کافر و مەلعونە وەک ئیبلیس، ئەگینا کێ هەیە لە هەڵە سەلامەت بێ هەم لە أصول و هەم لە فروع.** [ترجمة شيخ الإسلام ابن تيمية من الدرة اليتيمية في السيرة التيمية : 101-102]
ووتم: ئەمە ووتەی کەسێکە کە لەگەڵ ابن تيمية ژیاوە و قوتابی ئەو بووە، ووتەی کەسێک نیە کە بەهۆی کتێبەکانی لە مەنهەجەکەی تێگەیشتبێ، وە الذهبي یەکێکە لەوانەی لە زۆر بابەت موخالەفەی ابن تيمية-ی کردووە وەک خۆی باس دەکات لە زۆر بابەتی أصول و فروع موخالفی ئەوە، بەڵام لێرەدا هاوڕایەتی بێگومان گەر مەنهەجەکەی بەو جۆرە بوایە کە نەجدییەکان باسی

دەكەن ئەوا الذهبي لەمەشدا موخالەفەی دەكرد و باسی دەكرد، وە ابن رجب-یش لە (ذيل طبقات الحنابلة) هەمان ووتەی الذهبي لە ژياننامەی ابن تيمية نەقل دەكات، كەچی ابن رجب بێدەنگ دەبێت و هيچ ناڵێت لەسەری، گەر وانەبوایە لە بابەتێكی ئاوا گرنگدا بێدەنگ نەدەبوو، وە ابن رجب يەكێكە لەوانەی بە ابن تيمية كاريگەرە و لەگەڵ قوتابيەكانيدا ژياوە.

بڕوانە [ذيل طبقات الحنابلة : 506/4]

**ابن عثيمين** دەڵێ: **شيخ الإسلام** رحمه الله **لەو كەسانەيە كە پێی وايە تەئويل عوزرە، وە ئەگەر مرۆڤ لە تەئويلەكەيدا مەبەستی دژايەتيكردنی الله و پێغەمبەرەكەی نەبێت ئەوا عوزری هەيە، جا ڕەحمەتی الله-ی لێبێت لای ئەو بابەتی تەئويل فراوانە، جا دەڵێ: جياوازی هەيە لەنێوان ئەو كەسەی دژايەتی الله و پێغەمبەرەكەی دەكات لەگەڵ ئەو كەسەی كە دژايەتی ناكات، الله عز وجل دەفەرمووێ:** ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ **جا الله عز وجل ڕوونی كردەوە كە بێگومان دەبێت دژايەتی كردنەكە هەبێت ئينجا، وەكەسی تەئويلكەر دژايەتی الله و پێغەمبەرەكەی نەكردووە.** [شرح كتاب السياسة الشرعية : 178]

**ابن تيمية** دەڵێ: **من هەميشە وە ئەوەی لەگەڵم دانيشتبێ دەزانێت دەربارەی من كە يەكێكم لەوانەی بە توندی نەهی لەوە دەكەم كە كەسی معين تەكفير و تەفسيق و تاوانی بدرێتە پاڵ، مەگەر تەنها بزانێت كە كەسەكە ئيقامە حوججەی لەسەر كراوە گەر پێچەوانەی بكات ئەوكات دەبێتە كافر يان فاسق يان تاوانبار، وە من دان بەوە دەنێم كە الله لە هەڵەكانی ئەم ئوممەتە خۆشبووە، ئەم لێخۆشبوونەش هەموو هەڵە عەقيدەييەكان و كردارييەكان دەگرێتەوە.**

[مجموع الفتاوى : 229/3]

ووتم: والله ڕاست دەكات هەر كەسێك كتێبەكانی بخوێنێتەوە دەزانێت كە يەكێكە لەوانەی زۆر دژی تەكفيری معين بووە هەميشە ئيقامە حوججە و تەكفيری مطلق-ی باسكردووە.

**ابن تیمیة دەڵێ: کەسی تەئویلکەر کە مەبەستی شوێنکەوتنی پێغەمبەرە تەکفیر ناکرێت بەڵکو تەفسیقیش ناکرێت گەر ئیجتیهاد بکات و بکەوێتە هەڵەوە، ئەمەش ناسراوە لەلای خەڵکی لە بابەتە کردارییەکان، بەڵام بابەتە عەقیدەییەکان زۆربەی خەڵکی ئەوانەیان تەکفیرکردووە کە هەڵە دەکەن تێیدا، ئەم تەکفیرکردنەش لەلای هیچ یەکێک لە هاوەڵان و تابعینە چاکەکان و هیچ کام لە پێشەوایانی موسڵمانان نەزانراوە، بەڵکو ئەمە لە ئەصلدا ووتەی ئەهلی بیدعەیە.**

[منهاج السنة النبوية : 239/5]

ووتم: ئاگادار بە تۆ لەلای ابن تیمیة شوێنکەوتەی ئەهلی بیدعەی کاتێک ئەوکەسانە تەکفیر دەکەیت کە لە بابەتە عەقیدەییەکان دەکەونە هەڵەوە، هیچ سەلەفێکت نیە لە هاوەڵان و تابعین و پێشەوایانی ئیسلام ! دەپرسم گەر جاهیل عوزری هەبێت وتەئویلکەر عوزری هەبێت و موجتەهید عوزری هەبێت ئەی کێ تەکفیر دەکرێت ؟

**ابن تیمیة دەڵێ: ئەو ووتەیەی کە لە عبیداللە بن الحسن العنبري گێڕدراوەتەوە ماناکەی ئەمەیە: ئەو کەسانە بە تاوانبار نازانێت کە هەڵە دەکەن لە موجتەهیدەکانی ئەم ئوممەتە نە لە بابەتە أصولیەکان نە لە بابەتە فروعیەکان، وە زۆربەی زانایانی ئەهلی کەلام و ئەهلی ڕەئی سەرزەنشتیان کرد لەم ووتەیەیدا، بەڵام کەسانی تر دەڵێن: ئەمە ووتەی سەلەف و پێشەوایانی فەتوایە وەک أبو حنیفة والشافعي والثوري و داود بن علي و جگە لەوانیش، موجتەهیدی خاوەن هەڵە بە تاوانبار نازانن نە لە بابەتە ئوصولیەکان نە لە بابەتە فروعیەکان.**

[منهاج السنة النبوية : 87/5]

ووتم: لای ئەو عەقیدەی ئەهلی سوننە بەم شێوەیە کە کەسی موجتەهید گەر لە بابەتی عەقیدەییش هەڵە بکات نابێ تاوانبار بکرێت چ جای تەکفیر !

**ئیمام الشافعي دەڵێ: لە شتێکدا مونازەڕە بکەن کە هەڵەتان تێیدا کرد پێتان بووترێ: هەڵەتان کرد، مونازەڕە لە شتێکدا مەکەن کە هەڵەتان تێیدا کرد پێتان بووترێ: کوفرتان کرد.**

[مناقب الشافعي للبيهقي : 459/1]

**ئیمام الشافعي** دەڵێ: **ئەی محمد -واتا: محمد بن عبدالله بن عبدالحكم- گەر کەسێک پرسیاری لێکردیت دەربارەی شتێک لە عیلمی کەلام ئەوا وەڵامی مەدەوە، وە ئەگەر پرسیاری لێکردیت دەربارەی حەقی خوێن، دەڵێ: درهەمێک یان دانقێک، ئەویش پێت دەڵێ: هەڵەت کرد، بەڵام گەر پرسیارت لێبکات لە شتێک دەربارەی عیلمی کەلام تۆش بە هەڵە وەڵامی بدەیتەوە، دەڵێ: کوفرت کرد.** [مناقب الشافعي للبيهقي : 460/1]

**المزني** دەڵێ: **پرسیارم لە الشافعي کرد دەربارەی بابەتێکی عیلمی کەلام، ووتی: پرسیارم لێبکە دەربارەی شتێک گەر هاتوو هەڵەم تێدا کرد، بڵێی: هەڵەت کرد، پرسیارم لێمەکە دەربارەی شتێک گەر هاتوو هەڵەم تێدا کرد، بڵێی: کوفرت کرد.** [ذم الكلام وأهله : 1131]

**محمد بن عبدالله بن عبدالحكم** دەڵێ: **الشافعي دەیووت: والله گەر زانا فەتوا بدات و بووترێ: زاناکە هەڵەی کرد باشترە بۆی لەوەی قسەیەک بکات پێی بووترێ: زندیق، هیچ شتێک نیە زیاتر ڕقم لێی ببێتەوە لە عیلمی کەلام و ئەهلەکەی.** [سير أعلام النبلاء : 10/18-19]

**الذهبي** دەربارەی ئەم ووتانەی الشافعي دەڵێ: **ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە مەزهەبی أبو عبدالله (واتا: ئیمام الشافعي) بەم شێوەیە کە هەڵە کردن لە أصول دا وەک هەڵە کردن نیە لە ئیجتیهاد کردن لە فروع دا.** [سير أعلام النبلاء : 19/10]

ووتم: الذهبي کە تەکفیر لە عەقیدەی ئەودا بوونی نیە بەم شێوەیە لە ووتەکانی الشافعي تێگەیشتووە کە تێگەیشتنێکی دروستە، کەچی ابن تيمية دەڵێ: هیچ جیاوازی نیە لە أصول هەڵە بکەیت یان لە فروع، ئەم جیاوازی کردنە کاری ئەهلی بیدعەیە !

**ابن تيمية** دەڵێ: **زۆرێک لە بیدعەچیە موسڵمانەکانی ڕافیزە و جەهمیەکان و جگە لەوانیش چوونە ووڵاتی کافران جا کەسانێکی زۆر لەسەر دەستی ئەوان موسڵمان بوون و سوودیان لێیان بینی و بوون بە موسڵمانێکی بیدعەچی، ئەمەش باشترە لەوەی کە کافر بن.** [مجموع الفتاوى : 96/13]

ابن تيمية دەڵێ: **ڕافیزەی صاف و پاراو ئەوانە ئەهلی بیدعە و گومڕایین، نابێت موسڵمان کچەکەی بە شوو بدات بە ڕافیزی، بەڵام گەر پیاوەکە ویستی ئافرەتێکی ڕافیزی بخوازێت نیکاحەکەی دروستە گەر هیوای هەبێت کە تەوبە بکات ئەگینا وازهێنان لە خواستنی باشترە تا منداڵەکانی لێ تێک نەدات، والله أعلم.** [مجموع الفتاوى : 61/32]

ووتم: ڕافیزەی صاف و پاراو بە ئەهلی بیدعە و گومڕایی ناو دەبات، خۆ گەر بە ڕاشکاوی تەکفیری معین-ی کردبوایە ئەوکات کێشە نەبوو بڵێ بیدعەچی و گومڕان چونکە هەموو کافرێک بیدعەچی و گومڕایە، لێرەشدا باسی ڕافیزەی محض دەکات واتا یەک پارچەی صافە لە ڕەفز خەوشی تێدا نیە، پاشان دەڵێ گەر پیاوێک ویستی ئافرەتێکی ڕافیزە بخوازێت ئەوا نیکاحەکەی دروستە گەر هیوای پێ هەبێت کە تەوبە بکات، هەندێک کەس ووشەی (تەوبە) بەوە لێکدەدەنەوە کە ڕافیزەی بە کافر داناوە بۆیە باسی تەوبە دەکات، ووشەی تەوبە تەنها بۆ کوفر بەکار نایەت بۆ گوناهیش بەکاردێت چ جای بیدعە و گومڕایی وەک خۆی باسیکرد، بەڵام بە ڕوونی دیارە کە مەبەستی تەوبە نیە لە کوفر، چونکە ئەو لە سەرەتاوە نیکاحەکەی پێ دروستە پاشان گەر الله هیدایەتی داو تەوبەی کرد ئەوا باشترە، بێگومان دوای مارەکردنی ئافرەتەکە هەوڵی هیدایەتدانی دەدرێت کەواتە پێش هیدایەتدانی ئەو پێی دروستە مارە بکرێ، ئافرەتی موڕتەددیش مارە ناکرێ تا تەوبە دەکات، پاشان جوانتر ڕوونی دەکاتەوە کە بە کافری نازانێت کاتێک دەڵێ: (گەر هیوای هەبێت کە تەوبە بکات ئەگینا وازهێنان لە خواستنی باشترە) واتا گەر هیوای تەوبەکردنی پێ نەبوو ئەوا وەک یەدەگ (احتياط) واباشترە نەیخوازێ، ناڵێ جائیز نیە بیخوازێ چونکە موڕتەددە، هەروەک چۆن ئێمە دەڵێین دروستە ئەهلی کیتاب بخوازرێ بەڵام واباشترە تا موسڵمانی دەست کەوت موسڵمانەکە بخوازێ نەوەک ئەهلی کیتابەکە منداڵەکانی لێ تێک بدات.

ابن تيمية دەڵێ: **جائیز نیە بۆ هیچ کەسێک کچەکەی بە شوو بدات بە ڕافیزی و بەوکەسەی کە نوێژ تەرک دەکات، وە هەرکاتێک بە شوویدا بەو مەرجەی کە ئەو سوننەیە و پێنج نوێژەکەی کرد پاشان دەریخست کە ئەو ڕافیزەیە و نوێژ ناکات یان گەڕایەوە بۆ ڕافیزە بوون و تەرک کردنی**

**نوێژ ئەوا ئەم شتانە نیکاحەکە بەتاڵ دەکەنەوە.** [مجموع الفتاوى : 61/32]

ووتم: ڕافیزە بوون ونوێژ نەکردنی بەیەکەوە کردۆتە مەرجی هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکە، نەک تەنها ڕافیزە بوونەکەی، زانراویشە کە لەلای ئەو نوێژنەکەر کافرە، گەر تەنها ڕافیزە بوونی کردبوایە هۆکاری هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکە ئەوا لە ووتەی پێشوودا نەیدەووت دروستە گەر هیوای پێ هەبوو هیدایەت وەرگرێ ئەگینا وازهێنان لێی باشترە، وە لە زۆر شوێندا ڕافیزەکانی بە ئەهلی بیدعە ناوبردووە.

**ابن تيمية** پرسیاری لێدەکرێت دەربارەی کەسێک کە یەهود و نەصارا بە باشتر دەزانێت لە ڕافیزە، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: **الحمد لله. هەرکەسێک ئیمانی بەوە هەبێت کە محمد ﷺ پێی هاتووە ئەوا باشترە لە هەموو ئەوکەسانەی کە باوەڕیان پێی نیە. ئەگەرچی ئیماندارەکە جۆرێک لە بیدعەشی تێدا بێت جا بیدعەی خەواریج بێ شیعە بێ مورجیئە بێ قەدەری بێ یان جگە لەوانەش جیاوازی نیە، چونکە یەهود و نەصارا کافرن کوفرێک کە زانراوە لە دینی ئیسلامدا بە زەرورەت، جا کەسی بیدعەچی گەر وابزانێت ئەو موافقی پێغەمبەرە ﷺ نەک موخالفی بێت ئەوا پێی کافر نابێت. گەر واش دابنێین کە کافر دەبێت ئەوا کوفرەکەی وەک کوفری ئەوکەسە نیە کە باوەڕی بە پێغەمبەر ﷺ نیە.** [الفتاوى الكبرى : 516/3]

ووتم: پرسیاری لێدەکەن دەربارەی ڕافیزە کەچی باسی بیدعە دەکات ! وەک بڵێی ڕافیزە بیدعەچین و کافر نین، بۆیە دەڵێ: گەر واش دابنێین کە کافر بێت ئەوا هەر باشترە لە یەهود و نەصارا ! واتا وەک تەنازول کردن بڵێین کافرە نەک بە حەقیقی، لەکاتێکدا بە دەقی قورئان و سوننەت و ئیجماعی زانایان مورتەد حوکمی توندترە لە کافری ئەصلی، وە زیانیان زیاترە بۆ سەر موسڵمانان بە تایبەت ڕافیزە.

**ابن تيمية** دەربارەی نوێژنەکردن لەدوای ئیمامی بیدعەچی و فاسق دەڵێ: **گەر وازهێنان لە نوێژکردن لەدوایاندا بووە هۆی ئەوەی کە مەئموم نوێژی هەینی و پێنج فەرزەکەی لە دەست بچێ ئەوا لەم کاتەدا وازناهێنێت لە نوێژکردن لەدوایاندا مەگەرکەسێک بیدعەچی بێت و موخالەفەی**

**هاوەڵان بکات ﭫ واز دەهێنێت لە نوێژکردن لەدوایاندا، بەهەمان شێوە گەر ئیمامەکە وەلی ئەمرەکان دایانمەزراندبوو لە واز هێنانی نوێژکردن لەدوای هیچ بەرژەوەندییەک نەبوو ئەوا لەم کاتەدا لەسەری نیە واز بهێنێت لە نوێژکردن لەدوایاندا بەڵکو نوێژکردن لەدوای ئیمامێکی باشتر باشترە، هەموو ئەمانەش دەربارەی کەسێکە کە فسقێک یان بیدعەیەکی لێدەرکەوتووە کە دیارە پێچەوانەی قورئان و سوننەتە وەک بیدعەی ڕافیزە و جەهمیەکان و هاوشێوەیان.**

[مجموع الفتاوى : 354/23]

ووتم: بڕوانە بەڕوونی باسی ئەوە دەکات کە ڕافیزە و جەهمیەکان بیدعەچین گەر نوێژنەکردن لەدوایان بووە هۆی وازهێنان لە نوێژی هەینی و پێنج فەرزەکە بە کۆمەڵ ئەوا دەبێت نوێژیان لەدوا بکەیت و نابێت واز بهێنیت، باسی دووبارەکردنەوەی نوێژیش ناکات تا تەئویلی بۆ بکەن بڵێن بە کافری زانیون، بەڵکو تەواوی ووتەکەی دەربارەی نوێژکردنە لەدوای ئەو ئیمامانەی کە بیدعەچین یان فاسقن.

ابن تيمية دەڵێ: **کەسێک نوێژ بە کۆمەڵ بکات لەدوای بیدعەچیەک باشترە لەوەی نوێژ لەماڵەکەیدا بکات بە تەنها، تا ئەمە نەبێتە هۆی وازهێنان لە نوێژی بە کۆمەڵ بەیەکجاری، بەڵام ئەگەر توانی نوێژ بکات لەدوای ئیمامێک کە بیدعەچی نیە ئەوا چاکتر و باشترە بەبێ گومان، بەڵام گەر نوێژی لەدوای بیدعەچی کرد دەربارەی نوێژەکەی خیلاف هەیە لەنێوان زانایاندا، لە مەزهەبی الشافعي و أبو حنيفة نوێژەکەی دروستە، بەڵام لە مەزهەبی مالك و أحمد خیلاف و تەفصیل هەیە، ئەمەش دەربارەی بیدعەیەکە کە دەزانرێ موخالەفەی قورئان و سوننەتە وەک بیدعەی ڕافیزە و جەهمیەکان و هاوشێوەکانیان.** [مجموع الفتاوى : 23/355-356]

ابن تيمية دەڵێ: **ئەوەی لە سەلەف و پێشەوایەکانەوە ڕیوایەت کراوە بە مطلق-ی تەکفیری جەهمیە پاراوەکان دەکەن ئەوانەی کە ئینکاری لە صیفاتەکان دەکەن و حەقیقەتی ووتەکەیان ئەوەیە کە الله نە قسە دەکات و نە دەبینرێ و نە جیایە لە دروستکراوەکانی و نە عیلمی هەیە و نە قودرەت و نە بیستن و نە بینین و نە ژیان، بەڵکو قورئان مەخلوقە و ئەهلی بەهەشت الله نابینن**

**هەروەک چۆن ئەهلی دۆزەخ نایبینن و هاوشێوەی ئەم جۆرە ووتانە.** [مجموع الفتاوی : 352/3]
ووتم: دەڵێ سەلەف بە مطلق-ی جەهمیە پاراوەکانیان تەکفیر کردووە ! جەهمی پاراو واتا یەک پارچەیە لە جەهمیەت نەک تەنها چەند پەڵەیەکی جەهمیەتی تێدا بێت.

*ابن تيمية* دەڵێ: **لە فەتواکانی فەقیه أبو محمد (واتا: العز بن عبدالسلام) فەتوایەکی درێژم بینی کە شتی چاکی تێدا بوو، پرسیاریان لێ کردبوو دەربارەی ژمارەیەک بابەت، ئەویش لە وەڵامدا ووتوویەتی:** ... (دوای نەقل کردنی هەندێک لە ووتەکانی ئینجا دێتە سەر ئەم ووتەیە) **سەبارەت بە لەعنەت کردنی زانایان لە پێشەوا ئەشعەرییەکان ئەوەی لەعنەتیان لێ بکات تەمبێ دەکرێ و لەعنەتەکە بۆخۆی دەگەڕێتەوە، هەر کەسێک لەعنەت لە یەکێک بکات کە شایستە نەبێت ئەوا بۆخۆی دەگەڕێتەوە، زانایان سەرخەری فروعی دینن، وە ئەشعەرییەکان سەرخەری أصولی دینن.**
[مجموع الفتاوی : 4/15-16]

ووتم: بەلای ابن تيمية ئەمە قسەیەکی چاکە بووترێ: زانایان سەرخەری فروعی دینن، وە ئەشعەرییەکان سەرخەری أصولی دینن، لەکۆتایی ابن تيمية ئاماژە بەوە دەکات کە العز بن عبدالسلام بۆیە ڕێگری لە لەعنەت کردنیان کرد چونکە أصولی دینیان سەرخستووە، ئەمەش بریتیە لە موافەقەکردنی قورئان و سوننەت و ڕەددانەوەی ئەوەی موخالەفەی قورئان و سوننەت دەکات، جا هەندێک دەڵێن ئەوەتا لەبەر ئەوە بێدەنگ بووە لەسەر ئەم ووتەیە یان بە چاک ناوی بردووە وەک لە سەرەتا باسی دەکات لەبەر ئەوەیە کە ئەشعەرییەکان لە هەندێک بابەت موافقی ئەهلی سوننە بوونە و ڕەددی ئەهلی بیدعەیان داوەتەوە جا مەدحەکە تایبەتە بەمە نەک گشتی بێ، منیش دەڵێم باشە با وابێ، بەڵام ئەم ووتەیە وەک ئەوە وایە بووترێ: مەدخەلیەکان سەرخەری أصولی دینن چونکە لە بابەتی شیرکی هاوار کردن لە پیاو چاکان و گۆڕ پەرستی و باوەڕ بوون بە شتی پڕو پوچ و نەهێشتنی ئەم جۆرە شیرکانە دەستێکی باڵایان هەبووە لە ڕەددانەوەی سۆفیەکان بگرە لە جێبەجێ کردنی سوننەتە کردارییەکان و نەهێشتنی بیدعە ووتەیی و کردارییەکان ڕۆڵێکی باڵایان هەبووە لەناو مزگەوتەکاندا بە تایبەتی و دەرەوە بە گشتی، کەواتە دەکرێ بە مەدخەلیەکان

بڵێین لەم ڕووە سەرخەری أصولی دینن لەکاتێکدا خۆیان لە أصولی دین کەوتوونەتە کوفرەوە، ئەشعەرییەکانیش بەهەمان شێوە لە أصولی دین کەوتوونەتە کوفرەوە ئیتر نازانم سەرخستنی أصول مانای چیە لە کاتێکدا خۆت تێیکەوتووی ؟!

ئەوەی لەعنەتیش بکات لە ئەشعەرییەکان بۆخۆی دەگەڕێتەوە ! أبو إسماعيل الهروي کە خودی ابن تيمية بە شيخ الإسلام ناوی دەبات لە کتێبەکەیدا (ذم الكلام وأهله) لە چەندەها شوێن تەکفیرکردنی أبو الحسن الأشعري و ئەشعەرییەکان و لەعنەت کردن لێیان نەقل دەکات لەلایەن زانایانەوە، تۆ بڵێی بۆخۆی گەڕابێتەوە تەکفیر و لەعنەتەکان ؟!

أبو إسماعيل الهروي ئەگەرچی لەسەر عەقیدەی ئەهلی سوننە بووە لە زۆرێک لە بابەتەکان و زۆر توند بووە بەرامبەر کافر و بیدعەچیەکان بەڵام لە بابەتی تصوف و قەدەر تێکەوتووە کە جەبرییە لە قەدەردا، لەگەڵ ئەوەشدا ابن تيمية بە شيخ الإسلام ناوی دەبات، بینیوتانە سەلەف بە کەسێکی سۆفی و جەبری بڵێن شيخ الإسلام، جا وانەبێ کە ابن تيمية ئاگاداری حاڵی نەبێت بەڵکو خۆی هەڵەکانی باس دەکات، ئەمەش نیشانەی نەرمی ابن تيمية-یە لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لە عەقیدە تێکەوتوون، ئیتر بۆ لاتان سەیرە أبو حنيفة بە ئیمام وەسف بکات ؟!

أبو إسماعيل الهروي سەرەرای زۆر توند بوونی لەسەر عەقیدەی ئەهلی سوننە لە بابەتی صیفاتدا دژایەتیەکی توندی ئەهلی کەلامی دەکرد، بەڵام صۆفیە خلیسکانی گەورەی هەیە لە بابەتی (فناء) هەروەها لە بابەتی قەدەر جەبرییە، ابن تيمية-ش ئەمانە دەزانێ خۆی باسی کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا بە شيخ الإسلام ناوی دەبات، ئیتر ئەم نازناوە گەورەیە بدات بە کەسێکی ئاوا بۆ نازناوی ئیمام نادات بە أبو حنيفة ؟

**ابن تيمية** دەڵێ: **أحمد تەکفیری جەهمیەکانی نەکردووە بە معین، وە ئەوانەی أحمد پێی وتوون جەهمی هەمووی تەکفیر نەکردوون، وە ئەوانەی هاوڕای جەهمیەکان بوونە لە هەندێک بیدعەیاندا هەمووی تەکفیر نەکردوون، بەڵکو نوێژی لەدوای ئەو جەهمیانە کردووە کە بانگەوازیان دەکرد بۆ جەهمیەت و خەڵکیان تاقی دەکردەوە و سزای ئەوانەیان دەدا کە هاوڕایان**

**نەبن بە سزایەکی زۆر توند، کەچی أحمد و هاوشێوەی أحمد ئەوانیان تەکفیر نەکرد، بەڵکو أحمد بڕوای وابوو کە ئیماندارن و پێشەوان و دوعای بۆ دەکردن، وە بڕوای وابوو کە لەدوایاندا نوێژ بکرێ و حەج و جیهادیان لەگەڵدا بکرێ و ڕێگری بکرێ لە خروج کردن لێیان، هەروەک چۆن ئەم مافانەی بە پێشەواکانی تر دەدا، وە سەرزەنشتی ئەو کارە باطلەی دەکرد کە دایان هێنابوو کە کوفرێکی گەورە بوو ئەگەرچی ئەوان نەیاندەزانی کە کوفرە، جا أحمد سەرزەنشتی دەکرد و جیهادی دەکردن بۆ ڕەتکردنەوەی بەپێی توانا، جا گوێڕایەڵی الله و پێغەمبەرەکەی کۆ دەکاتەوە لە دەرخستنی سوننەت و دین و سەرزەنشت کردنی بیدعەی جەهمیە مولحیدەکان لەگەڵ ڕەچاو کردنی مافی ئیمانداران لە پێشەوایان و ئوممەت، ئەگەرچی جاهیل و بیدعەچی و زاڵم و فاسق بن.**

**[مجموع الفتاوى : 7/507-508]**

ووتم: بڕوانە جەهمیەکان بە مولحید ناو دەبات و دەڵێ ووتەکەیان کوفرێکی گەورە بوو، بەڵام کە دێتە سەر معین تەکفیریان ناکات و بە جاهیل و بیدعەچی و زاڵم و فاسق ناویان دەبات ! لەوەش سەیرتر ئەمە دەداتە پاڵ ئیمام أحمد گوایە بە موسڵمانی زانیون و نوێژی لەدوا کردوون ! دیارە بێ ئاگایە لەوەی کە ئیمام أحمد نوێژەکانی دووبارە دەکردەوە هەرکاتێک لەدوای ئەوانە نوێژی کردبوایە کە دەڵێن قورئان مەخلوقە، هەر ئەم جۆرە ووتانەیە کە ئەمڕۆ مەدخەلیەکان پێمانی دەفرۆشنەوە وکردوویانە بە کۆڵەگەی پشتیان.

أبو داود دەڵێ: **بە أحمد-م ووت: لەو کاتانەی کە نوێژی هەینی لەدوای جەهمیەکان دەکرد، ووتم نوێژی هەینی لەدوایان دەکرێت ؟ ووتی: من دووبارەی دەکەمەوە، تۆش هەرکاتێک نوێژت لەدوای ئەوانە کرد کە دەڵێن قورئان مەخلوقە دووبارەی بکەرەوە، ووتم: لە عەرەفەشدا دووبارەی بکەمەوە ؟ ووتی: بەڵێ. [مسائل أبي داود للإمام أحمد : 305] ت: طارق عوض الله**

عبداللطيف بن عبدالرحمن پرسیاری لێ دەکرێت دەربارەی ئەو گومانەی کە هەندێک لە مولحیدەکان دەیهێنن و دەیدەنە پاڵ ابن تیمیة کە وتوویەتی: ئیمام أحمد نوێژی لەدوای جەهمیەکان دەکرد، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: **ئەم ووتەیە گەر ڕاست بێت، ئەوا یەکێک لە شتە هەرە ڕوونەکان لەلای**

**فێرخوازانی زانست و ئەهلی ئەثەر ئەوەیە کە ئیمام أحمد و هاوشێوەکانی لە ئەهلی عیلم و حەدیث خیلافیان نیە لە تەکفیر کردنی جەهمیەکان کە ئەوان گومڕا و زندیقن، وە ئەوانەی کتێبیان نوسیوە دەربارەی عەقیدە تەکفیری جەهمیەکانیان باسکردووە لە تەواوی زانایانی ئەهلی عیلم و ئەثەر، اللالكائي ﷺ ژمارەیەک زانای ژماردووە ناتوانین باسیان بکەین لەم نامەیەدا. بەهەمان شێوە عبداللہ کوڕی ئیمام أحمد لە کتێبی السنة و الخلال لە کتێبی السنة وابن أبي مليكة لە کتێبی السنة، وە ابن خزيمة دانی ناوە بە کوفرەکەیان و لە ئیمامە گەورەکانەوە نەقلی کردووە، وە شمس الدين ابن القيم لە (الكافية الشافية) کوفری ئەوانی گێڕاوەتەوە لە 500 پێشەوای موسڵمانان و زاناکانیان، وە نوێژکردن لەدوایاندا بەتایبەتی نوێژی هەینی مانای ئەوە نیە کە تەکفیر نەکراون بەڵام دەبێت نوێژەکە دووبارە بکرێتەوە چونکە ناتوانرێ نوێژ لەدوای جگە لەوان بکرێت. وە ئەو ڕیوایەتەی کە ناسراوە لە ئیمام أحمد-ەوە ئەوەیە کە ڕێگری کردووە لە نوێژکردن لەدوایاندا، وە جیاوازی دەکرێت لە نێوان کەسێک کە ئیقامە حوججە کراوە لەگەڵ کەسێک کە نازانێت ئەم شتانە چین، ئەم ووتەیەش شیخ الإسلام مەیلی بۆ هەیە لەو بابەتانەی کە بەڵگەکانی شاراوەن لە هەندێک لە خەڵکی ...** (پاشان دەڵێ) **وە بشر المريسي وهاوشێوەکانی گومان و ووتەیان هەیە دەربارەی نەفیکردنی صیفات هاوشێوەی گومانی جەهمیە موتەئەخیرەکان، بەڵکو تەواوی ئوممەت ئیلحادیان کەمترە لە هەندێک لەم جەهمیە گومڕایانە بەڵام سەرەڕای ئەوەش زانایان یەکدەنگن لەسەر تەکفیرکردنی بشر المريسي، وە نوێژ دروست نیە لەدوای کافرێکی جەهمی یان هەرکافرێکی تر، وە ئیمام أحمد بە ڕاشکاوی باسیکردووە وەک کوڕەکەی عبداللہ و جگە لەویش لێیان نەقل کردووە کە نوێژی هەینی و نوێژەکانی تریشی دووبارە دەکردەوە.**

**[الدرر السنية : 420/10-422]**

ووتم: ووتی کە ابن تيمية جیاوازی دەکات لە نێوان ئەوەی ئیقامە حوججە کراوە و ئەوەی ئیقامە حوججە نەکراوە لە جەهمیەکان، وە ڕوونی کردەوە کە تەکفیرکردنی جەهمیەکان لەلایەن زانایانی سەلەف شتێکی زۆر ڕوونە، نەک وەک ئەوەی ابن تيمية باسی دەکات تەکفیری معین نەکراون.

**ابن تيمية دەڵێ: دوای هاتنی پێغەمبەر بە زەرورەت ئەوە دەزانین كە پێغەمبەر بە جائیزی دانەناوە بۆ ئوممەتەكەی كە هاوار لە مردوو و پێغەمبەران و پیاوچاكان و جگە لەوانیش بكەن، نە بە لەفزی استغاثة و نە بە لەفزی تر، نە بە لەفزی استعاذة و نە بە لەفزی تر، هەروەک چۆن بە جائیزی دانەناوە بۆ ئوممەتەكەی كە سوجدە بۆ مردوو بەرن یان بەرەو گۆڕی مردوو سوجدە بەرن و هاوشێوەی ئەم جۆرە كارانە، بەڵكو دەزانین پێغەمبەر نەهی لە هەموو ئەم كارانە كردووە، وە ئەم كارانە لەو شیركانەیە كە الله و پێغەمبەرەكەی حەڕامیان كردووە، بەڵام بەهۆی زاڵبوونی جەهل و كەمی زانست هەبوون بە بەڵگە شەرعیەكان لە زۆربەی موتەئەخیرینەكان نەتوانراوە تەكفیر بكرێن بەهۆی ئەم كارانەیانەوە تا بۆیان ڕوون دەكرێتەوە كە ئەوەی پێغەمبەر پێی هاتووە پێچەوانەی ئەمەیە.** [الرد على البكري : 629-630]

ووتم: بەڕوونی باسی ئەوە دەكات كە بەهۆی زاڵبوونی جەهل وكەم بوونەوەی زانست لەناو خەڵكیدا ناكرێ خەڵكی بەم كارانە تەكفیر بكرێت ئیللا دوای ئیقامە حوججە.

گەر بڵێن مەبەستی كوفری معذب-ە لێرەدا، دەڵێین باشە بۆ دەبێ ابن تيمية هەمیشە قسە لەسەر كوفری معذب بكات لە كاتێكدا زۆربەی موسڵمانان كە باسی تەكفیر دەكەن مەبەستیان زیاتر بابەتی (الأسماء)ە نەک (الأحكام) واتا كە دەپرسن فلان كافرە یان نا مەبەستیان ئەوەیە كە تەكفیری بكەن یان نا نەک مەبەستیان ئەوە بێت هێرشی بكەنە سەر و بیكوژن یان مەبەستیان ئەوە بێت لە قیامەتدا دەچێتە دۆزەخ یان تاقی دەكرێتەوە، نازانم بۆچی وای نیشان دەدەن كە ابن تيمية هەر جارێک باسی تەكفیر بكات هەمیشە مەبەستی (الأحكام) بووە لەكاتێكدا ئەوەی گرنگە و زیاتر قسەی لەسەر دەكرێت (الأسماء)ە، پاشان بۆ ڕوونی ناكاتەوە بۆ ئیللا دەبێت خۆمان هەمیشە ئەو تەئویلەی بۆ بكەین، ئاخر ئەمە بابەتێكی زۆر هەستیارە چۆن ووشەیەكی گوماناوی بەكار دەهێنێت لە بابەتێكی ئاوادا، پاشان لێی دەگەڕێ كە خوێنەر بۆخۆی تێبگات ! جارێک و دووانیش نیە دەیان جار دووبارەی دەكاتەوە، ئینجا سەیرەكە لەوە دایە گەر لە دە شوێن بڵێ تەكفیر ناكرێ بە معین ئیللا دوای ئیقامە حوججە، وە لە یەک شوێن تەكفیری معین بكات، یەک جارەكە دەكەن

بە ووتەی محكم و جارەکە دەکەن بە ووتەی متشابە !

**ابن تیمیة** دەڵێ: **لە الصحیحین هاتووە فەرموودەی ئەو پیاوەی کە بە منداڵەکانی ووت: (إذا أنا مت فاسحقوني ثم ذروني في اليم، فوالله لئن قدر الله علي ليعذبني عذابا ما عذبه أحدا من العالمين، فأمر الله البر فرد ما أخذ، وأمر البحر فرد ما أخذ منه، وقال ما حملك على ما فعلت ؟ قال خشيتك يا رب، فغفر له) جا ئەم پیاوە بڕوای وابوو گەر تەرمەکەی بسوتێنن و پاشماوەکەی فڕێدەنە ووشکانی و دەریا ئەوا الله ناتوانێ دووبارە زیندووی بکاتەوە، وە زیندووی ناکاتەوە یان ئەمەی بە جائیز زانی، جا هەردووکیان کوفرن، بەڵام جاهیل بوو حەقی بۆ ڕوون نەبوویەوە بۆیە الله لێی خۆشبوو، هەر بۆیە جەهمیەکان لە حلولیەکان و نەفیکەرانی صیفات کە نەفی ئەوەیان دەکرد الله تعالی لەسەر عەرش بێت کاتێک فیتنەکەیان سەری هەڵدا پێم دەووتن گەر من هاوڕای ئێوە بم ئەوا کافر دەبم، چونکە من دەزانم ووتەکەی ئێوە کوفرە بەڵام ئێوە لەلای من کافر نابن چونکە ئێوە جاهیلن، ئەم ووتەیەی منیش بۆ زاناکان وقازییەکان وشێخەکان وکاربەدەستەکانیان بوو.** [الرد على البكري : 383-384]

ووتم: نەفیکردنی صیفەتی علو بۆ الله تعالی کوفرێکی بەواحە و دەست بەجێ خاوەنەکەی پێی کافر دەبێت جا زانا بێت یان جاهیل، چونکە ئەمە شتێک نیە بە بەڵگە بزانرێ هەر لەفیطرەتی هەموو مرۆڤێکدا هەیە کە الله لە ئاسمانە جا کافر بێت یان موسڵمان تەنانەت ئەوانەی کە نەفی ئەم صیفەتەش دەکەن هەمیشە فیطرەتیان بەسەریاندا زاڵە کە ناوی الله دەهێنن بە پەنجە یان سەر ئاماژە بۆ ئاسمان دەکەن، تەنانەت گەر بێتو لە منداڵێکی تەمەن بچووک بپرسی الله لەکوێیە بەبێ هیچ بیرکردنەوەیەک ڕێک دەڵێ لە ئاسمانە، بۆیە بەهیچ شێوەیەک خیلاف نەبووە لە سەلەفی ئوممەت کە ئەوەی ئیثباتی صیفەتی علو نەکات بۆ الله تعالی کافرە و استتابە دەکرێ تەوبە نەکات لە ملی دەدرێت، بەڵام ابن تیمیة بابەتی عوزر هێنانەوە و ئیقامە حوججە ئەوەندە لەلای فراوانە تەنانەت نەفیکەرانی ئەم صیفەتەش دەگرێتەوە ! دەپرسم ابن تیمیة چ سەلەفێکی هەیە لەم کارەدا ؟ کام زانای سەلەف وای ووتوە ؟ پاشان خۆی باس دەکات کە ئەم ووتەیەی بۆ زاناکانی

ئەوان بووە نەک بۆ خەڵکی عەوام و جاهیل کەواتە بابەتی عوزر بە جەهل لەلای ئەو زۆر فراوانە، جا یەکێک لەوانەی کە دەیویست بەرگری لە ابن تیمیة بکات دەربارەی ئەم ووتەیەی دەیووت: ابن تیمیة ئەوانەی بە کافر زانیوە کە ئەم قسانەی لەگەڵ کردوون بەڵام ئەو وەک ئێمە حەماسی نەبووە ڕێک بڵێ ئێوە کافرن بەڵکو وتوویەتی ئێوە جاهیلن بۆیە تەکفیرتان ناکەم چونکە ئەوان زانان کەسێکیش زانا بێت زۆر بەلایەوە قورسە پێی بووترێ جاهیل ! ئەگینا ابن تیمیة ووتەیەی تری هەیە دەڵێ: حلولیەکان کافرن و ئەوەی تەکفیریشیان نەکات کافرە، منیش دەڵێم: دڵنیام ابن تیمیة لەژیاندابوایە پێی دەووتی درۆت کرد بە دەمی منەوە بۆ شتانێک بە دەمی منەوە دەڵێی کە من لێی بەریم، گریمان ئەوکات بەم شێوەیە بووە لە بەرامبەر کەسەکاندا ئەی ئەوکاتەی ئەم کتێبەی نوسیوە بۆ ڕاستیەکەی ڕوون نەکردۆتەوە بڵێ من مەبەستم ئەوە بووە کە ئاوام ووتوە ؟ خۆ ئێمە ووتەی ناو کتێبەکە دەخوێنینەوە نەک مەشهەدەکە بە چاوی خۆمان ببینین و ببیستین تا ئەم سیناریۆیە هەڵیت و پەڵیتەی بۆ دروست بکەین ! پاشان گەر واش بێت ئەوا پەڵەیەکە لەسەر ابن تیمیة چونکە ناکرێ کەسێک زانا بێت و نازناوی شیخ الإسلام بێت بە کەسانێکی کافر بڵێ ئێوە کافر نین لەلام بەڵکو جاهیلن تەنها لەپێناوی ئەوەی توڕەیان بکات و دەماریان بگرێت ! ئەم جۆرە یاریانە لە هەموو شوێنێک جێگای ببێتەوە لە دیندا جێگای نابێتەوە، سەبارەت بەوەی کە وتوویەتی حلولیەکان کافرن و ئەوەی تەکفیریشیان نەکات کافرە، بەڵێ ئەمە ڕاستە بەڵام من سەرەتای ئەم بڕگەیە ووتم من ووتانێک نەقل دەکەم لە ابن تیمیة کە دەربارەی کەس و گروپەکان و ڕووداوە زیندووەکانە نەک ووتەی گشتی ئەوەی وابڵێ کافرە و ئەوەی وابکات کافرە، ئەم ووتانە گشتین هەموو زانایەک ووتەی لەم شێوەیەی هەیە بەڵام کە هاتە سەر واقیع و جێبەجێ کردن دەردەکەوێ باوەڕی بە تەکفیری معین هەیە یان باوەڕی بە عوزر بە جەهل و ئیقامە حوججە هەیە، پاشان ووتنی (ئەوەی بڵێ قورئان مەخلوقە کافرە، وە ئەوەی تەکفیریشی نەکات کافرە) ووتەیەکی یەکجار باوە بووە لەلای سەلەف دوای ڕوودانی فیتنەی خلق القرآن بۆیە بە دەگمەن زانای ئەهلی سوننە هەیە لەو سەردەمە ژیا بێت و ئەمەی نەووتبێ کەچی سەرەڕای ناوبانگی ئەم ووتەیە ابن تیمیة دەڵێ سەلەف ئەو کەسەیان بە معین تەکفیر نەکردووە کە وتوویەتی قورئان مەخلوقە !

کەواتە کە خۆشی دەڵێ حلولیەکان کافرن و ئەوەی تەکفیریان نەکات کافرە زۆر ئاساییە بڵێ بە معین تەکفیر ناکرێن ئیللا دوای ئیقامە حوججە، بۆیە هەرگیز هەوڵی ئەوە مەدەن ووتە موجمەلەکانی بکەن بە حەکەم بەسەر ووتە موفەصەلەکانی وەک من ئاوا ڕووداوی زیندوو بهێننەوە کە حوکمی داوە لەسەرکەسەکان و گروپەکان، خۆ پێشتر هێنامان کە دەڵێ جەهمیەکان مولحیدن ووتەکەیان گەورەترین کوفرە کەچی هەر سوورە لەسەر ئەوەی کە بە معین تەکفیر ناکرێن بگرە ئەمەی داوەتە پاڵ سەلەف، جا شتێک بداتە پاڵ سەلەف چۆن پێچەوانەی ئەم شتە دەکات ؟ ئەو پێی وایە جەهمیەکان بە معین تەکفیر ناکرێن ئەمەش مەزهەبی سەلەفە لەلای ئەو، بێگومان خۆشی لەسەر ئەو مەزهەبە دەڕوات، باسکردنی ئەم فەرموودەیە کە پیاوەکە دەڵێ مردم بم سوتێنن لەگەڵ ئەم ووتانەدا کە کردوویەتی بەرامبەر جەهمیەکان خۆی لە خۆیدا بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە کە تەکفیریان ناکات، بۆیە کاتێک قسەی تەواو دەبێت لەسەر فەرموودەکە، دەڵێ: هەربۆیەش من وام بە جەهمیەکان ووت، واتا بەهۆی ئەم فەرموودەیە دەزانم تەکفیری کەسانی جاهیل ناکرێ، وە ابن تیمیة زیاترلە 10 جارلە کتێبەکانی ئەم فەرموودەیەی هێناوەتەوە وەک بەڵگە لەسەر هەبوونی عوزر بە جەهل و تەکفیر نەکردن ئیللا دوای ڕوونکردنەوە، تەنانەت لەشوێنێکدا ڕەددی ئەو زانایانەش دەداتەوە کە وتوویانە ووشەی (لئن قدر الله علي) بەمانای قودرەت نایەت بەڵکو بە مانای تەنگ کردن دێت یان بە مانای قەدەری الله وابێت کە سزام بدات دێت یان بەهەرجۆرێکی تر تەئویلیان کردبێ تا گومانی عوزربە جەهل لادەن لەسەرفەرموودەکە، کەچی ابن تیمیة ڕەددی بەڵگەکانیان دەداتەوە و ئەم ووتەیە سەردەخات کە عوزربە جەهل هەیە و فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەری، وە دەڵێ ئەوانەی کە ووشەکەیان تەئویل کردووە بە تەنگ کردن یان قەدەری الله ئەوا لە صەواب لایداوە و ڕێگای هەڵەی گرتۆتە بەر، وە تەحریفی مانای ووتەکانی کردووە.

بڕوانە [مجموع الفتاوى : 11/408-411]

کەچی دەبینین زانایانی تر هەر یەکێکیان بە جۆرێک تەئویلی دەکەن تا گومانی عوزر بە جەهل لادەن لەسەر فەرموودەکە بۆیە ووشەکە بە مانای تر لێک دەدەنەوە، یان وەک هەندێک لە نەجدییەکان دەڵێن: ئەم پیاوە لە سەردەمی فەترە ژیاوە حوکمی ئەوان جیاوازە لەسەرکەسانی تردا

قیاس ناکرێت، بەڵام ابن تیمیة چونکە عوزر بە جەهل زۆر فراوانە لەلای دەبینی چەندەها جار ئەم فەرموودەیە دەهێنێتەوە لە کتێبەکانیدا و دەیکات بە بەڵگە لەسەر عوزر بە جەهل.

**ابن تیمیة** دەربارەی ئیثبات کردن و نەفیکردنی ئەو لەفزانەی کە لە قورئان و سوننەتدا نەهاتوون وەک (متحیز) و (جهة) و (جسم) دەڵێ: **ئەوەی ئیثباتی ئەم لەفزانە دەکات دەڵێ: نەفیکردنی ئەوەی کە الله جیایە لە دروستکراوەکانی و صیفەتی علوی نیە بەسەردروستکراوەکانی شتێکی باطلە، بەڵکو ئەم کارانە پابەندی دەکات بەوەی کە پێغەمبەر بە درۆ بخرێتەوە لەو شتانەی کە ئیثباتی کردووە بۆ پەروەردگاری و لە پەروەردگاریەوە پێی ڕاگەیاندووین ئەمەش بەهەمان شێوە کوفرە، بەڵام هەر کەسێک قسەیەکی کوفر بکات مەرج نیە کافر بێت تا ئیقامە حوجەی لەسەر دەکرێت و کوفرەکەی ئیثبات دەکات، جا کاتێک ئیقامە حوجەی لەسەر کرا ئەوکات کافر دەبێت، بەڵکو نەفیکردنی ئەم شتانە پابەندی دەکات بە تەکفیرکردنی پێغەمبەر لەو شتانەی کە بۆ پەروەردگاری ئیثباتی کردووە و لە پەروەردگاریەوە پێی ڕاگەیاندووین، بەڵکو ئەم کارە نەفیکردنی الله-ی دروستکەری لێدەکەوێتەوە هەروەها پەکخستنی ئەو بە حەقیقەت، جا کاتێک نەفیکردنی ئەم شتانە کوفری لێ بکەوێتەوە بەو مانایەی کە باسمان کرد ئەوا کۆمەڵێکی زۆر لە ئەهلی ئیمان نەفی ئەم شتانەیان کردووە بەڵام لازمی مەزهەب نابێتە مەزهەب.** [مجموع الفتاوى : 306/5]

ووتم: ئەمەش ڕوونکردنەوەی ووتەی پێشوویەتی کە ئەوانەی نەفی صیفەتی علو دەکەن تەکفیریان ناکات و پێی وایە دەبێت دوای ئیقامە حوجە تەکفیر بکرێن، چونکە بە درۆخستنەوەی زیاتر لە هەزار بەڵگە لە قورئان و سوننەت هێشتا بەس نیە بۆ ابن تیمیة کە تەکفیری ئەوانە بکات کە نەفی علو دەکەن مەگەر تەنها بڵێن ئێمە ئەم بەڵگانە بە درۆ دەزانین ئەوکات دەبێ تەکفیر بکرێن! جا ئەپرسین ئیقامە حوجە لەسەر کێ دەکەیت ؟ بۆ ئەوانەی نەفی علویان کردووە بێ ئاگابوونە لە قورئان و فەرموودە و ووتەی سەلەف ؟ یان هەموویان دیوە بەڵام تەئویلی دەکەن و ڕەددی ئەهلی سوننە دەدەنەوە یان بگرە هەندێکیان ئەوانەش تەکفیر دەکەن کە ئیثباتی صیفەتی علو دەکەن بۆ الله تعالى، ئەم بیانووەشی بەیەکجاری بنەبڕ کردن کە بڵێن مەبەستی کوفری معذب-ە

نەک غیر معذب، چونکە دەڵێ: (کۆمەڵێکی زۆر لە ئەهلی ئیمان نەفی ئەم شتانەیان کردووە) کەواتە بە ئەهلی ئیمانیان دادەنێت نەک ئەهلی کوفر.

ابن تيمية دەڵێ: **أحمد تەکفیری جەهمیەکانی دەکرد ئەوانەی کە ئینکاری ناو وصیفەتەکانی الله دەکەن چونکە دژبەیەک بوونی ووتەکانیان لەگەڵ ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ پێی هاتووە ئاشکرا و ڕوونە، چونکە حەقیقەتی ووتەی جەهمیەکان پەکخستنی خالق-ە، جا أحمد بەوان تاقی کرایەوە تا حەقیقەتی ووتەکەی ئەوانی زانی کە بە دەوری پەکخستنی خالق دەخولێتەوە، وە تەکفیرکردنی جەهمیەکان بەناوبانگە لەلایەن سەلەف و پێشەوایانەوە، بەڵام أحمد بە معین تەکفیری نەکردوون.** [مجموع الفتاوى : 348/23]

ابن تيمية دەڵێ: **بەهەمان شێوە کاتێک حفص الفرد ووتی: قورئان مەخلوقە، الشافعي پێی ووت: کافر بووی بە الله-ی عظیم، بۆی ڕوون کردەوە کە ئەم ووتەیە کوفرە، بەڵام حوکمی موڕتەددی بەسەر حفص نەدا تەنها بەهۆی ئەمەوە، چونکە بەڵگەکانی بۆ ڕوون نەکردبوویەوە کە بەهۆیەوە کافر دەبێت، گەر الشافعي پێی وابوایە حفص موڕتەددە ئەوا هەوڵی کوشتنی دەدا، وە لە کتێبەکانی باسیکردووە شایەتی ئەهلی بیدعە قبوڵە و نوێژ لەدوایان دەکرێت.**
[مجموع الفتاوى : 349/23]

ووتم: زۆرێک لەوانەی کە بەرگری لە ابن تيمية دەکەن و وای نیشان دەدەن کە تەکفیری معین دەکات و باوەڕی بە عوزر بە جەهل نیە ئەم ڕووداوەی الشافعي وەک ڕەددێک بۆ مەدخەلیەکان دەهێنن و دەیکەن بە بەڵگە لەسەر هەبوونی تەکفیری معین و نەبوونی ئیقامە حوججە و عوزر بە جەهل، بەڵام ئەوەتا ابن تيمية زۆر بە ڕوونی دەڵێ الشافعي تەکفیری معین-ی نەکردووە تەنها تەکفیری مطلق-ی کردووە ئەگینا گەر بە موڕتەددی زانیبوایە هەوڵی کوشتنی دەدا، ئەمەش دیسان ئەو بیانووەتان پوچەڵ دەکاتەوە کە هەمیشە دەڵێن ابن تيمية باسی کوفری معذب دەکات نەک غیر معذب، لێرەدا بە ڕوونی باس دەکات کە الشافعي حفص-ی بە موڕتەد نەزانیوە، خۆ ئیتر ئەمە ڕوونە واتا تەکفیری معین-ی نەکردووە، بەڵام لێرەدا ئەم گومانە لادەدەین کە ابن تيمية دروستی

كردووە، سەرەتا الشافعي حاكم نيە تا مورتەد بكوژێ ئەمە كاری دەسەڵاتە نەک كاری الشافعي، بەڵام وەڵامی ئەمەش دەدەینەوە بە ڕیوایەتەكەی ابن أبي حاتم.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: في كتابي عن الربيع بن سليمان قال حضرت الشافعي أو حدثني أبو شعيب إلا أني أعلم أنه حضر عبدالله بن عبدالحكم و يوسف بن عمرو بن يزيد وحفص الفرد، وكان الشافعي يسميه حفصا المنفرد: **جا حفص پرسیاری لە عبدالله بن عبدالحكم كرد ووتی: چی دەڵێی دەربارەی قوڕئان ؟ وەڵامی نەدایەوە، پرسیاری لە یوسف بن عمرو بن یزید كرد، وەڵامی نەدایەوە، هەردووكیان ئاماژەیان بۆ الشافعي كرد، ئەویش پرسیاری لە الشافعي كرد، الشافعي بەڵگەی بۆ هێنایەوە و مونازەڕەكە درێژەی خایاند، جا الشافعي ئیقامە حوججەی لەسەر كرد بەوەی كە قوڕئان كەلامی الله-یە و مەخلوق نیە، وە حفص الفرد-ی تەكفیر كرد.**

**ابن أبي حاتم دەڵێ: الربيع ووتی: پاشان حفص-م بینی لە مەجلیسێكدا، ووتی: الشافعي ویستی بمكوژێ.** [آداب الشافعي ومناقبه : 149]

جا لێرەدا الربيع بن سليمان المرادي كە قوتابی الشافعي بووە لە ووتەكەی الشافعي تێگەیشتووە كە تەكفیری حفص-ی كردووە، تەنانەت خودی حفص تێگەیشتووە كە الشافعي تەكفیری كردووە بۆیە دەڵێ: الشافعي ویستی بمكوژێ، گەر تەكفیری نەكات چۆن هەوڵی كوشتنی دەدات ؟!

**الذهبي** دەربارەی حفص الفرد دەڵێ: **الشافعي تەكفیری كرد لە مونازەڕەكەیدا.**
[ميزان الاعتدال : 328/2]

ووتم: بەڵام ئینصاف واجبە ابن تيمية لە شوێنی تردا هەمان ڕیوایەتەكەی ابن أبي حاتم نەقل كردووە لە كتێبی (الرد على الجهمية) واتا ئاگاداری ئەوەیە كە الربيع دەڵێ: الشافعي حفص-ی تەكفیر كرد، وە ئاگاداری ئەوەشە كە حفص بە الربيع دەڵێ: الشافعي ویستی بمكوژێ وەک لە [مجموع الفتاوى : 506/12] هاتووە، جا هێنانی ئەم ڕیوایەتەیە لەگەڵ ووتنی ئەوەی الشافعي حفص-ی تەكفیر نەكردووە و ئەگینا هەوڵی كوشتنی دەدا بە هیچ شێوەیەک یەک ناگرێتەوە، یان ئەوەتا ابن تيمية سەرەڕای زانینی ئەم ڕیوایەتەش هەر سوور بووە لەسەر ئەوەی كە بڵێ الشافعي

تەكفیری حفص-ی نەكردووە، وەیان دواتر ئەم ڕیوایەتەی پێگەیشتووە و لە ووتەكەی پەشیمان بۆتەوە، جا ئێمە ئەگەری دووەم وەردەگرین تا نەڵێن بە بیانووە هەروەها گومان چاكیش واجبە، هەر چەندە لە كتێبەكەی ابن أبي حاتم ئەم دوو ڕیوایەتە بەدوای یەكتردا هاتوون بەڵام دیارە سەرەتا ابن تیمیة تەنها ڕیوایەتی یەكەمی بیستووە یان لە كتێبێكدا خوێندوویەتیەوە ئاگاداری ڕیوایەتی دووەم نەبووە ئینجا بەپێی مەزهەبەكەی خۆی لێكی داوەتەوە كە فراوانكردنی عوزر هێنانەوەیە ئەگینا ئەوەی كتێبەكە بخوێنێتەوە توشی ئەم گومانە نابێت چونكە وەك ووتمان ابن أبي حاتم هەردووك ڕیوایەتی بەدوای یەكتردا هێناوە، بەڵام گەر ابن تیمیة پێشی وابێت كە الشافعي حفص-ی تەكفیر كردووە بە معين ئەوا لەبەر ئەوەیە هەروەک پێشتر نەقلمان كرد لێی كە ووتی: ئیمام أحمد جەهمیەكانی بە معين تەكفیر نەكردووە كە دەیانووت قوڕئان مەخلوقە، گریمان گەر كەسانێكیشی بە معين تەكفیر كردبێ ئەوا لەبەر ئەوە بووە كە مەرجەكانی تەكفیری لێ هاتۆتەدی و ڕێگرییەكانی تەكفیری لەسەر نەماوە.

**ابن تيمية** دەڵێ: **تەكفیری معين-ی ئەم جاهیلانە و هاوشێوەكانیان بەو شێوەیەی كە حوكمی بەسەردا بدرێ لە كافرانە، جائیزنیە ئەنجام بدرێ ئیللا دوای ئیقامەكردنی حوججە نەبێت لەسەریان، كە ڕوون دەكرێتەوە بۆیان ئەوان موخالفی پێغەمبەرانن ئەگەرچی ووتەكە بەبێ گومان كوفر بێت، ئا بەم شێوەیە حوكم دەدەین دەربارەی تەكفیری هەموو كەسە معين-ەكان، ئەگەرچی هەندێک لەم بیدعانە توندترە لە هەندێكی تر، وە هەندێک بیدعەچی ئیمانی تێدایە كە لەوانی تردا نیە، جا بۆ كەس نیە كەسێک لە موسڵمانان تەكفیر بكات ئەگەرچی هەڵەش بكات تا ئیقامە حوججەی لەسەر دەكات و ڕێگای ڕاستی بۆ ڕوون دەكاتەوە، وە هەر كەسێک ئیمانی بە یەقینی چەسپا بێت ئیمانەكەی لەسەری لاناچێت بە گومان، بەڵكو لەسەری لاناچێت ئیللا دوای ئیقامەكردنی حوججە و لابردنی گومانەكان بۆیان.** [مجموع الفتاوى : 12/500-501]

ووتم: دیسان بیانووەكەی پوچەڵ كردنەوە كە هەمیشە دەڵێن كە ووتی تەكفیر ناكرێت باسی كوفری معذب دەكات، خۆ بە ڕوونی ووتی: (تەكفیری معين-ی ئەم جاهیلانە و هاوشێوەكانیان بەو

شێوەیەی كە حوكمی بەسەردا بدرێ لە كافرانە جائیز نیە ئەنجام بدرێ تەنها دوای ئیقامەكردنی حوججە نەبێت لەسەریان) كەواتە باسی تەكفیر دەكات نەك تەعزیب، جا لێرەدا بەوە خۆتان هەڵنەخەڵەتێنن بڵێن ئەو باسی ئەهلی بیدعە دەكات نەك ئەهلی كوفر، مەبەستی بیدعە كوفریەكانە وەك لە چەندەها شوێنی تر كوفری جەهمی و موعتەزیلە و ڕافیزە بە بیدعە ناو دەبات، بۆیە دڵنیاین مەبەستی ئەو بیدعانەیە كە كوفرن ئەگینا گەر كوفر نەبێت بۆ دەڵێ دوای ئیقامە حوججە تەكفیریان دەكەین ؟ خۆ ئەوەی بیدعەچی بێت و كوفری نەبێت دوای ئیقامە حوججەش تەكفیر ناكرێت بگرە هەرگیز تەكفیر ناكرێت.

ابن تيمية دەڵێ: **كەسی موجتەهید لە ئیمانداران لە شتێكی ئاوادا (واتا ئینكاری كردنی صیفەتی علو) گەر تەواو خۆی یەكلا كردبێتەوە بۆ گەیشتن بە حەق ئەوا الله لە هەڵەكەی خۆش دەبێت ئەگەرچی جۆرێك لە كەمتەرخەمیش تێیدا ڕوویدا بێت. ئەمە گوناهە ناكرێ بگەیەندرێ بە كوفر، ئەگەرچی دەووترێ ئەم ووتەیە كوفرە هەروەك چۆن سەلەف بە مطلق-ی وتوویانە كافرە ئەوەی هەندێك لە ووتەی جەهمیەكان بڵێت وەك ووتنی قورئان مەخلوقە یان ئینكاری كردنی بینینی الله لە قیامەت و هاوشێوەی ئەمانە كە هێشتا حوكمەكەی سووكترە لە ئینكاركردنی صیفەتی علوی الله بەسەر دروستكراوەكانیدا، وە ئینكاری كردنی ئەوەی الله لەسەر عەرشە، جا تەكفیركردنی خاوەنی ئەم ووتەیە لەلای سەلەف لە كارە هەرە ڕوونەكان بووە. جا تەكفیری مطلق وەك هەڕەشەی مطلق وایە، مەرج نیە تەكفیری كەسی معين-ی لێ بكەوێتەوە تەنها دوای ئیقامەكردنی حوججە نەبێت لەسەری كە بە موخالەفەكردنی كافر دەبێت.**

**[الإستقامة : 1/163-164]**

ووتم: دووبارە تەكفیركردنی سەلەف بۆ جەهمیەكان بە تەكفیری مطلق لەیەكدایەوە، ئینجا دوای ئەم ووتەیەی دیسان وەك هەمیشە فەرموودەی ئەو پیاوەی كە ووتی بم سوتێنن بە بەڵگە دەهێنێتەوە بۆ ووتەكەی، نەمدیوە هیچ زانایەك وەك ابن تيمية دەست بەم فەرموودەیەوە بگرێت و ئەوەندە زۆر بەڵگەی پێ بهێنێتەوە.

ابن تيمية دەربارەی چوار سەر مەزهەبەكە دەڵێ: **لە هەندێكیانەوە نەقل كراوە كە وتوویەتی ئەوەی ئاوا و ئاوا بڵێ كافرە، وە مەبەستەكەی ئەوەیە كە ئەم ووتەیە كوفرە تا خەڵكی ئاگادار بن، جا مەرج نیە هەر ووتەیەك كوفر بوو ئەوەی بیڵێت بە جەهل و تەئویلەوە كافر بێت، چونكە جێگیر بوونی كوفر دەربارەی كەسی معين وەك جێگیربوونی هەڕەشەی دۆزەخە دەربارەی، ئەمەش مەرج و ڕێگری خۆی هەیە هەروەك لە شوێنی خۆیدا بە درێژی باسمان كردووە، جا گەر كافر نەبن ئەوا مونافیقیش نین كەواتە لە ئیمانداراننن جا داوای لێخۆشبوونیان بۆ دەكرێت و ڕەحمەتیان بۆ دەنێردرێت.** [منهاج السنة النبوية : 240/5]

ووتم: هەمیشە لە هەوڵی ئەوە دایە كە ئەم مەنهەجە بداتە پاڵ سەلەف، ئەویش شوێنكەوتەی سەلەفە لەمەدا.

ابن تيمية دەڵێ: **ئەوەی بانگەواز بكات بۆ گومڕایی نەتوانرێ خراپەی بوەستێنرێ تەنها بە كوشتنی نەبێ بەهەمان شێوە دەكوژرێ، ئەگەرچی تەوبەش نیشان بدات وە ئەگەرچی حوكم نەدرێت بە كافر بوونی وەك ئیمامەكانی ڕافیزە كە خەڵكی گومڕا دەكەن، وە هەروەك چۆن موسڵمانان غيلان القدري و الجعد بن درهم وهاوشێوەكانیان كوشتن لە بانگەوازكاران، ئەم جۆرە كەسە دەججالە و دەكوژرێ، والله أعلم.** [الفتاوى الكبرى : 515/3]

ابن تيمية دەڵێ: **پرسیار لە أحمد كرا دەربارەی قەدەری، ئایا تەكفیر دەكرێت ؟ ووتی: گەر ئینكاری عیلمی الله بكات كافر دەبێت، جا لەم كاتەدا ئینكاری كەری عیلمی الله هاوشێوەی جەهمیەكانە، بەڵام كوشتنی ئەو كەسەی كە بانگەواز دەكات بۆ بیدعە ئەوا دەكوژرێ بۆ نەهێشتنی خراپەی لەسەر خەڵكی، هەروەك چۆن ڕێگر دەكوژرێ ئەگەرچی كافریش نەبێت، مەرج نیە هەر كەسێك فرمانی كوشتنی بۆ درا لەبەر مورتەد بوونەوەی بكوژرێ، جا بەپێی ئەمە كوشتنی غيلان القدري و جگە لەویش بەم شێوەیە بووە.** [مجموع الفتاوى : 23/349-350]

ووتم: ووتەی پێشووی ڕوون دەكاتەوە كە پێی وایە غيلان القدري كە كوژراوە لەبەر ئەوە نەبووە

کە موڕتەد بێت، بەڵکو بانگەوازی خەڵکی کردووە بۆ بیدعە بۆیە کوژراوە تا ئەمین بن لە خراپەی، ئەمەش حوکمدانە بە موسڵمان بوونی غیلان القدري ! کافری غیلان القدري ناسراوە لەلای زانایاندا لەیەک کاتدا نەفیکەری صیفات و مورجیئە و خەواریج و قەدەری بووە بەڵکو گروپێک لە گروپە قەدەرییەکان بەناوی ئەو کراوە کە گروپی غیلانیە، بانگەواز و مونازەڕەی دەکرد لەسەر قەدەر، هەربۆیە هەرچوار پەلی بڕدرا و لە سێدارە درا لە دمشق لەسەردەمی هشام بن عبدالملك، جا کەسێکی وەک ئەمە کە خاوەن گروپە و بانگەواز بۆ کوفر دەکات و مونازەڕە و تەحەددای لەسەر دەکات تەکفیر نەکرێت ئەی دەبێ کێ تەکفیر بکرێت ؟!

**الآجري** دەڵێ: **غیلان سوور بوو لەسەرکوفر لە قسەکردنی لەبابەتی قەدەر.**
[الشريعة : 485]

**ابن تيمية** دەڵێ: **کوشتنی کەسی بانگەوازکەر بۆ بیدعە بۆ وەستاندنی زیانەکەیەتی لەسەر خەڵکی، هەروەک کوشتنی ڕێگرەکان، وە کوشتنی غیلان القدري لەم جۆرەدا بووە.**
[مختصر الفتاوى المصرية لابن تيمية : 68]

**ابن تيمية** دەڵێ: **ئەوەی بڵێ نوێژ لەدوای ئەو کەسە جائیز نیە کە عەقیدەکەی نازانیت، ئەوا ئەم ووتەیە هیچ کەسێک نەیووتوە لە موسڵمانان، ئەهلی حەدیث و سوننە وەک الشافعي وأحمد وإسحاق و جگە لەوانیش هاوڕان لەسەرئەوەی کە نوێژی هەینی لەدوای چاک و خراپدا دەکرێت، تەنانەت زۆرێک لە ئەهلی بیدعەکان وەک جەهمیەکان کە دەڵێن قورئان مەخلوقە و الله لە ڕۆژی دواییدا نابیرێ، سەرەڕای ئەوەی أحمد بەوان تاقی کرایەوە کە ئەو ناودارترین ئیمامە لە پێشەوایەتی کردندا لە سوننەت لەگەڵ ئەوەشدا ووتەکانی أحمد خیلافی تێدا نیە کە نوێژ لەدوای جەهمی و قەدەری و ڕافیزی دەکرێ، وە هیچ کەس بۆی نیە واز لە نوێژی هەینی بهێنێت بەهۆی بیدعەیەک کە لە ئیمامدا هەیە، بەڵام خیلافیان هەیە دەربارەی ئەوەی ئایا نوێژەکە دووبارە دەکرێتەوە ؟ دوو ووتەیان هەیە، وە لە أحمد-یش دوو ڕیوایەت هاتووە، ووتراوە لە دوای ئیمامی**

**فاسق دووبارە دەکرێتەوە، وە مەزهەبی الشافعي و أبو حنيفة ئەوەیە کە دووبارە ناکرێتەوە.**
[مختصر الفتاوى المصرية لابن تيمية : 62-63]

ووتم: ئەمە بەڕوونی دەری دەخات کە ئەم گروپانە لەلای ئەو بیدعەچین کافر نین بۆیە پێی وایە نوێژکردن لەدوایاندا دروستە ئەمەش دەداتە پاڵ ئیمام أحمد، وە خیلافیش نەقل دەکات ئایا دووبارە دەکرێتەوە یان نا، ڕوونیشە لە مەزهەبی ئیمام أحمد گەر بیدعەچی بانگخواز بوو بۆ بیدعەکەی ئەوا دووبارە دەکرێتەوە، کەواتە ابن تيمية قسە لەسەر کافری ئەوان ناکات و بە کافریان نازانێت ئەگینا کوا خیلاف هەیە لەوەی کە نوێژ لەدوای کافردا ناکرێت ؟ وە ئەگەر کرا دووبارە دەکرێتەوە، ئەو خیلافی نێوان زانایان دەربارەی بیدعەچی و فاسق نەقل دەکات کە ئایا نوێژ لەدوایان دووبارە دەکرێتەوە یان نا، بۆیە باسکردنی ئەم خیلافە و تەنزیل کردنی بەسەر ئیمامی جەهمی و قەدەری و ڕافیزی ڕوونی دەکاتەوە کە ئەم گروپانە لەلای ئەو بیدعەچی و فاسقن نەوەک کافر.

هەر سەربارەت بەم ووتەیەی ابن تيمية گومانێک هەیە کە ئەوانەی تەکفیری عام دەکەن دروستیان کردووە دەربارەی دوو ڕیوایەت کە لە سفیان الثوري و أحمد هاتووە دەیکەن بە بەڵگە بۆ تەکفیری عام، لێرەدا باسی دەکەین:

*سفيان الثوري* ئامۆژگاری شعيب بن حرب دەکات ئەویش دەینوسێت، جا لە چوارچێوەی ئامۆژگارییەکانیدا هاتووە: **ئەی شعيب ئەم شتانەی کە نوسیت سودت پێ ناگەیەنن تا پێت وانەبێ نوێژ لەدوای هەموو چاک و خراپێکدا دەکرێت.**

**شعيب دەڵێ: ووتم بە سفیان: ئەی باوکی عبدالله هەموو نوێژەکان ؟ ووتی: نەخێر، بەڵام نوێژی هەینی و دوو جەژنەکە لەدوای هەرکەسێک ئەنجام بدە کە پێی دەگەیت، بەڵام نوێژەکانی تر تۆ سەرپشکی ئەنجامی مەدە تەنها لەدوای ئەو ئیمامەوە نەبێت کە سیقەت پێیەتی و دەزانی لە ئەهلی سوننە و جەماعەیە.** [شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة : 314]

ووتم: ئامۆژگارییەکەی دەربارەی ئەو وەلی ئەمرە موسڵمانانەیە کە بیدعەچی و زاڵم و فاسقن نەک

ئەوانەی کە کافرن، ئەمەش بۆیە باس دەکەم چونکە دەزانم ئەوانەی ئەم کتێبە دەخوێننەوە ئاستیان جیاوازە جا تا خوێنەرواتێنەگات نوێژی هەینی و دوو جەژنەکە لەدوای هەموو ئیمامێکدا دروستە ئەنجامی بدات ئەگەرچی کافریش بێت.

**المروزي** دەڵێ: **پرسیار لە أحمد کرا: بەڕێگادا دەڕۆم و گوێ بیستی قامەت دەبم، ئایا نوێژ بکەم ؟ أحمد ووتی: من سەرەتا شلیم دەنواند، بەڵام گەر بیدعە زۆر بوو ئەوا نوێژ مەکە تەنها لەدوای ئەوکەسە نەبێت کە دەیناسیت.** [طبقات الحنابلة : 59/1]

ووتم: ئەوانەی تەکفیری عام دەکەن ئەم دوو ڕیوایەتەیان کردووە بە بەڵگە کە گوایە تەکفیری عامیان کردووە ئەم دوو زانایە بۆیە دەڵێن نوێژ مەکە تەنها لەدوای ئەوکەسە نەبێت کە شارەزای عەقیدەکەی، ووتەکەی سفیان ڕوونە کە دەربارەی نوێژە فەرزەکانە، وە ووتەکەی أحمد-یش بەهەمان شێوە چونکە ئەم حاڵەتانە ڕۆژانە ڕوو دەدەن و ئاساییێن دەبینی بە بەردەم مزگەوتێکدا تێدەپەڕی لە بازاڕیان گەڕەکێکی تریان شارێکی تر لەوکاتەدا بانگ دەدات، بەڵام موسڵمان لەکاتی نوێژی هەینیدا لەم کۆڵان و کۆڵان ناخولێتەوە بەڵکو پێش بانگ لەوێ ئامادەیە چ جای ووتار تەواو بووبێت وکاتی قامەت بێ ئەویش خەریکی ڕۆیشتن بێ بە دەم ڕێگاوە، وە ئەگەر پرسیارەکە دەربارەی نوێژی هەینی بوایە أحمد بەم شێوەیە وەڵامی نەدەدایەوە چونکە یەک مزگەوت نوێژی هەینی تێدا دەکرێت چۆن پێی دەڵێت لەدوای ئەوە نوێژ بکە کە دەیناسیت ؟ بگرە خودی أحمد نوێژی هەینی دەکات لە دوایاندا گەرکەسی ترهەبوایە أحمد خۆی دەچوو بۆلایان، بەڵام نوێژی هەینی لە کۆندا تەنها لە یەک مزگەوتی شاردا ئەنجام دەدرا وەک ئێستا نەبوو مزگەوتی هەموو گەڕەکەکان نوێژی هەینی تێدا ئەنجام بدرێت، جا ئەوکەسەش کە نوێژی هەینی ئەنجام دەدات وەک ئیمام و خطیب یان خەلیفە بوو یان کەسانی تر بوون کە خەلیفە دەست نیشانی کردبوون لە شارەکاندا، بۆیە ئیمام و خطیب کافر بووایە یان بیدعەچی نوێژی هەینی و جەژنەکان و عەرەفەیان لەدوایدا دەکرد بەڵام بۆ کافرەکە دووبارەیان دەکردەوە بۆ بیدعەچیەکەش خیلاف هەیە ئایا دووبارە دەکرێتەوە یان نا، جا بۆیە ووتەکەی سفیان و أحمد ڕوونە کە دەربارەی پێنج فەرزەکەیە نەک نوێژی هەینی،

ئەمەشم بۆیە باسکرد چونکە ئەوانەی تەکفیری عام دەکەن دڵیان بەم دوو ڕیوایەتەی سفیان و أحمد خۆشکردووە کە ئەم دوو ڕیوایەتە هیچیان بەڵگە نین لەدژی ئێمە چونکە وەک باسمان کرد بارودۆخەکە گۆڕاوە ئێستا هەموو گەڕەگێک مزگەوتی خۆی هەیە، پاشان ئێمەش دەڵێین گەر نوێژی هەینی تەنها لەیەک مزگەوتی شاردا ئەنجام دەدرا تۆش ئەنجامی بدە گەر دەزانیت توشی کێشە دەبیت هەروەک چۆن ئیمام أحمد و زانای تریش ئەنجامیان داوە پاشان دووبارەیان کردۆتەوە چونکە ئەوکات دەسەڵات لە دەستی جەهمیەکاندا بوو کەسێک زانا بێت و نەچێتە نوێژی هەینی ئەوا دەزانرێ مەبەستی چیە بۆیە دەچوون، هەروەک پێشترین هێنامان کە أبو داود پرسیار لە أحمد دەکات دەربارەی نوێژی هەینی، دەڵێ دووبارەی دەکەمەوە، بەڵام بۆ پێنج فەرزەکە مادام مزگەوت زۆرە تا ئیمامی عەقیدە پاک هەبێت کە شارەزای عەقیدەکەی مەڕۆ بۆ مزگەوتی تر کە نازانیت ئیمامەکە عەقیدەی چۆنە، بۆ نوێژی هەینی و جەژنەکانیش هەمان شت مادام مزگەوت زۆرە کە نوێژی هەینی و جەژنیان تێدا دەکرێ بڕۆ بۆ ئەو مزگەوتەی کە ئیمامەکەی دەناسیت.

**عبدالله** دەڵێ: **بیستم باوکم** رحمه الله **دەیووت: ئەوەی وابڵێت نوێژی هەینی و نوێژی تریشی لەدوادا ناکرێت، بەڵام ئێمە واز ناهێنین لە ئەنجامدانی، جا هەرکەسێک نوێژی هەینی لەدوادا کرد دووبارەی دەکاتەوە. عبدالله دەڵێ: واتا ئەوکەسەی بڵێ قوڕئان مەخلوقە.** [السنة : 4]

**ئیمام مالک** دەڵێ: **ئەوەی بیدعەچی بێت لە وەلی ئەمرەکان نوێژی لەدوا ناکەین مەگەر لێی بترسین ئەوکات نوێژی لەدوا دەکەین.** [ابن القیم نەقلی کردووە - اجتماع الجیوش الإسلامیة : 112]

**ابن تیمیة** دەڵێ: **نوێژ لەدوای ئەوانەی کە تەکفیر دەکرێن لە ئەهلی بیدعەکان زانایان خیلافیان هەیە دەربارەی خودی نوێژی هەینی لەدوای ئەم کەسەدا، ئەوەی تەکفیری بکات دەڵێ دووبارە دەکرێتەوە، وە دەربارەی تەکفیر کردنی ئەهلی بیدعەکان خیلاف هەیە، دوو ڕیوایەت لە أحمد و جگە لەویش هاتووە، وە حەقیقەتی کارەکە بەم شێوەیە: ووتەکە کوفرە جا بە ڕەهایی دەووترێ خاوەنی ووتەکە کافرە، بەڵام کەسی معین تەکفیر ناکرێت تا ئیقامە حوججە دەکرێت.**

**خودی ووتەکە کوفرە بەڵام خاوەنی ووتەکە عوزری پێ دەدرێت، جا گەر لە ئیمانداران بێت ئەوا تەکفیر ناکرێت چونکە الله تعالی عوزری پێداوە بە چەند شتێک، یان عەقڵی درکی پێ نەکردووە یان لەلای نەچەسپاوە یان تێی نەگەیشتووە بەهۆی هەبوونی گومانێک کە دژی وەستاوە، جا هەر کەسێک مەبەستی حەق بێت و هەڵە بکات ئەوا الله لێی خۆش دەبێت، وە دابەشکردنی بابەتەکان بۆ بابەتی أصول کە بە ئینکارکردنی کافر دەبیت، وە بابەتی فروع کە بە ئینکارکردنی کافر نابیت، ئەم دابەشکردنە ئەصلی نیە نە لە هاوەڵانەوە نە لە تابعین نە لە پێشەوایەکانی ئیسلام، بەڵکو ئەم دابەشکردنە لە موعتەزیلە و هاوشێوەکانیان وەرگیراوە لە پێشەوایانی بیدعە ئەوانیش ووتەکانیان دژ بەیەکە** ... (پاشان دەڵێ) **مەبەستم ئەوەیە کە مەزهەبی پێشەوایان بەم شێوەیە کە جیاوازی بکرێت لەنێوان جۆر و کەسەکە، وە هەرکەسێک خیلافی ئەمە لە پێشەوایەکانەوە باس بکات ئەوا لە قووڵایی ووتەکانیان تێنەگەیشتووە.** [مختصر الفتاوى المصرية لابن تيمية : 67-68]

ووتم: دووبارە و دەبارەی کردەوە کە ووتەکە کوفرە بەڵام خاوەنەکەی تەکفیر ناکرێت ئیللا دوای ئیقامە حوججە، جگە لەوەش بابەتەکەی بەیەکجاری یەکلا کردەوە کە ووتی (مەزهەبی پێشەوایان بەم شێوەیە کە جیاوازی بکرێت لەنێوان جۆر و کەسەکە، وە هەر کەسێک خیلافی ئەمە لە پێشەوایەکانەوە باس بکات ئەوا لە قووڵایی ووتەکانیان تێنەگەیشتووە) کەواتە ئەمە مەزهەبی پێشەوایەکانە کە دەڵێن: جۆری ووتەکە یان جۆری کارەکە کوفرە، بەڵام خودی کەسەکە جیاوازە لەگەڵ جۆرەکە مەرج نیە کە ووتەکە یان کارەکە کوفر بوو کەسەکەش تەکفیر بکرێت، ئیتر چی هەیە لەم ووتەیە ڕوونتر کە بەڕاشکاوی دەڵێ ئەمە مەزهەبی پێشەوایانە جیاوازی کردن لەنێوان جۆر و کەسەکە، ئەوەی خیلافی ئەمەش بڵێت ئەوا لە ووتەکەی ئەوان تێنەگەیشتووە، کەواتە تۆی خوێنەر کە زۆر جار ابن تيمية بە مەعصوم سەیر دەکەیت و زۆر بەلاتەوە قورسە بڵێی نەیپێکاوە، ئەوا ابن تيمية بە تۆ دەڵێ: تۆ لە ووتەی پێشەوایەکان تێنەگەیشتووی بۆیە جیاوازی ناکەیت لەنێوان جۆری کارەکە و خاوەنی کارەکە، وەک مەدخەلیەکان بڵێ کارەکە کوفرە بەڵام خاوەنەکەی کافر نیە ئیللا دوای ئیقامە حوججە.

ابن تيمية دەڵێ: **كۆمەڵێک لە سەلەف وتوويانە: لێيان دەپرسی کێ ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە ؟ دەڵێن: الله، کەچی غەيری الله دەپەرستن، وە عيبادەتی ئەوان بۆ غەيری الله بريتيە لە هاوارکردن لێيان و کردنيان بە نێوەند و ڕێگا و شەفاعەتکار لەنێوان خۆيان و الله دا، جا هەر کەسێک ئەم ڕێگايە بگرێتە بەر ئەوا موشريکە بە قەدەر ئەو شيرکەی کە تێيدايە، وە ئەم شيرکە گەر ئيقامە حوججە کرا لەسەر مرۆڤ و هەر وازی لێی نەهێنا ئەوا کوشتنی واجبە هەروەک کوشتنی موشريکە هاوشێوەکانی، وە لە گۆڕستانی موسڵمانان نانێژرێ و نوێژی لەسەر ناکرێ، بەڵام گەر جاهيل بێت و عيلمی پێ نەگەيشتبێ و حەقيقەتی ئەو شيرکەی نەزانی بێت کە پێغەمبەر ﷺ لەسەری کوشتاری موشريکەکانی کردووە ئەوا تەکفير ناکرێت بەتايبەتی ئەم جۆرە شيرکە زۆر بووە لەنێو ئەو کەسانەی کە خۆيان داوەتە پاڵ ئيسلام، وە هەر کەسێک پێی وابێ ئەم شيرکە نزيکبوونە و گوێڕايەڵی کردنی الله-يە ئەوا ئەم کەسە گومڕايە بە يەکدەنگی موسڵمانان، وە پاش ئيقامە حوججە دەبێتە کافر.** [جامع المسائل - المجموعة الثالثة : 151]

ووتم: کە دەڵێ: گەر عيلمی پێ نەگەيشتبێ تەکفير ناکرێ ئيللا دوای ئيقامە حوججە، ڕەنگە بڵێن مەبەستی ئەو کەسانەيە کە لە شوێنی دوور لە موسڵمانان ژياون يان تازە موسڵمان بوونە نەک کەسانی تر، بەڵام دەڵێين: ناسينی الله تعالى بە تەنها و پەيدا نەکردنی شەريك بۆی و بەرائەت کردن لەو کەسانەی کە غەيری الله دەپەرستن ئەصلی دينە شتێک نيە لەهيچ بارودۆخيکدا مرۆڤ عوزری هەبێت تێيدا جا گەر تازە موسڵمان بووبێت يان لە شوێنی دوورە دەست ژيا بێت يان هەر شتێکی تر بێت بەهيچ جۆرێک عوزری نيە تێيدا، هەر بۆيە بە ئيجماعی زانايان ئەوانەی لە سەردەمی فەترەدا ژياون و هيچ پێغەمبەرێکيان پێ نەگەيشتووە گەر کوفريان تێدا هەبێت لە ئەصلی ديندا ئەوا لە دونيادا بە کافر هەژمار دەکرێن و هەمان حوکمی کافرانيان هەيە بەڵام لە قيامەتدا خيلاف هەيە ئايا تاقی دەکرێنەوە يان نا، بۆيە گەر مەبەستی ئەوانيش بێت ئەوا هەر عوزريان نيە هەر چەندە مەبەستی ئەوانيش نيە، پاشان دەڵێ: ئەوانەی خۆيان داوەتە پاڵ ئيسلام و ئەم جۆرە شيرکانەيان تێدايە زۆرن بەڵام تەکفير ناکرێن ئيللا دوای ئيقامە حوججە، کەواتە ووتەکە دەربارەی

ئەو کەسانەیە کە توشی شیرك بوونە و خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام، کەواتە باسی کەسانێک دەکات کە ژمارەیان زۆرە و بوونیان هەیە لە سەردەمی ئەودا باسی شتێکی گریمانەیی ناکات کە لە بابەتی نەزەریدا وەک گریمانە دەووترێ ئەوانەی تازە موسڵمان بوونە یان ئەوانەی پەیامیان پێ نەگەیشتووە یان دوورن لە موسڵمانان عوزریان هەیە لە بابەتە ئاشکراکاندا گەر ئینکاری واجبێک بکەن یان حەرامێک بە حەلال بزانن کە هاوشێوەی ئەوان دەکرێ نەیزانن بەهۆی تازە هاتنە ناو دین یان دووری شوێنەکەیان لە موسڵمانان، وەک ووتمان گەر مەبەستی ئەوانیش بێت لەم بابەتەدا عوزر بۆ هیچ کەسێک نیە جا لەهەر بارودۆخێکدا بێت چونکە ئەمە ئەصلی دینە، پاشان دەڵێ: ئەوەی پێی وابێت ئەم شیرکە نزیکبوونەوە و گوێڕایەڵی کردنی الله-یە ئەوا گومڕایە بە ئیجماع، وە دوای ئیقامە حوججە تەکفیر دەکرێت، واتا سەرەتا کافر نیە.

عبدالرحمن بن حسن عوزر بۆ ئەم ووتەیەی ابن تیمیة دەهێنێتەوە و دەڵێ: **ڕەحمەتی الله تعالی لێبێت باسی ئەوەی کرد کە بە معین تەکفیر ناکرێن ئیللا دوای ڕوونکردنەوە و سووربوونیان لەسەر کوفر، چونکە خۆی بە تەنها بوو بە ئوممەتێک، چونکە هەندێک زانا هەبوو تەکفیریان کرد بەهۆی نەهیکردنی لەوان لە شیرك پەیداکردن لە عیبادەتدا، جا نەیدەتوانی مامەڵەیان لەگەڵدا بکات بەو شێوەیەی کە ووتی، هەروەک هەمان شت بەسەر شێخەکەماندا هات محمد بن عبدالوهاب ڕەحمەتی الله تعالی لێبێت لە سەرەتای بانگەوازەکەیدا گەر بیستبوای هاوار لە زید بن الخطاب دەکەن، دەیووت: الله باشترە لە زید، تا ڕایان بهێنێت لەسەر نەفیکردنی شیرك بە ووتەی نەرم بۆ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی بانگەوازەکە و دوور نەکەوتنەوەی خەڵک لێی.**

[الدرر السنية : 211/2]

ووتم: تەنها من بەم شێوەیە لە ووتەکەی تێنەگەیشتووم بەڵکو ئەم زانایەش بەهەمان شێوە لێی تێگەیشتووە کە سەرەتا تەکفیری معین ناکات، وە عوزری بۆ هێنایەوە، بەڵام عوزر هێنانەوەکەی لەجێگای خۆی نیە چونکە ئاشکرا نەکردنی تەکفیر کردن جیاوازە لەگەڵ ئەوەی بڵێی تەکفیریان ناکەم چونکە جاهیلن، ئەوەی یەکەمیان شێخ محمد بن عبدالوهاب بەکاری هێناوە ئەوەی

دووەمیان ابن تيمية بەکاری هێناوە، جیاوازییەکەی نێوانیشیان ڕوونە، وە ئێمە هەرگیز لۆمەی هیچ کەسێک ناکەین پێی بڵێین بۆ بە ئاشکرا ناڵێی فلان کەس یان فلان گروپ کافرە، بەڵام ئەو کاتە لۆمەی دەکەین کە دەڵێ تەکفیریان ناکەم چونکە جاهیلن.

**ابن تيمية** دەربارەی ئەهلی بیدعە دەڵێ: **نەیانزانیوە ووتەکەیان موخالەفەی پێغەمبەرە گەر بیان زانیبوایە نەیاندەووت، جا مونافیق نین بەڵکو کەم ئیمان و بیدعەچین، الله لە هەڵەکانیان خۆشبووە و سزایان نادات لەسەری، ئەگەرچی لە پلەیان کەم کرێتەوە بەهۆی بیدعەکەیان.**

[مجموع الفتاوى : 63/13]

ووتم: بیدعە لەلای هاوەڵان و تابعین و أتباع التابعين یەکجار بە گەورەیی سەیر دەکرا بەم شێوە نیە کە ئەو باسی دەکات، ئەمەش نیشانەی نەرمیەتی لە حوکمدان و مامەڵەکردن لەگەڵ کەسەکان و گروپەکان.

**ابن تيمية** دەڵێ: **کاتێک زەمان زۆر ڕۆیشت ئەو شتانەی کە بۆ هاوەڵان ڕوون بوو بۆ زۆرێک لە خەڵکی شاراوە بوو، وە زۆربەی خەڵکی شتانێکیان لەلا وورد بوو کە لەلای هاوەڵان دیارو ئاشکرا بوو، جا لەلای موتەئەخیرین موخالەفەکردنی قورئان و سوننەت زۆر بوو کە لەلای سەلەف هاوشێوەی ئەمە نەبوو، وە ئەگەرچی لەگەڵ ئەمەشدا موجتەهید بوون و عوزریان هەیە و الله لە هەڵەکانیان خۆش دەبێت و پاداشتیان دەداتەوە لەسەر ئیجتهادەکانیان.**

[مجموع الفتاوى : 65/13]

ووتم: ئەوانەی لەدوای هاوەڵان هاتوون و موخالەفەی قورئان و سوننەتیان کردووە سەرەڕای ئەوەی کە الله لە هەڵەکانیان خۆش بووە بگرە پاداشتیش وەردەگرن لەسەری ! پێم سەیرە زۆر بەلایەوە قورسە حوکمی کوفر بدات بەسەر خەڵکانێک کە کوفریان تێدایە، بەڵام بەلایەوە ئاسانە دان بەوە بنێت کە الله لە گوناهەکانی کەسانێک خۆش بووە و پاداشتیان دەداتەوە لەسەری چونکە موجتەهید بوونە ! ئەمە لەکاتێکدا موخالەفەکانی ئەوان زۆربەی لە بابەتی عەقیدەیی بووە.

ابن تيمية دەڵێ: جەهمیەكان موخالەفەی شتێک دەكەن كە هەموو دینەكان و فیطرەتە سەلیمەكان لەسەری كۆكن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی ووتەكانیان شاراوەیە لە زۆرێک لە ئەهلی ئیمان، تەنانەت وادەزانرێ حەق بەوانە بەهۆی ئەو گومانانەی كە دەیهێنن، جا ئەم كەسانە ئیماندارن ئیمانیان بە الله و پێغەمبەرەكەی هەیە لە ناخ و ڕواڵەتدا، بەڵام شتەكانیان لێ تێكەڵ بووە و شێواوە هەروەک چۆن پۆلەكانی تری بیدعەچیەكان لێیان تێكەڵ بووە، جا ئەمانە كافر نین بە هیچ شێوەیەک بەڵكو لەوانەیە فاسق و تاوانباریان تێدا بێت، وە لەوانەیە خاوەن هەڵەیان تێدا بێت كە الله لێی خۆش دەبێت، وە لەوانەیە ئیمان و تەقوایەكی وای هەبێت كە ببێتە هۆی بوونی بە ئەولیای الله بە گوێرەی ئیمان و تەقواكەی. [مجموع الفتاوى : 355/3]

ووتم: بە جۆرێک باسیان دەكات و عوزریان بۆ دەهێنێتەوە خەریكە پیاو حەسودیان پێ ببات !

ابن تيمية دەڵێ: زانرا كە لە كەناری شام چیایەكی گەورە هەیە كە بە هەزاران ڕافیزەی تێدایە خوێنی خەڵكی دەڕێژن وماڵ وسامانیان دەبەن وخەڵكێكی زۆریان كوشتووە وماڵ وسامانیان بردوون، جا كاتێک موسڵمانان شكان لە ساڵی غازان (واتا: ساڵی 699) ڕافیزەكان ئەسپ و چەک و ئەسیرەكانیان برد فرۆشتنیان بە كافرانی نەصارا لە قوبرص، وە هەر سەربازێک بەلایاندا تێپەڕیبوایە دەیان برد، جا ئەوان زیانیان بۆ موسڵمانان زیاتر بوو لە هەموو دوژمنەكان، وە هەندێک لە ئەمیرەكانیان ئاڵای نەصاراِیان بەرزكردەوە، وە پێیان ووت: كامەی چاكترە موسڵمانان یان نەصارا ؟ ووتی: بەڵكو نەصارا چاكترن، پێیان ووت: لەگەڵ كێ حەشر دەكرێی ڕۆژی قیامەت ؟ ووتی: لەگەڵ نەصارا، وە هەندێک لە شاری موسڵمانانیان تەسلیمی نەصارا كرد، لەگەڵ ئەوەشدا كاتێک هەندێک لە وەلی ئەمرەكان ڕاوێژیان كرد دەربارەی جەنگان لەدژی ئەم ڕافیزانە من وەڵامێكی درێژم نوسی دەربارەی جەنگان لەدژیان، وە چووین بۆ ناوچەكەیان و ژمارەیەک لەوان لەگەڵم ئامادە بوون، جا مونازەرە و دانوستانی زۆر ڕوویدا لەنێوان من و ئەواندا كە باسكردنی درێژە دەكێشی، جا كاتێک موسڵمانان شاری ڕافیزەكانیان فەتح كرد و كەوتنە ژێر دەستی موسڵمانان من نەهیم كرد لە كوشتنیان و بە كەنیزەک گرتنیان، وە لە ووڵاتی موسڵمانان

**نیشتەجێمان کردن بە پەرت و بڵاوی تا کۆنەبنەوە.** [منهاج السنة النبوية : 5/158-160]

ابن تيمية دەربارەی یادکردنەوەی مەولود دەڵێ: **هەندێک خەڵک ئەنجامی دەدەن یان وەک لاسایی کردنەوەی نەصارا لە یادکردنەوەیان بۆ لەدایکبوونی عیسی ﵇ وە یان بۆ خۆشویستن و بەگەورە دانانیان بۆ پێغەمبەر ﷺ جا الله پاداشتیان دەداتەوە لەسەر ئەم خۆشویستن و ئیجتیهادە نەک لەسەر ئەو بیدعەیەی کە ڕۆژی لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ بکرێت بە جەژن.** [اقتضاء الصراط المستقيم : 2/123]

ابن تيمية دەڵێ: **زۆربەی ئەو خەڵکانەی کە دەیان بینیت سوورن لەسەر ئەنجامی ئەو بیدعانەی هاوشێوەی مەولود لەگەڵ هەبوونی نیەتی چاک و ئیجتیهاد، کە بەم دووانە هیوای پاداشت وەرگرتنیان بۆ هەیە، کەچی دەیان بینیت لاوازن لە جێبەجێ کردنی فرمانەکانی پێغەمبەر کە فرمانیان پێکراوە چالاک بن تێیدا، ئەمانە وەک ئەوکەسە وان کە قورئان دەڕازێنێتەوە کەچی نایخوێنێتەوە یان دەیخوێنێتەوە و شوێنی ناکەوێت، یان وەک ئەو کەسە وان کە مزگەوت دەڕازێنێتەوە و نوێژی تێدا ناکات یان کەم نوێژی تێدا دەکات.** [اقتضاء الصراط المستقيم : 2/124]

ابن تيمية دەڵێ: **گەورە ڕاگرتنی یادی مەولود و کردنی بەشتێکی ساڵانە هەندێک خەڵک ئەنجامی دەدەن و لەوانەیە پاداشتی گەورەی بۆ هەبێت لەم کارەدا بەهۆی نیەتە چاکەکەی و بە گەورە دانانی پێغەمبەری الله ﷺ هەروەک پێشتر بۆم باس کردیت هەندێک کار هەیە جوانە لە هەندێک خەڵکی و ناشرینە بۆ ئیمانداری خاوەن صەواب.** [اقتضاء الصراط المستقيم : 2/126]

ووتم: گومانمان لەوە نیە کە ابن تيمية مەولود بە بیدعە دەزانێت و دژیەتی هەروەک لێرە و لەشوێنی تریش باسی کردووە، بەڵام دەڵێ ئەوانەی ئەنجامی دەدەن بەهۆی نیەتە چاکەکەیان و ئیجتیهادیان پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە ! ئەمە هەڵگەڕاندنەوەی بابەتەکەیە بەسەراو ژووردا، جا کێ هەیە بڵێ والله من بۆ دژایەتی الله وپێغەمبەرەکەی ودینی ئیسلام و موسڵمانان مەولود دەکەم ؟ یان چونکە دەزانم بیدعەیە بۆیە لە ڕقی سوننەت ئەنجامی دەدەم، ئەم هەموو خەڵکەی کە ئەنجامی دەدەن

کەسانی جاهیلن بە دین هەموویان بە کارێکی چاکی دەزانن و لە خۆشەویستیان بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەنجامی دەدەن، کەواتە دەبێت بەو خەڵکە بڵێین کارەکەت بیدعەیە بەڵام لەوانەیە پاداشتی گەورەت بۆ بنوسرێ بەهۆی نیەتەکەت چونکە نیەتەکەت خۆشەویستی پێغەمبەر بووە ! جا ئەم قسەیە بە خەڵک بڵێین کەس واز لە مەولود ناهێنێت، خۆ هەمیشە دەبیستین دەڵێن تەنها لە خۆشەویستیمان بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەنجامی دەدەین، جا قسەکەشیان ڕاستە تەنانەت گەر مورتەددیش بن، چونکە ئەوکاتەی کە خۆشم مورتەد بووم کەیف خۆش دەبووم بە هاتنی مەولود واللە جگە لە خۆشویستی پێغەمبەر ﷺ هیچ شتێکی تر پاڵنەر نەبووە، ئەگەرچی لەم کاتەدا شەیتان بەم جۆرە کارانەوە سەرقاڵت دەکات تا وا هەست بکەی زۆر موسڵمان و ئیمانداری تا بیرت بۆ تەوحید نەچێت بەڵام ئەصلی بابەتەکە خۆشویستنەکەیە وات لێدەکات دڵخۆش بیت بە هاتنی ئەم ڕۆژە، جا مەبەستم لە هێنانی ئەم ووتانەی ابن تیمیة دەرخستنی نەرمی و شلی ابن تیمیة-یە لە بابەتەکانی تەکفیر و تەبدیع، بگرە دڵخۆشکردنی بیدعەچیەکانە بە پاداشت !

**ابن تیمیة دەڵێ: هیچ گروپێک نیە وەک ڕافیزە ڕاستی بە درۆ بزانن و باوەڕ بە درۆ بکەن، سەرانی مەزهەبەکەیان و پێشەواکانیان کە دایانهێناوە و دایانمەزراندووە مونافیق و زندیق بوونە، هەروەک چۆن لە زیاتر زانایەکەوە ئەم شتە باسکراوە، ئەمەش شتێکی ڕوونە بۆ ئەو کەسەی کە لێی بڕوانێ، بە پێچەوانەی عەقیدەی خەواریج کە بەهۆی جەهل بوون بوو لە تێگەیشتنی قورئان و زیادەڕەوی کردن لە گەورە دانانی تاوانەکان، بەهەمان شێوە عەقیدەی ئەوانەی تەنها ئایەتەکانی هەڕەشە وەردەگرن (الوعيدية) و قەدەرییەکان هەڵەکەیان لە زیادەڕەوی کردن بوو لە گەورە دانانی تاوانەکان، بەهەمان شێوە عەقیدەی مورجیئە ئەصلی مەبەستەکەیان نەفیکردنی تەکفیر بوو دەربارەی ئەو کەسەی کە باوەڕی بە پێغەمبەران هەیە، هەر بۆیە سەرانی ئەم مەزهەبانە کە دایانهێناوە هیچ کەس نەیووتوە ئەوان زندیق و مونافیقن، بەپێچەوانەی ڕافیزە سەرانی ئەوان زندیق و مونافیق بوون، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرێک لە ڕافیزەکان مونافیق نین و کافریش نین، بەڵکو هەندێکیان ئیمان و کردەوەی چاکی هەیە، وە هەیانە هەڵەیە اللە لە هەڵەکانی خۆش دەبێت، وە**

**هەیانە خاوەنی تاوانە هیوای لێخۆشبوونی الله-ی بۆ دەخوازرێ، بەڵام جەهل هەبوون بە ماناكانی قورئان و فەرموودە هەموویان دەگرێتەوە، هیچ كەسێكیان تێدا نیە ئیمامێك بێت لە ئیمامەكانی موسڵمانان لە عیلم و دیندا.** [منهاج السنة النبوية : 6/302-303]

ووتم: دامەزرێنەر و پێشەوا و سەركردەكانیان بە مونافیق و زندیق دەزانێت بەڵام زۆربەی خەڵكەكانیان بە موسڵمان دەزانێت، ئەوەی كە تەكفیریان دەكات غولاتی ڕافیزەیە وەك ئیسماعیلیەكان و نوصەیریەكان، ئەگینا ڕافیزەی ئیمامی بە معین تەكفیر ناكات.

ابن تيمية دەڵێ: **ڕافیزەی ئیمامی شوێنكەوتەی مورتەددەكان و نۆكەری مولحیدەكان و میراتگری مونافیقەكانن، خودی خۆیان مورتەد و مولحید نین.** [منهاج السنة النبوية : 7/220]

ابن تيمية دەڵێ: **فەیلەسوفەكان و باطنیەكان كافرن كوفرەكەیان ئاشكرایە لەلای موسڵمانان هەروەك الغزالي و جگە لەویش باسیان كردووە، وە كوفرەكەیان ئاشكرایە بۆ هەر كەسێك لە موسڵمانان كە كەمترین عیلم و ئیمانی هەبێت گەر حەقیقەتی ووتەكانیان بزانن، بەڵام كوفرەكەیان نازانێت ئەو كەسەی كە حەقیقەتی ووتەكانیان نازانێت، وە لەوانەیە هەندێك لەوانەی كە نازانن ئەمە كوفرە دەستیان گرتبێ بە هەندێك لە ووتەكانیان جا عوزری پێ دەدرێت بەهۆی جەهلەكەیەوە.** [شرح العقيدة الأصفهانية : 211]

ابن تيمية دەڵێ: **هەر بۆیە بە زانا گەورەكانیانم دەووت: گەر هاوڕای ئێوە بم لەو قسانەی كە دەیكەن ئەوا دەبم بە كافرێك كە خۆم دەمەوێت چونكە دەزانم ئەم ووتەیەی ئێوە كوفرێكی ڕوونە، بەڵام ئێوە تەكفیر ناكرێن بەهۆی جاهیل بوونتان بە حەقیقەتەكانی دین، هەر بۆیە سەلەف و پێشەواكان تەكفیری جەهمیەكانیان دەكرد بە مطلق و عام، بەڵام كەسی معین لە جەهمیەكان سەلەف دوعایان بۆ دەكردن و داوای لێخۆشبوونیان بۆ دەكردن چونكە زانا نەبوون بە ڕێگای ڕاست.** [بيان تلبيس الجهمية : 1/10]

ووتم: لێرەدا بە ڕوونی دەری دەخات كە تەكفیری معین-ی ئەوانی نەكردووە ئەگەرچی ووتەكەشی

بە كوفر زانیون بگرە ئەمە دەداتە پاڵ سەلەف هەربۆیە بەڵگە بەوە دەهێنێتەوە كە گوایە سەلەف وەک ئەو تەكفیری مطلق-یان كردووە نەک معین، جا گەر ئەم ووتەیەی بۆ زانا گەورەكانیان بێت ئەی دەبێت چی بە كەسە عەوامەكانیان بڵێت كاتێک كوفر دەكەن ؟! ووتەكەی وەڵامێكیش بوو بۆ ئەو كەسەی كە دەڵێ گوایە تەنها بۆ دەمار گرتنیان ئەم قسەیەی كردووە چونكە زانا تووڕە دەبێت پێی بووترێ جاهیل بۆیە ابن تیمیة نەیووتوە تەكفیرت دەكەم ئەگەرچی لە ناخەوە تەكفیری كردووە بەڵام ویستویەتی تووڕەی بكات !!!

**ابن تیمیة** دەڵێ: **ناوی موشریك چەسپاوە پێشهاتنی وەحی، چونكە كەسەكە شیركی بۆ الله بڕیار داوە و شتی تری یەكسان كردووە بە الله، وە لەگەڵ الله دا خوای تر دەپەرستێ و هاوتای بۆ داناوە پێشهاتنی پێغەمبەر.** [مجموع الفتاوى : 38/20]

ووتم: ئەمە یەكێكە لەو ووتانەی كە دەیكەن بە بەڵگە لەسەر ئەوەی ابن تیمیة باوەڕی بە عوزر بە جەهل نیە و تەكفیری معین دەكات و هەر كاتێک باسی ئیقامە حوججە بكات مەبەستی كوفری معذب-ە ئیتر دەیانەوێت تەنها بەم ووتەیەی تەواوی ووتەكانی پێشووی سفر بكەنەوە، ئیتر دەڵێن تەواو ووتی ناوی موشریك پێشهاتنی وەحیش دەچەسپێ، كەواتە ئەوەی شیرك بكات ابن تیمیة پێشهاتنی وەحیش بە موشریكی دەزانێت ئەی چۆن دوای هاتنی وەحی بە موشریكی نازانێت ؟ كەواتە لەهەر شوێنێک بڵێ تەكفیر ناكرێت ئیللا دوای ئیقامە حوججە ئەوا مەبەستی سزادانە نەک تەكفیر، هەروەک وتوویەتی: كوفری معذب نابێت ئیللا دوای پێگەیشتنی وەحی. [مجموع الفتاوى : 78/2]
كەواتە ئەم دوو ووتەیەی ڕوونی دەكاتەوە ابن تیمیة پێش ئیقامە حوججەش كەسەكە تەكفیر دەكات بەڵام بۆ سزادانی لەسەر ئیقامە حوججە وەستاوە !
لە وەڵامدا دەڵێین نەخێر وانیە، گەر بێتو پێش و پاشی ووتەكەی سەیر بكەین دەزانین ابن تیمیة مەبەستی چیە، ابن تیمیة بەم شێوازە نوسینە بەناوبانگە كە ڕستەیەک لە كتێبەكەی دەخوێنیتەوە جاری واهەیە دەبێت 10 لاپەرەی پێشووی بخوێنیتەوە تا تێبگەی مەبەستی چیە ئەگینا تەنها سیاقەكە وەرگریت بەبێ خوێندنەوەی سابق و لاحق ئەوا بە هەڵە تێدەگەیت و دەبێتە هۆی ئەوەی

زوڵمی لێ بكەیت هەندێكجار، وە یان بەرگری لێبكەیت بەناحەق هەندێكجار، گەر بێتو لاپەرەیەكی پێشووی ئەم دوو ووتەیە بخوێننەوە دەزانن باسی چی دەكات، ابن تیمیة كە دەڵێ ناوی موشریك دەچەسپێ پێشهاتنی وەحی مەبەستی ئەو قەومانەیە كە پێشهاتنی پێغەمبەرەكان بۆیان لەسەر كوفر و شیرك بوونە هەروەك نموونە بە قەومی فیرعەون دەهێنێتەوە كە الله تعالى پێش ناردنی موسى عليه السلام بۆیان هەر بە كافر ناوی بردوون، ئەم ووتەیەی ابن تیمیة-ش شتێكە كە ئیجماعی زانایانی لەسەرە بەبێ خیلاف تەنانەت مەدخەلیەكانیش خیلافیان لەوەدا نیە كە ئەو قەومانەی لەسەر كوفرن باوەڕیان بە الله نیە یان شەریكیان بۆی بڕیار داوە پێشهاتنی پێغەمبەرەكان بۆیان هەر بە كافر حیسابن و ناوی موشریك لەسەریاندا دەچەسپێ هەروەك چۆن كافرانی قوڕەیش پێشهاتنی وەحی هەر بە كافر حیساب كراون و ناوی موشریكیان لێ نراوە، جا ئەمە شتێك نیە بكرێت بە بەڵگە و مەنهەجی ابن تیمیة-ی پێ ڕوون بكرێتەوە بەڵكو ئەو باسی شتێك دەكات كە خیلافی تێدا نیە لەلای زانایان، سەبارەت بەوەش كە دەڵێ كوفری معذب نابێت ئیللا دوای ئیقامە حوججە ئەمەش ووتەیەك نیە كە تەنها ابن تیمیة خاوەنی بێت بەڵكو دەزانین پێغەمبەر ﷺ هێرشی نەدەكردە سەر هیچ قەومێك تا بانگەوازەكەی پێ ڕانەگەیاندبوان، وە ابن تیمیة مەبەستی ئەوەشە كە لە قیامەت سزا نادرێن تا ئیقامە حوججە نەكرێن بۆیە بەڵگە بە ئایەتی ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾ واتا: ئێمە سزایان نادەین تا پێغەمبەریان بۆ ڕەوانە نەكەین، جا ئایا ئایەتەكە مەبەستی سزای دونیاییە یان قیامەت ئەم باسە خیلافیە كە ئێرە شوێنی نیە، بەڵام بۆ سزای كوشتار (قتال) ڕوونە كە پێغەمبەر ﷺ هێرشی نەدەكرد سەر قەومە كافرەكان تا پەیامی ئیسلامی پێ ڕانەگەیاندبوان جا قبوڵیان بوایە دەبوونە موسڵمان قبوڵیان نەبوایە كوشتاری لەگەڵ دەكردن، جا ناكرێت لەبەر ئەوەی ابن تیمیة وتوویەتی كوشتار دوای ئیقامە حوججە دەكرێت ئەوا بڵێین لەهەر شوێنێك باسی ئیقامە حوججە بكات مەبەستی كوشتار بووە نەك تەكفیر، چونكە هەموو زانایان یەكدەنگن لەسەر ئەم شتە جا بەم پێیە بێت هیچ زانایەك باوەڕی بە عوزر بە جەهل نیە وەك ووتمان مەدخەلیەكانیش ئەوە دەزانن كە كوشتار دوای ئیقامە حوججە دەكرێت، بەڵام بووترێ ابن تیمیة لەهەر شوێنێك ووتی ئیقامە حوججە مەبەستی كوشتارە لەكاتێكدا ئەو بەڕوونی دەڵێ (تەكفیر

ناکرێت) ئەمە زیادەڕەوی کردنە لە بەرگری کردن و تەئویل هێنانەوە بۆ زانایان، وە ئەم ووتانەش مانای ئەوە نیە کە ابن تیمیة کەس تەکفیر ناکات دەزانین نوێژ نەکەر تەکفیر دەکات دەزانین الرازي تەکفیر کرد کاتێک کتێبی نوسی دەربارەی پەرستنی ئەستێرە دەزانین کاتێک دوو نێردراوەکەی پاشا لە بەندیخانە زۆر توڕەی دەکەن و داواکارییەکەی بەجێ ناگەیەنن پێیان دەڵێ زندیقینە مورتەدینە دین گۆڕینە، بەڵام نە تەکفیر کردنی کەسێک بە معین مانای ئەوە دەدات کە ئەم کەسە باوەڕی بە عوزر بە جەهل نیە، وە نە تەکفیر نەکردنی کەسێک بە معین مانای ئەوە دەدات ئەم کەسە باوەڕی بە عوزر بە جەهل هەیە، بەڵکو لە ووتە و کردارە گشتی و هەمیشەییەکانی دەردەکەوێت وەک لەم هەموو بەڵگەیەدا دەردەکەوت، ئەگینا ابن تیمیة و هیچ زانایەکی تر مەنهەجەکەی دیراسە ناکرێت لەسەر بنەمای یەک ڕووداوی تایبەت و دیاریکراو.

**ابن تیمیة** دەڵێ: **بە شێوەیەکی گشتی هەر کەسێک قسەیەک یان کارێکی کوفر بکات ئەوا بەمە کافر دەبێت ئەگەرچی مەبەستیشی نەبێت کافر بێت، چونکە کەس نایەوێت کافر بێت ئیللا ما شاء الله.** [الصارم المسلول : 339/2]

ووتم: ئەمەش ووتەیەک نیە ببێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە تەکفیری معین دەکات باوەڕی بە تەکفیری مطلق نیە، چونکە بە دەیان ووتەی هەیە کە دەڵێ ئەوەی ئاوا بکات کافرە بەڵام تەکفیری مطلق ئەگینا کە دێتە سەر کەسی معین مەنهەجی ڕوونە کە چۆنە، خۆشی یەکێک بووە لەوانەی زۆر تەئکیدی لەسەر ئەم باسە کردۆتەوە کە دەڵێ: سەلەف ووتیان ئەوەی وابکات کافرە گوێگر وادەزانێت ئەوەی کارەکە بکات کافرە، نازانێت کە ئەمە تەکفیری مطلق-ە بۆ کەسی معین نابێت ئیللا دوای هاتنەدی مەرجەکانی تەکفیر و نەمانی ڕێگریەکانی، پاشان ئەو ووتەیەی کاتێک ووتوە کە ڕەددی جەهمیەکان دەداتەوە کە دەڵێن دەبێت کەسەکە لەناخەوە مەبەستی کوفر کردنی هەبێت ئینجا کافر دەبێت، ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی داونەتەوە، وە دوای ئەم هەموو ووتەیەی کە پێشتر هێنامان کە زۆر بە ڕوونی لە چەندین شوێن تەئکید لەسەر ئەوە دەکاتەوە تەکفیری معین نابێ بکرێت ئیللا دوای ئیقامە حوججە، دەڵێین کارەکە کوفرە ووتەکە کوفرە بەڵام ناڵێین خاوەنەکەی

کافرە ئیللا دوای ئیقامە حوججە، ناتوانم دوای ئەم هەموو ووتانە بڵێم ابن تيمية باوەڕی بە عوزر بە جەهل نەبووە و جەهل و تەئویلی نەکردۆتە ڕێگری تەکفیر، چونکە گەر باسی مەنهەجی جەمع کردنی ووتە بکرێت ئەوا فەرموون جەمعی بکەن بزانن کامەی زاڵترە لایەنی تەکفیری معین یان تەکفیری مطلق، گەر باسی مەنهەجی وەرگرتنی ووتەی محکم و لێکدانەوەی ووتەی متشابە بە محکم دەکەن فەرموون بزانن لەکۆی قسەکانی دەردەکەوێت کە کامەی محکم بووە و کامەی متشابە بووە، گەر باسی زۆری و بۆری بکرێت دیارە لەکام لایەن ووتەی زۆرترە، وە گریمان بڵێین لێرەدا تەکفیری معین دەکات، ئەوا سەردەمی نوسینی ئەم کتێبە دیارە کە لە مانگی رجب-ی ساڵی 693 نوسیویەتی واتا 35 ساڵ پێش مردنی، ئەم ماوەیەش زۆرە بۆ گۆڕانکاری هەروەک الذهبي باسیکرد کە پێش مردنی وتوویەتی: کەس تەکفیر ناکەم لەم ئوممەتەدا مادام بەردەوام بن لەسەر نوێژ کردن، چونکە لە فەرموودەدا هاتووە تەنها ئیماندار پارێزگاری لە دەست نوێژ دەکات.

جا دوای هەموو ئەم بەڵگانە کە شلی ابن تيمية دەردەخات لە بابەتی تەکفیردا چاوەڕێی ئەوەی لێدەکەیت أبو حنيفة تەکفیر بکات ؟ ئەو جەهمی و ڕافیزە بە معین تەکفیر ناکات چ جای کەسێک کە خاوەن مەزهەبێکی فیقهیە کراوە بە یەکێک لە پێشەواکانی ئەهلی سوننە، جا ابن تيمية گەر لە تەکفیری جەهمی و موعتەزیلە و ڕافیزە و ئەشعەری لە مەنهەجی سەلەف لای دابێت و کۆمەڵێک عوزریان بۆ بهێنێتەوە ئیتر ئەمە خەیاڵ بڵاوییە چاوەڕێی ئەوە بکەیت تەکفیری أبو حنيفة بکات بەڵکو خەیاڵە گەر چاوەڕێی ئەوە بکەیت کە بە ڕاشکاوی تەبدیعی بکات یان دژی بوەستێ، جا تۆ یان دەبێت بڵێی لەمانەش هەر شوێنی دەکەوم وەک ئەو تەکفیری معین ناکەم ئیللا دوای ئیقامە حوججە یان دەبێت بڵێی بۆم دەرکەوت کە لە بابەتی تەکفیردا نەپێکاوە و بازنەی عوزر هێنانەوەی زۆر فراوانە، جا کاتێک دانت بەم ڕاستیە دانا ئەوا هیچ پێت سەیر نابێت کە بۆچی ابن تيمية تەکفیری أبو حنيفة ناکات یان تەبدیعی ناکات و دژی نەوەستاوە و بە ئیمام وەسفی دەکات، جا هەندێک کەس لە خەمخۆریيان بۆ زانایان هەمیشە هەوڵی عوزر هێنانەوە و تەئویل کردن دەدەن بۆیان تەنانەت دەیگەیەنن بە تەئویلی باطل و پێیان ئەستەمە بڵێن نەیپێکا، بۆ نموونە

ابن تيمية لە دەيان شوێن دەڵێ: تەكفير ناكرێت بە معين ئيللا دواى ئيقامە حوججە كەچى لە شوێنێک بڵێ فلان كافرە ئيتر دەڵێن: تەواو تەكفيرى معين-ى كرد كەواتە ووتەكانى پێشووى هەمووى مەتەڵ بوو بەم تەكفير كردنە مەتەڵەكە ئاشكرا بوو ! والله دەزانم لە خۆشەويستيتانە بۆ هەر زانايەک كە بەرگرى لێدەكەن بەڵام ئەمەش ماناى ئەوە نيە ڕەش بكەين بە سپى و سپيش بكەين بە ڕەش تەنها لەپێناوى ئەوەى نەڵێن فلان زانا نەيپێكا، منيش يەكێک بووم سەرەتا لەوانەى كە هەميشە ووتە زۆر و ديارەكانى بە ووتە كەم و دەگمەنەكانى شەرح دەكرد، ووتە موحكەمەكانى واز لێدەهێنا و ووتە متشابهەكانيم دەكرد بە بەڵگە لەمەشدا كاريگەر بووم بە نەجدييەكان، تەنها بۆ ئەوەى واى نيشان بدەم ابن تيمية لە بابەتى تەكفيردا لەسەر مەنهەجى سەلەفە و هيچ لاى نەداوە، بەڵام چيتر بەدواوە ناتوانم خۆم هەڵخەڵەتێنم و ئێستا دڵنيام لەوەى كە ابن تيمية عوزر بە جەهل لەلاى زۆر فراوانە و زۆر بە زەحمەت بە كۆمەڵێک قەيد و شەرتى توند كەسى معين تەكفير دەكات، هەر بۆيەش تەكفيرەكانى سەلەفى بە تەكفيرى مطلق ناو بردووە نەک معين وەک بينيتان، زۆربەى ووتەكان بابەتى زيندوون يان ووتەى ڕاشكاون و تەفصيلى پێداون و موجمەل نين، ناكرێ ئەم هەموو ووتەيە بەوە ڕەت بكرێتەوە كە لە شوێنێكدا كەسێكى تەكفير كردووە يان وتوويەتى ئەوەى وابكات كافرە و ئەوەى وابڵێت كافرە چونكە ئەمانە هەموو ووتەى گشتين كە دێتە سەر واقع هەموو بە مطلق حيسابە لەلاى ئەو وەک ڕوونمان كردەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ماناى ئەوە نيە كە ابن تيمية تەكفيرى معين هەرگيز ناكات، بۆيە لەشوێنێک ڕافيزەيەک يان جەهميەک يان ئەشعەرييەک تەكفير دەكات ناكرێ تۆ ئەمە بكەيت بە بەڵگەى بنبڕكەر وتەواوى ووتەكانى ترى ڕەت بكەيتەوە، خۆ ابن تيمية ووتى أحمد تەكفيرى جەهميەكان ناكات بە معين، گەر كەسێكيشى تەكفير كردبێ لێيان ئەوا مەرجەكانى تەكفيرى لێ هاتۆتەدى و ڕێگرييەكانى تەكفيرى لەسەر لاچووە بۆيە تەكفيرى كردووە، بەهەمان شێوەش ابن تيمية گەر كەسێكى تەكفير كردبێ بە معين ئەوا ئەو مەرجانەى كە دايناوە بۆ تەكفير لێى هاتۆتەدى و ئەو ڕێگريانەى كە دايناوە لەسەرى لاچووە بۆيە تەكفيرى كردووە، جا بەڕاستى من پێم سەيرە هەندێک برا هەموو ئەم ووتانەى ڕەت دەكەنەوە كە هەميشە دووبارەيان دەكاتەوە و تەئكيديان لەسەر دەكاتەوە كە تەكفيرى معين ناكرێت ئيللا دواى

ئیقامە حوججە، بە بیانووی ئەوەی لە شوێنێکدا ڕافیزەیەک یان جەهمیەکی تەکفیر کردووە ئیتر دەڵێن تەواو مادام فلانی تەکفیر کرد کەواتە باوەڕی بە عوزر بە جەهل نەبووە و تەکفیری معین-ی کردووە !

لەکوێی ووتەکانی ابن تیمیة وەڵامی ئەو عوزرەی نەجدییەکانمان بۆ دەرکەوت کە هەمیشە ابن تیمیة دەیهێننەوە و دەڵێن ابن تیمیة تەنها لە بابەتە خەفیەکان دوای ئیقامە حوججە تەکفیری معین دەکات، خۆ بینیمان کۆمەڵێک بابەتی باسکرد بە هیچ شێوەیەک نابن بە بابەتی خەفی، تەنانەت شیرکی گۆڕ پەرستانیشی باسکرد کە ئەمەیان ئەصلی شیرکی زۆرینەی قەومەکان بووە و پێغەمبەرانی بۆ نێردراوە.

## گومانی تەكفیر نەكردنی خەلیفە جەهمیەكان لەلایەن ئیمام أحمد و دەست گرتنی ابن تیمیة پێیەوە:

ابن تیمیة یەكەمین كەسە كە گومانی دروستكردووە دەربارەی ئەوەی كە ئیمام أحمد خەلیفە جەهمیەكانی تەكفیر نەكردووە كاتێک كە وتوویانە قورئان مەخلوقە و خەڵكیان بانگ كردووە بۆ ووتنی ئەم كوفرە و پەرەیان پێداوە و خەڵكیان لەسەر كوشتووە و بەند كردووە و سزاداوە، ابن تیمیة ئەم گومانەی كردۆتە ئەصل و لەسەری ڕۆیشتووە بۆیە نابینیت جەهمیەكان تەكفیر بكات ئیللا بە مطلق نەبێت، وە ئەگەر تەكفیری معین بكات بێگومان ئیللا دوای ئیقامە حوججە دەیكات، جا زۆرێک لە مەدخەلیەكان بە توندی دەستیان بەم گومانەی ابن تیمیة گرتووە، كە تۆ پێی دەڵێی: فلان سەرۆک ووڵات كافرە ئەوەتا كوفرەكانی، پێت دەڵێ: المأمون كوفری هەبوو ئیمام أحمد بۆ تەكفیری نەكرد ؟ جا لەوەش سەیرتر هەندێک موسڵمان لێرە و لەوێ دەڵێن: والله پیاو ڕاست بڵێ هیچ دەقێكی ئیمام أحمد نیە بە ڕوونی بڵێ المأمون كافرە، یان موسڵمانی وا هەیە دەڕوات تەئویل بۆ باسەكە دەكات و دەڵێ ئەمە باسێكی تایبەتە ناكرێ قیاس بكرێتەوە سەر جەهمیەكانی تر، هی واش هەیە وەک نیفاق بەكاری دەهێنێت لەلای خەواریجەكان دەڵێ ئیمام أحمد المأمون-ی تەكفیر نەكرد دەی گەر ئازان فەرموون ئیمام أحمد تەكفیر بكەن، لەلای مەدخەلیەكانیش دەڵێ ئیمام أحمد المأمون-ی تەكفیر كردووە و ڕەددی گومانەكانیان دەداتەوە ! والله المستعان.

لە وەڵامی ئەم گومانەدا كە ابن تیمیة دروستی كردووە و بۆتە كۆڵەگەی پشتی مەدخەلیەكان، سەرەتا دەڵێین: الجعد بن درهم كە دامەزرێنەری عەقیدەی جەهمیە ساڵی 105 كوژراوە، الجهم بن صفوان كە عەقیدەی جەهمی لە الجعد وەرگرتووە و عەقیدەكە بەناوی خۆی بڵاو بۆتەوە ساڵی 128 كوژراوە، ئیمام أحمد ساڵی 164 لەدایكبووە كەواتە نیو سەدە پێش لە دایكبوونی ئیمام أحمد عەقیدەی جەهمی هەبووە و زانایان تەكفیریان كردوون، بۆیە تەكفیر كردنی جەهمیەكان شتێک نیە لە سەر ئیمام أحمد وەستابێ، تا كاتی لە دایكبوون و پێگەیشتنی ئەو كەس قسەی لەم بابەتە نەكردبێ ئینجا دوای نیو سەدە بەهۆی ئیمام أحمد-ەوە بزانین جەهمیەكان كافرن یان نا ؟ وە ئایا

بە معين تەكفير دەكرێن يان بە مطلق ؟ ابن تيمية لێرەدا كەوتۆتە هەڵەوە كە تەكفيركردنی جەهميەكانی پەيوەست كردووە بە هەڵوێستی ئيمام أحمد بەرامبەر المأمون والمعتصم والواثق، ابن تيمية بەپێی تێگەيشتنی خۆی بۆ ڕووداوەكان گەيشتووە بەو ئەنجامەی كە ئيمام أحمد ئەم سێ خەليفەيەی بە معين تەكفير نەكردووە كەواتە هيچ جەهميەك بە معين تەكفير ناكرێت ئيللا دوای ئيقامە حوججەيەك كە ئيقامەكردنی لە تەخت كردنی چيا زەحمەت ترە و كاتی زياتر پێويستە، بۆيە پێی وايە مونازەرەی ئيمام أحمد لەگەڵ جەهميەكان هێشتا نەبۆتە ئيقامە حوججە بۆ المعتصم ! جا لەسەر ئەمە ڕۆيشتووە و كردوويەتی بە ئەصل لە بابەتەكە وەك بڵێی پێش لەدايكبوونی ئيمام أحمد و سەرهەڵدانی فيتنەی خلق القرآن لەساڵی 218 هيچ باسی تەكفير كردنی جەهميەكان نەكرابێ و هەموو زانايان ئەمەيان بۆ ئيمام أحمد جێهێشتبێ ! جا پێش بچينە سەر باسی هەڵوێستی ئيمام دەربارەی ئەم سێ خەليفەيە دەمەوێ ئەوە بڵێم كە موسڵمانی عەقيدە پاك ببينێ ئيمام أحمد لە گۆڕ هەڵساوەتەوە پڕ بە دەمی هاوار دەكات و دەڵێ من ئەم سێ خەليفەيەم تەكفير نەكردووە كاتێك وتوويانە قوڕئان مەخلوقە و خەڵكيان لەسەری سزاداوە و كوشتووە، ئەوا موسڵمان نابێت ئەم قسەيەی لێوەرگرێت و دەبێت ڕەتی بكاتەوە چونكە بە ئيجماعی زانايان تەكفير كراون لەسەر ئەوە ناوەستين بزانين ئيمام أحمد تەكفيری كردوون تا ئێمەش بيكەين گەر نەيكردوون تا ئێمەش نەيكەين، بۆيە هەڵوێستی ئيمام أحمد هەرچۆنێك بێت عەقيدەی ئێمە لەم باسەدا ناگۆڕێت، باسكردنی ئەم بابەتەش بۆ دوو مەبەستە، يەكەميان لەبەر ابن تيمية كە هاتووە هەڵوێستی ئيمام أحمد-ی كردۆتە ئەصل لە بابەتەكەدا كە ئەو چی كردبێت ئيتر دەبێتە حوكمێكی جێگير و تەكفيری جەهميەكان دەبێت لەسەر ئەم ئەصلە بنيات بنرێ كە ئەمەش ابن تيمية-ی خستۆتە هەڵەيەكی گەورەوە كە بە ڕوانين لە سووچێكی ئەم ڕووداوە تەكفيری معين لەسەر جەهميەكان لادەبات، دووەميان لەبەر مەدخەليەكان كە ئەم بابەتەيان بە گوڵ ڕازاندۆتەوە بۆ بەرگری كردن لە كوفری طاغوتەكان و لە دژ وەستانی ئەو كەسانەی كە تەكفيريان دەكەن، لەكاتێكدا ئەم سێ خەليفەيە هەموو كوفرەكانيان كۆ بكەيتەوە ناگاتە ئەو كوفرانەی كە لە يەك لاپەڕەی دەستوری ئەم طاغوتانە نوسراوە،وە كراوە بە حوكم بەسەر خەڵكيدا لەبرِی حوكمی الله.

جا هەموو موسڵمانان بگرە ژمارەیەک لە مەدخەلیەكانیش باش ئەوە دەزانن كە جەهمیەكان كافرن و لەلای سەلەف تەكفیر كراون بە معین، وە هیچ موسڵمانێک كە كتێبەكانی سەلەفی خوێندبێتەوە گومانی لەوەدا نیە كە لەسەف تەكفیری معین-ی جەهمیەكانیان كردووە لە سەرووی هەمووشیانەوە ئیمام أحمد، بگرە ئیمام أحمد ئەم ناوبانگەی بە دەست نەهێنا و نەبووە ئیمامی ئەهلی سوننە ئیللا دوای فیتنەی خلق القرآن نەبێت كە پێشەوایەتی ئەهلی سوننەی كرد بووە نیشانە بۆ خەڵكی، ئەمەش مانای ئەوە نیە ووتەی أحمد وەک ووتەی مەعصوم وابێت بەڵام ئیتر ئەمە فەزلی الله یە دەیدات بەهەركەسێک كە بیەوێت، بە فەزلی الله تعالى أحمد بووە ئیمام و دەم ڕاستی ئەهلی سوننە بەكوێرایی چاوی نەیارانی.

هەروەک **الطبري** دەربارەی دەڵێ: **قسە كردن دەربارەی لەفزی بەندەكان بە قوڕئان هیچ ئەثەرێک نیە لە هاوەڵانەوە كە بیزانین، وە لە تابعینیش نیە، تەنها ئەثەر هەیە لەو كەسەی كە ووتەكانی بە شێوەیەكە بێ پێویستت دەكات لە ووتەی كەسانی تروشیفای تێدایە ڕەحمەت وڕەزای الله-ی لەسەر بێت، وە لە شوێنكەوتنی ئەودا ڕێنموونی و هیدایەت هەیە، ووتەی ئەو لەلامان وەک ووتەی پێشەوایانی سەردەمی زوو وایە، ئەویش أبو عبدالله أحمد بن محمد بن حنبل رضي الله عنه، أبو إسماعيل الترمذي پێی ڕاگەیاندم ووتی: بیستم أبو عبدالله أحمد بن حنبل دەیووت: ئەوانەی دەڵێن لەفزمان بە قوڕئان مەخلوقە جەهمین** ... (پاشان الطبري دەڵێ) **هیچ ووتەیەكمان نیە لەم بابەتەدا دروست بێ بیڵێین كە هیچ ئیمامێكمان تێیدا نیە جگە لەو، ووتەی ئەویش بەسە بۆمان، ئەو ئیمامێكە خەڵكی شوێنی كەوتوون، ڕەحمەت و ڕەزای الله-ی لێبێت.**

[صريح السنة : 37-38]

**الذهبي** دەڵێ: **المروذي لە كتێبی (القصص) دەڵێ: ئیمام أحمد ووتی: بشر المريسي مرد الحسين الكرابيسي لەدوای خۆی جێهێشت، پاشان ووتی: هەواڵی أبو ثور چیە ؟ هاوڕای الكرابيسي-ە لەمەدا ؟ (واتا: بابەتی لەفزمان بە قوڕئان مەخلوقە) ووتم: هەجری الكرابيسي كردووە، ووتی: شتێكی چاكە، ووتم: من پرسیارم لە أبو ثور كرد دەربارەی ئەو كەسەی كە دەڵێ:**

**لەفزم بە قورئان مەخلوقە ؟ أبو ثور ووتی: بیدعەچیە، جا باوکی عبدالله تورە بوو ووتی: بیدعەچی چیە ! ئەمە خودی ووتەی جەهمە.** [تاريخ الإسلام : 85/18]

ووتم: بڕوانە ئیمام أحمد لە أبو ثور تورە بووە کاتێک وتوویەتی ئەوەی بڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە بیدعەچیە، واتا بەوەش ڕازی نیە کە بڵێ بیدعەچیە ئیللا دەبێت تەکفیری بکات، ئینجا چۆن کەسانێک تەکفیر ناکات کە دەڵێن قورئان مەخلوقە ودەیکەن بە دین لە خەڵکی وموسڵمانانی پێ تاقی دەکەنەوە و دەیانکوژن و بەندیان دەکەن و سزایان دەدەن ؟!

جا کە ئێمە زانیمان ئیمام أحمد جەهمیەکانی بە معین تەکفیر کردووە ئیتر چ پێویست دەکات لەوە بکۆڵینەوە ئایا المأمون کە جەهمی بووە أحمد تەکفیری کردووە ؟! بەڕاستی من سەیرم بەو کەسانە دێت کە خۆیان بەم باسەوە خەریک دەکەن، ئەمە وەک ئەوە وایە من بڵێم: هەموو ڕافیزەیەک کافرە بە معین، تۆش بڵێی: ئەی حسن روحاني سەرۆکی ئێران ئەویش تەکفیر دەکەیت ؟ ئێ من ووتم هەموو ڕافیزەیەک کافرە ئیتر چ پێویست دەکات بڵێی ئەی فلان و علان ؟ ئایا لەسەرمە هەر کەسێک ڕافیزە بێت ناوی بهێنم ؟ بۆ نموونە کەسێک زانا بێت لە بەغداد ژیا بێت و کۆمەڵێک کتێبی هەبێت لە کتێبەکانیدا بە ڕوونی دیار بێت کە ڕافیزەکان بە معین تەکفیر دەکات بەڵام لە هیچ کتێبێکیدا نەیووتوە حیدر العبادي کافرە ئایا دوای مردنی ئەم کەسە دەپرسن و دەیکەن بە بابەت و بڵێن: ئایا فلان زانا حیدر العبادي بە کافر زانیوە یان نا ؟ چونکە بە ڕوونی لە کتێبەکانیدا ناوی نەبردووە ؟ ئەی دەکرێ من کە لە هیچ وانەیەکی دەنگی مامۆستا کامەران ﷺ نەم بیستووە بڵێ: مسعود بارزانی کافرە ئینجا بڵێم ئەو لە سەردەمی مسعود ژیاوە بۆ نەیووتوە کافرە ؟! دیارە مامۆستا کامەرانیش شل بووە لەم بابەتەدا، ئێوەش دەڵێن ووتەی هەیە دەڵێ: حزبەکان کافرن ووتەی هەیە دەڵێ: یەکێتی و پارتی کافرن، منیش دەیکەم بە ئینکاری و دەڵێم مادام نەیووتوە مسعود کافرە با هەر بڵێ پارتی کافرە گرنگ ئەوەیە تەکفیری مسعودی نەکردووە بە ڕاشکاوی ! بێگومان لە قسەکانمدا دیارە کە تەنها مەبەستم بیانوو گرتنە بە مامۆستا کامەران ئەگینا ئەوەی گوێی لێ گرتبێ یەک دەنک گومانی لەوە نیە کە مسعود و هەموو هاوشێوەکانی بە کافر زانیوە، منیش دەڵێم ئیمام أحمد-یش بەهەمان شێوە ئەوەی ووتەکانی بزانێت دەربارەی جەهمیەکان یەک دەنک گومانی لەوە

نیە کە ئیمام أحمد المأمون و هەموو هاوشێوەکانی بە کافر زانیوە، دواتر ئەوانیش مرۆڤ بوونە وەک ئێوە ئەوەتا چەندەها زانا لەترسی لێدان و کوشتن لەژێر ئیکراهدا کوفریان کرد ووتیان قورئان مەخلوقە، ئەوانەی عەزیمەتیان گرتە بەر بەرگەی لێدان و بەندکردنیان گرت بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن، جا ئایا پێت وایە بارودۆخەکە ئەوەندە ئاسانە هەر کەسە و پڕ بە دەمی خۆی هاوار بکات بڵێ المأمون کافرە ؟ لە کاتێکدا ژمارەیەک زانای ناودار ئەم کوفرە بە دەمیان داهات لەژێر ئیکراهدا تا لەژێر دەستی المأمون ڕزگاریان بێت، بۆ مەگەر زاناکانی تر کە لە سەردەمی المأمون ژیاون هەموویان بە ڕوونی لە کتێبەکانیان وتوویانە المأمون کافرە تا بڵێین بۆ ئیمام أحمد وای نەووتوە ؟ گەر شتێکی لەم جۆرە لە ئارادا بێت هێشتا دەڵێین ڕێی تێدەچێ ئەوەتا زاناکانی سەردەمی المأمون زۆربەیان وتوویانە المأمون کافرە تەنها ئیمام أحمد وای نەووتوە بۆیە جێگای گومانە ئایا أحمد تەکفیری کردووە یان نا ؟ دەی ئێوە ناوی 10 زانام بۆ بهێنن لەم سەردەمەدا کە بە ڕاشکاوی بڵێن المأمون کافرە، ئینجا ئەوکات حەق بە ئێوەیە پرسیار بکەن ئیمام أحمد بۆ وای نەووتوە ؟ وابزانم ئەمەندە بەسە بۆ پوچەڵکردنەوەی ئەم گومانە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەند ڕیوایەتێک دەهێنین لە ئیمام أحمد-ەوە کە کراون بە گومان دواتر چەند ڕیوایەتێکی تر بۆ ڕەتدانەوەی گومانەکان.

# ئەو ڕیوایەتانەی وەک گومان دەهێنرێن دەربارەی تەكفیر نەكردنی خەلیفەكان لەلایەن ئیمام أحمد:

**الخلال** دەڵێ: أخبرنا أحمد بن محمد بن مطر ذكره ابن يحيى أن أبا طالب حدثه أنه قال لأبي عبدالله: **دەڵێن دەجەنگین لە دژیان و خروجیان لێ دەكەین، أحمد ووتی: نەخێر، شمشێرمان ناوێت دەبێتە فیتنە كەسی بێ تاوان تێیدا دەكوژرێ، دەست بگرن بە دوعاوە.**
[السنة : 1707] **(سەنەدەكەی صەحیحە).**

ووتم: خروج نەكردن مانای تەكفیر نەكردن نیە، چونكە خروج كردن پەیوەستە بە تواناوە.

**الخلال** دەڵێ: أخبرني محمد بن أبي هارون و محمد بن جعفر ووتيان: أبو الحارث بۆی گێڕاینەوە ووتی: **پرسیارم لە باوكی عبدالله كرد دەربارەی شتێک كە لە بغداد ڕوویدا، وە كەسانێک نیازیان وابوو خروج بكەن، منیش ووتم: ئەی باوكی عبدالله چی دەڵێی دەربارەی خروج كردن لەگەڵ ئەم كەسانەدا ؟ سەرزەنشتی ئەم كارەی كردن، وە دەیووت: سبحان الله خوێن ! خوێن ! ڕەئیم وانیە و فرمان بە شتی وا ناكەم، ئارامگرتن لەسەر ئەو حاڵەی كە تێیداین باشترە لە فیتنە خوێنی تێدا بڕژێت وماڵ وناموسی تێدا حەلال بكرێت، ئەی نازانی خەڵكی لە چ بارودۆخێكدا بوون -واتا ڕۆژانی فیتنە- ؟ منیش ووتم: ئەی خەڵكی ئەمڕۆ لە فیتنەدا نین ئەی باوكی عبدالله ؟ ووتی: ئەگەرچی فیتنەش بێت ئەمڕۆ بەڵام ئەم فیتنەیە تایبەتە بە هەندێک كەس بەڵام كە شمشێر بەكارهات فیتنە هەمووی دەگرێتەوە و ڕێگاكان دادەخرێن، ئارامگرتن لەسەر ئەم حاڵە وسەلامەتی دینەكەت باشترە بۆت، وە بینیم سەرزەنشتی خروجی دەكرد لە پێشەوایان و دەیووت: خوێن ! ڕەئیم وانیە و فرمان بە شتی وا ناكەم.** [السنة : 89] **(سەنەدەكەی صەحیحە).**

**الخلال** دەڵێ: أخبرني علي بن عيسى ووتی: بیستم حنبل دەیووت: **لە سەردەمی الواثق فەقیهەكانی بغداد كۆبوونەوە هاتنە لای باوكی عبدالله، أبو بكر بن عبيد و إبراهيم بن علي المطبخي وفضل بن عاصم، جا هاتنە لای باوكی عبدالله ئەویش ڕێگای دان بێنە ژوورەوە، ووتیان: ئەی باوكی عبدالله**

**ئەم كارە زیاتر خراپ بووە و تەشەنەی سەندووە، مەبەستی فیتنەی خلق القرآن و جگە لەویش بوو، باوكی عبدالله پێی ووتن: چیتان دەوێ ؟ ووتیان: ئێمە ڕاوێژت پێ دەكەین لەوەی كە ڕازی نین بە فەرمانڕەوایی الواثق و دەسەڵاتەكەی، جا باوكی عبدالله ماوەیەك مونازەرەی لەگەڵ كردن، وە پێی ووتن: لە دڵی خۆتاندا سەرزەنشتی بكەن و دەست لە گوێڕایەڵی هەڵمەگرن و یەكڕیزی موسڵمانان تێكمەدەن و خوێنی خۆتان و خوێنی موسڵمانانیش لەگەڵ خۆتان مەڕێژن، سەیری سەرئەنجامی كارەكەتان بكەن و ئارام بگرن تا چاكەكاران دەمرن و دەحەسێنەوە یان خراپەكار دەمرێت و لە دەستی دەحەسێنەوە، وە لەم مونازەرەیەدا قسەی زۆر كرا بیرم نەماوە، جا ئەوان ڕۆیشتن من وباوكم چووینە لای باوكی عبدالله دوای ئەوەی ئەوان ڕۆیشتن، باوكم بە باوكی عبدالله-ی ووت: داوای سەلامەتی لە الله دەكەین بۆ خۆمان و بۆ ئوممەتی محمد، وە حەز ناكەم كەس كاری ئاوا بكات، وە باوكم ووتی: ئەی باوكی عبدالله ئەم كارەی ئەوان لەلای تۆ صەوابە ؟ ووتی: نەخێر ئەمە پێچەوانەی ئەو ئاثارانەیە كە تێیاندا فرمانمان پێكراوە بە ئارامگرن، پاشان باوكی عبدالله ووتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (گەر دەسەڵاتدار لێیدایت ئارام بگرە ، گەر... گەر... ئارام بگرە) جا فرمانی كرد بە ئارامگرتن، وە عبدالله بن مسعود وتوویەتی: ... قسەیەكی كرد بیرم نەماوە.** [السنة : 90]

ووتم: علي بن عيسى بن الوليد مەجهولە.

الخلال دەڵێ: أخبرنا محمد بن علي قال حدثنا صالح بن أحمد ووتی: باوكم بۆی گێڕامەوە ووتی:
**ووتم بە ابن الكلبي و المظفر كە هەردووكیان نێرداوی خەلیفە بوون: بڕوام بە گوێڕایەڵی كردنی خەلیفە هەیە لە ناخۆشی و خۆشیدا لەو كارانەی پێم خۆشن و لەو كارانەش كە پێم خۆش نیە و ئەگەرچی خۆشیان لە ئێمە جیا بكەنەوە، وە من پەشیمانم لە نەچوونم بۆ نوێژی بە كۆمەڵ و ئامادە نەبوونم لە نوێژی هەینی و بانگەوازكردنی موسڵمانان.** [السنة : 13]

ووتم: محمد بن علي مەجهولە، گریمان بڵێین صەحیحیشە ئەوا ئەم قسەیە لەسەردەمی المتوكل ووتراوە كە موسڵمان بووە و فیتنەی خلق القرآن لە سەردەمی ئەو كوژایەوە و سوننەت بڵاو

بوویەوە، ابن الكلبي پۆستەچی المتوكل بووە، المظفر بە زاراوەی ئەمڕۆ سکرتێری عبدالله بن إسحاق بووە کە والی بغداد بووە لە سەردەمی المتوكل، ئەمەش کاتێک ڕوویدا کە محمد بن شجاع الثلجي درۆزن و جەهمی کە حەنەفی مەزهەب بوو، وە کۆمەڵێک ڕیوایەتی ئەومان هێنا لە بەشی دووەم دەربارەی مەدحی أبو حنيفة، ئەو بوهتانی بۆ ئیمام أحمد هەڵبەستا نامەیەکی بۆ المتوكل نوسی کە گوایە ئیمام أحمد کەسێکی عەلەوی لەماڵی خۆی حەشارداوە بۆ ئەوەی بەیعەتی پێ بدات، کاتێک دار و دەستەی المتوكل هاتن ماڵی ئیمام أحمد بپشکنن ئینجا ئیمام أحمد ئەم قسانەی کردووە، وە ووتمان کە شێخی الخلال مەجهولە بەڵام گریمان صەحیحیش بوایە ئەمە وەڵامێکە بۆی.

**الخلال** دەڵێ: أخبرني علي بن عيسى بن الوليد أن حنبلا حدثهم، وأخبرني عصمة بن عصام قال حدثنا حنبل ووتی: **لەم ڕووداوە -واتا ئەوەی پێشوو- ووتی: من دوعای بۆ دەکەم بە پێکان و سەرکەوتن و پشتگرتن لە شەو و ڕۆژدا، وە بڕوام وایە کە ئەمە واجبی ئەوە لەسەرم.** [السنة : 14]
ووتم: الخلال بە دوو سەنەد ئەم ڕیوایەتەی هێناوە سەنەدی یەکەم لە علي بن عيسى بن الوليد کە مەجهولە، سەنەدی دووەم لە عصمة بن عاصم، ئەمەی دووەمیان دەتوانین بڵێین حەسەنە چونکە الخلال تەوسیقی ئەم شێخەی کردووە، جا ئەم دوعایەش لە هەمان ڕووداوی پێشوودا ووتراوە وەک حنبل باسی دەکات، ئەمەش درۆی مەدخەلیەکان هەڵدەوەشێنێتەوە کە گوایە ئیمام أحمد سەرەڕای ئەوەی المأمون خراپی بەسەر هێنا کەچی دوعای بۆ دەکرد، بەڵکو ئیمام أحمد دوعای لە المأمون کردووە نەک بۆی بکات، شەوی مردنی المأمون ئیمام أحمد دوعای لێدەکات کە الله لە کۆڵ خەڵکی بکاتەوە بۆ بەرە بەیان هەواڵی مردنی المأمون بڵاو دەبێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دوعاکردن بۆ خەلیفەی کافر بە هیدایەتدان و تەوبەکردن و ئیصلاح بوونی هیچ شتێکی ناشەرعی تێدا نیە گەر هەر کەسێک بیکات.

**الخلال** دەڵێ: أخبرنا أبو بكر المروذي ووتی: **أبو عبدالله -واتا ئیمام أحمد- ووتی: ووتم بە ابن الكلبي کە هاوەڵی خەلیفە بوو لەوەتەی خۆم ناسیوە تا ئەم کاتەی ئێستا ئیللا پێم وابووە کە دەبێت**

**نوێژ لەدوای وەلی ئەمرەكان بكرێت و حیساب بۆ پێشەوایەتیان بكرێت، وە بڕوام بەوە نیە كە خروجیان لێ بكرێت.** [السنة : 86] **(سەنەدەكەی صەحیحە).**

ووتم: پێشتر باسمان كرد كە ابن الكلبي پۆستەچی المتوكل بووە كە خەلیفەیەكی موسڵمان بووە، وە ئەم قسانەی ئیمام أحمد هەمووی دروستە بۆ خەلیفەیەک كە موسڵمان بێت، بەڵام دەپرسین بۆچی ئیمام أحمد لە سەردەمی ئەوانەی پێش المتوكل نوێژی لەدوایان ئەنجام نەدەدا یان گەر ئەنجامی دابوایە ئەوا پاشان دووبارەی دەكردەوە و فەتوای بۆ خەڵک دەدا كە نوێژ دووبارە بكەنەوە لەكاتێكدا ئیمام أحمد دەڵێ عەقیدەكەم بەم شێوەیە كە نوێژ بكرێت لەدوایاندا ؟ حاشا لە ئیمام أحمد كە ئەهلی نیفاق بێت قسەیەک بكات و خۆی دژی بوەستێ، كەواتە خەلیفەكانی پێش المتوكل-ی بە موسڵمانی نەزانیوە بۆیە نوێژی لەدوا نەكردوون یان دووبارەی كردۆتەوە.

حنبل بن إسحاق بەسەرهاتی پیاوێكی سەر بە دەسەڵات دەگێڕێتەوە كە لەكاتی سزادانی ئیمام أحمد لەوێ ئامادە بووە پاشان هاتووە داوای گەردەن ئازادی لە ئیمام أحمد دەكات، جا ئیمام أحمد پێی دەڵێ: **تەوبە بكە بۆلای الله عز وجل وە مەگەڕێوە بۆ ئەم شتە، پیاوەكە ووتی: ئەی باوكی عبدالله من تەوبەم كردووە بۆلای الله عزوجل لە گەڕانەوە بۆلای دەسەڵات. جا باوكی عبدالله پێی ووت: گەردنی تۆم ئازاد كرد، وە هەر كەسێک باسی كردوومە گەردنی ئازاد بێت تەنها بیدعەچی نەبێت. حنبل دەڵێ: باوكی عبدالله ووتی: گەردنی باوكی إسحاق-یشم ئازاد كرد. (واتا: المعتصم).**
[ذكر محنة الإمام أحمد بن حنبل : 64-65]

ووتم: دوای پەشیمان بوونەوەی المعتصم ئینجا ئیمام أحمد گەردنی ئازاد كردووە وەک دواتر باسی دەكەین، نەک ئەوانەی كە لەسەر كوفر بەردەوام بوونە گەردنیان ئازاد بكات، بۆیە دەڵێ گەردەنی بیدعەچی ئازاد ناكەم، تۆ بڵێی المعتصم-ی بە بیدعەچیش نەزانی بێت بۆیە گەردەنی ئازاد كردووە؟! بۆیە نەقل كردنی ئەم ڕووداوانە بە پارچەكراوی ووتەیەک لێرە و ووتەیەک لەوێ دەبێتە هۆی گۆڕینی ڕاستیەكان ، ئەی بۆ هیچ كەسێک باسی پەشیمان بوونەوەی المعتصم ناكات تەنها باسی گەردن ئازاد كردنی المعتصم دەكرێ لەلایەن ئیمام أحمد ؟!

**حنبل بن إسحاق** دەڵێ: **بیستم صالح-ی كوڕی ئیمام أحمد بە باوكی ووت: باوكە فضل الأنماطي گەردنی أبو إسحاق المعتصم-ی ئازاد كرد لەو شتانەی كە پێی كردبوو لە لێدان، أبو عبدالله -واتا ئیمام أحمد- ئەم ئایەتەی خوێندەوە:** ﴿وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَكُمۡۚ﴾ **پاشان أبو عبدالله ووتی: كاتێك ڕۆژی قیامەت دادێت الله عز وجل دەفەرمووێ: (كەس ناچێتە بەهەشتەوە تەنها ئەوانە نەبێت كە لە خەڵكی خۆشبوونە، جا ئەهلی عەفو هەڵدەستنەوە و دەچنە بەهەشتەوە بەهۆی لێخۆشبوونیان لە خەڵكی) چی زەرەر دەكات پیاو گەر لە براكەی خۆشبێت الله-ش لەو خۆش دەبێت و سزای نادات ؟! پاشان ووتی: منیش گەردنی المعتصم-م ئازاد كرد لەو كارانەی كە پێی كردم لە لێدان و بەندكردن و كۆت و زنجیر كردن، بەڵكو الله لێم خۆشبێت بەهۆی لێخۆشبوونم لەو.** [ذكر محنة الإمام أحمد بن حنبل : 66]

ووتم: دواتر ڕیوایەتی تەوبەكردنی المعتصم دەهێنین.

**صالح بن الإمام أحمد** دەڵێ: **باوكم ووتی: لە مردووەكە خۆشبووم لەسەر ئەوەی كە لێیدام، پاشان دەیووت: چی زەرەر دەكات پیاو گەر بەهۆی ئەوەوە الله هیچ كەسێك سزا نەدات؟!** [سيرة الإمام أحمد بن حنبل : 47]

ووتم: ئەوەی لە ئیمام أحمد-ی دا المعتصم بوو، لە سەردەمی المأمون بەندكرابوو المأمون ووتی بیبینم دەیكوژم، ئیمام أحمد دوعای لێكرد كە الله لە كۆڵیانی بكاتەوە، ئەوە بوو بەرە بەیانیەكەی پێش بینینی هەواڵی مەرگی المأمون بڵاوبوویەوە، ئینجا لە سەردەمی المعتصم زۆر بە توندی لێیدرا پاشان المعتصم لێی بێ هیوا بوو ئازادی كرد، لە سەردەمی الواثق هەر ئازاد بوو توشی لێدانیش نەبوو بەڵام بۆی نەبوو لە ماڵ بێتە دەرەوە، كەواتە ئەم لێخۆشبوونە تەنها المعتصم دەگرێتەوە كە تەوبەی كردووە.

## چەند ڕیوایەتێک کە وەڵامە بۆ ئەم گومانانە:

**حنبل بن إسحاق** دەڵێ: أبو إسحاق -المعتصم- **فرمانی بە إسحاق بن إبراهيم کردبوو هەمیشە هەواڵی أحمد بن حنبل-ی بۆ بهێنێت، چونکە وەک إسحاق بۆی گێڕاینەوە دوای بێ هیوا بوونی المعتصم لە أحمد ئازادی کرد، وە پێمان گەیشت کە أبو إسحاق -المعتصم- پەشیمان بوویەوە دوای ئەمە تا تەوبەی کرد و چاک بوویەوە، جا خاوەنی هەواڵ إسحاق بن إبراهيم هەموو ڕۆژێک دەهاتە لامان بۆ ئەوەی هەواڵی أحمد بزانێت تا أحمد چاک بوویەوە و تیماری بوو دوای چارەسەر.** [ذكر محنة الإمام أحمد بن حنبل : 60-61]

ووتم: واتا المعتصم لەکۆتاییدا تەوبەی کردووە و پەشیمان بۆتەوە، ئیتر بڵاوکردنەوەی لێخۆشبوونی أحمد لە المعتصم بەبێ ئاماژەدان بە تەوبەکردنی المعتصم گۆڕینی ڕاستیەکان و خۆڵ کردنە چاوی خەڵکە.

**الخلال** دەڵێ: أخبرني عبدالله بن حنبل قال حدثني أبي ووتی: **مامم -واتا ئیمام أحمد- ووتی: کام بەڵا گەورەتر بوو لەو الذمي-ە، دوژمنی الله و دوژمنی ئیسلام مراندنی سوننەتی داهێنا لە ئیسلام. واتا ئەوەی پێش المتوكل، جا المتوكل سوننەتی زیندوو کردەوە ڕەزای الله-ی لێبێت.** [السنة : 23]

ووتم: ناوبردنی خەلیفەی پێش المتوكل واتا الواثق بە ئەهلی ذیممە و دوژمنی الله و دوژمنی ئیسلام تەکفیر لەخۆ دەگرێت، دایکی الواثق ڕۆمی بوو ناوی قراطیس بوو لەوانەیە هەر لەبەر ئەوە پێی بڵێ ئەهلی ذیممە وەک تانەدان لێی.

ئەگەرچی لە تەحقیقی (عطية الزهراني) ووشەی (أكثر) هاتووە -أي بلاء كان أكثر- بەڵام الفراء لە (الأحكام السلطانية) هەمان ڕیوایەتی نەقل کردووە ووشەی (أكبر) هاتووە -أي بلاء كان أكبر- وە ووشەی (أكبر) گونجاوترە بۆ سیاقەکە چونکە باسی بەڵا دەکات، کامە بەڵا گەورەترە نەک کامە بەڵا زۆرترە، بۆیە منیش ئەوەم داناوە.

**يوسف بن عبدالهادي** دەربارەى ڕیوایەتەكەى پێشووى الخلال دەڵێ: **گەر لەلاى أحمد ئیمامەتى ئەو خەلیفەیە دروست بوایە ئەوا بۆى حەلال نەبوو ئاواى پێ بڵێت.**
[إيضاح طرق الإستقامة : 61]

**أبو يعلى** دەڵێ: **لە ڕیوایەتى الأثرم هاتووە كە پرسیار لە أحمد كراوە دەربارەى ژنێك كە وەلى ئەمرى نیە، أحمد وتوویەتى دەسەڵاتدار دەبێتە وەلى ئەمرى، پێى ووترا: دەڵێى دەسەڵاتدار! كە دەبینى ئەمڕۆ ئێمە لە چ حاڵێك داین ؟ ئەمەش لەكاتێكدا بوو كە قازییەكان تاقى دەكرانەوە بە فیتنەى خلق القرآن، أحمد ووتى: من وەڵامم نەدایەوە بەگوێرەى ئەمڕۆ، تەنها ووتم دەسەڵاتدار.**
[الأحكام السلطانية : 20]
ووتم: ووتەكەى أحمد واتا: لە ئەصلدا حوكمەكە ئاوایە كە دەسەڵاتدار دەبێتە وەلى ئەمرى كچەكە، بەڵام بۆ ئەمڕۆ نابێت چونكە خەلیفە كافرە، گەر خەلیفەى ئەوكاتى بە موسڵمان زانیبوایە واى نەدەووت، چونكە كافر ویلایەتى نیە بەسەر موسڵمان.

**أبو يعلى** دەربارەى ئەم ووتەیەى أحمد دەڵێ: **ئەم ووتەیە زەمكردن و تانەدان لە خەلیفەكانى لێ دەكەوێتەوە، ئەمەش ڕوونادات تەنها بە تانەدان لە فەرمانڕەوایەتیان نەبێت.**
[الأحكام السلطانية : 20]

**الخلال** دەڵێ: أخبرني أحمد بن محمد بن مطر قال حدثنا أبو طالب ووتى: **ووتم بە باوكى عبدالله ئێمە بەلاى گۆڕى كەسێكدا تێپەڕین لە طرسوس، خەڵكى طرسوس ووتیان: كافرەكە ڕەحمەتى الله-ى لێ نەبێت، جا باوكى عبدالله ووتى: بەڵێ ڕەحمەتى الله-ى لێ نەبێت، ئەو بوو ئەم تاقیكردنەوەیەى دامەزراند و هێناى.** [السنة : 1708] **(سەنەدەكەى صەحیحە).**
ووتم: چۆن بزانین ئەمە گۆڕى المأمون بووە ؟
١. الذهبي دەربارەى المأمون دەڵێ: لە 12ى رجب ساڵى 218 مرد، تەمەنى 48 ساڵ بوو، لە البذندون مرد، العباس-ى كوڕى تەرمەكەى گواستەوە لە طرسوس ناشتى. [سير أعلام النبلاء : 289/10]

جەعد و جەهم کە یەکەم کەس بوون ئەم کوفرەیان داهێنا (ووتنی قورئان مەخلوقە) جەعد لە شاری واسط کوژرا بە دەستی خالد بن عبدالله القسري، جەهم لە خوراسان کوژرا بە دەستی سالم بن أحوز المازني، پاشان کە فیتنەی خلق القرآن لە سەردەمی المأمون سەری هەڵدا و خەڵکی لەسەر تاقی دەکرایەوە، سێ کەس ڕۆڵی سەرەکی تێدا هەبوو، بشر المريسي و أحمد بن أبي دؤاد و المأمون، بشر المريسي لە واسط مرد، أحمد بن أبي دؤاد لە بغداد نێژرا، ئەوەی مایەوە المأمون بوو کە لە طرسوس نێژراوە، نازانم کێی تر هەیە دەوری لەم فیتنەیەدا هەیە و ڕۆڵی سەرەکی بینیوە و لە طرسوس نێژراوە کەچی کەس باسی نەکردووە جگە المأمون ؟ دواتر طرسوس لە شامە خەڵکی شام بێ ئاگابوون لەم کوفرە لە خەڵکی عیراقەوە بۆیان گوێزرایەوە وەک الأوزاعي باسی دەکات، چ جای ئەوەی یەکێک لەوان دایمەزرێنێت و ڕۆڵی سەرەکی تێدا بگێڕێت.

٢. ناسینەوەی گۆڕەکەی لەلای خەڵکی چونکە خەلیفە بووە گۆڕەکەی ناسراوە، ئەگینا وەک ووتمان ئەوانەی دەستیان لەم کارەدا هەبووە کەسیان لەوێ نەنێژراون تا گۆڕەکانیان بناسرێ لەلای خەڵکەوە.

٣. خودی ووتەکەی ئیمام أحمد کە دەڵێ ئەو دایمەزراند و هێنای، ئاماژەیە بۆ المأمون کە ئیمام أحمد لەگەڵی ژیاوە و سزا دراوە لەسەر دەستی، وە ئەو کتێبە فەلسەفیە یۆنانیەکانی هێنا وەری گێڕایە سەر زمانی عەرەبی و گرنگی پێدا.

٤. الخلال ناوی کەسەکەی شاردۆتەوە کردوویەتی بە پیاوێک چونکە ئەویش لە سەردەمی عەباسیەکان ژیاوە ئەوکاتیش دەسەڵات پشت بە پشت بووە لە باوکەوە بۆ کوڕ یان لە براوە بۆ برا بۆیە ئەوانەی ئەو سەردەمیش کە خەلیفە بوونە هەر عەباسیەکان بوونە لە نەوەی هارون الرشيد، دیارە ناوهێنانی المأمون لەو کاتەدا زەحمەت بووە بۆ زاناکان ئەگینا الخلال هیچ دوو دڵ نەبووە لەناو هێنانی کافر و گومڕاکان، الخلال 17 ساڵ دوای مردنی المأمون لەدایکبووە، بۆ نموونە پاشای یەکەمی دەوڵەتی سعودیەی سێیەم بەناوی عبدالعزيز بن عبدالرحمن آل سعود کە 66 ساڵە مردووە تا ئێستاش وێنەکانی لە کۆشکی پاشایەتیدا هەیە کێ دەتوانێ لە سعودیە بە ئاشکرا باسی تەکفیر کردنی بکات ؟ ئەوەی المأمون-یش بەهەمان شێوە بهێنە بەرچاوت، بەڵگەش بۆ ئەوەی کە

الخلال ناوەكەى شاردۆتەوە ئەمەیە كە أبو طالب دەڵێ: بە لاى گۆڕى پیاوێك تێپەڕین، ئیمام أحمد ناڵێ ئەم پیاوە كێ بوو، ڕێك دەڵێ بەڵێ ڕەحمەتى اللە-ى لێ نەبێت، كەواتە ڕوونە كە أبو طالب ناوەكەى ووتوە بەڵام الخلال شاردوویەتیەوە.

**ابن كثیر** دەڵێ: **پیاوێك نامەیەكى بۆ المتوكل نارد تێیدا نوسیبووى: ئەى ئەمیرى ئیمانداران أحمد بن حنبل جوێن بە باوانت دەدات و بە زندیق ناویان دەبات، المتوكل بۆ پیاوەكەى نوسى: المأمون شتەكانى تێكەڵ كرد جا وایكرد خەڵك قسەى پێ بڵێن، وە المعتصم-ى باوكم پیاوى جەنگ بوو لەم باسانە حاڵى نەدەبوو، وە الواثق-ى برام ئەوەى دەربارەى ووتراوە حەقە.**
**[البدایة والنهایة : 419/14]**

ووتم: بڕوانە المتوكل ئینكارى لەوە ناكات كە الواثق-ى براى شایستەیە پێى بووترێ زندیق، ئەى ئیمام أحمد چى ؟ پێت وایە بڵێ نەخێر موسڵمانە و وەلى ئەمرە ؟

**ئیمام أحمد** باسى كاتى بەندیخانە دەكات پێش چوونى بۆلاى المعتصم دەڵێ: **ووتم بە ابن الحجام هاوار بە حاڵت دواى ئەوەى طەلەبى عیلم و فەرموودەت كرد گەیشتووى بەم حاڵە ؟! وە پرسیارم لێى كرد دەربارەى عیلمى اللە ؟ ووتى: عیلمى اللە مەخلوقە، منیش پێم ووت: كافر بووى بە اللە-ى عظیم ئەى كافر، نێردراوى إسحاق پێى ووتم: ئەمە نێردراوى ئەمیرى ئیماندارانە، منیش پێم ووت: ئەمە كافر بوو بە اللە، وە بە هاوەڵەكەیم ووت كە لەگەڵى بوو بەناوى ابن رباح ئەمە واتا ابن الحجام كافر بوو.** **[ذكر محنة الإمام أحمد بن حنبل : 42]**

**حنبل بن إسحاق** مونازەڕەى ئیمام أحمد و زانا جەهمیەكان بە ئامادەبوونى المعتصم دەگێڕێتەوە و دەڵێ: **أبو عبدالله -واتا ئیمام أحمد- ووتى: المعتصم پێى ووتم: گەر تۆ لە دەستى خەلیفەى پێش خۆم نەبواى ئەوا حەقم بەسەرتەوە نەبوو، پاشان المعتصم بە عبدالرحمن بن إسحاق-ى ووت: فرمانم پێ نەكردیت ئەم تاقیكردنەوەیە هەڵگریت ؟ ئیمام أحمد دەڵێ: لە دڵى خۆمدا ووتم: اللە أكبر، لەمەدا ڕزگار بوون هەیە بۆ موسڵمانان، پاشان المعتصم ووتى: مونازەڕەى بكەن و قسەى**

**لەگەڵدا بکەن، ئەی عبدالرحمن قسەی لەگەڵدا بکە، جا عبدالرحمن ووتی: چی دەڵێی دەربارەی قوڕئان ؟ وەڵامم نەدایەوە، پاشان ابن أبي دؤاد بە عبدالرحمن-ی ووت: قسەی لەگەڵ بکە، جا عبدالرحمن پرسیاری لێکردم ووتی: چی دەڵێی دەربارەی قوڕئان ؟ المعتصم پێی ووتم: وەڵامی بدەرەوە، منیش پێم ووت: چی دەڵێی دەربارەی عیلمی الله ؟ جا بێدەنگ بوو، بە عبدالرحمن القزاز-م ووت: قوڕئان بەشێکە لە عیلمی الله، جا هەرکەسێک پێی وابێت عیلمی الله مەخلوقە ئەوا کافر بووە بە الله، جا عبدالرحمن بێدەنگ بوو هیچ وەڵامی نەدایەوە، جا لەنێوان خۆیاندا ووتیان: ئەی ئەمیری ئیمانداران ئێمە و تۆشی تەکفیرکرد.** [ذكر محنة الإمام أحمد بن حنبل : 45]

ووتم: گەر ئیمام أحمد المعتصم-ی بە کافر نەزانیبوایە حاشای لێدەکرد و دەیووت نەخێر من تەکفیرت ناکەم، هەروەک چۆن ابن تيمية بە دەمی خۆی دانی پێدانا ووتی من بە زانا گەورەکانیانم ووت ئێوە لەلای من کافر نین چونکە جاهیلن، کەچی ئیمام أحمد وا شمشێر لەسەریەتی و دەست و قاچی کۆت و زنجیری کراوە گەر بە موسڵمانی بزانێت چۆن لە حاڵەتێکی ئاوا هەستیاردا خوێنی خۆی بە فیڕۆ دەدات و نایەتە دەنگ بڵێ: ئەی ئەمیری ئیمانداران درۆ دەکەن بە دەمی منەوە من تۆ بە کافر نازانم ! جا لێرەدا لەوانەیە ئەم قاعیدە فقهیە بکەن بە بەڵگە (لا ينسب إلى ساكت قول) واتا: کەسی بێدەنگ هیچ شتێکی نادرێتە پاڵ، لێرەدا ئیمام أحمد بێدەنگ بووە کاتێک ئەوان وتوویانە ئەی ئەمیری ئیمانداران ئێمە و تۆشی تەکفیر کرد، جا مادام بێدەنگ بووە نابێت ئەوەی بدرێتە پاڵ کە المعتصم و ئەوانیشی تەکفیر کردووە، بەڵام گەر بێتو تەواوی قاعیدەکە بهێنین ئەوا دەردەکەوێت ڕووداوەکەی ئیمام أحمد شێوەیەکی ترە، قاعیدەکە بەم شێوەیە بە تەواوی (لا ينسب إلى ساكت قول، لكن السكوت في معرض الحاجة بيان) واتا: هیچ ووتەیەک نادرێتە پاڵ کەسی بێدەنگ، بەڵام بێدەنگ بوون لە کاتێکدا کە قسە کردن پێویستە ئەوا خودی بێدەنگ بوونەکە بە ڕازی بوون حیساب دەکرێت، هەروەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (بێوەژن بە شوو نادرێت تا بە دەمی خۆی دەڵێ ڕازیم، کچیش بە شوو نادرێت تا ئیزنی لێوەردەگیرێت، بێدەنگ بوونیشی واتا ئیزنی داوە) جا لێرەدا بێدەنگ بوونی کچەکە بە مانای ڕازی بوون حیساب دەکرێت چونکە گەر ڕازی نەبێت دەڵێ ڕازی نیم شوو بەم کوڕە بکەم یان دەڵێ جارێ نامەوێ شوو بکەم، ووتنی ئەم قسەیەش

لەلایەن کچەوە هیچ ڕێگریيەکی لە بەردەمدا نيە کە نەتوانێ وابڵێ، بەڵام ووتنی ئەوەی ڕازیم و شووی پێ دەکەم زەحمەتە بۆ کچ بەهۆی شەرمەوە، جا بۆیە بێدەنگ بوونەکەی بە ڕازی بوون حیساب دەکرێت، کەواتە دەبێت برگەی دووەمی قاعیدەکەش ڕەچاو بکەین ئەگینا تەنها سەیرکردنی برگەی یەکەم وادەکات بە ڕەهایی قاعیدەکە وەربگرین لە هەموو بارودۆخێکدا کە ئەمەش هەڵەیەکی ڕوونە.

**أحمد الزرقا** لە شەرحی برگەی دووەمی قاعیدەکە (لکن السكوت في معرض الحاجة بيان) دەڵێ:
**بێدەنگ بوونی ئەو کەسەی کە توانای قسەکردنی هەیە (واتا: لاڵ نیە) لەو کاتەی کە پێویستە قسە بکات ئەوا بێدەنگیەکەی بە ڕازی بوون حیساب دەکرێت بەو مەرجەی حاڵی کەسەکە بەڵگە بێت لەسەری یان زەرورەتێک هەبێ وای لێ بکات قسە نەکات بۆ لابردنی مەترسی و زیان.**
[شرح القواعد الفقهية : 338]
ووتم: ووتی دەبێ حاڵی کەسەکە بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی کە بێدەنگ بوونەکەی مانای ڕازی بوونە، ئێمەش گەر سەیری حاڵی ئیمام أحمد بکەین دەبینین حاڵی ڕێگا دەدات بەوەی کە بڵێین ئەوانی تەکفیر کردووە و ڕازی بووە بەم ووتەیەی ئەوان، چونکە ئیمام أحمد ووتەی زۆرە کە دەڵێ: ئەوەی بڵێ قورئان مەخلوقە کافرە ئەوەی تەکفیریشی نەکات کافرە، جا چ شتێکی سەیر لەوەدا هەیە کە ئیمام أحمد کەسێک تەکفیر بکات کە دەڵێ قورئان مەخلوقە ؟! وە ووتی: یان بەهۆی لابردنی ترسی کوشتن یان زیان لەسەر خۆی بێدەنگ بێت، وە ئەم مەرجەش لە ئیمام أحمد هەیە کە ترسی کوشتن ڕێگر بێت لە بەردەم قسەکردنی بۆیە بە ڕاشکاوی نەیووتوە فلان خەلیفە کافرە نەوەک بیکوژێت، کەواتە هەردوو مەرجەکە لە ئیمام أحمد بوونی هەیە کە أحمد الزرقا باسیکرد، جا ئەم مونازەرەیە کاتێک ڕوویداوە کە تازە المأمون مردووە و المعتصم بۆتە خەلیفە، وە المعتصم وتوویەتی فرمانم کردووە کە ئەم تاقیکردنەوەیە هەڵگرن، وە یەکەم جارە ئیمام أحمد دەیبینێت و قسەکانی دەبیستێت جا گەر المعتصم و ئەوانەی دەوری تەکفیر بکات، ئەی بە چ حەقێک المأمون تەکفیر ناکات کە ئەو ئەم فیتنەیەی هەڵگیرساند ؟ بۆیە گەر المعتصم تەکفیر بکات لە یەکەم بینین

و قسەكردندا ئەوا المأمون زۆر لە پێشترە كە تەكفیری بكات، پاشان الواثق كە دوای المعتصم دەبێتە خەلیفە ئەگەرچی ئیمام أحمد بەند ناكات و سزای نادات بەڵام پێی دەڵێ نەتبینم لەسەر زەوییەكەم بۆیە ئیمام أحمد هەمیشە خۆی لێ حەشار دەدا، تەنانەت بە فرمانی الواثق لەسەر مزگەوتەكانی مصر دەنوسرا (لا إله إلا الله رب القرآن المخلوق) واتا: هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق جگە لە الله كە خاوەنی قورئانی مەخلوقە، وە لە سەردەمی ئەودا هیچ زانایەک نەمایەوە كە تاقی نەكرێتەوە، جا بۆیە هیچ ڕێگریەک نیە لە تەكفیر كردنی ئەویش لەلایەن ئیمام أحمد، وە هەر بەپێی مەزهەبی ابن تیمیة كە دەبێت دوای ئیقامە حوججە جەهمیەكان تەكفیر بكرێن دەڵێین: چ ئیقامە حوججەیەک ڕوونترە لەو ئیقامە حوججەیەی كە لە مونازەڕەدا دەكرێت ؟ ئیمام أحمد بە ئامادەبی المعتصم مونازەڕەی لەگەڵ جەهمیەكاندا كرد كەواتە ئیقامە حوججەی كردوون ئیتر بۆ تەكفیریان ناكات ؟ كەواتە بەپێی مەزهەبی ابن تیمیة-ش ئیمام أحمد هەردەبێ تەكفیری كردبن چونكە ئیقامە حوججەی كردوون لە مونازەڕەكەدا، بەڵام تۆ بتەوێ ئیللا ئیمام أحمد ڕووبەڕوو بە المعتصم بڵێ تۆ كافری ئەگینا قبوڵی ناكەم، یان بۆچی لەكاتی مونازەڕەكەدا بە ئەمیری ئیمانداران ناوی دەبات دیارە بە موسڵمانی زانیوە، ئەوا دەڵێین ئەو زانایانەی كە زۆرێكیان تابعی بوون كە بە ڕاشكاوی ووتەیان هەیە دەربارەی تەكفیر كردنی الحجاج كاتێک دەكەونە ژێر دەستی لەترسی كوشتنی نەک باسی تەكفیر كردنی ناكەن بگرە زۆر داوای لێبوردنیشی لێدەكەن و سوپاسی دەكەن كە گەورەیی بنوێنێت و بیان بووڕێت، بۆ نموونە الشعبي كە زانایەكی تابعی گەورەیە سەرەتا دەڵێ: شایەتی دەدەم كە الحجاج ئیمانی بە طاغوت هەیە و كافرە بە الله، كەچی دوای شكانی ابن الأشعث كە الشعبي دەكەوێتە دەستی الحجاج بە ئەمیر ناوی دەبات و زۆر جیاوازتر قسە دەكات لەگەڵی و داوای لێدەكات كە لێی خۆش بێت، هەموو ئامانجی ئەوەیە كە نەیكوژێت، بڕوانە [تاريخ الطبري : 375/6] گەر بووترێ ئیمام أحمد لە شمشێر نەترساوە ئەوەتا ئەوەندە لێی دراوە تەنانەت صالح- كوڕی دەڵێ كاتێک مردیش ئاسەواری لێدان بەسەر پشتیەوە مابوو واتا دوای 23 ساڵ، دەڵێین بەڵێ ئامادە نەبووە كوفر بكات لە بابەتێكدا كە خەڵكی هەموو چاوەڕێی دەمی ئەو دەكەن، تەنانەت كە إسحاق-ی مامی دەچێتە لای داوای لێدەكات وەک تقية وەڵامی داواكەیان بداتەوە و بڵێ قورئان

مەخلوقە، ئیمام أحمد دەڵێ: گەرزانا بە تقیة قسە بكات و جاهیلیش بە جەهلەوە قسە بكات ئەی چۆن حەق ڕوون دەبێتەوە ؟! بۆیە بە هیچ شێوەیەک ئامادە نەبوو لەژێر ئیكراهیشدا وەڵامیان بداتەوە، وە گومانیش لەوەدا نیە ئەگەرچی ئەو كەسەی زۆری لێ بكرێت عوزری هەیە بەڵام ئەوەی عەزیمەت وەردەگرێت تەسلیمی داواكەیان نابێت فەزل و پاداشتی زیاترە، بەتایبەتی گەر كەسەكە زانا بێت و خەڵكی چاویان لەسەری بێت لەپێشترە كە عەزیمەت وەربگرێت، بەڵام باسكردنی تەكفیر كردنی المأمون والمعتصم والواثق شتێكی ترە، ئەمڕۆ چەندەها زانای موەحید هەیە لە وڵاتان كە ئازادە یان گیراوە دەبینی تەواوی كتێب و دەرسەكانی دەربارەی تەكفیری طاغوتانە كەچی گەربتەوێ بە ڕاشكاوی تەكفیر كردنی ئەم زانایە بدۆزیتەوە بۆ سەرۆكی وڵاتەكانیان ئەوا لە هەموو بەرهەمەكانیان بگەڕێیت دەستت ناكەوێ، ئەو هەموو هەوڵ و تێكۆشانی بۆ ئەوەیە كە لە خەڵكی تێبگەیەنێت ئەمانە كافرن كە حوكم بە قوڕئان ناكەن ئیتر گەڕان بەدوای ئەوەی ئایا بە ڕاشكاوی ناوی سەرۆک وڵاتەكەی بردووە یان نا شتێكی بێ مانایە، پاشان وەک پێشتر باسمان كرد كامە زانای تر هەبووە بە ڕاشكاوی بڵێ المأمون والمعتصم والواثق كافرن تا گلەیی لە ئیمام أحمد بكەین بڵێین ئەی تۆ بۆ وات نەووت و بێدەنگیت هەڵبژارد ! بۆیە ئیمام أحمد شتێكی نەكردووە كە عەقیدەی خەڵک تێكبدات و توشی گومانیان بكات ئەو هەمیشە وتوویەتی ئەوەی بڵێ قوڕئان كافرە و ئەوشی تەكفیری نەكات ئەویش كافرە تەنانەت لە بەردەم المعتصم وایووت، ئیتر ناوبردنی المعتصم یان هەرخەلیفەیەكی تر بە كافری ئەمە شتێک نیە هیچ زانایەكی لەسەر لۆمە بكرێت، لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە ئیمام أحمد یەكێک لە قوربانیە هەرە دیارەكانی ئەم فیتنەیە بوو لە زۆربەی زاناكانی تر بوێرتر بوو، الله تعالى پلەی بەرزكردەوە بەهۆی ئەم ڕووداوە لە كاتێكدا زۆربەی هەرە زۆری زاناكانی تر تەسلیم بوون و لەژێر ئیكراهدا ووتیان قوڕئان مەخلوقە، ئەوانیش وەک ئیمام أحمد هیچ دەقێكی ڕاشكاویان نیە بڵێن المأمون والمعتصم والواثق كافرن، لەكاتێكدا ئیمام أحمد دوو ڕیوایەتمان لێوەی هێنا لەگەڵ ووتەیەک كە هەر سێكیان ئاماژەن بۆ تەكفیر كردنی خەلیفەكان، سەرەڕای هەموو ئەمانەش خەڵكی باسی هەڵوێستی زاناكانی تر ناكەن دەربارەی خەلیفەكان هاتوون گومان لەسەر ئیمام أحمد دروست دەكەن ئایا خەلیفەكانی تەكفیر كردووە

یان نا ؟ وەک ئەوە دێتە بەرچاوم باسی مەلاكانی كوردستان نەكەی كە هەڵوێستیان لاوازە بەرامبەر دەسەڵات، بەڵام خۆت بەوە خەریک بكەیت ئایا مامۆستا كامەران مسعود بارزانی تەكفیر كردووە یان نا ؟ لەكاتێكدا مامۆستا كامەران بە تەنها بە قەدەر زۆربەی مەلا موەحیدەكان دژی ئەم دەسەڵاتە كافرە وەستایەوە و خەڵكی هاندا بە تەكفیر كردنیان و هەڵسا بە ڕوونكردنەوەی عەقیدەی صەحیح بۆ خەڵكی، لەم فیتنەیەشدا بە شایەتی عالیم و عەوام ئیمام أحمد بوو بە ئیمامی ئەهلی سوننە ئیتر گەر كارێكی كردبێت كە ناشەرعی بێت ئەوا دەبوو زاناكانی سەردەمی خۆی سەرزەنشتی بكەن و دژی بوەستن، یان دەووترێ زاناكان بە ئیمام أحمد-یان ووتوە با خروج بكەین لە دژیان بەڵام ئیمام أحمد ڕێگای نەداوە دەیانەوێ وەک مەدخەلیەک نیشانی بدەن ! باشە ئەو زانایانەی كە نیازی خروج كردنیان هەبوو بۆ دەڕۆن ڕاوێژ بە ئیمام أحمد دەكەن؟ بۆ كاتێک ئەو دەڵێ خروج مەكەن خوێنی كەسانی بێ تاوان دەڕژێ و ماڵ و سامانی خەڵكی هەتک دەكرێ بۆ گوێڕایەڵی دەكەن ؟ بۆ دژی ئەم ووتانەی ناوەستن و بڵێن تۆ خەڵک سارد دەكەیتەوە یان بڵێن تۆ دەسەڵاتدار بە موسڵمان دەزانیت وەک ئێمە تەكفیری ناكەیت ؟ خۆ تەنها ڕاوێژ پێكردنی و گوێڕایەڵی كردنی قسەكانی ئەوە نیشان دەدات كە فەزڵی هەبووە بەسەر زاناكانی تری سەردەمەكەی خۆیدا، لێرەدا یان دەبێ بووترێ زاناكان دەسەڵاتداری ئەوكاتیان تەكفیر كردووە بەڵام ئیمام أحمد تەكفیری نەكردووە بۆیە ئەوانیش هەموو دوای كەوتن لەسەر قسەی ئەو دەستیان هەڵگرت لە تەكفیركردنی، یان دەبێت بووترێ ئیمام أحمد و ئەوانیش بە كافریان نەزانیوە بۆیە خروج كردن بە جائیز نازانن لە دژی حاكمێكی موسڵمان بۆیە نەیانكردووە و پەشیمان بوونەتەوە، یان دەبێت بووترێ ئیمام أحمد و ئەوانیش بە كافریان زانیوە بەڵام لەبەر نەبوونی توانا ئیمام أحمد وای بە باش زانیوە خروج نەكرێت چونكە دوو مەرج هەیە بۆ خروج كردن: بینینی كوفری بەواح لە حاكم لەگەڵ هەبوونی توانا، بە هاتنەدی مەرجی یەكەم تەكفیری حاكمەكە دەكرێت بە هاتنەدی مەرجی دووەم خروج دەكرێت، گەر تۆ توانات نەبوو خروج بكەیت مانای ئەوە نیە بە كافری نازانیت یان پێی ڕازیت.

**ابن أبي يعلى** لەكۆتايی كتێبی (طبقات الحنابلة) كتێبێک نەقل دەكات بە سەنەدەوە كە تێیدا بەشێک لە عەقیدەی ئیمام أحمد هاتووە، جا دەڵێ: أخبرنا الشيخ الإمام الحافظ أبو محمد المبارك بن علي بن الحسين بن عبدالله بن محمد المعروف بابن الطباخ البغدادي رحمه الله في الدنيا والآخرة إجازة قال حدثنا شيخنا الإمام الحافظ أبو الفضل محمد بن الناصر بن محمد بن محمد بن علي البغدادي بها قال أخبرنا الإمام جمال الإسلام أبو محمد رزق الله بن عبدالوهاب التميمي قال أخبرنا عمي أبو الفضل عبدالواحد بن عبدالعزيز التميمي بجميع هذا الاعتقاد وقال جملة اعتقاد أحمد بن حنبل رضي الله عنه والذي كان يذهب إليه ... (ئینجا لە چوار چێوەی عەقیدەكەدا ئەمە هاتووە) **ئیمام أحمد دەڵێ: هەر یەكێک لە خەلیفەكان بانگی كردن بۆ بیدعەیەک وەڵامی مەدەنەوە و هیچ كەرامەتی نیە، وە ئەگەر توانیتان لە دەسەڵات لایدەن ئەوا وابكەن.** [طبقات الحنابلة : 305/2]

ووتم: سەنەدەكە تا دەگاتە أبو الفضل التميمي صەحیحە بەڵام لەنێوان أبو الفضل و ئیمام أحمد پچڕان هەیە، ئیمام أحمد 241 مردووە أبو الفضل 410 مردووە، جگە لەوەش ئەوەی لەم عەقیدەیەدا هاتووە بە تێگەیشتنی خۆی ڕیوایەتی كردووە هەر بۆیە هەندێک ووشەی تێدایە كە ئەشعەرییەكان دڵیان پێی خۆشە كە پێچەوانەی ڕیوایەتەكانی تری ئیمام أحمدە كە هاوەڵەكانی لێیان نەقل كردووە، وە أبو الفضل نزیكبووە لە ئەشعەرییەكان و هاوڕێی خۆشەویستی أبو بكر الباقلاني بووە، جا بۆیە ناكرێ ئەوەی لەم عەقیدەیەدا هاتووە بدرێتە پاڵ ئیمام أحمد مەگەر ئیللا هەمان شت لە كتێبی هاوەڵەكانی خۆیدا هاتبێ ئینجا، ئەوكاتیش پێویستیمان بە ڕیوایەتی ئەو نابێت مادام هی هاوەڵەكانی هەیە، ابن تيمية لە (مجموع الفتاوى) و (درء تعارض العقل والنقل) باسی نزیكی أبو الفضل دەكات لە ئەشعەرییەكان هەروەها لادانی لە مەزهەبی ئیمام أحمد لە هەندێک بابەتدا و نەقل كردنی ووتەكانی بە تێگەیشتنی خۆی كە لەگەڵ عەقیدەی ئیمام أحمد یەک ناگرێتەوە باس دەكات.

جا ئەوەی هۆكاری كەوتنە هەڵەی ابن تيمية-یە لە بابەتی تەكفیر نەكردنی جەهمیەكان بە معین ئەم ڕووداوانەی ئیمام أحمد-ە لەگەڵ ئەم سێ خەلیفەیەدا كە ابن تيمية كردوویەتی بە ئەصل لە بابەتەكەدا و لەسەر ئەم ئەصلە تەكفیر نەكردنی جەهمیەكان بە معین بنیات ناوە،

ئەمەشی داوەتە پاڵ سەلەف بە گشتی نەک تەنها ئیمام أحمد، جا ئیمام أحمد پێکاویەتی یان نەیپێکاوە، تەکفیری کردوون یان نەیکردوون، خروجی کردووە یان نەیکردووە، موسڵمان خۆی بەم ڕووداوە تایبەتانەوە بەند ناکات و ئەصلی بابەتەکەی لەسەر بنیات بنێ، چونکە پێش لەدایکبوونی ئیمام أحمد حوکمدان لەسەر جەهمیەکان یەکلا بۆتەوە لەلای ئەهلی سوننە.

# النجاشي ﷺ نموونەیەکی تر

ئەمڕۆ لەلای مەدخەلیەکان النجاشي ﷺ بۆتە قەلغانێک بەهۆیەوە بەرگری لە کوفری طاغوتەکان دەکەن، دەڵێن ئەوەتا النجاشي حوکمی بە قورئان نەکردووە و تەکفیریش نەکراوە، کەواتە ئەوانەی ئەمڕۆش کە حوکم بە قورئان ناکەن تەکفیر ناکرێن، ابن تیمیة دووبارە ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە دروستکردنی ئەم گومانە، بگرە ئەصلی ئەم گومانەی مەدخەلیەکان لە ووتەی ابن تیمیة سەرچاوەی گرتووە.

**ابن تیمیة** دەڵێ: **النجاشي نەیدەتوانی حوکم بە قورئان بکات چونکە قەومەکەی بەم کارەی ڕازی نەدەبوون.** [مجموع الفتاوى : 218/19]

**ابن تیمیة** دەڵێ: **النجاشي ئەگەرچی پاشای نەصارا بوو بەڵام قەومەکەی گوێڕایەڵیان نەکرد لە هاتنە ناو ئیسلامەوە، بەڵکو ژمارەیەکی کەم لەگەڵی هاتنە ناو ئیسلامەوە، هەر بۆیە کاتێک مرد کەس نەبوو نوێژی لەسەر بکات، پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر کرد لە مەدینە، موسڵمانانی هێنایە دەرەوە بۆ المصلی جا ڕیزی کردن و نوێژی لەسەرکرد، وە هەواڵی مردنی پێدان ئەو ڕۆژەی کە مرد، فەرمووی: (برایە چاکەکەتان کە خەڵکی حەبەشە بوو مرد) جا النجاشي زۆربەی دروشمەکانی ئیسلامی ئەنجام نەدا چونکە نەیدەتوانی، نە هیجرەتی کرد نە جیهادی کرد نە حەجی کرد، بەڵکو ڕیوایەت کراوە کە پێنج نوێژە فەرزەکەشی نەکردووە و مانگی ڕەمەزانیش بە ڕۆژوو نەبووە و زەکاتی شەرعیشی نەداوە، چونکە ئەم شتانە لای قەومەکەی دەردەکەوتن و سەرزەنشتیان دەکرد لەسەری ئەویش نەیدەتوانی موخالەفەیان بکات، وە ئێمە یەکلایی بۆتەوە لەلامان کە دەزانین النجاشي نەیدەتوانی حوکم بکات لەنێوان قەومەکەی بە قورئان.**

[مجموع الفتاوى : 217/19-218]

**ئیمام أحمد** دەڵێ: حدثنا يعقوب حدثنا أبي عن محمد بن إسحاق حدثني محمد بن مسلم بن عبيدالله بن شهاب عن أبي بكر بن عبدالرحمن بن الحارث بن هشام المخزومي عن أم سلمة ابنة أبي أمية

بن المغيرة خێزانى پێغەمبەرﷺ ووتى: **النجاشي بە موسڵمانەكانى ووت: چى دەڵێن دەربارەى عيسى ابن مريم ؟ جعفربن أبي طالب پێى ووت: ئەوە دەڵێين دەربارەى كە پێغەمبەرەكەمان هێناويەتى بۆمان، عيسى بەندەى الله و نێردراوى الله و ڕوح و ووشەى الله-يە بە مەريەمى پاكى داوە، النجاشي دەستى دايە زەوى چيلكە دارێكە هەڵگرتەوە پاشان ووتى: ئەوەى تۆ ووتت دەربارەى عيسى ابن مريم بەقەدەر ئەم چيلكە دارە لە ڕاستى لاى نەدا، جا كار بەدەستانى دەوروبەرى النجاشي هەناسەيەكى قوڵيان فڕێدا كاتێک النجاشي ئەمەى ووت، النجاشي ووتى: ڕاستيەكە ئاوايە والله ئەگەرچى ئێوەش توڕە بن و هەناسە فڕێدەن، بڕۆن ئێوە پارێزراون لە زەوى مندا، ئەوەى جوێنتان پێ بدات غەرامەى دەكەم پاشان ئەوەى جوێنتان پێ بدات غەرامەى دەكەم پاشان ئەوەى جوێنتان پێ بدات غەرامەى دەكەم، حەز ناكەم چيايەک لە زێڕم هەبێت لە بەرامبەرى ئەوە يەكێک لە ئێوە ئەزيەت بدەم، دياريەكانى عمرو بن العاص و عبدالله بن أبي ربيعة بگەڕێننەوە بۆيان پێويستمان پێى نيە، الله بەرتيلى لێوەر نەگرتووم كاتێک مولكەكەى بۆ گەڕاندمەوە تا منيش بەرتيل وەربگرم لە بەرامبەر مولكەكەمدا. [مسند الإمام أحمد : 1740] (سەنەدەكەى حەسەنە).**

ووتم: كەسێک ئاوا بەبێ ترس لەلاى وەزير و دەوروبەرەكەى بڵێ عيسى كوڕى الله نيە و خواش نيە، بەڵكو بەندە و نێردراوى الله-يە، ئيتر لەوە دەترسێ نوێژ بكات و زەكات بدات و ڕۆژوو بگرێ ؟ لەكاتێكدا گەر دەسەڵاتيشى نەبێت دەتوانێ ئەم ڕوكنانە بە شاراوەيى ئەنجامى بدات، سەرەڕاى ئەوەش بە موسڵمانەكان دەڵێ بە ئارامى بژين لە ووڵاتەكەم ئەوەى قسەتان پێ بڵێ سزاى دەدەم ئيتر ترسى چى هەيە كە ابن تيمية باسى دەكات ؟ تەنانەت النجاشي حيسابى بۆ هرقل نەكردووە كە گەورەى هەموو ڕۆم بووە چ جاى لە ژێر دەستەكانى خۆى بترسێ !

**ابن القيم** باسى گەياندنى نامەى پێغەمبەرﷺ بۆ پاشاى عمان لە ڕێگاى عمرو بن العاص دەكات و دەڵێ: **پاشاى عمان ووتى: لەكوێ موسڵمان بوويت عمرو ؟ ووتم: لەلاى النجاشي، وە پێم ڕاگەياند كە النجاشي موسڵمان بووە، ووتى: قەومەكەى چيان لە مولكەكەى كرد ؟ ووتم: پێى ڕازى بوون و شوێنى كەوتن، ووتى: ئەى قەشەكانيان شوێنى كەوتن ؟ ووتم: بەڵێ، ووتى: سەير بكە ئەى عمرو**

**بزانە چی دەڵێی ! هیچ سیفەتێک لە پیاودا ناشرین و ئابڕوبەرتر نیە لە درۆ، ووتم: درۆم نەکردووە، وە لە دینی ئێمە درۆ بە حەلال نازانین، پاشان ووتی: پێم وانیە هرقل زانیبێتی کە النجاشي موسڵمان بووە، ووتم: دەزانێ، ووتی: بەچی ئەمەت زانی ؟ ووتم: النجاشي باجی بۆ هرقل دەنارد، کاتێک موسڵمان بوو باوەڕی بە محمد ﷺ کرد ووتی: نەخێر والله گەر هرقل داوای درهەمێکیشم لێ بکات پێی نادەم، ئەم ووتەیەی النجاشي گەیشت بە هرقل، یناق برای هرقل بە هرقل-ی ووت: وازلە بەندەکەت دەهێنی کە باجت بۆ نانێرێت و چۆتە سەر دینێکی نوێ ؟ هرقل ووتی: پیاوێکە حەزی چۆتە دینێک و هەڵیبژاردووە بۆخۆی چی لێ بکەم ؟ والله گەر لەبەر دەست گرتن نەبێ بە مولکەکەم ئەوا منیش وەک النجاشي دەکەم، پاشای عمان ووتی: سەیر بکە بزانە چی دەڵێی ئەی عمرو ! ووتم: والله ڕاستم پێ وتووی.** [زاد المعاد : 3/877-878]

ووتم: جا گەر النجاشي لە هرقل نەترسێ کە گەورەی ڕۆم بووە لە قەومەکەی خۆی دەترسێ ؟! لێرەدا مەبەستم ئەوە نیە کە ابن تیمیة وەک مەدخەلیەکان نیشان بدەم، بەڵام بەهۆی ووتەکانی دەربارەی خەلیفە عەبباسیەکان و النجاشي مەدخەلیەکان دڵیان خۆشکردووە دەیکەن بە قەلغان بۆ بەرگری کردن لە طاغوتەکان ئەگینا ابن تیمیة هەمیشە لە کێشە و ناکۆکی دابووە لەگەڵ کار بەدەستانی سەردەکەمەی خۆی.

## گومانی پێنجەم:
# پێویست ناكات باسی مردووەكان بكەین

ئەمەش یەكێكە لە زەقترین گومانەكان كە دوای هێنانی تەواوی بەڵگەكان و ڕەددانەوەی گومانەكانیان ئیتر كە هیچیان پێ نامێنێت دەڵێن: ئەم زانایانەی پێشوو كە كوفریان هەبووە سەدان ساڵە مردوون ئێمە چ پەیوەندیمان هەیە پێیانەوە باسی كوفرەكانیان بكەین، الله داوای نەكردووە لە عەقیدەی كەسانی پێش خۆمان بكۆڵینەوە بزانین موسڵمان بوونە یان كافر، گریمان كوفریشیان هەبێت كێ ناڵێ پێش مردنیان تەوبەیان نەكردووە بەڵام ئێمە ئاگادار نین، الله تعالى فەرموویەتی: ﴿تِلۡكَ أُمَّةٞ قَدۡ خَلَتۡۖ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَلَكُم مَّا كَسَبۡتُمۡۖ وَلَا تُسۡـَٔلُونَ عَمَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ واتا: ئەمانە ئوممەتێک بوون ڕۆیشتن، ئەوەی كردوویانە بە چاكە و خراپە دێتەوە ڕێگایان، ئێوە بەرپرسیان نین لە كار وكردەوەی ئەوان، چاكیان بۆ خۆیان و خراپیان بۆ خۆیان، نە چاكەكانیان سوود بە ئێوە دەگەیەنێت نە خراپەكانیان زیان بە ئێوە دەگەیەنێت، هەر كەسە و كاروكردەوەی خۆی، جا ئەم ئایەتە دەكەن بە بەڵگە بۆ ئەوەی كە باسی كوفرە زانا كۆنەكان نەكەین.

بە چەند خاڵێک وەڵامی ئەم گومانە دەدەینەوە:

**یەكەم:** ئەم ئایاتە بۆ ڕەددانەوەی یەهودییەكانە كە شانازیان بە پێغەمبەرانی وەک إبراهیم و إسحاق ویعقوب و كوڕەكانی یعقوب دەكرد عليهم السلام الله تعالى پێی فەرموون شانازی بەوان مەكەن، ئەوەی ئەوان كردوویانە بۆ خۆیان ئەوەی ئێوەش دەیكەن بۆ خۆتان، ئەمە لە لایەنی تایبەتی ئایەتەكە، لایەنە گشتیەشی وەک لە تەفسیرەكەیدا ووتمان هەر كەس كاری خۆی بۆخۆی چاكە و خراپەی كەس سود و زیانی بۆ تۆ نیە و تۆ لێی بەرپرسیار نیت.

ئەگەرچی دەووترێ ئیمام أحمد یان زانای تر دەربارەی خیلافی نێوان هاوەڵان كە پرسیاری لێكراوە ئەم ئایەتەی خوێندۆتەوە، ئێمەش دەڵێین ئەمە شتێكی باشە و بگرە واجبە چونكە بۆمان نیە قسە لە فیتنەی نێوان هاوەڵان بكەین، بەڵام ئایا خودی ئیمام أحمد كە باس دێتە أبو حنیفة یان كافر

و گومڕاكانی تر ئایا ئەم ئایەتە دەخوێنێت ؟ یان بە پێچەوانەوە قسەی زۆری لە دژیان دەكات ؟ بۆیە ئەم ئایەتە نابێتە بەڵگە لەدژی  قسەكردن لەسەر كافر وبیدعەچی وگومڕاكان بەهیچ شێوەیەک.

**دووەم:** أبو حنيفة كەسێک نیە كە ناو و مەزهەبەكەی بەسەر چوو بێت و كەس باسی نەكات، بەڵكو ئێستاش زۆربەی وولاتانی بەناو ئیسلامی حەنەفی مەزهەبن، هەمیشە ناوی أبو حنيفة لەپاڵ سێ ئیمامەكەی تر دێت و بە چوار ئیمامەكە ناسراون كە حاشا أبو حنيفة ئیمام بێت، بۆیە ئێمە باسی كەسێک ناكەین كە كاریگەری بەسەر موسڵماناندا نەبێت بەڵكو باسی كەسێک دەكەین كە سەركردە بووە لە ئیرجائدا و ئێستاش دەیبینن مورجیئە چ دەردێكە بۆ ئوممەتی ئیسلام، باسی كەسێک دەكەین كە مەزهەبەكەی زۆر لە بارە بۆ دروستبوونی بیدعە و مانەوەی بیدعەچی و گومڕاكاندا تێیدا وەک ابن تيمية-ش باسیكرد أصولی أبو حنيفة نەفی بیدعە ناكات ئەگەرچی ئیثباتیشی نەكات هەر بۆیە مەزهەبەكەی لە هەموو ئەهلی بیدعەكان پێكدێت، بۆیە دەبینین بە دەگمەن كەسێک هەیە ماتوریدی بێت و حەنەفی نەبێت، بگرە فیتنەی خلق القرآن لە ڕەحمی أبو حنيفة وحەنەفیەكانەوە هاتە دەرەوە كە بشر المريسي سەركردایەتی كرد دوای الجعد والجهم وەک باسیشمان كرد بشر المريسي حەنەفی مەزهەب بوو، بۆیە ئەمڕۆ ئەوەی مورجیئەیە دەتوانێ بڵێ أبو حنيفة پێشەوامە، ئەوەی بڵێ قورئان مەخلوقە دەتوانێ بڵێ أبو حنيفة پێشەوامە، ئەوەی جەهمیەتی تێدا بێت لە تەكفیردا دەتوانێ بڵێ أبو حنيفة پێشەوامە، ئەوەی فەتوا بە ڕەئی خۆی بدات و فەرموودە ڕەت بكاتەوە بە عەقڵی خۆیی و گاڵتە و بێ ڕێزی بەرامبەر بە فەرموودە بكات دەتوانێ بڵێ أبو حنيفة پێشەوامە، ئەوەی فێڵ لە شەرعدا بەكاربهێنێت وحەرام وحەلالی پێ بگۆڕێت دەتوانێ بڵێ أبو حنيفة پێشەوامە، ئەوەی كە خروج لە موسڵمانان دەكات أبو حنيفة بە پێشەوای خۆی دەزانێت، داخەكەم موسڵمانانی ئەمڕۆ هێندە تامەزرۆی حوكمی ئیسلام و لادانی ئەم طاغوتانەن وایان لێهاتووە خروجكردنی أبو حنيفة بە فەزیلەت بۆی حیساب دەكەن بە حیسابی ئەمڕۆی خۆیان لە بابەتەكە دەڕوانن، ئیتر مادام أبو حنيفة بەلای تۆوە یەكێكە لە چوار

پێشەواکەی ئەهلی سوننە ئەوا ڕێگا بەم کافر و گومڕایانەش بدە بیکەن بە پێشەوای خۆیان، گەر دەڵێی نەخێر لە هەڵەدا شوێنی ناکەوین کەواتە ڕێگەمان بدە هەڵەکانی ڕوون بکەینەوە تا خەڵک بیناسێت، گەر دەڵێی من موسڵمانم و عەقیدەم سوننیە لە هیچ هەڵەیەکدا شوێنی ناکەوم و کوفر وبیدعەکانی بۆ من کێشە دروست ناکات و پێی هەڵناخەڵەتێم، دەپرسم: ئەی بۆ کە باسی هەڵەکانی دەکەین دەمارگیریت توش دەبێ و دونیا دەدەی بەیەکدا ؟ بۆ پێت وایە ئەوەی قسە لە کوفری ئەم زانایانە بکات زندیقە جاسوسە خەواریجە گومڕایە فیتنە چیە خێری پێوە نیە ؟ بۆ پێت خۆش نیە سەلەف چیان ووتوە دەربارەی أبو حنیفة ئێمەش بڵاوی بکەینەوە و شوێنی سەلەف بکەوین ؟ کەواتە بزانە تۆش ئەگەرچی بە کوفر و بیدعەکانی أبو حنیفة هەڵنەخەڵەتاوی و شوێنی نەکەوتووی بەڵام خۆشەویستی أبو حنیفة و زانا کافرەکانی تر دڵی داگرتووی بۆیە حەز ناکەیت بە چاکە و وەسفی گەورە زیاتر بە هیچ شتێکی تر باس بکرێن، گەر دەڵێی خۆ کەس لە ئێمە پێی گومڕا نەبووە ئیتر بۆ  باس بکرێ، ئەوا دەڵێم ئەوەندە گومڕاییە بەسە بۆ تۆ کە تەواو دژی سەلەف وەستاوی دەربارەی أبو حنیفة، ئەوان تەکفیر و تەبدیعی دەکەن و بە پێشەوای گومڕاکانی دەزانن، کەچی تۆ کردووتە بە ئیمامی ئەهلی سوننە و وەلاء و بەڕائی لەسەر بنیات دەنێی، ئایا لەمە گومڕابوون زیاتر چی هەیە ؟ کەسێک لە سەردەمی سەلەف ئەمە حاڵی بێت کە لە بەشی یەکەم بینیتان، کەچی لەم سەردەمەدا بۆتە ئیمام و ئەوەی قسەی لەسەر بکات نیشانەی ناخ پیسیەتی و گومانی خراپی پێ دەبردرێ وەک بڵێی دەیەوێ موسڵمانان بخاتە تەڵەیەکەوە و فیتنەیەکی ئاوا دروست بکات کە ئەوسەری دیار نەبێت، لەکاتێکدا هەموو چەکی دەستی ئەو کەسە ئەوەیە کە دەڵێ سەلەف ئاوای ووتوە دەربارەی أبو حنیفة ڕەحمەتتان لێبێت با بگەڕێینەوە بۆ ووتەی سەلەف، کافر وگومڕاکان نەکەین بە پێشەوا و گەورەیان نەکەین، جا أبو حنیفة بێت یان زاناکانی تر کە کوفریان هەیە گەر تۆی موسڵمان بە کتێب و قسەکانی گومڕا نەبیت ئەوا ئەمڕۆ بە ملیۆنەها کەس پێیان گومڕا بوونە و توشی کوفر بوونە بۆیە تۆ تەنها لەچاوی خۆتەوە مەڕوانە، کە تۆ پێت وایە النووي و ابن حجر و هاوشێوەکانی ئیمامن و لە هەڵەکاندا شوێنیان ناکەویت ئەوا لە بەرامبەردا ملیۆنەها ئەشعەری و سۆفی بەهۆی ووتەکانی ئەوان توشی کوفر بوونە، بۆ وائەزانی الله تعالی تەنها بەگوێرەی تۆ حیساب

لەگەڵ بەندەکانی دەکات ؟ ئاساییە ملیۆنەها کەس پێی کافر و گومڕا بن گرنگ تۆی موسڵمان پێی گومڕا نەبوویت ئیتر هیچی لەسەر نامێنێت؟ یان هەیە دەڵێ ئەو زانایانەی پێشوو کە کوفریان هەیە باسی کوفرەکانیان ناکەین و بە موسڵمانیان دەزانین و ڕەحمەتیان بۆ دەنێرین و باسی چاکەکانیان دەکەین، بەڵام کاتێک بینیمان کەسێک پێی گومڕا بووە و بە ووتەکانی هەڵخەڵەتاوە ئەوکات هەڵەکانی بۆ ئەم کەسە باس دەکەین ! ئەمانە کۆمەڵێک ووتەن کە تەنها هەوا و ئارەزوو دروستی کردوون هیچ سەلەفێکیان نیە لەم ووتانەدا حاشا زانایەکی سەلەف هەبێ بڵێ فلان زانا کوفری هەیە بەڵام ئیمامە و ڕەحمەتی بۆ دەنێرین و بە چاکە باسی دەکەین و تەکفیری ناکەین کەی بینیمان کەسێک پێی گومڕا بووە ئەوکات هەڵەکانی باس دەکەین ! ئەمە پارچەیەکە لە خۆهەڵخەڵەتاندن و فرو فێڵ و خۆڵ کردنەوە چاوی خەڵک حاشا دینی ئیسلام بەریيە لەم کارانە.

**سێیەم:** کە دەڵێن ڕەنگە پێش مردنی تەوبەی کردبێ ئێمە نەزانین بۆیە تەکفیری ناکەین، ئایا بەڵگەتان هەیە بۆ ئەم قسەیە لە قورئان و سوننەتدا ؟ ئایا هیچ سەلەفێکتان هەیە لەم کارەدا؟ بێگومان هیچ بەڵگەیەکتان بەدەستەوە نیە بۆ ئەم قسەیەی کە داتانهێناوە، تەنها تەقلیدکردنەوەی الذهبي و الشوكاني-ە کە الذهبي شتێک نیە لەلای بەناوی تەکفیر وەک خۆشی دانی پێ دانا کە هەموو ئەهلی قیبلە بە موسڵمان دەزانێت ئەگەرچی هەر عەقیدە و مەزهەبێکیان هەبێت مادام هەموویان باوەڕیان بە یەک خوا هەیە کە اللە-یە، الشوكاني-ش پێشتر باسمان کرد کە توقف دەکات دەربارەی قورئان ئەمەش کوفرە هەروەها زۆر هەڵەی عەقیدەیی تری هەیە کە ئێرە جێگای باسکردنی نیە، جا کەواتە مادام بەڵگەتان نەبوو ووتەکە لە ئەصلەوە باطلە، وە ئەگەر هەر سوور بن لەسەر ئەوەی کە دەست بەم ووتەیە بگرن ئەوا مولزەمتان دەکات بەوەی کە هەر لە سەردەمی سەرەتای ئیسلامەوە تا ئێستا هیچ کەسێک بە کافر نەزانن چونکە ئەوانەی مردوون تۆ لەلایان نەبوویت و ئاگاداری ناو دڵیان نیت چووزانی پێش ئەوەی بمرن تەوبەیان نەکردووە ؟ کەواتە کەس بە کافر مەزانە تا قیامەت چونکە لەوانەیە هەموو کەسێک پێش مردن تەوبە بکات، جا مادام ئەم دەرگایەت کردۆتەوە دەبێت بۆ هەموو کافرێکی بکەیتەوە، جا ئێستا کە زانیتان توشی ئەم ئیلزام

كردنە دەبن دەڵێن: ناڵێین هەمووی دەڵێین هەندێكی، كەواتە دەركەوت ووتەكە لە هەوا و ئارەزوو سەری هەڵداوە، ئەو زانایانەی كە خۆشتان دەوێن و كتێبی بە سودیان هەیە تەكفیریان ناكەن بەم بیانووە، بەڵام زانای تر و خەڵكی تر كە ناودارنین و گەورە نەكراون تەكفیریان دەكەن، بۆ نموونە گوێچكەی پڕ بووە لە بیستنی ناوی النووي و ابن حجر دڵی نایەت تەكفیری بكات و ئەم بیانووەی بۆ دەهێنێتەوە، بەڵام الزمخشري ناناسێت كوفرەكانی بۆ باس بكە ڕێك تەكفیری دەكات، كەسێكی تر لەولاوە زۆر سودی لە الزمخشري دیوە لە بەلاغەتدا دڵی نایەت تەكفیری بكات و بیانووەكەی بۆ دەهێنێتەوە، القرطبي موفەسیر چونكە ناسراوە دڵی نایەت تەكفیری بكات و بیانووەكە دەیگرێتەوە بەڵام القرطبي فەرموودەناس كە شێخی القرطبي موفەسیرە تەكفیری دەكات گەر كوفرەكانی بۆ باس بكەیت چونكە ایناسێت، بڵێ أبو إسحاق الشيرازي و الرملي كافرن كێشەی نیە بەڵام بڵێ السیوطي كافرە ڕووی گرژ دەكات چونكە ناوی ئەوی زیاتر بیستووە، كەواتە ئەمە یارییەكی مندالانەیە لەسەر بنەمای خۆشویستنی تاكە كەسی بنیات نراوە ئەو زانایانەی كە سودم لێیان بینیوە یان ناویان لام گەورە كراوە تەكفیریان ناكەم ئەگەرچی كوفرەكانیشیان بزانم دەڵێم لەوانەیە تەوبەی كردبێ، بەڵام ئەوانەی كە نایان ناسم و ناوم زۆر نەبیستوون و گەورە نەكراون لەلام تەكفیریان دەكەم، هەیانە دەڵێ مادام زانا بووە من تەكفیری ناكەم جا هەر كەسێك بێت چونكە گۆشتی زانایان ژەهراوییە ! جا كە دەڵێن مادام مردووە نازانین تەوبەی كردووە یان نا بۆیە تەكفیری ناكەین، ئەم قسەیە شەرعی نیە چونكە ئەوەی كوفری بە ئاشكرا لێدەركەوت دەبێ تەوبەشی بە ئاشكرا لێدەركەوێ ئینجا دەست هەڵدەگرین لە تەكفیر كردنی، ئەو زانایانەی ئێمە تەكفیریان دەكەین كوفریان لەسەر چەسپاوە و تەوبە كردنیان نەچەسپاوە ئیتر بەچی ئەم یەقینە لادەدەن بە گومان ؟ خۆ ئەم قاعیدەیەتان بیستووە یەقین بە گومان لاناچێت، هەروەك چۆن موسڵمانێك كە بە یەقینی ئیسلامەتی چەسپاوە بە گومان ئیسلامەتی لەسەر لاناچێت، ئەوەش كە بە یەقینی كوفری لەسەر چەسپاوە بە گومان كوفری لەسەر لاناچێت، بەڵام پێم سەیرە موسڵمانان تەنها لە جۆری یەكەم بەڵگە بەم قاعیدەیە دەهێننەوە لە جۆری دووەمدا تەواو دژی قاعیدەكەن، جا ئەمەی ئەوان باسی دەكەن گومانیش نیە بەڵكو وەهمە لە خەیاڵی خۆیان دروستیان كردووە هیچ

ئەصلی نیە، کەسێک بەناوی زید موسڵمان بێت لەولاوە یەکێک بڵێ گوایە دەڵێن زید کوفری کردووە، ئەمە گومانە بۆیە بەم گومانە یەقینەکە لاناچێت و هەر موسڵمانانە لەلامان، بەهەمان شێوە زید کە کوفری لەسەر چەسپاوە تەکفیری دەکەین، لەولاوە یەکێک دەڵێ گوایە دەڵێن زید تەوبەی کردووە، ئەمە گومانە یەقینەکە لاناچێت بۆیە لەلامان هەر بە کافر حیسابە تا ئەو کاتەی بە یەقینی دەزانین تەوبەی کردووە، بەڵام ئەوەی دەربارەی ئەم زانایانە دەووترێ گومانیش نیە بەڵکو خەیاڵ بڵاویە، تۆ دەڵێی ئەمەتا کوفرەکانی ئەویش دەڵێ کێ ناڵێ تەوبەی نەکردووە ! جا گریمان بەر لە مردنی لەنێوان خۆیی و الله تەوبەی کردبێ ئەوا بەلای ئێمەوە هەر کافرە چونکە ئێمە حوکم لەسەر ڕواڵەت دەدەین پەیوەندیمان بە ناخەوە نیە، الله داوای لێنەکردووین حوکم لەسەر ناخ بدەین بەڵکو هەر ناتوانین حوکم بدەین لەسەر ناخ بۆیە گەر تەوبەشی کردبێ لەنێوان خۆیی و الله ئەوا لای الله موسڵمانە بەڵام ئێمە چونکە ئاگادار نین هەر بە کافری دەزانین و حوکم لەسەر ڕواڵەتەکەی دەدەین، جا خۆ گەر بێتو بە یەکێک لەو خاوەن گومانانە بڵێم: ئیمام أحمد کافرە، دەڵێ بۆ ؟ منیش دەڵێم: لەوانەیە پێش مردنی کوفرێکی کردبێ من ئاگادار نەبم بۆیە بە کافری دەزانم! بێگومان توشی شێتی دەبێت بەم قسەیە، وە حەقی خۆیەتی، بەڵام خۆشی هەمان شت ئەنجام دەدات بەڵام بە پێچەوانەوە، پێی دەڵێی فلان زانا کافرە ئەوەتا کوفرەکانی، دەڵێ لای من موسڵمانە، دەڵێی بۆ ؟ دەڵێ کێ ناڵێ پێش مردنی تەوبەی نەکردووە بەڵام من نایزانم ! ئەی ئێستا حەقی ئێمە نیە توشی شێتی بین بەم قسەیەی ئێوە ؟

جا وەک تەنازولیش گەر بڵێین قسەکەتان دروستە کە دەڵێن ئەوانەی لە پێشوو مردوون لە زانایەکان تەکفیریان مەکەن چونکە ڕەنگە تەوبەیان کردبێ ئێمە نەزانین، دەپرسم: بۆ لەسەر ئەم قسەیە ناڕۆن و جێبەجێی ناکەن ؟ خۆتان ئەم بیانووە باطلەتان داهێناوە کەچی ڕاستگۆش نین بەرامبەری و جێبەجێی ناکەن، مەگەر ئێوە ناڵێن تەکفیری ناکەین نەوەک تەوبەی کردبێ ؟ ئێ باشە گەر ڕاست دەکەن بڵێن: فلان زانا کوفری هەیە گومڕایە بیدعەچیە ڕقم لێیەتی خۆشم ناوێت بە ئیمامی نازانم و خەڵکی لە کوفر و هەڵەکانی ئاگادار دەکەمەوە بەڵام تەکفیری ناکەم نەوەک تەوبەی کردبێ من نەیزانم، گەر ڕاستگۆن دەبێ ئاوا بڵێن چونکە کە الشوکاني باسی ئەم بیانووە بەتاڵە

دەكات دەڵێ: ئەوانەی كە پێش خۆمان مردوون و كوفریان هەیە دان بەوە دەنێین كە كارەكانیان كوفرن و پەردەپۆشی ناكەین بەڵكو دەڵێین كوفرە بەڵام تەكفیریان ناكەین نەوەك تەوبەیان كردبێ ئینجا ئایەتەكە دەكاتە بەڵگە كە سەرەتا هێنامان، ئەمە مانای ووتەكەی الشوكاني-ە الذهبي-ش پێش ئەو ووتەیەكی هاوشێوەی ئەمەی هەیە، جا ئێوە گەر دەست بە ووتەی ئەم دووانە دەگرن دەبێ بڵێن: فلان گومڕایە بیدعەچیە ڕقم لێیەتی خۆشم ناوێ ئەهلی سوننە نیە ئیمام نیە و هەڵەكانی باس بكەیت بەڵام تەنها بۆ تەكفیر كردنەوە بوەستی گوایە نەوەك تەوبەی كردبێ، جا دەپرسم ئایا ئێوە ئاوان ؟ بێگومان نەخێر ئێوە ڕاستگۆ نین بەرامبەر ئەم بیانووە باطلە و جێبەجێی ناكەن، چونكە بیانووەكە تەنها باسی تەكفیر نەكردن دەكات نەك شتی تر، كەچی ئێوە نەك هەر تەكفیریان ناكەن بگرە بە ئیمام ناویان دەبەن و ڕەحمەتیان بۆ دەنێرن و خۆشتان دەوێن و زۆر ڕێزیان دەگرن و بگرە زۆربەتان وەلاء و بەڕاء لەسەر ئەمانە دادەمەزرێنن دەڵێن ئەوەی ئەمانە تەكفیر بكات خەواریجە دەبێ بكوژرێ ئەمانە فیتنەن بەرۆكی ئوممەتیان گرتووە تەكفیری پێشەواكانمان دەكەن، باشترینیان دەڵێ خەواریج نین بەڵام شایستەی تەمبێ كردنن ! كەواتە درۆتان كرد ئێوە ئەم بیانووە جێبەجێ ناكەن ئێوە تەنها بەیەك شت ڕازین جگە لەوە بە هیچی تر ڕازی نین ئەویش ئەوەیە كە بڵێین: هەموو ئەو زانایانەی كە كوفریان هەیە بە موسڵمان و ئیمامیان دەزانین و خۆشمان دەوێن و بەرگریان لێدەكەین و بە توندی دژی تەكفیر كردنیان دەوەستین، جگە لەمە بە هیچ شتێكی تر ڕازی نین زمانحاڵیشتان هەر ئەمە دەڵێت.

## گومانی شەشەم:

# بەهۆی تەکفیر کردنی زانایان دەبێ زۆرینەی موسڵمان تەکفیر بکەین

هەروەک زانیمان لەدوای سەدەی سێیەم ووردە ووردە أبو حنیفة گەورە کراوە تا وای لێهات لە پڕێک بووە کوڕێک، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە کاریگەری دروست بکات بەسەر سەدەکانی دواتر، ئەوەی ژیاوە و چاوی کردۆتەوە بیستوویەتی چوار مەزهەب هەیە لەناو ئەهلی سوننەدا سەر مەزهەبەکانیش ئەمانەن: أبو حنیفة ومالك والشافعي وأحمد، ئیتر ناوی أبو حنیفة هەر لەسەر دەم بووە و لە کتێبەکاندا مەزهەبەکەی سەنگی بۆ دانراوە وهەمان حیسابی سێ سەر مەزهەبەکەی تری بۆ کراوە، بۆیە دەبینین لەلای زۆربەی زانا موسڵمانەکانی دوای سەدەی سێیەم أبو حنیفة بە ئیمام دانراوە تا دەگاتە ئەمڕۆش موسڵمانان هەر بە ئیمامی دەزانن، بەهەمان شێوە ئەو زانایانەی کە لەدوای سەدەی سێیەم ژیاون و توشی کوفر یان بیدعە بوونە بە دەگمەن دەبینیت ئەمڕۆ یەکێکیان بە کافر یان بیدعەچی ناو ببرێ هەمووی کراوە بە ئیمام، جا موسڵمانێکی حەق ویست کە ئەم بەڵگانەی نیشانەی دەدەیت دەربارەی أبو حنیفة و زاناکانی تر کوفر و بیدعە وگومڕاییەکانی ئەوانی بۆ ڕوون دەکەیتەوە، دەڵێ من أبو حنیفة و زاناکانی تر بە کافر دەزانم، بەڵام دواتر سەیر دەکات ابن تیمیة و قوتابیەکانی و نەجدییەکان و موسڵمانانی ئەمڕۆش تەکفیریان ناکەن و بە ئیمام ناویان دەبەن خەریکە جۆرێک لە ڕقی بۆ دروست بێت بەرامبەریان ئیتر دەکات بە موناقەشە لەگەڵیان تا وای لێدێت دەڵێ ئێوە ئەم جۆرە زانایانە تەکفیر ناکەن و بە ئیمامیان دەزانن سەرەڕای زانینی کوفرەکانیان ؟ کەواتە ئێوەش کافرن وەک ئەوان، دواتر سەیری حاڵی خۆی دەکات زۆربەی موسڵمانەکانی دەوروبەری ئەم زانایانە بە ئیمام دەزانن خەریکە فکرەی تەکفیر کردنی ئەوانیشی بۆ دروست بێ، ئیتر کە بیر لە هەموو ئەم شتانە دەکاتەوە و سەیری حاڵی پێشووی خۆی دەکات دەگات بەو ئەنجامەی کە تەکفیر کردنی أبو حنیفة و زاناکانی تر کارەساتێکی گەورەیە و فیتنەی بەدوا دادێت وات لێدەکات هەرچی زانا و موسڵمان هەیە تەکفیریان بکەیت بەهۆیەوە وای لێدێت کەس

لە دەستت دەربازی نابێت مەگەر تەنها ئەوانەی کە وەک خۆت تەکفیری ئەو زانایانە دەکەن کە کوفریان هەیە، بۆیە بیرلەوە دەکاتەوە کە چۆن خۆی لەم تەنگژەیە دەربازبکات، ناچار دەگەڕێتەوە بۆ حاڵی پێشووی دەڵێ أبو حنيفة و زاناکانی تریش کە کوفریان هەیە تەکفیریان ناکەم و تێکەڵی ئەم باسانە نابم تا بە دووربم لەم فیتنەیەی پێشوو، ئەم حاڵەتە خۆم لە کەسێکم بیستووە کە ئاوای بەسەر هاتووە ئەگەرچی ئەمە حاڵی زۆرینەیە بەڵام وەک نموونە ئەمەم لایە.

لە وەڵامی ئەم گومانەدا دەڵێین:

برا و خوشکی موسڵمان تۆ ئەو کاتە لە عەقیدەکەت بترسە کە کوفری کەسێک وەک ڕۆژی ڕووناک دیارە لێتەوە و دەزانی تەوبەشی نەکردووە کەچی هەر بە موسڵمانی دەزانیت و بگرە بە ئیمام وەسفی دەکەیت و بەرگری لێدەکەیت، بەڕاستی ئەم کاتە حەقە کە لە عەقیدەکەت بترسی و بڵێی گەر الله تعالى لە قیامەت لێم بپرسێ بۆ فلانت تەکفیر نەکرد کە کوفرەکانیت هەمووی دەزانی ؟ چی وەڵام بدەمەوە ؟ بڵێم شوێنی فلان زانا کەوتم ئەو ووتی ئیمامە منیش کوێرانە شوێنی کەوتم ووتم مادام تۆ ووتت ئیمامە کوفریشی هەبێت لای منیش هەر ئیمامە، یان شوێنی زۆرینە کەوتم زۆربەی خەڵکی لەسەر ئەم حاڵەی من بوون، ئەی مەگەر الله تعالى لە چەندین شوێنی قورئاندا باسی زۆرینەی نەکردووە بە خراپە و زەم کردن ؟ بگرە ناوی زۆرینە نەهاتووە ئیللا بە زەم نەبێت، جا ئەی موسڵمان لەم حاڵەتەدا لە عەقیدەکەت بترسە بە تایبەتی کە هەڵوەشێنەرەوەی سێیەم تایبەتە بەمە، وە هیوادارم ئەوانەی کە کوفری زاناکان دەزانن و کوێرانە بەرگریان لێدەکەن و گەورەیان دەکەن و بەرزیان دەکەنەوە بەسەر ئوممەتدا لە قیامەت وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە (کوفرەکانیت دەزانی بۆ تەکفیرت نەکرد) ؟ جا ئایا وەڵامەکانیان بە کەڵکیان دێت و بۆیان دەبێت بە عوزر لەوێدا ؟ الله أعلم، جا بۆیە موسڵمان تۆ ئەو کاتە لەخۆت بترسە کە کەسانێک تەکفیر ناکەیت و بەرگرییان لێدەکەیت کە دڵنیای کوفریان هەیە، نەک ئەو کاتە لەخۆت بترسی کە تەکفیری خاوەن کوفرەکان دەکەیت، من پێم سەیرە ئەوکاتەی کە ئاگاداری کوفرەکانیانی بە موسڵمانیان دەزانی و خۆشت دەوێن زۆر هەست بە ئاسودەیی دەکەیت ! کەچی کاتێک کە تەسلیم

بە حەق دەبیت و تەكفیریان دەكەیت ئەوكات هەست بە ناڕەحەتی دەكەیت ! ئایا لەكامە باردا حەق وایە ناڕەحەت بیت ؟ لەو كاتەی كە خاوەن كوفرەكانت لێ بووەتە موسڵمان و ئیمام ؟ یان لەو كاتەی كە تەكفیریان دەكەیت ؟ فأي الفريقين أحق بالأمن ؟ ئایا كامەتان شایستەترن بەوەی كە ئاسودە بن بە عەقیدەكەیەوە ؟ تۆ كە بە خاوەن كوفر دەڵێی كافر؟ یان ئەو كە بە خاوەن كوفر دەڵێ ئیمام ؟ پاشان ئەم باسە گومان و تەئویلی زۆر تێدایە ئەوانەی تەكفیریان ناكەن زۆربەیان بەهۆی جەهلەوەیە و بەشێكیشیان تەئویلیان هەیە بەڵام تەئویلی نابەجێ بۆیە وا ئاسان نیە كە هەڵوەشێنەرەوەی سێیەم جێبەجێ بكەین لەسەریان و بڵێین أبو حنيفة یان فلان زانای كۆن كافرە ئەوەی تەكفیری نەكات ئەویش كافرە، خۆ ئێمە لە تەكفیر كردنی أبو حنيفة ووتەكانی سەلەفمان بە دەستەوەیە نەمانبینی سەلەف ئەو كەسانە تەكفیر بكەن كە أبو حنيفة بە كافر نازانن، جا بۆیە گومان و تەئویل لەم بابەتەدا یەكجار زۆر و بەهێزە بەتایبەتی كە دەبینی ئەم هەموو زانایە سەدە دوای سەدە هاتوون بە ئیمامی ناو دەبەن گومانەكە بەهێزتر دەكات، بەڵام داخەكەم ئێوە نەك هەر تەكفیری ناكەن بەڵكو ئامادەش نین بڵێن گومڕا و بیدعەچیە بگرە كردووتانە بە ئیمام كێشەكە گەورەكە لێرەدایە كاتێک بە ئیمامی دەزانیت بێگومان دژی ئەوانەش دەوەستیتەوە كە تەكفیری دەكەن یان تەبدیعی دەكەن واتا حەقت لێ دەبێت بە باطل و لەپێناوی باطل دەجەنگی، جا سەبارەت بەم گومانە گریمان ئەوەی أبو حنيفة و هاوشێوەكانی تەكفیر ناكات كافر بێت و هەڵوەشێنەرەوەی سێیەم بیگرێتەوە، كاتێک كەسی یەكەم دەكەوێتە كوفرەوە تۆ تەكفیری دەكەیت كە كوفرەكەت لەلا چەسپا بەڵام یەكێكی تر جاهیلە یان خاوەن گومان و تەئویلە تەكفیری ناكات، لێرەدا هەڵوەشێنەرەوەكە بۆ ئەو ترسی لەسەرە نەک بۆ تۆ، جا گریمان ئەوەی تەكفیری ناكات ئەویش كافر بێت، تۆ كەسی یەكەمت تەكفیر كرد ئیتر كەسێكی تر كە تەكفیری ناكات بەهەر گومان و تەئویلێک بێت ئەوا نێوان خۆیی و الله كە لە قیامەت عوزری چی بووە، بەڵام تۆ بە تەكفیر نەكردنت بۆ كەسی دووەم مەترسی هەڵوەشێنەرەوەی سێیەمت لەسەر نیە، گەر بڵێی ئەوەی أبو حنيفة تەكفیر نەكات دەبێ ئەویش تەكفیر بكەم ئەگینا خۆم كافر دەبم ئەوا ئەمە زنجیرەی تەكفیرە كە موعتەزیلە دایانهێناوە پێچەوانەی عەقیدەی ئەهلی سوننەیە، بۆیە كوفرت لەهەر زانایەک بینی

تەکفیری بکە بەڵام بۆ ئەو کەسەی کە تەکفیری ناکات بواری خیلاف بهێڵەوە تێیدا ئەگەرچی حەق بەتۆش بێت چونکە ئەگەرچی زانایان بازنەی عوزر هێنانەوە بۆیان تەسکترە چونکە جاهیل نین بەڵام گومان و تەئویلی هێندە زۆریان بۆ دروستکراوە زۆر زیاترە لە جاهیلەکە وە ئێمەش خۆمان کە بە شوێنکەوتەی سەلەف دەزانین شتێک ناکەین کە ئەوان نەیان کردبێ کەس لەوان نەیووتوە ئەوەی أبو حنیفة تەکفیر نەکات کافرە، بۆیە دەبینیت موسڵمانی ئەمڕۆ پیرەمێردێکی نەخوێندەواری جاهیل زۆر بە ئاسانی تەکفیر دەکات، بەڵام گەر کۆمەڵێک کوفری زانایەکی بۆ بژمێریت ئامادە نیە تەکفیری بکات بەهۆی زۆری گومانەکان کە دروستکراوە بۆ موسڵمانان، ئەمەش هەموو کاریگەری گەورەکردنی زاناکانە بەسەر خەڵکیەوە زۆربەی موسڵمانانی ئەمڕۆ ولله الحمد کە کوفر لە کەسێکی هاوسەردەمی خۆیان دەبینن دەست بەجێ تەکفیری دەکەن ئەگەرچی ئەم کەسەش لە هەموو ڕووێکدا عەقیدەی پاک بێت تەنها لەیەک بابەتدا کەوتبێتە کوفرەوە کەچی هەر تەکفیری دەکەن بگرە هەندێکجار لەوانەیە کەسێکی سەردەم تەکفیر بکەن بەهۆی بچووکتری شوبهەوە، بەڵام هەر هەمان ئەم موسڵمانە کاتێک ژمارەیەک کوفری زانا کۆنەکانی نیشان دەدەیت وەک مەدخەلیەکان پیشەی دەبێتە عوزر هێنانەوە بۆیان، چونکە کاریگەری دەوروبەر و سەردەمی لەسەرە ئەم زانا کۆنانە لەلای گەورە کراون، خۆ گەر بێتو هەر ئەو موسڵمانەی ئەمڕۆ کە زانایەکی سەردەمەکەی کە لە هەموو بابەتە عەقیدەییەکان هاوڕایەتی و کوفری بە طاغوت کردووە و پەرلەمان و دەنگدان و دیموکراسی بە کوفر دەزانێت و شیرکی نیە لە بابەتی گۆڕ و پیاوچاکان بەڵام لەیەک بابەتدا دەکەوێتە کوفرەوە ڕێک تەکفیری دەکات هەر چەند پێی بڵێی ئەم کەسە لە شتەکانی تردا هاوڕاتە سودی زۆر بووە کتێب یان ووتاری بە سودی هەیە قوربانی داوە لەم پێناوە، موسڵمانەکە گاڵتەی بەم قسانە دێت و دەڵێ ئەوەی بکەوێتە کوفرەوە کافرە جا هەر کەسێک بێت و هەر چی کردبێت، تەنانەت هەندێکجار ببینن ئەو کەسە لەگەڵ کافراندا تەنها وێنەی گرتووە زۆر توند دژی دەوەستن و قسەی لەسەر دەکەن هەیانە ڕەنگە تەنها بەمە تەکفیری بکات، بەڵام کە ئەم هەموو کوفرەی زانا کۆنەکان دەبینێت ئامادە نیە تەکفیریان بکات بگرە بەرگریشیان لێدەکات و دژی ئەو کەسانە دەوەستێ کە تەکفیری دەکەن چونکە کاریگەری سەردەم وای لێکردووە ناوی ئەم زانایانەی هەر بە

گەورە كراوی بیستووە جورئەت ناكات لەم بارودۆخە بێتە دەرەوە، بەڵام بۆ زاناكانی سەردەمی خۆی كە كەوتوونەتە ناو كوفر گاڵتەی بەم مەنهەجە دێت كە خۆی لەسەریەتی بەرامبەر زانا كۆنەكان، والله المستعان چ تێكەڵی و دژ بەیەك بوونێكە ئەم مەنهەجە ! هۆكارەكەشی هەمووی ترسی لادانە لە ووتەی شێخەكانیان.

## گومانی حەوتەم:

# مەزهەبی أبو حنيفة تا ئێستاش ماوەتەوە و سەنگی بۆ دانراوە

پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە قازی أبو یوسف قوتابیەکەی أبو حنیفة لە سەردەمی هارون الرشید کراوە بە گەورەی قازییەکان واتا لە هەموو شارەکان ئەو قازی دیاری دەکرد، بێگومان ئەوانەشی دەکرد بە قازی کە حەنەفین و بەپێی مەزهەبی أبو حنیفة حوکم و قەزاوەت دەکەن، ئەمەش وایکرد ئەم مەزهەبە زۆر تەشەنە بکات، پاشان دوای ئەوانیش عوسمانیەکان بەهەمان شێوە حەنەفی بوون و وولاتی زۆریان لەژێر دەست بوو کە حوکمیان بە مەزهەبی حەنەفی دەکرد ئەمەش وایکرد تا ئێستاش بڵاوترین مەزهەب لە جیهانی ئیسلامیدا لەسەر بنەمای زۆری شوێن و ژمارەی شوێنکەوتوان مەزهەبی حەنەفی بێت.

**المعلمي** لە وەڵامی تانەدانی الكوثري لە سفيان الثوري و الأوزاعي دەڵێ: **زانیمان چۆن مەزهەبەکەی ئێوە بڵاو بوویەوە:**

**یەکەم: پەیوەست بوون بەم مەزهەبە و خۆیان پێیەوە خەریک کرد چونکە هۆکاری نزیک بوونەوە بوو بۆ بە دەست هێنانی پلەوپایە بەبێ ماندوو بوون لە گەڕان بەدوای فەرموودەدا بە گوێگرتن و لەبەرکردن و گەڕان بەدوای حاڵی ڕاوییەکانی و عیللەتەکانی و جگە لەمانەش، چونکە بینیان گەر کەسێک شتێکی کەم لەمانە فێر بێت ئەوا بەسە بۆی کە دواتر بتوانێ بە ڕەئی خۆی فەتوا بدات و لەناکاو دەبێت بە خاوەنی پلەوپایە.**

**دووەم: هاوەڵەکەتان (واتا: أبو یوسف) پۆستی گەورەی قازییەکانی پێدرا، جا ئەوانیش سوور بوون لەسەر ئەوەی کە هیچ کەسێک نەکەن بە قازی لە شارێک لە شارەکانی ئیسلام ئیللا دەبێت لەسەر مەزهەبی خۆیان بێت، جا خەڵکیش حەزیان چوو بۆ ئەم مەزهەبە تا بکرێن بە قازی، جا پاشان قازییەکان هەوڵیان دەدا کە ئەم مەزهەبە بڵاو بکەنەوە لە هەموو شارەکاندا.**

**سێیەم: فیتنەی خلق القرآن لەسەر دەستی هاوەڵانی ئێوە بوو، وە لە خیلافەتی المأمون والمعتصم والواثق بەردەوام بوو، هێزی دەوڵەت هەمووی لەژێر دەسەڵاتی ئەوان بوو جا هەوڵیاندا بۆ بڵاو کردنەوەی مەزهەبەکەیان لە عەقیدە و فیقهدا لە هەموو شوێنێکدا، وە هەرکەسێک لە فیقهدا موخالەفەیانی کردبوایە پەلامەریان دەدا بەجۆرەها شێوە ئازاریان دەدا، هەر بۆیە پەلاماری أبو مسهر عبدالأعلى بن مسهر-یان دا زانای شام و میراتگری فیقهی الأوزاعي و ئیمام أحمد بن حنبل هەڵگری ئاڵای فیقهی حەدیث و أبو یعقوب البویطي جێگرەوەی الشافعي و ابن عبدالحكم و جگە لەویش لە زانا مالكیەكانی مصر، وە لە کتێبی (قضاة مصر) بەشێک لەو شتانەی تێدا هاتووە کە ئەنجامیان داوە لە مصر .....**

**چوارەم: غەیرە عەرەبەكان دەسەڵاتیان هەبوو بەسەر دەوڵەتدا، جا دەمارگیریان هەبوو بۆ مەزهەبەكەتان بەهۆی ڕەگەزایەتیەوە، وە بەهۆی هەبوونی فراوانی لە روخسەت و فێڵ کردن لە مەزهەبەكەتان.**

**پێنجەم: کۆمەڵێک دەوڵەتی غەیرە عەرەب بەدوای یەکتردا بوون.**

**شەشەم: هاوەڵانی ئێوە هەڵسان بە بانگەشەیەک کە هاوشێوەی نەبوو، لەم پێناوەشدا درۆیان حەلال کرد تەنانەت درۆکردن بە دەمی پێغەمبەر ﷺ هەروەک چۆن دەیبینن لەو کتێبانەی دەربارەی مەدحی أبو حنیفة نوسراون.**

**حەوتەم: ئەم کارەیان تەواو کرد لەسەر بنەمای هەڵە هەروەک کتێبی (التأنیب)ی الكوثري کە ڕۆڵی نموونەیەکی باڵا دەبینێت لەم هەڵانەدا، هەروەک چەند نموونەیەکم ڕوونکردەوە لەم هەڵانەدا لە کتێبی (الطلیعة) وە لەم کتێبەشدا، وە هەندێک لەم هەڵانە لەم ژیاننامەیەدا ڕوونم کردەوە. (واتا: ژیاننامەی سفیان الثوري). بڕوانە [التنكیل : 1/435-438]**

ووتم: مەبەستی لە غەیرە عەرەبەكان بە گشتی فارسە کە لەناوچەی خوراسان جێگیر بوون، ئەم ناوچەیەش لەو کاتەدا لە ئێرانەوە تا هیند دەڕۆیشت، وە شۆڕشی عەبباسیەكان دژی ئومەویەكان لە خوراسان سەری هەڵدا و ئەوان سەرکردایەتی ئەم شۆڕشەیان کرد بۆیە فارسەكان دەسەڵاتیان بەهێز بوو لە خیلافەتی عەبباسیەكاندا، وە لە هیچ شوێنێک بە قەدەر خوراسان مەزهەبی حەنەفی

بەهێز و بەربڵاو نیە تا ئێستاش، لەبەر ئەوەی أبو حنيفة بە ئەصل فارسە و خەڵكی شاری كابول-ە كە دەكاتە پایتەختی ئێستای ئەفغانستان ئەمە وایكرد فارسەكان مەیلیان بۆ مەزهەبەكەی هەبێت، وە خوراسانی ئەوكاتیش واتا ئێران و ئەفغانستان و پاكستان و توركمانستان و ئۆزبەكستان و كازاخستان و طاجیكستان و قیرغیزستان ئەم وڵاتانەش ئەوكات هەموویان فارس بوون و دراوسێی یەكترن و هاو سنوورن، بۆیە ناوچەیەكی زۆر لەبارە بۆ تەشەنە كردنی مەزهەبەكە بەبێ پچڕان بەهۆی لایەنی ڕەگەزایەتی و ئاسانكارییەكانی ناو مەزهەبەكە و چوونە ناو دەسەڵاتەوە، ئەمە مەبەستی المعلمي بوو لە ووتەكانیدا.

**مقبل بن هادي الوادعي دەڵێ: بەهۆی ئەوەی حەنەفیەكان دەسەڵاتی قەزایان هەبووە لە زۆربەی سەردەمەكان، دەبینی زۆرێك لە زانایان ناتوانن بە ڕاشكاوی تانە لە أبو حنيفة بدەن، ئەوەتا البيهقي لە كتێبی (مناقب الشافعي) لە ابن أبي حاتم تانەدان لە أبو حنيفة نەقل دەكات، ابن أبي حاتم بە ڕاشكاوی ناوی أبو حنيفة دەبات، البيهقي لەو نەقلی دەكات و دەڵێ: أبو فلان ووتی، ناوی أبو حنيفة بە ڕاشكاوی نابات، ئەوەتا ابن حجر لە كتێبی (التقريب) لە ژیاننامەی أبو حنيفة دەڵێ: فەقیهێكی ناودارە، ئەمەش لادانە لە بابەت لەلایەن ابن حجر-ەوە، چونكە ئەو باسی ئەم دەستەواژەیەی نەكردووە لە پێشەكی كتێبەكەدا، ئەم حوكمەش كە داویەتی لەسەر أبو حنيفة نە مانای جەرح دەدات نە مانای تەعدیل نەدات.** [نشر الصحيفة : 5-6]

ووتم: قسەكەی ڕاستە چونكە كتێبی (تقريب التهذيب) دەربارەی حاڵی ڕاوییەكانە لەڕووی فەرموودەوە، لەلای ابن حجر شاراوە نیە كە أبو حنيفة حاڵی چۆنە لە فەرموودەدا، ئیتر هاتووە باسی ئەوە دەكات فەقیهێكی ناودارە بۆ خۆدزینەوە لە تەزعیف كردنی، وە سەرەڕای ئەم هۆكارەش كە المعلمي و الوادعي باسیان كرد بەڕای من زۆربەی هەر خۆیان لەو ئاستەدا نین كە قسە لەسەر زاناكان بكەن، بۆ ئەم زانا كافر و بیدعەچیانە كەس گەورەی كردن جگە لە خەلەف ؟ خۆ گەر بە خراپەش باسیان نەكردبوایە دەیانتوانی گەورەی نەكەن، خۆ لە سەردەمی سەلەفیش قازییەكان حەنەفی بوون بەڵام سەلەف سڵیان نەكردەوە لە ووتنی حەق.

## گومانی هەشتەم:

# حوکمی ئیسلام نەماوە لە ئێستادا کەچی ئێوەش خەریکی زانا کۆنەکانن

ئەوانەی خۆشەویستی ئەم کافرانە لەگەڵ خوێنیان تێکەڵ بووە دوای ئەوەی بە بەڵگە بێ دەنگیان دەکەیت و ناتوانن وەڵامت بدەنەوە ئیتر ڕێگایەکی تر دەگرنە بەر بۆ سۆز جوڵاندنی خەڵک و دوور خستنەوەیان لە ڕاستیەکان، ئینجا دەست دەکەن بەم جۆرە قسانە:

حوکمی ئیسلام نەماوە خەڵک بێ ئاگایە لە تەوحید

کوفری پەرلەمان و دیموکراسی و دەنگدان و عەلمانیەت باوە لە ئێستادا

خەڵکی نازانن تەوحید چیە

ئێمە کێشەمان لەسەر گەڕاندنەوەی حوکمی ئیسلامە

کێشەمان لە تەوحیدی الأسماء والصفات و حاڵی زانا کۆنەکان نیە

خەڵکی بەم باسانەوە خەریک دەکەیت تا بیریان بۆ تەوحید نەچێت

بانگەوازی تەوحید تێکدەدەیت و خەڵکی بەم شتانەوە سەرقاڵ دەکەیت

کەی لە دار الإسلام ژیان ئەوکات ئەم باسانە بکەرەوە

ئێستا کەی کاتی ئەوەیە بزانین أبو حنيفة و فلان و علان عەقیدەیان چۆن بووە

ئێمە کێشەمان لەگەڵ طاغوتان و مەدخەلیەکان و ئیخوانەکان هەیە ...... هتد

ئیتر بەم جۆرە قسانە دەیانەوێ وات لێبکەن کە ئەم هەوڵ و تێکۆشانەی تۆ نەک هەر سوودی نیە بەڵکو زیانێکی گەورەی هەیە بۆ سەر بانگەوازی تەوحید.

لە وەڵامی ئەم هەموو گومانەدا دەڵێین:

بەڵێ ڕاستە ئێمە لە سەردەمێکدا دەژین کە حوکمی ئیسلام نەماوە و خەڵکی بێ ئاگان لە ئیسلام کەس ئینکاری لەم شتە ناکات، وە دەبێت پشکی شێر بەر بانگەوازی تەوحید بکەوێ لەم

سەردەمەدا بەڵام ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە دەست لە هەموو شتێک هەڵگریت و باسی هیچ نەکەیت جگە لە تەوحید ئەویش تەنها بەشێکی دیاریکراوی هەروەک هەندێک بە تەوحیدی حاکمیەت ناوی دەبەن ؟ بۆ مەگەر هەر فێربوونی تەوحید نیە موسڵمان بەرەو ئەوە ڕادەکێشێ کە بە کافر بڵێ کافر و نەیکات بە ئیمام و گەورەی نەکات ؟ وە لە لۆمەی لۆمەکارانیش نەترسێ ؟ یان پێتان وایە لە دەست بەتاڵیەوە موسڵمان ئەم بیرۆکانەی بۆ دێت ؟ دواتر بە درێژایی 1400 ساڵی ئەم دینە کە هەر سەردەمێک فیتنەیەک لە ئارا دابووە و خەڵکی پێی موبتەلا بوونە بەڵام نەمان بینیوە کە لە سەردەمێکدا هەموو کتێبەکان تەنها لەسەر ئەو بابەتە بنوسرێ کە خەڵکی خەریکین و بابەتی تر هەمووی پشتگوێ بخرێ، بەڵام کەس حاشا لەو ڕاستیەش ناکات کە تۆ دەبێت هەوڵی زیاتر بدەیت بۆ تیمار کردنی دەردە گەورەکان و زیاتر گرنگی بەو بدەیت، وەک دەووترێ گەر چویتە شارێک خەڵکی توشی فیتنەی ڕیبا ببون تۆش باسی زینات بۆ کردن ئەوا خیانەتت لێیان کردووە، بەڵێ ڕاستە تۆ لەم سەردەمەدا کە کوفرەی سەردەم کە بریتیە لە حوکم نەکردن بە قورئان هەموو وڵاتێکی گرتۆتەوە دەبێت عالیم و عەوام بەپێی توانای خۆیان کۆششی یەکەمیان بۆ ئەوە بێت کە خەڵکی ئاگادار بکەنەوە لەم کوفرە و زیاتر جەخت لە باسکردنی بکەن، بەڵام کەس ناڵێت عیلمی تەفسیر و فەرموودە و فیقھ باس مەکەن و مەیهێڵن تەنها خەریکی تەوحیدەکە بن، بۆیە ئەم قسە عاطفیە بۆ کەسێکی مەدخەلی بکەن کە مزگەوت و دەرس و دەورەی پێدراوە شەو و ڕۆژ باسی بابەتانێک دەکات کە ئەگەر خەڵکی لێی شارەزاش بن هەر کافرن، کەچی وازی لەم بابەتانە هێناوە کە خەڵکی پێی موسڵمان دەبێت و دەربازی دەبێت لە کوفر، نەک ئەم قسانە بەرەو ڕووی موسڵمانێک بکەن کە هەوڵ دەدات بەپێی توانا بۆ بانگکردنی خەڵک بۆ تەوحید و ڕوونکردنەوەی دینی ئیسلام وەک خۆی کە هەیە بەڵام هەست بەوەش دەکات کە زۆربەی موسڵمانان دوورن لە مەنهەجی سەلەف و موبتەلا بوونە بە مەنهەجە خوار وخێچەکەی خەلەف و معاصرین بۆیە دەیەوێت ئەم هەڵەیەش لەناو موسڵماندا ئاماژە پێبدات و چاکی بکاتەوە، ئێوە کاتێک ئەم قسانە بکەن کە هەموو بانگەواز لەسەر شانی ئەم کەسە وەستابێ بە سەرقاڵ بوونی ئەو بانگەواز بوەستێ، الحمدلله موسڵمانان زۆرن بەتایبەتی لە تۆڕە کۆمەڵاتیەکان کە شوێنێکی لەبارە بۆیان

كە بانگەوازی تێدا بكەن، بۆیە لەناو ئەم هەموو جەنجاڵی و قەڕەباڵغیەدا گەر موسڵمانێک كتێبێک بنوسێت دەربارەی زانایەک مانای ئەوە نیە تەوحیدی واز لێهێناوە و هەموو ژیانی تەرخان كردووە بۆ ڕوونكردنەوەی حاڵی ئەم زانایە، من باسی ئەزمونی خۆم دەكەم بۆتان ئەوە شەش مانگە خەریكی نوسینی ئەم كتێبەم، ئایا نوسینی ئەم كتێبە وای لە من كرد واز لە بانگەوازی تەوحید بهێنم ؟ ئایا ئیتر تەواو ناتوانم باسی كوفر بە طاغوت و كوفری حزبەكان و دیموكراسی و پەرلەمان و دەنگدان بكەن ؟ ئیتر ناتوانم باسی وەلاء و بەراء بكەم ؟ تەواو من لەم هەموو شتە بێبەش دەبم بەهۆی نوسینی ئەم كتێبە ؟ ئەمە چ بیانوویێكی لاواز و دۆڕاوە گرتووتانە بەر ، ئاخر من مۆبایلەكەم بە دەستمەوەیە لەیەک كاتژمێردا دەتوانم كوفری أبو حنیفة و كوفری مەدخەلیەكانیش پۆست بكەم، دەتوانم كوفری ئەشعەریيەكان وكوفری حكومەتیش پۆست بكەم، دەتوانم باسی كوفر لە تەوحیدی ئولوهیەت و كوفر لە تەوحیدی الأسماء والصفات بكەم، كوا ئەم ئیلزاماتانەی كە ئێوە باسی دەكەن بۆ لە من نایەتەدی ؟ بۆ دەتوانم لەیەک ڕۆژدا پۆستێک بكەم ڕەددی مەدخەلیەكان بدەمەوە لەهەمان ڕۆژدا پۆستێک بكەم ڕەددی خەواریجەكان بدەمەوە ؟ بۆ أبو حنیفة هەموو ژیانی داگیر نەكردووومە و لە هەموو بابەتێكی دانەبڕیوم ؟ وا خەریكم باسی حاڵەتێک دەكەم كە خۆم تێیدا دەژیم و مومارەسەی دەكەم ئیتر ئەم بیانووە دۆڕاوانە چیە باسی دەكەن گوایە گەر پۆستت كرد یان نامیلكەیەک یان كتێبێكت نوسی لەسەر زانایەكی كۆن ئیتر تۆ تەواو تا ژیانت ماوە ناتوانی باسی تەوحید وكوفری سەردەم بكەیت، پاشان چەند مانگێک خۆم خەریک بكەم بە نوسینی كتێبێک كە تەواوی ئەو باسانەی دەمەوێت تێیدا بنوسم باشترە لەوەی شەو و ڕۆژ خەریكی ئەم باسە بم وكاتم بە مشتومڕ بكوژم، ئیتر ئەوەی مشتومڕ بكات دەڵێم فەرموو ئەم كتێبە بخوێنەوە ئامادە نیم خولەكێک كاتم بە مشتومڕ كردن لەسەر أبو حنیفة بكوژم، سەبارەت بەتۆی خوێنەریش گەر هەر چەند خوێنەرێكی خراپ بیت ئەوا دەتوانی بە ماوەی مانگێک ئەم كتێبە بخوێنیتەوە، لێرەوەش زەمانت پێدەدەم كە ئەم كتێبە ڤایرۆس نیە بچێتە گیانتەوە و دوورت بخاتەوە لە باسكردنی تەوحید و شیرك بەڵكو گەر ئازا بیت دەتوانی بە هەفتەیەک بیخوێنیتەوە ئیتر قبوڵی ناوەڕۆكی كتێبەكە دەكەیت یان نا شتێكی ترە بەڵام دڵنیابە ڤایرۆس نیە هەموو كات و ژیانت

لێ داگیر بكات و بواری ئەوەت نەمێنێ چیتر قسە لەسەر كوفرەكانی سەردەم بكەیت، جا سەیرەكە لەوە دایە لە تۆڕە كۆمەڵاتیەكان زۆربەیان كاتێک دەبینن باسی تەفسیر یان فەرمووده یان فیقهـ یان جاری وا باسێكی دونیایی یان باسێكی كۆمیدی دەكرێت بەلایانەوە ئاساییە هیچ قسە ناكەن بەڵام كە دەبینن باسی أبو حنیفة یان هەر زانایەكی تر دەكرێت ڕێک دەڵێن: براكەم باسی تەوحید بكەیت باشتر نیە ؟ واتا زمانی حاڵیان دەڵێ باسی چی دەكەیت بیكە تەنها باسی ئەو زانایانە مەكە كە خۆشەویستیان لەگەڵ خوێنمان تێكەڵ بووە كە هیچیش دەربارەیان نازانین تەنها سەردەم وایكردووە لەلامان گەورە بكرێن، دواتر گریمان من كەسێكم تەنها لەو بوارە دەزانم تەنها لەوە قسە دەكەم، تۆ لە تەفسیر دەزانیت لەوە قسە دەكەیت، یەكێكی تر لە فەرمووده دەزانێت لەوە قسە دەكات هەركەسە و بەپێی زانست و توانای خۆی، فەرموون خۆ من دەرگام بە ڕووتان دانەخستووە هێندە باسی ئەو بابەتانە بكەن كە بە پێویستی دەزانن تا تواناتان تێدا نامێنێت، خۆ من ڕێگام لێ نەگرتوون ! فەرموون باسی حكومەت باسی پەرلەمان باسی حزبەكان باسی مەدخەلیەكان باسی ئیخوان باسی هەر شتێک بكەن كە پێتان خۆشە تا هێزتان تێدا نامێنێت باسی بكەن، واللە نە من نە كتێبەكەشم ڕێگر نیە لە بەردەمتان، ئێمە نابینە هۆكاری پەكخستنی بانگەوازی تەوحید بگرە لە زۆرێک لەوانە چالاكترین كە ئەم بیانووە دۆڕاوانە باس دەكەن، پاشان ئەم بابەتە شتێک نیە كە زانین و نەزانی وەک یەک بێت كە بووترێ زانینی سودی نیە و نەزانینی زیانی نیە، مەنهەجی سەلەف لە مامەڵە كردندا لەگەڵ كەسانی موخالیف زۆر غەریب كەوتووە بگرە قبوڵی ناكەن، مەنهەجی خەلەف لەگەڵ خوێنیان تێكەڵ بووە كە وایان لێهاتووە بڵێن فلان زانا بەڵێ كوفری هەیە بەڵام چونكە كتێبی بە سودی نوسیوە موسڵمانە ئیمامە تەكفیر ناكرێت بەكوێرایی چاوتان ئەوەشی باسی بكات بە خراپە شایستەی ئەوەیە بكوژرێ بەند بكرێ تەمێ بكرێ ...هتد، واللە ئەمە كارەساتێكی گەورەیە كە ئەمڕۆ موسڵمانان تێیكەوتوون بە بیانووی ئەوەی چونكە سەردەمەكە گۆڕاوە ئاساییە كافر بكەیت بە ئیمام گرنگ ئەو زانایە كێشەی بۆ تۆ نەبێت، لە گۆڕ پەرستی كوفری هەبێت لە تەوحیدی الأسماء والصفات كوفری هەبێت هیچ كێشە نیە بەلامانەوە هەر موسڵمانە مادام لە بابەتی طاغوتی حاكمیەت و حوكم بە قورئان دژی ئێمە نیە ئیتر كێشەمان لەگەڵی نیە !

واتا بابەتی تەكفیر بۆتە شەخصی بەپێی سەردەم و بەرژەوەندییەكان كافر و موسڵمان دابەش دەكرێت، ئەمرۆ من هەوڵی گەڕانەوەی حوكمی ئیسلام دەدەم هەموو گیانت كوفر بێت كێشەم لەگەڵت نیە مادام تۆ لەو بابەتەدا دژم نیت، بەڵام كەسێكی تر لە هەموو شتێكدا هاو عەقیدەم بێت لەیەك بابەت لەگەڵم نەبێت تەكفیری دەكەم جا حەز دەكەی دەورێكی باڵای هەبوو بێت لە بانگەوازی تەوحید و جیهاد، أبو محمد المقدسي بە نموونە كە چەندەها موجاهیدی پێ گەیاندووە بە كتێبە بە سودەكانی دیارترینیان الزرقاوي كە قوتابی خۆی بووە هەڵگیرسێنەری ئاگری جیهاد بوو لە عیراق، تا ئێستاش كتێبەكانی دەخوێننەوە بەڵام كە هاتە سەر تەلەفزیۆن لە بەرژەوەندی حكومەتی ئوردن قسەی كرد ئیتر حیسابیان بۆ هیچ لە كتێبەكانی نەكرد و تەكفیریان كرد، دەستان خۆش بێ ئاوا بن كوفرتان لەهەر كەسێك بینی تەكفیری بكەن، بەڵام كە دێتە سەر أبو حنيفة و القاضي عياض وابن حزم وابن الجوزي والقرطبي والنووي والعسقلاني والهيتمي والرملي والشيرازي والسيوطي والشوكاني و هاوشێوەكانیان كۆمەڵێك كوفریان بەدوای یەكتردا ڕیز بكە یان بە دەیان تەئویل و عوزریان بۆ دەهێنێتەوە كە دەتوانرا بۆ المقدسي بیهێننەوە بڵێن لەژێر فشاری حكومەت قسەی كردووە بەڵام المقدسي شمولی ناكات بەڵام ئەمانە شمولیان دەكات هەرچەندە كوفرەكانیان زۆرزەق بن و هیچ خیلافی تێدا نەبێت هەر موسڵمانن هەر ئیمامن بەوەش ناوەستین ئەوەی بێ ڕێزی بكات بەرامبەریان دەسەڵاتمان هەبێ بەسەریدا تەمبێ دەكەین دەسەڵاتیشمان نەبێت بەسەریدا بە نیزامی یان خەواریج یان غولات یان منداڵ یان رويبضة ناوی دەبەین بەپێی ئارەزووی خاوەن ووتەكە چ ناوێكی پێ خۆش بوو ئازادە دەری ببڕێ بەرامبەر موسڵمانانێك كە تەنها دەڵێن كافر مەكەن بە پێشەوای خۆتان و گەورەی مەكەن ! هەر هیچ نەبێت كە ئەم زانایانە بەم هەموو كوفرەیانەوە عوزرت  پێدان و ووتت هەر موسڵمانن، ئێ عوزر بە براكانیشت بدە بڵێ ئەگەرچی لە تەكفیر كردنیان هاوڕاتان نیم بەڵام هەر برای منن و كێشەم نیە لەگەڵتاندا، بڵێ خۆ من مادام كێشەم لەگەڵ كەسێك نەبێ كە كەوتۆتە ناو كوفرێكی بەواحەوە كێشەم لەگەڵ تۆش نیە كە لە عەقیدەدا هاوڕاین، ئەمە وەك بەراوردێك بۆ حاڵی ئێوە باس دەكەم كە مادام عوزرتان بەواندا بە ئێمەشی بدەن، ئەگینا هەرگیز من ناچمە بەرەی بەرگری كردن لەخۆم بەرامبەر ئێوە بەڵكو ئەوە

ئێوەن دەبێ بەرگری لەخۆتان بکەن نەک من، بەرگری لەم عەقیدە خوار و خێچەتان بکەن و وەڵاممان بدەنەوە و پێمان بڵێن لەسەر چ بنەمایەک ئەم کافرانەتان کردوون بە ئیمام و لەسەریان دێنە وەڵام و موسڵمانانی تری لەسەر دەکەن بە خەواریج ؟ گەر کەسێک هەبێت لەم نێوەندەدا حاڵی خراپ بێت ئەوا ئێوەن نەک ئێمە چونکە ناوی هەر زانایەکمان هێنا بێت و تەکفیرمان کردبێ بە بەڵگەوە کوفرەکانی لەلامانە هیچ پێویستیشمان بە تەئویل و پینەو پەڕۆ نیە لەم کارەدا، بەڵام ئێوە کە کۆمەڵێک کافرتان لەخۆتان کردووە بە ئیمام دەبێت کۆمەڵێک تەئویل و پینەو پەڕۆیان بۆ بکەن تا لە هەندێک کوفر دەربازیان بکەن لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێک کوفر دەرباز بوونی بۆ نیە مەگەر ئیللا بە سڕینەوە و لەناو بردنی کتێبەکانیان ئەم کوفرانەیان پەردەپۆش بکەن، جا لە هەموو بارێکدا هەڵوێستی ئێوە لاوازترە، گەر تۆ هەموو ئەم قسانەی کردم بە شتێکی زۆر ئاسایی دەزانیت و هیچ بەلاتەوە کێشە نیە کە ئەم بابەتە هەروەک خۆی بمێنێتەوە و تا قیامەت نەوە لە نەوە وەری گرێت کە ئەم زانایە کۆنانە ئەگەرچی کوفریشیان هەبێت ئەوا هەر پێشەوان ! ئەوا بەلای منەوە ئاسایی نیە و موصیبەتە دەبێت باس بکرێت و ڕوون بکرێتەوە هەر بۆیەش ئەم کتێبەم لەسەری نوسیوە تا أبو حنيفة ببێتە دەرگایەک بۆ هەموو ئەوانی تر، وە کە دەڵێن ئەم باسانە دامان دەبڕێت لە واقعی ئەمڕۆ، دەڵێم ئایا کەسێکی وەک ئیمام البخاري کە لە سەردەمێک ژیاوە خەواریج و رافیزە و جەهمی و موعتەزیلی لێ بووە دەچێت کتێب دەنوسێت دەربارەی (بر الوالدين) و (القراءة خلف الإمام) و (رفع اليدين في الصلاة) ئەم کتێبانە وای لێکرد کە لە واقعی سەردەمەکەی خۆی دابڕێت ؟ یان وا لە خوێنەر بکات بەم باسە فیقهیانەوە سەرقاڵ بێت و ئاگای لە کوفر و بیدعەی گروپەکانی تر نەمێنێت ؟ یان شێخ محمد بن عبدالوهاب کە لە سەردەمەکەی ئەودا بت پەرستی وەک سەردەمی سەرەتای ئیسلام بووە بگرە خراپتریش، کەچی دەچێت دەربارەی (أحاديث في الفتن والحوادث) و (أحكام الصلاة) و (آداب المشي إلى الصلاة) و (شروط الصلاة وأركانها وواجباتها) و (فضائل القرآن) دەنوسێت، ئایا ئەم نامیلکانە وای لە خۆیی و خەڵکیش کرد کە دوور کەونەوە لە بانگەوازی تەوحید ؟ والله بیانووەکانتان زۆر دۆڕاوە تەنها لە نەبوونی بەڵگەیە وادەکات ئەم جۆرە بیانووانە بگرن ئەگینا ئەم کتێبە زیانی بۆ من و بۆ خوێنەر چیە جگە لەوەی کە شارەزا بێت وبزانێت

سەلەف چۆن مامەڵەیان لەگەڵ کەسی موخالیف کردووە لە بابەتی کوفر و بیدعەدا کە ئەمڕۆ ئێوە تەواو پێچەوانەی مەنهەجی سەلەفن لەم بابەتەدا.

لەکۆتاییدا حەز دەکەم فیلمێک وەک نمایش بیخەمە بەرچاوتان بەڵکو بتان جوڵێنێت و بەهۆش بێنەوە و بزانن لە چ گێژاوێکدان کە هەستی پێ ناکەن:
بێنە بەرچاوت کە ئەمڕۆ کەسانی وەک عبداللطیف و ربیع المدخلي وعبيد الجابري و صالح الفوزان وعبدالعزيز آل الشيخ وسعيد رسلان وهاوشێوەکانیان کە بوونەتە سەربازی طاغوت بە عیلمەکەیان و دژی ئەهلی تەوحید وەستاون و بە خەواریج و تێکدەریان دەزانن، تۆ ئەمانە تەکفیر دەکەیت و هەمیشە لەسەر زارتن و بە بەڵا و کارەساتی ئەم سەردەمەیان دەزانیت و خوێنیان لە ئاو بە حەلالتر دەزانیت، ئینجا دوای 500 ساڵی تر دونیا بگۆڕێت وحوکم بکەوێتە ژێر دەستی موسڵمانان، لەم کاتەدا خەڵکی کێشەیان لە بابەتی حوکم و دیموکراسی و عەلمانیەت و پەرلەمان و ئەم شتانەدا نەبێت بەڵکو لە بابەتی گۆڕ پەرستی و پاڕانەوە لە غەیری الله و تەوحیدی الأسماء والصفات و قەدەر و ئەم بابەتانە کێشەیان هەبێت کە ئەو کەسە مورتەددانەی سەرەوە لەم بابەتانەدا عەقیدەیان زۆر باشە و ڕۆڵی چاکیان هەبووە، ئینجا بێنە بەرچاوت نەوەکانت لەسەر هەمان مەنهەجی تۆ بڕۆن و بڵێن ئەم کەسانەی سەرەوە موسڵمانن ئیمامن خۆشمان دەوێن قبوڵ ناکەین تەکفیر بکرێن کتێبی زۆر چاک و بە سودیان نوسیوە ...هتد، ئەوکات کەسێکیش پێیان بڵێ: ئەی هاوار خەڵکینە ئەمانە هەمووی کافرن کوفری بەواحیان هەبووە دژی حوکمی ئیسلام بوونە پشتی طاغوتانیان گرتووە و باب و باپیرانتان ئەم جۆرە کەسانەیان تەکفیر کردووە ئێوە چۆن دەیانکەن بە پێشەوای خۆتان ؟ ئەوانیش لە وەڵامدا وەک ئێستای ئێوە دەڵێن: لەم سەردەمەدا کێشەی ئێمە ئەم شتانە نیە کێشەی ئێمە شتێکی ترە کە ئەوان لەم بابەتانەدا کتێبی زۆر چاکیان نوسیوە، الله خۆی دەزانێت ئەوکات چۆن بوونە یان لەسەر چ حاڵێک مردوون ئەوەتا وتوویانە دیموکراسی کوفرە عەلمانیەت کوفرە تۆ چی دەزانیت بڕۆ هەموو ووتەکانی عبدالعزيز آل الشيخ کۆ بکەرەوە ئینجا دەزانیت عەقیدەی چەند پاک بووە، بڕۆ ووتەکانی صالح الفوزان کۆ بکەرەوە ئینجا

تێدەگەی کە عەلمانیەت و دیموکراسی بە کوفر زانیوە، جاهیلێکی وەک تۆ چیە قسە دەربارەی ئەم زانایانە بکات تۆ خەواریجی تۆ فیتنەی تۆ دەتەوێ موسڵمانان سارد بکەیتەوە بەم بابەتانە ... هتد ئەم پرسیارە لەخۆت بکە ئایا بەرگەی بارودۆخێکی ئاوا دەگریت گەر بە چاوی خۆت ببینیت ؟
هەر هەمان ئەم بارودۆخە ئێستا تۆ مومارەسەی دەکەیت، ئەوەتا ئەوانەی سەلەف تەکفیریان کردوون بگرە ئەوانی دوای سەلەف بە زیادەوەش کوفریان هەیە تۆ نەک هەر تەکفیریان ناکەیت بەڵکو لێت بوونە بە ئیمام و بەرگریان لێ دەکەیت و دژی ئەوانە دەوەستین کە تەکفیریان دەکەن بە بیانووی ئەوەی سەردەم گۆڕاوە ! جا ئەوکاتیش خەڵکەکە دەڵێن گەر ئەم زانایانە کافر بوان ئەوا زاناکانی سەردەمی خۆیان تەکفیریان دەکردن، کوا بهێنە کام زانا ئەمانەی تەکفیر کردووە ؟ واتا هەموو زاناکانی پێشوو نەیانزانی ئەمانە کافرن تەنها تۆ زانیت ؟ واتا زاناکانی 500 ساڵ لەمەوبەر تا ئەمڕۆ هەموویان جاهیل بوون تەنها تۆ نەبێت ؟ هەمان ئەم قسانە دووبارە دەکەنەوە کە ئەمڕۆ ئێوە دەیکەن، جا ڕاستیش دەکەن خۆ هەرچی کتێب هەیە بگەڕێ نابینیت باسی تەکفیر کردنی ئەمانەی تێدا بێت، نەماندیوە زانایەک کتێب بنوسێ بڵێ ئەمانە کافرن تەنها لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان و کون و کەلەبەرەکان کۆمەڵێک کەس کە زۆرینەیان نەناسراون بگرە طالب علمیش نین تەکفیریان دەکەن مەبەستم ئەوە نیە تەکفیر کردنیان ناحەقە مەبەستم واقیعەکەیە، ئینجا کابرای داماو چی بکات لەم حاڵەدا ؟ کوفرەکانیان نیشان دەدات پێی دەڵێن فەرموو زانایەک بهێنە لە کتێبێک تەکفیری ئەمانەی کردبێ ئەویش دەستی ناکەوێ، تەنانەت بن باز و بن عثیمین کە زۆربەتان تەکفیریان دەکەن ئەمڕۆ هەرچی کتێب و دەزگا بیسراو بینراوەکان هەیە پڕیەتی لە مەدح و بە شان و باڵ هەڵدانیان، بگرە زۆرێک لە زانا موەحیدەکان تەکفیریان ناکەن بگرە قوتابی ئەمانە بوونە و لای ئەوان خوێندوویانە بگرە بە شێخ ناویان دەبەن و ڕەحمەتیان بۆ دەنێرن، جا تۆ دوای 500 ساڵی تر بڵێی ابن عثیمین کافرە بەیعەتی بە طاغوتی سعودیە داوە، خەڵکەکە دەڵێن ئەوەتا شێخ علي الخضير لە کتێبێکیدا بە شێخی خۆی ناوی دەبات و ڕەحمەتی بۆ دەنێرێت، واتا تۆ زاناتر بووی لە علي الخضير ؟ ئەو دەڵێ شێخمە ڕەحمەتی لێبێ تۆش دەڵێی کافرە ؟ ئەوەتا وليد السناني باسی هەڵەکانی ابن عثیمین و عبدالعزیز آل الشیخ دەکات بەڵام دەڵێ تەکفیریان ناکەم تۆ

لەو زاناتری کە تەکفیریان دەکەیت، ئەویش دەڵێ خەڵکینە من بەڵگەی کوفرەکانی ئەمانەم بۆ هێناون واز لە ووتەی فلان و علان بهێنن بە بەڵگەی قورئان و سوننەت ئەم کارانە کوفرن، خەڵکەکەش دەڵێم ئەم قسەیەت مولزەمت دەکات بەوەی کە بڵێی هەموو زانایانی پێشوو گومڕا و نەزان بوونە بۆیە تەکفیری ئەمانەیان نەکردووە تەنها تۆ زانا بووی ! واللّٰه المستعان.

تێبینی: أبو محمد المقدسي کوفری تری هەیە وەک بە موسڵماندانانی ئیخوان و بەرگری کردن لە طالبان کە ئەو کەسێک نیە ئاگاداری کوفری ئەمانە نەبێت و نەزانێت کارەکانیان کوفرن، خۆی باش گونجاندووە لەگەڵ حکومەتی ئوردن دوای ئازاد بوونی لە بەندیخانە لەسەر حیسابی دینەکەی، ئەگەرچی بە کافری دەزانم بەڵام بە چارەگی ئەو کەسانە کوفری نیە کە ئێوە بە پێشەوایان دەزانن، بۆیە باسیم کرد وەک نموونەیەک کە کەسێکی ئاوا دیار لە بانگەوازی تەوحید بەلاتانەوە زۆر ئاسانە تەکفیری بکەن کە کوفرتان لێ بینی، بەڵام تەکفیر کردنی ئەوانەی کۆمەڵێک کوفریان هەیانە هێڵی سوورە بەلاتانەوە ! ئایا کاتی بەهۆش هاتنەوە نیە ؟

## گومانی نۆیەم:

# باسكردنی كوفری زانا كۆنەكان فیتنە دەنێتەوە لە نێوان موسڵماناندا

**الحاكم** دەڵێ: حدثنا أبو أحمد بن أبي الحسن ووتی: **ابن خزيمة منی نارد بۆ لای أبو العباس السراج، ووتی: پێی بڵێ: با دەست هەڵگرێ لە باسكردنی أبو حنيفة و هاوەڵەكانی خەڵكی شارەكە توشی تەشویش بوونە، منیش نامەكەم پێی گەیاند، جا أبو العباس السراج: بەڕوومدا هەڵشاخی.** [الذهبي نەقلی كردووە - تاريخ الإسلام : 463/23] **(سەنەدەكەی صەحیحە).**

ووتم: أبو أحمد ناوی الحسين بن علي التميمي ناسراو بە حسينك حافزە.

بەڵێ ئەوەی جاهیل بێت بە حاڵی أبو حنيفة و بێ ئاگا بێت لە كتێبەكانی سەلەف و تەنها ئەوەی بیستبێ أبو حنيفة یەكێكە لە چوار پێشەواكە و دەروبەرەكەی هەر بە ئیمام ناوی بردووە بێگومان توشی تەشویش دەبێت و فیتنە دروست دەكات چونكە لە ژینگەیەک گەورە بووە و وایان تێگەیاندووە كە أبو حنيفة هیچ جیاوازی نیە لەگەڵ مالك والشافعي و أحمد تەنانەت ئەو پێش هەموویان ژیاوە فەزلیشی بەسەریانەوە هەیە، هەروەک لە سەردەمی ابن خزيمة هەمان شت ڕوویداوە ئەمە لەكاتێكدا ابن خزيمة ساڵی 311 مردووە، چ جای ئەم سەردەمەی ئێستا كە أبو حنيفة كراوە بە یەكێک لە پێشەواكانی ئەهلی سوننە، بەڵام ڕەحمەت لە السراج بێت كە حیسابی بۆ ووتەكەی ابن خزيمة نەكردووە و لەوە تێگەیشتووە كە دەبێت ڕاستیەكان چۆنن وەک خۆی باس بكرێن و نابێت كەسانی كافر وگومڕا وبیدعەچی بكرێن بە پێشەوای موسڵمانان و مەزهەبە خوار و خێچەكانیان بكرێن بە مەزهەبی فیقهی و خەڵكی لەسەری برۆن، جا ئایا ئەوانەی ئەم بابەتە دەكەن بە فیتنە و دونیا سەراو ژوور دەكەن لەسەری ئایا بە زانستەوە ئەم كارە دەكەن یان دەمارگیری و كاریگەری سەردەم وای لێكردوون ؟ بێگومان دەمارگیری و نەخوێندنەوە ئەوانی گەیاندووە بەم ئەنجامە ئەگینا ئەوەی كتێبەكانی سەلەف بخوێنێتەوە خەمێكی قوڵ دایدەگرێ و دەڵێ أبو حنيفة ئەمە حاڵی بووە لەلای سەلەف ئەی چۆن كراوە بە پێشەوای ئەهلی سوننە ؟! وە

زۆرێک لەوانەی کە بەرگری لێدەکەن یەک کتێبی سەلەفیان نەخوێندۆتەوە تەنانەت نازانن کەی لەدایکبووە و کەی مردووە، وەک باقی ئەم خەڵکەی تر چاوی هەڵهێناوە بە دونیا بیستوویەتی أبو حنیفة ئیمامە ئیتر ئەویش هەر لەسەر ئەمە ڕۆیشتووە، هەروەک أبو زرعة الرازي باسیکرد ئێمە لە گەنجیدا وەک باقی خەڵکەکەی تری خوراسان سەرسام بووین بە أبو حنیفة کە بینیم الحمیدي کتێبی (الرد علی أبي حنیفة) دەخوێنێتەوە خەریک بوو بۆی هەڵسمەوە بەڵام دواتر گومڕایی أبو حنیفة و هاوەڵانیمان بۆ دەرکەوت، یان کەسێکی وەک إسحاق بن راهویە کە ووتی لە خوراسان هاتمە دەرەوە بڕوام وانەبوو کەسێک هەبێ بتوانێ موخالەفەی أبو حنیفة بکات کەچی بینیم لە دەرەوەی خوراسان دونیا جۆرێکی ترە، پاشان إسحاق بوو بەو کەسەی کە ابن قتیبة دەربارەی دەڵێ کەسم نەدیوە وەک إسحاق ڕەددی ئەهلی ڕەئی بداتەوە، جا ئێوەش یان وەک ئەمانە اللّٰه هیدایەتتان دەدات بە خوێندنەوەی ئەم کتێبانە، وە یان سوور دەبن لەسەر دەمارگیریتان بۆ أبو حنیفة، ئەوا لە حاڵەتی دووەمدا مولزەم دەبن بەوەی کە بڵێن زۆربەی کتێبەکانی سەلەف فیتنەیە خوێندن وچاپکردن وبڵاوکردنەوەی کارێکی خراپە و هەجری ئەم کتێبانە بکەن و ئاگادارکردنەوەیان لێ بدەن چونکە ئوممەت بەرەو فیتنە و گومڕایی دەبەن، لەم دوو حاڵەتە زیاتر هیچی ترتان لەبەردەمدا نیە، بەڵام بە شایەتی ئەم زانایانە وەک باسمان کرد ئەوان ئەوکاتە خۆیان بە گومڕا زانیوە کە أبو حنیفة-یان بە ئیمام داناوە، وە ئەو کاتە پێیان وابووە کە گەڕاونەتەوە بۆ حەق کە قسەیان بە أبو حنیفة ووتوە و ڕەددیان داوەتەوە، جا بۆیەش تۆ ئەوکاتە لە گومڕایی و فیتنە دایت کە کەسێکی وەک أبو حنیفة دەکەیت بە ئیمام و بەرگری لێدەکەیت، نەک ئەوکاتەی کە ڕاستیەکانت بۆ دەردەکەوێ و تەسلیمی حەق دەبیت.

## گومانی دەیەم:

# تەکفیر کردنی أبو حنیفة بابەتێکی خیلافیە پێویست ناکات خۆمان پێی خەریک بکەین

زۆر جار ئەم ووتەیە دەبیستین کە تەکفیر کردنی ئەو زانایانەی کە کوفریان هەیە خیلافین پێویست ناکات بەم باسە خیلافیانە خۆمان خەریک بکەین.

لە وەڵامدا دەڵێین: بەڵێ لە کۆن و ئێستاش هەمیشە کەسانێک هەن کە خیلاف هەیە دەربارەیان ئایا کافرن یان نا، ئەمە شتێکە ڕوونە پێویست بە بەڵگە ناکات، دیارترین نموونەش الحجاج-ە کە زۆرجار نموونەی پێ دەهێنرێتەوە لە هەبوونی خیلاف لە تەکفیر کردندا، ئەو لایەنەی کە تەکفیری دەکەن دەڵێن کوفرەکەی زۆر ڕوونە کەچی لەگەڵ ئەوەشدا کەسانێکی دیار تەکفیریان نەکردووە، وە ئەمە نەبۆتە هۆی ئەوەی یەکتری تەکفیر بکەن یان یەکتر لەکەدار بکەن یان یەکتر مولزەم بکەن بە شتانی ترەوە، ئەوپەڕی بووترێ لەم بابەتەدا ئەوەیە ئەوانەی کە تەکفیریان نەکردووە ئاگاداری کوفرەکانی نەبوونە یان کوفرەکانی تەئویلی هەڵگرتووە بۆیە وەستاون لە تەکفیر کردنی یان هەر شتێکی تر کە الله خۆی دەیزانێت بەڵام هەموومان ئەوە دەزانین کە هیچ زانایەک نەبووە بڵێ من کوفرم لە الحجاج دیوە بەڵام هەربە هەوەس تەکفیری ناکەم، کەسیشیان نەیووتوە من کوفرم لێی بینیوە بەڵام مادام فلان زانا تەکفیری نەکردووە منیش نایکەم، ئەوەتا سعید بن جبیر دەڵێ: تا کوفرم لێی نەدی خروجم لێی نەکرد، کەواتە لەسەر ئەوە نەوەستاوە بزانێت ئایا أنس بن مالك ﵁ یان تابعینەکانی تر چی دەڵێن دەربارەی الحجاج، کوفری لێی دیوە و خروجی لێی کردووە، وە کەسیش بە سعید بن جبیر و ئەو 500 زانایەی نەووت کە خروجیان کرد لە الحجاج ئایا ئێوە زیرەکترن لە أنس بن مالك ؟ ئەو بۆ تەکفیری ناکات بۆ خروجی لێ ناکات ؟ پاشان دەربارەی هەر کەسێک کە دەووترێ خیلاف هەیە لە تەکفیر کردنی واتا ئەم کەسە زۆر گلاو و پیسە هەندێک تەکفیریان کردووە هەندێکیش تەکفیریان نەکردووە بەڵکو دەڵێن کوفری بچووکی هەیە یان تەئویلی

هەیە بۆیە تەکفیری ناکەین یان بە بیدعەچی و گومڕای دەزانین، ئەمە مانای خیلاف هەبوون لە تەکفیرە نەک مانای ئەوە بێت کەسانێک تەکفیریان کردووە و کەسانێک بەرزیان کردۆتەوە بۆ ئاسمان ! کە أبو حنيفة-ش ابن الجارود دەربارەی دەڵێ خیلافیان هەبووە دەربارەی موسڵمان بوونی ئەمە ماناکەیەتی واتا کەسانێک تەکفیریان کردووە کەسانێکیش تەکفیریان نەکردووە بەڵام بە گومڕا و بیدعەچیان زانیوە و دژی بوونە و بە خراپ باسیان کردووە، جا دەپرسم ئایا ئێستا ئێمە بەم شێوەیەن تا بڵێین پێویست ناکات باسی ئەم بابەتانە بکەین ؟ بۆ نموونە أبو حنيفة یەکێک تەکفیری کردووە یەکێک دەڵێ بیدعەچیە یەکێک دەڵێ گومڕایە یەکێک دەڵێ جەهمیە یەکێک دەڵێ سەرکردەیە لە ئیرجاء یەکێک دەڵێ دەردێکی بێ دەرمانە یەکێک دەڵێ کەس لە دایک نەبووە لە ئیسلام شومتر بێ لەو، ئایا ئێمەش واین وەک سەلەف بەم جۆرە وەسفی دەکەین ؟ والله گەر ئێمەش وابین ئەوا یەک خولەکیش کاتم ناکوژم بە باسکردنی أبو حنيفة، زۆر ئاساییە با یەکێک تەکفیری بکات یەکێک تەبدیع و تەضلیلی بکات بەپێی ئەم زانیاریيانەی کە هەیەتی لەسەری بەڵام نەک بە حەز و ئارەزوو کوفریشی لێ ببینیت هەر بڵێی تەنها تەبدیعی دەکەم، بەڵام ئێمە لە سەردەمێک دەژین أبو حنيفة هیچ لەم وەسفانە نایگرێتەوە بەڵکو کراوە بە الإمام الأعظم ئەوەی بە خراپ باسی بکات هاوار بەحاڵی چی پێ دەکەن گەر بە خەواریجیشی نەزانن هاوڕان لەسەر ئەوەی کە ئەم کەسە فیتنە چیە، ئایا ئەو خیلافەی ئێوە باسی دەکەن بەم شێوەیە بووە لەلای سەلەف یەکێک بڵێ کافرە و یەکێک بڵێ ئیمامە ؟ یان یەکێک وتوویەتی کافرە یەکێک وتوویەتی بیدعەچی و گومڕایە ؟ بۆیە ئەو خیلافەی ئێوە باسی دەکەن بەڵگەیە لەسەر خۆتان، ئەمە حاڵی أبو حنيفة بووە لە سەردەمەکەی خۆیدا پێم ناڵێن دوای سەدان ساڵ پاش مردنی چۆن بوو بە ئیمامی ئەهلی سوننە ؟ خۆ دوای مردنی عەقیدەکەی نەگۆڕاوە ؟ کەواتە ئەمە ڕوونترین بەڵگەیە کە ئەوانەی لەدوای سەلەف هاتوون شل بوونە لە مامەڵە کردن لەگەڵ کەسانی کافر و بیدعەچی، ئەگینا هیچ مانای نیە پیاوێک تا دەمرێت کەسانی دەوروبەری هەر هێرشی دەکەنە سەر لە تەکفیر کردن بگرە تا دەگاتە بچووکترین ووتە پێی دەڵێن، بەڵام دوای چەند سەدەیەک ئەم کەسە دەبێتە ئیمامی ئەهلی سوننە کەس بۆی نیە بە خراپ ناوی بهێنێت، کەواتە ئەم خیلافە بەهۆی گۆڕانی

عەقیدەی خەڵكەوە ڕوویداوە نەک هەر لە سەرەتاوە بوونی هەبوو بێت، هاوشێوەی تەكفیر كردنی نوێژ نەكەر دەبینین لەلای هاوەڵان بە ئیجماع كافرە دواتر لەناو تابعین یەک دوو ووتە پەیدا دەبێت كە كافر نیە گەر بە واجبی بزانێت، دوای چەند سەدەیەک دەبینین زۆربەی فوقەهاء لەسەر ئەوەن كە نوێژ نەكەر كافر نیە ئیللا مەگەر بە واجبی نەزانێت ئەو كات كافرە، سەیركە سەرەتا باسەكە چۆن بوو دواتر چی لێ بەسەرهات ئێستا گەیشتووە بەو حاڵەی كە بۆمان نیە لە گوڵ كاڵتر بەوانە بڵێین كە تەكفیری نوێژ نەكەر ناكەن، ئەمە لەكاتێكدا لە سەردەمی هاوەڵان ئیجماعی لەسەر بووە و كەس موخالەفەی نەكردووە، كەواتە ئایا لە ئەصلدا خیلافەكە بوونی هەبووە یان دوای تێپەڕ بوونی كات و گۆڕان بەسەر عەقیدەی خەڵک ئەم ووتەیە دروست بوو كە نوێژ نەكەر كافر نیە ؟ بێگومان بەهۆی گۆڕانی عەقیدەی خەڵک ئەم ووتەیە دروست بوو، هەروەک ابن تیمیة دەڵێ: هەر كەسێک نوێژ نەكەر بە كافر نەزانێت ئاوا توشی شوبهەی ئیرجاء لەم بابەتەدا بیەوێ یان نا، جا ڕەحمەتتان لێبێت جیاوازی بكەن لەنێوان كەسێک كە خیلاف هەیە دەربارەی ئایا كافرە یان بیدعەچی و گومڕایە لەگەڵ كەسێک خیلاف هەیە دەربارەی ئایا كافرە یان ئیمامی ئەهلی سوننەیە، گەر خیلافەكە لەجۆری یەكەم بێت ئێمەش قسە ناكەین هەروەک چۆن سەلەف قسەیان نەكردووە، بەڵام گەر خیلافەكە لەجۆری دووەم بێت چۆن سەلەف قسەیان كردووە ئێمەش قسە دەكەین تا كەسی كافر نەكرێت بە ئیمام، ئەو كەسەی تەكفیریشی ناكات جورئەتی ئەوەی نەبێت بڵێ ئیمامە چ جای جورئەتی ئەوە بكات هێرش بكاتە سەر ئەوانەی تەكفیری دەكەن و بە خەواریج و ئەم جۆرە شتانە ناویان ببات.

زاناكانی تریش كە كوفریان هەیە بەهەمان شێوە هەروەک لە گومانی پێنجەمدا باسمان كرد كەی ئێوە ووتتان ئەو زانایانەی كە كوفریان هەبووە و تەوبەیان لێی نەكردووە كافرن یان ووتتان بیدعەچی و گومڕان و ڕقمان لێیانە و خۆشمان ناوێن بەڵام تەكفیریان ناكەین نەوەک تەوبەیان كردبێ ئێمە نەیزانین، ئەو كات ئێمەش سەر ناخەینە سەرتان ئەگەرچی بیانووەكەتان باطلە بەڵام بەوەندە واز دەهێنین، بەڵام هەرچی ئێوەن دەڵێن: بەڵێ كوفری هەیە بەڵام هەر موسڵمانە هەر

ئیمامە هەر بەڕێزە، ئەوەی تەکفیری بکات یان بە خراپە باسی بکات هەرگیز لێی قبوڵ ناکەین و ئاوا و ئاوا دەکەین بەرامبەری ...هتد، کەواتە باسەکە خیلاف نیە باسەکە ئەو ژینگە و سەردەمە دروستی کردووە کە تۆی تێدا گەورە بووە، هەر بیستووتە ئەوانە ئیمامن و کەسانی بەڕێزن تۆش هەر ئەمە دووبارە دەکەیتەوە وەک تەقلیدی کوێرانە، ئەگینا ئەو کوفرانەی لە جەهمی وڕافیزی و موعتەزیلی وئەشعەری وماتوریدی داهەیە هیچ کام لە سەلەف خیلافیان نەبووە لەوەی کە خاوەنەکەی کافرە بە معین، ئەم قسەیەش کە دەووترێ ئەهلی سوننە خیلافیان هەیە دەربارەی ئەشعەرییەکان هەندێک دەڵێن کافرن و زۆرینەی دەڵێن کافر نین، ئەمە ووتەی خەلەفە نەک سەلەف ئەگینا ووتەی سەلەف زۆر ڕوونە دەربارەی ئەو کوفرانەی کە ئەشعەرییەکان تێی کەوتوون هیچ خیلافێکیان نیە تێیدا، بەڵام بەهۆی ئەوەی مەزهەبی ئەشعەری دواکەوتووە خاوەنەکەی ساڵی 324 مردووە سەلەف ووتەیان نیە دەربارەی ئەشعەرییەکان، جا ئەمەش خاڵێکی ڕوونە بۆ جیاکردنەوەی مەزهەبی سەلەف و خەلەف، بڕوانە ووتەی سەلەف دەربارەی کوفری جەهمیەکان و موعتەزیلە چەند ڕوونە هەروەها تەکفیر کردنیان بە معین، بەڵام چونکە زۆرێک لە سەلەف پێش دەرکەوتنی أبو الحسن الأشعري مردوون بۆیە ووتەیان نیە دەربارەی خۆیی و مەزهەبەکەی، جا حوکمدان لەسەر ئەشعەرییەکان بۆ خەلەف ماوەتەوە سەیرکە بزانە چیان ووتوە دەربارەیان، تا بە ئەشعەرییەکان دەگات موعتەزیلەشیان بە یەکێک لە 72 فرقەکە حیساب کردووە تەنانەت هەندێکیان جەهمیەکانیشیان لە 72 فرقەکە حیساب کردووە، ئەمە جگە لەوەی کە دەڵێن گەر شوێنێک ئەهلی سوننەی لێ نەبێت ئەوا ئەشعەرییەکان دەبن بە ئەهلی سوننە لەم شوێنەدا ئەمەش ووتەی ابن تیمیة-یە، ئەوانەشی دەڵێن خیلاف هەیە دەربارەی تەکفیر کردنیان نابینی کەسیان بە معین تەکفیر بکەن، ئەمە لە کاتێکدا بە شایەتی زۆرێکیان مەزهەبی ئەشعەری زۆر پیسترە لە مەزهەبی جەهمی و موعتەزیلە لە صیفاتدا، بەڵام ئەوەی جەهمی و موعتەزیلە بە ئاشکرا دەری دەبڕن ئەوان جورئەت ناکەن بە ئاشکرا دەری ببڕن بە شێوەیەکی تر دەری دەبڕن ئەگەرچی لە ڕووکەشدا واخۆیان نیشان دەدەن کە دژی موعتەزیلە و جەهمین بەڵام لە ڕاستیدا هاوڕای ئەوانن، قورئان بە نموونە وەربگرین باوە لەناو خەڵکیدا کە موعتەزیلە دەڵێن قورئان کەلامی الله

یە بەڵام مەخلوقە، لەسەر ئەوەش تەكفیر كراون بە معین، لە بەرامبەردا ئەهلی سوننە و ئەشعەرییەكان دژی ئەم كوفرەی موعتەزیلەن و ڕەددیان دەدەنەوە، مەزهەبی ئەهلی سوننە دیارە قورئان كەلامی اللە-یە و مەخلوق نیە، بەڵام ئەشعەرییەكان ئەگەرچی وای نیشان دەدەن كە دژی موعتەزیلەن لە ووتنی قورئان مەخلوقە بەڵام دوای وورد بوونەوە دەردەكەوێ كە كوفری ئەوان پیسترە لە كوفری موعتەزیلە لەم بابەتەدا، وەك ابن القیم و ابن أبي العز و زانای تریش ئاماژەیان بەمە داوە، چونكە ئەشعەرییەكان پێیان وایە ئەو قورئانەی لەبەر دەستمان دایە كەلامی نەفسانی اللە-یر واتا اللە قسەی پێ نەكردووە بەڵكو جبریل قسەی پێكردووە و تەعبیرە لە كەلامی اللە، كەواتە لای ئەشعەرییەكان قورئان كەلامی اللە نیە و مەخلوقیشە، هەر بۆیە یەكێك لە زاناكانی موعتەزیلە كە ئێستا ناویم بیر نیە دەڵێ: ووتەی ئەشعەرییەكان لە هی ئێمە خراپترە، ئێمە دەڵێین: قورئان كەلامی اللە-یە بەڵام مەخلوقە، ئەوان دەڵێن: قورئان كەلامی اللە نیە و مەخلوقیشە، بۆیە ابن أبي العز لە شەرحی عەقیدەی الطحاوي ئاماژە بەوە دەكات كە كوفری ئەشعەرییەكان پیسترە لە كوفری موعتەزیلەكان دەربارەی قورئان، ئەمە وەك نموونەیەك لە باقی تەئویلی صیفاتیشدا هەر جەهمین بەڵام تەعطیلیان گۆڕیوە بۆ تەئویل بۆیە بە جەهمی مێینە ناوبراون، سەبارەت بەو گومانەش كە دروستیان كردووە گوایە كوفر لە تەوحیدی الأسماء والصفات هەمووی دوای ئیقامە حوججە خاوەنەكەی تەكفیر دەكرێ چونكە ئەم بابەتە خەفیە واللە المستعان، ئەمە تانەدانە لە دین بەبێ ئەوەی هەستی پێ بكەن، كاتێك دەووترێ تەوحیدی سێ بەشە ربوبیەت و ئولوهیەت و ناو و سیفەتەكان واتا مرۆڤ دەبێ لەم سێیەدا توشی كوفر و شیرك نەبوو بێت ئینجا تەوحیدەكەی سەلامەتە، تۆ كە ووتت تەوحید سێ بەشە لە دوو بەش كێشەت نەبوو لە بەشەكەی تر كۆمەڵێك كوفرت هەبوو هەر موسڵمانی ! ئەمە خۆی لە خۆیدا كەم كردنەوەی گرنگی تەوحیدە بە تایبەتی ئەو تەوحیدەی كە پەیوەستە بە ناسینی اللە كە تەوحیدی الأسماء والصفات-ە، كە زۆرترین ئاماژەی پێدراوە لە قورئاندا و زۆرترین فەرموودەی لەسەر هاتووە و زۆرترین كتێبی لەسەر نوسراوە، سەلەف كاتێك كتێبیان دەنوسی زۆرینەی دەربارەی ئەم تەوحیدە بوو زۆرترین ڕوونكردنەوەیان بۆ داوین لەسەر ئەم تەوحیدە، تەنانەت لە سەردەمی خەلەف زۆربەی كتێبەكانی ابن تیمیة و ابن القیم

لەسەر باسكردنی ئەم تەوحیدە بووە، گەر ئەمڕۆ کەسێک بیەوێ سەرچاوەی دەستکەوێ دەربارەی تەوحیدی ئولوهیەت و شیرك دانان بۆ الله ئەوا لە سەردەمەکانی کۆن بە دەگمەن دەستی دەکەوێ دەبێ پشت ببەستێ بە کتێبی نەجدییەکان چونکە ئەوان لە هەمووان زیاتر باسی ئەمەیان کردووە بەهۆی زاڵبوونی ئەم شیرکە لە سەردەمەکەیان، گەر ئەمڕۆ کەسێک بیەوێ سەرچاوەی دەستکەوێ دەربارەی کوفری پەرلەمان و دیموکراسی و عەلمانیەت دەبێ سەیری سەرچاوەکانی سەدەی 20 و 21 بکات کە دوای جەنگی جیهانی یەکەم بە فراوانی ئەم کوفرە تەشەنەی کرد، خۆ گەر بیەوێ کتێبی چاپکراویشی دەست کەوێ هی زانایەکی موسڵمان ئەوا زۆر ئەستەمە یان دەبێ گوێ بۆ دەرسەکانی ڕابگرێ یان دەبێ لە ئینتەرنێت لە سایتە نەناسراوەکان داونلۆدی بکات، وە بە ئەستەم دەبینی یەکێک لەم زانایانە ڕێگایان پێ بدرێ کە لە شاشەی تەلەفزیۆن دەربچن یان لە ڕادیۆ قسە بکەن یان لە گۆڤار و ڕۆژنامەکان شت بنوسن، بگرە زۆرجار بە شاراوەیی بەرهەمەکانیان دەستاو دەست دەکرێ، وە بە دەگمەن دەبینیت مەلایەک لەسەر مینبەر باسی ئەم کوفرانە بکات، بەڵام گەر کەسێک بیەوێ سەرچاوەی دەست بکەوێ دەربارەی تەوحیدی الأسماء والصفات ئەوا هێندە سەرچاوە زۆرە هەر لە سەردەمی سەلەف و خەلەف و ئێستاشدا کە لە ژماردن نایەت، لەگەڵ ئەوەشدا پێتان وایە دوو کوفرەکەی پێشوو هیچ کەس عوزری تێدا نیە و زۆر ڕوونە ئەوەی تێی بکەوێ کافرە و عوزری نیە، بەڵام تەوحیدی الأسماء والصفات بابەتێکی خەفیە سەرەڕای هەبوونی ئەم هەموو ئایەت و فەرموودە و کتێبە لەسەری بە دڵی خۆت تەئویل و نەفی صیفات بکە و دەقی قورئان بە درۆ بخەرەوە ئەوا هەر بابەتێکی خەفیە ! والله ئەم هەوڵە نەزۆکە هیچ نیە تەنها بۆ لابردنی تەکفیر نەبێ لەسەر زانا ئەشعەرییەکان ئەگینا ڕوونترین بابەت کە لە سەلەف و خەلەفەوە بۆمان باسکرابێ و تەرکیزی زۆری لەسەر کرابێ ئەم بابەتە بووە، بە نموونە صیفەتی (العلو) بەرزی الله وەربگرین کە لە فیطرەتی هەموو مرۆڤێکدا بە موسڵمان و کافر ئەوە چەسپاوە کە لە الله تعالی لە ئاسمانە، منداڵ و پیر و گەنج و خوێندەوار و نەخوێندەوار و زانا و جاهیل و یەهودی و نەصرانی هەمووی دەست بۆ ئاسمان بەرز دەکاتەوە، کاتێک ئاماژە بۆ الله دەکەن بە چاو و بە دەست ئاماژە بۆ ئاسمان دەکەن، گەر پێویست بێ هەموو شتێک فێری منداڵ بکرێ ئەوا

هیچ پێویست ناکات فێری ئەوەی بکرێ کە الله لە ئاسمانە، هەرکاتێک کە فێری قسە کردن و قسە تێگەیشتن بوو لێی بپرسە بڵێ الله لەکوێیە ؟ بەبێ بیرکردنەوە و وەستان دەڵێ لە ئاسمانە، چونکە لە فیطرەتیدا چەسپاوە پێویستی بەوە نیە بۆی باس بکەیت و فێری بکەیت ؟ کێ لە ئێوە لە منداڵێ نەیدەزانی الله لە ئاسمانە دواتر کەسێک فێری کرد ؟ بێگومان کەستان، تەنانەت خودی ئەشعەرییەکان فیطرەتیان دژیانە کاتێک دەڵێن الله بێ شوێنە نابێ بووترێ الله لەکوێیە بەڵام لەهەمان کاتدا کاتێک ناوی الله دەهێنن بە دەست و چاو ئاماژە بۆ ئاسمان دەکەن، وەک ابن القیم دەڵێ: زیاترلە هەزاربەڵگە هەیە لەسەرئەوەی الله لە ئاسمانە، جا ئایا شتێک کە بە فیطرەت دەزانرێ پێم ناڵێن چۆن دەبێتە بابەتێکی خەفی ؟ هەرچەند بڵێی سەردەم گۆڕاوە جەهل زۆر بووە بەڵام خۆ فیطرەت هەر دەمێنێتەوە لای هەموو مرۆڤێک کە الله لە ئاسمانە ئەمە شتێکە مەحاڵە بووترێ دەبێتە خەفی، بەڵگەیەکی تریش کە هیچ بیانووێک ناهێڵێتەوە لەم بابەتە ڕووداوی الإسراء والمعراج-ە کە هەموو موسڵمانێک بە عالیم و عەوام ئەوە دەزانن کە لەم شەوەدا پێغەمبەر ﷺ شەوڕەوی پێکرا بۆ بیت المقدس پاشان لەوێ بەرز بوویەوە بۆ ئاسمان تا گەیشت بۆلای الله تعالى و قسەی لەگەڵ کرد تەنانەت خەڵکی عەوامیش ئەوە دەزانن کە پێغەمبەر موسی عليه السلام چەند جارێک داوای لە پێغەمبەر ﷺ کرد کە داوا لە الله بکات ژمارەی نوێژەکان کەم بکاتەوە لەسەر ئوممەتەکەی ئەویش لە هەر جارێکدا بەرز دەبوویەوە بۆلای الله تا ئەمەی پێی بڵێ، ئەم ڕووداوە هەموو کەسێکی عەوام دەیزانێت و لە قورئانیشدا باسکراوە، ئیتر دوای ئەم ڕووداوە هیچ بیانووێک دەمێنێتەوە بۆ هیچ کەسێک کە بڵێ الله لە ئاسمان نیە ؟ بۆیە سەلەف وتوویانە هەرکەسێک دان بەوە نەنێت کە الله لە ئاسمانە لەسەر عەرشەکەی ئەوا لە ملی دەدرێت و لە گۆڕستانی موسڵمانان نانێژرێت، زانراویشە کەسێک تا تەکفیر نەکرێت حوکمی کوشتنی بۆ دەرناچێ کە وتوویانە دەکوژرێ واتا کافرە چونکە تەکفیر چەند حوکمێکی لەسەر بنیات دەنرێ بۆ نموونە دەووترێ ئەوەی ئەم کوفرە بکات نوێژ لەدوای ناکرێ یان میرات وەرناگرێ یان مارەیی دانامەزرێ یان لە ملی دەدرێ ئەم حوکمانە هەمووی دوای تەکفیری معین دێتە دی، ناکرێ تۆ کەسێکت هێشتا بە معین تەکفیر نەکردبێ ئەم حوکمانەی لەسەر بدەیت، ئەمەم بۆیە باسکرد تا نەووترێ کە سەلەف وتوویانە

دەكوژرێ مەبەستیان تەكفیری مطلق بووە نەک معین، كوشتن دوای تەكفیری معین بڕیاری لەسەر دەدرێ نەک پێشتر بۆیە ئاگاداری ئەم خاڵە بن، جا وەک تەنازول كردن لەگەڵتان بڵێین تەوحیدی الأسماء والصفات بابەتێكی تەواو خەفیە بە گشتی، با بزانین بابەتی خەفی چۆن باس كراوە لای زانایان مەگەر ئەوە نیە كە دەڵێن خاوەنەكەی دوای ئیقامە حوججە تەكفیر دەكرێت، باشە ئیقامە حوججە چیە لای ئەهلی سوننە ؟ مەگەر هەر كەسێک قوڕئان و سوننەتی پێ بگات ئیقامە حوججە نەكراوە ؟ باشە ئێستا دوو زانا بە نموونە وەربگرین النووي و ابن حجر العسقلاني كە هەردووكیان حافز قوڕئانن زۆربەی فەرموودەكانیان بیستووە بگرە لەبەریانە، دوو صەحیحترین كتێبیان شەرح كردووە دوای
قوڕئان كە صەحیحی البخاري و صەحیحی مسلم-ە هێندە كتێبیان نوسیوە و خوێندۆتەوە كە لە ژماردن نایەت، ئاگاداری كتێبەكانی سەلەفن دەربارەی الأسماء والصفات تەنانەت هەندێكجار ڕەددی ئەوانەش دەدەنەوە كە ئیثباتی صیفەتی العلو دەكەن لەسەر ڕواڵەت بەبێ تەئویل بگرە النووي لە المتولي نەقل دەكات كە ئەوەی ئیثباتی علو بكات كافرە بێدەنگیش دەبێت لەسەری جگە لە كوفرەكانی تریان كە فەتوا و كاری شیركیان هەیە وەک سۆفیەكان، جا دوای ئەوەی زانایەک ئەمە حاڵی بێت ئیقامە حوججەی چی لەسەر دەكرێت ؟ پێی دەڵێ لە قوڕئان ئەمە هاتووە ؟ كە خۆی حافز قوڕئانە ؟ پێی دەڵێی لە فەرموودە ئەمە هاتووە كە بە دەگمەن فەرموودە هەیە نەیبیستبێ ؟ پێی دەڵێی مەزهەبی سەلەف ئاوا بووە ؟ كە لە من و تۆ زۆر چاكتر ئاگاداری كتێبەكانە و ئاماژەیان پێ دەدات ؟ پێم ناڵێی چۆن ئیقامە حوججەی دەكەیت ؟

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: حدثنا يونس بن عبدالأعلى ووتی: **بیستم الشافعي دەیووت: الله ناو و صیفاتی هەیە كەس بۆی نیە ڕەتی بكاتەوە، وە هەر كەسێک موخالەفە بكات دوای جێگیر بوونی حوججە لەسەری ئەوا كافر بووە، بەڵام پێش ئیقامە كردنی حوججە عوزری هەیە بە جەهل چونكە ئەم بابەتە بە عەقڵ و ڕوانین و بیركردنەوە نازانرێ.**

[ابن حجر نەقلی كردووە - فتح الباري : 396/17] **(سەنەدەكەی صەحیحە).**

ووتم: ابن حجر دەڵێ ابن أبي حاتم لە كتێبی (آداب الشافعي ومناقبه) ڕیوایەتی كردووە، بەڵام ئەو كتێبەی كە ئێستا بەردەستە تێیدا نیە ڕەنگە كەوتبێ، وە هەندێكیان داویانەتە پاڵ عەقیدەی الشافعي بە ڕیوایەتی الهكاري، وە ابن أبي يعلى بە سەنەدێكی صەحیح هێناویەتی بە لەفزێكی نزیك لەمە، وە ابن قدامة وابن القيم والذهبي هێناویانە، ووتەكەی الشافعي زۆر ڕوونە كە ناو و صیفەتەكانی الله بە بیر كردنەوە و عەقڵ نازانرێ تەنها بە وەحی نەبێت، بەڵام كە قورئان دابەزی فەرمووده بڵاو بوویەوە و گەیشت بە خەڵكی دوای ئەمە هەر كەسێك ڕەتی بكاتەوە كافرە، هەر چەندە هەندێك صیفەت هەن پێش وەحیش دەزانرێن كە پێیان دەووترێ صیفەتە سمعية عقلية ئەگەرچی بە وەحی هاتوون بەڵام بە عەقڵیش دركیان پێ دەكرێ بۆیە ئەوەی كە فیطرەتی پاك بێ و تێك نەچوو بێ ئەوا دەزانێ الله دروستكەری مەخلوقاتە واتا دان بەوە دەنێت كە خالق-ە صیفەتی خەلقی هەیە، دان بەوە دەنێت كە رزاق-ە صیفەتی رزق-ی هەیە، دان بەوە دەنێت كە الله زانایە صیفەتی عیلم-ی هەیە، دان بەوە دەنێت كە الله دەبیستێ و دەبینێ واتا السميع و البصير-ە، گریمان بووترێ هەموو ئەمانە صیفەتی خەبەرین بە عەقل دركی پێ ناكرێ ئەوا الشافعي ووتی دوای پێگەیشتنی قورئان و سوننەت عوزری نامێنێت و كافرە، جا بۆیە گەر بووترێ تەوحیدی الأسماء والصفات هەمووی بابەتێكی خەفیە ئەوا دوای گەیشتنی قورئان و سوننەت ئەوەی تەسلیمی نەبێت كافرە چونكە بە قورئان و سوننەت ئیقامە حوججە كراوە، وە لە پێناسەی بابەتە ئاشكراكان و شاراوەكان (الظاهرة والخفية) زانایەك دەڵێن: بابەتە ئاشكراكان ئەوانەن كە هەموو خەڵكی دەیزانن بەبێ جیاوازی بە عالیم و عەوامەوە كەس نیە نەیزانێت وەك واجب بوونی پێنج نوێژەكە، بابەتە شاراوەكانیش ئەوانەن كە هەموو خەڵكی نایزانن تەنها زانایان دەیزانن یان بەشێك لە زانایان دەیزانن لای خەڵكی عەوام شاراوەیە، بەڵام دەبینین صیفەتی العلو نەك لای خەڵكی عەوام شاراوە نیە بەڵكو لای كافرانیش شاراوە نیە دەزانن الله لە ئاسمانە، كەواتە ئەوەی ئێوە باسی دەكەن دەربارەی صیفەتی العلو گوایە بابەتێكی خەفیە تەواو پێچەوانەی پێناسەی زانایانە بۆ بابەتی خەفی، ئەوان دەڵێن عەوام نایزانێت زانا دەیزانێت كەچی صیفەتی العلو عەوام دەیزانێت زانا كەوتۆتە كوفرەوە تێیدا.

لە کۆتاییدا دەڵێم: گەر وەک مەدخەلیەکانیش بڵێن ئیقامە حوججە بەم شێوەیە کە دانیشیت لەگەڵی تا قژت سپی دەبێ هەر مشتومڕی لەگەڵ بکەی دوای ئەمە هەر ووتی من تەسلیم نابم و عینادی دەکەم ئەوکات ئیقامە حوججە کراوە، ئەوا بەڕاستی هیچ وەڵامێکم بۆتان نیە چونکە خودی ئەم ووتەیە عینادی کردنە لەگەڵ کەسی عینادیش قسە کردن سودی نیە.

تێبینی: سەبارەت بە باسکردنی ئەشعەرییەکان یان باسکردنی صیفەتی العلو  یان باسکردنی النووي و ابن حجر  مەبەست ئەوە نیە کە تەنها بابەتی تەکفیر کردن تەنها لەم گروپە یان تەنها لەم صیفەتە یان تەنها لەم دوو کەسە کورت بکرێتەوە، باسکردنی ئەم گروپە و ئەم صیفەتە و ئەم دوو زانایە تەنها وەک نموونەیە، ئەگینا هەر کەسێک بێت هەر گروپێک بێت هەمان حوکمی هەیە مادام بزانین لە تەوحیدی الأسماء والصفات لەسەر ئوصولی ئەهلی سوننە ناڕوات.

## گومانی یانزدەم:
# گەر کافر بێت چۆن ناوی بە زیندوویی ماوەتەوە لەناو ئوممەتدا

کاتێک باسی کوفرەکانی أبو حنیفة یان هەر زانایەکی ناوداری تر دەکەین کەسانێک دەڵێن: گەر کافر بوایە چۆن ئاوا لەناو ئوممەت ناوی دەمایەوە و ڕێز لێگیراو دەبوو، ئەوەتا خەڵکی تا ئێستاش کتێبەکانیان دەخوێنن و گرنگی پێدەدەن و بە ئیمام ناویان دەبەن، مەحاڵە الله تعالى جێگای کەسێکی کافر بکاتەوە لەناو دڵی موسڵمانان‌دا و ئاوا بە گەورە سەیری بکەین، مانەوەی ناوی ئەم زانایانە و کتێبەکانیان بەڵگەی ئەوەیە کە الله قبوڵی پێ بەخشیون لەناو خەڵکیدا.

لە وەڵامی ئەمەدا دەڵێین: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **(إن الله لا يظلم مؤمنا حسنة، يعطى بها في الدنيا ويجزى بها في الآخرة، وأما الكافر فيطعم بحسنات ما عمل لله تعالى في الدنيا، حتى إذا أفضى إلى الآخرة لم يكن له حسنة يجزى بها)**. [صحيح مسلم : 2808]

واتا: الله زوڵم ناکات لە چاکەی هیچ ئیماندارێک، لە دونیادا شتی پێ دەبەخشێتەوە و لە ڕۆژی دواییش پاداشتی دەداتەوە، بەڵام کافر گەر چاکە ئەنجام بدات لەپێناوی الله ئەوا لە دونیادا پاداشت و تام و چێژی چاکەکەی وەردەگرێت تا کاتێک دەگات بە ڕۆژی دوایی هیچ چاکەیەکی نیە پاداشتی لەسەر وەربگرێت.

ئەمە ڕێک گونجاوە بۆ حاڵی زانا کافرەکان گۆڕ پەرستن یان نەفی صیفات دەکەن یان هەر کوفرێکی تریان هەبێ لەگەڵ ئەوەشدا هەندێکجار موسڵمانان تەکفیر دەکەن بەهۆی بڵاو کردنەوەیان بۆ تەوحید، کەچی ئەوەتا زۆرێک لەئێوە سەرەڕای زانینی کوفرەکانیان بە ئیمام ناویان دەبەن و زۆر گەورەیان دەکەن و بەرزیان دەکەنەوە، تەنانەت کەسانێک دەڵێن ئەوەی تەکفیریان بکات شایستەی کوشتنە یان تەمبێ کردنە، یان دەڵێن خەواریجە یان نەززامیە یان غولاتی تەکفیرە یان فیتنە چیە یان بێ ئەدەبە بەرامبەر زاناکان، ئیتر لەم پاداشتە زیاتر چی کە لە دونیا پێیان

دراوەتەوە، لەبڕی ئەوەی تەکفیر بکرێن کراون بە ئیمام، بەجۆرێک بەرگریان لێ دەکرێت وەک بڵێی بەرگری لە دینی ئیسلام دەکەن.

پاشان ئایا أبو حنیفة لە سەردەمەکەی خۆی ئەم ڕێز و پلە و پایەی پێدراوە کە خەلەف و معاصرین پێیان داوە ؟ بێگومان نەخێر وەک لەبەشی یەکەمدا ڕوونمان کردەوە، کەواتە سێ باشترین قەرنی ئوممەت پلە و پایەیان بۆ هیچ بیدعەچیەکیش دانەناوە چ جای بگات بەوەی بۆ کافرانی دابنێن، کەواتە کەسێک قبوڵی پێ نەبەخشرا بێ و جێگای نەبووبێتەوە لە دڵی زانایانی سەلەف کە باشترینی ئوممەتن بە شایەتی پێغەمبەری الله ﷺ ئیتر ئەوانەی دوای سەلەف دێن بەرزکردنەوەیان و گەورەکردنیان بۆ ئەم جۆرە کەسانە چ نرخێکی هەیە ؟ جا ئایا ئێستا دەڵێن: الله تعالی قبوڵی نەبەخشی بەم جۆرە زانایانە لە سێ سەدەی یەکەم ئینجا دواتر قبوڵی پێ بەخشین؟ یان دەڵێن: لە سێ سەدەکەش قبوڵی پێ بەخشین بەڵام زاناکانی سەلەف ناخ پیس بوون و حەسودیان پێ بردن و قبوڵی ئەم ڕێز لێنانەی الله-یان نەکرد بۆ بەندە بەڕێزەکانی ؟
ئەمەش دووبارە جیاوازی نێوان مەنهەجی سەلەف و خەلەف نیشان دەدات ئەوەی لەلای سەلەف ناشرین و بێزراوە تەکفیر وتەبدیع کراوە لەلای خەلەف بۆتە ئیمام و کەسێکی زۆر گەورە و بەڕێزە، جا کەسانێک لەباشترین سێ سەدەی ئوممەت تەکفیر کرابن و قسەیان پێ ووترا بێ بەرزکردنەوەی خەلەف چ سودێکیان پێ دەگەیەنێت ؟ جگە لەو پاداشتە نەبێ کە پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەدا موژدەی پێداون، لە قیامەتیش موفلیسن چونکە لەلای الله شتێک نیە بەناوی ئەوەی کتێبی بە سود کوفر و شیرك بسڕێتەوە، ئەوە مەنهەجی ئێوەیە داتانهێناوە بەڵێ فلان کوفری هەیە بەڵام کتێبی بە سودی نوسیوە ئیمامە لەلامان قبوڵ ناکەین تەکفیر بکرێت، الله بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: گەر شیرك ئەنجام بدەیت کردەوەکانت هەڵدەوەشێتەوە، گەر باسی کتێبی بە سود وخزمەتی ئیسلام دەکەن کێ بە قەدەر پێغەمبەر ﷺ بە سود بووە بۆ موسڵمانان و خزمەتی ئیسلامی کردووە ؟ تا ڕۆژی قیامەت هەر کەسێک موسڵمان بێت پاداشتەکەی بۆ ئەویش دەڕوات چونکە لەڕێگای ئەوەوە ئیسلام گەیشت بە خەڵکی، لە ئادەم تا دواترین مرۆڤی سەر زەوی کەس ناگات بە پلەی ئەو، کەچی

الله پێی دەفەرمووێ: گەر شیرك ئەنجام بدەیت کردەوەکانت هەڵدەوەشێتەوە، واتا گەیاندنی پەیامی ئیسلام و ئەم هەموو ترس و ناڕەحەتی و ناخۆشی و ئازارەی بینی لەپێناوی دینی الله بە گیان و ماڵ خۆی کردە فیدای دینەکەی الله هەموو ئەم کارانەی ئەنجامیدا هیچ سودی بۆی نابێت گەر شیرك ئەنجام بدات، بەڵام زاناکان ئەگەرچی کوفریشیان هەبێت مادام کتێبی بە سودیان نوسیوە ئەوا کافر نابن و الله لە کوفرەکانیان خۆش دەبێت بەهۆی خزمەتکردنیان بۆ دینی ئیسلام ! ئەمە چیتان بەسەر هاتووە ؟ کوا عەقڵتان ؟ کێ ئەم شەریعەتە نوێیەی بۆ داناون ؟ ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُا۟ شَرَعُوا۟ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ﴾ واتا: یاخود موشریکان خوای تریان هەیە جگە لە الله شتانێکیان لەدیندا بۆ دادەڕێژێ کە الله ڕێگای پێنەداوە. ئەی ئێوە چی ؟ خوای ترتان هەیە جگە لە الله ئەم تەشریعەی بۆ داڕشتوون ؟ الله دەفەرمووێ: لە هەموو شت خۆشدەبم لە شیرك خۆش نابم، بە وەحی بۆ هەموو پێغەمبەرانی ناردووە گەر بێتو شیرك ئەنجام بدەن کردەوەکانتان هەڵدەوەشێتەوە، بە هیچ کەسێکی نەووتوە گەر خزمەتی دینت کرد لە کوفرەکانت خۆش دەبم، دەی ئیتر پێمان بڵێن کێ ئەم شەریعەتەی بۆ داڕشتن گەر زانا کوفر بکات کافر نابێت چونکە خزمەتی دینی کردووە ؟ کام خوا ئەم شەریعەتەی بۆ داڕشتوون ؟ هیچ کەسێکتان کردۆتە شەریکی الله کە شەریعەتێکی لەم شێوەیەتان بۆ داڕێژێت ؟ عەقڵ و هۆشتان بخەنەوە بەر تاکەی تەقلیدی کوێرانە، تاکەی بە مەعصوم سەیر کردنی کەسەکان و گروپەکان و شوێنکەوتنی کوێرانەی ئەوان، تاکەی پشتکردن لە دەقی شەرعی و شوێنکەوتنی زەلەی زاناکان، تاکەی واز هێنان لە مەنهەجی سەلەف و شوێنکەوتنی خەلەف ؟

# گومانی دوانزدەم:
# سەلەف وتوویانە گەر خیلافتان تێکەوت بگەڕێنەوە بۆلای موجاهیدان

الله تعالى فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ﴾ واتا: ئەوانەی جیهاد دەکەن لەپێناوی ئێمەدا ئەوا هیدایەتیان دەدەین بۆ ڕێگای ڕاست.

ئیتر دەڵێن الله هیدایەتی بەخشیوە بە موجاهیدان ئەوان هیدایەتدراون بە هیدایەتی الله مەحاڵە لەشتێکی ئاوادا نەپێکن و بە هەڵەدا بچن، هەروەها عبدالله بن المبارك وسفيان بن عيينة وأحمد بن حنبل وتوویانە: گەر خەڵکی خیلافیان تێکەوت سەیر بکەن بزانن ئەهلی سەنگەرەکان لەسەر چ شتێکن، الله تعالى فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ﴾.

سەرەتا دەبێ ئەوە بزانین لێرەدا جیهاد تەنها جیهادی کوشتار نیە، بەڵکو هەموو جۆرەکانی جیهاد دەگرێتەوە هەروەک موفەسیرین باسیان کردووە، بەڵام بێگومان جیهادی کوشتاریش دەگرێتەوە بەتایبەتی لەم سەردەمەی ئێستادا کە بۆتە قورسترین جۆری جیهاد جا لە هەموو جۆرەکانی تر لەپێشترە کە بیگرێتەوە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە کە موجاهیدان مەعصوم بن، کەس قسەیەکی لەم شێوەیەی نەکردووە، وە هەرگیز حەق بە کەسەکان ناناسرێتەوە بەڵکو کەسەکان بە حەق دەناسرێنەوە، ئەم ووتەیەش کە دراوەتە پاڵ عبدالله بن المبارك و أحمد بن حنبل کە گوایە وتوویانە کاتێک خیلافتان تێکەوت بگەڕێنەوە بۆ خەڵکی سەنگەرەکان، نە ابن المبارك نە أحمد شتی ئاوایان لەسەر جێگیر نەبووە بەڵکو بەبێ سەنەد دراوەتە پاڵیان، بەڵام بە سەنەدەوە لە سفيان بن عيينة هاتووە.

**ابن أبي حاتم** دەڵێ: حدثنا أبي حدثنا يعقوب بن إسحاق البغدادي حدثنا حماد قال سمعته يقول قال لي **ابن عيينة: ..... اختلفوا فيه ..... وأهل الثغور، فإن الله يقول:** ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ

﴿سُبُلَنَا﴾. [تفسير ابن أبي حاتم - سورة العنكبوت : الآية 69]

ووتم: بەم شێوەیە هاتووە لە تەحقیقی أسعد وەک دەبینن کەوتن هەیە لە سەنەد و مەتنەکەدا (حدثنا حماد قال سمعته يقول قال لي ابن عيينة) لێرەدا هەروەک دیارە لەنێوان حماد و سفيان بن عيينة کەسێکی تر هەیە بەڵام کەوتووە جا یان هەڵەی چاپە یان هەر لە دەستنوس ئاوا بووە، هەروەها نەمزانی ئەمە کام حماد-ە پێم وانیە هیچ کام لە حماد بن سلمة و حماد بن زيد و حماد بن أسامة بە واسطة ڕیوایەت بکەن لە سفيان بن عيينة والله أعلم، گەر واسطة-ش هەبێ لەنێوانیان ئەوا کەوتووە، هەروەها يعقوب بن إسحاق البغدادي نەمزانی کێیە مەگەر ابن السكيت بێ ئەگینا نایناسم، مەتنەکەش کەوتنی تێدایە هەروەک دیارە، لە چاپە نوێیەکەی دار ابن الجوزي سورەتی العنكبوت-ی تێدا نیە بۆیە نەمتوانی سود لەویش وەربگرم، وە القرطبي والخازن وأبو حيان التوحيدي لە تەفسیرەکانیاندا هەمان ووتەیان نەقل کردووە لە سفيان بەبێ سەنەد.

**القرطبي** دەڵێ: **وقال سفيان بن عيينة لابن المبارك: إذا رأيت الناس قد اختلفوا فعليك بالمجاهدين وأهل الثغور، فإن الله تعالى يقول:** ﴿لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ﴾. [تفسير القرطبي : 390/16-391]

**الخازن** دەڵێ: **قال سفيان بن عيينة: إذا اختلف الناس فانظروا ما عليه أهل الثغور، فإن الله تعالى يقول:** ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَا﴾. [تفسير الخازن : 385/3]

**أبو حيان التوحيدي** دەڵێ: **قال سفيان بن عيينة: إذا اختلف الناس في شيء ما فالأمر ما عليه أهل الثغور، فإن الله تعالى يقول:** ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَا﴾.
[البصائر والذخائر : 327/1]

جا وەک بینیتان تەنها ابن أبي حاتم نەقلی کردووە بە سەنەدەوە حاڵی سەنەدەکەش بەو شێوەیە بوو کە بینیتان، گریمان صەحیحیش بێت دەکرێ ووتەی تاکە زانایەک بکەین بە بەڵگە

لەكاتێكدا الله تعالى فەرموويەتی: ﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ﴾ واتا: گەر خیلافتان تێكەوت ئەوا بیگەڕێننەوە بۆلای كتێبی الله و فەرموودەكانی پێغەمبەر ﷺ گەر ئێوە ئیمانتان هەیە بە الله و بە ڕۆژی دوایی.

بڕوانە نەیفەرموو خیلافەكانتان بگەڕێننەوە بۆلای موجاهیدان بەڵكو فەرمووی بیگەڕێننەوە بۆ قوڕئان و سوننەت، جا ئایەتەكە وەردەگرن یان ووتەی سفیان بن عیینة ؟ پاشان مەبەستتان لە ووتەكەی سفیان ئەوەیە كە بگەڕێینەوە بۆ ووتەی ئەو موجاهیدانەی كە أبو حنیفة بە ئیمام دەزانن، ئەی باشە بۆ دەربارەی أبو حنیفة ووتەی سفیان وەرناگرن ؟ خۆ خودی سفیان بینیتان چی بە أبو حنیفة ووت لەبەشی یەكەمدا، ئەو ووتانەی وەرناگرن كە لەدژی أبو حنیفة-یە بەڵام ووتەكەی تری وەردەگرن كە بە دڵتانە ؟ ئێستا گەر سفیان لەژیاندابوایە لەسەر قسەی خۆی دەمایەوە یان وازی لە قسەی خۆی دەهێنا و دەچوو لە موجاهیدانی دەپرسی بزانێ ئەوان چی دەڵێن دەربارەی أبو حنیفة ؟ ئەی زاناكانی سەلەف كەسیان ئەهلی جیهاد و سەنگەر نەبوون ؟ بۆ كەسیان ئەوكات نەیانووت أبو حنیفة ئیمامە ؟ گەر بەپێی ووتەكەی سفیان بڕۆین تا قیامەت ئەم باسە یەكلا نابێتەوە چونكە سەردەمانێك موجاهیدان دژی أبو حنیفة قسەیان كردووە لەم سەردەمەش موجاهیدان بە ئیمامی دەزانن ئەمە واتای چی؟ خەڵكی سەردەمی پێشوو لەسەر ڕەئی موجاهیدەكانی ئەوكات بڕۆن و دژی أبو حنیفة بن، خەڵكی ئەم سەردەمەش لەسەر ڕەئی موجاهیدەكانی ئێستا بن و أبو حنیفة بە ئیمام بزانن، دوای سەدان ساڵی تر كۆمەڵێكی تری جیهادی بێت أبو حنیفة تەكفیر بكات خەڵكی سەردەمەكەش تەكفیری أبو حنیفة بكەن ؟! ئەمە بەستنەوەی حەقە بە كەسەكان ناكرێ لە سەردەمێك شتێك حەق بێت لە سەردەمێكی تر دژەكەی ببێتە حەق، پاشان سفیان باسی خیلاف دەكات دەڵێ گەر خیلافتان تێكەوت، زانایەك بكەوێتە كوفرەوە بە دەقی ئایەت بڕاوەتەوە كە كافرە ئیتر خیلاف كوا تا بگەڕێینەوە بۆلای ئەم و ئەو ؟ پاشان ئەم هەموو ووتە زۆرەی سەلەفمان بینی كوا خیلافیان هەبوو دەربارەی أبو حنیفة ؟ یەكێك ووتی كافرە، یەكێك ووتی شومترین كەسە لە دایكبووە، یەكێك ووتی گرێكانی ئیسلامی دانە بە دانە هەڵوەشاندەوە، یەكێك

ووتی سەركردە بوو لە ئیرجاء، یەكێك ووتی بانگی كردم بۆ ئیرجاء، یەكێك ووتی خەواریجە، یەكێك ووتی جەهمیە، یەكێك ووتی درۆزنە، یەكێك ووتی هیچ فیتنەیەك لە ئاسمان دانەبەزیوە خراپتر بێ لە أبو حنیفة بۆ سەر ئوممەت، چەندین ووتەی تری هاوشێوەی ئەمانە، واز بهێنین لە هەموو ئەم ووتانە سەیر بكەین بزانین موجاهیدانی ئەمڕۆ چی دەڵێن ؟ لەكاتێكدا جگە لە ووتنەوەی خەلەف هیچیان بە دەستەوە نیە، خۆ گەر بێتو بە بەڵگە وەڵاممان بدەنەوە ئەوا نەك موجاهید هەر كەسێك بێت لێی قبوڵ دەكەین بەڵام كە بەڵگە نەبوو لە كەسی قبوڵ ناكەین موجاهید بێت یان هەر كەسێكی تر، پاشان ئێمە كتێبەكەی تركي البنعلي-مان بینی كە بۆ بەرگری كردن لە حەوت زانا نوسیبووی، كە پێی وابوو زۆربەیان هەر كوفریان نیە تەنها كەوتوونەتە بیدعەوە ! پاشان بۆ بەرگری كردن لێیان نەهاتبوو ڕەددی ئەم خاڵانە بداتەوە كە باس دەكرێن لەسەریان، بۆ نموونە بڵێ ئەم كوفرە دراوەتە پاڵ فلان زانا بەڵام ڕاست نیە بۆی هەڵبەستراوە، یان ئەم كوفرە دراوەتە پاڵ فلان زانا بەڵام تەوبەی لێكردووە ئەمەش بەڵگەی تەوبەكردنی، گەر بەم شێوەیە بەرگری بكەن لێیان ئەوا نەك موجاهید هەر كەسێك بێت قبوڵی دەكەین، بەڵام تركي البنعلي شتێكی زۆر چاوەڕوان نەكراوی كرد كە لە ئاست پلەی زانستی ئەودا نەبوو، بەڕاستی توشی شۆك بووم كە كتێبەكەم بینی، چاوەڕێی ئەوەم دەكرد بەڵگەكان یەك لەدوای یەك ڕیز بكات بۆ لابردنی گومانی كوفر لەسەر زاناكان، كەچی تەنها و تەنها پشتی بەوە بەستبوو كە فلان زانا لە خەلەف و فلان زانای نەجدی و فلان زانای موجاهید ئەم زانایەی بە ئیمام ناوبردووە ئیتر كەسانێكی لەم جۆرە بە ئیمام ناوی ببەن ئێمەش بە ئیمام ناوی دەبەین و مەحاڵە كافر بێت ! لە 20 شوێندا بەڵگەی بە ووتەی الذهبي هێنابوویەوە گوایە الذهبي وتوویەتی فلان ئیمامە كەواتە مادام الذهبي ووتی ئیمامە ناكرێ تەكفیری بكەین ! ئاخر كەسێكی وەك الذهبي تەكفیر لە قاموسیدا نیە هەرچی ڕافیزی وجەهمی وزندیق هەیە بە ئیمام ناوی دەبات چۆن دەكرێ بەم بیانووە بەتاڵانە كافر بكەین بە ئیمام ! خۆ بینیمان أبو حنیفة حاڵی چۆن بوو لەلای سەلەف، وە دەشبینین كە لەلای خەلەف و معاصرین چۆن كراوە بە ئیمام و هەمیشە لەپاڵ مالك والشافعي وأحمد ناوی دەهێنرێ، هەروەها تركي البنعلي كە دەربارەی أبو حنیفة قسە دەكات لە دەنگێكی دوو سێ خولەكی هەمان ووتەكانی

سليمان العلوان-ی مامۆستای دووبارە دەکاتەوە کە لە گومانی دووەم وەڵاممان دایەوە، ئیتر دەکرێ ئەم هەموو بەڵگەیەی کە بینیمان لە بەشی یەکەمدا بیخەینە لاوە و شوێنی ئەم ووتانە بکەوین بە بیانووی ئەوەی خاوەنی ووتەکە موجاهید بووە ؟! صلاح الدين الأيوبي کە ئەشعەری بوو دوو گەورەترین هێزی کوفری ڕووخاند کە دەوڵەتی ڕافیزە بوو لە مصر، وە هێزی نەصارا بوو لە قودس، خەڵکی لەو سەردەمەدا کە خیلافیان زۆر بوو دەربارەی الأسماء والصفات چیان کردبوایە ؟ شوێنی عەقیدە ئەشعەرییەکەی صلاح الدين کەوتبوان بە بیانووی ئەوەی موجاهیدە ؟ یان أبو عمر البغدادي کە خەلیفەی دەوڵەتی ئیسلامی لە عیراق بوو لە ڕوونکردنەوەی عەقیدەی دەوڵەتەکەیدا ووتی: حزبە بەناو ئیسلامیەکانی عیراق کافرن لەسەر ئاستی کاربەدەستان بەڵام خەڵکە سادەکەی تر کە لایەنگری ئەم حزبانەن و دەنگیان پێدەدەن دوای ئیقامە حوججە تەکفیر دەکرێن، ئایا ئەوکات و ئێستاش بۆمان هەبوو لەم هەڵەیەدا شوێنی بکەوین بە بیانووی ئەوەی موجاهیدە ؟ خۆ تا ئێستاش بابەتی عوزر بە جەهل و ئیقامە حوججە و تەکفیری جاهیلان قسە و باسی زۆر لەسەرە بەڵام هەرگیز بیرتان لەوە کردۆتەوە بگەڕێنەوە سەر ووتەکەی أبو عمر البغدادي و بڵێن دەنگدەر و لایەنگری ئەم حزبانە تەکفیر ناکەین؟ هەروەها لە (سلسلة علمية في بيان مسائل منهجية) لە ئەڵقەی یەکەم هاتووە کە دەڵێن: بە توندترین شێوە سەرزەنشتی ئەو کەسە دەکەین کە ستەم دەکات و سنوور دەبەزێنێت تەکفیری زانایانی وەک ابن قدامة المقدسي والنووي وابن حجر العسقلاني وجگە لەوانیش دەکات رحمهم الله کە دەستانێکی سپیان هەیە لە بڵاو کردنەوەی زانست وسەرخستنی شەریعەت، پلەو پایەیان دەپارێزین و ڕەحمەتیان بۆ دەنێرین، وە عوزریشیان بۆ دەهێنینەوە لەو هەڵە و پەڵخلیسکانەی کە لێیان دەرکەوتووە.

بەڵێ ئەمە مەنهەجەکەیانە گەر زانا کوفریشی هەبێت لە کەسی قبوڵ ناکەن تەکفیری بکات چونکە ئەم زانایانە ڕۆڵیان هەبووە لە بڵاوکردنەوەی زانست و کتێبی بە سودیان نوسیوە، چاوپۆشی لە کوفرەکانیان دەکەین و پلەیان بەرز ڕادەگرین و ڕەحمەتیان بۆ دەنێرین ! ئایا ئەم مەنهەجە لەگەڵ ئایەتی ﴿لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ﴾ یەک دەگرێتەوە ؟

**البربهاري** دەڵێ: **بزانە ڕەحمەتی الله-ت لێبی عیلم بە زۆر ڕیوایەت کردن و زۆری کتێب نیە، زانا ئەو کەسەیە کە شوێن عیلم و سوننەت کەوتووە ئەگەرچی عیلم و کتێبی کەم بێت، وە هەر کەسێک موخالەفەی قورئان و سوننەت بکات ئەوا خاوەنی بیدعەیە ئەگەرچی عیلم و کتێبیشی زۆر بێت.** [شرح السنة : 103]

ووتم: جا ببینە و بزانە کامە مەنهەج هەڵدەبژێری، ئەو مەنهەجەی کە زانایانی سەلەف لەسەری بوونە کە لەگەڵ قورئان یەک دەگرێتەوە هەر کەس کوفر بکات کافرە، یان ئەو مەنهەجەی کە خەلەف و معاصرین دایانهێناوە کە پێچەوانەی قورئانە کە کافر دەکەن بە ئیمام و ڕێز لێگیراو ؟ جا ئایا ئامادەن ئێوەش وەک البربهاري بڵێن ئەوەی کوفری هەبێت کافرە ئەوەی بیدعەی هەبێت بیدعەچیە ئەگەرچی عیلمی زۆر بێت و کتێبی بە سودی نوسی بێت ؟ یان ووتەکەی ئەو بە دیواردا دەدەن و دەڵێن مادام کتێبی بە سودی هەیە هەر ئیمامە ئەگەرچی هەموو گیانیشی کوفر و بیدعە بێت ؟

**ابن القيم** دەڵێ: **پشت هەڵکەر لە تەوحید موشریکە بیەوێ یان نەیەوێ، وە پشت هەڵکەر لە سوننەت بیدعەچیەکی گومڕایە بیەوێ یان نەیەوێ.** [إغاثة اللهفان : 387/1]

ووتم: ئێوەش دەڵێن ئەوەی کەوتۆتە ناو کوفرەوە ئیمامە بیەوێ یان نەیەوێ ! والله المستعان.

نامەوێ زۆر لەسەر ئەم باسە بدوێم بەڵام ویستم ئاماژە بەوە بدەم کە موجاهید هەرچەندە بەڕێز و قەدر گەورە بێت لەلامان بەڵام مەعصوم نیە و بەدەر نیە لە هەڵە، وە لەکاتی خیلافدا قورئان و سوننەت لەنێوانماندایە نەک ووتەی کەس و لایەنێک ببێتە بەڵگە و باسەکە یەکلا بکاتەوە، هەروەک الله تعالى فەرموویەتی: ﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ﴾.

# کۆتایی

**بەم ئایەتە کۆتایی بە کتێبەکە دەهێنم**

﴿أَمۡ يَقُولُونَ بِهِۦ جِنَّةُۢۚ بَلۡ جَآءَهُم بِٱلۡحَقِّ وَأَكۡثَرُهُمۡ لِلۡحَقِّ كَٰرِهُونَ﴾

**وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين**

داستان محمد - تەبلیسی / جۆرجیا

**2019/8/2** دەستم بە نوسینی کرد **2020/2/3** بەکۆتا هات

# سەرچاوەكان

## (أ)

1/ [إبطال الحيل لابن بطة] المكتب الإسلامي ط(٢) / ت: زهير الشاويش

2/ [إجتماع الجيوش الإسلامية لابن القيم] دار البيان ط(٣) / ت: بشير محمد عيون

3/ [الأحكام السلطانية لأبي يعلى] دار الكتب العلمية / ت: محمد حامد الفقي

4/ [الإحكام في أصول الأحكام لابن حزم] دار الآفاق الجديدة - بيروت ط(٢)

5/ [أخبار أبي حنيفة وأصحابه للصيمري] عالم الكتب ط(٢)

6/ [أخبار الشيوخ وأخلاقهم للمروذي] دار البشائر الإسلامية ط(١) / ت: عامر حسن صبري

7/ [الإختلاف الأئمة العلماء للوزير ابن هبيرة] دار الكتب العلمية ط(١) / ت: السيد يوسف أحمد

8/ [الإختلاف في اللفظ والرد على الجهمية والمشبهة لابن قتيبة] دار الراية ط(١) / ت: عمر بن محمود

9/ [آداب الشافعي ومناقبه لابن أبي حاتم] دار الكتب العلمية ط(١) / ت: عبدالغني عبدالخالق

10/ [الأدب المفرد للبخاري] دار الصديق ط(٢) / ت: الألباني

11/ [الأرجوزة المنبهة لأبي عمرو الداني] دار المغني ط(١) / ت: محمد بن مجقان الجزائري

12/ [الإرشاد للخليلي] مكتبة الرشد ط(١) / ت: محمد سعيد عمر إدريس

13/ [الإستذكار لابن عبدالبر] دار قتيبة - دار الوعي ط(١) / ت: قلعجي

14/ [الإستيعاب لابن عبدالبر] دار الكتب العلمية ط(١) / ت: علي محمد معوض و عادل أحمد عبدالموجود

15/ [الأسماء والصفات للبيهقي] مكتبة السوادي / ت: عبدالله بن محمد الحاشدي

16/ [أصول الحديث علومه ومصطلحه لمحمد عجاج الخطيب] دار الفكر

17/ [أعلام الموقعين لابن القيم] دار ابن الجوزي ط(١) / ت: مشهور

18/ [إغاثة اللهفان لابن القيم] دار عالم الفوائد / ت: محمد عزير شمس

19/ [إقتضاء الصراط المستقيم لابن تيمية] دار إشبيليا ط(٢) / ت: ناصر بن عبدالكريم العقل

20/ [الإكليل للسيوطي] دار الكتب العلمية ط(١) / ت: سيف الدين عبدالقادر الكاتب

21/ [الإنتقاء لابن عبدالبر] مكتبة القدسي

22/ [الأوسط في السنن والإجماع والإختلاف لابن المنذر] دار الفلاح ط(٢)

23/ [إيضاح طرق الإستقامة ليوسف بن عبدالهادي] دار النوادر ط(١) / ت: بإشراف نورالدين طالب

## (ب)

24/ [البحر المحيط للزركشي] وزارة الأوقاف والشؤون الإسلامية - الكويت ط(٢) / ت: عبدالقادر العاني
25/ [البداية والنهاية] دار هجر ط(١) / ت: التركي
26/ [بدائع الصنائع للكاساني] دار الكتب العلمية ط(٢) / ت: علي محمد معوض و عادل أحمد عبدالموجود
27/ [براءة الأئمة الأربعة من مسائل المتكلمين المبتدعة لعبدالعزيز الحميدي] دار ابن عفان ط(١)
28/ [البشائر في السماع المباشر لعبدالله بن عياش الأهدل] دار عمر بن الخطاب ط(١)
29/ [البصائر والذخائر لأبي حيان التوحيدي] دار الكتب العلمية ط(١) / ت: محمد السيد عثمان
30/ [بغية الطلب في تاريخ حلب لابن العديم] دار الفكر / ت: سهيل زكار
31/ [بيان تلبيس الجهمية لابن تيمية] مجمع الملك فهد / ت: يحى بن محمد الهنيدي
32/ [بيان فضل علم السلف على علم الخلف لابن رجب] دار الصميعي ط(١) / ت: محمد بن ناصر العجمي

## (ت)

33/ [تاريخ أبي زرعة الدمشقي] دار الكتب العلمية ط(١) / ت: خليل المنصور
34/ [تاريخ الإسلام للذهبي] دار الكتاب العربي ط(٢) / ت: عمر عبدالسلام تدمري
35/ [التاريخ الأوسط للبخاري] دار الصميعي ط(١) / ت: محمد بن إبراهيم اللحيدان
36/ [تاريخ بغداد للخطيب] دار الغرب الإسلامي ط(١) / ت: بشار عواد معروف
37/ [تاريخ جرجان للسهمي] عالم الكتب - بيروت ط(٤) / ت: تحت مراقبة محمد عبدالمعيد خان
38/ [تاريخ دمشق لابن عساكر] دار الفكر ط(١) / ت: محب الدين أبي سعيد عمر بن غرامة
39/ [تاريخ الطبري] دار المعارف ط(٢) / ت: محمد أبو الفضل إبراهيم
40/ [تاريخ علماء النحويين من البصريين والكوفيين وغيرهم للتنوخي] إدارة الثقافة والنشر - جامعة الإمام محمد بن سعود / ت: الحلو
41/ [التاريخ الكبير للبخاري] دائرة المعارف العثمانية ط(١) / ت: المعلمي اليماني

42/ [تأويل مختلف الحديث لابن قتيبة] المكتب الإسلامي - بيروت و مؤسسة الإشراق - الدوحة ط(٢) / ت: محمد محيي الدين الأصفر
43/ [تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي للمباركفوري] دار الفكر
44/ [ترتيب المدارك للقاضي عياض] وزارة الأوقاف والشؤون الإسلامية - المغرب ط(٢)
45/ [ترجمة شيخ الإسلام ابن تيمية من الدرة اليتيمية في السيرة التيمية للذهبي] الرسالة العالمية ط(١) / ت: خالد بن سليمان بن علي الربعي
46/ [التسعينية لابن تيمية] مكتبة المعارف - الرياض ط(١) / ت: محمد بن إبراهيم العجلان
47/ [تفسير ابن أبي حاتم] مكتبة نزار مصطفى الباز ط(١) / ت: أسعد محمد الطيب
48/ [تفسير الخازن] دار الكتب العلمية ط(١) / ت: عبدالسلام محمد علي شاهين
49/ [تفسير الطبري] دار هجر / ت: التركي
50/ [تفسير غريب الموطأ لعبدالملك بن حبيب] مكتبة العبيكان ط(١) / ت: عبدالرحمن بن سليمان العثيمين
51/ [تفسير القرطبي] مؤسسة الرسالة ط(١) / ت: التركي
52/ [التمييز لمسلم] وزارة المعارف السعودية ط(٢) / ت: الأعظمي
53/ [التنكيل للمعلمي] دار عالم الفوائد
54/ [تهذيب الآثار للطبري] دار الكتب العلمية ط(١) / ت: علي إبراهيم مصطفى
55/ [تهذيب التهذيب لابن حجر] مؤسسة الرسالة / ت: إبراهيم الزيبق و عادل مرشد
56/ [تهذيب الكمال للمزي] مؤسسة الرسالة ط(٢) / ت: بشار عواد معروف

## (ث)

57/ [الثقات لابن حبان] دائرة المعارف العثمانية ط(١) / ت: محمد عبدالمعيد خان

## (ج)

58/ [جامع بيان العلم وفضله لابن عبدالبر] دار ابن الجوزي ط(١) / ت: أبو الأشبال الزهيري
59/ [جامع الترمذي] دار الغرب الإسلامي ط(١) / ت: بشار عواد معروف

60/ [الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع للخطيب] دار الكتب العلمية ط(١) / ت: أبو عبدالرحمن صلاح بن محمد بن عويضة

61/ [جامع المسائل لابن تيمية] دار عالم الفوائد

62/ [الجرح والتعديل لابن أبي حاتم] دائرة المعارف العثمانية ط(١) / ت: المعلمي اليماني

63/ [جمع الوسائل في شرح الشمائل للملا علي القاري] دار الكتب العلمية / ت: محمد بن رياض الأحمد

64/ [الجواهر المضية في طبقات الحنفية لعبدالقادر القرشي] دار هجر ط(٢) / ت: الحلو

## (ح)

65/ [حلية الأولياء لأبي نعيم الأصبهاني] دار السعادة - مصر

## (خ)

66/ [الخصائص لابن جني] المكتبة العلمية / ت: محمد علي النجار

67/ [خير الكلام في القراءة خلف الإمام للبخاري] دار الكتب العلمية

## (د)

68/ [الدرر السنية] ج ت: عبدالرحمن بن محمد بن قاسم ط(٦)

69/ [دستور الوحدة الثقافية بين المسلمين لمحمد الغزالي] دار الشروق

## (ذ)

70/ [ذكر محنة الإمام أحمد بن حنبل لحنبل بن إسحاق] ت: محمد نغش ط(٢)

71/ [ذم الكلام وأهله للهروي] مكتبة الغرباء الأثرية / ت: الأنصاري

72/ [ذيل طبقات الحنابلة لابن رجب] مكتبة العبيكان ط(١) / ت: عبدالرحمن بن سليمان العثيمين

## (ر)

73/ [رافضة اليمن على مر الزمن لمحمد بن عبدالله] دار الحديث ط(١)

74/ [الرد على البكري لابن تيمية] دار الوطن ط(١) / ت: عبدالله بن دجين السهيلي

75/ [الرد على الجهمية والزنادقة للإمام أحمد] دار الثبات ط(١) / ت: صبري بن سلامة شاهين

76/ [الرد على السبكي في مسألة تعليق الطلاق لابن تيمية] دار عالم الفوائد

77/ [رفع الإشتباه للمعلمي] دار عالم الفوائد

78/ [رفع الإصر عن قضاة مصر لابن حجر] مكتبة الخانجي ط(١) / ت: علي محمد عمر

## (ز)

79/ [زاد المعاد لابن القيم] دار عالم الفوائد

## (س)

80/ [سر تأخر العرب والمسلمين لمحمد الغزالي] نهضة مصر ط(٧)

81/ [السنة لحرب الكرماني] ت: عادل آل حمدان

82/ [السنة للخلال] دار الراية ط(١) / ت: عطية الزهراني

83/ [السنة لعبدالله] ت: عادل آل حمدان

84/ [سنن الدارقطني] دار الكتب العلمية ط(١) / ت: مجدي بن منصور بن سيد الشورى

85/ [سنن الصغرى للنسائي] دار التأصيل ط(١)

86/ [سنن الكبرى للبيهقي] دار الكتب العلمية ط(٣) / ت: محمد عبدالقادر عطا

87/ [سؤالات البرذعي لأبي زرعة] الفاروق الحديثة ط(١) / ت: أبو عمر محمد بن علي الأزهري

88/ [سير أعلام النبلاء للذهبي] مؤسسة الرسالة ط(١١)

89/ [سيرة الإمام أحمد بن حنبل لصالح بن الإمام أحمد] المكتب الإسلامي ط(١) / ت: محمد الزغلي

## (ش)

90/ [شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة للالكائي] وزارة الأوقاف السعودية ط (٨) / ت: أحمد الغامدي

91/ [شرح الأصول من علم الأصول لابن عثيمين] دار البصيرة / ت: نشأت بن كمال المصري

92/ [شرح السنة للبربهاري] مكتبة الغرباء الأثرية ط(١) / ت: الردادي

93/ [شرح صحيح مسلم للنووي] دار الكتب العلمية ط(١) / ت: محمد فؤاد عبدالباقي
94/ [شرح العقيدة الأصفهانية لابن تيمية] مكتبة الرشد ط(١) / ت: سعيد بن نصر بن محمد
95/ [شرح القواعد الفقهية لأحمد زرقا] دار القلم ط(٢) / ت: مصطفى أحمد زرقا
96/ [شرح كتاب السياسة الشرعية لابن عثيمين] دار العثمانية - دار ابن حزم ط(١) / ت: صالح عثمان اللحام
97/ [شرح مختصر الروضة للطوفي] دار الكتب العلمية ط(١) / ت: محمد عثمان
98/ [الشريعة للآجري] دار الكتب العلمية ط(١) / ت: محمد بن الحسن إسماعيل

## (ص)

99/ [الصارم المسلول لابن تيمية] رمادي ط(١) / ت: الحلواني و شودري
100/ [صحيح البخاري] دار ابن كثير ط(١)
101/ [صحيح مسلم] الحلبي ط(١) / ت: محمد فؤاد عبدالباقي
102/ [صريح السنة للطبري] مكتبة أهل الأثر - الكويت ط(٢) / ت: بدر بن يوسف المعتوق
103/ [الصلة في تاريخ أئمة الأندلس لابن بشكوال] دار الغرب الإسلامي ط(١) / ت: بشار عواد معروف

## (ض)

104/ [الضعفاء للعقيلي] دار مجد الإسلام و دار ابن عباس ط(١) /ت: السرساوي
105/ [الضعفاء والمتروكين للنسائي] مؤسسة الكتب الثقافية / ت: بوران الضناوي و كمال يوسف الحوت

## (ط)

106/ [طبقات الحنابلة لابن أبي يعلى] مطبعة السنة المحمدية / ت: محمد حامد الفقي
107/ [الطبقات الكبير لابن سعد] مكتبة الخانجي ط(١) / ت: علي محمد عمر
108/ [طليعة التنكيل للمعلمي] دار عالم الفوائد
109/ [طليعة التنكيل للمعلمي] دار الكتب السلفية / ت: الألباني و محمد عبدالرزاق حمزة
110/ [طوق الحمامة لابن حزم] مطبعة حجازي / ت: الصيرفي

